ئۆرهان پاموک


هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات ٢٠٠٦

# بەفر


بەکر شوانی

لە تورکییەوە وەری گێڕاوە




پێشکەشە بە روئیا


ناوی کتێب: بەفر – ڕۆمان
نووسینی: ئۆرهان پاموک
وەرگێڕانی لە تورکییەوە: بەکر شوانی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٣٣
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و هەڵەگری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: مەریەم موتەقییان
سەرپەرشتیاری کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٦٩٣)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# مۆدێرنە و ترادسیۆن

# لە لای ئۆرهان پاموک

## بەختیار عەلی

*لێرەدا لاڵەکان قسە دەکەن و مردووەکان دەژین*

نووسراوی سەر کتێبخانەیەک لە بۆدابست

*شاعیر تەنیا مەخلوقی ڕاستەقینەی دونیایە،*

*هەتا باشترین فەیلەسوف لە بەردەمیدا لە کاریکاتێر دەچێت*

فردریش ڤۆن شیللەر

گەر سەرنجێکی مێژووی ئەدەبیاتی خۆرهەڵات بدەین، بەرچاوترین شتێک لە سەرەتاوە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت، ئەو ڕاستییەیە کە لە هەرێمی ئێمەدا، ئەدەبیاتی تورکی بەراورد بەئەدەبیاتی دیکەی ناوچەکە هەردەم شانسێکی گەورەتری بۆ بەجیهانیبوون لە پێش دەمدا بووە. بەدرێژاییی سەدەی بیست نووسەرە تورکەکان ئاسانتر بوونەتە ڕوخساری گەورە و ناسراو لە خۆرئاوادا . بۆ ئێمە کە کەم تا زۆر لە ئەدەبیاتی ئێرانی و عەرەبییەوە نزیکین، ئەو حاڵەتە هەردەم جێگای کەمێک سەرسامی و هەستکردن بووە بە ناهەقی. زۆر ناوی گەورە و گرنگ لە ئەدەبیاتی خۆرهەڵاتدا تا ئێستا لە دەرەوەی وڵاتانی خۆیان بەدەگمەن دەناسرێن. ناوی زۆر گەورەی وەک سوهراب و شاملۆ و گولشیری، وەک سەلیم بەرەکات و مونیف لەگەڵ وەرگێڕانی هەندێک لە کارەکانیشیاندا هێشتا لە خۆرئاوا یان هەر نەبیستراون یاخود لە سنووری بازنەیەکی زۆر تەسکی ئەکادیمیدا دەناسرێن. بەڵام نووسەرانی تورکی وەک نازم حیکمەت، عەزیز نەسین، یەشار کەمال، محەمەد عارف، ئۆرهان



پاموک زۆر خێراتر و ئاسانتر لە نووسەرانی دیکەی خۆرهەڵاتی ڕێگا دەبڕن و تێکەڵاوی خۆرئاوا دەبن و دەچنە ڕیزی ئەو نووسەرانەی کە کتێبەکانیان لەو بنکانەدا چاپ دەبن کە کتێبی فرە خوێنەر چاپ دەکەن. نهێنیی ئەمە ڕەنگە بەشێکی لەو نزیکییەدا بێت کە گەلێک ساڵە تورکیای بەخۆرئاواوە گرێ داوە. بوونی وەرگێڕی باش و ئەنستیوتی کاریگەریش هۆکارێکی گەورەن کە ئەدەبیاتی تورکی شانسی بەربڵاوی بەخۆیەوە بینیوە، جگە لەوەش تورکیا وەک وڵاتێک کە نە خۆرئاوایە و نە خۆرهەڵات، جێگایەکی سەرنجڕاکێشە کە ئاسان دەتوانێت هۆش و خەیاڵی هەموو ئەو کەسانە ڕاکێشێت کە بایەخ بەپێوەندیی نێوان ئەم دوو دونیا جیاوازە دەدەن. بەڵام لەم هۆیانە گەورەتر و گرنگتر ئەوەیە کە ڕووبەرێکی بچووکی لە دیموکراسییەت لە تورکیا دەرگای بۆ جۆرێک لە ئەدەبیات کردووەتەوە کە ئەدیبانی تورک لە ڕێگایەوە ڕەخنەگرتر و ئیرۆنیتر لە بارودۆخی ناوەوەی تورکیا بڕوانن. بەشێکی گرنگی ناوبانگی نووسەرانی تورکیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نیگا ڕەخنەیییە کە لە نازم حیکمەتەوە دەست پێ دەکات و لای عەزیز نەسین فۆرمێکی گاڵتەئامێزی زۆر تراژیدی وەردەگرێت و لای یەشار دەبێتە هونەری خوێندەوە و بەقارەمانکردنی پیاوە سادە و ساکار و پەڕاوێزییەکان و پلەیەکی باڵا لە واقعییەت بەدەست دەهێنێت. لای پاموکیش دەبێتە جۆرێک لە خوێندنەوەی ئەرکیۆلۆژی بۆ ئەو تەنگژانەی تورکیای ئەمڕۆیان دروست کردووە. دیارە ئەم دەستنیشانکردنە بەمەبەستی کەمکردنەوە نییە لە قەدری ئەو نووسەرانە، کە بەش بەحاڵی خۆم پێکڕا بەنووسەری ئێجگار گەورەیان دەزانم، بەڵکو تێبینییەکە دەربارەی ئەو هۆکارانەی کە وا دەکەن ئەدەبی تورکی بۆ خوێنەرانی خۆرئاوایی سەرنجڕاکێشتر و شایستەتر بنوێنێت، لە کاتێکدا ڕەنگە بۆ منێکی خۆرهەڵاتی، سوهراب و فەروغ و ماغوتیش لە هەمان ئاست و باڵاییدا بن. بەگشتی هەر کاتێک من کتێبێکی نووسەرانی تورکی ناودار دەخوێنمەوە، دەمەوێت دوای ئەو هۆیانە نەکەوم کە وا دەکات نووسەرێکی تورک لە خۆرئاوا سەیر و خوێنراوە بێت و ببێتە جێگەی سەرنج، بەڵکو بۆ ئەو نووسەرە ڕاستەقینەیە دەگەڕێم کە گەر لە نێوکۆی «سیاق» ئەو کولتووری بەراوردەش کە ئەمڕۆ لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بەرقەرارە دەری بهێنین، هەر گەورە بمێنێتەوە. بۆ ئێمەی خوێنەری

خۆرهەڵاتی کە ئەدەبیاتی تورکی دەخوێنینەوە، دەبێت ئەو سەرسامییە بدۆزینەوە، کە سەرسامیی خۆمانە. هەموو ئەدەبێکی گەورە بەشێوەی جۆراوجۆر خەڵک سەرسام دەکات. ئاساییە کە دەبینین بینەرێک لە خۆرهەڵات بەتابلۆیەکی بیکاسۆ یان ماتیس سەرسام نابێت، چونکە سەر بەسەر زەمینێک و پاشخانێکی کولتوورییە، بواری پێ نادات لە نهێنیی سەرسامبوونی خۆرئاوا بەبیکاسۆ تێ بگات. کولتووره جیاوازەکان، شێوازی جیاوازی سەرسامبوون دروست دەکەن، چونکە هەر کولتوورە و بەجیا جۆرە چاوێک بۆ خۆی دروست دەکات، فەرهەنگێک و کولتوورێکیش ئەو کات دەمرێت کە دەستبەرداری چاوی خۆی بێت و بەچاوی ئەوانی دی دونیا ببینێت. هەڵبەت ئەمە بەمانای ئەوە نییە کە لە نهێنی زەوقی ئەدەبی بەگشتی تێ نەگەین، یاخۆ وا بڕوانین کە زەوق و چێژی ئەوانی دی ناتوانن زەوق و چێژی ئێمە دەوڵەمەند بکەن، یان نیگای خۆمان هەرچۆنێک بوو بەئەلتەرناتیڤێکی ڕەها و پیرۆزی نیگای ئەوانی دی بزانین، بەڵکو بەو مانایەیە کە مرۆڤ مانای ئەو ڕوانگە و گۆشەنیگایە نەدۆزێنێت کە خۆی لێوەی تەماشا دەکات. لە ڕۆشنبیریی کوردیدا کولتووری بینین بەمانا ئەدەبییەکەی، واتە دروستکردنی نیگای خۆت بۆ تێکستەکان و شێوەی خۆت لە دەرەنجامگیریدا هێشتا هونەرێکی سەرەتایی و لاوازە. لەم نووسینە کورتەدا هەوڵ دەدەم شتێکی زۆر بچووک لەسەر سەرسامیی خۆم بەپاموک باس بکەم، پاموک وەک ئارکیۆلۆژیستێک کە بنکۆڵی گرفتگەلێک دەکات دونیای ئێمەی لە ژێرەوە بنکۆڵ کردووە... ڕاستە برێک لە سەرسامیی ئێمە بەپاموک دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستە سیاسییە هیومانیستییەکانی، بۆ ئازایەتیی لە بەرگریکردن لە ڕاستیدا، بەڵام لەمانە بترازێت دەبێت پاموکی نووسەر خۆی بخوێنینەوە و وەک نووسەر لە گرنگیی تێ بگەین. پاموک وەک خۆرهەڵاتییەک توند ڕیشەکانی لە ناو ئەو ململانێ کولتوورییە قووڵەوە هاتووە کە ئەمرۆ پێکڕای کۆمەڵگاکانی ئێمە پارچە پارچە دەکات، ململانێی سەختی نێوان مۆدێرنە و ترادسیۆن، ململانێی نێوان وێنەی ئێمە و نیگای ئەو، شەڕی نێوان دوێنی و ئێستا. پاموک کوڕی وڵاتێک و سەرزەمینێکە کە تەواوی ئەو ململانێیانە بەشێوەیەکی توند و خوێناوی دەژی. لەم کورتە باسەدا تەنیا دەتوانم لەسەر یەک کێشەی سەرەکی لای پاموک بووەستم، قسەکانم لە ئاست چوار ڕۆمانی سەرەکیدا



ڕادەگرم، هەڵبەت دەمویست قسەگەلێکی زۆر لەسەر کتێبی ڕەشیش بکەم، کە لە کارە زۆر گرنگەکانی پاموکە، بەڵام پێم باش بوو ئەوە هەڵگرم بۆ وتارێکی تایبەتی و لە ئێستادا تەنیا لە کێشەی ترادسیۆن و مۆدێرنە لای ئەم نووسەرە بدوێم.

قەڵای سپی یەکەمین ڕۆمانی پاموک بوو من خوێندبێتمەوە، لەگەڵ تەواوکردنی کتێبەکەدا ڕستەیەکی گیلبەرت، ک، چێستەرسنی ڕۆماننووس و وتارنووسی ئینگلیزیم هاتەوە یاد دەربارەی نووسەری بەناوبانگ تشارلز دیکنز، چێستەرسن دەڵێت: خوێنەری ئاسایی حەز دەکات بزانێت چۆن کتێبێک تەواو دەبێت، بەڵام خوێنەرانی دیکنز حەز دەکەن کتێبەکەیان هەرگیز تەواو نەبێت. ڕۆمانەکانی پاموک لە ڕووی هونەرییەوە هەمان وەسف هەڵدەگرن و پێکڕا هەمان سیحر و هێزی ڕاکێشانیان تێدایە. بەڵام پاموک تەنیا تەکنیکارێکی گرنگ نییە کە مرۆڤ ئاسان جێ پەنجەی نووسەرانی وەک ئەمبرتو ئیکۆ و کالفینۆ و کافکا لە ئیشەکانیدا دەدۆزێتەوە. بەڵکو پاموک بۆ ئێمە نووسەرێکە لەسەر تەوەرگەلێک دەنووسێت کە گرنگییەکی بێ وێنەیان بۆ تێگەیشتن لە تورکیا هەیە. واتە گرنگیی پاموک تەنیا لەو ستایل و شێوازە هونەرییە بەرزەدا نییە کە کاری شاکارنووسەکانی ئەدەبیاتی نوێمان بیر دەخاتەوە، بەڵکو لەوەدایە کە پاموک کێشەگەلێکی شارستانی و سیاسیی زۆر گرنگ لە ڕێگای ئەو شێوازەوە نیشان دەدات. لەو وتەیەدا کە ئۆرهان پاموک بەبۆنەی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵەوە خوێندیەوە، ئاماژەی بەخاڵێک دا کە بۆ تێگەیشتنی کارەکانی گرنگییەکی زۆری هەیە. ئەو ڕای وایە هەر کات وشەی نووسین دەبیستێت، مرۆڤێکی دێتە پێش چاو کە لەسەر مێزێک دانیشتووە و بەرەو ناوەوەی خۆی دەگەڕێتەوە، نووسین دۆزینەوەی کاراکتەرێکی شاردراوەیە لە ناوماندا، وەک پاموک دەڵێت، کاراکتەرێکی حەشاردراو کە لە ڕێگای نووسینەوە دووبارە دەیهێنینە دەرێ، نووسین گەڕانەوە یان دووبارە سەرکەوتن و دەرکەوتنەوەی ناوەوەیە لە قاڵبی وشەدا، ئیشێکە بەرهەمی ئیلهام نییە، بەڵکو بەرهەمی سەبر و سەرسەختییە. بەڵام ئێستا کە ئێمە کارەکانی پاموک دەخوێنینەوە، هەمان ئەو جۆرە گەڕانەوەیە دەبینین، هەمان ئەو پشکنینە قووڵە دەبینین، بەڵام وشەی ناوەوە لێرەدا مانایەکی قووڵتری لەو مانا خودگەرایە هەیە، کە تەنیا دەلالەت بێت بۆ گەڕانەوە

بەرەو خود، تەنیا مانای ئەوە بێت مرۆڤێک هەیە و بەرەو ناوەوەی خۆی وەک تاک دەگەڕێتەوە و ئەو تاقانەیی و تاکگەرابوونەی خۆی دەپشکنێت. کارەکانی پاموک کاری خودگەرا نین، ڕۆمانگەلێک نین کە لە نێو نەست یان هۆشیاریی فەردەکاندا نوقم بن. ڕۆحی تێکستەکانی پاموک لە تێکستی نووسەرە مێژووییەکانەوە نزیکترە وەک لە تێکستی ڕۆماننووسە ئاساییەکان. گەڕانەوەی نووسەر بۆ ناوەوەی خۆی، جیاوازییەکی نییە لە گەڕانەوەی مێژووی هەنووکەیی ئێمە بۆ ڕابوردووی خۆی. پاموک نووسەری ئەو سەفەرەیە، سەفەرێک بەرەو نادیار، کە هاوواتای نیشتەجێبوونێکی هەمیشەییە لە تەلیسمێکدا. گومان لەوەدا نییە کە شتێک لە ڕۆحی ڕۆمانی پۆلیسی لە زۆربەی بەرهەمەکانی پاموکدا هەیە، لە زۆر ڕانانەکاندا، هەندێک کتێبی پاموک وەک ڕۆمانی پشکنینی پۆلیسی پۆلێن دەکرێن. بەڵام لەگەڵ ئەم ڕەهەندەشدا کە تەشویق و کێشهێزێکی گەورەی بەکارەکانی پاموک بەخشیوە، دەبێت بڵێین کە پێکهاتی تەلیسم و نەدۆزراوە لای پاموک لە مانا قووڵەکەیدا، وەک لای ئەمبرتۆ ئیکۆش دەیبینین لە سنووری مانا پۆلیسییە ئاساییەکەی تێ دەپەڕێت و سروشتی پێوەندییەکی تەماوی و ئاڵۆز بەکۆی ڕابردووەوە وەردەگرێت. تەلیسمی گەورە لای پاموک پێوەندیی ئێستایە بەڕابردووەوە، ئیدی کۆی تەلیسمە بچووکەکان لای ئەو لە ژێر ئەم تەلیسمەدا کۆ دەبنەوە. لە وتە تایبەتییەکەی پاموکدا کاتی وەرگرتنی نۆبل، ئاماژەکردنی بەردەوامی پاموک بەجانتا ڕەشەکەی باوکی، کە باوکی دەستنووسە کۆنەکانی خۆی تیا داناوە و بۆ کوڕەکەی جێ هێشتووە. ئاماژەکردنێکی مەجازییە بەو تەلیسم و مانا و وێنە سەیر و چاوەڕواننەکراوانەی هەردەم لە ڕابردووەوە بۆمان دەمێنێتەوە.

لە ڕۆمانی ژیانی نوێدا، پاموک بەدوای ئەو تەلیسمە دەکەوێت، تەلیسمی پێکدادانی ئێستا بەڕابردوو. ژیانی نوێ یەکێکە لە ئیشەکانی پاموک کە لەوانەیە بەرتەقای بەفر یان ناوم سوورە یاخود قەڵای سپی بەناوبانگ نەبێت، بەڵام بەبڕوای من یەکێکە لەو کارە سەرەکییانەی پاموک کە دەروازەیەکی گەورەمان بۆ تەواوی کارەکانی دیکەی پێشکەش دەکات. کتێبەکە لە ڕووی ڕەمزییەوە یەکێکە لە دەوڵەمەنترین کتێبەکانی ئەم نووسەرە . ڕۆمانەکە حیکایەتی سەفەرێک و چیرۆکی



تەلیسمێکیشە، سەفەر و تەلیسم دوو بابەتن لە کارەکانی پاموک جیا نابنەوە، کتێبەکانی پاموک وەک زۆربەی ڕۆمانە گرنگەکانی دنیا سەفەرن بەناو نهێنییەکدا. هەردوو ئەم بابەتەش لە کتێبەکانی پاموکدا تا ڕادەیەکی زۆر سەمبولی سەفەری تورکیای نوێن بەدوای کاراکتەر و مانادا. ڕۆمانەکانی پاموک بێ هیچ چەندوچوونێک داستانی سەفەری ئەم وڵاتەن بەدوای شوناس و ڕوخساری ڕاستەقینەی خۆیدا لە سەرەمێکدا تورکیا لە هەر وڵاتێکی دیکەی خۆرهەڵات پتر تووشی تەنگژەی شوناس و گرفتی تێگەیشتن لە خود بووە، بەبێ ئەم خاڵە ناوەندی و سەنتراڵە، ئەستەمە بزانین پاموک لەو ساتەدا کە حیکایەت دەگێڕێتەوە، باسی چی دەکات. ڕۆمانی ژیانی نوێ بەراورد بەڕۆمانەکانی تری پاموک ئاڵۆزتر و دەستکردتر دەنوێنێت، پتر لە کارەکانی تری ئەم نووسەرە مرۆڤ هەست بەسوریالییەت و ناواقعییەت دەکات، ڕۆمانەکە خاڵی نییە لەو فەنتازیا سادەیەی کە لە گۆڤاری ڕەنگاوڕەنگی منداڵان یان لە هەندێک فیلمی هۆلیۆددا بەکار دێت. خوێندنەوەی هەندێک بەشی کتێبەکە بۆ کەسانێک کە ناتوانن بزانن پاموک دەیەوێت بڵێت چی، ئاسان نییە. ڕۆمانەکە حیکایەتی قوتابییەکی کۆلیژی ئەندازەیە بەناوی عوسمانەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان کتێبێک دەخوێنێتەوە و سەرلەبەر ژیانی دەگۆڕێت. کتێبێکە کتێبێکی ئاسایی نییە، بەڵکو ڕوناکییەکی بەهێزی لێ وەدەردەکەوێت کە سەرتاپای ژیان و هۆش و بیری ئەو کەسانە داگیر دەکات کە دەیخوێننەوە. هەر کەسێک ئەو کتێبە بخوێنێتەوە، تیشکی هەڵقولاوی نێو لاپەڕەکان تووشی خولیایەکی بەهێز و کۆنترۆڵنەکراوی دەکات و هێزێکی نهێنی پاڵی پێوە دەنێت بۆ دنیایەکی نوێ بگەڕێت، ناونیشانی کتێبە سیحراوییەکەش هەر ژیانی نوێیە. ژیانی نوێ لێرەدا مەجازێکە بۆ ئەو خولیایەی کە تورکیای نوێ لە ناوەوە داگیر دەکات، سەمبولی ئەو هەستە توند و خواستە بەهێزەیە کە تورکیا بۆ مۆدێرنەکردنی خۆی هەیەتی. بەڵام مرۆڤ دەبێت بەناو حیکایەتێکی ئاڵۆزدا بڕوات تا لە مانای ئەو کتێبی پڕ ڕۆشناییە تێ بگات، کە کاریگەرییەکی گێژکەر و هێزێکی ئەفسووناویی هەیە. بەدرێژایی ڕۆمانەکەی پاموک ئێمە شتێک دەربارەی ناوەڕۆک و جەوهەری کتێبەکە نازانین، بەڵام تێدەگەین ئەوانەی کتێبەکە دەخوێننەوە، فریشتەیەکی ڕزگارکەر دەبینن، یاخۆ لە ڕاستیدا

خولیای بینینی فریشتەیەکی فریادڕەس دەکەوێتە سەریان. عوسمان یەکەمین جار ئەو کتێبەی بەدەست جانانەوە دەبینێت، کە کیژە قوتابییەکی کۆلێژی میعمارییە. خولیای ئەوەی بزانێت ئاخۆ کتێبەکە بەهەمان شێوە کاریگەرییەکی وەها ئەفسووناویی لەسەر ئەو هەبووە، لە جانانی نزیک دەکاتەوە کە لە پێوەندییەکی خۆشەویستیدایە لەگەڵ محەمەددا کە ئەویش یەکێکە لە خوێنەرانی ئەو کتێبە ئەفسووناوییە. جانان، عوسمان و محەمەد بەیەکدی دەناسێنێت و لە ڕێگای محەمەدەوە تێ دەگات کە ژیانی ئەو کەسانەی کتێبەکە دەخوێننەوە لە مەترسیدایە، بەڵام عوسمان وەها شەیدای دونیای کتێبەکە و وەها عاشقی جانانیش بووە گوێ بەهیچ نادات و لە هیچ مەترسییەک سڵ ناکاتەوە. هێند نابات عوسمان، بەچاوی خۆی دەبینێت کەسێکی نەناسراو لە نزیک تاشقشڵە تەقە لە محەمەد دەکات. لە دوای ئەو ڕووداوەوە هەریەک لە محەمەد و جانان بەشێوەیەکی نادیار و تەلیسماوی ون دەبن و کەس جێگا و شوێنیان پێ نازانێت، ئیدی هەتا ئاشکرا نییە محەمەد بەکاری گوللەکان کوژراوە یاخۆ نا. دوای ئەو ڕووداوە عوسمان بەدوای جانان و بەدوای ئەو جیهانەش کە لە کتێبەکەدا هەیە، گەشتێکی دوور و درێژ دەست پێ دەکات، گەشتێک پێ دەچێت ئەوانەی کتێبەکە دەخوێننەوە و کاریان تێ دەکات پێکڕا مەحکوومی بن. گەشتێک بەئۆتۆبیسە نەفەر هەڵگرەکانی نێو تورکیا، گەشتێکی ناکۆتا و بێ ئاڕاستە و بێ خواست، گەشتێک کە مانگ لە دوای مانگ درێژ دەبێتەوە، عوسمان تەنیا ئیشی ئەوەیە لەم پاس دابەزێت و سوار ئەوی دی بێت. وەک ئەوەی پاموک بەم سەفەرە نارێک و خراپ و پڕ لە ڕووداوەی عوسمان، وێنەیەکی مەجازیی سەفەری تورکیامان لە ناو مۆدێرنەدا بۆ بکێشێت. دوای چەند ڕووداوێکی پاس کە هەردەم خەڵکانێکی تیا دەمرن، لە یەکێک لە ڕووداوەکاندا عوسمان، دووبارە جانان دەدۆزێتەوە کە ئەویش لە پاسێکی دیدا هەمانشێوە لە سەفەرێکی درێژ و بێهودەدا بەدوای محەمەد و دونیای ئەو کتێبەدا دەگەڕێت. وەک جانان دەیگێڕێتەوە دەبێت محەمەد لە ڕووداوێکی ئۆتۆبیسدا سووتا بێت، بەڵام ئەو لەو باوەڕەدایە محەمەد شوناسی خۆی لەگەڵ ڕێبوارێکی گەنجی دیکەدا گۆڕی بێت و خۆی کردبێت بەو مردووە تا خۆی ون بکات. لەوێوە ئیدی عوسمان دەبێتە هاوڕێی جانان و پێکەوە



درێژە بەو سەفەرە بێهودە و بێ ئاڕاستەیە دەدەن، ڕۆمانەکە هێند دیمەنی سەفەر و ڕێگاوبانی تێدایە، وەرگێڕی ئەڵمانی کتێبەکانی پاموک ئینگرید ئیرن لە فرانکفۆرتە ئەلگەماینە تزایتونگدا بەڕۆد نۆڤل ناوی دەنێت، واتە ئەو ڕۆمانانەی کە زۆربەی ڕووداوەکانی لە ڕێگاوباندا ڕوو دەدەن. دوای سێ مانگ هاتوچۆ و مانەوەی بەردەوام لە ڕێگاوباناندا، عوسمان و جانان، شەوێکی باران دووبارە لە ئۆتۆبیسێکدا ڕووبەڕووی ڕووداوێکی پێکدادان دەبنەوە و لەوێدا کچێک دەبینن لەگەڵ کوڕێکدا، کوڕەکە لە ڕووداوەکەدا دەمرێت و کچەکەش لە نێوان ژیان و مەرگدا دەستی جانان دەگرێت و دەکەوێتە قسەکردن دەربارەی ئەو فریشتە نادیارەی کە بینینی لای خوێنەرانی کتێبەکە خولیا و ئامانجێکی گەورەیە. کچەکە وا قسە لەگەڵ جاناندا دەکات، وەک ئەوەی ئەو فریشتەکە بێت، فریشتەیەک مرۆڤ تەنیا لە ساتی مەرگدا و لەودیو شووشەی ئۆتۆبیسێکەوە دەیبینێت. کیژەکە بەر لە مردنی ئەو ڕاستییە دەدرکێنێت کە خۆی و کوڕە دەستگیرانەکەی لەوانە بوون کە کتێبەکە شەیدای کردوون و کەوتوونەتە گەڕان بەدوای دونیای ئەودا، بەڵام پاش ماوەیەک دەستگیرانەکەی هەست دەکات کتێبەکە تەواوی ژیانی وێران کردووە و بڕیار دەدات بکەوێتە جەنگەوە لەگەڵیدا و دەبێت بەیەکێک لەوانەی لەگەڵ دکتۆر ناریندا دژی کتێبەکە شەڕ دەکەن. کیژەکە پەشیمانە لەوەی خیانەتی لە کتێبەکە کردووە. بەر لە مردنی ئەوە ئاشکرا دەکات، کە دوژمنانی کتێبەکە و پەیڕەوانی دکتۆر نارین لە شاری گودول کۆ دەبنەوە و دەبێت ئەوان هەوڵ بدەن پێش لە نەیارانی کتێبەکە بگرن و بەناوی ئەوانەوە خۆیان بکەن بەو کۆبوونەوەیەدا. ئاوها جانان و عوسمان لە ژێر ناوی عەلی قەرە و ئەفسون قەرەدا بەرەو گودول دەڕۆن و لەوێ بڕێکی گەورەی نهێنییەکان ئاشکرا دەبێت. دکتۆر نارین پیاوێکی پیرە، کە جانان و عوسمان دەگەنە ماڵی ئەوان تێ دەگەن ئەم دکتۆرە باوکی محەمەدە. دکتۆر کە پیاوێکی نیمچە شێتە، یەکێکە لە فانەتیک و کۆنزەرفاتیڤەکانی تورکیا، پاموک لە ڕێگای کاراکتەری دکتۆر نارینەوە وێنەیەکی واقعی ئەو پیاوە پیر و توندڕەوانەی تورکیا دەکێشێت کە دژایەتیی دونیای نوێ دەکەن. دکتۆر ڕای وایە شتەکان یادەوەرییان هەیە، ئەوانیش وەک مرۆڤ ڕووداو و یادگاری تۆمار دەکەن... لە یەکدی دەپرسن و ڕێکدەکەون و ڕاز

دەگۆڕنەوە، پێکەوە ئاهەنگێکی نهێنی ساز دەکەن کە ئێمە بەمۆسیقای ئەو ئاهەنگە دەڵێین: دنیا. بەڕای دکتۆر نارین دوژمنان لە پیلانێکی گەورەدا بۆ ئەوەی لە خشتەمان بەرن سەرەتا لە شتەکانی خۆمان دوورمان دەخەنەوە، تەکنۆلۆژیای نوێ کە تەباخی گاز و کۆکا کۆلا دەهێنێت، سەرەتای سڕینەوەی یادەوەری و داگیرکردنی ژیانمانە. دکتۆر نارین بۆ ئەوەی بەرگری لە شتەکان و یادەوەرییەکانی ناویان بکات تۆڕێک لە بازرگان و خەڵکی فانەتیکی وەک خۆی کۆ دەکاتەوە، کە ئیشیان پاراستنی شتی کەلەپووری و کەرەستەی کۆنە، ئیدی لە فانۆس و قەفەز و عەلادینەوە تا دەگاتە چەقۆ و تەپڵەکی جگەرە و باوەشێن و قەفەزی کەناری کە لە هەموو لایەکەوە کۆی دەکاتەوە و لە دوکانەکەیدا کەڵەکەیان دەکات، بێ ئەوەی بوار بەهیچ شتێکی نوێ بدات، ڕوو بکاتە فرۆشگاکەی. کاتێک کوڕە تاقانەکەی دکتۆر لە ئەستەمبولەوە نامە بۆ باوکی دەنێرێت و پێی دەڵێت نایەوێت چی تر بیبینێت، تووشی حەسرەتێکی گەورە دەبێت، بەوەدا دکتۆر پیاوێکی زەنگین و دەستکراوەیە، سیخوڕ و هەواڵگرێکی زۆر دەخاتە دوای محەمەدی کوڕی تا لە نهێنیی گۆڕان و تەلیسمی پشت چیرۆکەکەی تێ بگات. نازناوی سیخوڕەکانی دکتۆر نارین هەموویان بەنێوی مارکە جۆراوجۆرەکانی سەعاتەوەن، وەک زینات، سیکۆ، سەرکیسۆف. دکتۆر خۆی لە هەوادارانی کۆکردنەوەی سەعات و چەکە، شانازی بەوەوە دەکات کە تورکیا لە پێشی پێشەوەی وڵاتانی دنیادایە لە کڕینی سەعاتدا، شەرمی بەوەش نییە کە تورکیا چەک و سەعات بهێنێت، چونکە زەمەن و چەکداری موڵکی یەک نەتەوە نین، بەڵکو موڵکی هەموومانن. سیخوڕەکانی نارین شەو و ڕۆژ و لە گۆشەی جیاوازەوە چاودێریی محەمەد دەکەن. دکتۆر لە ڕێگای ڕاپۆرتی سیخوڕەکانەوە تێ دەگات، کە ئەوەی کوڕەکەی و خەڵکانێکی تریشی لە خشتە بردووە، کتێبێکی نادیارە کە کاریگەرییەکی تەلیسماوی و سیحراوی جێ دەهێڵێت. دکتۆر ئەمە بەبەشێک لەو پیلانە گەورەیە دەزانێت کە دژ بەو و دژ بەشارستانیەتی نەتەوەیی ساز کراوە. بڕیار دەدا هەموو نوسخەکانی ئەو کتێبە بفەوتێنێت و ئەوانەش لەنێو بەرێت کە بڵاوی دەکەنەوە. لە گەڕان و پشکنین و سۆراغیدا بەدوای ئەو کتێبەدا، لە ئەنجامی چاوەدێرکردنی بەردەوامی محەمەدەوە، ڕێگای دەچێتە سەر فەرمانبەرێکی پیری



هێڵی شەمەندەفەر بەناوی ڕفقیەوە. ڕفقی فەرماندەیەکی هێڵی شەمەندەفەرە کە ساڵگەلێکی زۆری تەمەنی لە پاڵ ئیشەکەیدا لە بەڕێوەبەرایەتیی هێڵی ئاسن، خەریکی نووسینی چیرۆکی منداڵان بووە، کۆنە دراوسێیەکی ماڵی عوسمان و دۆستێکی دێرینی باوکێتی، کە عوسمان لە منداڵیدا هاتوچۆی کردوون. بەوەدا لەو دەمەدا گۆڤارە ئەمریکاییەکانی منداڵان کە باس لە کاوبۆ و هیندیی سوور و هێڵی شەمەندەفەر دەکەن، فرۆشتیان زۆرە، ڕفقی بڕیار دەدات هەمان ئەو چیرۆکانە و بەهەمان ستایلی ئەمریکی بنووسێتەوە، بەڵام پاڵەوانێکی نەوجەوانی تورکی بۆ زیاد بکات و سەرجەم سەرکێشی و بوێرییەکان بەناوی ئەو نەوجەوانە تورکەوە لە ئەمریکا حیکایەت بکات. محەمەد ئەو ڕاستییەی دۆزیوەتەوە کە نووسەری کتێبی دنیای نوێ، هەر ئەو کەسەیە کە زنجیرە چیرۆکی منداڵانی پرتەو و پیتەری نووسیوە. چونکە محەمەدیش لە منداڵیدا وەک عوسمان شەیدای چیرۆکەکانی ڕفقی بووە. پاموک لێرەشدا وێنەیەکی کاریکاتێریی مۆدێرنەی تورکی دەکێشێت. مۆدێرنەیەک کە پتر لەوەی پڕۆژەیەکی ڕاستەقینە بێت، لە چیرۆکی کاریکاتێریی منداڵان دەچێت، مۆدێرنەیەک پتر لەسەر وەهم و خەیاڵاتی لاساییکردنەوە دروست بووە، نەوەک لەسەر نووسینی تێکستێکی نوێ. گەر دکتۆر نارین لە ڕۆمانەکەدا نوێنەری کاریکاتۆریی تورکێکی دەمارگیری بیر تەسک بێت کە لە دژایەتیکردنیدا بۆ دنیای نوێ دەست لە هیچ شتێک ناپارێزێت، ئەوا ڕفقی نوێنەری مۆدێرنەیەکی شەرمن و لاساییکەرەوە و کزۆڵەیە کە ناتوانێت بەرگری لە پڕۆژەی خۆی بکات. کە پیاوەکانی نارین دەزانن ڕفقیی کارمەند لە هێڵی شەمەندەفەر نووسەری ئەو کتێبەیە دەیکوژن. نارین سیخوڕ و هەواڵگرەکانی خۆی دەخاتە دوای هەر کەسێک کتێبەکە بخوێنێتەوە. تەواوی دۆسییە و نهێنیی ڕێکخراوەکەیشی دەخاتە ژێر دەستی عوسمان کە هەڵبەت بەناوی عەلی قەرەوە لە ماڵی دکتۆر وەک جوانێکی خۆبەخش خۆی دەردەخات کە هاتووە شەڕ لەگەڵ پیلانگێران و دوژمنانی کەلەپووردا بکات. نارین وەها خۆشحاڵ و سەرمەستە بەعوسمان لە فیکری ئەوەدایە بیکاتە کوڕی خۆی. عوسمان لە ڕێگای خوێندنەوەی ڕاپۆرتی سیخوڕەکانی دکتۆرەوە بۆی دەردەکەوێت کە تێوەگلانی ئەو لەم حیکایەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ پلانێکی پێشوەختی جانان و محەمەد کە کەوتوونەتە

سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کتێبەکە شتێک لێ بکەن و بیدەن بەیەکێک. عوسمان دڵنیایە کە محەمەد نەمردووە، بەڵکو لە ژێر ناوێکی دیکەدا لە جێگایەکی دیکەدا دەژی، بەوەدا لە ڕێگای ڕاپۆرتەکانی دکتۆرەوە زانیاریی لەسەر زۆربەی ئەوانە لە لایە کە سەروکاریان لەگەڵ کتێبەکەدایە و پیاوانی نارین چاوەدێرییان دەکەن، بڕیار دەدات یەکە یەکە بۆ ئەوانە بگەڕێت کە لە ژێر چاوەدێریدان تا محەمەد دەدۆزێتەوە، ڕۆژێک جانان بەنەخۆشی جێ دەهێڵێت و دووبارە دەکەوێتەوە سەر هەوای سەفەر و شارەوشارکردن و ئۆتۆبیس گۆڕین، تا دواجار لە شارێکدا محەمەد دەدۆزێتەوە، کە ناوی خۆی گۆڕیوە و خۆی ناو ناوە عوسمان، لەو شارەدا محەمەد تەنیا ئیشی ئەوەیە جار دوای جار کتێبەکە بەتاقەت و سەبرێکی زۆرەوە دەنووسێتەوە و دەیفرۆشێت و شتێک بۆ ژیان و بژێوی پەیدا دەکات. عوسمانی ڕاستەقینە و عوسمانی ساختە پێکەوە چەند پیاسەیەک دەکەن، بەڵام لە سەرەتاوە دەزانین کە عوسمان هاتووە محەمەد بکوژێت. هۆکاری پشت کوشتنەکە وا دەردەکەوێت ئەوە بێت کە جانان هەمیشە حەزی لە محەمەدە و بەهۆی خۆشەویستیی ئەوەوە ئازار زۆر دەکێشێت. دواجار عوسمان، محەمەد لە سینەمایەکدا دەکوژێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای جانان، بەڵام جانان ون دەبێت و نادۆزێتەوە. ئیدی ساڵان دەڕوات و عوسمان دەگەڕێتەوە بۆ لای دایکی و ژن دەهێنێت و دەبێت بەخاوەن کچێک، دەبیستێت کە جانان شووی کردووە و سەفەری کردووە بۆ ئەڵمانیا. کۆتاییی ڕۆمانەکە، چی تر گەڕانی عوسمان نییە بەدوای دنیای نوێدا، بەڵکو گەڕانێتی بەدوای خولیای ئەو فریشتەیەی کە خوێندنەوەی کتێبەکە لەگەڵ خۆیدا ڕای دەکێشێت، ئەو فریشتەیەش بەتەنزێکی ئاشکرا ڕێگایەکی کۆمیدیی بڕیوە، سەرەتا عوسمان لە ماڵی ڕفقی خەتدا دادەگرێت، ڕیشەی ئەو فریشتەیە لای ڕیلکەوە هاتووە، کاریگەریی ڕیلکە لەسەر ڕفقی دەدۆزێتەوە، بەڵام زوو دەگاتە ئەو بڕوایەی کە وێنەی ئەو فریشتەیە کە دوای کتێبەکە دەبێتە خولیامان، لە کاغەزی سەر جۆرە شیرینییەکی منداڵانەوە هاتووە کە نیگای ئەو فریشتەیەی لەسەرە، لێرەدا شیرینی و کەرەمێلا وەک سەمبولی تازەکردنەوە سەیر دەکرێت، کە منداڵانی نەوەی نوێی پێ پەروەردە دەبن. وەک ئەوەی پاموک گاڵتە بەسەرجەمی ئەو ڕەوتە بکات کە مۆدێرنە بڕیوێتی، بەدوای سەرچاوەی



ئەو فریادڕەسە خورافییەدا دەگاتە لای پەروین ئاغا ناوێکی کوێر کە خاوەنی کارخانەی کارمێلاکە بووە و منداڵان هەموو لە شیرینییە فریشتەدارەکەی ئەویان خواردووە... کۆتاییی ڕۆمانەکە ئاڵۆز و تەنزئامێز و تاڵە. عوسمان دوای ئەوەی نهێنیی فریشتەکەی لای ئەو خاوەن فابریکە کوێرە دەست دەکەوێت، دەزانێت ئەو فریشتەیە هیچ نییە جگە لەو فریشتە شینەی ڕۆمانەکەی هێنریش مان کە مارلین دیتریش ژنە ئەکتەری بەناوبانگی ئەڵمان ڕۆڵی تیا دەبینێت. واتە لە ڕاستیدا هیچ نهێنییەک لە گۆڕێ نییە، زیندەگیی نوێ و نیگای فریشتە سیحرییەکەی ئەو مانا شاردراوە و قووڵەیان نییە کە عوسمان چاوەڕانیی دەکرد. ئیدی نائومێد دەگەڕێتەوە و لە ڕێگا لە ساتێکدا کە خەریکە ئۆتۆبیسەکەیان بەجۆرێکی کوشندە خۆی دەدات بەئۆتۆبیسێکی دیکەدا عوسمان بەڕوونی ئەو فریشتەیە دەبینێت. ئەو فریشتەیە هیچ نییە جگە لە فریشتەی مەرگ، ئەو کتێبەش هیچ نییە جگە لە کتێبی مەرگ. خەونی ژیانی نوێ بەو جۆرەی کە دێتە تورکیا، بەڕێگایەکی پووچ و بێ مایە و بێ ناوەڕۆکدا دەڕوات و لە کۆمەڵێک پێکدادان و بەریەککەوتنی کوشندە و پوچگەرادا تەواو دەبێت.

ئاشکرا نیگای پاموک بۆ کێشەی ترادسیۆن و مۆدێرنە، نیگایەکی تراژیدییە کە تا ڕادەیەک لە پووچی مۆدێرنەی تورکی و بەربەریەتیی ترادسیۆن نائومێدە.

پاموک خۆی لە یەکێک لە چاوپێکەوتنەکانیدا دەڵێت ئەوەی دوو کیشوەر، دوو کولتوور، دوو ڕۆحی هەبێت، حەکیمتر، زیرەکتر، کامڵترە. بەڵام دوای خوێندنەوەی ڕۆمانی ژیانی نوێ، مرۆڤ دەگاتە ئەو بڕوایەی کە کێشەی گەورەی تورکیا ئەوەیە کە نایەوێت دوو کولتوور، دوو ڕۆح ، دوو کیشوەری هەبێت، نیوەی تورکیا ئێستا بەلای بەشێکی ئەو ڕۆحە و نیوەکەی دی بەلای بەشەکەی دیکەی ئەو ڕۆحەدا دەڕوانێت. ئەوەش گرفتێکی کوشندەی بۆ ئەم وڵاتە دروست کردووە.

لە ڕۆمانی قەڵای سپیدا پاموک یەکێک لە شاکارە گەورەکانی خۆیمان پێشکەش دەکات، گەرچی من ئێجگار سەرسامم بەڕۆمانی ناوم سوورە، بەڵام وەک تێکستێکی هونەری قەڵای سپیم پێ کامڵتر و وەستایانەترە، لەگەڵ کورت و بچووکیی ڕۆمانەکەدا دەسەڵاتی پاموک بەسەر مەتریال و کاراکتەر و گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا لە لوتکەدایە. لەم ڕۆمانەشدا دیسان سەنتەر و بابەتی کارەکە بەتەواوەتی لەسەر

خۆرهەڵات و خۆرئاوا یان دونیای ئیسلام و دونیای مەسیحییەتە. وەک ئەوەی کۆی ڕۆمانەکە بانگەوازێکی گەورە بێت بۆ پێکەوە ژیان. ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە لە پێش زەمانی حوکمڕانیی سەدری ئەعزەم کۆپرولو و لە سەردەمی ئەودا ڕوو دەدەن. کاتێک حیکایەتخوانی چیرۆکەکە، کە گەنجێکی ئیتالییە بەکەشتی لە ڤینیسیاوە بەرەو ناپۆلی دەڕوات، چەند کەشتییەکی تورک ڕێگایان پێ دەگرن و بەدیل دەکەوێتە دەست جەنگاوەرانی عوسمانی کە لەگەڵ کۆمەڵێک دیلی دیکەدا دەیبەن بۆ ئەستەمبول. کابرای ئیتالی کە لە گەلێک ڕشتەدا قاڵ و لە زۆر لکی زانستدا شارەزاییی هەیە، بۆ ئەوەی کاری قورسی پێ نەکەن، خۆی بەپزیشک نیشان دەدات و لە چاکردنەوەی چەندین نەخۆشدا بەشداری دەکات و زۆربەی دەرمان و داروووەکانی کاریگەریی باش لەسەر نەخۆشەکان جێ دەهێڵن. لە ماوەیەکی کورتدا ناوبانگی دەگاتە لای پادشا و ئەویش بۆ دەردی تەنگەنەفەسی داوای کۆمەکی لێ دەکات، وا دەبێت کە دەرمانەکانی پادشا چاک دەکەنەوە. ئەوە دۆخی لە زیندان باشتر دەکات و ئومێدێکی بۆ ئازادی لا پەیدا دەبێت. بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بخاتە دۆخێکەوە هەرچی زووتر بگەڕێتەوە بۆ نێو کەسوکاری خۆی، فێری تورکی دەبێت، بەڵام پادشا و نزیکانی، کە جار جار سوود لە بەهرەی دەبینن، دەیخەنە ژێر فشاری ئەوەی ببێتە موسڵمان و دەست لە مەسیحییەت بەردا، بەڵام هەوڵەکانیان بێ سوود و بێ ئەنجام دەمێنێتەوە. پادشا کە تا ڕادەیەکی زۆر لە زانیاری و توانای ئەم دیلە دڵنیایە، دەیبەخشێتە یەکێک لە پیاوە زاناکانی خۆی کە بەخواجا دەناسرێت. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە خواجا و کۆیلەکەی زۆر لەیەک دەچن، بەسەر و ڕووخسار مرۆڤ ناتوانێت لە یەکیان جیا بکاتەوە، وەک دووانە وەهان. ڕۆمانەکە چیرۆکی سەیر و سەمەرەی پێوەندیی خواجایە بەکۆیلەکەیەوە، پێوەندییەک کە پڕە لە کێشمەکێش و ڕەهەندی پڕ ناکۆکی. بەسەرێک لە پێوەندیی مامۆستا و قوتابی دەچێت، چونکە خواجا خۆی دەیەوێت چ زانیارییەک لای کۆیلەکەی هەیە فێری بێت، بەڵام بەسەرێکی دی خواجا هەردەم دەیەوێت خۆی وەک بلیمەتێکی بێ وێنە و هاوشێوە ئیتالییەکەی وەک گەمژەیەک نیشان بدات. لێرەوە پێوەندیی نێوانیان تێکەڵەیەکە لە نزیکبوونەوە و نەفرەت، یەکدی ئازاردان و لێبووردن، ڕق و بەزەیی، ڕێز و قێز. تەواو وەک پێوەندیی خۆرهەڵات بەخۆرئاواوە، کە



لە زۆربەی فۆرمەکاندا لەسەر ئەوە دروست بووە، بۆیەکی بسەلمێنن کامیان لە کامیان بڵندتر و بەهێزتر و زیرەکترن. پاموک لە ڕێگای پێوەندیی خواجا و کۆیلەکەیەوە، بڕگەیەکی گرنگ لە مێژووی خۆرئاوا و خۆرهەڵاتمان بۆ دەگێڕێتەوە. من ڕۆمانەکە وەک ڕۆمانی ڕۆبنسۆن کرۆسۆی دانیال دیڤۆ دەبینم، وەک چۆن دانیال دیڤۆ، لە ڕێگای پێوەندیی ڕۆبنسۆن کرۆسۆ و فرایدەیەوە پێوەندیی خۆرئاوا بەدەرەوەی خۆی دەخوێنێتەوە، پاموک لە ڕێگای ئەم ڕۆمانەوە پێوەندیی جیهانی ئیسلامی بەدەرەوەی خۆی دەخوێنێتەوە. بەڵام گرنگیی تێکستەکە لەوەدایە، حیکایەتەکە لەبری ئەوەی لە زمانی پیاوی سەردەستەوە واتە خواجاوە بگێڕدرێتەوە، وەک لای دانیال دیڤۆ دەیبینین، لە زمانی کۆیلەوە واتە لە زمانی فرایدەیەوە دەگێڕدرێتەوە. ئەم دەستکاریکردنە لە ڕوانگەدا، ئێجگار گرنگە بۆ ئەوەی تێ بگەین تێکستەکەی پاموک هەڵگری ئەو کینە دینی و ئەتنییە نییە کە تێکستەکەی دانیال دیڤۆ هەڵگرێتی. ڕۆمانەکە دەست لەوە ناپارێزێت وێنەیەکی کاریکاتێری بۆ خواجا بکێشێت. خەیاڵاتەکانی خواجا، نمونەیەکی دیکەی تێگەیشتنی پڕ خورافەتی ئێمەی خۆرهەڵاتییە لە زانست. خواجا نمونەی ئەو زانایەیە کە نە پرسیارە ڕاستەقینەکان و نە وەڵامە ڕاستەقینەکان دەدۆزێتەوە، ژیانی لە کێشەی وەهمی و هاوکێشەی خەیاڵیدا دەباتە سەر، بەڵام پێشی وایە کە تەمەن و کاتی خۆی هەمووی تەرخانی فێربوون و زانست کردووە. خواجا هەردەمە خەریکی کێشەیەکە، بەڵام چۆنێتیی تەماشاکردنی بۆ ئەو کێشانە دوورە لە مامەڵەی عەقڵانی و زانستییەوە. سەردەمانێک خواجا خەریکی فەلەکناسی دەبێت، دەکەوێتە خەیاڵاتی ئەوەی لە نێوان زەوی و مانگدا ئەستێرەیەکی تر هەیە و دەبێت بیدۆزێتەوە، وا بیر لە ئەستێرەکان دەکاتەوە وەک ئەوەی مەخلووقاتی زیندوو بن و بیر بکەنەوە و بەوردی ئەندازە و ماتماتیک بزانن. دواتر دەکەوێتە سەر خولیای نووسینی کتێبێک لەسەر مێروولە، لە زۆربەی پڕۆژەکانیدا خولیای سەرەکیی ئەوەیە سەرنجی پادشا ڕابکێشێت و ئافەرینی ئەو وەربگرێت. ماوەیەک دواتر دەست لەو پڕۆژانە بەردەدات و سەروەختێک خولیای ئەوە دەکەوێتە سەریەوە، بزانێت گەمژەکان بۆ وا مەگژەن؟ دواتریش دەیەوێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە کە من بۆ منم؟ ڕۆژگارێک پێی وایە بەندەکە دەتوانێت

بیر و خەیاڵاتی خەڵکی تر بخوێنێتەوە، بەڵام نایەوێت ئەو فێر بکات، ماوەیەک بەردەوام بەکورسییەکەی خۆیەوە دەیبەستێتەوە و ناچاری دەکات خراپەکانی خۆی تۆمار بکات، تا تێ بگات ئەو بۆ ئەوە. ئیدی وای لێ دێت خواجا خۆشی دادەنیشێت و خراپەکانی خۆی دەنووسێتەوە. لە ڕێگای گێڕانەوەی وردی ژیانی خۆیانەوە هەردووک بەوردی شارەزای ڕابردووی یەک دەبن، خواجاش فێری ئیتالی دەبێت، ئیدی تەواو وەک دوانەیەکی ڕاستەقینەیان لێ دێت کە هەریەکەیان دەتوانێت ئاوێنەی ئەوی دی بێت. بەپێی ئەو وێنەیەی پاموک دەیکێشێت، مرۆڤ تێ دەگات، خۆرهەڵات و خۆرئاوا دوو منداڵی دوانەن، بەڵام لە پێوەندییەکی نەخۆشدا دەژین و فیگەرە خۆرهەڵاتییەکەش بێ ئەندازە نوقمی خورافاتی خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانن پێکەوە ئیش بکەن، دەتوانن هەردوولا لەسەر یەک مێز دانیشن و لەیەک فێر بن، بەڵام وەک دەردەکەوێت ئەو دانیشتن و کۆبوونەوەیە پڕ کێشە و گرفت و شێوازی ناعەقڵانییە. خواجا لەم ڕۆمانەدا نوێنەری دین و کولتووری خۆرهەڵات نییە، بەڵکو نوێنەری تێگەیشتنی خۆرهەڵاتییە لە زانست، نوێنەری یەکەمین پێوەندیی ناعەقڵانی خۆرهەڵاتە لەگەڵ ئەو دەستکەوت و خەیاڵە زانستییانەی ڕێنیسانسی ئەوروپی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. گرفتەکە ئەوەیە کە ئەم نوێنەرە خورافییەی زانست و تازەگەری لە ناو کولتووری ئیسلامیدا شوناسی ڕاستەقینەی ئاشکرا نابێت. خواجا، بێ ئەوەی بووبێتە خاوەنی عەقڵییەتێکی زانستیی ڕاستەقینە، هەندێک جار ڕۆڵی مونەجیمە کۆنەکان بۆ پادشا دەبینێت. دووریی عەقڵی خواجا لە زانستەوە تەواو لە ڕۆژگاری تاعووندا ئاشکرا دەبێت. هەرچەند کۆیلە ئیتالییەکەی دەیەوێت خواجا تێ بگەیێنێت کە تاعوون نەخۆشییەکی دەستپردە و لە مرۆڤەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ، بەڵام خواجا پێکەنینی بەو قسانە دێت و لای وایە گەر مرۆڤ ڕۆژی تەواو بوو لە هەر جێگایەک بێت مەرگ دێتە میوانی. کۆیلە ئیتالییەکە تێ ناگات، ئازایەتی بەو مانایەی خواجا باسی لێوە دەکات مانای چی، ئەو باوەڕی بەو لۆژیکە زانستییە هەیە کە تاعوون نەخۆشییەکی ترسناکە و دەشێت مرۆڤ لە یەکێکی دییەوە وەری بگیرێت و بمرێت، بەڵام خواجا بەپێلەرزۆک و ترسنۆک ناوی دەنێت. لە ڕۆژگاری تاعووندا جیاوازیی نێوان هەردوو ئەو ڕۆحە ئاشکرا دەردەکەوێت. بەڵام مەترسیی ئەو گیانی



خورافەتە ئەو کات تەواو دەردەکەوێت کە خواجا دەیەوێت چەکێکی زۆر کاریگەر و کوشندە بۆ پادشا دروست بکات، تا بتوانێت دوژمنانی ئیسلام تارومار کات. کۆتاییی ڕۆمانەکە باسی ئەو چەکەیە کە خواجا و کۆیلەکەی شەش ساڵ کاری لەسەر دەکەن و دواجار دەبێتە بەشێک لە هێزی سەربازی عوسمانی و سوڵتان دەیخاتە ژێر فەرمانی ڕاستەوخۆی خۆیەوە، بەڵام ئاشکرایە کە چەکێکی بێ سوودە، لە پەلامارەکاندا ڕۆڵێکی گرنگ نابینێت، دواجار لەشکرکێشیی سوڵتان بۆ سەر پۆڵۆنییەکان، لە ئاست قەڵایەکی سپییدا تووشی نوشوستی دێت، دوای چەندین هێرش عوسمانییەکان لە ئاست قەڵاکەدا دەستەوەستان دەبن، پادشا بڕیار دەدات ئەو چەکە گەورە و تایبەتییەی خواجا بخاتە شەڕەوە، بەڵام خواجا دڵنیایە کە گەر چەکەکەی نەتوانێت شەڕ بباتەوە، لەوانەیە سوڵتان کۆیلەکەی بەمەرگ سزا بدات. هەر ئەو شەوە بڕیار دەدا لەگەڵ کۆیلە ئیتالییەکەیدا جێگای خۆیان بگۆڕنەوە. چونکە تەنیا بەو ڕێگایە دەتوانێت ژیانی کۆیلەکەی ڕزگار بکات، کە بەشێک لە سەربازەکان بەکافر و جاسووس و مایەی بەدبەختی تاوانباری دەکەن. چەندین ساڵی پێکەوە ژیانی خواجا و هاوشێوەکەی، هەردووکیانی بەجۆرێک وەک یەک لێ کردووە، هەمان خەون و هەمان خولیایان هەیە، ئەوەی خواجا بیری لێ دەکاتەوە لای کۆیلەکەیە و ئەوەی کۆیلەش بیری لێ دەکاتەوە لای خواجایە. هەردووکیان زۆر شت لەسەر ژیانی ئەوی تر دەزانن و هەردووکیشیان بەڕووخسار وەک یەکن. شەوی پێش پەلاماری قەڵای سپی، کۆیلە ئیتالییەکە تێ دەگات خواجا دەیەوێت خۆی بکات بەو و بڕوات بۆ ئیتالیا و ژیانی ئەو بژی، دووبارە تا بەیانی هەموو شتێکی لەسەر ژیانی خۆی بۆ دووبارە دەکاتەوە، هەموو ئەو وردەکارییانەی فێر دەکات کە بۆ نیشتەجێبوونەوەی لە ئیتالیا پێویستی پێیەتی، دەمەوبەیان خواجا دەڕوات و کۆیلەکەش دەبێت بەخواجا و جێگای ئەو دەگرێتەوە.

پاموک لەم ڕۆمانەدا جگە لە دەرخستنی ئەو دیوە ناکۆک و پڕ گرفتانەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا پێکەوە کۆ دەکەنەوە، باس لە تێکەڵاوی و وەک یەکی و هاوشێوەیی و یەک جەوهەریی هەردوو دونیاکەش دەکات، خواجا دەڕوات بۆ ئیتالیا و لەوێ وەک ئەوەی ئەو لە نێو تورکاندا غەریبە بووبێت، ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکات، بەچاوی

غەریبەیەک لەسەر تورکان دەنووسێت، ناوبانگ پەیدا دەکات و زەنگین دەبێت. کۆیلەکەش ژیانی خواجا دەژی، ئەو خەونانەی خواجا جێبەجێ دەکات... خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەکرا یەک بن، دەکرا بچنە جێگای یەک، دەکرا بەپلەیەک لەگەڵ یەکدا تەماهی بکەن و چۆنایەتیی یەک هەڵگرن کە لێک جیا نەکرێنەوە. لەبەر ئەم تێڕوانینە قووڵەیە، هانز پیتەر کونیش لە ڕۆژنامەی دی تزایتدا دەنووسێت هیچ کەسێک نییە، وەک پاموک، ئەگەری بوونی پێکەوەییی نێوان ئیسلام و خۆرئاوای بەرجەستە کردبێت.

لە ڕۆمانی ناوم سوورەدا ململانێی نێوان مۆدێرنە و ترادسیۆن بەجۆرێکی تر چڕ دەبێتەوە، هاتنی خۆرئاوا دەبێتە کێشەیەکی ناوەکی و قووڵی خۆرهەڵات خۆی، دەبێتە کێشەی مۆدێرنە و ترادسیۆن و لەوە دەردەچێت، کێشەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بێت. ئەم ڕۆمانە مێژووییترین کاری پاموکە، خوێنەری ئەم ڕۆمانە بەو هەموو زانیارییەی سەرسام دەبێت کە پاموک لەسەر هونەری خۆرهەڵاتی کۆن و هونەری میناتۆری ئێرانی و نەخشی چینی و مێژووی ڕێباز و قوتابخانە دێرینەکانی دنیای ئیسلام هەیەتی. توانای پاموک لەسەر خوڵقاندن و سازاندنەوەی فەزای سەدەی شازدەدا بێوێنە و بلیمەتانەیە. ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٩٠ی زاینی. بەپێچەوانەی ڕۆمانەکانی تری پاموکەوە، ئەم ڕۆمانە بەشێوازی پۆلیڤۆنی نووسراوە، تێکستێکە کە تێیدا مردووەکان و سەگ و پارە و درەخت و ئەسپیش قسە دەکەن. لە بنەڕەتدا دستۆفسکی داهێنەری ئەم شێوازە تەکنیکییەیە، دواتر فۆکنەر گەشەی پێ دەدات، مارکیزیش لە پایزی پەتریارکەکەیدا ڕووخسارێکی نوێی پێ دەبەخشێت، بەڵام بەکارهێنانی پاموک بۆ ئەم شێوازە تەکنیکییە، تایبەتمەندیی خۆی هەیە، پاموک بەجۆرێک ئەم تەکنیکە بەکار دەهێنێت کە زۆر بەشێوازی فۆکنەر نزیکە، بەڵام لە ستایلی ئەو فراوانتر و بەربڵاوتر و ئۆرگانیترە. ڕۆمانەکە بەڕای ژمارەیەکی زۆر لە ڕەخنەگران نزیکییەکی گەورەی لەگەڵ ڕۆمانی ناوی گوڵی ئەمبرتۆ ئیکۆدا هەیە. ئەگەر بزانین ناوی گوڵ لە هەندێک لە زمانە ئەوروپییەکاندا بەناوی گوڵی سوور وەردەگێڕدێت، ئیدی دەزانین کە نزیکی لە ناونیشانەکانەوە دەست پێ دەکات. لە ناوەڕۆکیشدا هەردوو ڕۆمانەکە چیرۆکی



زنجیرەیەک کوشتنە کە بەهۆکاری دینی و لە فەزایەکی پڕ لە تابۆ و حەرامدا ئەنجام دەدرێن، لێکچوونەکان لە نێوان ئەو دوو ڕۆمانەدا بەئەندازەیەک زۆرن کە وتارێکی تایبەتیی دەوێت، هەندێک لە پاداشتی ئەو نزیکییەدا پاموک بەئیکۆی تورکیا ناو دەبەن، بەڵام ئەوەی سەرنج بدات دەبینێت کە لە شێوازی قسەکردن و دونیابینیی کاراکتەرەکاندا، هەناسە و ستایلی ئیتالۆ کالڤینۆش ئامادەگییەکی بێ وێنەی هەیە. بەڵام لەوانەش بترازێت، من هەست بەکاریگەری و هەناسەی نووسەرێکی گەورەی وەک ئەمین مەعلووف دەکەم، کە تاکە نووسەرێکی گەورەی خۆرهەڵاتە پێش پاموک بەو قووڵی و چڕییە لەسەر مێژووی دێرینی ئیسلام و ناوچەکە کاری کردبێت، مرۆڤ لە خوێندنەوەی قەڵای سپی و ناوم سوورەدا نابێت سێبەری مەعلووف فەرامۆش بکات.

ڕۆمانەکە بەکوشتنی زەریفە فەندی دەست پێ دەکات، کە بەر لە هەموو قسەکەرەکانی دی دێت و لە مەرگەوە قسەمان بۆ دەکات. هۆکاری کوشتنەکەی زەریفە فەندی ئاشکرا نییە، بەڵام خۆی پێمان دەڵێت، لە پشت مردنیەوە هێزێک وەستاوە کە دژی ئیمان و ترادسیۆن و جیهانبینیمانە، داواش دەکات ئەو بکوژە بدۆزینەوە. زەریف یەکێکە لە چوار نیگارکێش کە لە وەرشەنیگاری وەستا عوسماندا ئیش دەکەن، کەسێکە لە بواری زێڕکاری و ڕازاندنەوەی قەراغ و نەخشکردندا دەست و پەنجەیەکی زێڕینی هەیە. بەڵام کوشتنی ئەو تاکە تاوانی ناو ڕۆمانەکە نییە، هێند نابات زاواش کە نیگارکێشێکی شوێن باوەڕی سوڵتانە دەکوژرێت. زاوا باوکی شەکوورەیە، ئەو کیژە قەشەنگەی کە قەرە لە دوازدە ساڵییەوە خۆشی دەوێت. چەند ساڵێک لەوەوبەر کە قەرە دان بەخۆشەویستیی خۆیدا دەنێت بۆ شەکوورەی پوورزای، زاوا لە ماڵ دەیکاتە دەرێ و ئیدی بۆ فێربوونی نیگارکێشان دەکەوێتە سەفەرێکی درێژ بەشارە گەورە و گرنگەکانی خۆرهەڵاتدا و لەسەر دەستی نیگارکێشە گەورەکاندا فێر دەبێت، دواتر لەسەر داوای زاوا دەگەڕێتەوە تا لە نەخشکردن و دروستکردنی کتێبێکی نهێنیدا کۆمەکی پێ بکات. زاوا ساڵانێک پێشتر بەئیشی سوڵتان ڕووی لە ڤینیسیا کردووە، لەوێ کاری هونەرمەندانی نوێی ئەوروپایی بینیوە، ئەو تابلۆیانەی بینیوە کە دەروازەی ڕینیسانسی ئەوروپین، بەشێوەیەکی

سەیر کەوتووەتە ژێر کاریگەریی هونەری فەرەنگییەکانەوە. ئەم کاریگەرییە دەرەنجامێکی کوشندەی لەسەر چارەنووسی خۆی و زەریفە فەندی دەبێت. لە هونەری ئیسلامیدا هونەرمەند بۆی نییە نە کاراکتەری تایبەتی شتەکان و نە بۆچوون و گۆشەنیگای شەخسیی خۆی بخاتە ناو تابلۆوە، تاکە شتێک دەتوانێت بیکات ئەوەیە شتەکان لە گۆشەنیگای ئیلاهییەوە ببینێت، چونکە هەر جۆرە ئیجتیهادێکی تایبەتی وەک لاساییکردنەوەی خالقی لێ دێت، ئەوەش کوفرێکی گەورەیە. هەڵبەت نوێکردنەوە لە هونەری ڕینیسانسی خۆرئاواییشدا تا ئەندازەیەکی زۆر لەسەر مەسەلەی ڕوانگە داڕێژراوە، کە بوار بۆ هونەرمەند دەکاتەوە لە گۆشەنیگای خۆیەوە دنیا ببینێت. مەسەلەی ڕوانگە واتە مرۆڤ خۆی شتەکان وەها بخولقێنێتەوە وەک ئەوەی چاوی خۆی دەیانبینێت، ئەوەش بەتەفسیری ئیسلامی خۆ خستنەجێگای خالیقە. بەڵام زاوا کە لە سەفەری ئەوروپا دەگەڕێتەوە و هەوای لاساییکردنەوەی ئەوروپییەکان پەڕیوەتە سەری، دەیەوێت شتێکی نوێ بهێنێتە ناو سەرای پادشایانی عوسمانییەوە، شتێک ئەو ترادسیۆنە دووبارە نەکاتەوە کە مامۆستایانی گەورەی هونەری ئیسلامی و وەستا گەورەکانی هیرات و تەورێز پەیڕەویان کردووە. پادشا تەواو دەچێتە ژێر کاریگەریی زاواوە و دەکەوێتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کتێبێکی ڕەنگاوڕەنگی قەشەنگ کە هونەری بەرزی خۆرهەڵات نیشان ئەوروپاییەکان بدات پێشکەش بەیەکێکە لە دۆقە گەورەکانی ئیتالیا بکات، بڕیارە لە ناوەڕاستی کتێبەکەدا، وێنەیەکی چێوە زێڕی سوڵتان خۆی بەشێواز و ستایلی فەرەنگییەکان کتێبەکەی ڕازاندبێتەوە، سوڵتان بۆ ئەم کارە لەبری وەستا عوسمان، زاوا دەکاتە سەرپشکی پڕۆژەکە، کە هەڵبەت ئێرەیی و وەرزییەکی زۆر لای وەستا عوسمان و لە نێو شاگردەکاندا دروست دەکات. بەڵام هەمووش دەزانن کە زەریف لە دروستکردنی ئەو کتێبەدا کە زۆر نهێنی و تایبەتییە کۆمەک بەزاوا دەکات. زاوا و زەریف پڕۆژەکە وەها دەخەنە قاڵبێکی نهێنی و تەلیسماوییەوە، فزوڵی زۆربەی شاگرد و وەستاکانی نەخشخانەکەی عوسمان دادەگیرسێنێت. دوای کوشتنی زەریف و زاوا ئیدی ئاشکرایە کوشتنەکە هۆیەکی تایبەتی لە پشتە و سوڵتان کە زۆر نیگەرانە و هەست دەکات پیلانێک دژ بەکتێبەکەی لە گۆڕێیە، هەریەک لە عوسمان و



قەرە دەگرێت و مۆڵەتی سێ ڕۆژیان دەداتێ پیاوکوژەکە بگرن. تێوەگلانی قەرە لە مەسەلەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ بابەتی سەنتراڵ و سەرەکیی ڕۆمانەکە کە عەشقی هەمیشەییی قەرەیە بۆ شەکوورە. لەو چەند ساڵەدا کە قەرە ئاوارە دەبێت و بۆ فێربوون دەبێتە وێڵگەردی شار و قوتابخانە دوورەکان، شەکوورە شووی کردووە بەجەنگاوەرێک و دوو کوڕی بووە، بەڵام مێردەکەی چوار ساڵە بێ سەروشوێنە و لە مەیدانی جەنگ نەگەڕاوەتەوە، لەو نێوەندەشدا حەسەنی برای مێردەکەی شێتانە عاشقی شەکوورە بووە و دەستی لێ بەرنادات و دەیەوێت لە ماڵی خەزووری بمێنێتەوە و ڕێگا خۆش دەکات بۆ ئەوەی ڕۆژێک بیخوازێت. شەکوورە لەبەر فشاری بێوچانی حەسەن دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی واتە بۆ لای زاوا، بەڵام شەکوورە هەمیشە دوودڵە و نازانێت لە نێوان قەرە و حەسەندا کامیان هەڵبژێرێت. لە نێو ئەو هەموو دوودڵی و پیلان و پرسیارانەدا، ڕۆژێک شەکوورە دوای کورتە ژوانێک لەگەڵ قەرەدا دەگەڕێتەوە و دەبینێت باوکی کوژراوە، بۆ ئەوەی مردنی باوکی نەبێتە ڕێگر لە نێوان ئەو و قەرەدا، قەرە ناچار دەکات لای قازی و بەپارە و بەڕێگای پێچاوپێچ بێوەژنبوونی شەکوورە بەشەرعی بناسێت و ڕایبگەێنێت کە بەهۆی مردنی مێردەکەیەوە، شەکوورە شووی دێت و مێردکردنی حەڵاڵە. بەو جۆرە و بەشەرعی و بەنووسراوی قازی شەکوورە و قەرە دەبنە ژن و مێرد. بەڵام شەکوورە بەقەرە دەڵێت، گەر تاوانی کوشتنی باوکی ڕوون نەکاتەوە و بکوژی ئەو دەستگیر نەکات، دەستی پیا ناگات و پێی شاد نابێت. لەوێدا حەسەن کە ئێرەیی کوشتوێتی هەریەک لە قەرە و شەکورە بەکوشتنی زاوا و شاردنەوەی مردنەکەی تاوانبار دەکات، کە دواجار دەبێتە مایەی گرتنی قەرە. دەبێت بڵێم کە سروشتی پۆلیسیانەی چیرۆکەکە، ڕێگا لەوە ناگرێت پاموک لەو هێڵە فەلسەفی و هونەرییە دوور بکەوێتەوە کە ڕۆمانەکە خاوەنێتی. زۆر ڕۆمانی گەورەی دنیا ئەو نەفەسە پۆلیسییەیان تێدایە، بەڵام ڕۆمانە گەورەکان لە پاڵ ئەو هەناسەیەدا هێڵێکی فیکری و فەلسەفی یان هەوایەکی سایکۆلۆژی یاخۆ فەزایەکی میتافیزیکی و سوریالییان هەیە، کە ڕۆمانی پۆلیسی ئاسایی نییەتی. لێرەدا هەڵەیە وا تێ بگەین پاموک ڕۆمانێکی پۆلیسیی ئاسایی نووسیوە. بەپێچەوانەوە، پاموک پێ دەچێت لێرەدا شتێک لەو تێبینیانەی سارتەر

نزیک بێت، سارتەر سەردەمانێک خوێنەری ڕۆمانی پۆلیسی بوو، لە دیالۆگەکانیدا لەگەڵ سیمۆن دی بۆڤاردا باس لەوە دەکات مرۆڤ دەتوانێت سوود لە ستراکتوری ڕۆمانی پۆلیسی وەربگرێت بۆ ئیشکردن لەسەر بابەتی تر، پاموکیش وەها دەکات. ئەم ڕەهەندە تەکنیکییە کاتێک تەواو ئاشکرا دەبێت کە قەرە و وەستا عوسمان ناچار دەبن بەدوای بکوژەکەدا، بکەونە شیکار و خوێندنەوەی شێوازی نیگارکێشانی هەریەک لە سێ نیگارکێشەکەی وەرشەکەی وەستا عوسمان لەقلەق و زەیتون و پەپوولە، چونکە دواجار لە دەستی زەریفە فەندیدا وێنەی ئەسپێک کە بەشێوازێکی زۆر تایبەت کە لە شێوازی نیگارکێشە مەغۆلییەکان دەچێت دۆزراوەتەوە. ئەو ئەسپە دەبێتە ڕێگایەک بۆ ئەوەی پاموک بەوردەکارییەکانی ناو هونەری دێرینی خۆرهەڵاتدا بمانبات، تا دواجار لە سەفەرێکی سەیر و پڕ شیکاردا، کە زۆرجار حیکایەتی شیکردنەوە سیمۆلۆژییەکانی غالبمان لە ڕۆمانی کتێبی ڕەشدا بیر دەخاتەوە، دەگەینە سەر پیاوکوژەکە. لێرەشدا پاموک وەک قوتابییەکی بلیمەتی ئەو سیستمە سیمۆلۆژییە دەردەکەوێت کە ئەمبرتۆ ئیکۆ سەرەتا لە ناوی گوڵ و دواتر لە بەندۆڵی فۆکۆدا ئیشی پێ کردووە، بەچەشنێک مرۆڤ ئاسان دەتوانێت بڵێت کە ئەگەر ژیانی نوێ ڕۆمانێکی ڕەمزیی چڕ بێت، ئەوا ناوم سوورە تێکستێکی سیمەنتیکیی فرە لایەنە کە بەرهەمی ئەو ڕۆحە ئەرکیۆلۆژییە قووڵەیە کە پاموک بەمێژووی کۆن و نوێدا دەگێڕێت. لێرەدا هونەری نەخش و نیگارکێشان سەنتەری پێکدادانی مۆدێرنە و ترادسیۆنن. وەک چۆن لە خۆرئاوا شێوەکاران دەرگا لە ڕینیسانس دەکەنەوە و پێشڕەوی تازەگەرین، پاموک بەم ڕۆمانەی لە خۆرهەڵاتیش بۆ وەها تێزەیەک پێکوڵ کاری دەکات. ئەو وا دەبینێت کە شکاندنی تابۆ و حەرامەکانی ناو دونیای ڕەسم سەرەتای ئەو پێکدادان و بەریەککەوتنەی نێوان ترادسیۆن و نوێکارییە لە دونیای ئیسلامدا. فانتیکبوون لە هونەردا، ئاوێنەیەکی سروشتی فاناتێکبوونە لە دیندا، هەموو کرانەوەیەکی هونەری شکاندنی ڕوانگەیەکی موقەدەس و هەرەسی جۆرێک لە جیهانبینییە. پاموک لەم ڕۆمانەدا چەندە باس لە دڵڕەق فاناتیکییەتبوون دەکات، هێندەش لە فیتنە و سیحری مۆدێرنە ڕادەمێنێت، شوێنی سەرسامی نییە کە بزانین بکوژی زەریفە فەندی و زاوا، تەنیا لەبەر هۆکاری دینی تاوانەکان ئەنجام نادات،



بەڵکو پیاوکوژەکە کەسێکە شێت و شەیدای ئەوەیە لە نزیکەوە مۆدێلی فەرەنگییەکان ببینێت، کە زاوا دەکوژێت و هەندێک لە لاپەڕەکانی کتێبەکەی دەدزێت بۆ ئەوەیە دەست لە سیحری ئەو شێوازە بدات کە زاوا لە فەرەنگییەکانەوە فێری بووە. پاموک لە ژیانی نوێدا مۆدێرنەمان وەک ڕووناکییەکی سیحری بۆ باس دەکات کە مرۆڤەکان دەخاتە سەر هەوا و هەوەسی گەڕان بۆ جیهانێکی نوێ، هەوا و هەوەسێکی ناعەقڵانی. لێرەشدا مۆدێرنەمان هەروەک هێزێک پیشان دەدات، کە وەها بکێش و سیحراوییە خەڵکان دەخاتە سەر کەڵکەڵەی کوشتن. ئەوەی لە ڕۆمانەکەدا لای من بلیمەتانە دەردەکەوێت، ئەو ڕۆحە پراگماتیزمییەیە کە زۆربەی کاراکتەرەکان هەیانە، هەتا کاراکتەری قەرەش کە جوانترین و لە خۆبوردووترین کاراکتەری ناو تێکستەکەیە لەو گیانە پراگماتییە بەدوور نییە. پاموک لێرەشدا بەو فەزا و وێناکردنە جارێکی دی ڕۆحی مۆدێرنەمان بەر لە هاتن و سەرهەڵدانی مۆدێرنە خۆی بۆ دەخوێنێتەوە.

لە ڕۆمانی بەفردا پاموک تەواوی ئەو ململانێیە کە لە ڕۆمانەکانی دیکەیدا سروشتێکی ڕەمزیی هەیە، وەک جۆرە واقعێکی کۆمەڵایەت تاڵ و پڕ لە غەم و خاڵی لە فەنتازیا نیشان دەداتەوە. لە سێ ڕۆمانەکەی دیکەدا ململانێی ترادسیۆن و مۆدێرنە، ململانێیەکی ڕەمزییە کە لەسەر ئاستی زانست وەک لە قەڵای سپیدا یان هونەر وەک لە ناوم سوورەدا یان شێوەی تێگەیشتن و ڕاڤەکردن وەک لە ژیانی نوێ و کتێبی ڕەشدا ڕوو دەدات، دەبینرێت. لە بەفردا ئەم ململانێیە دەبێتە ململانێیەکی ڕۆژانەی سیاسی و کۆمەڵایەتی. شانۆی ئەم ڕۆمانە شاری قارسە، شوێنێکی دووردەستی باکوری خۆرهەڵاتی تورکیا. لەوێدا تەواوی ئەو ڕەگەزە دژ و ناتەبایانەی تورکیای ئەمڕۆیان دروست کردووە پێک دەدەن. جگە لە شەڕی بەردەوامی ناسیونالیستە کورد و تورکەکان، شەڕی عەلمانییەت و دین لە توندترین و تاریکترین شێوەیدا هەڵگیرساوە. پاموک پاڵەوانی ڕۆمانەکەی ناو دەنێت کا. خودی ئەم ناونانە بەئەندازەیەک زیرەکانە و وردەکارانەیە کە جارێکی دی وامان لێ دەکات، بەتوانای پاموک سەرسام بین، بەتایبەت لە ئاست گۆڕینی شتی بچووک و سادەدا بۆ شتی مانادار و پڕ دەلالەت. ناوی کا ڕاستەوخۆ وەبیرهێنانەوەی پاڵەوانەکانی کافکایە لە

ڕۆمانەکانی کۆشک و دادگادا. چوونی کا بۆ قارس هاوشێوەی چوونی کای کافکایە بۆ ئەو شارۆچکە بێپوەرەی پاڵەوانەکە لە پێچوپەناکانیدا سەرگەردان دەبێت. ناوی کا ناوێکی کافکاییە، کاراکتەری پاڵەوانەکەش هەمان شێوە بێ هاوتا کافکاییە. کای شاعیر ڕۆحێکی ماندووە کە گەڕانی بەدوای بەختەوەریدا لە فرانکفۆرتەوە دەیگێڕێتەوە بۆ تورکیا و لەوێ لەسەر داوای ڕۆژنامەیەکی تورکی ڕوو لە قارس دەکات تا ڕاپۆرتێک لەسەر ئەو کچە ئیسلامییانە بنووسێت کە بەهۆی قەدەغەکردنی حیجابەوە خۆیان دەکوژن. بەڵام جگە لەوە کا دەخوازێت ئیپەکیش ببینێت کە شۆخە هاوڕێیەکی زەمانی زانکۆیە، کە کاتی خۆی کا عاشقی بووە، بەڵام ئەو شووی کردووە بەموختار کە ئێستا لە ئەندامە پایە بەرزەکانی حیزبی ڕەفاهی ئیسلامییە. کا دەزانێت ئیپەک لە موختار جیا بووەتەوە، لە دوای ئومێدێکی تاریک بۆ زیندووکردنەوەی ئەو عەشقە دێرینە ڕوو لە قارس دەکات. لەگەڵ گەیشتنی پاڵەوانەکەدا بەقارس بەفرێکی وەها دەبارێت ماوەیەک قارس دەبێتە شارێکی تەواو لە دونیا دابڕاو. کا لەو شارەدا ڕووبەڕووی واقعی ڕاستەقینەی تورکیا دەبێتەوە، لەگەڵ گەیشتنیدا بەقارس دەکەوێتە گەرمەی جەنگی حیجابەوە، هەر لەو ئوتێلەدا کە ئیپەکی تیا دەبینێت دەبێت بەشاهیدی کوشتنی بەڕێوەبەرێک کە کچانی لەچکپۆشی لە پەیمانگاکەی وەدەرناوە. پاموک لە ڕۆمانێکی درێژدا کای پاڵەوان بەنێو چەندەها گرێ و دیالۆگ و کێشەی قورسدا ڕادەکێشێت کە جەمسەرە بەرابەرەکانی جارێک فانەتیکە دینییەکانن و جارێکیش فانەتێکە عەلمانییەکانن. پاموک جارێکی تر تێزەی سەرەکیی خۆی دەربارەی ڕووخساری مۆدێرنەی تورکی دووپات دەکاتەوە. ئەو مۆدێرنە کاریکاتێرییەی لە ڕۆمانی ژیانی نوێدا کەسایەتیی ڕفقی خەت نوێنەرایەتیی دەکات، لە قەڵای سپیدا خواجا و خەیاڵ پڵاوە زانستییەکانی دەبێتە نیشاندەرەوەی، لە ناوم سوورەدا، پارەپەرستێکی وەک زەریفە فەندی و زاوا یان شیفتەدڵێکی وەک زەیتوون سەرەتاکانی ئاشکرا دەکەن. لێرەشدا کەسایەتییەکی شیزۆفرینیی وەک سۆنای یان فاشییەکی وەک دەمیرکۆڵ دەبێتە هەڵگری خەونەکانی. پاموک لە کەسایەتیی سۆنایدا جەوهەری مۆدێرنەی تورکیمان بۆ بەیان دەکات، وەک مۆدێرنەیەک کە لە واقعدا بوونی نییە، مۆدێرنە هیچ نییە جگە لە شانۆگەرییەکی



خوێناوی. بەڕێکەوت نییە بەشێکی گرنگی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لەسەر شانۆدا ڕوو دەدەن. سۆنا کاراکتەرێکە ناتوانێت لە نێوان ژیان و شانۆدا جیاوازی بکات، هەتا مردنی ڕاستەقینەی خۆی دەباتە سەر شانۆ و بەزیندوویی پەخشی دەکات. پاموک لە ڕێگای سۆنایەوە پێمان دەڵێت مۆدێرنەی تورکی لە نمایشێک زیاتر نییە کە تێکەڵاو بەژیان نەبووە بۆ ئەوەی تێکەڵاویش بێت دەبێت خەڵکێک هەبن لە شانۆکەوە گوللەی ڕاستەقینە بتەقێننە خەڵک. دیمەنی ئەو ڕەشەکوژی و قەسابخانەیەی لە کاتی نمایشی شانۆی سەرپۆش یان نیشتیماندا ڕوو دەدات، یەکێکە لە سەرەکیترین دیمەنەکانی ڕۆمانەکە. ئەو دیمەنە بەواتای دڵڕەقی دەوڵەت و دەسەڵات نییە بەتەنها، وەک لە ژمارەیەکی زۆر ڕانان و خوێندنەوەدا بۆ ڕۆمانەکە، نووسەرانی ئەڵەمان ڕاڤەی دەکەن. ئەو دیمەنە و دوا دیمەنیش کە تێیدا بڕیار دەبێت قەدیفە لەچک فڕێ بدات، هەردووکیان نیشانەی ئەوەن کە مۆدێرنیستەکانی تورکیا ناتوانن شانۆ و ژیان، وەهم و ڕاستی لە یەکتر جیا بکەنەوە. ئەو شانۆگەرییەی مۆدێرنیزمی تورکی لە فۆرمە فاشی و ئەتاتورکییەکەیدا پیادەیان کردووە، هەرگیز دانەبەزیوەتە ناو ژیانی ڕاستەقینە. ئەوەی تورکیا حیجابی فڕێ دابێت هەمیشە شانۆگەرییەکی بێ تام و خوێناوی بووە کە پێشتر تێکستەکەی نووسراوە و بەزۆر ئەکتەرەکانی ڕاپێچی نمایشەکە کراون، وەک ئەو تێکستانەی کە لە ڕۆژنامەی شاری سەرحەددا پێشوەخت دەنووسرێن و دواتر دەبنە ڕاست. بەڵام بەودیویشدا فانەتیکەکانی سەلەفییەت لەگەڵ ئیمانی کوێرانە و توندڕەوییە خوێنینەکەیاندا، جگە لە دونیایەکی سەتحی و ڕیاکار هیچی دییان نییە. ئەو شانۆنامە خوێناوییەی عەلمانییەکانی تورکیا سەپاندوویانە، دیوی ئەودیوی ڕۆحانییەتێکی پاکی دینی نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەودیویشی هەر ڕیاکاری و هوقەبازییە. شینە کە وەک تیرۆریستێکی بەناوبانگ ناوی ڕۆیشتووە و یەکێکە لە ڕەمزەکانی جیهاد، دەست لەوە ناپارێزێت کە لە یەک کاتدا لەگەڵ دوو خوشکدا پێوەندیی سێکسی ببەستێت، ئیپەک درۆ دەکات کە دەڵێت گەر باوکم لە ماڵ بێت لەگەڵ هیچ پیاوێکدا ناخەوم، قەدیفە سەرتۆپی کچانی حیجاب بەسەر پێوەندیی حەرام و ئیرەیی جنسی بۆ خوشکەکەی هەیە، فازیل لەگەڵ کوشتنی برادەرەکەیدا تەماح لە دەستگیرانەکەی دەکات. هەتا کا کە دەیەوێت ڕۆحی خۆی

بپارێزێت، بەردەوام لە ڕێگای شیعرەوە ئەو دوورییە ئەفسانەییە لە نێوان خۆی و شتەکاندا دروست دەکات، ناتوانێت نەبێت بەبەشێک لە گەمەکە. سەرەتا وا دەردەکەوێت وەک ئەوەی بیەوێت تێ بگات، بەڵام لە ناو یارییەکان و هێزەکاندا ون دەبێت، دەبێت بەبەشێک لە یارییەکی زۆر لەو گەورەتر، هەوڵی ئەوەی ڕۆڵی ناوبژیوان ببینێت دەیکات بەبەشداریێکی ڕاستەوخۆ لە شەڕەکەدا. پاموک لە ڕێگای ئەم ڕۆمانەوە پێمان دەڵێت : مرۆڤ لە تورکیای ئەمڕۆدا ناتوانێت پاک بێت. ئا لێرەدا ڕەمزییەتی بەفر وەک ناونیشان و وەک کاراکتەرێکی سەرەکیی ڕۆمانەکە دێتە پێشێ. بەدیوێکدا بەفر هێمای ئەو پاکییە ون و ئەفسانەییەیە کە کا بۆی دەگەڕێت، بەڵام بەدیوێکی تریشدا بەفر، کە هیچ کەلوویەکی لەوی دی ناچێت، هەریەکە و ڕیزبەندییەکی کریستاڵی تایبەتیی هەیە، هێمایە بۆ فەردانییەت. کا دەیەوێت وەک کەلووە بەفرە ناوازەکان خۆی بێت، بەڵام ئەستەمە بتوانێت خۆی بێت، هەر لایە و دەیخەنە خانەیەکەوە، مرۆڤی خۆرهەڵاتی ناتوانێت بێ ئەو خانە خانەکردنە بژی. وەک ئەوەی پاموک لە چارەنووسی کادا چارەنووسی خۆی و چارەنووسی هەموو نووسەرێکی خۆرهەڵاتی و هەموو کلوو بەفرێکی ئەم دەڤەرە بنووسێتەوە. لەوەش بترازێت بەفر ئاماژەیە بۆ ئەو ئابڵۆقە ئاسنینەی تورکیا تیا دەژی، ئەو پەرژینە ئاسنینەی کە ئەم وڵاتە لە ڕێگایەوە دەیەوێت مێژوو و حەقیقەتی خۆی لە دەرەوە بشارێتەوە. بەفر ئەو پەردەیەیە کە دەدرێت بەسەر ئەو ململانێ خوێناوییەدا کە تورکیای تیادا دەژی. لەم ڕۆمانەدا پاموک بەگشتی باس لەوە دەکات کە سیاسەت چەند مرۆڤ بەدبەخت دەکات، هێندەش پیشەی خەڵکانی بەدبەختە. خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت بەدبەختی هۆیەکی گونجاوە بۆ ئەوەی لە ڕووی سیاسییەوە ئەکتیڤ بیت، سیاسەتکردن بەتووڕەیی و بوغزەوە، زۆربەی جار نەک هەردەم ئیشی خەڵکانی ناشادە. ناشادی هێزیان دەداتێ. من هەردەم سیاسەتم لە تورکیا بەو جۆرە بینیوە. کا لە فرانکفۆرتەوە دەگەڕێتەوە و بۆ بەختەوەری دەگەڕێت، بەڵام دەبینێت کە خەڵکانی ناشاد چۆن لە ڕێگای سیاسەتەوە هێندەی تر بەدبەخت و ناشادبوون، لێرەوە سەفەرەکەی ئەویش هەر لە نەهامەتی و گوناهدا کۆتایی دێت. پاڵەوانە فانەتیکەکانی پاموک هەموو دەیانەوێت ببن بەئەفسانە، شینەی ئیسلامی و



سۆنای سکولار و هونەردۆست هەردووکیان دەیانەوێت ببن بەئەفسانە و لەو نێوەندەدا ژیانی ئاسایی و بەختەوەریی هەموو ئەوانی دەوروبەریان وێران دەکەن، بەفر بەدیوێکی تردا گەڕانەوەیە بۆ سادەگی و دەستبەرداربوون لە خواستی بوون بەقارەمان و ئەفسانەبوون.

پاموک دەڵێت بەبڕوای من، ئەدەب بەنرخترین شتێکە مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە خۆیی دروستی کردبێت. لەوەشدا تا ئەندازەیەکی زۆر لەسەر هەقە. شاعیرییەتی پاموک زۆر قووڵتر و وردتر لە هێزی شیکار و تێڕوانینی فەیلەسووفان و بیریارانی خۆرهەڵات دەڕوات، ئەو دەرگایانەی پاموک دەیانخاتە سەرپشت، دەرگاگەلێکن بەکلیلی ئەدەب نەبێت هیچ کلیلێکی دیکەی دنیا نایانکاتەوە. ئەدەبی پاموک بە ڕوویەکدا دەروازەیەکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و بە ڕوویەکی تریشدا دەروازەیەکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە خۆرهەڵات. دنیا نووسەری گەورەی زۆر تێدایە، بەڵام بۆ ئێمە کورد و خۆرهەڵاتی، خوێندنەوەی پاموک نرخێکی بێهاوتای هەیە، نە لەبەرئەوەی پاموک ئەو دەرگایەمان بۆ دەکاتەوە کە لە ڕێگایەوە باشتر دەتوانین تورکیا ببینین، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو دەرگایەشمان بۆ دەکاتەوە کە دەتوانین باشتر خۆمان ببینین. پاموک نووسەرێکی تورک نییە، بەڵکو وێنەگرێکی وردی ڕۆحی خۆرهەڵاتە ... هەموو خۆرهەڵات.

## سەرچاوەکان

سوودم لەم چاپانەی ڕۆمانەکانی پاموک وەرگرتووە:
Fischer Verlag, Frankfurt 2000 .PAMUK, ORHAN: Das neue Leben
Suhrkamp Verlag, Frankfurt 1995 . PAMUK, ORHAN: Die weisse Festung
Fischer Verlag, Frankfurt 2004 .PAMUK, ORHAN: Rot ist mein Name
Carl Hanser Verlag, M_nchen 2005 .PAMUK, ORHAN: Schnee

هەروەها لە ئەدەبیاتی تردا، سوودم لەو وتار و چاوپێکەوتنانەش بینیوە:

ژمارە ٥ ساڵی ٢٠٠١ ڕۆژنامەی دی تزایت، وتارێکی "Hans-Peter Kunisch" بەناونیشانی:
Der tuerkische Schriftsteller Orhan Pamuk .Die Morde der Maler und die schoene Sekuere erzaehlt von der Auseinandersetzung zwischen Orient und Okziden

وتارێکی "Ingo Bierschwale" لە ژمارەی ٢١ی ئوکتۆبەر ٢٠٠٦ی گۆڤاری شتێرن بەناونیشانی :
Autor zwischen Orient und Okzident .Orhan Pamuk

وتارێکی ڕۆژنامەی "NZZ"، ژمارەی ڕۆژی ٤٢ی ئوکتۆبەری ٢٠٠٥ بەناونیشانی :

Der weite Blick _ber den Bosporus
Eine Begegnung mit dem t_rkischen Autor Orhan Pamuk

چاوپێکەوتنی Jorg Lau لەگەڵ پامـوک لە ژمـارەی ٦١ی سـاڵی ٢٠٠٥ی ڕۆژنامـەی دی تزایت بەناونیشانی:

Achte auf die Details des Lebens

وتارێکی وەرگێڕی کارکەنی پاموک " Ingrid Iren" لە "فرانکفۆرتەر ئەلگەماینە تزایتونگ FAZ" ژمارەی ٣ی نۆڤەمبەری ١٩٩٨ بەناونیشانی:

Wenn einer hielte und f_hrte mich zum Ararat

وتارێکی "Dilek Zaptcioglu" لە ڕۆژنامـەی " تاگس تزایتـونگ TAZ" ژمـارەی ٢٠٠٦,١١,٨١ بەناونیشانی :

Der Reichtum eines Untergehers

هەروەها دەقی وتەکـەی پامـوک لـە کـاتی وەرگـرتنی نۆبێـڵدا، بەو شـێـوەیەی کــە لە NO-BELSTIFTUNGوە لە ٧ی دیسەمبەری ٢٠٠٦دا بڵاوکرایەوە و بەناونیشانی جانتاکەی باوکمەوە بوو. Der Koffer meines Vaters

بۆ بۆچوونـەکانی سـارتەریش دەربـارەی ڕۆمـانی پۆلیـسی بـڕوانە لاپەڕە ٢٢ی ئەم سـەرچاوەیەی خوارەوە :

١٩٩٦ .Hamburg .Rowohlt .Aus Gespraechen mit Jean - Paul Sartre .Simone de Beauvoir

# ١

## کپیی بەفر

### سەفەر بۆ قارس

ئەو پیاوەی ڕاستەوخۆ لە پشت شۆفێری پاسەکەوە دانیشتبوو، بیری لە کپیی بەفر دەکردەوە. خۆزگەی دەخواست ئەو کپیی بەفرەی لە ناخیدا هەستی پێ دەکات، هەوێنی هەڵبەستێک بوایە.

لە دوا چرکەدا خۆی گەیاندبووە ئەو پاسەی کە لە ئەرزەرووممەوە بۆ قارس دەچوو. دوای گەشتێکی دوو ڕۆژە بەپاس و بەناو کرێوەی بەفر و بارێزەدا گەیشتبووە گەراجی ئەرزەڕووم. کاتێک بەساکەکەی دەستییەوە بەڕێڕەوەی قرێژ و ساردی گەراجەکەدا عەودالی شوێنی وەستانی پاسەکانی قارس بوو، یەکێک پێی گوت ئەوا پاسێک خەریکە بەرەو قارس دەردەچێ.

لەبەرئەوەی شاگردی کۆنە پاسەکە، جۆری (ماگیروس)، ئامادە نەبوو جارێکی تر دەرگای داخراوی سندووقی باوڵەکان بکاتەوە، پێی گوتبوو: پەلەمانە. بۆیە جانتا دەستییە گەورە و ڕەنگ گێلاسییەکەی، مارکەی (بالی)، لەتەک خۆیدا بردە سەرێ و لە نێوان لاقەکانیدا داینا. ڕێبواری دانیشتووی لای پەنجەرەکە پاڵتۆیەکی خۆڵەمێشیی لەبەردا بوو کە پێنج ساڵ لەوەوبەر لە بازاڕی (کاوفهۆف) لە فرانکفورت کڕیبووی. دەبێ هەر لە ئێستایشەوە بڵێم پاڵتۆ جوان و تووک نەرمەکەی، هەم دەبێتە سەرچاوەی شەرم و نائارامی بۆی و، هەم لەو چەند ڕۆژەدا کە لە قارس بەسەری دەبات، دڵنیاییی زیاتری پێ دەبەخشێت.

ڕێبواری دانیشتووی لای پەنجەرەکە، دوای وەگەڕکەوتنی پاسەکە و بەهیوای بینینی شتێکی نوێ، پێڵووی چاوەکانی کردەوە. لە جامی پاسەکەوە نیگای بڕییە کۆڵانەکانی قەراغ شاری ئەرزەڕووم، دووکانی بچووک و هەژاری بەقاڵەکان،



نانەواخانەکان و چایخانە شڕ و پەڕپووتەکان. بەفریش هەر کرێوەی دەکرد و کلووەکانی زۆر لەوە گرانتر و گەورەتر بوون کە بەدرێژاییی ڕێگای نێوان ئەستەمبوڵ و ئەرزەرووم باریبوو. ڕێبواری دانیشتووی لای پەنجەرەکە ئەگەر ماندوو نەبوایە و کەمێک زیاتر سەرنجی ئەو کلووە بەفرانەی بدایە کە وەکو پەڕی باڵندە لە ئاسمان دەهاتنە خوارێ، ئەوا دەیتوانی تێ بگات کە باهۆز و بارێزەیەکی بەهێز بەڕێوەیە. لەوانەیش بوو لە سەرەتاوە پەی بەوە بردبایە کەوا ملی لە سەفەرێکی ئەوتۆ ناوە کە بۆی هەیە سەرلەبەری ژیانی بگۆڕێ و، دووریش نەبوو بڕیاری گەڕانەوە بدات.

بەڵام ئەوەی بەخەیاڵیدا گوزەری نەدەکرد، گەڕانەوە بوو. لەگەڵ هاتنی ئێوارەدا چاوەکانی بڕییە قووڵاییی ئاسمان کە لە زەوی ڕووناکتر دەینواند. ئەو لە بارین و کەڵەکەبوونی کلووە بەفرەکان و بڵاوبوونەوەیان بەدەم (با)وە، نیشانەی نزیکبوونەوەی کارەساتێکی بەدی نەدەکرد، بەڵکو وەکو نیشانەی گەڕانەوەی پاشماوەی بەختەوەری، پاکیزەیی و بێگەردیی سەردەمی منداڵی لەو دیمەنەی دەڕوانی. ڕێبواری دانیشتووی لای پەنجەرەکە دوای ئاوارەبوونێکی دوازدە ساڵە، هەفتەیەک لەمەوبەر و بەدوای مردنی دایکیدا گەڕابووەوە بۆ ئەستەمبوڵ، بۆ ئەو شارەی تەمەنی منداڵی و بەختەوەریی خۆی تێدا بەسەربردبوو. چوار ڕۆژ لەوێ مابووەوە، دواتر لەناکاو ئەم گەشتەی قارسی بۆ هاتبووە پێش کە پێشتر لە بەرنامەیدا نەبوو. هەستی دەکرد جوانیی لە ڕادەبەدەری بەفر شادییەکی زۆرتر لەوەی پێ دەبەخشێ کە لە بینینەوەی ئەستەمبوڵ لە دوای ئەو دابڕانە درێژە هەستی پێ کردبوو. ئەو شاعیر بوو و چەندین ساڵ لەمەوبەر لە هۆنراوەیەکدا کە زۆرینەی خوێنەرانی تورک پەیان پێ نەبردووە، گوتبووی: بەدرێژاییی ژیانمان تەنیا جارێک لە خەونەکانماندا بەفر دەبارێ.

بەدەم هاتنە خوارەوەی کلووی بەفرەوە بەکپی و بێدەنگی وەکو لە خەونەکانیدا بباری، ڕێبواری دانیشتووی لای پەنجەرەکە خۆی بەو بێتاوانی و سادەییە سپارد کە سالانێکی درێژ بەپەرۆشەوە بەدوایدا وێڵ بوو و، بەگەشبینییەوە باوەڕی بەوە هێنا هەست دەکات لەم جیهانەدا لە ماڵی خۆیدایە. پاش ساتەوەختێک چاوەکانی لێک نا و لە سەر کورسییەکە خەو بردییەوە.

بە نووستنەکەی بقۆزینەوە و چەند زانیارییەک لە بارەیەوە بخەینە ڕوو. ماوەی

دوازده ساڵ بوو وەکو پەنابەرێکی سیاسی لە ئەڵمانیا ژیانی بەسەردەبرد، بەڵام هیچ کاتێک خۆی نەهاویشتبووە ناو قووڵاییی سیاسەتەوە، تاقە ئەڤین و خولیای ئەو هەر شیعرە. تەمەنی چل و دوو ساڵە، زگورتییە و هەرگیز ژیانی هاوسەریی پێک نەهێناوە. لەسەر کورسییەکە بەجۆرێک خۆی گرمۆڵە کردووە هەست بەبەرزیی باڵای ناکرێ، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ تورکەکاندا، ئەو باڵای بەرزترە. پێستێکی سپیی هەیە کە بەهۆی سەفەرەوە مەیلەو زەرد دیارە و قژێکی ماش و برنجی پێوەیە. حەز بەتەنیایی دەکات و زۆر شەرمنە، خۆ ئەگەر بیزانیبا بەدەم خەوەوە سەری بەرداوەتەوە سەر شانی ڕێبوارەکەی تەنیشتی و دواتریش سەری خستووەتە سەر سنگی، ئەوا زۆر شەرمندە دەبوو. ئەو ڕێبوارەی سەری بەسەر ڕێبوارەکەی تەنیشتیدا لار بووەتەوە، مرۆڤێکی نیازپاک و سەرڕاستە، خۆی داوەتە دەستی چارەنووس و وەکو پاڵەوانی چیرۆکەکانی چیخۆف لە ژیاندا سست و ژێرکەوتووە. دواتر زۆر جاران دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتی چارەنووسە. ئەم ڕێبوارەی کە بەهۆی دانیشتنی وەرسکەرەوە ناتوانێ زیاتر بنوێ، ناوی (کەریم ئالاقوش ئۆغلو)ە، بەڵام لەبەرئەوەی خۆشیی لەم ناوە نایات، هەمیشە حەز دەکات بەدوو پیتی یەکەمی ناوەکەی (Karim) (کا–Ka) بانگ بکرێ. با هەر لە ئێستاوە پێتان بڵێم منیش لەم کتێبەدا بەو ناوەوە ئاماژەی بۆ دەکەم. پاڵەوانەکەمان هەر لە قوتابخانەوە دەستی دابووە کەللەڕەقی لە نووسینەوەی ناوەکەیدا. ئەو هەمیشە لەسەر کاغەزی تاقیکردنەوە و ئەرکەکانی ماڵەوە (کا)ی دەنووسی، لە زانکۆیش هەمان ناوی لە سەر دەفتەرەکانی تاقیکردنەوە دەنەخشاند. هەموو جارێکیش لەم هەڵایەدا ئەوەی لە بەرچاو دەگرت کە لەگەڵ مامۆستاکان و فەرمانبەرانی دەوڵەتدا تووشی دەمەقاڵە دەبێت. دایکی و کەسوکار و هاوڕێکانی ناچار کرد بەم ناوەوە بانگی بکەن و شیعرەکانیشی هەر بەهەمان ناوەوە بڵاو دەکردەوە. ناوی (کا) لە تورکیا و لە ناو تورکەکانی ئەڵمانیادا ناوبانگێکی بچووک و پڕ لە ڕازی هەبوو. منیش دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی شۆفێری پاسەکە کە لەگەڵ دەرچوونیان لە ناوەندی شاری ئەرزەڕووم هیوای سەفەرێکی بێ بەڵای بۆ ڕێبوارەکان خواست و دەڵێم: خودات لەگەڵ ئەی (کا)ی خۆشەویست. نەمگەرەکە فێڵتان لێ بکەم: من هاوڕێیەکی دێرینی



(کا)م و بەر لەوەی دەست بەگێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەیش بکەم، دەزانم لە قارس چی بەسەر دێت.

لە دوای خوراسان پاسەکە بەرەو باکور ڕووی لە قارس کرد. لە یەکێک لە هەورازەکاندا گالیسکەیەک دەرکەوت. ڕاگرتنی پاسەکە لە لایەن شۆفێرەکەوە هێندە بەهێز بوو بەجۆرێک (کا)ی لە خەو ڕاپەڕاند، هێندەی پێ نەچوو تێکەڵ بەکەشی هاوئاهەنگ و یەککگرتووی ناو پاسەکە بوو. هەر جارێکیش شۆفێری پاسەکە لە کاتی پێچکردنەوە لە لۆفەکان و لە قەراغی هەڵدێرە بەردینەکان خێراییی کەم کردەوە، (کا) سەرباری ئەوەی ڕاستەوخۆ لە دوای شۆفێرەکەوە دانیشتبوو، وەکو ڕێبوارەکانی پشتەوەی پاسەکە هەڵدەستایە سەرپێ بۆ باشتر بینینی ڕێگاکە. بەقامکەکانی ئاماژەی بۆ گۆشەیەکی جامی پێش شۆفێرەکە کرد کە یەکێک لە ڕێبوارەکان لە سۆنگەی یارمەتیدانی شۆفێرەکەوە پاکی دەکردەوە. (کابرا هەستی بەئاماژەکەی ئەم نەکرد). لەبەرەوە بەفر کەڵەکە دەبوو و جامسڕەکان فریا نەدەکەوتن جامی سپیبووی پێشەوەی پاسەکە پاک بکەنەوە. ئەویش وەکو شۆفێرەکە چاوی بۆ ڕێگایەک دەگێڕا کە لە هیچ لایەکەوە بەدی نەدەکرا.

بەفر تابلۆکانی هاتوچۆی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکەی داپۆشیبوو و چی دی نەدەخوێنرانەوە. شۆفێرەکە، لەگەڵ کەڵەکەبوونی بەفرەکەدا تیشکهاوێژە دوورەکانی دەکوژاندەوە. لە نیمچە تاریکییەدا ڕێگاکە باشتر بەدەردەکەوت، بەڵام تاریکی ناو پاسەکەی دادەگرت. ڕێبوارەکان بەدەم ترسەوە سەیری کوچەگەلی گوندە هەژارەکانی بەبەفر داپۆشراو، گڵۆپی کزی خانووە پەرپووت و یەک نهۆمییەکان، ڕێگاوبانی گوندە دوورەدەستەکان کە هەر لە ئێستاوە بەفر دای پۆشیبوون و سەیری ئەو هەڵدێرانەیان دەکرد کە تیشکهاوێژەکانی پاسەکە ڕووناکی دەکردنەوە. لە نێوان خۆشیاندا قسەیان نەدەکرد، بشیانکردایە، چپەدووان بوو.

ئەو ڕێبوارەی (کا) بەدەم خەوەنوتکێوە کەوتبووە باوەشیەوە، بەچرپە هۆی هاتنی بۆ قارسی لە (کا) پرسی، چونکە هێندە دژوار نەبوو مرۆڤ بزانێ (کا) خەڵکی قارس نییە.

(کا) بەگوێی کابرادا چرپاندی: "من ڕۆژنامەنووسم"... ئەمە ڕاست نەبوو. "من

بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانی و دیاردەی خۆکوشتنی ژنان رووم لە قارس کردووە." ئەمەیان ڕاست بوو. کابرای تەنیشتی بەهەستێکی هەڵچووەوە کە (کا) تێ نەگەیشت داخۆ هەستی بەخۆنازینە یان شەرمکردن گوتی: "هەموو ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ نووسیبوویان سەرۆکی شارەوانیی قارس کوژراوە و ژنانی شارەکە خۆیان دەکوژن."

(کا) بەدرێژاییی ڕێگاکە جاروبار ئەو گوندییە باریکەڵە و ڕێکپۆشەی دەدواند کە دوای سێ ڕۆژ بەرێکەوت بەچاوی پڕ لە گریانەوە لە شەقامی بەبەفر داپۆشراوی خالید پاشادا دەیبینێتەوە. (کا) ئەوەی لێ حاڵی بوو کە لەبەر کەمیی نەخۆشخانە لە قارس دایکی بۆ ئەرزەڕووم بردووە، بۆ خۆیشی لە گوندێکی نزیکی قارس ئاژەڵداری دەکات و بە کوڵلەمەرگی ژیان بەسەر دەبات. کەچی وەکو خۆی دەیگوت، مەیلی بەلای یاخیبوونەوە نییە. لەبەر چەند هۆیەکی پڕ لە نهێنیش کە ئامادە نەبوو بۆ (کا)ی بدرکێنێ، خەمی خۆی نا، بەڵکو خەمی نیشتمانی لەبەر بوو. ئەوەیشی لە بیر نەچوو سوپاسگوزاریی خۆی بۆ مرۆڤێکی خوێندەواری وەکو (کا) دەربڕێ کە لە ئەستەمبوڵەوە هاتووە بۆ بەسەرکردنەوەی ئێش و ئازارەکانی قارس. هەستێکی خۆشەویستی و بەزەیی پیاهاتنەوە بەرامبەر بەکابرای لادێیی باڵی بەسەر (کا)دا کێشا.

(کا) هەستی کرد هەبوونی ئەم کەسە جۆرێک لە ئارامیی پێ دەبەخشێت. ئەم جۆرە ئارامییە کە بەدرێژاییی دوازدە ساڵ مانەوەی لە ئەڵمانیا هەستی پێ نەکردبوو، ئەو سەردەمانەی بیر دەخستەوە کە چێژی لە تێگەیشتن لە کەسێکی لە خۆی لاوازتر و بەزەیی پیاهاتنەوەیدا وەردەگرت. لەو کاتانەدا تێ دەکۆشا بەچاوی کەسێکی میهرەبان و خاوەن بەزەییەوە بۆ جیهان بڕوانێ، ئەم هەستەش وای لێ کرد ترسی لە کرێوەی دانەبڕاوی بەفر کەمتر ببێتەوە. لەوە گەیشت ئیدی پاسەکەیان بۆ ناو دۆڵەکان گل نابێتەوە و ئەگەر درەنگیشیان بەسەردا بێت، هەر دەگەنە قارس.

کاتێک پاسەکە دوای سێ سەعات دواکەوتن لە سەعات "دە"دا گەیشتە کوچە و شەقامە بەبەفر داپۆشراوەکانی قارس، (کا) شارەکەی بەهیچ جۆرێک نەناسییەوە. ئەو وێستگای شەمەنەفەرەیشی نەناسییەوە کە لە بەردەمیدا قووت بووەوە و بیست



ساڵ لەمەوبەر و لە ڕۆژێکی بەهاریدا بەشەمەنەفەرێکی هەڵم پێی گەیشتبوو. ئەو کاتە بەسواری گالیسکەیەک هەموو شاری بەدوای هوتێلی (جمهوری)دا تەی کردبوو، ئەو هوتێلەی کە لە هەر ژوورێکیدا هێلێکی تەلەفۆن هەبوو، بەڵام نەیدۆزیبووەوە، چونکە بەفر هەموو شتەکانی داپۆشیبوو و وەکو ئەوە وابوو ون بووبن. ڕاوەستانی یەک دوو گالیسکە لە گەراجی شاردا، ڕابردووی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ، بەڵام شارەکە لەوە غەمگینتر و هەژارتر دەهاتە بەرچاو وەکو ئەوەی لە یادەوەریی (کا)دا چەسپابوو. لە پەنجەرەی شەختەبەستووی پاسەکەوە ئەو باڵەخانە چوونیەکانەی بینی کە لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا لە هەموو شارەکانی تورکیا بەقووڵاییی ئاسماندا چووبوون. تابلۆکانی پلەکسی گلاس و پۆستەرە لەیەکچووەکانی هەڵمەتی هەڵبژاردنی بینی کە بەپەت لەمبەرەوە بۆ ئەوبەری شەقامەکان هەڵواسرابوون.

هەرکە لە پاسەکە هاتە خوارێ و پێی نایە سەر بەفرە نەرمەکە، شەپۆلێک هەوای ساردی گورچووبڕ لە دەرلینگی پانتۆڵەکەیەوە چووە لەشیەوە. بەدەم پرسیارکردنەوە بۆ زانینی ناونیشانی هوتێلی بەفرپالاس کە لە ئەستەمبوڵەوە بەتەلەفۆن ژوورێکی تێدا گرتبوو، چەند دەموچاوێکی ئاشنای لە ناو ئەو ڕێبوارانەدا بینییەوە کە باوڵەکانیان لە شاگردی پاسەکە وەردەگرتەوە، بەڵام بۆی نەکرا لەو بەفرەدا ئەو کەسانە بناسێتەوە.

دوای خۆشکردنی شوێنی حەوانەوەی لە هوتێلەکە خۆی گەیاندە چێشتخانەی نیشتمانی سەوز و لەوێ جارێکی تر دەموچاوە ئاشناکانی بینییەوە. پیاوێک، زەمانە شوێنەواری خۆی لەسەر رووی جێ هێشتبوو، بەڵام هێشتا ڕێکپۆش و بەزەوق دەینواند، ژنێکی قەڵەو، بەڵام لەشسووکیی لەگەڵدا بوو کە پێ دەچوو هاوسەری بێت. (کا) بەشانۆگەرییە سیاسییە پڕ لە دروشمەکانی ساڵانی حەفتای ئەستەمبوڵدا ژن و پیاوەکەی ناسییەوە. پیاوەکە ناوی سونای زایم بوو. (کا) بەخەیاڵێکی بڵاوەوە تێی ڕوانین و شێوەی ژنەکەی بردەوە سەر یەکێک لە هاوڕێکانی سەردەمی قوتابخانەی سەرەتایی. کۆمەڵێک پیاوی تریشی بینی کە هەموویان بەشێوەی ئەکتەر و کارمەندگەلی بواری شانۆ ڕەنگ زەرد و پێست مردوو بوون. تۆ بڵێی کاری ئەم تیپە

شانۆگەرییە بچووکە لەم شەوە شوباتییە پڕ وەیشومەیەدا و لەم شارە لە بیرکراوەدا چی بێ؟ بەر لەوەی ئەو چێشتخانەیە بەجێ بهێڵێ کە بیست ساڵ لەمەوبەر پیاوە کراڤات لە ملەکان ڕوویان تێ دەکرد، پێی وابوو لە پشت مێزێکەوە پاڵەوانێکی چەپی بەدی کردووە کە لە ساڵانی حەفتادا چەکی هەڵدەگرت. وێ دەچوو بیرەوەریی ئەمیش، وەکو قارس و چێشتخانە هەژارکەوتوو و ڕەنگ زەردەکە، لە ژێر بەفردا سڕابێتەوە.

ئایا بەهۆی بەفرەوە بوو کەس بەسەر شەقامەکانەوە نەبوو، یاخۆ هیچ کاتێک کەس بەسەر ئەم شۆستە ڕچیوانەوە نەبووە؟ بەوردی کەوتە خوێندنەوەی پۆستەری هەڵبژاردنی سەر دیوارەکان و بانگەشەی خولە زانستییەکان، تابلۆی چێشتخانەکان، پۆستەرەکانی دژ بەخۆکوژی کە لە لایەن پارێزگاوە هەڵواسرابوون و لەسەریان نووسرابوو: (مرۆڤ شاکاری خودایە و خۆکوشتن کفرە). (کا) لە پەنجەرەی بەفربەستووی چایخانەیەکی نیوە پڕەوە کۆمەڵێک لاوی بینی سەیری تەلەفزیۆنیان دەکرد. بینینیی باڵەخانە بەردینە کۆنەکانی دەستکردی ڕووس کە لە یادەوەری (کا)دا شوێنێکی تایبەتییان بەقارس بەخشیبوو، جۆرێک لە ئارامیی خستە هەناویەوە، ئەگەرچی کەمیش بێت.

هوتێلی بەفرپالاس باڵەخانەیەکی نایابی دەستکردی ڕووسان بوو کە لەسەر شێوەی بیناسازیی باڵتیکی بنیاد نرابوو. دەروازەی میوانخانەکە لە ژێر کەوانەیەکدا بوو کە بەسەر هەیوانێکدا دەیڕوانی. پەنجەرەکانی باڵەخانە دوو نهۆمییەکە تەسک و بڵند بوون. (کا) کاتێک بەژێر کەوانەکەدا کە بەئەندازەی تێپەڕبوونی گالیسکەیەک بەرز دروست کرابوو، تێ پەڕی، هەستی بەهەڵچوون و نائارامییەکی شاراوە کرد، بەڵام لەبەر ماندوویی، نائارامییەکەی فەرامۆش کرد. با ئەوەیشی بخەمە سەر کە ئەم هەڵچوونەی (کا) پێوەندیی بەیەکێک لە هۆیەکانی هاتنیەوە بۆ قارس هەبوو. (کا) سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە بارەگای ڕۆژنامەی جمهورییەت لە ئەستەمبوڵ چاوی بەتانەری هاوڕێی سەردەمی لاوێتیی کەوتبوو. تانەر پێی ڕاگەیاندبوو لە قارس هەڵبژاردنی شارەوانییەکان بەڕێوە دەچێت، جگە لەوە، کچانی قارسیش وەکو کچانی باتمان تووشی پەتایەکی سەیری خۆکوشتن بوون. تانەر پێشنیاری بۆ کردبوو ئەگەر



دەیەوێت لەسەر ئەم بابەتانە بنووسێ و بخوازێ تورکیای ڕاستەقینە ببینێ و بناسێ، بچێت بۆ قارس. ناسنامەیەکی کاتیی ڕۆژنامەنووسیشی بۆ ئەم ئەرکە کە کەسی تر خۆی لە قەرەی نەدابوو، دابوویێ. تانەر پێیشی گوتبوو ئیپەکی هاوڕێی شۆخ و شەنگی سەردەمی زانکۆیان لە قارسە، لە موختار جیابووەتەوە و لەگەڵ باوک و خوشکەکەیدا لە هوتێلی بەفرپالاس دەژی. (کا) بەدەم گوێڕاگرتنەوە بۆ قسەکانی تانەر کە لێکۆڵینەوەی سیاسیی بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت دەنووسی، بیری لە جوانی و شۆخیی ئیپەک کردبووەوە.

(کا) کلیلی ژووری ٢٠٣ی لە جاویدی کارمەندی هوتێلەکە کە لە هۆڵی بنمیچ بەرزی پێشوازیی هوتێلەکەدا سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، وەرگرت و چووە ژوورەکەی خۆی، دوای کلیلدانی دەرگاکە، هەستی بەحەوانەوە کرد. زۆر بەباشی گوێی بۆ هەستی خۆی ڕاگرتبوو، بەپێچەوانەی ئەوەی بەدرێژاییی ڕێگا لێی سڵەمی بووەوە، هۆش و دڵی بایەخیان بەبوون و نەبوونی ئیپەک لە میوانخانەکە نەدەدا. تا سنووری مردن لەوە دەترسا لە ئاکامی غەریزەیەکی بەهێزەوە، وەکو ئەوانەی لە ژیانی کورتخایەنی سۆزدارییاندا تەنیا زنجیرەیەک ئازار و شەرمیان بەیادگاری بۆ دەمێنێتەوە، گرفتاری داوی ئەڤین بێت.

لە نیوەی شەودا بیجامەکەی لەبەر کرد و بەر لەوەی بچێتە جێگاوە، پەردەی پەنجەرەکەی کەمێک لادایە لاوە و نیگای لە کلووە گەورەکانی بەفر بڕی کە بێ هەدادان دەبارین.

# ٢

## شارەکەمان لە شوێنێکی ئارامدا هەڵکەوتووە

### کوچە دوورەکان

بەفرەکە بەقوڕ و چڵپاو و تاریکی شارەوە هەستی پاکیزەییی خەوتووی لای (کا) بێدار کردەوە، بەڵام ئەو لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنیەوە بۆ قارس متمانەی بەپاکیزەییی بەفر نەما. بەفر لێرە شتێکی ماندووکەر، وەڕسهێنەر و خەمبەخشە. دوێنێ شەو بێ بڕانەوە باریبوو. (کا) بەیانیان بەشەقامەکانی شاردا پیاسەی دەکرد، لەو چایخانانەدا وچانی دەدا کە سیخناخ بوون لە بێکارانی کورد، قەڵەم و کاغەزێکی بەدەستەوە دەگرت و وەکو ڕۆژنامەنووسێکی پەیوەست بەکارەکەیەوە دەنگدەرانی دەدواند. ڕێگای کوچە سەخت و شەختاوییە هەژارنشینەکانی دەگرتە بەر، بەدرێژاییی دیداری ئەم لەگەڵ سەرۆکی پێشووی شارەوانی و جێگری پارێزگار و خزم و کەسوکاری کچانی خۆکوشتوودا، بەفر بێ بڕانەوە دەباری. کاتێک لە تافی منداڵیدا لە پەنجەرەی ماڵە ئارامەکەیانەوە لە بەشە شاری نیشانتاشی لە ئەستەمبوڵ سەیری دیمەنی شەقامە بەفراوییەکەی دەکرد، وەکو بەشێک لە داستانێک دەهاتە بەرچاوی، بەڵام ئەمێستا چەشنی سەرەتای ژیانێکی سادە کە ساڵانێکی درێژ وەکو دوا پەناگە لە خەیاڵیدا هەڵی گرتبوو و وەکو هەژارییەکی ناهومێدانە کە نەیدەویست بەخەیاڵیش پێشبینیی کۆتاییەکەی بکات، خۆی دەنواند.

سەرلەبەیانی، ئەو دەمەی شار تازە لە خەو ڕابووبوو، (کا) بێ ئەوەی گوێ بەبەفر بدات، لە شەقامی ئەتاتورکەوە هاتە خوارەوە و بە پەلەپرووزێ ڕووی لە کوچەی کوڵیتنشینەکان و گەڕەکی ژێر قەلا کە هەژارترین و نەدارترین گەڕەکی قارس بوو، کرد. بەتاو بەژێر دار زەیتوونە ڕووسییەکان و دار چنارە لق بەستووەکاندا دەهاتە خوارێ، بەدەم ڕۆیشتنەوە نیگای دەبڕیە باڵەخانە ڕووسییە کۆن و داڕووخاوەکان کە لوولەی سۆپا لە پەنجەرەکانیانەوە هاتبوونە دەرێ، سەیری ئەو بەفرەی دەکرد کە



بەسەر دێرێکی ئەرمەنیی هەزار ساڵەوە کە کەوتبووە نێوان کۆگای خەڵووز و وێستگای کارەبای شارەوە، دەباری. سەرنجی دابووە وەڕینی سەگە دڕەکان کە بەو ڕێبوارانە دەوەڕین کە بەسەر پردە بەردینە پێنج سەدە لەمەوبەر بنیادنراوەکەی سەر ڕووباری بەستووی قارسدا دەپەڕینەوە. سەیری ئەو دووکەڵە زراڤانەی دەکرد لە کوڵیتە بچووکەکانی گەڕەکی ژێر قەلاوە بەرز دەبوونەوە. کوڵیتەکان لە ژێر بەفرەکەدا چۆڵ و بەجێهێڵراو دەهاتنە بەرچاو. ئەم دیمەنانە هێندە دڵگرانی کرد بەجۆرێک فرمێسک بەسەر ڕوومەتەکانیدا هاتە خوارێ. لەوبەر دۆڵەکەوە کچ و کوڕێکی بەدی کرد کە سەرلەبەیانی زوو بۆ نانەواخانە نێردرابوون، دەستەیەک کولێرەی گەرمیان بەباوەشەوە بوو و بەکامەرانی بەدەم یەکەوە دەتریقانەوە، (کا) لای خۆیەوە زەردەخەنەیەکی بۆیان کرد. ئەو دڵگرانییەی لە ناخەوە هەستی پێ دەکرد، سەرچاوەکەی بۆ هەژاری و بێچارەیی نەدەگەڕایەوە، بەڵکو هەستێکی قووڵ و نامۆی تەنیایی بوو کە لە جامخانەی بەتاڵی دوکانی وێنەگران، لەسەر پەنجەرەی ڕچیوی چایخانە پڕەکان لە کەسانی بێ کار کە یاریی کاغەزیان دەکرد و لە مەیدانە چۆڵە بەبەفر داپۆشراوەکاندا دەیبینی و دواتریش بەردەوام دەیبینینەوە. وەکو ئەوە وابوو کە بەهەموو لایەک ئەم شارەیان لە بیر کردبێ و بەفریش تا کۆتاییی ژیان بەکپی و بێ هەدادان هەر بباریێ.

سپێدە تێ پەڕی و بەخت یاوەری (کا) بوو، بەچاوی ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگی ئەستەمبوڵی لێیان دەڕوانی، هەمووان تێ دەکۆشان بیناسن و تەوقەی لەگەڵدا بکەن. هەر لە جێگری پارێزگارەوە بگرە هەتا هەژارترین کەس، هەموو دەرگایان بۆ دەخستە سەرپشت و قسەیان بۆ دەکرد. ئەو کەسەی (کا)ی بەقارسییەکان ناساند، سەردار بەگی سەرنووسەری (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) بوو کە سێ سەد و بیست دانەی لێ دەفرۆشرا. بۆ خۆیشی سەردەمانێک هەواڵە ناوخۆییەکانی قارسی بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت دەنارد، (بەڵام زۆربەیان بڵاو نەدەکرانەوە). (کا) دەمی بەیانی کاتێک لە میوانخانەکە هاتە دەرێ، یەکەم کاری ئەوە بوو خۆی بگەیەنێتە بەر دەرگای ماڵی ئەو ڕۆژنامەنووسە دێرینەی کە لە ئەستەمبوڵ ناوەکەیان پێی دابوو و پێیان گوتبوو ئەمە (پەیامنێری هەرێمی)مانە. (کا) دەسبەجێ تێ گەیشت کە ئەم کابرایە

هەموو قارس دەناسێ. ئەو پرسیارەی کە سەدان جار لە ماوەی سێ ڕۆژ مانەوەیدا لە قارس ڕووبەڕووی (کا) کرایەوە، یەکەم جار لە سەردار بەگەوە هات: "بەخێر بێن بۆ شاری سەرحەد ئوستادم، بەڵام چ کارێکتان هەیە لێرە؟"

(کا) لە وەڵامدا گوتی کە بۆ چاودێکردنی هەڵبژاردنەکان هاتووم و لەوانەیشە وتارێک لەسەر ئەو ژنانە بنووسم کە خۆیان دەکوژن.

ڕۆژنامەنووسەکە گوتی: "لێرەش وەکو باتمان بەپێوەنانەوە باس لە خۆکوشتنی ژنان دەکرێ. با بچین سەرێک لە قاسم بەگی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایش بدەین، کەس نازانێ چ دەقەومێ! با ئەویش لە هاتنتان ئاگادار بێت."

بەپێی نەریتێک کە مێژووەکەی بۆ سەرەتای ساڵەکانی ١٩٤٠ دەگەڕایەوە، هەر بیانییەک بگەیشتبایە ئەو شارە، با ڕۆژنامەنووسیش بوایە، پێویست بوو خۆی بەپۆلیس بناسێنێ. (کا) وەکو سیاسییەکی دوورخراوەی دوای چەندین ساڵ گەڕاوە بۆ وڵات و لەبەرئەوەیش هەستی بەجمووجۆڵی گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستانیش کردبوو کە ئەگەرچی بەئاشکراش باس نەدەکرا، پێشنیارەکەی ڕەت نەکردەوە.

لە ماوەی پازدە خولەکدا، بەشێوەیەکی نیوە بازنەیی و بەدەم بارینی بەفرەوە شاریان لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر تەی کرد. سەرەتا بەبازاڕی میوەفرۆشاندا، پاشان بەشەقامی نازم قەرەبەکر و بەبەردەمی ڕیزە دوکانی ناڵبەند، پارچەفرۆش، شیر و ماستفرۆشەکاندا و بەپێش ئەو چایخانانەدا تێ پەڕین کە بێ کارەکانی ناویان بەغەمگینییەوە سەیری تەلەفزیۆن و بارینی بەفریان دەکرد.

سەردار بەگ هەڵوێستەیەکی کرد و بەئاماژەی دەست ئەو شوێنەی نیشانی (کا) دا کە سەرۆکی پێشووی شارەوانی لێ کوژرا بوو. بەگوتنی هەندێ کەس، کێشەکە زۆر سادە بووە، سەرۆکی شارەوانیی لەبەرئەوەی بڕیاری ڕووخاندنی باڵکۆنێکی دابوو کە بەنایاسایی بنیاد نرابوو، تەقەی لێ کرابوو و کوژرابوو. بکوژەکە پەنای بردبووە بەر گوندەکەی خۆیان و دوای سێ ڕۆژ لە ئەنجامدانی تاوانەکەی، لە کادانی ماڵەکەیاندا بەچەکەکەیەوە دەستگیر کرابوو. بەدرێژاییی ئەو سێ ڕۆژە ئەوەندە



پڕوپاگەندە کرابوو و هێندە بەکێشەکەوە نرابوو، خەڵکەکە باوەڕیان نەدەکرد ئەمە بکوژەکە بێت. هۆی سادە و ساکاری ئەم تاوانە جۆرێک لە خەیاڵشکێنیی لای خەڵکەکە دروست کرد.

بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی قارس لە باڵەخانەیەکی درێژی سێ نهۆمیدا بوو، یەکێک بوو لەو باڵەخانە بەردینانەی کە بەدرێژاییی شەقامی فایەق بەگ پاڵیان بەیەکەوە دابوو و لە پاشماوەی دەوڵەمەندەکانی ڕووس و ئەرمەنەکان بوون و بەزۆریش بۆ کاروباری دەوڵەت تەرخان کرابوون. لەو دەمەدا کە چاوەڕێی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشیان دەکرد، سەردار بەگ ئاماژەی بۆ بنمیچی نەخشێنراوی باڵەخانەکە کرد و گوتی کە ئەم کۆشکە لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕووسەکاندا لە ١٨٧٧–١٩١٨دا کۆشکێکی چل ژووریی دەوڵەمەندێکی ئەرمەنی بووە و دواتر کراوە بەنەخۆشخانە.

قاسم بەگی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایش بەورگە دەرپەڕیوەکەیەوە هاتە ڕێڕەوەکەوە و هەردووکیانی دایە پێش بۆ ژوورەکەی خۆی. (کا) دەستبەجێ ئەوەی بۆ ڕوون بووەوە کە قاسم بەگ ڕۆژنامەی جمهوورییەت بەچەپ دەزانێ و نایخوێنێتەوە، حاڵیش بوو سەردار بەگ لە وتارێکدا بەشان و باڵی شاعیرێتیی کەسێکیدا هەڵداوە و ئەمەیش لای قاسم بەگ مایەی پەسەندکردن نەبووە. بەڵام (کا) سەرنجی دا کە قاسم بەگ بەشەرمەوە ئەم ڕازانە لە بەردەم سەردار بەگی خاوەنی بەربڵاوترین ڕۆژنامەی قارسدا دەدرکێنێ. پاشان ڕووی پرسیاری لە (کا) کرد و گوتی:

"پاسەوانتان دەوێ؟"

"چۆن؟!"

"کەسێکی سڤیلی خۆمان دەخەینە تەکتان بۆ ئەوەی خەیاڵتان ئاسوودە بێت."

(کا) بەدەردی نەخۆشێک کە پزیشک پێشنیاری بۆ کردبێ ئیدی بەدارشەق بەڕێوە بڕوات پرسیاری کرد: "ئایا پێویستم بەوە هەیە؟"

قاسم بەگ لە وەڵامدا گوتی:

"شارەکەمان لە شوێنێکی ئارامدا هەڵکەوتووە. تیرۆریستە جوداخوازەکانمان لەم

ناوە وەدەرناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس نازانێ چ دەقەومێ و چ ناقەومێ."

(کا) گوتی:

"ئەگەر قارس شارێکی ئارام بێت، پێویستم بەپاسەوان نابێ."

(کا) لە ناخی خۆیدا ویستی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایش دووپاتی بکاتەوە کە قارس کەوتووەتە شوێنێکی ئارامەوە، بەڵام قاسم بەگ ئەو دەستەواژەیەی دووبارە نەکردەوە.

سەرەتا ڕوویان لە هەردوو گەڕەکی ژێر قەڵا و بایرام پاشا کرد کە لە هەژارترین گەڕەکەکانی شار بوون. سەردار بەگ بەدەم بارینی بەفرەوە لە دەرگای ئەو خانووانەی دەدا کە بەچینکۆ و دار و پەردوو پێکەوە نرابوون. کاتێک ژنان دەرگایان دەکردەوە، ئەم پرسیاری پیاوەکانی لێ دەکردن. بەبڕوایەکی پتەو بەخۆوە، خۆی بەخەڵکەکە دەناساند و دەیگوت: "ئەم هاوڕێ ڕۆژنامەنووسەم بەبۆنەی هەڵبژاردنەکانەوە لە ئەستەمبوڵەوە بۆ قارس هاتووە، بەڵام هەر هەڵبژاردنەکان نا، بەڵکو ئەو خوازیارە لەسەر کێشەکانی قارس و دەربارەی خۆکوشتنی ژنانیش بنووسێ، جا ئەگەر گرفتەکانی خۆتانی بۆ بگێڕنەوە، ئەوا بۆ قارسیش باش دەبێت." هەندێک لە ژنەکان بەبیستنی ئەم قسانە دڵخۆش دەبوون، چونکە وایان دەزانی میوانەکان پاڵێوراوەکانی سەرۆکایەتیی شارەوانین و تەنەکەڕۆنی گوڵەبەڕۆژە یان سندووقی سابوون یاخۆ بەستە پسکیت و هەڕەشتەیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە. ئەوانەیشی لە ڕووی میوانپەروەرییەوە مۆڵەتی چوونە ژوورەوەیان پێ دەدان، بە(کا)یان دەگوت کە لە وەڕینی سەگەکان نەترسێ. هەندێکی دی لە ژنەکان پێیان وابوو کە ئەمە بەسەرادانی تری لەو جۆرەیە کە ساڵانێکی درێژە بەردەوام دووبارە دەبنەوە، بۆیە بەترس و دڵەڕاوکێوە دەرگاکانیان دەخستە سەرپشت، کاتێکیش حاڵی دەبوون کە میوانەکان سەر بەپیاوەکانی دەوڵەت نین، پەنایان بۆ هونەری بێدەنگی دەبرد. دەربارەی کچە خۆکوشتووەکانیش ((کا) توانیبووی لە ماوەیەکی کورتدا شەش ڕووداو دەستنیشان بکات)، کەسوکاریان دەیانگوت کە کچەکانیان هیچ گازندەیان دەرنەبڕیوە و سەریان لەم ڕەفتارانەی کچەکانیان سوڕماوە و بۆ لە دەستدانیشیان زۆر پەرێشان و ماتەمبارن.



لە ژووری گڵڕێژکراو یان داپۆشراو بەڕایەخی ماشینکردی بچووکی هێندەی لەپێکی دەست و ساردی وەکو بەفردا، لەسەر کورسیی کۆن و شەقوشڕی لارەوەبوو و لە نێوان ئاپۆرەی منداڵاندا کە لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دی ژمارەیان زیادی دەکرد و بێ وچان تاویان دەدا و بەپارچە پلاستیکی شکاو (ئۆتۆمبیل و بووکەشووشەی یەک قۆڵ) و شووشە و قوتووی بەتاڵی دەرمان و کارتۆنی بۆشی چای گەمەیان دەکرد، بەدیار سۆپای دارەوە کە پێویست بوو بۆ جۆشدان بێ وەستان تێک بدرایە، یان لە بەردەم سۆپای کارەباییدا کە بەکارەبای قاچاخ کاری دەکرد، لە پێش تەلەفزیۆنە بەردەوام داگیرساو و بێ دەنگراوەکاندا، (کا) و هاوڕێکەی، گوێیان بۆ خەمە بێ کۆتاییەکانی قارس و چیرۆکی هەژاری و لە کار دەرکردن و خۆکوشتنی کچان ڕاگرت. خێزانە هەژارەکان چیرۆکی تایبەتی خۆیان بەشێوەیەک بۆ (کا) دەگێڕایەوە وەکو ئەوەی گرفتی وڵات و دەوڵەت بن. دایکان گازندەی خۆیان لە بێ کاریی کوڕەکانیان دەردەبڕی و بۆ کەوتنە زیندانی منداڵەکانیان دەگریان، یاخۆ بۆ کاری ڕۆژانەی دوازدە سەعاتی گسکلێدەریان لە گەرماوەکاندا کە بەناچاری بۆ تێرکردنی سکی هەشت سەر خێزانیان دەیانکرد. دایکان گلەییان لە بەدبەختیی خۆیان لەگەڵ دەوڵەت و شارەوانیدا دەکرد و دەیانگوت کە منداڵەکانیان بێ کارن و بەهۆی نەبوونی پارەی پیاڵە چایەکەوە لە ڕۆیشتن بۆ چایخانەکان دەسڵەمێنەوە.

لە پنتێکی هەموو ئەو بەسەرهات و تووڕەیی و کەف و کوڵەدا و سەرباری تیشکی ئەو ڕووناکییەی لە پەنجەرەکانەوە دزەی دەکردە ژوورەکانەوە، (کا) هەستی کرد تاریکی باڵی بەسەر ئەو ماڵانەدا کێشاوە کە ئەم لێی دەچێتە ژوورێ و لێی دێتە دەرێ و شمەکەکانی ناویان لەیەک جیا ناکاتەوە. لەوەش زیاتر هەر هەمان نەبینینە ناچاری دەکرد نیگای بخاتە سەر کلووە بەفرەکانی دەرەوە کە لە پەردەیەکی تەنک دەچوون، یاخۆ شێوەیەک لە شێوەکانی کپیی بەفر باڵی بەسەر هۆشیدا دەکێشا و ئاوەز و بیرەوەریشی بەرپەرچی بەسەرهاتەکانی هەژاری و بێ نەواییی دەدایەوە.

(کا) دواتر تا لە ژیاندا مابوو، نەیتوانی بەسەرهاتی هیچ کام لەو خۆکوشتنانە لە بیر بکات کە بۆیان گێڕابووەوە. ئەوەی لە بەسەرهاتەکاندا (کا)ی هەژاندبوو، هەژاری و کڵۆڵی یان تێنەگەیشتنی دایکان و باوکان و دارکاریکردنی کچان و

کوڕەکانیان و ڕێگرتن لە چوونە دەرەوەیان، یاخۆ گوشاری پیاوە دڵپیسەکان بۆ سەر ژنەکانیان نەبوو، بەڵکو ئەوەی ترسی خستبووە دڵی (کا)وە و سەرسامی کردبوو، ئەوە بوو کە دیاردەی خۆکوشتن، لەناکاو، بێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت و بێ ڕێوڕەسم خۆی بەژیانی ڕۆژانەدا دەکرد.

بۆ نموونە کچێک کە لەوەدا دەبێ بدرێ بەخاوەن چایخانەیەکی بەساڵاچوو، وەکو هەموو ڕۆژێک لەگەڵ باوکی و دایکی و سێ خوشک و براکەی و داپیرەیدا شیو دەخوات، پاشان بەدەم گاڵتە و بێنە و بەردەوە لەگەڵ خوشکەکانیدا قاپەکان کۆ دەکاتەوە، دواتر بەنیازی هێنانی شیرینی دەچێتە ئاشپەزخانەکە، لەوێوە دەچێتە حەوشەکەوە و لە پەنجەرەوە خۆی بەژووری دایک و باوکیدا دەکات و بەتاپڕەکەی باوکی گوللەیەک بەخۆیەوە دەنێ. دایک و باوکەکە کە پێیان وابوو کچەکەیان لە ئاشپەزخانەکە شیرینییان بۆ دێنێ، دەکەون بەسەر جەستەی لە خوێندا خەڵتانبووی کچەکەیاندا و تێ ناگەن بۆچی لە ئاشپەزخانەکەوە چووەتە ژوورەکەی ئەوان و لە پای چی خۆی کوشتووە. کچێکی تری شازدە ساڵە لەسەر ئەوەی سەیری کام کەناڵی تەلەفزیۆن بکەن و کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکە بەدەست کامیانەوە بێ، هەموو ئێوارانێک لەگەڵ خوشک و براکانیدا دەبێتە هەرایان، باوکیان کە بۆ جیاکردنەوەیان دێ، دوو زللەی توند بەبناگوێی کچەکەیدا دەسرەوێنێ، دواتر کچەکە دەچێتە ژوورەکەی خۆی، هەروەکو ئەوەی بوتڵێک ئاوی کانزایی (مۆرتالین) بخواتەوە، شووشەیەک دەرمانی دژە مێرووی کشتوکاڵی بەسەرەوە دەنێ و دوای چەند ساتێک گیان لە دەست دەدات. کچێکی تری پازدە ساڵە لە ئەنجامی خۆشەویستییەوە شوو دەکات و شەش مانگ لەوەوبەر منداڵێکی دەبێت. لە لێدانی پیاوە بێکار و چەوسێنەرەکەی بێزار دەبێت، ڕۆژێک دوای دەمەقاڵێیەکی ئاسایی دەچێتە چێشتخانەکەوە و لەو دیوەوە دەرگا لەسەر خۆی کلۆم دەکات. پیاوەکەی بەدەم هاوار و بانگکردنەوە دەرگاکە دەشکێنێ و دەبینێ ژنەکەی بەپەتێکی هەڵواسراو بەقولاپێکەوە کە پێشتر ئامادەی کردووە، خۆی هەڵواسیوە و لە یەکەم هەوڵدا گیانی لە دەست داوە.

لە سەرجەم ئەم بەسەرهاتنانەدا جۆرێک لە خێرایی و ناهومێدی کە (کا)ی ئەفسووناوی کردبوو، لە هاتوچۆی نێوان مەرگ و ڕەوتی ئاساییی ژیاندا هەبوو.



قولاپی قایمکراو لە بنمیچەکان و تفەنگە فیشەک لەبەرەکان و هێنانی شووشەی دەرمانی دژەمێرووی کشتوکاڵی لە ژوورە چەپەکانەوە بۆ ژووری نووستن، بەڵگە بوون بۆ ئەوەی کە تۆوی خۆکوشتن لەمێژ بووە لە سەری ژنەکاندا چەکەرەی کردووە.

دیاردەی خۆکوشتنی کچان و ژنان سەرەتا لە باتمانەوە سەری هەڵدا کە چەند سەد کیلۆمەترێک لە قارسەوە دوورە. ڕێژەی خۆکوشتنی پیاوان لەسەر ئاستی جیهان سێ یان چوار بارتەقای ڕێژەی خۆکوشتنی ژنانە، بەڵام پێچەوانەبوونەوەی ئەم ڕێژەیە لە باتمان، سەرنجی کارمەندێکی لاوی دەزگای ئامار لە ئەنکارا ڕادەکێشێ و هەواڵێکی بچووک لەو بارەیەوە دەداتە ڕۆژنامەی جمهورییەت کە سەرەتا هیچ کەس و لایەنێک لە تورکیا بایەخی پێ نادات. ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا و فەرەنسا بەم هەواڵەیان زانی، بەدەمییەوە چوون و پەیامنێرەکانی خۆیان لە تورکیا بۆ باتمان نارد. دوای ئەوەی ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا لە وڵاتەکانی خۆیان هەواڵی دیاردەی خۆکوشتنی ژنانی باتمانیان بڵاوکردەوە، ڕۆژنامەکانی تورکیایش ئاوڕیان لە دیاردەکە دایەوە و بەدوای ئەوەشدا ئاپۆڕەی ڕۆژنامەنووسان و هەواڵنێرانی ناوخۆیی و بیانی ڕوویان لە شارەکە کرد. بەبۆچوونی هەندێک لە فەرمانبەرانی پێوەندیداری دەوڵەت، ئەم بایەخ پێدان و بڵاوکردنەوەیە هانی هەندێک کچ و ژنی تری داوە بۆ خۆکوشتن. جێگری پارێزگار لە قسەکانیدا بە(کا)ی گوت کە ژمارەی ژنە خۆکوشتووەکانی قارس ناگات بەوانەی باتمان، گوتیشی لاری نییە لەوەی (کا) "ئێستا" چاوی بەچەند بنەماڵەیەکی کچە خۆکوشتووەکان بکەوێ، بەڵام تکای لە (کا) کرد کە لە وتووێژ لەگەڵیاندا دەست بەبەکارهێنانی وشەی "خۆکوشتن"ەوە بگرێ و لە نووسینەوەی بابەتەکەشدا بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت زیادەڕۆیی نەکات. هەمان کات تەدارەک ساز درابوو بۆ هاتنی دەستەیەکی پێکهاتوو لە شارەزایەکی دەروونی، پۆلیسێک، نوێنەرێکی دادوەری و ئەندامێکی دامەزراوەی کاروباری ئاینی لە باتمانەوە بۆ قارس. پێشوەختیش دەست کرابوو بەهەڵواسینی پۆستەری دژ بەخۆکوشتن کە بەفەرمانی دامەزراوەی کاروباری ئاینی چاپ کرابوون و لەسەریان نووسرابوو: (مرۆڤ شاکاری خودایە و خۆکوشتن کفرە). چەند نامیلکەیەکیش بەهەمان ناوەوە گەیشتبوونە پارێزگا و بەسەر دانیشتوواندا دابەش کرابوون.

سەرباری ئەوەیش جێگری پارێزگار لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەو هەنگاوانە ڕێ لەو دیاردەی خۆکوشتنە بگرێ کە ماوەیەکە شاری قارسی گرتووەتەوە، بەڵکو بگرە ترسی ئەوەی هەبوو کە ئەم تەگبیرانە ئەنجامی پێچەوانەیان هەبێ، چونکە زۆربەی کچان وەکو کاردانەوەیەک بەرامبەر بەدەوڵەتی دژبەری خۆکوشتن، دژ بەباوکان، پیاوان، مەلاکان و هەواڵەکانی خۆکوشتن بڕیاری خۆکوشتنیان دەدا.

جێگری پارێزگار بە(کا)ی گوت: "بەدڵنیاییەوە هۆی خۆکوشتنی کچان و ژنانمان ناهومێدیی لە ڕادەبەرە، هیچ گومان لەمەدا نییە، بەڵام خۆ ئەگەر بێ ئومێدی هۆکارێکی ڕاستەقینەی خۆکوشتن بێت، ئەوا دەبوایە نیوەی ژنانی تورکیا پەنایان بۆ خۆکوژی ببردایە." جێگری پارێزگار کە سمێڵێکی فلچە ئاسا و دەموچاوێکی سمۆرەیی پێوە بوو، بە لەخۆباییبوونەوە بە(کا)ی گوت کە ژنان بەبیستنی ئامۆژگاریی (خۆت مەکوژە) لە دەوڵەت و لە خێزانەکانیان و لە دەنگی نێرینەی ئاین پەستن، بۆیە نووسراوێکی بۆ ئەنکارا ناردووە و تیایدا داوای کردووە بەلایەنی کەمەوە ژنێک لەو دەستە و تاقمانەدا هەبێ کە بەمەبەستی هەڵمەتی دژ بەخۆکوژی ڕوو لە ناوچەکە دەکەن.

بیرۆکەی خۆکوشتن، سەرەتا، دوای گەڕانەوەی کچێک لە باتمانەوە بۆ قارس بەنیازی خۆکوشتن، وەکو پەتا تەشەنەی کردبوو. دوای نیوەڕۆ (کا) لە ژێر دار زەیتوونە ڕووسییەکانی ناو حەوشەیەکی بەبەفر داپۆشراوی گەڕەکی ئەتاتورکدا (فەرموویان لێ نەکردبوو بۆ ژوورەوە) خاڵی کچەکەی دواند. کابرا بەدەم جگەرەکێشانەوە بە(کا)ی گوت کە خوشکەزاکەی پێش دوو ساڵ بەبووکی بۆ باتمان براوە، لەوێ سبەی تا ئێوارە لە کاروباری ناو ماڵدا کاری کردووە و لەبەرئەوەی منداڵی نەبووە، بەردەوام لە لایەن خەسوویەوە سەرزەنشت کراوە. بەپێی قسەی کابرا ئەم هۆکارانە بەس نین بۆ خۆکوشتن، بۆیە دەبێ کچەکەیان بیرۆکەی خۆکوشتنی لە ژنە خۆکوشتووەکانی باتمانەوە وەرگرتبێ، سەرباری ئەوەی خوداێخۆشبوو لە ناو کەسوکاریدا لە قارس نیشانەی کامەرانیی پێوە دیار بووە، کەچی سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژەی کە دەبوو بۆ باتمان بگەڕێتەوە، تەرمی کچەکەیان لە ناو جێدا دۆزیوەتەوە و لە نامەیەکدا کە لە تەنیشت سەرینەکەیەوە دانابوو،



نوسیبووی کە دوو پاکەت حەبی خەوی قوت داوە. خاڵەکەی باسی ئەوەی کرد کە زۆر سەریان لەم ڕووداوە سوڕماوە.

دوای مانگێک لەم ڕووداوە کە بیرۆکەی خۆکوشتنی لە باتمانەوە بۆ قارس گواستەوە، پورزا شازدە ساڵییەکەی ئەو ژنە هەمان چارەنووسی هەڵبژارد. هۆی خۆکوشتنی ئەم کچە کە (کا) بەڵێنی بەدایک و باوکە چاو بەگریانەکەی دا بەسەرهاتەکەی بەهەموو وردەکارییەکانیەوە لە ڕۆژنامەدا بڵاو بکاتەوە، ئەوە بووە یەکێک لە مامۆستاکان لە پۆلدا پێی گوتووە کە پەردەی کچێنیی لە دەست داوە. ئەم قاودانە دوای ماوەیەکی کورت زۆر بەخێرایی بەهەموو قارسدا بڵاو دەبێتەوە و هەر لەبەر ئەو هۆیە دەزگیرانەکەیشی دەستی لێ هەڵدەگرێ. ئەو داخوازیکارە زۆرانەیش کە پێشتر دەیانەوێ ئەم کچە شۆخە بخوازن، پێ لە ماڵیان دەبڕن. لەو دەمانەدا دایکی پێی دەڵێ کە ئیدی هەرگیز شووی دەست ناکەوێ. لە کاتێکدا ئەندامانی خێزانەکە هەموویان پێکەوە لە تەلەفزیۆندا سەیری دیمەنی شایی و زەماوەند دەکەن، باوکە سەرخۆشەکەی دەست بەگریان دەکات، کچەکە قوتوویەک حەبی خەو لە سندووقی تفاقەکانی نەنکی دەدزێ، هەمووی قوت دەدات و دەنوێ. (شێوازەکانی خۆکوشتنیش بەهەمان خێراییی بیرۆکەی خۆکوشتن تەشەنەی دەکرد) کاتێکیش پزیشکی دادوەری زانی کچە خۆکوشتووەکە پەردەی کچێنیی لە دەست نەداوە، باوکی و ئەو مامۆستایەیش کە تۆمەتی بێ بنیی دابووە پاڵی، تاوانی خۆکوشتنی کچەکەیان خستە ئەستۆی خزمە گەڕاوەکەی باتمانی. کەسوکاری کچەکە لەبەرئەوەی داوایان لە (کا) کرد لە هەواڵەکەدا باسی بێتاوانیی کچەکەیان بنووسێ و ئەو مامۆستایە ڕیسوا بکات کە تۆمەتەکەی دابووە پاڵی، بەوردی چیرۆکی خۆکوشتنی کچەکەیان گێڕایەوە.

ئەوەی لە هەموو بەسەرهاتەکاندا (کا)ی پەلکێشی ناو بێ ئومێدییەکی سەیر کرد، کچان توانیویانە تەنیا بۆ خۆکوشتن پەنا و کاتیان دەست بکەوێ. تەنانەت ئەو کچانەش کە بەدزییەوە بەقوتدانی حەبی خەو خۆیان کوشتووە، ژووری تایبەت بەخۆیان نەبووە، بەڵکو ژووری هاوبەشیان لەگەڵ ئەندامانی تری خێزانەکانیاندا هەبووە. (کا)ی دەرچووی بەشی ئەدەبیاتی ڕۆژئاوایی و پەروەردەی نیشانتاشیی

ئەستەمبوڵ کاتێک بیری لە کوشتنی خۆی دەکردەوە، پێی وابوو کاتێکی درێژی بۆ ئەم کارە دەوێت و دەبێ لە ژوورێکدا بێت کە تا چەندین ڕۆژ کەس لە دەرگاکەی نەدات. بۆیە هەتا زیاتر لە بیرۆکەی خۆکوشتندا قووڵ بوایەتەوە کە وای دادەنا بەئازادی و بەقوتدانی حەبی خەو و خواردنەوەی وێسکی ئەنجامی بدا، لەو تەنیاییە بێ سنوورە دەترسا و هیچ کاتێک بیرۆکەی خۆکوشتنی بەهەند نەدەگرت.

تاقە کەسێک کە ئەم هەستی تەنیاییەی لای (کا) زیندوو کردەوە، (کچی سەرپۆش بەسەر) بوو کە مانگێک و هەفتەیەک لەوەوبەر خۆی هەڵواسیبوو. ئەو یەکێک بوو لە کچانی پەیمانگای پەروەردە کە لە دەسپێکدا ڕێیان پێ نادرێ بەسەرپۆشەوە بچنە پۆلەوە و دوای ئەوەش، لە ئانکاراوە بڕیار هات و ڕێی چوونە ژوورەوەی پەیمانگاشیان لێ گیرا. باری دارایی خێزانی کچەکە لە هەموو ئەو خێزانانەی تر باشتر بوو کە (کا) دواندبوونی. (کا) بەدەم خواردنەوەی کۆکا کۆلاوە کە باوکی کۆستکەوتووی کچەکە لە یەخچاڵی دوکانی بەقاڵییەکەی دەری هێنا، زانی کەوا کچەکە ماوەیەک بەر لە خۆکوشتنی، لای خێزانەکەی و دەستەخوشکەکانی بابەتەکەی کردووەتەوە. کچەکە لە دایکی و لە خێزانەکەیەوە فێری سەرپۆش بەسەرکردن بووبوو، بەڵام دواتر لە ڕێی بەڕێوەبەرانی قەدەغەکاری پەیمانگا و دەستەخوشکە بەرهەڵستکارەکانیەوە زانیبووی کە سەرپۆش نیشانەی ئیسلامی سیاسییە. کاتێک، سەرەڕای گوشاری دایک و باوکیشی، ڕازی نابێت سەرپۆش فڕێ بدات، پۆلیس بەبیانووی پەیوەست نەبوون بەمەرجەکانی دەوامەوە، ڕێگای چوونەوە ژوورەوەی پەیمانگای پێ نادەن و لەوە نزیک دەبێتەوە لە پەیمانگا دەربکرێ. کاتێکیش بۆی دەردەکەوێ هەندێک لە دەستەخوشکەکانی لە بڕیاری خۆیان پاشگەز بوونەتەوە، سەریان ڕووت کردووە و باروکەیان لەسەر کردووە، بەباوک و هاوڕێکانی دەڵێ: "هیچ شتێک لە ژیاندا واتای نەماوە، من نامەوێ بژیم." ئیدی لەو ڕۆژانەدا کە هەم دامەزراوەی کاروباری ئاینیی سەر بەدەوڵەت و هەم ئیسلامییەکان خۆکوشتن بەیەکێک لە تاوانە گەورەکان لە قەڵەم دەدەن و لەو پێناوەدا بەدەست و بەهەڵواسین نامیلکە و پۆستەر بڵاو دەکەنەوە، بەخەیاڵی کەسدا نایات ئەم کچە باوەڕمەندە پەنا بۆ خۆکوشتن ببات. بەڵام بیرۆکەی خۆکوشتن لە خەیاڵی ئەمدا چەکەرە دەکات، لە



دوایین شەوی ژیانیدا بەبێ دەنگی لە تەلەفزیۆندا سەیری زنجیرەی ماریانا دەکات. چای لێ دەنێ و دەیخاتە بەردەستی دایک و باوکی، دوایی خۆی دەدزێتەوە بۆ ژوورەکەی، دەستنوێژ دەشوات، نوێژ دەکات و دوای ئەوەی ساتێکی درێژ بەخەیاڵێکی پەرش و بڵاوەوە لە خودا دەپاڕێتەوە، بەلەچکەکەی، خۆی بەقولاپی گڵۆپی ژوورەکەدا هەڵدەواسێ.

## ٣

# دەنگ بدەن بەحزبی خودا

## هەژاری و مێژوو

لە تافی منداڵیدا، هەژاری بەلای (کا)وە ئەو سەرزەمینە بوو کە سنوورەکانی ژیانی چینی ناوەڕاستی لە نیشانتاشی بەسەربردووی، لەوێدا کۆتاییان دەهات. ئەو ژیانەی کە لە باوکێکی پارێزەر، دایکێکی خانمی ماڵەوە، خوشکێکی خوێن شیرین، خزمەتکارێکی دڵسۆز، چەند ڕایەخێک و ڕادیۆیەک و پەردەکان پێک دەهات. لەودیو سنووری ماڵیشەوە، تخووبی جیهانێکی تر دەستی پێ دەکرد. ئەو جیهانەی دی، لەبەرئەوەی تاریکییەکی ترسناکی دەست پێ ڕانەگەیشتووی هەبوو، لە فانتازیای منداڵانەی (کا)دا ڕەهەندێکی میتافیزیکیی هەبوو. هەرچەندە ئەم ڕەهەندە لە قۆناغەکانی دواتری ژیانیدا هەر مابووەوە، بەڵام بۆی ڕوون نەبووەوە بۆچی کاتێک کە لە ئەستەمبوڵ بڕیاری سەفەری قارسی دا، یەکسەر تاسەی تافی منداڵیی کرد. (کا) سەرەڕای دووربوونی لە تورکیا، دەیزانی قارس لەم ساڵانەی دواییدا هەژارترین و لەبیرکراوترین هەرێمی وڵاتە. کاتێک دوای بەسەربردنی دوازدە ساڵ ژیان لە فرانکفورت گەڕایەوە، لە گەشتێکدا لەگەڵ هاوڕێکانی سەردەمی منداڵی بەکوچەکانی ئەستەمبوڵدا بۆی دەرکەوت کە سەرتاپا شەقام و دوکان و سینەماکانی ئەستەمبوڵ گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە، یاخۆ نەماون و ڕۆحیان گۆڕاوە، ئەمە وای کرد هەستێک لە ناوەوە پاڵی پێوە بنێ تا لە شوێنێکی تر هەڵوەدای سەردەمی منداڵی و پاکیزەیی ببێت، بۆیە دەکرێ بڵێین (کا) بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ ئەو ژیانە مامناوەندییەی کە لە تافی منداڵیدا لە دوای خۆی بەجێی هێشتبوو بەرەو قارس کەوتبووە ڕێ. بەڕاستیش کاتێک لە جامخانەی دوکانەکانی ناو بازاڕدا پێڵاوی مارکەی (گیسلاف)ی دەبینی کە ئەم لە کاتی منداڵیدا لە پێی دەکرد و ئێستا لە ئەستەمبوڵ باوی نەماوە، یان سۆپای مارکەی (ڤەزویڤ) یاخۆ پەنیری شەشپاڵوویی



ناو قوتووی دەبینی کە لە منداڵیدا ئەمی بەقارس ئاشنا کردبوو، هێندە مەست و کەیفساز دەبوو، بەجۆرێک تەنانەت کچانی خۆکوشتوویشی لە بیر دەکرد و لە قارس هەستی بەئارامی دەکرد.

(کا)، دەمەونیوەڕۆ خۆی لە سەردار بەگی ڕۆژنامەنووس دابڕی، پاش دیداری لەگەڵ سەرانی پارتی یەکسانیی گەلان و کەسانی ناوداری ئازەری، بەتەنیا و بەژێر کلووە بەفرەکاندا بەشاردا گەڕا. لە پیاسەیەکی غەمگیندا لە شەقامی ئەتاتورکەوە بەسەر پردەکاندا بەرەو هەژارترین گەڕەکەکانی شار ڕێگای پێوا. کاتێک هەستی کرد لەو بێ دەنگییەدا کە سەگوەڕ نەبێ هیچی دی نەشڵەقاند، بەفر وەکو ئەوەی بیەوێ زەمەنێکی بێ کۆتایی داپۆشێ، بەسەر چیا دوورە نەبینراوەکان، قەڵای پاشماوەی سەلجوقییەکان و کوڵێتەکانی جیاوەنەبوو لە کارەساتە مێژووییەکاندا دەبارێ، فرمێسک زایە چاوەکانی. سەیری دەستەیەک هەرزەکاری کرد کە هەموویان لە تەمەنی قوتابیانی قۆناغی ناوەندیدا بوون و لە گەڕەکی یووسف پاشا لە تەنیشت پارکێکی جۆلانێ پچڕاو و خلیسکانێ شکاودا، لەبەر ڕووناکیی گڵۆپە بەرزەکانی کۆگاکانی خەڵووزدا تۆپانێیان دەکرد. بەدەم گوێگرتن لە هاوار و قیژە و شەڕە جنێوی منداڵەکانەوە کە لە بەفرەکەدا کپتر دەگەیشتە گوێ، لەبەر ڕۆشنایی زەرد و لاوازی گڵۆپەکاندا و لە ژێر بارینی بەفردا هەستی کرد ئەم گۆشەیەی جیهان فرە تەنیایە و لە هەموو شتێکەوە دوورە، بەڵام هەستێکی هێندە بەهێز کە بیری خودای لە سەریدا وروووژاند.

ئەم هەستە لە سەرەتادا زیاتر وێنەیەک بوو وەک لەوەی بیرۆکەیەک بێ، بەڵام وێنەیەکی تەڵخی ئەوتۆ وەکو ئەوەی کەسێک بەپەلە بەژوورەکانی مۆزەخانەیەکدا بسووڕێتەوە و بێ بیرکردنەوە بۆ شتەکان بڕوانێ و دواتر هەوڵ بدات ئەوەی بینیویەتی بیهێنێتەوە بەرچاوی خۆی، بەڵام بۆی نەکرێ. لە وێنەیەک زیاتر، هەستێک بوو کە چرکەساتێک بەدەردەکەوت و دواتر ون دەبوو. (کا)یش یەکەم جاری نەبوو ئەمەی بەسەردا دەهات.

(کا) لە ئەستەمبوڵ لە ناو خێزانێکی لایسیستی کۆماریخوازدا پێ گەیشتبوو، لە قۆناغی سەرەتاییدا جگە لە وانەکانی ئاین لە قوتابخانە، لە هیچ شوێنێکی تر دەرزی

ئاینی نەخوێندبوو. لەم ساڵانەی دوایشدا کاتێک گیرۆدەی هەستێکی لە جۆری ئەوەی ئێستا دەبوو، نەخۆی دەشڵەژاند و نەدوای هەستێکی شاعیرانەش دەکەوت بۆ پێش لێ گرتنی، بەڵکو هەرە زیاد، بیری ئەوەی کە جیهان شوێنێکی شایستەی تێرامانە، بەگەشبینییەوە لە ناخیدا چەکەرەی دەکرد.

بەمەبەستی پشوودانێکی کورت گەڕایەوە بۆ هوتێل و لە ژوورەکەی خۆیدا و بەدەم ئەو هەستی بەختەوەرییەوە کە هێشتا بەری نەدابوو کەوتە هەڵگێڕانەوەی چەند کتێبێکی مێژووی قارس کە لە ئەستەمبوڵەوە لەگەڵ خۆی هێنابوونی. ئەو بەسەرهاتانەی بەدرێژاییی ڕۆژ بۆیان گێڕابووەوە لەگەڵ ئەم مێژووەدا کە داستانەکانی سەردەمی منداڵی هێنایەوە یادی، لە مێشکیدا ئاوێتەی یەکدی بوون.

سەردەمانێک لە قارس چینێکی ناوەندیی دەوڵەمەند کە لە کۆشکەکاندا ئاهەنگیان دەگێڕا و زەماوەندی چەندین ڕۆژەیان ساز دەکرد، ژیابوون و ئەمەش ئەگەرچی لە دووریشەوە بوایە، ساڵانی منداڵیی بەبیری (کا) دەهێنایەوە. سەرچاوەی هێز و دەوڵەمەندیی ئەم مرۆیانە دەگەڕایەوە بۆ هەڵکەوتنی قارس لەسەر شاڕێی نێوان گورجستان، تەبرێز، قەفقاسیا و تفلیس بۆ بازرگانی، بۆ ئەوەی کە شارەکە خاڵی بەیەکگەیشتنی هەردوو ئیمپراتۆریای عوسمانی و قەیسەری ڕووسی بوو کە لە سەدەی ڕابردوودا ڕووخان، بۆ ئەو هێزانەی کە ئیمپراتۆریاکان بەمەبەستی پاراستنی ئەم سەرزەمینە لە چیاکاندا مۆڵیان دەدان. لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ئێرە شوێنی نیشتەجێی میللەت و نەتەوەی جۆراوجۆر بوو، بۆ نموونە ئەرمەنییەکان کە هەندێک لە کڵێسا بنیادنراوەکانی هەزار ساڵ لەمەوبەریان هێشتا بەوپەڕی شکۆوە بەرەو ئاسمان هەڵکشاون، عەجەمەکانی پەڕیوە و هەڵهاتوو لە دەستی مەغۆلەکان و سوپاکانی ئێران، ڕۆمەکانی پاشماوەی دەوڵەتگەلی بیزانز، پۆنتوس، گورج، کورد و چەرکەز. کاتێک لە ساڵی ١٨٧٨دا قەڵای پێنج سەد ساڵە خۆی ڕادەستی ڕووسەکان دەکات، بەشێک لە موسڵمانەکان ژێردەستە دەبن، بەڵام دەوڵەمەندی و ئاڵۆزیی شارەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە. لە سەردەمی ڕووسەکاندا کۆشکەکانی پاشا، گەرماو و دامەزراوە عوسمانییەکانی گەڕەکی قەڵایچیی دامێنی قەڵا هەمووی تێک درا و بیناسازەکانی قەیسەر لە تەختاییی باشووری چەمی



قارسەوە بەڕاکێشانی پێنج شەقامی هاوتەریب لەگەڵ یەکتر و بەبنیادنانی چەندین کوچەی ڕەپ و ڕاست، شارێکیان لە قارس دروست کرد کە هیچ سیمایەکی ڕۆژهەڵاتیی پێوە دیار نەبوو و زۆر بەخێرایییش دەوڵەمەند دەبوو. سەردەمانێک قەیسەر ئەلێکساندەری سێیەم بۆ بەسەربردنی کات لەگەڵ یارە نهێنییەکەیدا و بۆ ڕاو و شکار ڕووی لە قارس دەکرد. شارەکە توانیبووی بەپشتیوانیی داراییی گەورەی ڕووسەکان، گرێبەستی دەست بەسەرداگرتنی هەموو ڕێ و بانە بازرگانییەکانی بەرەو باشوور و ڕووەو دەریای سپی، لە دەسپێکەوە ڕێک بخاتەوە. قارس کە (کا) بیست ساڵ لەمەوبەر سەری لێ دابوو و پێی سەرسام بووبوو، بەشەقامەکانی، بەردی زەبەلاحی ناو پارکەکانی، دار زەیتوونە ڕووسییەکانی و داربەڕووی دەستچێنی کۆماری تورکیاوە ئەم شارە غەمگینەی ئێستای لێ چێ بووبوو. قارس بەهۆی نەژادپەرستی و شەڕی نێوان هۆزەکانەوە، بناغەی تەختەییی خۆی لە دەست داوە و چی دی شارێکی عوسمانی نییە.

دوای سەردەمانێک لە شەڕی بەردەوام، وێرانکاری، بەکۆمەڵ کوشتن، یاخیبوون و پاش ئەوەی قارس سەردەمانێک کەوتە ژێر دەستی سوپاکانی ئەرمەنی و ڕووس و تەنانەت سەروەختێکیش ئینگلیزەکان و بەدوای ئەوەدا کە ماوەیەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، سوپای تورکیا بەپێشەنگی ئەو کازم قەرەبەکرەی کە ئێستا لە مەیدانی وێستگا پەیکەرێکی بۆ دانراوە، لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٠دا چووە شارەکەوە. تورکەکان کاتێک دوای تێپەڕبوونی چل و سێ ساڵ جارێکی تر دەستیان بەسەر قارسدا گرتەوە، نەخشەی نوێی قەیسەریان پەسەند کرد و جێبەجێیان کرد، ئەو چاندەی قەیسەرەکان لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، چوون لەگەڵ سەودای بوونە ڕۆژئاواییی کۆماردا یەکی دەگرتەوە، تورکەکان هەر لە سەرەتاوە پەژراندیان و هەریەکە لەو پێنج شەقامەیش کە ڕووسەکان دروستیان کردبوو، ئەمان ناوی جەنەراڵێکی سەربازییان لێ نا، هۆیەکەیشی ئەوە بوو تورکەکان کەسی گەورەتر لە سەرکردەکانی سوپایان نەدەناسی.

وەکو موزەفەر بەگی سەرۆکی پێشووی شارەوانی سەر بەپارتی گەل بە لەخۆباییبوون و هەڵچوونەوە دەیگێڕایەوە، ئەو ساڵانە ساڵانی بوونە ڕۆژئاوایی بوون.

له مەڵبەندە میللییەکاندا ئاهەنگی سەما ساز دەکرا، لە ژێر ئەو پردەیشدا کە (کا) ئەم بەیانییە بەسەریدا پەڕیەوە و لە زۆر لاوە ژەنگی گرتووە، پێشبڕکێی بەفرەخلیسکێ ساز دەکرا. گرووپی شانۆکارانیش کە لە ئانکاراوە بۆ نیشاندانی تراژیدیای (شا ئۆدیپوس) دەهاتن – سەرباری ئەوەی هێشتا بیستساڵ بەسەر شەڕی یۆناندا تێ نەپەڕیبوو– لە لایەن چینی مامناوەندیی کۆماریخوازی قارسەوە بەچەپڵەڕێزان پێشوازییان لێ دەکرا. دەوڵەمەندە دێرینەکان پاڵتۆی توکنیان دەپۆشی، پێ دەکەنین و بەسواری گالیسکەی سەر بەفری ڕازاوە بەگوڵ و شتی بریقەدار بەدوای ئەسپی هەنگاریی ڕەسەنەوە بەشاردا دەگەڕان. لە ئاهەنگەکاندا، هاوڕێ لەگەڵ پیانۆ و ئۆکۆردیۆن و کلارنێت لە ژێر داربەڕووە گەورەکانی باخچەی میللەتدا و بەمەبەستی هاندانی تیپی تۆپی پێ، دوایین جۆرەکانی سەما دەکرا. کچانی قارس کراسی نیو قۆڵیان دەپۆشی و دەیانتوانی بەدووچەرخە بەشەقام و کوچەکانی شاردا بگەڕێن. لاوان بەگالیسکەی سەر بەفر بۆ قوتابخانە دەچوون و وەکو قوتابیانی ناوەندییەکانی تر بەدەم هەڵگرتنی جۆش و خرۆشی کۆمارەوە کراڤاتی پەپوولەیان دەبەست. پارێزەر موزەفەر بەگ دوای چەندین ساڵ لە گەرمەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی شارەوانیی قارسدا کراڤاتە پەپوولەییەکی سەردەمی خوێندنی ئامادەییی بەستبوو. هاوڕێکانی لە ناو حزبدا پێیان گوتبوو ئەم شتە (مایەی گاڵتەجاڕییە) دەبێتە هۆی لە دەستدانی دەنگ، بەڵام ئەو گوێی بەم قسانە نەدابوو.

وەکو ئەوە وابوو پێوەندییەک لە نێوان زستانە بێ کۆتاییەکان و ڕۆچوونی شار و هەژاری و غەمگینییەکەیدا هەبێت. سەرۆکی پێشووی شارەوانی دوای وەسفێکی زستانە جوانەکانی ڕابردوو، هاتە سەر باسی هاتنی ئەو ژنە شانۆکارە نیمچە ڕووت و دەموچاو بەپۆدرە داپۆشراوانەی کە لە ئانکارەوە بۆ نمایشکردنی شانۆنامە یۆنانییەکان دەهاتن. پاشان قسەی بردەوە سەر شانۆگەرییەکی شۆڕشگێڕانە کە خۆی و کۆمەڵێک لاوی تر لە کۆتاییی چلەکاندا لە مەڵبەندێکی میللیدا پێشکەشیان کردبوو و گوتی: "لەو شانۆیەدا هوشیاربوونەوەی کچێکی سەرپۆش ڕەشی گەنجمان نیشان دەدا کە لە کۆتاییدا سەری ڕووت دەکرد و سەرپۆشەکەی دەسووتاند. هەموو قارسمان دایە ژێر پێوە و لە هەموو لایەک ئاگاداریمان بڵاوکردەوە بۆ پەیداکردنی



سەرپۆشێکی ڕەش بۆ شانۆگەرییەکەمان، بەڵام دەستمان نەکەوت، بۆیە ناچار تەلەفۆنمان بۆ ئەرزەرووم و کرد و لەوێوە بۆمان هات." موزەفەر بەگ درێژەی دایێ و گوتی: "بەڵام ئێستا کوچە و کۆڵانەکانی قارس پڕن لە سەرپۆش، ڕووپۆش و لەچک، کچانیش، لەبەرئەوەی ئاڵای نیشانەی ئیسلامی سیاسییان بەسەرەوەیە، ڕێی چوونە ژوورەوەی دەرزەکانیان پێ نادرێ و ئەوانیش خۆیان دەکوژن." (کا) وەکو لە هەموو دیدارەکانی تردا، ئەو پرسیارانەی نەورووژاند کە دەربارەی پەرەسەندنی دیاردەی ئیسلامی سیاسی و کچانی ڕووپۆش لە ناخیدا سەریان هەڵدەدا. بەهەمان شێوە هیچ بایەخی بەو شانۆیەش نەدا کە لاوانی ئاگرینی دژبەری سەرپۆش، سەرباری نەبوونی تەنانەت یەک ژنی سەرپۆش بەسەریش لە ساڵی چلەکاندا لە قارس نمایشیان کردووە. بەدرێژاییی ڕۆژ بەکۆڵانەکانی شاردا سووڕایەوە و هیچ بایەخی بەو ژنە سەرپۆش بەسەر و لەچکپۆشانە نەدا کە لە ڕێگاوبانەکان دەیبینین، چونکە لە ماوەی هەفتەیەکدا هێندەی ڕۆشنبیرێکی لایسیست فێر نەبووبوو لە یەکەم ڕوانینەوە بۆ ژنانی سەرپۆش داپۆشراو، ئەنجامی سیاسی هەڵێنجێنێ. ئەو هەر لە منداڵییەوە سەرنجی ژنانی سەر داپۆشراوی نەدەدا، لە ناوەندە بەڕۆژئاواییبووەکانی ئەستەمبوڵدا کە (کا) ژیانی خۆی تێدا بەسەر بردبوو، تاکە ژنی سەر داپۆشراو ژنێک بوو کە لە دەوروبەری ئەستەمبوڵەوە، بۆ نموونە لە کارتاڵەوە بۆ فرۆشتنی ترێ ڕووی لەو گەڕەکانە دەکرد، یان ژنی کابرای شیرفرۆش یاخۆ کەسانی سەر بەچینە نزمەکان.

دواتریش چەندین بەسەرهاتم دەربارەی خاوەنی پێشووتری هوتێلی بەفرپالاسی شوێنی حەوانەوەی (کا) بیست: پرۆفیسۆرێکی زانکۆی شەیدای ڕۆژئاوا کە قەیسەر دووری دەخاتەوە بۆ تاراوگەیەکی نیانتر لە سیبیریا، ئەرمەنییەکی بازرگانی ڕەشەوڵاخ، هەتیوخانەی ڕۆمەکان... خاوەنی یەکەمی کێ دەبێ با ببێ، ئەم باڵەخانەیە کە تەمەنی خۆی لە سەد و دە ساڵ دەدات، وەکو هەموو باڵەخانەکانی تری شاری قارس بەشێوەیەک بنیاد نراوە کە سۆپایەک لە دیوارێکیدا دابنرێ و لە یەک کاتدا چوار ژوور گەرم بکات، بەڵام تورکەکان لە سەردەمی کۆماردا نەیانتوانی هیچ کام لەو سۆپایانە بخەنە کار، بۆیە کاتێک باڵەخانەکەیان گۆڕی بۆ هوتێل، لە

پشت دەروازەی هۆتێلەکەدا سۆپایەکی گەورەی لە جۆری مسیان دانا و دواتریش سیستەمی گەرمکردنی ناوەندی بۆ ژوورەکان دانرا.

لەو کاتەدا (کا) لەسەر چرپاکەی بەڕاکشاوی نوقمی خەیالات بوو، لە دەرگا درا و ئەمیش بەپاڵتۆکەی بەریەوە هەستا و دەرگای کردەوە. جاویدی کارمەندی هۆڵی پێشوازی کە هەموو ڕۆژەکەی بەدیار سۆپاوە و بەسەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە بەسەر بردبوو، هاتبوو ڕاسپاردەیەکی پێ ڕابگەیەنێ کە لە بیری چووبوو لە کاتێکدا کلیلەکەی دابوویێ، پێی بڵێ.

"پێش کەمێک لە بیرم چوو پێت بڵێم سەردار بەگی خاوەنی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) چاوەڕێتە بۆ کارێکی بەپەلە."

پێکەوە دابەزین بۆ هۆڵی پێشوازی. بەر لە چوونە دەرەوە (کا) ئێستێکی کرد: ئیپەک لە دەرگای تەنیشت مێزی پێشوازیکردنەکەوە دەرکەوت، هاتە ژوورەوە و زۆریش لەوە شۆختر بوو کە لە خەیاڵی خۆیدا لێکی دابووەوە. (کا) دەسبەجێ جوانی و شۆخیی ئەم ژنەی لە سەردەمی زانکۆدا بیرکەوتەوە. دەسپێک وەکو دوو بۆرژوای ئەستەمبوڵی بەرۆژئاواییبوو دەستیان لە دەستی یەکتر نا، دوای بیرە بیرەیەکی کەم و بێ ئەوەی بەشی خوارەوەی لەشیان لەیەک نزیک بخەنەوە، سەریان لار کردەوە و یەکدیان ماچ کرد. ئیپەک کەمێک خۆی کێشایەوە و بەڕاشکاوییەکی ئەوتۆ کە (کا)ی تووشی سەرسوڕمان کرد، گوتی:

"بەهاتنتم دەزانی."

لە کاتێکدا چاوی لە چاوی (کا) بریبوو، گوتی: "تانەر بەتەلەفۆن پێی گوتم."

(کا) گوتی: "لە پێناوی هەڵبژاردنەکانی شارەوانی و کچە خۆکوشتووەکاندا هاتووم."

ئیپەک لە وەڵامیدا گوتی: "چەند دەمێنیتەوە؟ لە تەنیشت هوتێل ئاسیاوە شیرینیخانەیەک هەیە بەناوی ژیانی نوێ. ئێستا لەگەڵ باوکمدا سەرقاڵم. با سەعات یەک و نیو لەوێ دابنیشین و بۆ خۆمان قسان بکەین."

(کا) سەری لە نامۆیی ئەم دیمەنە سوڕما کە لە قارس ڕووی دا نەک لە



ئەستەمبوڵ، (بۆ نموونە لە گەڕەکی بەی ئۆغلو). نەیشیزانی هۆی پەشێوییەکەی چەندی بۆ جوانییەکەی ئیپەک دەگەڕێتەوە. کاتێک لە هۆتێلەکە هاتە دەرێ و بەژێر بەفرەکەدا ڕێی دەکرد، هەستی کرد چەندە کارێکی باشی کردووە کە ئەم پاڵتۆیەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

لە ڕۆیشتنیدا بەرەو بارەگای ڕۆژنامەکەی سەردار بەگ، هەست و دڵی بەهەمان دڵنیایی دوو شتی تریان پێ گوت کە هۆشی بەهیچ جۆرێک دانی پیا نەدەنا: یەکەمیان: هاتنەوەی (کا) لە فرانکفورتەوە چەندە بەمەبەستی خۆگەیاندنە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی دایکی بوو، هێندەیش لە پێناوی دۆزینەوەی کچێکی تورکدا بوو دوای دوازدە ساڵ لە تەنیایی. دووەمیان: (کا) لە ئەستەمبوڵەوە هاتبوو بۆ قارس، چونکە لە ناخیدا باوەڕی وابوو ئیپەک ئەو کچەیە کە ئەم زەماوەندی لەگەڵدا دەکات.

خۆ ئەگەر بهاتایە و هاوڕێیەکی بەپەی پێبردنێکی بەهێزەوە بیرۆکەی دووەمی بەگوێی (کا)دا بچرپاندایە، ئەوا ئەم نەک هەرگیز لێی خۆش نەدەبوو، بگرە ئەگەر ئەم شیمانەیە سەری بگرتایە، ئەوا بەدرێژاییی ژیان شەرمی بەخۆیدا دەهاتەوە. (کا) لەو کەسە بەرەوشتانە بوو کە گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە ترۆپکی بەختیاری لەوەدایە مرۆڤ هیچ شتێک لە پێناوی بەختەوەری خۆیدا نەکات. سەرباری ئەوەیش، گەڕان بەدوای کچێکدا بەمەبەستی هاوسەرێتی کە ئەم باش نەیناسێ، لەگەڵ پەروەردەی خوداپێداوانە و ڕۆژئاواییی ئەودا یەکی نەدەگرتەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانە کاتێک گەیشتە بارەگای (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)، هەستی بەنائارامی نەدەکرد، چونکە یەکەم دیداری لەگەڵ ئیپەکدا لەوە باشتر تێ پەڕی وەکو ئەوەی لە پاسەکەدا لە ئەستەمبوڵەوە بۆ قارس بیری لێ کردبووەوە.

بارەگای (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) دەکەوتە سەر شەقامی فایەق بەگ کە کۆڵانێک لە خوار هوتێلەکەی (کا)وە بوو، ڕوویەری ژووری سەرنووسەر و چاپخانەکە شتێک لە ژووری هۆتێلەکەی (کا) فراوانتر بوو. ژوورەکە بەپارچە تەختەیەک کرابووە دوو بەشەوە و بەتەختەکەدا وێنەی ئەتاتورک، ساڵنامە، نموونەی کارتی زەماوەند، وێنەی گەورەپیاوانی دەوڵەت و ناودارانی تورک لەوانەی کە هاتبوونە قارس و

سەردار بەگ وێنەی گرتبوون و وێنەیەکی چوارچێوەداری یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکە کە چل ساڵ لەمەوبەر دەرچووبوو، هەڵواسرا بوو. لە پشتیشەوە دەزگایەکی چاپی تیپۆی کارەبایی بەدیمەنی جوانیەوە کاری دەکرد. ئەم دەزگایە سەد و دە ساڵ لەمەوبەر لە کارخانەی (باومان) لە شاری لایپزیگ لە ئەڵمانیا دروست کرابوو، دوای بیست و پێنج ساڵ بەکارهێنانی لە شاری هامبورگ، لە سەردەمی ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا لە دوای مەشروتەی دووەم لە ساڵی ١٩١٠دا بەئەستەمبوڵ فرۆشرابوو. دوای ئەوەی لەوێ چل و پێنج ساڵی ڕەبەق لە کاری بەردەوامدا دەبێ و بڕیار دەدرێ لەبەریەک هەڵبوەشێنرێ و فڕێ بدرێ، باوکی خوداڵێخۆشبووی سەردار بەگ لە ساڵی ١٩٥٥دا بەشەمەنەفەر لە ئەستەمبوڵەوە دەیهێنێ بۆ قارس. سەردار بەگ، نووکی پەنجەکەڵەی دەستی ڕاستی بەزمانی تەڕ دەکرد و کاغەزی دەخستە دەزگای چاپەکەوە، کوڕە بیست و دوو ساڵانەکەیشی بەدەستی چەپی و زۆر لێهاتووانە لاپەڕە چاپکراوەکانی کۆ دەکردەوە، چونکە سەبەتەی کۆکردنەوەی لاپەڕەکان یازدە ساڵ لەمەوبەر لە شەڕێکی نێوان براکاندا شکا بوو. سەردار بەگ توانی هەمان کات لە جووڵەیەکی نێوان چاو و برۆدا بەخێرهاتنی (کا)یش بکات. کوڕی دووەمیش کە بەدوو برۆی بەرز، دەموچاوێکی مانگ ئاسا، باڵایەکی کورت، لەشێکی گۆشتنەوە هاتە بەرچاو و (کا) لە خەیاڵی خۆیدا شێوەی بردەوە سەر دایکی نەک باوکی، لە پشت مێزێکی ڕەش داگەڕاوی خەڵتانی مەرەکەب و لە نێوان ژمارەیەکی زۆری کشاو، پیتی قورقوشمی گەورە و بچووک و قاڵب و کلێشەی جۆربەجۆردا بەئارامیی خۆشنووسێک کە دەستی لە دنیا شووشتبێ، بەدەست خەریکی ڕێکخستنی ئاگادارییەک بوو بۆ ڕۆژنامەکەیان کە دوای سێ ڕۆژی تر چاپ دەکرا.

سەردار بەگ بە(کا)ی گوت: "دەبینن ڕۆژنامەگەری لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە چی هەلومەرجێکدا لە پێناوی مانەوەدا تێ دەکۆشێ." ڕێک لەو کاتەدا کارەبا بڕا. کاتێک دەزگای چاپەکە لە کار کەوت و دوکانەکە نوقمی تاریکییەکی ئەفسوناوی بوو، (کا) چاوی لە دەرێ بڕی و دڵکێشیی سپێتیی بەفرەکەی بینی. سەردار بەگ مۆمێکی داگیرساند و (کا)ی لەسەر کورسییەکی پێشەوەی نوسینگەکەی دانیشاند و لە کوڕەکەی پرسی:



"بوون بەچەند؟"

"سەد و شەست، بابە."

"دوای هاتنەوەی کارەبا بیکە بە سێ سەد و چل دانە، ئەمڕۆ شانۆکاران میوانمانن."

(ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) تەنیا لە یەک شوێن دەفرۆشرا کە دەکەوتە بەرامبەر هۆڵی شانۆی گەل و تەنیا بیست کەسێک کە بەوێدا تێ دەپەڕین، دەیانکڕی. بەڵام بەگوتەی سەردار بەگ کە بەشانازییەوە باسی دەکات، لە ڕێی ئابوونەوە سێ سەد و بیست دانە لە ڕۆژنامەکە دەفرۆشرێ، دوو سەد دانە لە ئابوونەمانەکان بریتین لە کۆگاکان و دەزگاکانی دەوڵەت لە شاری قارس کە سەردار بەگ ناچارە بەشان و باڵیاندا هەڵبدات. هەشتا ئابوونەمانەکانی تر کەسانێکی (گرنگ و شەرەفمەندن) کە لای دەوڵەت قسەیان دەڕوات و سەرەڕای دوورکەوتنەوەیان و گواستنەوەیان بۆ ئەستەمبوڵ، هێشتا پێوەندیی خۆیان لەگەڵ قارسدا نەبڕیوە.

کارەبا هاتەوە و (کا) عەرەقەی تووڕەبوونی بەناوچەوانی سەردار بەگەوە بینی. سەردار بەگ گوتی: "دوای جیابوونەوەت لە من چاوت بەچەند کەسێکی چەواشەکار کەوتووە و زانیاریی چەوتت لە بارەی شاری سەرحەدەوە دەست کەوتووە."

(کا) گوتی: چۆن زانیت بۆ کوێ چووم؟"

ڕۆژنامەنووسەکە گوتی: "بێ گومان پۆلیس بەدواتەوەیە و ئێمەش لەبەرئەوەی کارەکەمان وا دەخوازێ بەهۆی ئەم بێتەلەوە گوێ لە گفتوگۆکانی پۆلیس دەگرین. لە سەدا هەشتای ئەو هەواڵانەی کە لە ڕۆژنامەکەماندا بڵاوی دەکەینەوە، لە پارێزگا و لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی وەردەگرین. هەموو بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش ئاگادارە کە تۆ بەهەر کەسێک دەگەیت، پرسیاری هۆکارەکانی دواکەوتوویی قارس تا ئەم ئاستە و هۆی هەژاری و هۆیەکانی خۆکوشتنی کچەکانمان دەکەیت."

(کا) گوێی لە چەند وتوێژێک بووبوو سەبارەت بەهۆکارەکانی دابەزینی قارس بۆ ئەم ئاستی هەژارییە، لەوانە سستبوونی ئاستی بازرگانی لەگەڵ سۆڤێتدا لە سەردەمی شەڕی سارددا، داخستنی دەروازەکانی گومرک، دەستگرتنی باندەکانی

کۆمۆنیست لە سالانی ١٩٧٠دا بەسەر دەوڵەتدا و هەڕەشەکردنیان لە دەوڵەمەندەکان، ڕفاندنیان و کۆچکردنی ئەو دەوڵەمەندانەی کە برێک پارەیان پاشەکەوت کردبوو، بۆ ئەستەمبوڵ و ئانکارا، ناکۆکیی نەبڕاوەی نێوان تورکیا و ئەرمەنستان کە قارسی لە بیری دەوڵەت و خودایش بردبووەوە.

سەردار بەگ گوتی: "من بڕیارم داوە ڕاستیی مەسەلەکەت پێ بڵێم."

(کا) بەهۆشێکی بریسکەدار و بەگەشبینییەکی ئەوتۆ کە سالانێک بوو هەستی پێ نەکردبوو، یەکسەر تێ گەیشت مەسەلەکە لە بنەڕەتدا شەرمەزارییە. کرۆکی بابەتەکە لە ئەڵمانیایش هەر مایەی شەرم بوو بۆ ئەم، بەڵام ئەوە بوو ئەم شەرمەی لە خۆیدا دەشاردەوە. (کا) ئێستا بەهۆی ئەو شادییەوە کە لە ناخیدا هەستی پێ دەکات، دان بەم ڕاستییەدا دەنێ.

سەردار بەگ وەکو ئەوەی نهێنییەک بدرکێنێ، گوتی: "ئێمە لێرە هەموومان وەکو برا وابووین، بەڵام ئەوە چەندە ساڵێکە یەکێک دەڵێ من ئازەریم، یەکێکی تر دەڵێ کوردم و ئەوی تر دەڵێ من تەرەکەمەم. بێ گومان لێرە لە هەموو جۆرە نەتەوەیەک هەن، دەڵێن تەرەکەمە و قەرەپاپاکیش هەن و ئەوانە برای ئازەرییەکانن. ئێمە کوردەکان بەهۆز و عەشیرەت ناو دەبەین، ئەوان لە ڕابردوودا بەکوردبوونی خۆیان نەدەزانی. هیچ کام لە خۆجێییەکانی پاشماوەی عوسمانییەکان بەسنگ دەرپەڕاندنەوە نالێ: من خۆجێییم. تورکمان و پۆسۆف و ئەو ئەڵمانانە هەبوون کە قەیسەری ڕووسیا بۆ ئێرە دووری خستبوونەوە، بەڵام کەس لە بەرامبەر ئەوانی تردا شانازیی بەڕەچەڵەکی خۆیەوە نەدەکرد. هەموو ئەم هەستی بەخۆنازینە لە لایەن ڕادیۆ کۆمۆنیستەکانی یەریڤان و باکۆوە بەمەبەستی هەڵوەشانی تورکیا و دابەشکردنی پەخش دەکران. ئێستا خەڵکەکە هەژارتر بوون، بەڵام بەخۆشانازتر بوون."

کاتێک سەردار بەگ گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بەقسەکانی باندۆری لەسەر (کا) داناوە، بایدایەوە بۆ سەر بابەتێکی تر. "گرووپە ئاینییەکان دەرگا بەدەرگا دەکوتن و ژنانیان سەر لە مالان دەدەن، قاپ و قاچاخ، دەزگای گوشینی پرتەقال، سندووقە سابوون، کیسەی ساوەر و تایت بە ژنان دەبەخشن. بەخێرایی لە گەڕەکە



هەژارەکاندا ڕایەڵەی دۆستایەتی و نزیکبوونەوە لە نێوان ژناندا ڕادەکێشن و سنجاقی زێڕین لە شانی منداڵان دەدەن و دەڵێن: دەنگ بدەن بەپارتی خودا کە ئەوان پێی دەڵێن پارتی ڕەفا، دەڵێن بەهۆی دوورکەوتنەوەمانە لە خودا کە هەژاری و بێ نەوایی بەرۆکمانی گرتووە. پیاوانیان لەگەڵ پیاوان و ژنانیشیان لەگەڵ ژناندا دەدوێن. متمانەی پیاوانی بێ کاری توورە و هەست بریندار بەدەست دەهێنن. شادی دەخەنە دڵی ئەو ژنانەوە کە لە ماڵەوە هیچ شک نابەن بۆ ئێواریێ بیخەنە سەر ئاگر. دواتر بەڵێنی دیاریی زیاتریان پێ دەدەن و سوێندیان دەدەن کە دەنگ بدەن بەئەوان. درێغی ناکەن لە بەدەستهێنانی متمانەی هەژاران و ئەو بێکارانەی کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە سووکایەتیان پێ دەکرێ، قوتابیانی زانکۆکان کە ڕۆژی لە یەک قاپ شۆربا زیاتر، هیچی تر ناچێتە گەروویانەوە. تەنانەت ڕێزی دوکاندارەکانیش بەدەست دێنن، چونکە ئەمان لە هەمووان چالاکتر، سەرڕاستتر و خاکیترن."

خاوەنی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) گوتی: "سەرۆکی شارەوانی لەبەرئەوە نەکوژرا کە کەسێکی هاچەرخ بوو و هەوڵی دەدا گالیسکەی ئەسپ لە شاردا نەهێڵێ – بەهۆی کوژرانیەوە ئەم کارەی بەنیوەناچڵی مایەوە – ، بەڵکو بەهۆی بەرتیل و گەندەڵییەوە ڕقی هەمووانی لە خۆی هەڵساندبوو. پارتە کۆمارییەکانیش بەهۆی شەڕی کۆنەقین و جیاوازیی نەژادی و لەبەر دابەشبوونی ڕووخێنەرانەیان بەسەر باڵەکانی چەپ و ڕاستدا، هیچ کامێکیان نەیانتوانیبوو پاڵێوراوێکی بەهێز دەستنیشان بکەن." سەردار بەگ درێژەی دایێ و گوتی: "بەشەرەفی پارتی خودا نەبێت، متمانە بەکەسی تر ناکرێ. ئەو پاڵێوراوەیش موختار بەگی پیاوی پێشووی ئیپەکی کچی تۆرگوت بەگی خاوەن ئەو هوتێلەیە کە تیایدا دەژین. کەمێک بێ ئەقڵە، بەڵام کوردە. کوردەکان لە سەدا چلی دانیشتووانی ئێرە پێک دەهێنن، بۆیە پارتی خودا لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ."

بەفرەکە کە بەچڕی دەباری، جارێکی تر هەستی تەنیاییی لە ناخی (کا)دا ژیاندەوە، هەستی ترس لەوەی کە ژیانی گۆڕان بەرەو بەرۆژئاواییبوون لە تورکیا کە ئەم لە ئەستەمبوڵ بەسەری بردبوو، بەکۆتایی گەیشتووە، بووە سەرباری هەستکردنی بەتەنیایی. وای هاتە پێش چاو ئەو شەقامانەی کە سەردەمی منداڵیی

تێدا بەسەر بردووە و باڵەخانە کۆن و نایابەکانی سەدەیەک لەمەوبەر کە هەندێک لە هاوڕێکانی تیا دەژین، هەمووی ڕووخاوە و وێران بووە. دارەکانی سەردەمی منداڵی وشکیان کردووە و بڕاونەتەوە، لە ماوەی دەیان ساڵی ڕابردوودا سینەماکان داخراون و کراون بەدوکانی تەنگ و تاریک بەپەنای یەکترەوە بۆ فرۆشتنی جلوبەرگی ئامادە. ئەمەش نەک هەر بەواتای کۆتایی هاتنی منداڵیی ئەو دێت، بەڵکو دوایی پێهاتنی خەیاڵی سەرلەنوێ دەست پێکردنەوەی ژیان لە ئەستەمبوڵ دەگەیەنێ. وای بەخەیاڵدا هات ئەگەر ڕێژمێکی بەهێزی شەریعەتخواز لە تورکیا ڕەگ دابکوتێ، ئەوا تەنانەت خوشکەکەیشی ناتوانێ بێ سەرپۆش بێتە دەرێ. (کا) لەمیانەی تیشکی گڵۆپە نیۆنەکانی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ەوە سەیرێکی کلووە بەفرە گەورەکانی کرد کە بەهێمنی دەبارین و بەخەیاڵ لەگەڵ ئیپەکدا بۆ فرانکفورت گەڕایەوە، لە بەشی پێڵاو فرۆشتن لە نهۆمی دووەمی بازاڕی کاوفهۆف، لەو شوێنەی پاڵتۆ بۆرەکەی لێ کڕیبوو و ئێستا توند بەخۆیەوە نوساندووە، خەریکی کڕینی شتومەک بوون.

سەردار بەگ گوتی: "هەموو شتەکان بەشێکن لە بزووتنەوەی نێودەوڵەتیی ئیسلامی کە دەیەوێ تورکیا وەکو ئێران لێ بکات."

(کا) گوتی: "کچە خۆکوژەکانیش بەهەمان شێوە؟"

سەردار بەگ گوتی: "بەداخێکی زۆرەوە هەواڵمان پێ دەگات کە ئەوانە لە خشتە دەبرێن، لەبەرئەوەیش کە کچان هەست ناسکترن و لە ترسی ئەوەی نەبادا ژمارەی کچانی خۆکوشتوو زیاد بکات و هەروەها لێپرسراوێتیی سەر شانیشمان وامان بەسەردا دەسەپێنێ کە لەم بارەیەوە نەنووسین. دەگوترێ تیرۆریستی ئیسلامی ناسراو (شینە) لە شارەکەمانە و ئەو سەرپۆش بەسەران و کچانی خۆکوشتوومان ڕێنمایی دەکات."

(کا) گوتی: "مەگەر ئیسلامییەکان لە دژی دیاردەی خۆکوشتن نین؟"

سەردار بەگ لە ئاستی ئەم پرسیارەدا خۆی کپ کرد. کاتێک دەزگای چاپەکە لە کار ڕاوەستا و بێدەنگی باڵی بەسەر دەوروبەردا کێشا، (کا) سەیری بەفرەکەی دەرەوەی کرد کە باوەڕ پێنەکراوانە دەباری. ئەو دوودڵی و ترسەی کە بەهۆی



نزیکبوونەوەی وادەی بینینی ئیپەکەوە هەستی پێ دەکرد، هاوتا بوو لەگەڵ هەستکردنی بەغەم و ئازارەکانی قارس، بەڵام (کا) ئێستا تەنیا بیر لە ئیپەک دەکاتەوە و دەیەوێ خۆی بۆ ژوانی شیرینیخانەکە ساز بدات، چونکە سەعات وا یەک و بیست خولەک نیشان دەدات.

سەردار بەگ لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە تازە چاپکراوەکەی لە کوڕە گەورەکەی وەرگرت و وەکو ئەوەی دیارییەک لە خشڵ و زیو پێشکەش بکات، خستیە بەردەم (کا). چاوانی (کا) کە ساڵانێکی درێژ بوو لە گەڕان بەدوای ناوی خۆیدا لە گۆڤارە ئەدەبییەکاندا ڕاهاتبوو، یەکسەر پەڕینە سەر ئەو هەواڵەی لە کەناری لاپەڕەی ڕۆژنامەکەدا چاپ کرابوو:

## شاعیری ناودارمان (کا) لە قارسە

شاعیری ناسراومان لە سەرانسەری تورکیا (کا) دوێنێ گەیشتە شارەکەمان، شاری سەرحەد. شاعیری لاومان کە بەهۆی کتێبەکانی ستوو، مەندەلینا و ڕۆژنامەکانی ئێوارانەوە جێی ڕێزی هەموو وڵاتە و هەڵگری خەڵاتی (بەهجەت نەجاتیگل)ـە، لەسەر ناوی ڕۆژنامەی جمهورییەت بۆ بەدواداچوونی هەڵبژاردنەکانی شارەوانی هاتووە. (کا)ی شاعیر ساڵانێکی درێژ لە شاری فرانکفورت لە ئەڵمانیا سەرقاڵی لێکدانەوەی شیعری ڕۆژئاوایی بووە.

(کا) گوتی: "ناوەکەم بەهەڵە نووسراوە، پێویست بوو پیتی A بچووک بنووسرایە". یەکسەر بەدوای ئەمەدا و بەمنەتبارییەوە گوتی: "جوان دەرچووە."

سەردار بەگ گوتی: "ئوستاد، ئێمەش لەبەرئەوەی لە ناوەکەت دڵنیا نەبووین، زۆر بەدواتدا گەڕاین." دواتر بەدەنگێکی دوور لە شڵەژان سەرزەنشتی کوڕەکانی کرد و گوتی: "کوڕم، بڕوانە کوڕم، ناوی شاعیرەکەمانتان بەهەڵە چاپ کردووە. دەی، هەر ئێستا ڕاستی بکەنەوە."

کا هەستی کرد ئەمە یەکەم جار نییە لە چاپکردنی ناوەکەیدا هەڵە بکرێ، بۆیە گوتی: "پێویست ناکات." پاشان سەرنجی دا کە ناوەکەی لە دێری کۆتاییی گەورەترین هەواڵدا بەڕاستی نووسراوە.

## شەوی سەرکەوتنی تیپی شانۆی سونای زایم لە هۆڵی شانۆی گەل

تیپی شانۆی سونای زایم کە لەسەر ئاستی تورکیا بەکارە میللی و ئەتاتورکچی و ڕۆشنگەرییەکانی ناسراوە، دوێنێ شانۆگەرییەکی لە هۆڵی شانۆی گەل نمایش کرد کە لە لایەن ئامادەبووانەوە بەجۆش و خرۆشێکی بێ هاوتاوە پێشوازیی لێ کرا. ئەم شانۆگەرییە کە تا نیوەی شەو درێژەی کێشا و بە ئامادەبوونی جێگری پارێزگار و جێگری سەرۆکی شارەوانی و کەسایەتییە ناسراوەکانی شاری قارس نمایش کرا، جاروبار بەچەپڵەڕێزان و دەربڕینی ڕەزامەندی، دەڕاگیرا. دانیشتووانی قارس کە ماوەیەکی درێژ بوو تینووی نمایشێکی لەو جۆرە بوون، سەرباری ئەوەی هۆڵی شانۆی گەلیان پڕ کردبوو، توانییان لە ماڵیشەوە سەیری شانۆگەرییەکە بکەن، چونکە (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) لە وەتەی لە دوو ساڵ لەمەوبەرەوە دەستبەکار بووە، یەکەم وەشانی زیندووی خۆی ئەنجام دا و دەمودەست شانۆگەرییەکەی بۆ هەموو دانیشتووانی قارس گواستەوە. بەم جۆرە (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) یەکەم وەشانی ڕاستەوخۆی لە دەرەوەی ستۆدیۆکانیدا ئەنجام دا. (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) لەبەرئەوەی هێشتا ئۆتۆمبیلی وەشانی دەرەکیی نییە، کابڵێکی درێژی کامێرای لە مەڵبەندی خۆی لە شەقامی خالید پاشاوە بەدرێژاییی دوو شەقام هەتا هۆڵی شانۆی گەل ڕاکێشا بوو. بەمەبەستی ئەوەی لە زیانی بەفر پارێزراو بێت، هەندێک لەو قارسییانەی گیانی هاوکارییان تێدایە، کابڵەکەیان بەناو ماڵەکانی خۆیاندا درێژ کردبووەوە. (بۆ نموونە پزیشکی ددان فازیل بەگ کابڵەکەی لە باڵکۆنی پێشەوەی ماڵەکەی هەتا باخچەی پشتەوە ڕاکێشا بوو.) قارسییەکان خوازیارن لە دەرفەتی تردا ئەم وەشانە زیندووە سەرکەوتووەیان بۆ دووبارە بکرێتەوە. لێپرسراوانی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) ڕایانگەیاند کە هەموو دوکاندارەکانی قارس بەهۆی ئەم پەخشە زیندووەیانەوە ڕێکلامیان داوە بەتەلەفزیۆنەکەیان. لەم نمایشەدا کە هەموو خەڵکی شاری سەرحەد بینییان، تێکەڵەیەک لە تێکستە ئەتاتورکییەکان، چەند دیمەنێکی جوانترین شانۆنامە بەناوبانگەکانی دەرهاویشتەی ڕۆشنگەریی ڕۆژئاوایی، هەندێک سکێچ بۆ ڕەخنەگرتن لەو ڕێکلامانەی کە کلتوورەکەمان دەشێوێنن، سەرچڵییەکانی ڤورالی گۆڵچیی ناودارمان، شیعرەکانی



ئەتاتورک و نوێترین هەڵبەستی شاعیرمان (کا) بەناونیشانی (بەفر) کە بەدەنگی خۆی خوێندیەوە و بۆ خۆیشی ئێستا بەسەردان لە شارەکەمانە و هەروەها شاکاری ڕێ نیشاندەر (نیشتمان یان چارشێو) کە لە سەرەتای ساڵەکانی دامەزراندنی کۆماردا نووسراوە، سەرلەنوێ ئامادە کراوەتەوە و ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (نیشتمان یان سەرپۆش)، پێشکەش کرا.

(کا) گوتی: "نە هەڵبەستێکم هەیە بەناوی (بەفر) و نە ئێوارەش دەچم بۆ هۆڵی شانۆی گەل. دوایی دەردەکەوێ کە هەواڵەکەتان هەڵەیە."

سەردار بەگ لە وەڵامدا گوتی: "ئەوەندە بەخۆتدا مەنازە و هێندەیش بەکەممان مەزانە لەبەرئەوەی هەواڵەکەمان بەر لە ڕووداوەکە نوسیووە. زۆرێک پێیان وابوو ئەوەی ئێمە دەیکەین فڕی بەسەر ڕۆژنامەگەرییەوە نییە، بەڵکو جۆرێکە لە جادووگەری، بەڵام پاش ئەوەی ڕووداوەکان کوتومت وەکو ئەوەی ئێمە نووسیومانە، دەقەومان، ئەو کەسانە سەرسام دەبوون. چەندین ڕووداو، تەنیا لەبەرئەوەی ئێمە هەواڵەکەیمان پێشوەخت چاپ کردووە، قەومان و بوون بەڕاستی. ئا ئەمەیە ڕۆژنامەگەریی هاوچەرخ. ئێستا دڵنیام تۆیش بۆ ئەوەی دڵمان نەشکێنی و مافی ئەوەمان لێ زەوت نەکەی کە ئێمە لە قارسدا نوێخوازین، سەرەتا هەڵبەستێک بەناوی (بەفر) دەنووسیت و دواییش دەچیت لە شانۆی گەل دەیخوێنیتەوە."

لە نێوان هەواڵەکانی کۆبوونەوەی تایبەت بەهەڵبژاردنەکان، گەیشتنی ئامپول لە ئەرزەڕوومەوە و تاقیکردنەوەی لە قوتابخانە ئامادەییەکان و، هەواڵی ئەوەی کە شارەوانیی قارس وەکو یارمەتییەک بۆ قارسییەکان، وەرگرتنی پارەی ئاو بۆ دوو مانگی تر دوا دەخا، (کا) هەواڵێکی تری خوێندەوە کە پێشتر لە نێوان ئەو هەموو هەواڵەدا سەرنجی ڕانەکێشا بوو:

## بەفر ڕێگاوبانەکانی گرتووە

ئەو بەفرەی ماوەی دوو ڕۆژە بێ ناوبەر دەبارێ، هەموو پێوەندییەکانی شارەکەمانی بەجیهانەوە پچڕاندووە. دوێنێ بەیانی ڕێگای ئەردەهان بەسترا، دوانیوەڕۆش ڕێگای ساریقامیش داخرا. هەروەها بەهۆی بارین و کەڵەکەبوونی بەفرێکی زۆرەوە لە

ناوچەی یۆڵگەچمەز، ڕێگای ئەرزەرووم داخراوە و ئەمەش وای کردووە ئەو پاسەی کۆمپانیای یەڵماز کە بۆ ئەرزەرووم دەچوو، بگەڕێتەوە بۆ قارس. بەڕێوەبەرایەتیی کەش و هەوایش ڕای گەیاندووە کە شەپۆلی سەرما و کلووی گەورەی بەفری سەرچاوەگرتوو لە سیبریاوە هەتا سێ ڕۆژی تر درێژەی دەبێت، شاری قارس وەکو زستانەکانی ڕابردوو ماوەی سێ ڕۆژ بەدەست گۆشەگیرییەوە دەناڵێنێ و ئەمەش هەلێک دەبێت بۆ بەخۆدا چوونەوە و خۆڕێکخستنەوە.

لەو کاتەدا (کا) ویستی بڕوات، سەردار بەگ بەرزەپێ ڕاپەڕی و دەستی بەدەرگاکەوە گرت بۆ ئەوەی دوا قسەی خۆی پێ بڵێ:

"کێ دەزانێ تۆرگوت بەگ و کچەکانی بەبۆچوونی خۆیان چیت بۆ دەگێڕنەوە! ئەوانە خەڵکانێکی دڵگیرن لە دانیشتنی ئێواراندا، بەڵام لە بیرت نەچێت: پیاوی پێشووی ئیپەک خانم پاڵێوراوی پارتی خودایە بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی. قەدیفەی خوشکی ئیپەک کە باوکی بەنیازی خوێندن لە تەک خۆیدا بۆ ئێرەی هێناوە، دەگوترێ سەردەستەی کچە سەرپۆش بەسەرەکانە. باوکیشیان کۆنە کۆمۆنیستە. ئەمڕۆ تاقە کەسێکیش لە قارسدا نییە کە بزانێ ئەمانە بۆچی چوار ساڵ لەمەوبەر لە خراپترین ڕۆژگارەکانی قارسدا هاتنە ئێرە."

(کا) سەرەڕای ئەوەی بەجارێک زۆر شتی نوێی بیست لەوانەی کە نائارامی دەکەن، بەڵام هیچی بەسەر خۆی نەهێنا.



## ٤

## بەڕاستی لەبەر هەڵبژاردن و خۆکوشتنەکان هاتووی بۆ ئێرە؟

### (کا) و ئیپەک لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ

ئەرێ سەرباری بیستنی ئەو هەموو هەواڵە خراپانە، ئەو خەندە نادیارە چی بوو بەڕووی (کا)وە کاتێک لە شەقامی فایەق بەگەوە بەرەو شیرینیخانەی ژیانی نوێ دەچوو؟ لە گوێیدا (ڕۆبێرتا)ی (پەپینۆ دی کاپری) زرنگایەوە، وەکو پاڵەوانەکەی ڕۆمانی (تورگەنیەڤ) کاتێک بۆ ژووانی ئەو ژنە دەچێت کە چەندین ساڵە خەیاڵی لێ داوە، خۆی ڕۆمانتیک و غەمبار دەهاتە بەرچاو. (کا) تورگەنیەڤ و ڕۆمانە زەریفەکانی خۆش دەویست. تورگەنیەڤ لە ئەورووپاوە خەون بەوڵاتەکەی خۆیەوە دەبینێ کە بەهۆی کێشە لە بڕانەوە نەهاتووەکانیەوە ماندوو بووە و لەبەرچاوی کەوتووە و جێی هێشتووە. بەڵام ڕاستییەکیش هەیە با بیدرکێنم: (کا) بەپێچەوانەی ڕۆمانەکەی تورگەنیەڤەوە، ساڵانێکی درێژ خەونی بەئیپەکەوە نەبینیبوو. ئەوەندە هەبوو کە دالغەی بە ژنێکی وەکو ئیپەکەوە لێ دابوو و جاروباریش بەخەیاڵیدا هاتبوو، کاتێکیش کە زانیبووی لە مێردەکەی جیابووەتەوە، بیری لێ کردبووەوە. ئێستایش دەیەوێت بۆشاییی بیر نەکردنەوەی لە ئیپەک، بەو مۆسیقایەی دەیشنەوێ و بەڕۆمانسییەتی تورگەنیەڤ پڕ بکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ پێوەندییەکی ڕاستەقینە و قوڵی لەگەڵدا دابنێ.

بەڵام کاتێک گەیشتە شیرینیخانەکە و لەسەر هەمان کورسی لە تەنیشت ئیپەکەوە دانیشت، هەستی ڕۆمانسییەتی تورگەنیەڤ لە خەیاڵیدا ڕەوییەوە. ئیپەکیش شۆختر دەینواند وەک لەوەی یەکەمجار لە هۆتێلەکەدا و پێشتریش لە ساڵانی زانکۆدا بینیبووی. کاریگەریی جوانییەکەی، لێوە سووکرەنگراوەکانی، ڕەنگی کەمێک زەرهەڵگەڕاوی پێستی دەموچاوی، بریقەی چاوەکانی و دڵگیرییەکەی کە یەکسەر هەستی نزیکیی لە ناخی مرۆڤدا دەوروژاند، (کا)ی شڵەژاند. ئیپەک ساتێک

بەشێوەیەکی هێندە بەهێز دڵگیر هاتە بەرچاو، بەجۆرێک (کا) ترسی ئەوەی هەبوو کە ئەمە سروشتی نەبێت. ئەمەیش، لە دوای ترسی لە نووسینی شیعری خراپ، ترسی دووەمی بوو لە ژیانیدا.

(کا) بەخەیاڵی کردنەوەی بابەتێکەوە گوتی: "لە ڕێگادا بەرەو ئێرە ئەو کرێکارانەم بینی کە بەشێوەی هەڵواسینی پەتی تەناف لە (تەلەفزیۆنی قارس سەرحەد)ەوە کابڵ بۆ هۆڵی شانۆی گەل ڕادەکێشن. بەڵام بەدەم قسەکانی خۆیەوە پێ نەکەنی، چونکە نەیویست خۆی وا نیشان بدات کە سووکایەتی بەژیانی خەڵکی ناوچەکە دەکات.

وەکو جووتێکی نیازپاک و خاوەن بڕیار بەدوای چەند بابەتێکی هاوبەشدا گەڕان تاکو بەئارامی قسەی لەسەر بکەن. هەر کاتێک بابەتێک تەواو دەبوو، ئیپەک زۆر وەستایانە پێ دەکەنی و بابەتێکی تری دەدۆزیەوە؛ بەفر بارین، هەژاریی قارس، پاڵتۆکەی (کا)، ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر هەردووکیاندا هاتووە، وازنەهێنان لە جگەرەکێشان، ئەو کەسانەی (کا) لە ئەستەمبوڵ بینیبوونی... مردنی دایکی هەردووکیشیان و ناشتنیان لە گۆڕستانی فەریکوێی لە ئەستەمبوڵ لەسەر خواستی خۆیان، ئەمانی زیاتر لە یەکتر نزیک کردەوە. کاتێک بۆیان ئاشکرا بوو کە هەردووکیان هەمان بورجیان هەیە، بەئاسوودەییەکی کورتخایەنەوە کە هەستی لەیەکنزیکبوونەوەی ژن و پیاو دەیبەخشێ -ئەگەر چی دەستکردیش بێت- لە قسەکانیاندا چەندین بابەتیان هێنا و برد؛ ڕۆڵی دایک لە ژیانی هەر یەکێکیاندا (بەکورتی)، وێستگای کۆنی شەمەنەفەری قارس بۆ ڕووخێندرا (درێژتر)؛ شوێنی ئەم شیرینیخانەیەی ئەمانی لێ دانیشتوون هەتا ساڵی ١٩٦٧ کڵێسایەکی ئۆرتۆدۆکس بووە و ئێستا دەرگای کڵێسا ڕووخێنراوەکە لە مۆزەخانەدا شاردراوەتەوە؛ بەشی تایبەت بەکۆمەڵکوژیی ئەرمەنییەکان لە مۆزەخانەکەدا (هەندێک لە گەشتیاران لە سەرەتادا وا حاڵی بووبوون کە ئێرە جێگەیەکە سەبارەت بەکوشتنی ئەرمەنییەکانە لە لایەن تورکەکانەوە، بەڵام دواتر پێچەوانەکەی تێ گەیشتبوون)؛ گارسۆنە نیوە گوێگران و نیوە خەیاڵییەکە، نەفرۆشتنی قاوە لە چایخانەکانی قارسدا بەهۆی ئەوەی بێکاران لە بەر گرانی نایخۆنەوە، بۆچوونی سیاسیی ئەو ڕۆژنامەنووسەی (کا) دەگەڕێنێ و ڕۆژنامەنووسانی تر (هەموویان پشتیوانییان لە سوپا و لە



حکوومەتی هەنووکەیی دەکرد)، ژمارەی سبەینێی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) کە (کا) لە گیرفانی دەرهێنا.

لەو کاتەدا ئیپەک بەوردی خەریکی خوێندنەوەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە بوو، (کا) ترسی ئەوەی لێ نیشت کەوا تاکە ڕاستی بەلای ئیپەک و بەلای هاوڕێ دێرینەکانیشیەوە کە لە ئەستەمبوڵ دیبوونی، ئازارە قووڵەکان و جیهانی سیاسیی پەرێشانی تورکیا بێت و بەهیچ جۆرێک بەخەیاڵی ئیپەکدا نەیات کە لە ئەڵمانیا بژی. (کا) بەدرێژی سەیری دەستە بچووکەکانی ئیپەک و دەموچاوی شیرینی کرد کە هێشتا بەلای ئەمەوە تا ڕادەی سەرسوڕمان بەجوانی مابووەوە.

ئیپەک بەپێکەنینێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە لە (کا) ی پرسی: "بەکام پەرەگراف و بۆ ماوەی چەند ساڵ سزا درای؟" (کا) بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. لە کۆتاییی هەفتاکاندا لە تورکیا، دەکرا هەموو شتێک لە ڕۆژنامەیەکی سیاسیی بچووکدا بڵاوبکرێتەوە، هەموو کەسێک بۆی هەبوو دادگایی بکرێ و بەو پەرەگرافەی یاسای سزادان سزا بدرێ و شانازیشی پێوە بکردایە، بەڵام کەس نەدەچووە زیندانەوە، چونکە پۆلیس ڕەشمەکەی زۆر ڕانەدەکێشا و بەدوای نووسەر و سەرنووسەر و وەرگێڕەکاندا نەدەگەڕا کاتێک ناونیشانی خۆیان دەگۆڕی. بەڵام دواتر کە کودەتای سەربازی ڕووی دا، لەبەرەوە دەست کرا بەدەستگیرکردنی ئەوانەی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان دەگۆڕی. (کا) لەسەر وتارێک کە خۆی نەینووسیبوو و نەشیخوێندبووە و بەپەلە بڵاوکرابووەوە، سزا درابوو و بۆ ئەڵمانیا هەڵهاتبوو.

ئیپەک پرسی: "ئەڵمانیات بۆ سەخت بوو؟"

(کا) گوتی: "ئەوەی لێی دەترسام، فێربوونی زمانی ئەڵمانی بوو. جەستەم لە بەرامبەر ئەڵمانیدا خۆی ڕاگرت و لە ئاکامیشدا سادەیی و ڕۆحی خۆم پاراست." (کا) کە لە ناکاو هەموو شتێکی گێڕایەوە، ترسا لەوەی خۆی دەم بەخەندە نیشان بدات، بەڵام شادمان بوو بەوەی کە ئیپەک گوێی بۆ ڕاگرتبوو. (کا) چیرۆکی خامۆش و نقوومبووی ناو هەناوی و نەبوونی توانای شیعرنووسینی لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا کە چیرۆکێک بوو کەسی تر پێی نەدەزانی، گێڕایەوە.

"لەو خانووە بچووکەدا کە لە نزیک وێستگای شەمەنەفەر بەکرێم گرتووە و پەنجەرەیەکی هەیە بەسەر سەربانەکانی فرانکفورتدا دەڕوانێ، ئێواران لە جۆرێک لە بێدەنگیدا بیرم لە ڕۆژی بەسەربردوو دەکردەوە، ئەمەیش هانی دەدام بۆ شیعر نووسین. دواتر ئەو کۆچبەرانەی تورک کە بیستبوویان من وەکو شاعیر کەمێک لە تورکیا ناسراوم و، هەروەها ئەو شارەوانییانەی کە دەیانویست تورکەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، کتێبخانەکان، قوتابخانەکانی پلە سێ و ئەو دەستە و تاقمانەی کە دەیانویست منداڵەکانیان بەشاعیرێکی تورکینووس ئاشنا بکەن، دەستیان کرد بەبانگهێشتکردنم بۆ شیعر خوێندنەوە."

کاتێک (کا) سواری یەکێک لەو شەمەنەفەرانەی فرانکفورت دەبوو کە ئەم شەیدای نەزمی کاریان و گەیشتنی لە ئان و ساتیاندا بوو، لە پەنجەرە هەڵمگرتووەکانەوە دەیڕوانییە بورجی نازداری کڵێساگەلی گەڕەکەکانی کەنار شار، تاریکایی ناو جەرگەی دارستانی دارە ڕەشەکان، ئەو منداڵە تەندروستانەی کە جانتای قوتابخانە بەکۆڵەوە بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە، دیسانەوە هەستی بەبێدەنگی دەکرد و لەبەرئەوەی هیچ لە زمانی ئەم وڵاتە نەدەگەیشت، هەستی دەکرد لە نیشتمانە و لەسەر شیعر نووسینی خۆی بەردەوام دەبوو. ئەگەر بۆ شیعر خوێندنەوە بۆ شارێکی تر سەفەری نەکردایە، سەعات هەشتی بەیانی لە ماڵ دەهاتە دەرێ و بەشەقامی کایزەردا تێ دەپەڕی و دەچووە کتێبخانەی شارەوانی لە شەقامی تسایل و لەوێ کتێبی دەخوێندەوە. (ئەوێ هێندە کتێبی ئینگلیزیی لێ بوو کە بەشی بیست تەمەنی منی دەکرد.) (کا) بەئارامی و وەکو ئەو منداڵانەی کە دەزانن چاوی مەرگیان لێ دوورە، ڕۆمانەکانی سەدەی نۆزدەیەم کە ئەم شەیدایان بوو، بەرهەمی شاعیرە ڕۆمانسییەکانی ئینگلیز و کتێبی تایبەت بەمێژووی ئەندازیاری و کاتەلۆگی مۆزەخانەکانی دەخوێندەوە. لە کتێبخانەی شارەوانی لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە و سەیری ئەنسکلۆپیدیا کۆنەکانی دەکرد و لەبەردەم لاپەڕە نەخشێنراوەکاندا ڕادەوەستا. سەربارێ ئەوەی لەگەڵ سەرلەنوێ خوێندنەوەی ڕۆمانەکانی تورگەنیەڤدا دەنگی ژاوەژاو و جەنجاڵی شارێکی لە گوێیەکانیدا دەبیست، کەچی لە ناخەوە هەستی بەبێدەنگیی ناو شەمەنەفەرەکە کرد. هەرچەندە ئێواران ڕاگوزەری خۆی



دەگۆڕی و بەبەردەم مۆزەخانەی جووەکاندا بەدرێژاییی کەناری ڕووباری ماین ڕێگای دەبڕی و لە کۆتاییی هەفتەیشدا لەمبەری شارەوە دەیپێوا بۆ ئەوبەری، کەچی بەدەم ڕێکردنەوە هەستی بەهەمان بێدەنگی دەکرد. (کا) گوتی: "پاش ماوەیەک ئەم ساتانەی بێدەنگی ئەوەندەیان جێگا لە ژیانمدا داگیرکرد، بەجۆرێک ئەو هەرا و هوریا نەسرەوتەم نەدەبیست کە دەبوو بۆ شیعر نووسین بەرەنگاری ببمەوە. خۆبەخۆ لەگەڵ ئەڵمانەکاندا نەدەدووام، نێوانیشم لەگەڵ ئەو تورکانەدا خۆش نەبوو کە منیان بەلووتبەرز و ڕۆشنبیر یان نیمچە شێت دەزانی. کەسم نابینی و لەگەڵ کەسدا قسەم نەدەکرد و شیعریشم نەدەنووسی."

ئیپەک گوتی: "بەڵام ڕۆژنامەکە نووسیویێتی کە تۆ ئەم ئێوارەیە نوێترین شیعری خۆت دەخوێنیتەوە."

(کا) لە وەڵامدا گوتی: "من نوێترین شیعر شک نابەم تاکو بیخوێنمەوە."

لە شیرینیخانەکەدا، جگە لەوان، لاوێکی باریکەڵە و تەن بچووک و پیاوێکی لاوازی تەمەن مامناوەندی و ماندوو لە دامێنی مێزێکی تاریکی بەردەم پەنجەرەیەکدا دانیشتبوون. پیاوەکە بەئارامی شتێکی بۆ لاوەکە ڕوون دەکردەوە. تیشکێکی پەمەیی دەیدا لەو بەفرە زۆرەی کە لە تاریکاییی پەنجەرە گەورەکەی پشت سەریانەوە دەباری. لە سووچێکی پەڕی شیرینیخانەکەدا کەوتبوونە گفتوگۆیەکی قوڵەوە، دوو کەسەکە وەکو بەشێک لە فیلمێکی ڕەش و سپیی خراپ دەهاتنە بەرچاو.

ئیپەک گوتی: "قەدیفەی خوشکم لە تاقیکردنەوەکانی ساڵی یەکەمی زانکۆدا دەرنەچوو، بەڵام لە ساڵی دووەمدا توانی لە پەیمانگای پەروەردەی ئێرە وەربگیرێ. ئەو پیاوە لاوازەی لەوپەڕەوە لە پشتی منەوە دانیشتووە، بەڕێوەبەری پەیمانگاکەیە. بابم کە خوشکەکەمی زۆر خۆش دەوێت، دوای مردنی دایکم لە ڕووداوێکی هاتووچۆدا، بڕیاری دا بگوازێتەوە بۆ ئێرە بۆ لای ئێمە. کاتێک ئەو پێش سێ ساڵ هاتە ئێرە، من لە موختار جیا بووبوومەوە. هەموومان پێکەوە جێگیر بووین. هۆتێلەکەمان کە پڕە لە خێو و گیانی مردووان، لەگەڵ خزمەکانماندا تێیدا هاوبەشین. ئێمە لە سێ ژووردا دادەنیشین."

له سـاڵانی زانکۆ و ڕێکخراوە چەپەکاندا هیچ نزیکبوونەوەیەک لە نێوان (کا) و ئیپەکدا نەبوو. کاتێک (کا) بەحەڤدە ساڵی بەڕێڕەوەکانی کۆلێژی ئەدەبیاتدا تێپەڕ دەبوو، وەکو زۆر کەسانی تر لە سایەی شۆخی و جوانییەکەیدا، یەکسەر هەستی بەبوونی ئیپەک کردبوو. ساڵی دواتر کە ئیپەکی بینییەوە، شووی کردبوو بەموختاری شاعیر کە ئەندامی هەمان ڕێکخستنەکەی ئەم بوو. هەردووکیشیان قارسی بوون.

ئیپەک گوتی: "موختار لە باوکیەوە وەکالەتنامەی ئارچەلیک و ئای گازی بۆ مایەوە. لەبەرئەوەی لە سـاڵانی دووای گەڕانەوەماندا بۆ ئێرە منداڵم نەدەبوو، بەردەوام دەیناردم بۆ لای پزیشکەکانی ئەرزەڕووم و ئەستەمبوڵ. هەر لە سۆنگەی منداڵ نەبوونیشەوە لە یەکتر جیابووینەوە. بەڵام موختار لە جیاتی دووبارە ژن هێنانەوە خووی دایە ئاین."

(کا) پرسی: "بۆچ لێرە هەموو کەسێک خوو دەداتە ئاین.؟"

ئیپەک وەڵامێکی پێ نەبوو، هەردووکیان ساتێک نیگایان بڕیە تەلەفزیۆنە ڕەش و سپییەکەی سەر دیوارەکە.

(کا) پرسی: "بۆچی هەموو کەسێک لەم شارەدا خۆی دەکوژێ؟"

ئیپەک لە وەڵامدا گوتی: "هەموو کەسێک نا، کچانی گەنج و ژنان خۆیان دەکوژن. پیاوان خوو دەدەنە ئاین و ژنانیش خۆیان دەکوژن."

"بۆچی؟"

ئیپەک بەجۆرێک سەیری (کا)ی کرد کە (کا) هەستی کرد ڕەهەندێکی بێڕێزی و بێشەرمی لە پرسیارەکەی و لە شێوازی گەڕانی بەدوای وەڵامێکی خێرادا هەیە. کەمێک بێدەنگ بوون.

(کا) گوتی: "بۆ ڕاپۆرتەکەم دەربارەی هەڵبژاردنەکان پێویستە موختار ببینم." ئیپەک هەستا و بەرەو قاسەی شیرینیخانەکە هەنگاوی نا. تەلەفۆنێکی کرد، گەڕایەوە و بەدەم دانیشتنەوە گوتی: "هەتا سەعات پێنج لە بارەگای لقی پارێزگای پارتی چاوەڕێت دەکات."

بێدەنگی باڵی بەسەر دانیشتنەکەیاندا کێشا و (کا) خەم دای گرت. ئەگەر ڕێگاکان



دانەخرابانەیە، ئێستا سواری یەکەم پاس دەبوو و لێرە هەڵدەهات. بەزەییەکی قوڵی بەدەمەوئێوارانی قارس و دانیشتووانی لەبیرکراویدا هاتەوە. هەر لە خۆیەوە چاوی بڕیبووە بەفرەکە. هەردووکیان، وەکو دوو کەس کە کاتیان هەبێ و گوێ بەژیان نەدەن، ساتێکی درێژ سەیری بەفرەکەیان کرد. (کا) خۆی زۆر بەبێچارە دەهاتە بەرچاو.

ئیپەک لێی پرسی: "بەڕاستی لەبەر هەڵبژاردن و خۆکوشتنەکان هاتووی بۆ ئێرە؟"

(کا) گوتی: "نەخێر، لە ئەستەمبوڵ بیستم کە لە موختار جیابوویتەوە. بەمەبەستی زەماوەندکردن لەگەڵ تۆدا بۆ ئێرە هاتووم."

وەکو ئەوەی ئەمە گاڵتەیەکی خۆش بێ، ئیپەک ساتێک پێ کەنی، لێ هێندەی نەبرد کە ڕووی سوور هەڵگەڕا. دوای بێدەنگییەکی درێژ، لە چاوی ئیپەکدا هەستی کرد ژنەکە شتەکان وەکو ئەوەی کە هەیە دەبینێ. چاوەکانی ئیپەک دەیانگوت: "هێندە بێ ئۆقرەی کە ئەگەر بۆ کەمێکیش بووە، ناتوانی نیازی خۆت بشاریتەوە و بەوشەی شیرین ختووکەی هەستم بدەی. هۆی هاتنەکەت بۆ ئێرە خۆشویستنی من و بەتایبەتی بیرکردنەوە لە من نییە، بەڵکو زانیوتە کە جیابوومەتەوە، جوانییەکەمت بیرکەوتووەتەوە و نیشتەجێبوونیشمت لە قارس بەخاڵی لاوازم داناوە، بۆیە هاتووی."

(کا) بەمەبەستی سزادانی ئارەزووی بێشەرمانەی خۆی لە پێناوی بەختەوەریدا کە ئیدی بەتەواوی بۆی بووبوو بەمایەی شەرم، پێشبینیی کرد کە ئیپەک بێبەزەییانە بیر لە شتێکی تریش سەبارەت بەهەردووکیان دەکاتەوە: "ئەوەی بەیەکمان دەگەیەنی کەمبوونەوەی چاوەڕوانییەکانمانە لە ژیان." بەڵام ئیپەک شتێکی تری گوت کە تەواو پێچەوانەی پێشبینییەکانی (کا) بوو: "من هەمیشە ڕام وابوو کە تۆ دەبی بەشاعیرێکی باش. پیرۆزباییت لێ دەکەم بۆ کتێبەکانت."

لە شیرینیخانەکەیش، وەکو لە سەرجەم چایخانە، ڕێستورانت و هوتێلەکانی قارس، لەبری دیمەنی چیاکانی قارس کە خەڵکەکە شانازییان پێوە دەکرد، دیمەنی چیاکانی ئالپی سویسرا هەڵواسراون. گارسۆنە بەساڵاچووەکە کە پێش کەمێک دوو چای بۆ هێنابوون، لە نێوان ڕیزە سینیی پڕ لە چۆرەک و شۆکۆلاتەدا کە کاغەزە

چەور و زەرکەفتەکانیان لەبەر ڕۆشناییی لاوازی گڵۆپەکاندا دەبریسکانەوە، لە تەنیشت کاسەکەوە، ڕوو لە ئەمان و پشت لە مێزەکانی دواوە، بەکامەرانی سەیری تەلەفزیۆنە ڕەش و سپییەکەی قەد دیوارەکەی دەکرد. (کا) کە ئامادە بوو جگە لە چاوی ئیپەک سەیری هەموو شتێکی تر بکات، چاوی لە فیلمی ناو تەلەفزیۆنەکە بڕی. لە فیلمەکەدا، ژنە ئەکتەرێکی چاوشین و قژزەردی تورک بەمایۆوە بەسەر لمی قەراغ دەریایەکدا ڕای دەکرد، دوو پیاوی سمێڵ بابڕ ڕاویان دەنا. لاوە باریکەڵە و تەن بچووکەکە کە لەوپەڕی شیرینیخانەکە بەدەوری مێزێکەوە دانیشتبوو، لەو کاتەدا هەستایە سەرپێ، ڕووی دەمانچەکەی دەستی لە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە کرد و چەند شتێکی پێ گوت کە (کا) بەباشی گوێی لێ نەبوو. دواتر (کا) تێ گەیشت کە لەگەڵ وەڵامدانەوەکەی بەڕێوەبەردا، زرمە لە دەمانچەکە هەستێنراوە. بەدەنگی ناڕوونی دەمانچەکەدا نا، بەڵکو (کا) بەوە زانی تەقەکراوە، کاتێک بینی کە بەڕێوەبەر لەتاو ئازاری ئەو فیشەکانەی بەری کەوتبوو، لە کورسییەکەی کەوتە خوارەوە.

ئیپەکیش ڕووی خۆی وەرگێڕابوو و سەیری هەمان دیمەنی دەکرد کە (کا) چاوی تێ بڕیبوو. گارسۆنە پیرەکە لەو شوێنە نەمابوو کە (کا) پێش کەمێک لێی بینبیوو. لاوە باریکەڵە و تەن بچووکەکە لە شوێنی خۆی هەستابووە سەرپێ و ڕووی دەمانچەکەی لە بەڕێوەبەر کردبوو. بەڕێوەبەریش چەند شتێکی پێ دەگوت. لەبەر دەنگی تەلەفزیۆنەکە نەدەزانرا کە چی دەڵێ. لاوە باریکەڵە و تەن بچووکەکە، دوای ئەوەی سێ فیشەکی تری بەجەستەی بەڕێوەبەرەوە نا، لەپڕ لە دەرگایەکەوە چووە دەرێ و ون بوو. (کا) بەهیچ جۆرێک چارەی کابرای نەبینی. ئیپەک گوتی: "با بڕۆین. با لێرە ڕانەوەستین."

(کا) بەدەنگێکی نووساوەوە گوتی: "فریاکەون!" دواتر گوتی: "با تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکەین." بەڵام لە شوێنی خۆی نەجوولا. پاشان بەدوای ئیپەکدا هەڵهات. نە لە نێوان دەرگای دوودەری شیرینیخانەکەدا و نە لەسەر پلیکانەکان کە ئەمان بەخێرایی بەسەریاندا چوونە دەرێ، کەس بەدی نەدەکرا.

لەپڕ خۆیان لەسەر شۆستە بەبەفر داپۆشراوەکان بینییەوە و بەپەلە دەستیان



بەرۆیشتن کرد. (کا) بیری لەوە کردەوە کە کەس دەرچوونی ئەوانی لەوێوە نەبینیوە، ئەمەیش سووکناییی بەدڵیدا دەهێنا، چونکە وای هەست دەکرد وەکو ئەوەی کە خۆی تاوانەکەی ئەنجامدابێ. وای دەزانی سزای پڕ بەپێستی دەربڕینی ئارەزووی خۆی بۆ زەماوەند وەرگرتووە، بۆیە ئێستا لە دەربڕینی ئەو ئارەزووە پەشیمان بوو و شەرمی بەخۆیدا دەهاتەوە. نەیدەویست چاوی بەهیچ کەسێک بکەوێ.

کاتێک گەیشتنە گۆشەی شەقامی کازم قەرەبەکر، (کا) لە زۆر شت دەترسا، بەڵام بەختەوەر بوو بەو کامەرانییە بێدەنگەی کە لە پای هەبوونی ڕازێکی هاوبەش لەگەڵ ئیپەکدا وەبەرهاتبوو. کاتێک (کا) لەبەر ڕۆشناییی گڵۆپێکی ڕووتەڵەدا کە سندووقی پرتەقاڵ و سێوەکانی بەر دەرگای خانی خالید پاشای ڕووناک دەکردەوە و لە جامخانەی سەرتاشخانەکەی ئەولاتردا دەشکایەوە، فرمێسکی لە چاوەکانی ئیپەکدا بینی، شڵەژا.

ئیپەک گوتی: "بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە مۆڵەتی بەچوونە ژوورەوەی کچە قوتابیانی سەرپۆش بەسەر نەدەدا. بۆیە بەستەزمانە کوژرا."

(کا) گوتی: "با پۆلیس ئاگادار بکەینەوە." دەسبەجێ ئەوەی بیرکەوتەوە کە چەپەکان سەردەمانێک نەفرەتیان لەم ڕستەیە دەکرد.

ئیپەک گوتی: "هەرچۆنێک بێ خۆیان تێ دەگەن. لەوانەیشە ئێستا بەهەموو شتێکیان زانیبێ." پاشان پەنجەی ڕاکێشا بۆ دەروازەی خانەکە و گوتی: "بارەگای لقی پارتی ڕەفا لە نهۆمی دووەمە لە سەرەوە. ئەوەی بینیت بۆ موختاری بگێڕەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر میت بەسەریاندا دا تووشی حەپەسان نەبێ. هەروەها با ئەمەیشت پێ بڵێم: موختار دەیەوێ سەرلەنوێ زەماوەندم لەگەڵدا بکات، کاتێک قسەی لەگەڵدا دەکەی، ئەمەت لەبیر نەچێ."

## ٥

# مامۆستا بۆم هەیە پرسیارێکت لێ بکەم؟

## دوا گفتوگۆی نێوان بکوژ و کوژراو

بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە کە کوڕە لاواز و باریکەڵەکە لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ و بەبەرچاوی (کا) و ئیپیەکەوە چەند فیشەکێکی بەسنگ و سەریەوە نا، ئامێرێکی بچووکی دەنگ تۆمارکردن لە مارکەی (گروندیک) لە لایەن کارمەندە وردبین و شارەزاکانی سەر بەلقی قارسی دەزگای هەواڵگریی میللی -میت-ەوە بەپارچەیەک لەزگەی باریک لەسەر لەشی جێگیرکرابوو. بەڕێوەبەر بەهۆی ئەوەی مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کچانی سەرپۆش بەسەری بۆ پەیمانگا و پۆلەکان نەدەدا، هەم خۆی چەند هەڕەشەیەکی پێ گەیشتبوو و هەم فەرمانبەرانی سڤیلی دەزگای میت-یش لە قارس هەندێک هەواڵیان لەو بارەیەوە لە دەوروبەرە ئاینییەکانەوە کۆکردبووەوە، بۆیە پێشنیازی پاراستنیان پێ کردبوو، بەڵام بەڕێوەبەر سەرباری ئەوەی پیاوێکی لایسیست بوو، هێندەی باوەڕمەندێکی خوداپەرست باوەڕی بەچارەنووس هەبوو، حسابی ئەوەی کردبوو کە لەبری ئەوەی پاسەوانێکی دێوئاسا بخەنە هاوشانی، باشتر وایە دەنگی هەڕەشەکاران تۆمار بکات و دواتر بەگرتیان بدات. کاتێک بەمەبەستی خواردنی چۆرەکی گوێزدار چووە شیرینیخانەی ژیانی نوێ، بینی ئەوا کەسێکی نەناسراو لێی نزیک دەبێتەوە. ئەمیش ئەو کارەی کرد کە دەبوو لەم جۆرە ڕەوشانەدا بیکات، ئەویش داگیرساندنی تۆمارکەرەکەی ژێر جلوبەرگەکانی بوو. ئامێری تۆمارکردنەکە کە نەیتوانی ژیانی بەڕێوەبەر ڕزگار بکات، سەرەڕای پێکانی بەدوو فیشەک، لە کار نەکەوتبوو. من دواتر لە ڕێی بێوەژنی خودا لێخۆشبووی بەڕێوەبەر کە دوای چەندین ساڵ هێشتا چاوەکانی فرمێسکیان لێ دەباری و لە ڕێی کچکەیەوە کە مانکەنێکی ناسراوبوو، دەقی گفتوگۆی کاسێتی ناو ئامێری تۆمارکردنەکەم دەست کەوت.



"سڵاو مامۆستا، دەمناسنەوە" / "نا، نایەتەوە یادم." / "منیش هەروای بۆ چووبووم مامۆستام، چونکە پێشتر یەکترمان نەناسیوە. دوێنێ ئێوارە و ئەم بەیانییە دوو جار هەوڵم دا قسەتان لەتەکدا بکەم. دوێنێ پۆلیس لەبەردەم دەرگای پەیمانگا گەڕاندمیانە دواوە. ئەم بەیانییە توانیم بێمە ژوورەوە، بەڵام سکرتێرەکەتان نەیهێشت بگەم بەدیدەنیتان. منیش ویستم بەر لەوەی بچنە پۆلەوە، لەبەردەم دەرگادا خۆمتان نیشان بدەم. لەو دەمەدا منتان بینی. ئەمەتان دێتەوە بیر مامۆستام؟" / "نا، بیرم نایەت." / "بیرتان نایەت کە منتان بینیبێ؟" / "دەتانویست باسی چیم لەگەڵدا بکەن؟" / "لە ڕاستیدا دەمەوێ چەندین سەعات و چەندین ڕۆژ لەگەڵ ئێوەدا قسە لەسەر هەموو شتێک بکەم. پرۆفیسۆرێکی شارەزا و مرۆڤێکی زۆر بەڕێز و خوێندەوار و رۆشنبیرن. ئێمە بەداخەوە نەمانخوێندووە، بەڵام لە بابەتێکدا زۆرمان خوێندووە، ئەویش ئەو بابەتەیە کە دەمەوێ لەگەڵ ئێوەدا گفتوگۆی لەسەر بکەین. بمبەخشن مامۆستام، خۆ لە کاتتان ناگرم، وا نییە؟" / "ئەستەغفیروڵا." / "بمبوورن، بەیارمەتیتان دەتوانم دانیشم؟ چونکە بابەتێکی هەمەلایەنە." / "فەرموون، تکا دەکەم." / "دەنگی ڕاکێشانی کورسی و دانیشتن دێت." / "چۆرەکی گوێزدار دەخۆن مامۆستام. لە تۆکاتی لای ئێمە دارگوێزی زۆر گەورە هەن. ئایا هیچ سەرتان لە تۆکات داوە؟" / "بەداخەوە، نەخێر. " / "زۆر بەداخەوە مامۆستام. ئەگەر بێن، دەبنە میوانی من. هەموو تەمەنی خۆم، تەواوی سی و شەش ساڵەکەم لە تۆکات بەسەر بردبووە. تۆکات زۆر دڵگیرە. تورکیاش زۆر دڵگیرە. (کەمێک بێدەنگی)، بەڵام جێی داخە کە وڵاتی خۆمان ناناسین و هاووڵاتیانی خۆمان خۆش ناوێت. تەنانەت بێڕێزی نواندن و ناپاکیکردن لەم میللەتە بە ماریفەت دادەنرێ. بمبەخشن مامۆستام، مۆڵەتم دەدەن پرسیارێکتان لێ بکەم، ئێوە خودانەناسن، وا نییە؟" / "نا، کە نیم. " / "وا دەڵێن، بەڵام منیش هیچ باوەڕ ناکەم کەسێکی خوێندەواری وەکو ئێوە -حاشا- نکوڵی لە هەبوونی خودا بکات. پێویستیش ناکات بگوترێ، بەڵام خۆ جوولەکەیش نین، وا نییە؟" / "نا، کە نیم." / "مسوڵمانن؟" / "سوپاس بۆ پەروەردگار، مسوڵمانم." / "مامۆستام دەبینم بزەتان دێ، کەوا بوو تکایە ئەم پرسیارەم بەهەند وەربگرن و وەڵامم بدەنەوە. چونکە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەم

بدەنەوە، بەم زستانە لە تۆکاتەوە بەناو بەفر و کرێوەدا گەیشتوومەتە ئێرە." / "لە تۆکات لە کوێوە ناوی منتان بیستووە؟" / "مامۆستا، ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ لەو بارەیەوە نانووسن کە ئێوە مۆڵەت نادەن کچانی ئێمەی سەرداپۆشراو و پەیوەست بەئاین و کتێبەوە بچنە ناو پەیمانگاوە. ئەوانە سەرقاڵی بێ ئابڕووییەکانی کچگەلی مانکەنی ئەستەمبوڵن. بەڵام لە تۆکاتی دڵگیر ڕادیۆیەک هەیە بەناوی بایراق کە لە هەر شوێنێکی وڵات نارەوایی بەرامبەر بەباوەڕمەندان بکرێ، ئەم هەواڵەکەی بەگوێگران دەگەیەنێ." / "من نارەوایی دەرهەق بەباوەڕمەندان ناکەم، منیش لە یەزدان دەترسم." / "مامۆستام، دوو ڕۆژە بەڕێگا و بانی بەستەڵەک و تۆفەوەم؛ لە ناو پاسەکاندا هەر بیرم لە ئێوە دەکردەوە، باوەڕم پێ بکەن زۆر باشم دەزانی کە دەڵێن (من لە یەزدان دەترسم.) لەو کاتەدا لە خەیاڵی خۆمدا بیرم لەوە کردەوە ئەم پرسیارەتان لێ بکەم: ئەی پرۆفیسۆر نووری یەڵماز، ئەی مامۆستای بەڕێز، ئەگەر لە خودا دەترسن و باوەڕتان هەیە کە قورئانی پیرۆز فەرمایشتی یەزدانە، دە کەواتە پێم بڵێن بۆچوونتان سەبارەت بەئایەتی سی و یەکەمینی سورەتی نوور چییە؟" / "ئەم ئایەتە بەئاشکرا داوا لە ژنان دەکات سەریان داپۆشن و تەنانەت ڕووی خۆشیان بشارنەوە." / "زۆر جوان و دروستتان فەرموو، سوپاس مامۆستام! کەواتە ئێستا دەتوانم پرسیارێک بکەم. باشە، ئەم فەرمانەی یەزدان چۆن گرێ دەدەنەوە بەڕێگرتنتان لە چوونە ژوورەوەی کچانی سەرداپۆشراومان بۆ پۆلەکان؟" / "ڕێگرتن لە چوونە ژوورەوەی کچانی سەرداپۆشراو بۆ پۆلەکان و تەنانەت بۆ قوتابخانەکانیش، فەرمانی دەوڵەتی لایسیستمانە." / "بمبەخشن مامۆستام، ئایا دەتوانم پرسیارێک بکەم: مامۆستام، ئایا فەرمانی دەوڵەت لە فەرمانی خودا گەورەترە؟" / "پرسیارێکی بەجێیە، بەڵام ئەم شتانە لە دەوڵەتێکی لایسیستدا لە یەکتر جیاوازن." / "زۆر ڕاستتان فەرموو مامۆستام، بێنە با دەستتان ماچ بکەم، بێنە مامۆستام، مەترسە، بێنە، بڕوانن، تێر و پڕ دەستم ماچ کردن. ئۆه. خوداتان لێ ڕازی بێت. ئێستا تێ گەیشتن کە ئێوە چەند بەڕێزن لەلام. مامۆستام، تکایە ئێستا دەتوانم پرسیارێک بکەم؟" / "فەرموون، تکا دەکەم." / "مامۆستام، باشە لایسیزیم واتای بێ ئاینی دەگەیەنێ؟" / "نەخێر." / "ئەی کەواتە کچانی سەرداپۆشراومان کە پەیڕەو لە فەرمانەکانی ئاینەکەیان دەکەن، بۆچی ڕێیان پێ نادرێ بچنە پۆلەکانەوە؟" / "بەخودا کوڕم، بەقسەکردن لەسەر ئەم بابەتانە ناگەینە ئەنجام. ئەوەتا ڕۆژ هەتا ئێوارە لە تەلەفزیۆنەکانی ئەستەمبوڵدا قسە و باس لەسەر ئەم بابەتانە دەکرێ، بەڵام بەچی دەچێ؟ نە کچان سەرپۆشەکانیان فڕێ دەدەن و نە دەوڵەتیش مۆڵەتیان پێ دەدات بەو شێوەیە بچنە پۆلەکانەوە." / "باشە مامۆستام، ئایا دەتوانم پرسیارێک بکەم؟ توخودا بمبەخشە، گەلۆ زەوتکردنی مافی خوێندنی کچانی سەرداپۆشراومان، ئەو کچە زیرەک و بەڕەوشت و خوداپەرستانە کە بەهەزار دەردی سەری پەروەردەمان کردوون، لەگەڵ دەستوور و ئازادیی پەروەردە و ئایندا یەک دەگرێتەوە؟ ئایا بەویژدانی ئێوە ڕەوایە؟ مامۆستام، تکایە وەڵامم بدەرەوە." / "ئەو کچانە ئەگەر ئەوەندە لە خوداترس بوونایە، سەرپۆشەکانیان تووڕهەڵدەدا. کوڕم تۆ ناوت چییە و چ کارەی؟" / "مامۆستام، لەسەر ئاگردانی چایخانەکەی خوار گەرماوی پەروانەوە لە تۆکات کاردەکەم. من لەوێ لێپرسراوی کتری و قۆری و ئاگردانم. ناوم ئەوەندە گرنگ نییە، ڕۆژ هەتا ئێوارەیش گوێ لە ڕادیۆی بایراق دەگرم. هەندێک جار ئەنجامدانی نارەوایی لە دژی مسوڵمانان لە کەللەم دەدات و جا مامۆستام، لەبەرئەوەی من لە وڵاتێکی دیموکراتدا دەژیم و مرۆڤێکی ئازادی ئەوتۆم کە بەئارەزووی دڵی خۆم دەژیم، سواری پاس دەبم و خۆم دەگەیەنمە ئەو کەسەی کە لە کەللەی داوم، جا لە هەر کوێیەکی تورکیا بێت، ڕووبەڕوو حسابی ئەو نارەواییەی لێ دەپرسم. لەبەر ئەوە تکایە مامۆستام وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە. ئایا فەرمانی دەوڵەت گەورەترە یاخۆ فەرموودەی خودا؟" / "کوڕم، ئەم گفتوگۆیە نامانگەیەنێتە هیچ شوێنێک. تۆ لە کام هوتێل لات داوە؟" / "ئایا لای پۆلیس زمانم لێ دەدەی؟ لە من مەترسە مامۆستام. ئەندامی هیچ ڕێکخراوێکی ئاینی نیم. نەفرەتیش لە تیرۆر دەکەم و بڕوام بەدانوسانی هزر و خۆشەویستیی خودا هەیە. هەر لەبەرئەوەیشە من سەرەڕای ئەوەی کەسێکی خاوەن زانیاریی کەم و ئەزموونێکی سنووردارم لە ژیاندا، بەڵام لە دانوستانی هزردا هەمیشە گوێڕایەڵ بووم. دەمەوێ تەنیا وەڵامی ئەو پرسیارەم بدەیتەوە. مامۆستام، بمبەخشن، لە کاتێکدا لە سورەتەکانی ئەحزاب و نووری قورئانی پیرۆزدا کە فەرموودەی خودایە، ئەمە زۆر ئاشکرا ڕوون کراوەتەوە،

باشە ئازاری ئەو کچانەی لەبەردەم پەیمانگا ڕێیان لێ دەگرن، بەویژدانتانەوە نادات؟" / "کوڕم، قورئانی پیرۆز دەفەرموێ دەستی دزیش ببڕن، بەڵام دەوڵەتی ئێمە نایبڕێ. ئەی بۆچی لەدژی ئەمە ڕاناوەستی؟" / "وەڵامێکی زۆر جوانە مامۆستام. دەستەکانتان ماچ دەکەم. بەڵام ئایا قۆڵی دزی و ئابڕووی ژنانی ئێمە دەکەن بەیەک؟ بەپێی ئامارێک کە لە لایەن مسوڵمانی ئەمەریکایی ڕەشپێست مارڤین گینگەوە ئەنجام دراوە، ڕووداوی دەستبردن بۆ ئابڕووی ژنان لەو وڵاتە ئیسلامییانەی کە ژنانیان سەرپۆش دەپۆشن، هێندە کەمە تا ڕادەی نەبوون و باسێکیش لە لاقەکردن نییە، چونکە ژنێکی سەرپۆش بەسەر، هەر لە سەرەتاوە لە ڕێی جەستەیەوە بەپیاوان دەڵێ: (تکایە دەست بۆ ئابڕووم مەبەن.) مامۆستام، تکایە دەتوانم پرسیارێک بکەم: ئایا دەمانەوێ بەبێبەشکردنی ژنانی سەرداپۆشراو لە پەروەردە و توورڕدانیان بۆ دەرەوەی کۆمەڵگا و، بەکردنی ژنانی سەر ڕووت بەتاجی سەر، ئابڕووی ژنانمان وەکو سەردەمی دوای شۆڕشی سێکس لە ئەوروپا بەدوو ئانە بگۆڕینەوە و، خۆیشمان، توخودا بمبەخشن، ببین بەگەواد؟" / "کوڕم من چۆرەکەکەم تەواو کرد، بمبوورە، من دەڕۆم." / "دانیشە مامۆستام، دانیشە با ئەمە بەکار نەهێنم. ئەمە چییە مامۆستام، دەیبینی؟" / "دەمانچە." / "بەڵێ مامۆستام، بمبوورن، من لەبەر ئێوە ئەو هەموو ڕێگایەم بڕیوە، کەسێکی ئەوەندە دەبەنگ و گەوج نیم، گوتم لەوانەیە گوێم لێ ڕانەگرن، بۆیە ئەم تەگبیرەم کرد." / "کوڕم، ئێوە ناوتان چییە؟" / "واحید سویزمە یاخۆ سالم فەشمەکان، چ بایەخێکی هەیە مامۆستام. من لەم وڵاتە لایسیست و ماتەریالیستەدا پارێزەرێکی بێ ناوی ئەو قارەمانە نەناسراوانەم کە لە پێناوی باوەڕی خۆیاندا تێ دەکوشن و ڕووبەڕووی نارەوایی دەبنەوە. ئەندامی هیچ ڕێکخراوێک نیم. لایەنگری مافەکانی مرۆڤم و خۆشیم بەچارەی توند و تیژیدا نایەت. لەبەر ئەوە دەمانچەکەم دەخەمەوە گیرفانم و لە ئێوە داواکارم تەنیا وەڵامی پرسیارێکم بدەنەوە." / "باشە." / "مامۆستام، ئەو کچانە کە پەروەردەکردنیان چەندین ساڵی خایاندووە و هەر یەکەیان سۆمای چاوی دایک و باوکانیانن، ئەو کچە زیرەک و هۆشمەندانەی کە هەموویان یەکەمی پۆلەکانیانن، بەفەرمانێک کە لە ئانکاراوە بۆتان هات، هەمووتان فەرامۆش کردن. ئەوانەیشی ناویان لە تۆماری



تاقیکردنەوەکاندا هەبوو، ئێوە بەبیانووی ئەوەی سەرداپۆشراون، ناوەکانیانتان سڕیەوە. کاتێک حەوت قوتابی کە یەکێکیان سەرپۆش بەسەر بوو، هاتنە لای مامۆستاکەیان، ئێوە حسابی نەبووتان بۆ سەرپۆش بەسەرەکە کرد و داواتان لە چایچییەکە کرد شەش چایان بۆ بێنێ. حسابتان بۆ ئەو کچانە نەکرد و ئەوانتان گریاند. هەر بەوەندەشەوە نەوەستان. بەفەرمانێکی نوێ کە لە ئانکارەوە هات، سەرەتا دەروازەی پۆلەکانتان لێ گرتن و ئەوانتان فڕێ دایە ڕێڕەوەکانەوە، دواتریش دەرتان کردنە دەرەوەی دەروازەی پەیمانگا. یەکێک لەو کچە قارەمانانەی کە کۆڵی نەدا و سەری ڕووت نەکرد و بۆ نیشاندانی نارەزایی خۆی، لەبەردەم دەرگای پەیمانگادا لە سەرماندا هەڵدەلەرزی، تەلەفۆنتان کرد و پۆلیستان بۆ بانگ کرد") / "ئێمە بانگی پۆلیسمان نەکرد." / "مامۆستام، لە ترسی دەمانچەکەی گیرفانم درۆم لەگەڵدا مەکە. ئەو ڕۆژانەی پۆلیس کچانیان دەدایە پێش خۆیان و بۆ گرتووخانە ڕاپێچیان دەکردن، ئێوە شەوان بەچ ویژدانێکەوە سەرتان دەنایە سەر سەرین؟ ئەوەیە پرسیارەکەم." / "بێگومان گۆڕینی سەرپۆش بۆ سیمبول و بۆ گەمەیەکی سیاسی، کچانی ئێمەی زیاتر ناشاد کرد." / "گەمەی چی مامۆستام، یەکێک لەو کچانەی کە کەوتە نێوان بەرداشی خوێندن و ئابڕووەوە، چ جێی داخە کە خۆی کوشت. ئایا ئەوە گەمەیە؟" / "کوڕم، تۆ زۆر تووڕەی، ئایا هیچ بیرت لەوە کردووەتەوە کە هەندێک هێزی دەرەکی لە پشت گۆڕینی ئەم بابەتی سەرپۆشەوەن بۆ پرسێکی سیاسی بەمەبەستی پارچەکردن و لاوازکردنی تورکیا؟" / "مامۆستام، ئایا کچی سەرداپۆشراوی تر هەیە ئەگەر تۆ ئەمانە بکەیتە ژوورەوە؟" / "کوڕم، ئایا بەویستی من دەبێت؟ ئەوە خواستی ئانکارایە. هاوسەرەکەی منیش سەرپۆش بەسەرە." / "مامۆستام، چاپلوسیم لەگەڵدا مەکە و وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە." / "کام پرسیار؟" / "ویژدانت ئازارت نادات؟" / "کوڕم، منیش باوکم، بێگومان منیش بۆ ئەو کچانە غەمگین دەبم." / "بڕوانە، من زۆر باش توانیم خۆم ڕابگرم، بەڵام من کەسێکی زۆر کەللەڕەقم. سەرم گەرم بێ، فیلم دەسازێنم. لە زینداندا لە زەلامێکم دا تەنیا لەبەرئەوەی لە کاتی باوێشکداندا دەستی بەدەمیەوە نەگرت، هەموو قاوشەکەم پیاو کرد، هەموویان دەستبەرداری خووە خراپەکانیان بوون و دەستیان بەنوێژکردن

کرد. ئێستا تۆیش خۆتم لێ مەدزەوە و وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە." / "چیت گوت کورِم؟ ئەو دەمانچەیە داگرە." / "ئایا کچت هەیە، غەمگین دەبیت؟ ئەمەم نەپرسیبوو." / "ببوورە کورِم، چیت پرسی؟" / "دەی، لە ترسی دەمانچەکەم ماستاوم بۆ سارد مەکەرەوە. بیهێنەوە بیری خۆت چیم لێت پرسیبوو." / (کەمێک بێ دەنگی.) / "چیتان پرسیبوو؟ / "هەی بێ باوەڕ، پرسیم کە داخۆ ویژدانت ئازارت نادات؟" / "بێگومان ئازارم دەدات." / (کەواتە بۆ دەیکەی هەی بێ ئابڕوو؟" / "کورِم من مامۆستایەکم لە تەمەنی باوکی ئێوەدا. ئایا لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانێک هەیە بفەرموێ دەمانچە هەڵکێشن و سوکایەتی بکەن؟" / "تۆ بۆت نییە ناوی قورئانی پیرۆز بهێنی، باشە؟ بە ڕاست و چەپیشدا مەڕوانە بۆ گەڕان بەدوای یارمەتیدا. هاواریش بکەی، تەختت دەکەم. ئێستا تێ گەیشتی؟" / "تێ گەیشتم." / "کەواتە وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەرەوە: ڕووتکردنی سەری کچانی سەرداپۆشراو چی سوودێکی دەبێت بۆ ئەم وڵاتە؟ هۆیەکم پێ بڵێ کە لە ناختەوە هەڵقولابێ و ویژدانت هەرسی کردبێ، بۆ نموونە بڵێ: ئەگەر سەریان ڕووت بکەن، ئەوا ئەوروپاییگەل زیاتر حسابی مرۆڤیان بۆ دەکەن. هەر هیچ نەبێت لە مەبەستت تێ دەگەم، تەقەت لێ ناکەم و ئازادت دەکەم." / "کوڕی بەڕێزم، منیش کچێکم هەیە سەری ڕووتە. هەروەکو چۆن کارم بەسەر دایکە سەرپۆش بەسەرەکەیەوە نییە، ئاواش کارم بەسەر ئەوەوە نییە." / "کچەکەت بۆچی سەری ڕووت کرد، ئایا دەیەوێت ببێ بەتیاترۆ؟" / "هیچ شتێکی لەو جۆرەی بەمن نەگوتووە. لە ئانکارا لە بەشی پێوەندییە گشتییەکان دەخوێنێ. جێی داخە لەم مەسەلەی سەرپۆشەدا من بووم بەئامانجی هەرە گەورە و داخ و ئازاری زۆرم چەشت. هەر کاتێکیش دووچاری بەدگۆیی، هەڕەشە، کەسانی تووڕە و مافداری وەکو ئێوە و چاوسوورکردنەوەی دوژمنەکانم بووبم، کچەکەم پشتیوانیی زۆری لێ کردووم. لە ئانکاراوە تەلەفۆنی کردووە و..." / "دەیگوت: ئەمان بابە، دان بەخۆتدا بگرە، من دەمەوێ بچمە سەر شانۆ." / "نا کورِم، وای نەدەگوت. دەیگوت: بابە، لە خۆم ڕانابینم بەسەری ڕووتەوە بچمە پۆلێکەوە کە هەموو قوتابییەکانی سەرپۆش بەسەر بن و پێویستیش بێت من بەپێچەوانەی ویستی خۆمەوە سەرپۆش بەسەر بکەم." / "باشە چی ڕووی دەدا ئەگەر بەپێچەوانەی ویستی خۆیەوە



سەرپۆشی لەسەر بکرایە؟" / "بەخودا کورِم من لەم شتانە ناکۆڵمەوە. ئێوە داواتان کرد هۆیەکتان پێ بڵێم." / "کەواتە ئەی بێ ئابڕوو، تۆ بۆ ئەوەی کچەکەت لە سەفای خۆی نەکەوێ، کچانی باوەڕمەند و پەیڕەوکەری فەرمایشتەکانی خودا لەبەردەم دەروازەی پەیمانگا دەدەیتە دەم قامچیی پۆلیسەوە، دەیانچەوسێنیتەوە و زەمینە بۆ خۆکوشتنیان خۆش دەکەیت." / "هۆی کچەکەیشم هەمان هۆی زۆربەی ژنانی تری تورکە." / "من تێ ناگەم سەماکەری تیاترۆخانەکان چی هۆیەکیان هەیە لە کاتێکدا لە سەدا نەوەدی ژنانی تورکیا سەرپۆش بەسەرن. شانازی بەخۆ ڕووتکردنەوەی کچەکەتەوە دەکەیت، تۆ ئەی بێ ئابڕووی زۆردار، بەڵام ئەمە بخەرە مێشکتەوە، من پرۆفیسۆر نیم، بەڵام لەم بارەیەوە زۆر زیاتر لە تۆم خوێندووەتەوە." / "بەڕێزم، تکایە ڕووی لوولەی چەکەکەتان لە من مەکەن، ئەگەر تووڕە بن لە دەستتان دەردەچێ، دەیتەقێنن و لەوانەیشە لە ئاکامدا پەشیمانی بچێژن." / "بۆچی پەشیمانی دەچێژم، من خۆم دوو ڕۆژە بەناو بەفر و کرێوەدا بەڕێوەم بۆ ئەوەی سەرزەمین لە کافرێک پاک بکەمەوە. قورئانی پیرۆز دەفەرموێ؛ کوشتنی زۆردارێک کە باوەڕمەندان دەچەوسێنێتەوە، ئەرکە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەزەییم پیاتا دێتەوە، دوا هەلت دەدەمێ: تەنیا یەک هۆم پێ بڵێ کە بەویژدانی تۆ ڕەوا بێ بۆ سەر ڕووتکردنی کچانی سەرپۆش بەسەر. ئەگەر بەقسەم بکەی، سوێندت بۆ دەخۆم کە تەقەت لێ ناکەم." / "ئەگەر ژن سەرپۆشەکەی لاداتە لاوە، پایەیەکی گونجاوتر و سەنگینتر لە کۆمەڵدا بەدەست دێنێ." / "لەوانەیە بۆ کچەکەی تۆ کە دەیەوێت ببێتە تیاترۆجوو، وا بێت. بەڵام بەپێچەوانەوە، خۆپێچانەوە ژنانی لە پەلامار و لاقەکردن پاراستووە و هەڵسوڕانیانی لە کۆمەڵدا ئاسانتر کردووە. مەلاحەت شاندرای سەماکەر و زۆرێکی تر لەو ژنانەی کە دواتر بڕیاری سەرداپۆشینیان داوە ڕایان گەیاندووە کە سەرپۆش ژنی لەو ڕەوشە دەرهێناوە کە لە پێناوی وەڵامدانەوەی هەوەسە ئاژەڵییەکانی لاوانی کوچە و کۆڵانەکاندا لەگەڵ ژنانی تردا بکەوێتە ڕقەبەری و هەمیشە هێندە سووراو بکات تا وەکو دەعبایەکی بەستەزمانی بەسەردێت. هەروەکو پرۆفیسۆری ڕەشپێستی ئەمەریکایی ماڤین کینگیش گوتوویەتی، ئەگەر ئەکتەری بەناوبانگ ئەلیزابێت تایلۆر لەم بیست ساڵەی دواییدا سەرپۆشی لەسەر بکردایە، ئەوا شەرمی لە قەڵەوییەکەی

نەدەکرد و نەدەکەوتە نەخۆشخانە و بەختەوەر دەژیا. بمبەخشن مامۆستام، ئایا دەتوانم پرسیارێک بکەم: بۆ پێ دەکەنی مامۆستام، ئایا قسەکانم هێندە مایەی پێکەنین؟ (کەمێک بێدەنگی) کورە هەی بێ ئابڕووی خودانەناس، قسە بکە، بۆچی پێ دەکەنی؟" / "کوڕی بەڕێزم، بڕوام پێ بکەن پێ ناکەنم، ئەگەر پێکەنینیشم هاتبێ، ئەوا لە تووڕەبوونمەوە بووە." / "نا، بەبڕواوە پێ کەنیت." / "کوڕی بەڕێزم، منیش دڵم پڕە لە سۆز و بەزەیی بەرامبەر بەکەسانی وەکو تۆ و هەموو ئەوانەی کە لەم وڵاتەدا لە سۆنگەی باوەڕمەندییاندا ئازار دەچێژن." / "بەخۆڕایی سالوسیم لەگەڵدا مەکە. من هیچ ئازار ناچێژم. بەپێکەنینەکەشتدا دیارە کە نیازی پەشیمانبوونەوەت نییە. بۆیە هەر ئێستا بارودۆخەکەت بۆ بەیان دەکەم. دادگای مجاهیدانی ئیسلامی لەمێژە سزای مەرگی بۆت بڕیوەتەوە، بڕیارەکەش پێنج ڕۆژ لەمەوبەر لە تۆکات بەکۆی دەنگ پەسەندکرا و منیشیان بۆ جێبەجێکردنی ناردووە. ئەگەر پێ نەکەنیبای و پەشیمان بوویتایەوە، لەوانە بوو بتبەخشم. ها ئەو کاغەزە بگرە و بڕیارەی کوشتنەکەت بخوێنەوە... (کەمێک بێدەنگی) وەک ژن مەگری و بەدەنگێکی بەرز بیخوێنەوە، دەی بێ ئابڕوو، ئەگەر نا، هەر ئێستا ڕۆحت لەبەر دەبڕم." / "من پرۆفیسۆری خودانەناس نووری یەڵماز، کوڕی بەڕێزم، من خودانەناس نیم..." / "دەی بیخوێنەوە." / "کوڕم، لە کاتی خوێندنەوەیدا تەقەم لێ ناکەن؟" / "ئەگەر نەیخوێنیتەوە، زرمەت لێ هەڵدەسێنم، بیخوێنەرەوە، دەی." / "وەکو ئامێرێک بۆ کردنی مسوڵمانانی کۆماری تورکیای لایسیست بەکۆیلەی ڕۆژئاوا و ئابڕووبردنیان و لە ئاین دەرکردنیان، ئەوەندە گوشارم خستە سەر ئەو کچانەی کە پابەندی ئاین و سەریان ڕووت ناکەن و لە فەرموودەکانی قورئانی پیرۆز لانادەن، هەتا لە ئاکامدا کچێکی باوەڕمەند لە بەرامبەر ئێش و ئازارەکاندا خۆی پێ ڕانەگیرا و لە داخاندا خۆی کوشت... کوڕی بەڕێزم، ئەگەر مۆڵەتم بدەی، لێرەدا ڕەخنەیەکم هەیە؛ تکایە بیگەیەنە ئەو دەستەیەی کە ئێوەی ڕەوانە کردووە. ئەو کچە لەبەر نەکردنە ژوورەوەی بۆ خوێندنگا یاخۆ لە ئەنجامی گوشاری باوکیەوە نا، بەڵکو وەکو دەزگای هەواڵگریی میللی ئێمەی لێ ئاگادارکردووەتەوە، لە تاو ئاگری عەشق خۆی هەڵواسیبوو." / "لەو نامەیەدا کە لەپاش خۆی بەجێی هێشتووە، وا ناڵێ." / "لەگەڵ داوای لێبووردندا



کوڕی خۆم؛ -تکایە ئەو دەمانچەیە داب گرە- ئەو کچە نەزانەمان بەر لەوەی شوو بکات، بێ بیرکردنەوە، پەردەی کچێنیی خۆی نایە بەردەستی پۆلیسێکی بیست و پێنج ساڵ لە خۆی بەتەمەنتر. کاتێک ئەم پۆلیسە پێی گوت کە ژنی هەیە و هیچ نیازی نییە بیخوازێ..." / "بێدەنگ بەهەی هیچ و پوچ. ئەو ڕەفتارە هەر لە کچە قەحپەکەی تۆ دەوەشێتەوە." / "نەکەی کوڕم، نەکەی ڕۆڵەم. ئەگەر من بکوژی، دواڕۆژی تۆیش تاریک دەبێت." / "بلێ پەشیمانم." / "پەشیمانم ڕۆڵەم، تەقە مەکە." / "دەمت بکەرەوە با لوولەی دەمانچەکەی تێ بنێم... ئێستا تۆ پەنجەم لەسەر چەکوشی دەمانچەکە هەڵبگرە. وەکو بێباوەڕێک، بەڵام هیچ نەبێ بەئابڕووی خۆتەوە مردار دەبیتەوە." / "بێدەنگی" / "کوڕم، بڕوانە کەوتوومەتە چ ڕەوشێکەوە، لەم تەمەنەدا دەگریم، دەپاڕێمەوە، بەزەییت بەمندا نایاتەوە، بەزەییت بەخۆتدا بێتەوە. حەیفە بەو جوانییەتەوە ببی بەپیاوکوژ." / "کەواتە خۆت چەکوشەکە ڕابکێشە! بۆ ئەوەی بزانی کە خۆکوشتن چەند تاڵ و بەئازارە." / "کوڕم، من مسوڵمانم، دژی خۆکوشتنم." / "دەمت بکەرەوە. "بێدەنگی" مەگری ئاوا... ئایا هیچ بەخەیاڵتدا نەهاتبوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاوا لێت دەپێچرێتەوە؟ مەگری، ئەگەر نا، زرمەت لێ هەڵدەسێنم." / "لە دوورەوە دەنگی گارسۆنە پیرەکە دێت"؛ "مامۆستا دەتانەوێ چایەکەتان بۆ بهێنمە سەر ئەم مێزە.؟" / "نا، نامەوێ، ئێستا هەڵدەستم." / "سەیری گارسۆنەکە مەکە، پاشماوەی بڕیاری کوشتنەکەت بخوێنەوە." / "کوڕم، بمبەخشن." / "دەڵێم بیخوێنەرەوە." / "لە هەموو کردەوەکانم پەشیمانم و بۆ ئەوەی خودای مەزن لێم خۆش بێت..." / "دەی بیخوێنەوە..." / "کوڕی بەڕێزم، بهێڵە با ئەم پیاوە پیرە کەمێک بگری. لێم گەڕێ با بۆ دواجار بیرێک لە ژنەکەم و کچەکەم بکەمەوە." / "بیر لەو کچانە بکەرەوە کە زوڵمت لێ دەکردن. یەکێکیان شێت بوو، چواریان لە قۆناغی سێیەمدا لە پەیمانگا دەرکران، یەکێکیان خۆی کوشت، ئەوانەی لەبەردەم دەروازەی پەیمانگا چاوەڕێیان دەکرد، هەموو لەرز و تایان گرت و لە جێدا بۆی کەوتن، هەموویان ژیانیان لێ شێوا." / "من زۆر پەشیمانم کوڕی بەڕێزم. بەڵام بیر لەوە بکەرەوە کە ئایا ئەوە دێنێ بەکوشتنی کەسێکی وەکو من خۆت بکەیت بەپیاوکوژ؟" / "باشە." / "بێدەنگی" / "مامۆستام، من بیرم لێ کردووەتەوە، بزانن

چیم بۆ هات." / "چی؟" / "من لە پێناوی دۆزینەوە و بەسزا گەیاندت دوو ڕۆژ بێ کار و کاسبی بەم شارە ڕیسوایەی قارسدا سووڕامەوە. گوتم وا دیارە قیسمەتی تێدا نییە، بۆیە بلێتی گەڕانەوەم بۆ تۆکات کڕی و ڕووم لێرە کرد بۆ ئەوەی دوا چا بخۆمەوە..." / "کوڕم، ئەگەر بیرت لەوە کردووەتەوە من بکوژیت و بەدواین پاس لە قارس هەڵبێیت، ئەوا بەفر ڕێگا و بانەکانی گرتووە و پاسی سەعات شەش دەرناچێ، با دوایی پەشیمان نەبیتەوە." / "کە ئاوڕم دایەوە، بینیم وا خودا تۆی نارد بۆ ئەم شیرینیخانەی ژیانی نوێیە. ئێستا کە خودا لێت خۆش نەبووبێ، چاوەڕوانی من بتبەخشم؟ دوا قسەت بکە و شایتمان بێنە." / "بگەڕێوە سەر کورسییەکە کوڕی خۆم، ئەم دەوڵەتە هەمووتان دەگرێ و گشتتان هەڵدەواسێ." / "شایەتمان بێنە." / "ئارام بە کوڕم، ڕاوەستە، دانیشە، جارێکی تر بەخۆتدا بچۆرەوە. تەقەم لێ مەکە." / "دەنگی چەک، تەقەتەقی کورسی." / "نەکەی کوڕم." / "دەنگی دوو تەقەی تر. بێدەنگی، ناڵەیەک، دەنگی تەلەفزیۆنەکە. جارێکی تر دەنگی تەقە. بێدەنگی."



# ٦

# ئەڤین و ئاین و شیعر

## چیرۆکی غەمگینی موختار

پاش ئەوەی ئیپەک لەبەردەم دەروازەی خانەکەی شەقامی خالید پاشا لێی جیابووەوە و بۆ هوتێل گەڕایەوە، (کا) لەبری ئەوەی بەپلیکانە دوو قاتییەکەدا بۆ بارەگای لقی پارتی ڕەفا سەربکەوێ، ڕووی لە بێکار و شاگرد و دەست بەتاڵەکانی ناو ڕێڕەوەکانی خانەکە کرد. هێشتا دیمەنی گیانکێشانی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی بەزیندوویی لەبەر چاو بوو، هەستی بەپەشیمانی و تاوانباری دەکرد، لە ناخەوە ئارەزووی لێ بوو تەلەفۆنێک بکات بۆ یاریدەدەری بەڕێوەبەری ئاسایش کە ئەم بەیانییە قسەی لەگەڵدا کردبوو، یان بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت لە ئەستەمبوڵ، یاخۆ بۆ هەر ناسیاوێکی تری بێت، بەڵام نەیتوانی لەو خانە پڕ لە چایخانە و سەرتاشخانەیەدا گۆشەیەک بۆ تەلەفۆن کردن بدۆزێتەوە.

بێ لێکدانەوە خۆی کرد بە شوێنێکدا کە لەسەر تابلۆی سەر دەرگاکەی نووسرابوو (یانەی ئاژەڵپەروەران). لەوێ تەلەفۆن هەبوو، بەڵام بەدەست کەسێکی ترەوە بوو و تەلەفۆنی پێ دەکرد. ئیدی ئەوەندەش دڵنیا نەبوو کە داخۆ تەلەفۆن بکات یان نەیکات. کاتێک لە دەرگای نیوەکراوەی ئەولاتری یانەکە چووە ژوورەوە، خۆی لە هۆڵێکدا بینییەوە کە وێنەی کەڵەشێر بە دیوارەکانیدا هەڵواسرابوون و لە ناوەڕاستیشیدا مەیدانێکی بچووکی شەڕە کەڵەشێر دروست کرابوو. (کا) لە هۆڵی شەڕە کەڵەشێرەکەدا بە ترسەوە درکی کرد کە ئەڤینداری ئیپەک بووە و پاشماوەی ژیانی پەیوەستە بەو ئەڤینەوە.

ئاژەڵدۆستێکی دەوڵەمەندی شەیدای شەڕە کەڵەشێر زۆر باشی لە بیرە چۆن (کا) ئەو ڕۆژە لەو ساتەدا چووبووە یانەکەوە، لەسەر کورسییەکی جێی بینەرانی قەراغ مەیدانەکە دانیشتبوو و نوقمی بیرکردنەوە بووبوو. (کا) لەوێ بەدەم چا

خواردنەوەوە، مەرج و ڕێساکانی شەڕە کەڵەشێری خوێندەوە کە بە پیتی گەورە لەسەر تابلۆیەک نووسرابوو و بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو:

**ئەو کەڵەشێرەی دێتە سەر سەکۆکە، بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی دەستی بۆ نابردرێ**
**کەڵەشێری لاڕەوەبوو ئەگەر سێ جار بەدوای یەکدا دەنووک نەوەشێنێ، ئەوا بەتەواوی دۆڕاوە**
**لە پاژنە شکاندا سێ خولەک و لە نینۆک شکاندا یەک خولەک کات بۆ تیمارکردن هەیە**
**ئەو کەڵەشێرەی لە شەڕدا بکەوێ، ئەگەر پێ بەسەر سنگی بەرامبەرەکەیدا بنێ، ئەوا شەڕەکە درێژەی دەبێت**
**لە کاتی کارەبا بڕیندا ١٥ خولەک چاوەڕێ دەکرێ، ئەگەر کارەبا نەهاتەوە، ئەوا کۆتایی بە شەڕەکەڵەشێر دەهێندرێ**

(کا) سەعات دوو و چارەک لە یانەی ئاژەڵدۆستان هاتە دەرەوە و بیری لەوە دەکردەوە چۆن ئیپەک بڕفێنێ و لەم شاری قارسە ڕابکات. نووسینگەی پارێزەر موزەفەر بەگی سەرۆکی پێشووی شارەوانی کە گلۆپەکانی کوژێندرابوونەوە، دوو دوکان لەولای بارەگای لقی پارتی ڕەفاوە بوو لە هەمان نهۆمدا. (چایخانەی دۆستان و بەرگدووری سەوز کەوتبوونە نێوانیانەوە.) سەرباری ئەوەی کە سەرلەبەیانیی هەمان ڕۆژ سەری لە پارێزەرەکە دابوو، کەچی سەردانەکەی وەکو ڕابردوویەکی زۆر دوور خۆی دەنواند، بۆیە بە سەرسوڕمانەوە بەهەمان ڕێڕەوی هەمان باڵەخانەدا خۆی کرد بە بارەگای پارتیدا.

(کا)، دواجار دوازدە ساڵ لەمەوبەر موختاری بینیبوو. دوای یەکدی ئامێزکردن و ماچ و موچ، سەرنجی دا موختار ورگی پەیدا کردووە و قژی ڕووتاوەتەوە، بەڵام لای خۆیەوە پێشبینیی ئەم چارەنووسەی بۆ کردبوو. موختار، بە چەشنی سالانی زانکۆ هیچ تایبەتمەندییەکی نەبوو، هەروەکو لەو سەردەمانەیشدا کردبووی بە خوو، هەمیشە جگەرەیەک بە لێویەوە بوو.

(کا) گوتی: "بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەیان کوشتووە."



موختار لە وەڵامدا گوتی: "نەمردووە، ئێستا ڕادیۆ ڕای گەیاند. تۆ ئەمەت لە کوێوە بیست؟"

(کا) گوتی: "ئەویش وەکو ئێمە لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ دانیشتبوو، لەو شوێنەی کە ئیپەک تەلەفۆنی بۆت کرد." پاشان سەر لەبەری ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.

موختار گوتی: "تەلەفۆنتان بۆ پۆلیس کرد؟ ئەدی دواتر چیتان کرد؟"

(کا) گوتی کە ئیپەک بۆ ماڵەوە گەڕاوەتەوە و خۆیشی ڕاستەخۆ بۆ ئێرە هاتووە.

موختار گوتی: "پێنج ڕۆژ ماوە بۆ هەڵبژاردنەکان، دەوڵەت کە زۆر باش لە بردنەوەمان دڵنیابووە، هەموو شێوازێک تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی کڵاومان لەسەر بنێ. سیاسەتی پارتیمان ئەوەیە لە هەموو تورکیادا خوشکانی سەرپۆش بەسەرمان بپارێزین. ئێستاش ئەو بینەرەی کە لە شوێنی دەستوەشان لەو نامەردە بووە، ئەو نامەردەی کە نەیدەهێشت کچان بچنە ئەودیوی دەروازەی پەیمانگاوە، بێ ئەوەی پۆلیس ئاگادار بکاتەوە، یەکسەر هاتووە بۆ بارەگای لقی پارتیمان." جۆرێک لە جوانکاریی بە قسەکانی بەخشی و درێژەی دایێ: "تکایە لێرەوە تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکە و هەموو ڕووداوەکەیان بۆ بگێڕەوە." وەکو خاوەن ماڵێکی بەخۆدانازیو دەسکی تەلەفۆنەکەی بۆ (کا) درێژ کرد. (کا) دەسکەکەی بە دەستەوە گرت، موختاریش لە دەفتەرێکدا بەدوای ژمارەکاندا دەگەڕا.

(کا) گوتی: "قاسم بەگی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایش دەناسم." موختار بە گومانێکی ئەوتۆوە کە (کا)ی تووڕە کرد، پرسی: "لە کوێوە دەیناسی؟"

(کا) لەوەدا بوو بڵێ: "ئەو بەیانییەی ڕۆژنامەنووس سەردار بەگ یەکەمجار منی برد بۆ لای"، کەچی سەر بگۆڕی تەلەفۆنەکە (کا)ی بە جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشەوە گرێ دا. ئەویش ئەوەی لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ بینیبووی، هەمووی وەکو خۆی بۆ گێڕایەوە. موختار دوو هەنگاوی خێرا و مندالانەی سەیری نا، ناشیانە خۆی وەرگێڕا، گوێی نزیک خستەوە و ویستی لەگەڵ (کا)دا گوێ لە گفتوگۆکە بگرێ. ئەویش بۆ ئەوەی موختار باشتر گوێی لە گفتوگۆکە بێت، دەسکی تەلەفۆنەکەی لە

گوێی خۆی دوور خستەوە و لە گوێی ئەوی نزیک خستەوە. هێندە لە یەکدی نزیک کەوتبوونەوە، لەسەر ڕووی یەکدی، هەستیان بە گەرمیی هەناسەی یەکتر دەکرد. (کا) نەیزانی بۆچی موختاری کرد بە هاوبەشی گفتوگۆکەی خۆی لەگەڵ جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشدا، بەڵام وای بۆچوو، باشترە وا بکات. دوو جار وەسفی شێوەی پیاوە هێرشکارە باریکەڵە و تەن بچووکەکەی بۆ جێگری بەڕێوەبەری ئاسایش کرد کە ئەم دەموچاوی نەبینیبوو. کۆمیسەری ئاسایش بە دەنگێکی تێکەڵ بەنیازێکی باش گوتی: "یەکسەر وەرە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی قسەکانت تۆمار بکەم."

(کا) گوتی: "من لە بارەگای پارتی ڕەفام. هێندەم پێ ناچێت، دێم." بێدەنگییەک باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا.

کۆمیسەر گوتی: "چرکەیەک."

(کا) و موختار گوێیان لێ بوو وا کۆمیسەر دەمی لە دەسکی تەلەفۆنەکە دوور خستووەتەوە و بەچرپە لەگەڵ کەسێکی تردا دەدوێ.

کۆمیسەر گوتی: "بمبوورن، ئەوە پرسیاری ئۆتۆمبیلی ئێشکگرم کرد. ئەم بەفرە هیچ خۆشی ناکاتەوە. کەمێکی تر ئۆتۆمبیلێک دەنێرم بۆ ئەوەی لە بارەگای پارتییەوە بتانگەیەنێتە ئێرە."

موختار بەدەم داخستنەوەی تەلەفۆنەکەوە گوتی: "باشت کرد کە گوتت لێرەیت. هەر چۆنێک بێت هەر پەیان پێ دەبرد، چونکە گوێ لە هەموو شوێنێک دەگرن. تکایە بەهەڵە لێم تێ مەگە کە من لەسەرەتاوە وا قسەم کرد وەکو ئەوەی تۆ تاوانبار بیت."

شەپۆلێکی تووڕەیی لە بابەتی ئەوەی سەردەمانی زوو لە بەرانبەر ئەوانەی کە خۆیان وەکو بۆرژوای نیشانتاشی دەبینی و سەوداسەری سیاسەت بوون، بە ناخی (کا)دا تێ پەڕی. ئەمانە لە قۆناغی خوێندنی ئامادەییدا بەردەوام پەنجەیان بە قونی یەکدیدا دەکرد، لە ساڵانی دواتردا سیخوڕیکردن و زمان لێدان لای پۆلیس لە دژی یەکتر و بەتایبەتیش لە بەرامبەر نەیارانی سیاسی، جێی گەمەکەی ساڵانی زوویانی گرتبووەوە. (کا) لە ترسی ئەوەی نەکەوێتە دۆخێکەوە سواری ئۆتۆمبیلی پۆلیس بێت و ئەو ماڵانە دەستنیشان بکات کە پەلامار دەدرێن، هەمیشە خۆی لە سیاسەت



بەدوور گرتبوو. کەچی دەبوو ئێستا خۆی بەدوای داوای لێبووردن و دۆزینەوەی بیانوودا ماندوو بکات، ئەمە لە کاتێکدایە موختار لەسەر لیستی پارتێکی ئاینی و شەریعەتخواز خۆی بۆ هەڵبژاردن پاڵاوتووە کە خودی خۆی دە ساڵ لەمەوبەر گاڵتەی بە کارێکی وا دەهات.

تەلەفۆن لێی دا، موختار بە فیزی بەرپرسێکەوە هەڵی گرت و لەگەڵ لێپرسراوێکی (تەلەفزیۆنی سەرحەد فارس)دا دەستی کرد بە سەودا و مامەڵەیەکی سەختگیر لەسەر نرخی ئەو ڕێکلامەی کە لە بەرنامە ڕاستەخۆکەی ئەو ئێوارەیەدا بۆ دوکانەکەی کە کەلوپەلی کارەبایی ناوماڵی تێدا دەفرۆشێ، بڵاودەکرێتەوە.

تەلەفۆنەکەی داخستەوە. هەردووکیان نەیانزانی سەبارەت بە چی قسە بکەن، وەکو دوو منداڵی لە یەکتر زیزبوو قوڕ و قوپیان لێ کردبوو. بەڵام سەرجەم ئەو بابەتانەی لە ماوەی دوازدە ساڵی ڕابردوودا قسەیان لەسەر نەکردبوو، هەمووی لە خەیاڵی (کا)دا ڕوون بووەوە.

سەرەتا لە خەیاڵی خۆیاندا بە یەکدییان گوت: "ئێستا ئێمە هەردووکمان بەو پێیەی کە جۆرێک ژیانی ئاوارەییمان بەسەر بردووە و هێندە سەرکەوتوو نەبووین، بۆمان ئاشکرا بووە کە ژیان شتێکی سەختە! شاعیریش دادی نەدا... بۆیە سێبەری سیاسەت ئەم چارەنووسەی لە ناوچەوانمان نووسی." پاشان، هەستێکی تریش لە خەیاڵیاندا بوو کە نەیاندەتوانی خۆیانی لێ ببوێرن: "کاتێک شیعر بەختەوەری نەکردین، پێویستیمان کەوتە سێبەری سیاسەت." (کا) ئێستا بە چاوێکی نزمترەوە لە موختاری دەڕوانی.

بیری کردەوە کە موختار لەبەرئەوەی لە چاوەڕوانی بردنەوەی هەڵبژاردنەکاندایە، لە خۆی ڕازییە. بۆ خۆیشی لە پای ئەوەی کە شاعیرێکی نیمچە ناسراوی تورکیایە -لە هیچ باشترە-، کەمێک ڕازی بوو. بەڵام هیچ کامیان دانیان بەم ڕازیبوونەی خۆیاندا نەنا و چەرمەسەرییەکانی ژیانیان بۆ یەکدی نەدرکاند. واتا خراپیان لێ قەومابوو، شانیان بۆ دۆڕاندنی ژیان شل کردبوو و لەسەر زۆرداری و ناڕەواییی بێبەزەییانەی ژیان ڕاهاتبوون. (کا) ترسی ئەوەی لێ نیشت کە هەردووکیان بۆ دەرچوون لەم ڕەوشە، پێویستیان بە ئیپەک هەبێت.

موختار بە تەوسەوە گوتی: "بیستم ئەم ئێوارەیە نوێترین هەڵبەستی خۆت دەخوێنیتەوە."

(کا) بە چاوی دوژمنەوە سەیرێکی چاوە جوان و هەنگوینییەکانی موختاری کرد کە لە ناوەوەڕا پێکەنینیان تێدا بەدی نەدەکرا و بە کابرایەکەوە بوون کە سەردەمانێک پیاوی ئیپەک بووە. دواتر موختار بە پێکەنینێکی ڕوونەوە گوتی: "لە ئەستەمبوڵ فاخیرت بینی؟"

ئەمجاریان (کا) توانی لەگەڵ ئەودا پێ بکەنێ. لە پێکەنینەکانیاندا جۆرێک لە بەزەیی و ڕێز بەدی دەکرا. فاخیر لە تەمەنی ئەواندا بوو؛ ماوەی بیست ساڵ بوو بێ پەروا بەرگریی لە شیعری نوێی ڕۆژئاوایی دەکرد. لە سانت جۆزێف خوێندبووی، بەو پارەیەی کە لە داپیری وەری دەگرت (دەیانگوت داپیری شێت بووە و لە کۆشک هاتووەتە دەرەوە)، ساڵی جارێک دەچووە پاریس، لە کتێبخانەکانی سانت جێرمان چەندین باوڵ کتێبی شیعری دەکڕی و لەتەک خۆیدا دەیهێنایەوە بۆ ئەستەمبوڵ. شیعری ئەو کتێبانەی وەردەگێڕایە سەر زمانی تورکی و لەگەڵ شیعرەکانی خۆی و شیعری شاعیرە نوێخوازەکانی تری تورکدا، لەو کۆوارانەدا کە خۆی دەری دەکردن و لە کۆواری شیعری دەزگاکانی تری چاپ و پەخشدا، بڵاوی دەکردنەوە. بە پێچەوانەی ئەم کارەیەوە کە لای هەمووان جێگای ڕێز بوو، شیعرەکانی خۆی کە لە ژێر کاریگەریی وەرگێڕانی شیعرەکاندا بۆ تورکی دەنووسی، زۆر بێ بەهرە، خراپ و نارەوان بوون.

(کا) گوتی کە لە ئەستەمبوڵ فاخیری نەبینیوە. موختار گوتی: "سەردەمانێک زۆر بەپەرۆش بووم فاخیر دانێکی خێر بە شیعرەکانمدا بنێ، بەڵام ئەو منی دادەگرت بۆ ئاستی ئەوانەی کە بەدوای فۆلکلۆر و جوانییەکانی سروشتدا دەگەڕێن. ساڵ هات و ساڵ چوو، کودەتای سەربازی ڕووی دا، هەموو کەوتینە زیندان و دواتر ئازاد کراین. منیش وەکو هەموو کەسێک چەشنی گێژ بەملا و ئەولادا تووڕ هەڵدەدرام. ئەوانەی بۆ من پێشەنگ بوون، خۆیان لێ گۆڕا، ئەوانەی هەوڵم دا مایەی ڕەزامەندییان بم، ون بوون. لە ژیانیش و لە شیعریشدا هیچ کام لە ویستەکانم نەهاتنە دی. لەتاو ژیانی بێئومێدی و نائارامی و بێ پارەیی، لە ئەستەمبوڵەوە گەڕامەوە بۆ قارس. ئەو



دوکانەی باوکم هەڵگرتەوە کە جاران بە مایەی شەرمم دەزانی. ئەمانەیش بەختەوەریان نەکردم. خەڵکی ئێرە بە چاوی سووکەوە سەیری مرۆڤ دەکەن، وەکو ئەوەی فاخیر لەگەڵ شیعرەکانمدا دەیکرد، کە ئەوانە دەبینم، چاو دەنووقێنم. لە قارس، شاریش و خەڵکیش لە ڕاستەقینە ناچن. لێرە هەموو کەسێک دەیەوێت بمرێ یان خۆی بکێشێتەوە و لێرە بڕوا، بەڵام من هیچ جێگایەکم نەبوو بۆی بچم. وەکو ئەوە وابوو فڕێ درابێتمە دەرەوەی مێژوو و شارستانی. شارستانی هێندە لێمەوە دوور بوو کە نەمدەتوانی تەنانەت لاسایشی بکەمەوە. خوداش منداڵێکی نەدامێ تاکو ئەوەی من پیا نەگەیشتم، ئەو بیکات و ڕۆژێک لە ڕۆژان و بێ دەردەسەری ببێتە خاوەن کەسایەتییەکی هاوچەرخ و ڕۆژئاوایی."

(کا) زۆری پێ خۆش بوو کاتێک بینی وا موختار لە ناکاو بە سووکە خەندەیەکی هاوکات لەگەڵ تیشکێکدا، وەکو ئەوەی لە ناخیەوە هەڵقوڵابێ، دڵنەواییی خۆی دەداتەوە. "ئێواران دەمخواردەوە و سەرخۆش دەبووم، بۆ ئەوەی ئیپەکی شۆخم لێ زویر نەبێ، درەنگانی شەو دەهاتمەوە ماڵێ. شەوێک کە هەموو شتێک، تەنانەت باڵندەکانی ئاسمانیش بەستبووی، من دواین کەس بووم لە مەیخانەی نیشتمانی سەوز هاتمە دەرێ و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە کە ئەو کاتە لە شەقامی ئۆردوو بوو. ئەو ڕێگایە لە دە خولەک زیاتر نییە، بەڵام ئەمە مەودایەکی درێژە بۆ قارس. لەبەرئەوەی عارەقێکی زۆرم خواردبووەوە، لەو ڕێگا دوو هەنگاوییەدا ون بووم. هیچ کەسێکیش بە کۆڵانەکانەوە نەبوو. قارس لە شەوانی سارددا هەمیشە وەکو ئەوە وابوو چۆڵکرابێ، ئەو دەرگایانەی کوتام، یان دەرگای ئەو خانووە ئەرمەنییانە بوون کە هەشتا ساڵ بوو کەسیان تێدا نیشتەجێ نەبووبوو، یاخۆ دانیشتووانی لە ژێر چەندین چین پێخەودا وەکو ئاژەڵ نوقمی خەوی زستان بوون و لە کونەکانیان نەدەهاتنە دەرێ." "ئەم چۆڵ کراوی و بێکەسییەی شار لە ناکاو نەشئەی پێ بەخشیم. بەهۆی سەرخۆشی و سەرماوە حەزێکی شیرینی خەو سەرتاپای جەستەی داگرتم. منیش بڕیارم دا بە بێدەنگی ماڵئاوایی لەم ژیانە بکەم، سێ چوار هەنگاوم نا و لەسەر پلیکانەی ڕچیوی ژێر دارێکدا کەوتمە چاوەڕێکردنی خەو و مەرگ. مردن بە سەرێکی مەستەوە لەو سەرمایەدا کاری سێ چوار خولەکە. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی

خەوێکی سووک بە دەمارەکانمدا ئەو منداڵەم هاتە بەرچاوم کە ماوەیەک بوو هەر نەدەبوو. زۆرم خۆش ویست: کوڕ بوو، پێ گەیشتبوو و کراڤاتی بەستبوو؛ شێوەی لە فەرمانبەرە کراڤات لە ملەکانی ئێمە نەدەچوو، بەڵکو دەچووەوە سەر ئەوروپاییگەل. لەو کاتەدا کە ویستی شتێکم پێ بڵێ، دەستی پیاوێکی پیری ماچ کرد. ئەو پیاوە پیرە هەر چوار لای خۆی ڕووناک کردبووەوە. لەو شوێنەی لێی ڕاکشابووم، تیشکێک لە ناو چاوی دام و بێداری کردمەوە. بە پەشیمانی و ئومێدەوە هەستامە سەرپێ. سەیرم کرد کەمێک لەولاترەوە دەرگایماڵێکی ڕووناک کرایەوە، هەندێکی لێ دەچوونە ژوورێ و چەندێکی لێ دەهاتنە دەرێ. گوێڕایەڵی ئەو دەنگە بووم کە لە هەناومەوە دەهات و کەوتمە دوای ئەوانە. منیان لەگەڵ خۆیان برد و گەیاندمیانە ماڵێکی ڕووناک و گەرم. ئەوانەی لەوێ بوون، لە خەڵکە غەمگین و لە ژیان بێئومێدبووەکانی قارس نەدەچوون و کەسانێکی بەختەوەر بوون، کەچی هەمووشیان قارسی بوون و تەنانەت هەندێکیان ناسیاویش بوون. تێ گەیشتم ئەم ماڵە، تەکیەی نهێنیی شێخی کورد حەرزەتی سەعادەدین ئەفەندییە کە پێشتر ناوبانگیم بیستبوو. لە هاوڕێ فەرمانبەرەکەمانم بیستبوو شێخ لەسەر داخوازی موریدانی دەوڵەمەند کە بەردەوام ژمارەیان لە زیادی دەدا، لە گوندە چیاییەکەی هاتووەتە خوارەوە و خەڵکە هەژار و بێکار و ناشادەکەی قارس بەکێش دەکات بۆ کۆڕی زیکر لە تەکیەکەی، بەڵام پۆلیس بەبیانووی ڕێگرتن لە دوژمنانی ئەم کۆمارە، چی تر مۆڵەتیان پێ نەدابوو. فرمێسک بە چاومدا دەهاتە خوارەوە و بە پلیکانەکانی تەکیەی ئەو شێخەدا سەرکەوتم. شتێکم بینی کە ساڵانێکی درێژ بوو بە دزییەوە لێی دەترسام و لە ساڵانی خودانەناسیمدا بە نەزانی و دواکەوتوویم دەزانی: بەرەو ئیسلام دەگەڕامەوە. لە ڕاستیدا من لە کاریکاتۆرەکانی ئەو شێخە ڕیشن و جبە لەبەر و دواکەوتووانە دەترسام، کەچی ئەوا ئێستا بە ویستی خۆم و چاو بە گریان بە پلیکانەی بەردەم تەکیەیەکدا سەردەکەوم. شێخ مرۆیەکی باش بوو. لێی پرسیم کە بۆچی دەگریم. هەڵبەتە نەمگوت: "بۆیە دەگریم، چونکە کەوتوومەتە ناو موریدانی شێخە دواکەوتووەکانەوە." هەروەها زۆر شەرمم بە خۆمدا هاتەوە کە بۆنێکی بەهێزی عارەق لە دەمم دەهات. گوتم کە کلیلەکەم ون کردووە. هاتەوە یادم بەستەی کلیلەکانم لەو شوێنە لێ کەوتبوو کە بەنیازی مردن لێی ڕاکشابووم. دەست و پێوەندەکانی شێخ





لەوەدا بوون لێکدانەوەی مەجازی بۆ ونبوونی کلیلەکانم بکەن، کەچی شێخ ناردنی لە کۆڵانەکان بەدوای کلیلەکانمدا بگەڕێن. کە دووبەدووی خۆمانماینەوە، خەندەیەکی شیرینی بۆ کردم. کاتێک تێ گەیشتم ئەمە هەمان ئەو پیاوە پیرە دەست و دڵ فراوانەیە کە پێش کەمێک لە خەونمدا بینیبووم، لە ناخەوە هەستم بە ئاسوودەیی کرد."

"لە خۆمەوە دەستی ئەو زاتە پایەبەرزەم ماچ کرد کە وەکو پیاوچاک هاتە بەرچاوم. شتێکی کرد زۆر سەرم لێی سوڕما. ئەویش دەستی منی ماچ کرد. ئاسوودەییەکی ئەوتۆ بە جەستەمدا بڵاوبووەوە کە ساڵانێکی درێژبوو هەستم پێ نەکردبوو. دەسبەجێ تێ گەیشتم کە دەتوانم باسی هەموو شتێکی لەگەڵدا بکەم و بەسەرهاتی ژیانی خۆمی بۆ بگێڕمەوە. ئەو ڕێی خودای گەورەی نیشاندام کە من لە ساڵانی ئەتایستیمدا لە ناخەوە بە هەبوونیم دەزانی. ئەمەش هەر لە سەرەتاوە بەختەوەری دەکردم. کلیلەکانیان دۆزیبووەوە. ئەو شەوە گەڕامەوە ماڵێ و لێی خەوتم. دەمەوبەیانیی ڕۆژی دواتر شەرمم بە سەرتاپای ئەو ئەزموونەمدا هاتەوە. ئەوەی بەسەرم هاتبوو بە خەیاڵ و مەیاڵم دەزانی و نەمدەویست بیرم بکەوێتەوە. سوێندم خوارد جارێکی تر نەچمەوە بەو تەکیەیەدا. بە ترس و بە سەرێکی گرانەوە دەمگوت نەکا لە شوێنێک تووشم بێت بە تووشی ئەو موریدانەوە کە دوێنێ ئێوارە منیان لە تەکیەکە بینیبوو. وەلێ شەوێکی تر لە ڕێی گەڕانەوەمدا لە مەیخانەی نیشتمانیی سەوزەوە بۆ ماڵ، لاقەکانم لە خۆیانەوە منیان بۆ ئەوێ بەکێش کرد. سەرەڕای ئەو پەشیمانییەی بە ڕۆژ دەمچێشت، کەچی هەمان شت شەوانی دواتریش درێژەی کێشا. شێخ منی لای خۆیەوە دادەنا، گوێی بۆ ئازارەکانم شل دەکرد و خۆشەویستیی خودای لە هەناومدا دەچاند. بەردەوام دەگریام و ئەمەیش ئاسوودەییی پێ دەبەخشیم. بە ڕۆژ بۆ ئەوەی کۆڕی زیکری شەوانی تەکیە وەکو نهێنییەک بشارمەوە، دانەیەکم لە ڕۆژنامەی جمهورییەت کە بە لایسیستترین ڕۆژنامەم دادەنا، بە دەستەوە دەگرت و گازندەی ئەوەم دەکرد کە پیاوانی ئاینیی دوژمن بە کۆمار بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە، بە ڕاست و چەپدا هاوارم دەکرد و دەمگوت کە بۆچی لە کۆمەڵەی هاوبیرانی ئەتاتوک کۆبوونەوە ساز ناکرێ."

"ئەم ژیانە دوو ڕووەم هەتا ئەو شەوەی ئیپەک لێی پرسیم: "ژنێکی ترت هەیە؟" درێژەی کێشا. بەدەم گریانەوە دانم بە هەموو شتێکدا نا. ئەویش دەستی بە گریان کرد و گوتی: "خووت داوەتە ئاین و دەتەوێ سەرم پێ داپۆشی؟". سوێندم بۆ خوارد کە داخوازێکی لەو جۆرەی لێ ناکەم. لەبەرئەوەی هەستم وابوو ئەوەی بەسەرمان هاتووە جۆرێکە لە خزان بەرەو هەژاری و هەروەها بۆ ئەوەی ئیپەک ئارام بکەمەوە، پێم گوت کە کاری دوکان باش دەچێتە پێش و سەرەڕای کارەبابڕینی بەردەوام، سۆپای کارەبایی ئارچەلیک فرە باش دەفرۆشرێ. لە راستیشدا بەختەوەر بووم کە دەمتوانی لە ماڵەوە نوێژ بکەم. کتێبێکی فێربوونی نوێژم لە کتێبخانەیەک کڕی. دەستم بە ژیانێکی نوێ کرد."

"هێشتا بەتەواوی نەهاتبوومەوە سەرخۆم کە شەوێک سروشم بۆ هات و شیعرێکی گەورەم نووسی. لەو شیعرەدا هەموو تەنگژەکانم، شەرم و بەخۆداشکانەوەم، خۆشەویستیی هەڵکشاوی خودا لە هەناومدا، ئاسوودەیی، یەکەم سەرکەوتنم بەسەر پلیکانە پیرۆزەکانی شێخمدا و واتای ڕاستی و مەجازیی کلیلەکانم دەگێڕایەوە. هیچ کەم و کوڕیی نەبوو. سوێند دەخۆم هیچی کەمتر نەبوو لەو نوێترین و هاچەرخترین شیعرانەی شاعیرانی ڕۆژئاوایی کە فاخیر وەری دەگێڕان. یەکسەر بە پۆستدا بۆم نارد. شەش مانگ چاوەڕێم کرد، لە گۆڤاری (مەرەکەبی ئاخیلیۆس)دا کە ئەو سەردەمە دەردەچوو، بڵاو نەکرایەوە. لە ماوەی ئەو چاوەڕووانییەدا سێ شیعری ترم نووسی. ئەوانەیشم بە جیاوازیی دوو مانگ بەدوای یەکتردا بۆی نارد، بەڵام دیسان هیچیانی بڵاو نەکردەوە."

"هۆی ناشادیی ژیانم لەو سەردەمەدا ئەوە نەبوو کە هێشتا منداڵم نەبووبوو، یان ئیپەک ئەرکەکانی ئیسلامی بەجێ نەدەهێنا، یاخۆ بڵێم هاوڕێ لایسیست و چەپەکانی زووم لەبەر بە ئیسلامی بوونم سوکایەتیم پێ بکەن. ئەوان هێندە بایەخیان بە من نەدەدا، چونکە کەسانێکی زۆری وەکو من هەبوون کە بە شەوقەوە بۆ باوەشی ئیسلام گەڕابوونەوە. ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر منی هەراسان کرد، بڵاونەبوونەوەی ئەو شیعرانە بوو کە بۆ ئەستومبوڵم دەناردن. سەرەتای هەموو مانگێک، ڕۆژ و سەعات تێ نەدەپەڕین بۆ نزیکبوونەوەی وادەی دەرچوونی ژمارەی



نوێ، هەموو جارێک خۆم بە هیوای ئەوەوە هێور دەکردەوە کە هەر چۆنێک بێت لە ژمارەی ئەو مانگەدا یەکێک لە شیعرەکانم بڵاو دەکرێتەوە. ئەو ڕاستییانەی لەو شیعرانەدا باسم لێوە کردبوون، دەکرا تەنیا لەگەڵ ڕاستیی شیعرە ڕۆژئاواییەکاندا بەراورد بکرێ. پێشم وا بوو لە تورکیادا تەنیا فاخیر دەتوانێ بڵاوی بکاتەوە."

"تووڕەبوونم و ڕەهەندەکانی ئەو ناڕەواییەی بەرامبەرم دەکرا، ئەو بەختەوەرییەی ژەهراوی دەکرد کە ئیسلام بە منی بەخشیبوو. ئیدی کاتێک لە مزگەوت کە ماوەیەک بوو ڕووم تێ کردبوو، لە کاتی نوێژکردندا بیرم لە فاخیر دەکردەوە؛ هەمدیسان غەمگین دەبووم. شەوێک بڕیارم دا گرێی خەمی خۆم بۆ شێخ بکەمەوە، بەڵام شێخ نەیزانی شیعری هاوچەرخ، ڕێنێ کار، ڕستەی لە ناوەڕاستدا شکاو، مارالمە، ژۆبێرت و بێدەنگیی میراتی چۆڵم چین."

"ئەمە متمانەی منی بە شێخ لەق کرد. ئێ ماوەیەکی درێژیش بوو جگە لە چەندبارە کردنەوەی هەشت نۆ ڕستەی لە جۆری "دڵت پاک ڕابگرە، ئینشالاّ بە خۆشەویستیی خودا لەو خەمە دەڕەخسێی"، هیچی تری نەدەکرد. نامەوێ مافی بخۆم، پیاوێکی سادە نەبوو، بەڵام پیاوێکی خاوەن زانیاریی سادە بوو. ئەو ئیبلیسە نیوە عاقڵ و نیوە سووخۆرەی لە سەردەمی خودانەناسیمەوە لە ناخمدا مابووەوە، خەریک بوو لە ڕێ دەرم بکات. کەسانی وەکو من کاتێک دەتوانن هەست بە ئاسوودەیی بکەن کە لەگەڵ هاوبیرەکانی خۆیاندا لە پارتێکی سیاسیدا خۆیان بۆ دۆزێک تەرخان بکەن. بەمجۆرە تێ گەیشتم کە هاتوچۆکردنم بۆ پارتی، ژیانێکی مەعنەویی قوڵتر و واتادارترم لەوەی تەکیە پێ دەبەخشێ. ئەزموونی کاری ڕێکخراوەیی سەردەمانی مارکسی بوونم لە پارتیدا کە بایەخ بە ئاین و مەعنەویات دەدات، زۆر بە کەڵکم هات."

(کا) لێی پرسی: "وەکو چی؟"

کارەبا بڕا. بێدەنگییەکی درێژ ئەو ناوەی داگرت.

پاشان موختار بە دەنگێکی پڕ لە نهێنییەوە گوتی: "کارەبا بڕا."

(کا) بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، بێ جووڵە لە تاریکییەکەدا دانیشت.

# ٧

# ئیسلامی سیاسی، ناوێکە کە ڕۆژئاواییەکان و لایسیستەکان له ئێمەیان ناوە

## له بارەگای پارتی، لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و دیسانەوە لەسەر شەقامەکان

بەبێدەنگی دانیشتنیان لەو تاریکییەدا شتێک لە ترسناکیی تێدابوو، بەڵام (کا) پێی باشتربوو وەکو دوو دۆستی کۆن لەگەڵ موختاردا دوو بە دوو باسی ئەم نیگەرانییە بکات. ئێستا تەنیا شتێک کە ئەوی بە موختارەوە گرێدەدا، ئیپەک بوو، (کا) لەلایەک زۆر ئارەزووی دەکرد بەجۆرێک لە جۆرەکان لەو بارەیەوە بدوێ، لەلایەکی تر، فرە دەترسا لەوەی ئاشکرای بکات کە عاشقی ئیپەک بووە. ترسێکی تری (کا) ئەوە بوو ئەگەر موختار درێژە بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی بدات، ئەوا دەبەنگتر لەوەی کە هەیە بێتە بەرچاوی و ئەمەیش درز بخاتە شەیدابوونەکەیەوە بە ئیپەک کە چۆن توانیوێتی ئەوەندە ساڵە ژنی پیاوێکی لەو تەرحە بێت.

بۆیە کاتێک موختار لە نەبوونی بابەتی گفتوگۆدا قسەی بردەوە سەر هاوڕێ کۆمۆنیستەکانی لەمەوبەری کە بۆ تاراوگەی سیاسیی ئەڵمانیا هەڵهاتبوون، (کا) هەستی بە ئاسوودەیی کرد. بە زەردەخەنەوە لە وەڵامی پرسیارێکی موختاردا گوتی کە بیستوویەتی تۆفان مەلاتیایی قژلول کە (لە گۆڤارێکدا وتاری دەربارەی جیهانی سێیەم دەنووسی)، شێت بووە. گێڕایەوە و گوتی دواجار ئەوی لە وێستگای سەرەکیی شەمەنەفەر لە شتوتگارت بینیووە کە دارێکی درێژی بەدەستەوە بووە، پەڕۆیەکی تەڕی بە سەری دارەکەوە بەستووە و بەدەم ڕاکردنەوە زەویی سڕیوەتەوە. دواتر موختار پرسیاری ئەو مەحموودەی لێ کرد کە لەبەرئەوەی دەمی ڕانەدەوەستا، هەمیشە ئازاری دەگەیشتێ. (کا) لە وەڵامدا گوتی کە ئەو چووەتە پاڵ گرووپە



شەریعەتخوازەکەی خەیروڵا ئەفەندی و ئەو دەمەدەمە توندانەی سەردەمانێک بۆ چەپی دەکرد، ئێستا لەگەڵ ئەوەدا تێکەڵی کردووە کە کام دەستە و کۆمەڵ دەست بەسەر کام مزگەوتی ئەڵمانیادا بگرێ. سلێمانی خۆشەویست هاوڕێیەکی تریان بوو کە (کا) بەدەم زەردەخەنەوە بیری کەوتەوە و گوتی کە ئەو لە شاری بچووکی تراونشتاین لە هەرێمی باڤاریا بە کۆمەکی کلێسایەک دەژیا کە باوەشی بۆ دوورخراوە سیاسییەکانی جیهانی سێیەم ئاوەڵا کردبوو، بەڵام لەبەر بێزاری خۆی بۆ ڕانەگیرا و سەرەڕای ئەوەی سوور دەیزانی دەگیرێ و دەخرێتە زیندانەوە، بۆ تورکیا گەڕایەوە. موختار و (کا) یادی چەند دۆست و برادەرێکی تریشیان کردەوە؛ حیکمەت کە لە بەرلین شۆفێر بوو و لە ڕەوشێکی تەمومژاویدا کوژرا. فازیل کە لەگەڵ بێوەژنێکی بەتەمەن کە پێشتر ژنی ئەفسەرێکی نازی بووە، زەماوەندی کردووە و پێکەوە پانسیۆنێک بەڕێوە دەبەن. تاریق بیردۆزە کە لەگەڵ مافیای تورکیدا لە هامبورگ کار دەکات و زۆریش دەوڵەمەند بووە. سادقیش کە سەردەمانێک لەگەڵ موختار، (کا)، تانەر و ئیپەکدا گۆڤاری تازە چاپکراویان دەپێچایەوە، ڕابەرایەتیی دەستەیەک چەتەی دەکرد کە لە چیاکانی ئەلپەوە کرێکاری نایاسایی دەگەیاندە ئەڵمانیا. هەرچی موحەڕەمیشە کە زوو زوو زویر دەبوو، دەگوترێ خۆی و خێزانی لە یەکێک لە وێستگا خەیاڵییەکانی میترۆی بەرلیندا کە بەهۆی شەڕی سارد و دیواری بەرلینەوە هیچ بەکار نەهێنرابوو، ژیانێکی ژێر زەمینی بەختەوەر بەسەر دەبات. ئەو دەمەی شەمەنەفەری نێوان کرۆیتزبێرگ و ئەلەکساندەرپلاتز بەخێرایی تێ دەپەڕێ، تورکە سۆسیالیستە خانەنشینەکانی ناو واگۆنەکان لەسەر شێوازی کۆنە چەقۆکێشەکانی ئەستەمبوڵ کە لە ئاستی ڕێژاوی ئەرناڤوتکوێ سڵاویان لەو ڕێبرە ئەفسانەیییە دەکرد کە بە ئۆتۆمبیلەکەیەوە لە ئاوەکەدا ون بووبوو، ئەمانیش سڵاو لە یەکدی دەکەن. دوورخراوە سیاسییەکانی ناو واگۆنەکان ئەگەر لەکاتی سڵاوکردندا یەکتریش نەناسن، ئەوا بە چاو سڵاوی هاوڕێیانی قارەمانی ئەفسانەیی دۆزێکی دۆڕاو دەسێننەوە. (کا) لە واگۆنێکی لەو جۆرەدا لە بەرلین، ڕوحیی بینیبوو کە هەمیشە هاوڕێ چەپەکانی لە پای بایەخنەدان بە باری دەروونییان ڕەخنە دەکرد. (کا) ئەوەی لێ حاڵی بووبوو کە کراوە بە نموونەی تاقیکردنەوە بۆ کاریگەریی ڕێکلامی پیتزایەکی نوێی بە گۆشتی گای تورکی کە هەوڵدەدرا بۆ کۆچبەرانی تورکی

خاوەن نزمترین دەرامەت بەرهەم بهێنرێ. فەرهاد کە بەختەوەرترین دوورخراوەیەکی سیاسی بوو (کا) لە ئەڵمانیا ناسیبێتی، پێوەندیی کردبوو بە ڕیزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە و لە تەلەفزیۆنی CNN دا بینرابوو کە بە خرۆشێکی نەتەوەییەوە پەلاماری نووسینگەکانی هێڵی ئاسمانیی تورکیا دەدات و بۆمبی مۆلۆتۆڤ دەگرێتە قونسوڵخانەکانی تورکیا. خۆی فێری کوردی دەکرد بەو خەیاڵەوە ڕۆژێک بێت و شیعری پێ بنووسێ. هەندێک ناوی تریش کە موختار بە پەرۆشییەکی سەیرەوە پرسیاری دەکردن، (کا)، یان لە بیری کردبوون یاخۆ بیستبووی کە هەندێکیان پێوەندییان بە گرووپی بچووکی چەتەوە کردووە، بەشێکیان بۆ دەزگاکانی هەواڵگری کاریان کردووە، تاک و تەرایان خوویان داوەتە کاری ڕەش و وەکو زۆر کەسی تر تیاچووبوون، یاخۆ بێ سەر و شوێن بوون و بە ئەگەری زۆریش، بێکەسکوژ کرابوون و فڕێ درابوونە ئاوەڕۆکانەوە.

(کا) هەر لە زووەوە دەیزانی لە تورکیا واتای باوەڕهێنان بە خودا ئەوەیە نییە کە مرۆڤ بەرزترین بیر و گەورەترین داهێنەرە، بەڵکو بەر لە هەموو شتێک واتای پێوەندیکردنە بە دەستەیەکەوە یاخۆ بە دەوروبەرێکی دیاریکراوەوە، بەڵام پێی سەیر بوو کە دەیبینی ئەم پەتایە موختاریشی گرتووەتەوە، ئەوەتا کابرا باسی خودا و خودی خۆی ناکات، بەڵکو لە بەرژەوەندیی دەستە و تاقمەکان قسە دەکات. هەستی کرد لەم ڕووەوە موختاری بەکەم دێتە بەرچاو. بەڵام لەلای پەنجەرەکەوە سەیرێکی موختاری کرد و لەبەرخۆوە شتێکی پێ گوت:

"موختار، پێم وایە ئەگەر باوەڕ بە خودا بهێنم، ئەوا تۆ تووشی خەیاڵشکان دەبی و دووریش نییە بە چاوێکی سووکەوە لێم بڕوانی."

"بۆچی؟"

"باوەڕهێنانی تاکێکی بەرۆژئاواییبووی بێکەس و بێ شیرازە بە خودا، تۆ دەترسێنێ. کەسێکی بێ باوەڕی سەر بە دەستە و تاقمێک، زیاتر جێی متمانەی تۆیە وەک لە تاکێکی باوەڕمەند. بەلای تۆوە تاکە باوەڕمەندەکە زۆر لە تاکە بێباوەڕەکە دەبەنگ و خراپترە."

موختار گوتی: "من زۆر تەنیام."



لەبەرئەوەی موختار توانیی زۆر لە ناخەوە و بە بڕوا بەخشینەوە ئەم چەند وشەیە دەرببڕێ، (کا) لە هەمان کاتدا هەستی بە قین و بەزەیی کرد لە بەرانبەری. هەستی دەکرد تاریکیی شوێنەکە لای خۆی و لای موختاریش جۆرێک لە میهرەبانیی سەرخۆشبوونی خوڵقاندووە. ڕووی لە موختار کرد و گوتی: "من نابم، بەڵام ئایا دەزانی هۆی سەرەکیی مەترسیی تۆ چی دەبێت ئەگەر بێت و من ببم بەو باوەڕمەندەی کە ڕۆژی پێنج جار نوێژ دەکات؟ تۆ تەنیا ئەو کاتە دەتوانی ئامێز بۆ ئاین بکەیتەوە کە کەسانی لایسیستی وەکو من کاروباری دەوڵەت و بازرگانی بگرنە ئەستۆی خۆیان. مرۆڤ، ئەگەر متمانەی بە لێهاتوویی کەسانی لایسیست نەبێ بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەرەوەی ئاین، بازرگانی و سیاسەت لەگەڵ ڕۆژئاوادا، ئەوا ناتوانێ بە ئارەزووی دڵ لەم وڵاتەدا خوداپەرستی بکات.

موختار گوتی: "بەڵام تۆ ئەو پیاوەی دەوڵەت و بازرگانی نیت. هەر کاتێکیش گەرەکت بێت، دەتبەمە خزمەت جەنابی شێخ."

(کا) گوتی: "وا بزانم پۆلیسەکانمان گەیشتن."

هەردووکیان بەبێدەنگی لە پەنجەرەکەوە کە جامەکانی لە چەند لایەکەوە بەستبووی، سەیری ئەو دوو پۆلیسە سڤیلەیان دەکرد کە لە سەرخۆ و لە ناو بەفرەکەدا لەو ئۆتۆمبیلە دابەزین کە لە خوار خانەکەوە ڕایان گرتبوو.

موختار گوتی: "من ئێستا شتێکم لە تۆ دەوێت. ئەو کەسانە کەمێکی تر دێنە سەرێ و دەمانبەن بۆ پۆلیسخانە. تۆ ناگرن، کۆمەڵێ زانیاریت لێ وەردەگرن و ئازادت دەکەن. دوای ئەوەی گەڕایتەوە بۆ هوتێل، تورگوت بەگی خاوەن هوتێک بۆ خواردنی ئێوارە بانگهێشتنت دەکات و تۆیش دەچیت. بێگومان کچە خۆ تێ هەڵقورتێنەرەکانیشی لەوێ دەبن. دەمەوێ ئەم شتانەم بۆ بگەیەنی بە ئیپەک. گوێت لێمە؟ بە ئیپەک بڵێ کە دەمەوێ سەرلەنوێ بیخوازمەوە. پێی بڵێ ئەوەی کە داوام لێ کردبوو سەری داپۆشێ و بە شێوازی ئیسلام جلوبەرگ بپۆشێ، هەڵەیەک بوو کردم. ئیدی وەکو پیاوێکی تەنگەتیلە و دڵڕەش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا ناکەم، پەشیمانیشم لەو گوشارانەی کە لە ساڵانی پێکەوەبوونماندا خستبوومە سەری و زۆر شەرمم بە خۆمدا دێتەوە."

"تۆ پێشتر ئەمەت بە ئیپەک نەگوتووە؟"

"پێم گوتووە، بەڵام بێ کەڵک بوو. لەوانەیە لەبەرئەوەی سەرۆکی لقی پارتی ڕەفام، بڕوام پێ نەکات. تۆ کەسێکی جیاوازی، لە ئەستەمبوڵەوە، تەنانەت لە ئەڵمانیاوە هاتووی. ئەگەر تۆ قسەی لەگەڵدا بکەیت، باوەڕت پێ دێنێ."

"سەردانەپۆشینی هاوسەرەکەت، وەکو سەرۆکی لقی پارتی ڕەفا لە ڕووی سیاسییەوە تەنگ و چەڵەمەت بۆ ناخوڵقێنێ؟"

موختار گوتی: "بە یارمەتیی خودا دوای چوار ڕۆژی تر هەڵبژاردنەکان دەبەینەوە و دەبم بە سەرۆکی شارەوانی. بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە تۆ پەشیمانیی من بە ئیپەک بگەیەنی. لەوانەیە لەو کاتەدا من هێشتا دەستبەسەر بم. براکەم، ئەمەم بۆ دەکەیت؟"

(کا) پاش کەمێک لە بێ بڕیاری گوتی: "دەیکەم."

موختار (کا)ی لە ئامێز گرت و ڕوومەتەکانی ماچ کرد. (کا) هەستی بە تێکەڵەیەک لە بەزەیی و نەفرەت لە بەرانبەر موختار دا کرد و سەرکۆنەی خۆی کرد کە هێندەی ئەو کراوە و دڵساف نییە.

موختار گوتی: "تکاشم وایە لە ئەستەمبوڵ ئەم شیعرەم بۆ بدەیتە دەستی فاخیر. ئەو شیعرە کە بۆم باسکردی. ناوی (پلیکانە)یە."

(کا) لە تاریکییەکەدا شیعرەکەی خزاندە گیرفانیەوە، لەو کاتەدا سێ کەسی سڤیل هاتنە ژوورەوە بۆ ناو خانەکە. دووانیان لایتی گەورەیان بەدەستەوە بوو. ساز و خۆ تێ هەڵقورتێنەر بوون و بە ڕوونی بە هەڵسوکەوتیانەوە دیار بوو کە زۆر باش دەزانن (کا) و موختار لەوێ چی دەکەن. (کا) حاڵی بوو کە ئەو کەسانە سەر بە دەزگای هەواڵگریی میللی –میت–ن. لەگەڵ ئەوەشدا چاوێکیان بە ناسنامەکەی (کا)دا گێڕا و لێیان پرسی کە چی دەکات لەم ناوە. (کا) گوتی کە لە ئەستەمبوڵەوە هاتووە بۆ نووسینی وتار لەسەر هەڵبژاردنەکان و خۆکوژیی ژنان بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت.

یەکێک لە کارمەندەکان گوتی: "جا ئەوانە بۆیە خۆیان دەکوژن بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ لە سەریان بنووسن."

(کا) شێلگیرانە گوتی: "نا،.لەبەر ئەوە نییە."



"ئەی لەبەر چییە؟"

"لەتاو چارەڕەشی و بەدبەختی خۆیان دەکوژن."

"ئێمە بەدبەختیشن، بەڵام خۆمان ناکوژین."

لەولایشەوە دووانەکەی تر لەبەر ڕۆشنایی لایتەکەی دەستیاندا دۆڵابەکانی بارەگای پارتیان کردەوە، کشاوەکانیان ڕاکێشا و هەرچییان تێدابوو ڕۆیان کردە سەر مێزەکە و لە تۆمارەکانیشدا بەدوای چەند شتێکدا گەڕان. مێزەکەی موختاریان هەڵگێڕایەوە و لە ژێریدا بەدوای چەکدا گەڕان، یەکێک لە دۆڵابەکانیان ڕاکێشایە پێشەوە و سەیری پشتەوەیان کرد. جۆری هەڵسوکەوتیان لەگەڵ (کا)دا باشتر بوو لە مامەڵەیان لەتەک موختاردا.

"بۆچی لە دوای بینینی پەلاماردانی بەڕێوەبەر نەچوونە مەڵبەندی پۆلیس و هاتنە ئێرە؟"

"لێرە ژووانم هەبوو."

"بۆچی؟"

موختار بە دەنگێک کە بۆنی لێبووردنی لێ دەهات، گوتی: "ئێمە هاوڕێی دێرینی سەردەمی زانکۆین. کچی خاوەنی هوتێلی بەفرپالاسیش کە ئەم لێی دابەزیوە، هاوسەرمە. کەمێک بەر لە هێرشەکە تەلەفۆنیان کرد بۆ ئێرە، بۆ بارەگای پارتی و کاتی دیداریان لەگەڵمدا دەستنیشان کرد. لەبەرئەوەی دەزگای هەواڵگری گوێ لە تەلەفۆنەکانمان دەگرێ، ئێوە دەتوانن لە ڕاستیی ئەم قسەیەم بکۆڵنەوە."

"تۆ لە کوێوە دەزانی کە ئێمە گوێ لە تەلەفۆنەکانتان دەگرین؟"

موختار بێ ئەوەی خۆی تێک بدات، گوتی: "داوای لێبووردن دەکەم، نازانم، بەڵکو وای بۆچووبووم. لەوانەیشە بە هەڵەدا چووبم."

(کا) لە موختاردا خوێنساردی و چەوساوەیی کەسێکی بەدی کرد کە مامەڵەی خراپی پۆلیسی بەهەند نەدەگرت و سووکایەتی پێکردنی نەدەکردە مەسەلەی شەرەف، بەشێوەیەکی سروشتی لەسەر بێبەزەییبوونی پۆلیس و دەوڵەت، لەسەر

بڕینی کارەبا و قوڕ و چڵپاوی بەردەوامی ڕێگا و بانەکان ڕاهاتبوو. (کا)، لە سۆنگەی ئەوەی توانا و تایبەتمەندییەکی لەو جۆرەی لە خۆیدا شک نەدەبرد، لە بەرانبەر موختاردا هەستی بە ڕێز کرد.

پاش پشکنینێکی درێژخایەنی بارەگای لقی پارتی و تێکدانی دۆڵابەکان و تۆمارەکان بەسەر یەکدا و پێچانەوەی بەشێکیان و لە توورەکە نانیان و تۆمارکردنی وردەکارییەکانی پشکنین، خزێنرانە دواوەی ئۆتۆمبیلی پۆلیسەکانەوە و هەردووکیان وەکو دوو کوڕی چەپی تاوانبارکراو بەبێدەنگی لە شانی یەکترەوە دانیشتبوون. (کا) چەوساوەیی موختاری لە دەستە گەورە و سپییەکانیدا بەدی کرد کە ژێرانە وەکو پیرەسەگی قەڵەو بەسەر ئەژنۆکانیدا شۆڕی کربوونەوە. بەدەم بەرەو پێشەوەچوونی لەسەرخۆی ئۆتۆمبیلی پۆلیسەوە بە شەقامە بەفراوی و تاریکەکانی قارسدا، ئەمان بە غەمگینی چاویان بڕیبووە تیشکی کز و نارنجیی سەرهاویشتوو لە پەنجەرەی نیوەکراوەی کەونە ماڵانی ئەرمەنی، ڕۆیشتنی لەسەرخۆی پیر و پەککەوتەی کیسەی پلاستیک بەدەست بەسەر شۆستەکاندا و دەرک و حەوشەی ماڵە تەنیا و چۆڵ و کۆن و بە(خێو)بووەکان. پۆستەرەکانی نمایشی دەمەوئێوارە بە تابلۆی ئاگادارییەکانی هۆڵی شانۆی گەلەوە هەڵواسرابوون، ئەو کرێکارانەی کاریان بۆ ڕاکێشانی کابڵی پەخشی زیندووی تەلەفزیۆن دەکرد، هێشتا لەسەر کارەکەیان بەردەوام بوون. بەهۆی بڕانی ڕێگا و بانەکانیشەوە کەشێکی تووڕە باڵی بەسەر گەراجەکانی پاسدا کێشابوو.

ئۆتۆمبیلی پۆلیسەکان هێدی هێدی بەسەر بەفرە ئەفسانەییەکەدا خل دەبووەوە. کلووە بەفرەکان لە چاوی (کا)دا لە کلووی ناو ئەو لەیستۆکە پڕ لە ئاوانە گەورەتر بوو کە منداڵان (تۆفانی بەفر)یان پێ دەگوت. بەدرێژاییی ئەو ڕێگا کورتە کە بەهۆی لێخوڕینی لەسەرخۆی شۆفێرەکەوە حەوت هەشت خولەکێکی خایاند، نیگای (کا) جارێک لەگەڵ نیگای موختاری تەنیشتیدا یەکانگیر بووەوە و بە شەرمەوە و زۆر بە ئاسانی لە ڕوانینی غەمگین و ئارامبەخشی دۆستە دێرینەکەیەوە حاڵی بوو کە موختار لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش دارکاری دەکرێ و خۆیشی دەستی بۆ نابرێ.

لە ڕوانینەکانی دۆستەکەیدا کە دەبوو چەندین ساڵ دوای ئەوەش لە بیری نەکات،



ئەوەیش حاڵی بوو کە موختار بیر لەوە دەکاتەوە ئەو تێهەڵدانەی پاش کەمێکی تر دووچاری دەبێت، خۆی بەسەر خۆی هێناوە. موختار سەرباری بڕوای تەواوی بە سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانیدا لە دوای چوار ڕۆژی تر، کەچی ڕوانینێک لە ڕووخساریدا بەدی دەکرا کە دەتگوت بەر لە قەومانی پێشهات بۆ پۆزش هێنانەوە ئامادەیە. (کا) تێ گەیشت موختار چۆن بیر دەکاتەوە: "دەزانم لەبەرئەوەی هێشتا لەسەر ژیان لەم گۆشەیەی جیهان سوورم و تەنانەت چاوم بڕیوەتە دەسەڵات، شایەنی ئەو تێهەڵدانەم کە کەمێکی تر دەیخۆم و هەوڵ دەدەم بێ ئەوەی هەستی شانازیم بریندار بکات، لێی دەرباز ببم و هەر لەبەرئەوەیشە خۆم لە تۆ بە بچووکتر دەزانم. تۆیش تکایە چیدی چاوت مەبڕە ناو چاوەکانم، چونکە هەست بە شەرمەزاری دەکەم."

پاش ئەوەی ئۆتۆمبیلی پۆلیسەکان گەیشتە حەوشەی بە بەفرداپۆشراوی پشتەوەی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش، (کا) و موختاریان لە یەکتری جیانەکردەوە، بەڵام لەگەڵ هەریەکەیاندا مامەڵەیەکی جیاوازیان کرد. لەگەڵ (کا)دا مامەڵەی کەسێکی کاریگەر و بینەرێکی ئامادەی هاوکاریکردن و ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگی لە ئەستەمبوڵەوە هاتوویان کرد کە ئەگەر بهاتایە و لەدژی ئەوانی بنووسیبایە، ئەوا تووشی سەرئێشەی زۆری دەکردن. لە هەڵسوکەوت لەگەڵ موختاریشدا هەوایەکی سووکایەتی پێکردنی تێکەڵ بە "ها ئەوە دیسان خۆتی!"، بەدی دەکرا؛ تەنانەت لەگەڵ (کا)دا گەیاندیانە ئەوەی پێی بێژن: "دەبێ کەسێکی وەکو تۆ چی لەگەڵ ئەم کابرایەدا هەبێ!" (کا) ساویلکانە بیری بۆ ئەوە چوو پۆلیسەکان بۆیە سووکایەتی بە موختار دەکەن، چونکە بە گەوج (پێت وایە ئەم دەوڵەتە ڕادەستی تۆ دەکرێ!) و بوودەڵە (تۆ جارێ ئاوڕێک لە ژیانی خۆت بدەرەوە)ی دەزانن. بەڵام دواتر بە ئازارەوە بۆی ئاشکرابوو کە ئەوان بە شێوازێکی زۆر جیاوازتر درێژەیان بە گەمەی خۆیان دا.

ماوەیەک (کا)یان بردە ژوورێکی تر و بەمەبەستی دەستنیشانکردنی ئەو کوڕە باریکەڵە و تەن بچووکەی کە تەقەی لە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە کردبوو، نزیکەی سەد وێنەی ڕەش و سپیی کۆکراوەی ناو ئەرشیفیان نیشانی دا. هەموو ئەندامانی ڕێکخراوە ئیسلامییە سیاسییەکانی قارس و دەوروبەری، ئەوانەی کە

تەنانەت جارێکیش لە لایەن هێزەکانی ئاسایشەوە دەستگیرکرابوون، لەوێ وێنەیان هەبوو. زۆربەیان لاو بوون، کورد بوون، گوندی یاخۆ بێکار بوون، بەڵام لە نێوانیاندا فرۆشیاری گەڕۆک، ئیمامی مزگەوت، تەنانەت قوتابیی زانکۆ، مامۆستا و تورکی سونی مەزهەبیش هەبوون. لە ناو ئەو وێنانەدا کە خاوەنەکانیان بە ڕق و کەسەرەوە چاویان بڕیبووە کامێراکانی ئاسایش، (کا) سیمای دوو لاوی خوێن گەرمی ناسییەوە کە پێشتر لە کاتی پیاسەکردن بە کۆڵانەکانی قارسدا، ڕووی تەقیبوو بە ڕوویاندا. بەڵام کارێکی فرە دژوار بوو وێنەی هێرشکارەکە کە ئەم بە کەسێکی بە تەمەنتر و لەڕ و باریکەڵەی دەزانی، لە ناو وێنە ڕەش و سپییەکاندا بدۆزرێتەوە.

کاتێک هێنرایەوە بۆ ژوورەکەی پێشووتر، بینی ئەوا موختار لەسەر هەمان کورسییەکەی ئەوسا خۆی کووڕ کردووەتەوە، خوێن لە لووتی دێ و ژێر یەکێک لە چاوەکانیشی سوور بووەتەوە. موختار بە شەرمەوە یەک دوو جووڵەی کرد و بە دەسڕەکەی دەستی، ڕووی خۆی بە باشی شاردەوە. لەو بێ دەنگییەدا (کا) خەیاڵی بۆ ئەوە چوو موختار لە سایەی ئەو دارکارییەدا، لە هەستی تاوانباریی سەرچاوەگرتوو لە هەژاری و بوودەڵەییی وڵاتەکەی و لە ئازاری دەروونی پاک بووەتەوە. (کا) دوای دوو ڕۆژ لەو ڕووداوە و بەر لەوەی ناشادترین هەواڵی ژیانی پێ بگات، کەوتە ئەم دۆخەی ئێستای موختارەوە و زۆر گەوجانە ئەم خەیاڵکردنەی بیرکەوتەوە.

دوای ئەوەی ماوەی خولەکێک لەگەڵ موختاردا چاویان بەیەک کەوتەوە، جارێکی تر (کا)یان بردەوە ژوورەکەی ئەولا بۆ وەرگرتنی وتەکانی. (کا) دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی تەقەکردن لە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە بۆ ئەو پۆلیسە لاوەی کە لە سەر داکتیلۆیەکی مارکەی (ڕەمینگتۆن) دەینووسی، لە جۆری ئەوەی کە باوکە پارێزەرەکەی ئێواران بۆ تەواوکردنی کارەکانی دەیهێنایەوە بۆ ماڵ. (کا) لەو کاتەدا بیری بۆ ئەوە چوو کە بۆیە موختاریان لەو بارەدا پێ نیشان داوە، بۆ ئەوەی ئەمی پێ بترسێنن.

دوای کەمێک ئازاد کرا، بەڵام تا ماوەیەکی درێژ نەیتوانی دەموچاوی خوێناویی موختار لە بیر بکات. لە ڕابردوودا تەنانەت کەسانی کۆنەپارێز لە شارە



دوورەدەستەکانیش لە لایەن پۆلیسەوە بەوجۆرە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نەدەکرا، بەڵام موختار سەر بە پارتێکی ڕاستڕەوی ناوەندی وەکو (ئەناپ- پارتی نیشتمانی دایک) نەبوو، بەڵکو سەر بە ڕەوتێک بوو کە دەیویست ببێت بە ڕادیکاڵی ئیسلامی. سەرباری ئەوەیش پێی وابوو کە ئەم ڕەوشە تا ڕادەیەک پێوەندیی بە خودی کەسایەتیی موختارەوە هەیە. (کا) بەژێر بەفرەکەدا ماوەیەکی درێژ ڕێی کرد، لە خوارەوەی شەقامی ئۆردوو لەسەر دیوارێک دانیشت، جگەرەیەکی داگیرساند و نیگای بڕیە ئەو منداڵانەی کە لەبەر ڕۆشنایی گڵۆپی دارتەلەکانی کارەبادا بەفرەخلیسکێیان دەکرد. ئەو هەژاری و توندوتیژییەی بەدرێژایی ڕۆژ بینیبووی، ماندووی کردبوو، بەڵام لە ناخیدا هیوای دەستپێکردنی ژیانێکی تەواو نوێ لەگەڵ خۆشەویستنی ئیپەکدا چەکەرەی دەکرد.

(کا) لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بوو، پاش ماوەیەک دیسانەوە خۆی لەسەر شۆستەی پێش شیرینیخانەی ژیانی نوێدا بینییەوە. شووشەی پەنجەرەکانی شیرینیخانەکە شکابوون و گڵۆپی شینی تۆخی ئۆتۆمبیلی پۆلیسی ڕاگیراو لەبەردەمیدا دادەگیرسا و دەکوژایەوە. گڵۆپەکە بە تیشکێکی جوان ئاپۆڕەی ئەو پیر و منداڵانەی کە بۆ سەیرکردنی پۆلیسەکانی ناو شیرینیخانەکە کۆبووبوونەوە و بەفرەکەی ڕووناک دەکردەوە کە بە سەبرێکی خودایی دەباری. (کا) خۆی کرد بەناو ئاپۆرەکەدا و بینی وا پۆلیسەکان هێشتا لە شیرینیخانەکەدا چەند شتێک لە گارسۆنە پیرەکە دەپرسن.

کەسێک بەنەرمی دەستی خستە سەر شانی (کا): "ئێوە شاعیر (کا)ن، وا نییە؟"

جوانخاسێکی چاوسەوزی چاوگەورە و خاوەن دەموچاوێکی منداڵانە بوو. لاوەکە گوتی: "من ناوم نەجیب"ە. دەزانم کە بەمەبەستی نووسینی وتار سەبارەت بە هەڵبژاردن و خۆکوژیی کچان ڕووتان لە قارس کردووە و دیدارتان لەگەڵ چەندین کەس و دەوروبەردا ئەنجام داوە. بەڵام کەسێکی تری زۆر گرنگ هەیە لە قارسدا کە پێویست دەکات بیبینن."

"کێ؟"

"کەمێک بچینە لاوە؟"

(کا) ڕەفتاری پڕ لە ڕازی لاوەکەی پێ خۆش بوو. خۆیان گەیاندە بەردەم بۆفیەی هاوچەرخ کە (بە شەربەت و شیرینی لە هەموو جیهاندا ناسراوە).

لاوەکە گوتی: "پێم ڕاسپێردراوە تەنیا کاتێک ناوی ئەو کەسەتان پێ بڵێم کە ڕەزامەندی لەسەر بینینی دەربڕن."

(کا) گوتی: "جا چۆن ڕازی بم لەسەر چوون بۆ لای کەسێک کە نەزانم کێیە؟"

لاوەکە گوتی: "ئیدی ئاوایە. ئەو کەسە خۆی شاردووەتەوە. هەتا ڕازیش نەبن لەسەر بینینی، پێتان ناڵێم لە کوێ و بۆچی خۆی شاردووەتەوە."

(کا) گوتی: "باشە، ڕازیم بە بینینی." دواتر بە جووڵەیەکی لە شێوەی ئەکتەری ناو ڕۆمانە بە نەخش و نیگارەکانەوە گوتی: "هیوادارم ئەمە تەڵەیەک نەبێ."

لاوەکەیش بەهەمان جووڵەوە گوتی: "ئەگەر متمانەت بە کەسانی تر نەبێت، لە ژیانتدا هیچت بۆ ناکرێ."

(کا) گوتی: "متمانەم پێتان هەیە. ئەو کەسە کێیە کە پێویستە بیبینم؟"

لاوەکە گوتی: "کە ناویتان زانی، ئیدی دەبێ بیبینن. بەڵام پێویستە ڕازی شوێنی خۆحەشاردانی بپارێزی. ئێستا جارێکی تریش بیر بکەرەوە. ناوەکەی بڵێم؟"

(کا) گوتی: "بەڵێ. ئێوەش متمانەتان بە من هەبێت."

نەجیب بە خرۆشێکی وەهاوە وەکو ئەوەی ناوی قارەمانی یەکێک لە ئەفسانەکان بهێنێ، گوتی: "ئەو کەسە ناوی شینەیە."

کاتێک هیچ کاردنەوەیەکی لە (کا) نەبینی، تووشی خەیاڵشکاندن بوو. پاشان گوتی: "ئەو دەمەی کە لە ئەڵمانیا بوون، هیچتان لە بارەیەوە نەبیستووە؟ کەسێکی زۆر ناودارە."

(کا) بەدەم هێورکردنەوەوە گوتی: "دەزانم. ئامادەم بۆ بینینی."

نەجیب گوتی: "بەڵام من نازانم لە کوێیە. تەنانەت لە ژیانمدا هەر نەشمبینیووە."

بە خەندەیەکی پڕ لە گومانەوە ماوەیەک لە تەوقی سەرەوە بۆ نووکی پێ سەیری یەکتریان کرد.



نەجیب گوتی: "کەسێکی تر دەتبات بۆ لای شینە. ئەرکی من ئەوەیە بتگەیەنم بەو کەسەی کە بە ئەوت دەگەیەنێ."

پێکەوە بەژێر ئالای بچووک و پۆستەرەکانی هەڵبژاردندا بە شەقامی کوچووک کازم بەگدا بەرەو خوار ڕۆیشتن. (کا) بە جووڵەی شپرزەی لاوە مێرخاسەکە و باڵا زراڤەکەیدا سەردەمی لاوێتیی خۆی هاتەوە یاد و هەستی بۆی جوولا. ساتێک وا هەستی کرد کە دەیەوێ لە چاوی لاوەکەوە سەیری جیهان بکات.

نەجیب پرسی: "لە ئەڵمانیا چیتان لە بارەی شینەوە بیستووە؟"

(کا) گوتی: "لە ڕۆژنامە تورکییەکاندا ئەوەم خوێندووەتەوە کە میلیتانێکی ئیسلامی سیاسییە. هەندێ شتی خراپی تریشم لە سەری خوێندووەتەوە."

نەجیب بەپەلە قسەکانی پێ بڕی: "ئیسلامی سیاسی ناوێکە کە ڕۆژئاوا و چاپەمەنیی لایسیست لە ئێمەیان ناوە، ئێمەی مسوڵمانی ئامادە بۆ شەڕ لە پێناوی داهاتوودا. ئێوە لایسیستن، بەڵام تکایە باوەڕ مەکەن بەوەی کە چاپەمەنیی لایسیست لەو بارەیەوە دەینووسێ. شینە کەسی نەکوشتووە. لە پێناوی بەرگریکردن لە برا مسوڵمانەکانیدا، چووەتە بۆسنە و تەنانەت لە گرۆزنی بە بۆمبای ڕووسەکان بریندار بووە." (کا)ی لە گۆشەیەکدا ڕاگرت و گوتی: "ئەو دوکانەی ئەوبەرەوە دەبینی، کتێبخانەی تەبلیغ... ئەوە هی وەحدەتچییەکانە، بەڵام هەموو ئیسلامییەکانی قارس لەوێ یەکتر دەبینن. پۆلیسیش وەکو هەمووان بەمە دەزانێ. ئەوان لە ناو فرۆشیارەکاندا سیخوڕیان هەیە. من قوتابیی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانم. چوونی ئێمە بۆ ئەو جۆرە شوێنانە قەدەغەیە، سزای بێ دیسیپلینی دەدرێین، بەڵام هەواڵ دەنێرم بۆ ناوەوە. دوای سێ خولەکی تر لاوێکی باڵابەرزی کڵاوسوور و ڕیشدار دێتە دەرەوە. بکەوە دوای ئەو. دوای دوو کۆڵان خۆیت پێ دەگەیەنێ و ئەگەر پۆلیسی سڤیل بەدواتانەوە نەبێ، دەتبات بۆ شوێنی مەبەست. تێ گەیشتی؟ خودا پشت و پەنات بێت." نەجیب لەناکاو لە ناو بەفرە چڕەکەدا ون بوو. (کا) لە ناخی خۆیدا هەستی بە خۆشەویستی کرد لە بەرانبەری.

# ٨

## خۆکوژ گوناهباره

### بەسەرهاتی شینە و ڕۆستەم

(کا) لە بەرامبەر کتێبخانەی تەبلیغ چاوەڕێی دەکرد و بەفریش بە گوڕتر دەباری. لە تەکاندنی بەردەوامی بەفری بان سەری، سەر جلەکانی و لە چاوەڕێکردن بێزار بووبوو، لەوەدا بوو بۆ هوتێل بگەڕێتەوە، لەو کاتەدا بینی وا لاوێکی بالابەرزی ڕیشن لەوبەرەوە بەژێر تیشکی زەردی گڵۆپی کۆڵانەکەی ئەوبەردا ڕێ دەکات و کڵاوە سوورەکەی سەری، لە بەفردا سپی دەکاتەوە. لێدانی دڵی (کا) زیادی کرد و دوای لاوەکە کەوت.

بەدرێژاییی شەقامی کازم پاشا کە پاڵێوراوی پارتی نیشتمانی دایک-ئەناپ بۆ سەرۆکایەتیی شارەوانی بەڵێنی دابوو لەسەر شێوازی ئەستەمبوڵ بیگۆڕێ بۆ شەقامی پیادەڕۆیی، ملی ڕێیان گرت و دواتر بەلای شەقامی فایەق بەگدا بایاندایەوە. دوو کوچە لە خوارترەوە بەلای ڕاستدا گەڕانەوە و گەیشتنە مەیدانی وێستگای شەمەنەفەر. بەفر پەیکەری کازم قەرەبەکری ناوەڕاستی مەیدانەکەی داپۆشیبوو و لە تاریکییەکەدا شێوەی بەستەنییەکی گەورەی گرتبوو. (کا) بینی لاوە ڕیشنەکە خۆی کرد بە باڵەخانەی وێستگاکەدا، ئەمیش تینی دایە خۆی و دوای کەوت. لە هۆڵەکانی چاوەڕوانیکردندا کەس بەدی نەدەکرا. هەستی کرد لاوەکە بەسەر شۆستەی وێستگاکەدا ملی ڕێگای گرت و بەرەو ئەوسەر چوو. کاتێک گەیشتە کۆتاییی شۆستەکە، وەکو ئەوەی تارماییی لاوەکە لە تاریکییەکەدا ببینێ وابوو، بە ترسەوە شانبەشانی هێڵی ئاسنینی وێستگاکە چووە پێشەوە. (کا) ئەوەی بە بیردا هات کە ئەگەر لێرە دەستی لێ بوەشێنن و بیکوژن، ئەوا کەس ناتوانێ هەتا بەهار تەرمەکەی بدۆزێتەوە. لەو کاتەدا لووتی تەقی بە لووتی لاوە ڕیشن و کڵاو لەسەرەکەدا.



لاوەکە گوتی: "کەس لە دوامانەوە نییە، بەڵام ئەگەر بتەوێ، ئێستایش دەتوانی پاشگەز بیتەوە. خۆ ئەگەر لەگەڵ منیشدا دێیت، ئەوا پێویستە لەمەودوا چەنەت دابخەیت. بەهیچ جۆرێک ئەوەت بەسەر زماندا نایات کە چۆن گەیشتیتە ئێرە. ئاکامی ناپاکان کوشتنە."

بەڵام تەنانەت دوا وشەی لاوەکەش (کا)ی نەترساند، چونکە دەنگێکی ئەوەندە ناسک و باریکی هەبوو کە باوک مردەی دەخستە پێکەنین. بەدرێژاییی هێڵی ئاسنینی وێستگاکەدا ڕۆیشتن و بەلای سایلۆکەدا تێ پەڕین. دوای ئەوەی گەیشتنە کوچەی یاخنیلەری تەنیشت ماڵە سەربازییەکان. لاوە دەنگ زراڤەکە ئەو باڵەخانەیەی نیشانی (کا) دا کە دەبوو بۆی بڕوات، بۆی ڕوون کردەوە کە دەست بەکام زەنگدا بنێ و پێی گوت: " لەبەردەم وەستادا بێڕێزی نەنوێنی! قسەی پێ مەبڕە، کە کارەکەیشت تەواوبوو، یەکسەر و بێ خۆخەریک کردن بێرە دەرەوە."

بەو جۆرە (کا)حاڵی بوو کە (وەستا) نازناوێکی تری شینەیە کە لە لایەن هەوادرانییەوە بەسەریدا بڕاوە. (کا) بۆ خۆیشی زانیاریی زۆر کەمی هەبوو سەبارەت بەوەی کە شینە مسوڵمانێکی سیاسی و کەسێکی بەناوبانگە. چەند ساڵێک لەمەوبەر، لەو ڕۆژنامە تورکییانەدا کە لە ئەڵمانیا دەستی پێیان ڕادەگەیشت، خوێندبوویەوە کە شینە لە تاوانێکەوە گلاوە. چەندین مسوڵمانی پیاوکوژ هەبوون؛ بەڵام هیچیان ناوبانگی ئەویان نەبوو. ئەوەی شینەی بەناوبانگ کردبوو، دەنگۆی ئەوە بوو گوایە بێژەرێکی کوشتووە کە لە کەناڵێکی بچووکی تەلەفزیۆندا بەرنامەیەکی پێشبڕکێ و خەڵاتبەخشینی پێشکەش دەکرد. بێژەرەکە لە بەرنامەکەدا جلوبەرگی نەخشین و بریقەداری دەپۆشی و گاڵتەی بێتام و بێلەزەتی دەکرد، بە خۆنازینەوە و بە دەنگی مێینانەی خۆی، لە نرخ و بەهای (نەزانەکان)ی کەم دەکردەوە. ئەم بێژەرە قۆشمەیە کە ناوی گوینەر تەنەر بوو و ئاوڵە دەموچاوی داپۆشیبوو، لە بەرنامەیەکی ڕاستەوخۆی پێشبڕکێدا کەسێکی هەژار و دەبەنگ هەڵدەسێنێتە سەرپێ و بەدەم پێ ڕابواردنەوە، زمانی دەترازێ و پلارێکی ناشایستە دەگرێتە حەزرەتی پەیامبەر. ئەم پلار تێگرتنە کە هەندێ بینەری باوەڕمەند کە بەدەم خەوەنوتکێوە سەیری پرۆگرامەکەیان کردبوو، کەللەیی کردبوو، خەریک بوو لە بەرەوە

له بیری خەڵک دەچووەوە. بەڵام شینه لەو کاتەدا نامە بۆ هەموو ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ دەنووسێ و هەڕەشەی ئەوە لە کابرای بێژەر دەکات کە ئەگەر لە هەمان بەرنامەدا تۆبە نەکات و داوای پۆزش نەکات، ئەوا دەیکوژێ. چاپەمەنیی ئەستەمبوڵ لەگەڵ ئەم جۆرە هەڕەشانەدا ڕاهاتبوون و لەوانەیش بوو هیچ بایەخ بە نامەکانی شینه نەدەن و فەرامۆشی بکەن؛ بەڵام کەناڵێکی بچووکی تەلەفزیۆن کە سیاسەتێکی لایسیستانەی پەیڕەو دەکرد و دەیویست بە پەیامێک لە ڕای گشتی بگەیەنێ کە مەترسیی ئیسلامی سیاسیی چەکدار تا چ ڕادەیەک پەرەی سەندووە، شینه دەهێنێتە سەر پەردەی تەلەفزیۆن و ئەویش کۆمەڵێ هەڕەشەی تر بە هەڕەشەکانی پێشوویەوە دەنێ. دوای سەرکەوتنی ئەم پرۆگرامە، شینه بە ڕۆڵی (ئیسلامییەکی یاخیبووی تەور بەدەست) ڕازی دەبێ و لە کەناڵەکانی تریشدا دەبینرێ. داواکاری گشتی بە تۆمەتی (هەڕەشەی کوشتن) فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ دەردەکات، ئەویش کە لەو سەروبەندەدا تازە سووکە ناوبانگێکی پەیداکردبوو، لە چاوان ون دەبێ و دەست بە خۆشاردنەوە دەکات. گوینەر تەنەریش کە دەبینێ وا ڕای گشتی گرنگی بە ڕووداوەکە دەدات، هەموو ڕۆژێک لە بەرنامە ڕاستەوخۆکەیدا و بە شێوازێکی چاوەڕوان نەکراو ڕادەگەیەنێ کە لە (شێت و نەزانەکانی دوژمنی ئەتاتورک و کۆمار ناترسێ) و مەیدانبازی دەکات. ڕۆژی دواتر بۆ بەرنامەکەی دەچێتە ئەزمیر، لەوێ لە ژوورەکەی خۆی لە هوتێلێکی لوکسدا، بەو کراڤاتەی کە نیگاری تۆپی ئاوی بەسەرەوە بوو و لە بەرنامەکانیدا لە ملی گرێ دەدا، خنێکرا بوو. شینه سەرەڕای ئەوەی سەلماندبووی کە لەو ڕۆژەدا لە مانیسا بەشداریی لە کۆنفرانسێکدا کردووە بۆ پشتیوانیکردن لە کچانی سەرپۆش بەسەر، خۆی لە ڕووداوەکە و لە چاپەمەنی کە ناوبانگی ئەویان بە هەموو لایەکی وڵاتدا بڵاوکردبووەوە، دزییەوە و درێژەی بە خۆشاردنەوە دا. لەو ڕۆژانەدا بەشێک لە چاپەمەنیی ئیسلامی سیاسیش لە چاپەمەنیی لایسیست کەمتریان پێ نەکرد و بەبیانووی وەکو ئەوەی کە ئیسلامی سیاسی چەشنی کەسانی دەست بە خوێن نیشان داوە، لەیستۆکی دەستی چاپەمەنیی لایسیستە، بەشێوەیەک کە لە ئیسلامییەک ناوەشێتەوە، شەیدای ناوبانگە، حەزی لە خۆدەرخستنە لە هۆیەکانی ڕاگەیاندندا و سیخوڕی (سی ئای ئەی)یە، پەلاماریان دەدا. لەبەر ئەو هۆیانە شینه



ماوەیەکی درێژ خۆی شاردەوە. لەو سەروبەندەدا ئەو دەنگۆیە لە ناو دەوروبەرە ئیسلامییەکاندا بڵاوبووەوە کە وەکو قارەمانێک لە بۆسنە دەست لە سربەکان و لە گرۆزنی دەست لە ڕووسەکان دەوەشێنێ، بەڵام هەندێک بۆچوونی تریش هەبوون کە ئەم دەنگۆیانەیان بەدرۆ دەخستەوە.

ئەوانەی بە پەرۆشن بۆ زانینی ڕای شینه لەسەر ئەم بابەتانە، دەتوانن لە بەشی سی و پێنجەمی کتێبەکەماندا بە سەردێری (من سیخوڕی کەس نیم) و بە ژێردێری "(کا) و شینه لە ژوورەکەدا"، بڕواننە کورتەی بەسەرهاتی شینه کە بە دەستەواژەی (لەم ڕۆژی بیستی شوباتەدا کە شیمانەی بەهێزی لە سێدارەدانی من لە ئارادایە) دەست پێ دەکات، بەڵام بەتەواوی دڵنیا نیم لەوەی کە هەموو گێڕانەوەکانی قارەمانەکەمان لەوێدا ڕاست بن. شێوازی ژیانی پڕ لە ڕازی شینه سەرچاوەی زۆربەی ئەو دۆریانە بوون کە بۆی هەڵدەبەستران و هەندێکیشیان دەگەیشتە ئاستی ئەفسانە. بێدەنگییەکەیشی کە دواتر هەوڵی دەدا پەردەپۆشی بکات، دەکرێ وا لێک بدرێتەوە کە شینه ئەو ڕەخنانەی دەوروبەرە ئیسلامییەکانی لا پەسەند بوو کە لە سەرەتای ناوبانگ دەرکردنیدا لێیان گرتبوو و تێیدا بە باشیان نەزانیبوو مسوڵمانێک هێندە بە زۆری لە ڕاگەیاندنی بۆرژوای زایۆنیدا ببیندرێ، بەڵام وەکو لە چیرۆکەکەماندا دەیبینن، شینه لە ڕاستیدا زۆر حەزی دەکرد بۆ ڕاگەیاندن بدوێ.

ئەو شتانەیشی دەربارەی هاتنی بۆ قارس دەگوتران –وەکو هەموو ئەو قسانەی کە یەکسەر بە شوێنە بچووکەکاندا بڵاودەبوونەوە–، هیچیان یەکتریان نەدەگرتەوە. هەندێک دەیانگوت شینه هاتووەتە قارس بۆ ئەوەی جەماوەر و نهێنییەکانی کەسانی سەر بە تاقمێکی ئیسلامیی کوردی بپارێزێ کە دەستەی بەڕێوەبەرایەتییەکەی لە ئامەد لە ئاکامی هێرشەکانی دەوڵەتەوە درزی تێ کەوتووە، بەڵام تاقمی ناوهێندراو لە قارسدا لە دوو سێ لایەنگر زیاتری نەبوو. لایەنگرانی ئاشتیخواز و نیازپاکی سەر بە گرووپە کوردییە مارکسی و نەتەوەپەرستەکان و کوردە ئیسلامییەکانیش دەیانگوت بۆ ئارامکردنەوەی ئەو شەڕە هاتووە کە بەر لە ماوەیەک لە شارەکانی ڕۆژهەڵات لە نێوان هەردوولادا دەستی پێ کردبوو و خەریک بوو تەشەنەی دەکرد. پێکاهەڵپرژانی گرووپە کوردییە مارکسی و نەتەوەپەرستەکان و کوردە ئیسلامییەکان

سەرەتا بە دەمەقالێ، جنێو بە یەکتردان، دارکاریکردنی ئەندامانی یەکتری و شەڕە کۆڵان دەستی پێ کردبوو. پاشان لە زۆربەی شارەکاندا گەیشتبووە ئاستی چەقۆکێشی و تەوربازی، لەو مانگانەی دواییشدا لایەنەکان تەقەیان لە یەکتر دەکرد، یەکتریان دەکوشت، ئەندامەکانی یەکتریان دەفڕاند و ئەشکەنجەیان دەدان. (هەردوولایش شێوازی ئەشکەنجەدانی لە جۆری تواندنەوەی نایلۆن بە سەر دەمارەکانی لەشدا و گوشینی گونیان پەیڕەو دەکرد.) دەگوترا کەسانێک کە پێیان وابوو ئەو شەڕە (لە بەرژەوەندی دەوڵەتە)، شاندێکی ناوبژیوانی نهێنییان بۆ کۆتایی پێهێنانی پێکەوە ناوە و ناوچە بە ناوچە بەدوای شینەدا گەڕاون، بەڵام بە گوتەی دوژمنەکانیشی، لەبەر خاڵە ڕەشەکانی ژیانی ڕابردووی و کەمیی تەمەنی، بۆ ئەم ئەرکە قورس و بەدەربەستە دەستی نەدەدا. هەرچی لاوە ئیسلامییەکانیش بوون، دەیانگوت شینە هاتووە بۆ لەناوبردنی بێژەر و دیسکجۆکی کەناڵی ناوخۆی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) کە لە بەرنامەکاندا جلوبەرگی بریقەداری دەپۆشی و گاڵتەی بێتامی دەکرد، ئەگەرچی ناڕاستەوخۆش بێت، توانج و پلاری دەگرتە ئیسلام. بۆیە بێژەر حەقان ئوێزگەی بە ڕەچەڵەک ئازەری لە پرۆگرامەکانی ئەم دواییەدا هەر جار ناجارێک ناوی خودای دەهێنا و کاتەکانی بانگ و نوێژی ڕادەگەیاند. هەندێکیش دەیانگوت شینە سەر بە باسکی تورکیای تۆڕێکی تیرۆریستی ئیسلامیی نێودەوڵەتییە. تەنانەت هەواڵ گەیشتبووە دەزگای هەواڵگری و هێزەکانی ئاسایش لە قارس کە گوایە ئەم تۆڕە بە پشتیوانیی عەرەبستانی سعوودی نەخشەی داڕشتووە بۆ کوشتنی چەند ژنێک بەمەبەستی ترساندنی ئەو ژنانەی کە لە کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشووەوە بۆ کاری لەشفرۆشی دەهاتنە تورکیا. شینە بانگەشەکانی لە جۆری ئەوەی لە پێناوی ژنانی خۆکوشتوودا یان بۆ پشتیوانی لە کچانی سەرداپۆشراو یاخۆ لەبەر هەڵبژاردنەکان بۆ قارس هاتووە، وەکو هەموو بانگەشەکانی تر بە درۆ نەدەخستەوە. نەبینینی لە هیچ لایەک و بێدەنگبوون لە بەرامبەر ئەو شتانەی دەدرانە پاڵی، کەشێکی پڕ لە نهێنیی ئەوتۆی خوڵقاندبوو کە بۆ قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان مایەی چێژ لێ وەرگرتن بوو. خۆشاردنەوەکەی تەنیا لە چاوی پۆلیس نەبوو، بەڵکو نەهاتنە دەرەوەی بۆ کوچە و کۆڵانەکانی قارس، هەمان کات بۆ تێکنەدانی ئەو کەشە ئەفسانەیییە بوو کە لە ناو



خەڵکدا خوڵقابوو، ئەمەیش گومانی ئەوەی لە شارە یاخۆ نا، زیاتر دەکرد.

(کا) دەستی بەو زەنگەدا نا کە لاوە کڵاو سوورەکە نیشانی دابوو. کابرایەکی باڵاکورت دەرگاکەی کردەوە و فەرمووی لێ کرد بۆ ژوورەوە. (کا) سەرەتا وا تێ گەیشت ئەمە ئەو کابرایەیە کە سەعات و نیوێک لەمەوبەر لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی بەر گوللە دا. دەگەڵ بینینی کابرادا لێدانی دڵی زیادی کرد. کورتەباڵاکە دەستەکانی بەرز کردەوە، ناو لەپەکانی نیشان دا و گوتی: "ببوورن، لە ساڵی ڕابردوودا سێ جار هەوڵی کوشتنی وەستامان دراوە، دەبێ بتانپشکنم."

(کا) بەو شێوەیەی کە لە ساڵانی زانکۆدا لەسەری ڕاهاتبوو، باڵەکانی بۆ پشکنین ئاوەڵا کرد. کابرای کورتەباڵا بەوردی بۆ گەڕان بەدوای چەکدا دەستە بچووکەکانی بەسەر کراسەکەی و پشتیدا گێڕا. (کا) ترسی ئەوەی لێ نیشت کابرا هەست بە لێدانی خێرای دڵی بکات. بەڵام یەکسەر لێدانی دڵی گەڕایەوە سەر ڕەوتی ئاسایی و هەستی کرد کە بە هەڵەدا چووە. نەخێر، ئەم کابرایە بەهیچ جۆرێک ئەو کەسە نییە کە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی بەر گوللە دابوو. ئەم کەسە میهرەبان و تەمەن مامناوەندییە کە ئەدوارد جی ڕۆبینسۆنی هێنایەوە یادی، لەو بابەتە بوێر و پتەوانە نەبوو کە بتوانێ کەسانی تر بداتە بەر دەستڕێژی گوللە.

هەنسکی منداڵێک کە خەریک بوو دەستی بە گریان دەکرد و دەنگی شیرینی دایکێک کە لەگەڵ منداڵەکەدا دەدوا، هاتە بەر گوێی (کا). پرسیاری کرد کە "ئایا پێڵاوەکانم دابکەنم؟" بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکات، دەستی کرد بە داکەندنی پێڵاوەکانی و لەگەڵیشیدا گوتی: "ئێمە لێرە میوانین و نامانەوێ ببینە ئەرک بەسەر خاوەن ماڵەوە."

(کا) لەو ساتەدا هەستی کرد کەسێکی تر لەسەر قەنەفەکان دانیشتووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە حاڵی بوو ئەوەی بینیویەتی شینەیە، بەڵام لەبەرئەوەی لایەکی هۆشی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی کاریگەرتر جۆش دابوو، کەوتە گومانەوە. بەدوای شینەدا چووە ژوورێکی پەرپووتەوە کە تەلەفزیۆنێکی ڕەش و سپیی تێدا داگیرسێنرابوو. لەوێ کۆرپەیەکی ساوای بینی کە دەستی تا مەچەکی لە زاری نابوو، بەوپەڕی

ئاگاهی و دەربەستەوە چاوی بڕیبووە دایکی کە بەدەم گۆڕینی دەرپێکەیەوە وشەی شیرینی کوردی پێدەگوتەوە. نیگای کۆرپەکە سەرەتا کەوتە سەر شینە، بەدوای ئەویشدا (کا) هاتە ژوورێ. ماڵەکە، وەکو ماڵە ڕووسییە کۆنەکان ڕێڕەوی نەبوو، لە هەنگاونان بەردەوام بوون و چوونە ژوورێکی ترەوە.

(کا) تەنیا چاودێریی شینەی دەکرد. پاشان نیگای چووە سەر نوێن و پێخەوێکی ڕێکخراو لەسەر شێوازی وردی سەربازی، بیجامەیەکی هێڵ شینی جوان قەدکراو و دانراو لە تەنیشت سەرینەکەوە، تەپڵەکێک کە (ئەرسین ئەلەکتریک)ی لەسەر نووسرابوو، ساڵنامەیەک بە دیمەنی ڤینیسیاوە بە دیوارەکەوە و دوو تاکی کراوەی پەنجەرەیەکی فراوان کە دەیڕوانی بەسەر هەموو تیشکە خەمبارەکانی شاری قارسی نقومبووی ناو بەفردا. شینە پەنجەرەکەی داخست و گەڕایەوە بۆ لای (کا).

شینە چاوەکانی شینێکی تۆخی ئەوتۆ بوون کە لە تورکەکاندا بەدی نەدەکرا. ڕەنگ کەژێکی بێ ڕیش بوو و زۆریش لەوە کەم تەمەنتر بوو کە (کا) بۆی چووبوو، پێستێکی سپی و زەردهەڵگەڕاوی مایەی سەرسوڕمان و لووتێکی چەماوەی پێوەبوو. هەتا بڵێی ڕێکپۆش دیار بوو. سەنگینییەکی پێوە دیار بوو کە لە متمانە بەخۆبوونەوە سەرچاوەی دەگرت. چاپەمەنیی لایسیست شینەی وەکو کەسێک وێنا کردبوو کە بە دەستێک تەزبیح و بە دەستەکەی تر چەکی هەڵگرتووە. بە کەسێکی ڕیشن، لادێیی و شەریعەتخوازێکی شەڕانگێزی دادەنا، بەڵام هیچ کام لەم ئاکارانە لە ڕەوش و هەڵوێست و ڕواڵەتیدا بەدی نەدەکرا.

"هەتا سۆپاکە ژوورەکە گەرم نەکات، پاڵتۆکەتان دامەکەنن... پاڵتۆیەکی جوانە. لەکوێ کڕیوتانە؟"

"لە فرانکفورت."

شینە گوتی: "فرانکفورت... فرانکفورت." چاوی بڕییە بنمیچی ژوورەکە و نوقمی بیرکردنەوە بوو. پاشان گوتی کە (سەردەمانێک) بەهۆی بڵاوبوونەوەی بیری دامەزراندنی سیستەمی دەوڵەتێکی بنیادنراو لەسەر بنەمای ئاین، ئەم بە پەرەگرافی ١٦٣ لە یاسای سزادان حکوم دراوە و لەبەر ئەوە بۆ ئەڵمانیا هەڵهاتووە.



بێدەنگییەک باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. (کا) هەستی دەکرد دەبێ چەند شتێک بڵێ بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دۆستانە هەڵسوکەوت بکات، بەڵام لەبەرئەوەی هیچی بە خەیاڵدا نەهات بۆ گوتن، کەمێک شپرزە بوو. هەستی کرد شینە بۆ ئارامکردنەوەی ئەم دەستی بە قسە کرد.

"ئەو کاتانەی لە ئەڵمانیا بووم، لە هەر شارێک سەردانی کۆمەڵە ئیسلامییەکانم بکردایە، لە فرانکفۆرت، لە کۆڵن لە نێوان کلێسای دۆم و وێستگای شەمەندەفەردا، یان لە گەڕەکە دەوڵەمەندنشینەکانی هامبورگ، لە هەر کوێ پیاسەم بکردایە، دوای ماوەیەک ئەڵمانێکم دەبینی و لە خەیاڵی خۆمدا لەوانی ترم جیا دەکردەوە و هەموو هزری خۆم دەخستە سەری. بەلای منەوە گرنگ نەبوو من چۆن بیر لە ئەو دەکەمەوە، بەڵکو خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو کە داخۆ ئەو چۆن بیر لە من دەکاتەوە، تێ دەکۆشام لە چاوی ئەوەوە بڕوانمە ڕواڵەت، قیافەت، هەستان، دانیشتن، هاتوچۆم، مێژووم، لە کوێوە هاتووم، بۆ کوێ دەچم و من کێم. ئەمە هەستێکی زۆر خراپ بوو، بەڵام خووم پێوە گرتبوو، بە چاوی سووک سەیرم نەدەکرد: تێ دەگەیشتم چۆن بە چاوی سووک سەیری براکانم دەکرێ... بەشێوەیەکی گشتی ئەورووپایی بە چاوی سووکەوە سەیری ئەوانی تر ناکەن، بەڵکو ئێمە سەیری ئەوان دەکەین و خۆمان بە کەم دێتە بەر چاو. کۆچ بەتەنیا هەڵهاتن نییە لە دەست زۆردارەکانی نیشتمان، بەڵکو ڕێگایەکیشە بۆ گەیشتن بە قووڵاییی ڕۆحمان. بێگۆمان کۆچکردووان ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر دەگەڕێنەوە بۆ ڕزگارکردنی ئەوانەی کە نەیانتوانیوە نیشتمان بەجێ بهێڵن و بوون بە هاوبەشی تاوانباران. تۆ بۆچی گەڕایتەوە؟"

(کا) بێدەنگ بوو. سادەیی و پەڕپووتیی ژوورەکە، دیوارە ڕەنگ نەکراو و داڕووخاوەکانی و تیشکی بەهێزی گڵۆپی ڕووتی سەر پێخەوەکە کە لە ناو چاوی دەدا، نائارامیان دەکرد.

شینە گوتی: "من نامەوێ بە پرسیار کردن دەربارەی کۆتایی و دنیای ئەودیو بێزارت بکەم. خوداڵیخۆشبوو مەلا قاسم ئەنساری بەر لە هەموو شتێک بەو میوانانەی دەگوت کە لە ماڵەکەی لە ناو هۆزەکەیدا لە قەراغ دیجلە دەچوونە سەردانی: خۆشحاڵ بووم بە ناسینتان، گەلۆ ئێوە سیخوڕی بۆ کێ دەکەن؟"

(کا) گوتی: "بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت..."

شینە لە وەڵامدا گوتی: "ئەوەندەی دەزانم. بەڵام گرنگیدانیان بە قارس تا ڕادەی ئەوەی بگاتە ناردنی کەسێک بۆ ئێرە، منی خستووەتە گومانەوە."

(کا) گوتی: "من خۆبەخشانە ئەم ئەرکەم لە ئەستۆ گرت. بیستبوویشم دۆستی دێرینم موختار و خێزانەکەی لە قارس دادەنیشن."

شینە چاوی بڕیە ناو چاوی (کا) و گوتی: "لە یەک جیابوونەوە، نەتبیستبوو؟"

(کا) گوتی: "دەمزانی." بەتەواوی سوور هەڵگەڕا. ئەو هەستەی لا دروست بوو کە شینە هزری ئەم دەخوێنێتەوە و لەبەر ئەوە ڕقی لێ بووەوە.

"لە ئاسایش موختاریان دارکاری کرد؟"

"کردیان."

شینە بە ڕیتمێکی سەیر گوتی: "ئایا شایەنی دارکاریکردن بوو؟"

(کا) بە پەشۆکاوییەوە گوتی: "نەخێر، بێگومان شایەنی لێدان نەبوو."

"ئەدی بۆ تۆیان دارکاری نەکرد، لە خۆت ڕازیت؟"

"نازانم بۆچی لە منیان نەدا."

شینە گوتی: "دەزانی، بە جەستە و نیگاکانتدا دیارە کە بۆرژوایەکی ئەستەمبوڵیت. گوتوویانە هەبێ و نەبێ ئەمە چەند ناسیاوێکی لەسەرەوە هەیە و کەس نازانێ چی دەقەومێ. دەشزانن هەموو جەستەی موختار هاوار دەکات کە نە ناسیاوی هەیە و نە هێز. موختاریش بۆیە پێی نایە مەیدانی سیاسەتەوە بۆ ئەوەی وەکو تۆ جێی متمانەی ئەوان بێت. وەلێ تەنانەت ئەگەر لە هەڵبژاردنەکانیشدا سەربکەوێ، بۆ ئەوەی بتوانێ لەسەر کورسیی دەسەڵات دابنیشێ، پێویستە بۆیان بسەلمێنێ کەسێکی وایە کە هەموو شەقەکانی دەوڵەتی بە دڵفراوانییەوە پەسەند کردووە. بۆیە لەم سۆنگەیەوە زۆر شادمانە بە دارکاریکردنی."

شینە هیچ پێ نەدەکەنی، بگرە تارماییی خەمێک بە ڕوویەوە دیاربوو.

(کا) گوتی: "هیچ کەسێک دڵخۆش نابێت بە لێدانی." دواتر لەبەردەم شینەدا خۆی



وەکو کەسێکی ئاسایی و ڕووکەش هاتە بەرچاو.

ڕووی شینە وای دەنواند وەکو ئەوەی بڵێ کاتی ئەوە هاتووە بێینە سەر کرۆکی مەبەست. بە (کا)ی گوت: "چاوت کەوتووە بە خێزانی ئەو کچانەی کە خۆیان کوشتووە. بۆچی چوویتە دیدەنیی ئەوانە؟"

"گوتم بەڵکو وتارێک لەسەر ئەو بابەتە بنووسم."

"لە ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوادا؟"

(کا) لەناکاو و بە فیزەوە گوتی: "بۆ ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا." لە ڕاستیشدا هیچ ناسیاوێکی نەبوو بۆ ئەوەی وتارێکی لە ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانیدا بۆ بڵاو بکاتەوە. پاشان بە پەشیمانییەوە لێی زیاد کرد و گوتی: "لە تورکیاش بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت."

شینە گوتی: "هەتا ڕۆژئاواییەکان نەیەنە پێشەوە، ڕۆژنامە تورکییەکان بایەخ بە ئێش و ئازاری میللەتەکەی خۆیان نادەن. نووسین دەربارەی هەژاری و دیاردەی خۆکوژی بە شوورەیی دەزانن و وەکو شتێکی ناهاوچەرخ مامەڵەی لەتەکدا دەکەن. کەواتە تۆیش ناچار دەبیت وتارەکانت لە ئەورووپا بڵاوبکەیتەوە. منیش بۆ ئەم مەبەستە ویستم بتبینم: بە قوربانت بم نە لە ناوخۆ و نە لە دەرەوە لەسەر ئەو کچانە مەنووسە کە خۆیان دەکوژن. خۆکوژی گوناهێکی گەورەیە! ئەم نەخۆشییە هەتا بایەخی پێ بدرێ، زیاتر تەشەنە دەکات. بەتایبەتیش بانگەشەی ئەوەی کە ئەو کچەی لەم دواییانەدا خۆی کوشتووە، خوداپەرست بووە و لە پێناوی سەرپۆشدا تێ کۆشاوە، لە ژەهر کوشندەترە."

(کا) گوتی: "بەڵام ئەوە ڕاستە، کچەکە بەر لەوەی خۆی بکوژێ، دەستنوێژی گرتووە و نوێژی کردووە. ئێستایش ئەو کچانەی کە لە پێناوی سەرپۆشەکانیاندا تێ دەکۆشن، زۆر ڕێزی لێ دەگرن."

شینە گوتی: "کچێک خۆی بکوژێ، تەنانەت مسوڵمانیش نییە! باوەڕیش ناکرێ لە پێناوی سەرداپۆشیندا تێ کۆشابێت. ئەگەر ئەم هەواڵە درۆیە بڵاوبکەیتەوە، ئەوا لە ناو کچانی تێکۆشەر لە پێناوی سەرپۆشدا بانگەشەی ئەوە بڵاودەبێتەوە کە لە

لادەرانی نێوان خۆیان، لە دەبەنگە باروکە لەسەرەکان، لە پۆلیس و گوشاری دایکان و باوکانیان دەترسن. ئایا تۆ بۆ ئەمە هاتووی بۆ ئێرە؟ هانی کەس مەدە بۆ خۆکوشتن. ئەم کچانە کە لە نێوان خۆشەویستیی خودا و خێزان و قوتابخانەدا گیریان خواردووە، هێندە بەدبەخت و تەنیان کە هەموویان ئامادەن لاساییی ئەو خۆشەویستە خۆکوشتووەیان بکەنەوە."

"جێگری پارێزگاریش داوای لێ کردم لە رووپۆشکردنی دیاردەی خۆکوشتندا لە قارس زیادەڕۆیی نەکەم."

"جا بۆ چ مەبەستێک چاوت بە جێگری پارێزگار کەوت؟"

"لەگەڵ کاربەدەستانی پۆلیسیشدا قسەم کرد بۆ ئەوەی بە درێژاییی رۆژ بێزارم نەکەن."

شینە گوتی: "ئەوانە بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە هەواڵی (کچانی سەرداپۆشراوی دەرکراو لە قوتابخانە خۆیان دەکوژن) دەکەن."

(کا) لە وەڵامدا گوتی: "من ئەوەی دەیزانم، دەینووسم."

"ئەم قسەیەت بەتەنیا پارێزگارە لایسیستەکەی دەوڵەت ناگرێتەوە، بەڵکو رووی منیش دەگرێتەوە. سەرباری ئەوەیش دەتەوێ پێم بڵێی کە (نە پارێزگاری لایسیست و نە ئیسلامی سیاسی نایانەوێ لەسەر خۆکوشتنی کچان بنووسی؟)"

"بەڵێ."

"ئەو کچە لەبەر دەرکردنی لە قوتابخانە نا، بەڵکو بەهۆی کێشەی ئەڤیندارییەوە خۆی کوشت. ئەگەر رووداوێکی ئاساییی خۆکوشتن لە پێناو ئەویندا وەکو لاوازیی کچانی سەرداپۆشراو لە قەڵەم بدەی، ئەوا ئیسلامییەکانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانتان لێ زیز دەبن. قارس شارێکی بچووکە."

"من لای خۆمەوە ئەمە لەو کچانە دەپرسم."

شینە گوتی: "زۆر باش دەکەی! ئادەی جارێک لەو کچانە بپرسە بزانە ئەوان رازی دەبن لە رۆژنامەکانی ئەڵمانیادا بنووسرێ کە لە تێکۆشانیاندا بۆ سەرداپۆشین لە



پێناوی رەزامەندیی خودادا بەرگە ناگرن و خۆیان دەکوژن و بە گوناهباری دەمرن."

(کا) کەللەڕەقانە گوتی: "دەپرسم." بەڵام ترسیشی لێ نیشتبوو.

شینە گوتی: "بۆیە ناردم بە دووتدا بۆ ئەوەی شتێکی تریشت پێ بڵێم. کەمێک لەمەوبەر بەرێوەبەری پەیمانگای پەروەردە درایە بەر گوللە... ئەوە ئەنجامی تووڕەییی مسوڵمانانە لە بەرامبەر گوشاری دەوڵەت بۆ سەر کچانی سەرپۆش بەسەر. بەڵام هەڵبەتە رووداوەکە رەفتارێکی ئاژاوەگێرانەی دەوڵەتە. لە سەرەتادا بەرێوەبەری بەستەزمانیان وەکو ئامێرێکی زۆرداری بەکارهێنا، پاشان بۆ ئەوەی تاوانەکە بە مسوڵمانانەوە بلکێنن، بەدەستی شێتێک بە کوشتیان دا."

(کا) وەکو رۆژنامەنووسێکی وردەکار لێی پرسی: "ئایا رووداوەکەتان پێ باشە، یان ڕیسوای دەکەن؟"

شینە گوتی: "من لە پێناوی سیاسەتدا بۆ قارس نەهاتووم، من هاتووم بۆ پێشگرتن بە دیاردەی خۆکوشتن لەم شارەدا." لەناکاو هەردوو شانی (کا)ی گرت و لە خۆی نزیک کردەوە و روومەتەکانی ماچ کرد و پێی گوت: "تۆ دەروێشێکی کە تەمەنی خۆی بە شیعر بەخشیوە. نابی بە ئامێری ئەوانەی خراپە دەرهەق بە مسوڵمانان و لێقەوماوان دەکەن. هەروەک چۆن من متمانەم بە تۆ کرد، تۆیش بە منت کرد و بەناو ئەم بەفرەدا هاتی بۆ لام. دەمەوێ لەبری سوپاسکردن، بەسەرهاتێکی واتادارت بۆ بگێڕمەوە." بە رێتمێکی نیوە شانۆیی و نیوە ئاسایی نیگای بڕیە ناو چاوەکانی (کا) و گوتی: "بیگێڕمەوە؟"

"بیگێڕەوە."

"لە زەمانی زۆر کۆندا، لە ئێران قارەمانێکی بێ هاوتا و جەنگاوەرێکی ماندوونەناس هەبوو. هەموو کەسێک دەیناسی و خۆشی دەویست. با ئێمەش وەکو ئەو کەسانەی لەو سەردەمەدا خۆشیان دەویست، بڵێین ناوی رۆستەم بوو. رۆستەم رۆژێک لە کاتی راودا رێی لێ وێڵ دەبێت کە شەویشی بەسەردا دێت و خەوی لێ دەکەوێ، ئەسپەکەی ون دەبێت. بەدەم گەڕانەوە بەدوای ئەسپەکەیدا کە ناوی رەخش بوو، دەچێتە خاکی دوژمن، واتە خاکی تووڕانەوە. بەڵام لەبەرئەوەی ناوبانگی بەر لە

خۆی بە ئەوێ گەیشتبوو، ناسرایەوە و هەڵسوکەتێکی باشی لەگەڵدا کرا. دوای نانخواردن دەچێتە ژووری حەسانەوە، لەو کاتەدا کچی شا دەچێتە لای، ئەڤینی خۆی بۆ بەیان دەکات و پێی دەڵێ کە دەیەوێت منداڵێکی لێ ببێ. بە جوانییەکەی و زمانی لووسی، ڕۆستەم لە خشتە دەبات، پێکەوە دەنوون. بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ڕۆستەم قۆڵبەستێک بۆ ناسینەوەی منداڵەکەی جێ دەهێڵێ و بۆ وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە. کوڕەکەی –ئەوان ناویان ناوە زۆراب و با ئێمەیش هەروا ناوی بێنین– کاتێک دوای سالآنێکی درێژ تێ دەگات کە کوڕی ڕۆستەمی پاڵەوانی داستانە، دەڵێ: "ڕوو لە ئێران دەکەم، کەیکاوسی شای زۆردار لە تەخت دێنمە خوارەوە و باوکم دەخەمە جێگای... پاشان دەگەڕێمەوە بۆ توووران، شا ئەفراسیابی شای زۆرداری توورانیش وەکو کەیکاوس لە تەختی پاشایەتی دێنمە خوارەوە و خۆم تاجی پاشایەتی لەسەر دەکەم! ئەو کاتە ڕۆستەمی باوکم و خۆم، ئێران و توووران، واتە هەموو جیهان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بەڕێوە دەبەین!" ئەمە گفت و بیرکردنەوەی زۆرابی سادە و نیازپاک دەبێت، بەڵام هێشتا تێ نەگیشتبوو کە دوژمنەکانی چەند قرێژ و تەڵەکەبازن. شای توووران شا ئەفراسیاب سەرەڕای ئەوەی نیازی زۆرابی بۆ ئاشکرا دەبێ، بەبیانووی شەڕی دژ بە ئێران پشتیوانیی لێ دەکات، بەڵام کۆمەڵێک سیخوڕ دەخاتە ناو سوپاوە بۆ ئەوەی نەهێڵن زۆراب ڕۆستەمی باوکی بناسێتەوە. دوای فڕوفێڵ، دەسیسە، گەمەی چارەنووسی بەد و ڕێکەوتە نهێنییەکانی یەزدانی پەروەردگار ڕۆستەمی داستان و زۆرابی کوڕی دێنە مەیدانی جەنگ و ڕیزی سوپا لە پشتیانەوە ڕادەوەستێ. ئەمان لەبەرئەوەی زرێیان پۆشیوە، یەکدی ناناسنەوە و مەیدان لە یەکتری دەگرن. ڕۆستەم بۆ ئەوەی جەنگاوەرەکەی بەرامبەری فریا نەکەوێ هێزی خۆی کۆ بکاتەوە، بێ ئەوەی بزانێ کێیە، هەڵمەتی بۆ دەبات. زۆرابیش کە چاوەکانی لە دانانی باوکی لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران هیچ شتێکی تری نەدەبینی، هیچ باکی نەبوو لە بەرامبەر کێدا دەجەنگێ. بەمجۆرە ئەم دوو جەنگاوەرە دڵفراوان و گەورەیە، ئەم باوک و کوڕە، لە یەکتر دێنە پێشێ، شمشێر هەڵدەکێشن و سەربازەکانیش لە پشتیانەوە سەیریان دەکەن."

شینە بێدەنگ بوو. بێ ئەوەی سەیری ناو چاوی (کا) بکات، منداڵ ئاسا گوتی:



"هەرچەندە سەدان جاریش ئەم داستانەم خوێندووەتەوە، بەڵام کە دەگاتە ئەم شوێنە، دڵم دەلەرزێ و لێدانی زیاد دەکات. بۆچی؟ نازانم، سەرەتا خۆم لەگەڵ زۆرابدا بەراورد دەکەم لە کاتێکدا کە خەریکە باوکی خۆی دەکوژێ. کێ هەیە بخوازێ باوکی خۆی بکوژێ؟ کام ڕۆح خۆی لەبەر ئازاری ئەم تاوانە و باری ئەم گوناهەدا ڕادەگرێ؟ بە تایبەتیش زۆرابی دڵ بچووک کە جاروبار خۆم دەخەمە جێگای ئەو! ئەگەر وابێت، باشترین ڕێباز بۆ کوشتنی باوکی ئەوەیە، بێ ئەوەی بیناسێتەوە، بیکوژێ."

"لە کاتێکدا من لەم بیرکردنەوانەدام، هەردوو جەنگاوەری زرێپۆش دەست بە شەڕ دەکەن و دوای چەندین سەعات یەکتر هێنان و بردن، یەکتریان بۆ نابەزێندرێ و بە برینداری پاشەکشە دەکەن. سەرلەئێوارەی ڕۆژی یەکەم بەقەد ئەوەی خەیاڵم لای زۆرابە، هێندەش دەچێتە لای باوکی و کاتێکیش پاشماوەی داستانەکە دەخوێنمەوە، هەروەکو ئەوەی یەکەم جارم بێت، بە گەشبینییەوە خۆزگەی ئەوە دەخوازم کوڕ و باوک یەکتر نەبەزێنن، بەڵکو بە ئاشتی لەم کارە بێنە دەرێ."

"لە ڕۆژی دووەمدا دیسان سوپاکان لە بەرامبەر یەکتر ڕادەوەستن، هەمدیسان کوڕ و باوکی زرێپۆش لە یەکتر دێنە پێشەوە و فرە بێبەزەییانە دەکەونە وێزەی یەکتری. دوای هێنان و بردنێکی زۆر ئەو ڕۆژە بەخت –جا توخودا ئەوە بەختە؟– بەدەم زۆرابەوە پێ دەکەنێ و ڕۆستەم لە ئەسپ دەخاتە خوارەوە و دەینێتە ژێر. خەنجەر هەڵدەکێشێ و خەریک دەبێت بەمەبەستی کوشتن، لە دڵی باوکی بچەقێنێ. لەو کاتەدا کەسێک دەگاتە سەریان و دەڵێ: "لە ئێران باو نییە لە یەکەم جاردا سەری جەنگاوەری دوژمن بپەڕێندرێ. مەیکوژە، با نەبێتە هۆڤێتی." زۆرابیش باوکی ناکوژێ."

"کاتێک زیاتر دەخوێنمەوە و دەگەمە ئێرە، هەمیشە هۆشم ئاڵۆز دەبێ. دەروونم پڕ دەبێ لە خۆشەویستی بۆ زۆراب. لە خۆم دەپرسم گەلۆ واتای ئەو چارەنووسە چییە کە خودا بە گونجاوی دەزانێ بۆ باوک و کوڕ؟ ڕۆژی سێیەم بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی پڕ لە پەرۆشمەوە، مەیدانبازی لەناکاو کۆتایی پێ دێ. ڕۆستەم، زۆراب لە ئەسپەکەی دێنێتە خوارێ، خەنجەر لە سینەی دەچەقێنێ و دەیکوژێ. ڕووداوەکە چەندە خێرا و ترسناکە، هێندەیش سەرسوڕهێنەرە. کاتێک ڕۆستەم بە

قۆڵبەستەکەدا بۆی دەردەکەوێ کە کوڕەکەی خۆی کوشتووە، دەکەوێتە سەر ئەژنۆ، لاشەی خوێناویی زۆراب لە ئامێز دەگرێ و دەست بە گریان دەکات."

"کاتێک دەگەمە ئەم بەشەی داستانەکە، منیش دەست بە گریان دەکەم. من لە هاوخەمی نواندن بۆ ڕۆستەم زیاتر، بۆ واتای مردنی زۆرابی بەلەنگاز و ڕەبەن دەگریم. زۆراب کە بە هەوای خۆشەویستیی باوکی ملی ڕێ دەگرێ، بەدەستی باوکی دەکوژرێ. هەمیشە بە ستایشەوە بۆ ئەو خۆشەویستییە دەڕوانم کە زۆرابی دڵفراوان بۆ باوکی هەیەتی، بەڵام لێرەدا هەستێکی قوڵتر و کامڵتر بەرانبەر بە ئازاری پڕ ویقاری ڕۆستەم کە لە سۆنگەی ڕێسا و دابوونەریتەوەیە، بەسەر ئەو ستایشەمدا زاڵ دەبێت. بەدرێژاییی داستانەکە خۆسەویستی و ستایشم بۆ زۆرابی یاخیبوو و تاکڕەو سەر دەکات و ڕۆستەمی بەهێز و خاوەن لێپرسراوێتیش دەگرێتەوە."

کاتێک شینە چرکەساتێک بێدەنگ بوو، (کا) ئیرەییی پێ برد کە بە بڕوایەکی هێندە بە تینەوە بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە، جا هەر بەسەرهاتێک بێت.

شینە گوتی: "جا من ئەم داستانەم لەبەر ئەوە بۆت نەگێڕایەوە تاکو نیشانت بدەم کە چ واتایەکی بە ژیانم بەخشیوە، بەڵکو لەبەرئەوەی لەبیر کراوە. هەر نەبێ ئەم داستانە لە شانامەی فیردەوسیدا هەیە. سەردەمانێک ملیۆنان کەس لە تەورێزەوە تا ئەستەمبوڵ، لە بۆسناوە هەتا ترابزۆن دەیانزانی و بە یادیان دەهێنایەوە و لە واتای ژیانی خۆیان تێ دەگەیشتن، ڕێک وەکو ئەوەی ئەمڕۆ چۆن لە ڕۆژئاوادا سەیری (کوشتنی باوک)ی ئۆدیب یاخۆ (تەخت و مردن)ی ماکبێس دەکرێ. بەڵام ئێستا هەمووان، بەهۆی شەیداییی ڕۆژئاواوە ئەم داستانەیان لەبیرکردووە. داستانە کۆنەکان لە کتێبی قوتابخانەکان دەرهێندراون. ئەمڕۆ لە ئەستەمبوڵدا تەنانەت یەک کتێبخانەیش نییە کە شانامە بفرۆشێ! بۆچی؟"

کەمێک بێدەنگ بوون.

شینە گوتی: "تۆ ئێستا وا بیر دەکەیتەوە کە ئایا جوانیی ئەم داستانە ئەوە دێنێ مرۆڤی لە پێناودا بکوژرێ؟ وا نییە؟"

(کا) گوتی: "نازانم."

شینە گوتی: "کەواتە بیری لێ بکەرەوە." ئەمەی گوت و لە ژوورەکە چووە دەرێ.



# ٩

## بمبەخشن، ئایا ئێوە ئەتایستن؟

### بێباوەڕێک کە نایەوێ خۆی بکوژێ

دوای ئەوەی شینە لە ژوورەکە چووە دەرێ، (کا) ماوەیەک بێ بڕیار مایەوە. سەرەتا وای بۆچوو کە شینە هێندەی پێ ناچێ دەگەڕێتەوە و پرسیاری ئەو بابەتەی لێ دەکات کە داوای لێ کردبوو (بیری لێ بکاتەوە!) بەڵام پاش کەمێک بۆی ڕوون بووەوە دۆخەکە بەو جۆرە نییە کە ئەو بۆی چووە: کابرا پەیامێکی ئاراستە کردووە کە ئەگەرچی بۆ خۆدەرخستن بێ و کەمێک سەیریش بێت. تۆ بڵێی ئەمە هەڕەشەیەک بووبێ؟

ئەوەی ڕاستی بێ، (کا) لەو ماڵەدا لە کەسێکی هەڕەشەلێکراو زیاتر، هەستی بەنامۆیی دەکرد. نەیتوانی لە ژوورەکەی ئەودیودا منداڵە ساواکە و دایکەکەی ببینێتەوە، بێ ئەوەی کەس چاوی پێوە بێ، لە دەرگای ماڵەکە چووە دەرەوە. لە دڵەوە ئارەزووی دەکرد بە پلیکانەکاندا ڕابکاتە خوارەوە.

بەفرەکە هێندە لەسەرخۆ و بە کپی دەباری، بەجۆرێک (کا) وای بۆچوو کە کلووە بەفرەکان لە هەوادا هەڵواسرابن. ئەم کپییە هەستێکی وای لەکن (کا) خوڵقاند وەکو ئەوەی کات لە شوێنی خۆی مەیی بێ، وای بە زەیندا هات زۆر شت گۆڕاوە و کاتێکی زۆر تێ پەڕیوە؛ ئەمە بەمەرجێک دیدارەکەی لەگەڵ شینەدا تەنیا بیست خولەکی خایاندبوو.

بەهەمان ڕێگادا کە لێوەی هاتبوو، بەدرێژایی هێڵی ئاسنینی شەمەنەفەرەکە و بەلای سایلۆکەدا کە لە ژێر بەفردا لە سێبەرێکی زەبەلاح و سپی دەچوو، گەڕایەوە بۆ وێستگاکە. لەو دەمەیدا بەناو وێستگا قرێژ و بۆشەکەدا تێ دەپەڕی، سەرنجی دا وا سەگێک لێی نزیک دەبێتەوە و دۆستانە کلکی بۆ دەلەقێنێ. سەگێکی ڕەش بوو، بەڵام پەڵەیەکی سپی بە ناوچەوانییەوە بوو. (کا) سێ لاوی بینی کە لە هۆڵی چاوەڕوانیی

وێستگاکەدا سەمونیان فڕێ دەدایە بەردەم سەگەکە. یەکێکیان نەجیب بوو، بەر لە هاوڕێکانی پێی هەڵگرت و خۆی گەیاندە لای (کا) و پێی گوت: "دەستم دامێنتان با هاوڕێ قوتابییەکانم هەست نەکەن کە من چۆن زانیومە ئێوە لێرەوە تێ دەپەڕن. هاوڕێیەکی زۆر نزیکم گەرەکیەتی پرسیارێکی فرە گرنگتان لێ بکات. ئەگەر کاتتان هەبێ و خولەکێک بۆ فازیل تەرخان بکەن، ئەوا زۆر دڵخۆش دەبێت."

(کا) گوتی: "باشە." ڕووی لەو کورسییە کرد کە دوو لاوەکە لەسەری دانیشتبوون. لە پۆستەرەکانی پشت سەریانەوە ئەتاتورک گرنگی و بایەخی هێڵی شەمەنەفەری دەهێنایەوە یاد، دەوڵەتیش ئەو کچانەی دەترساند کە نیازی خۆکوشتنیان هەیە. هەردوو لاوەکە هەستانە سەرپێ و دەستی (کا)یان گوشی. هەردووکیان شەرم دایگرتن.

نەجیب گوتی: "بەر لەوەی فازیل پرسیارەکەی بکات، مەسعوود دەیەوێت بەسەرهاتێک بگێڕێتەوە کە خۆی بیستوویەتی."

مەسعوود بە شڵەژانەوە گوتی: "نەخێر، نایگێڕمەوە. تکایە تۆ لەبری من بیگێڕەوە."

نەجیب دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کرد و (کا)یش بەدەم گوێگرتنەوە سەیری سەگە ڕەشەکەی دەکرد کە بەدەم کلک بادانەوە لە وێستگا پۆخڵ و بۆش و نیوە تاریکەکەدا ڕای دەکرد.

"بەسەرهاتەکە لە یەکێک لە ئامادەییەکانی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی ئەستەمبوڵ ڕووی داوە و منیش هەروام بیستووە." نەجیب بەمجۆرە دەستی بە گێڕانەوە کرد: "بەڕێوەبەرێکی ناقۆڵای یەکێک لە ئامادەییەکانی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی قەراغ ئەستەمبوڵ بۆ کارێکی پەیوەست بە پۆستەکەی، دەچێتە یەکێک لەو باڵەخانە بەرزانەی کە تازە بنیادنراون و ئێمە لە تەلەفزیۆندا دەیانبینین. سواری ژوورکێشێکی گەورە دەبێت و دەچێتە سەرەوە. کەسێکی تری بالابەرز و بە تەمەن لە بەڕێوەبەر بچووکتر کە کتێبێکی بەدەستەوە دەبێ و لە ژوورکێشەکەدا دەبێ، لێی نزیک دەبێتەوە و کتێبەکەی نیشان دەدات. بۆ کردنەوەی لاپەڕەکانی، چەقۆیەکی دەسک گەوهەر لە گیرفانی دەردێنێ و چەند شتێک دەڵێ. کاتێک دەگەنە نهۆمی نۆزدەیەم، بەڕێوەبەر دادەبەزێ، بەڵام ڕۆژانی دواتر دەست بە





گۆڕانێکی سەیر دەکات لە خۆیدا. لە مردن دەترسێ، نایەوێ هیچ بکات و بەردەوام بیر لە کابرای ناو ژوورکێشەکە دەکاتەوە. بەڕێوەبەر لەبەرئەوەی پیاوێکی زۆر باوەڕمەند و ئاینپەروەر دەبێ، بۆ گەڕان بەدوای چارەکەیەکدا بۆ ئەم دەردەی، سەر لە تەکیەی (جەراحی) دەدات. شێخێکی ناودار پاش ئەوەی هەتا بەرەبەیان گوێ لە ڕازی دڵی دەگرێ، دەردەکەی دەستنیشان دەکات و پێی دەڵێ: "باوەڕت بە خودا لە دەست داوە، خۆت هەستی پێ ناکەیت، کەچی سەرباری ئەوە بوغرا بوویت! ئەم بەلایە لە کابرای ناو ژوورکێشەوە دەربازی تۆ بووە. تۆ بوویت بە ئەتایست." هەرچەندە بەڕێوەبەر بە چاوی پڕ لە گریانەوە هەوڵ دەدات نکۆڵی بکات، بەڵام بە بەشێکی دڵی کە هێشتا خاوێنە، حاڵی دەبێت کە فەرمودەکانی جەنابی شێخ هەموو ڕاستن. کار گەیشتە ڕادەیەک دەست بۆ کچە قوتابییە دڵگیرەکان درێژ بکات، تێ بکۆشێ بەتەنیا لەگەڵ دایکانی قوتابیاندا بمێنێتەوە و پارەی مامۆستایەک کە ئێرەیی پێ دەبرد، بدزێ. بەڕێوەبەر سەرەڕای تاوانەکانی، کەچی شانازیی بەخۆیەوە دەکرد: هەموو قوتابیان و مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانەکە کۆدەکاتەوە و دەڵێ کە مرۆڤەکان بەهۆی گیرۆدەبوونیان بە بیر و باوەڕی تاریک و دابوونەریتی تووڕەهات وەکو ئەو ئازاد نین، دەڵێ کە هەموو شتێک ئازادە، لێکدالێکدا وشەی ڕۆژئاوایی دەخزێنێتە ناو قسەکانیەوە و بەو پارانەی کە دزیونی، جوانترین جلوبەرگی ڕۆژئاوایی دەسێنێ و دەیانپۆشێ. لە سۆنگەی هەڵوێستێکەوە کە خەڵکانی تر بە کەم و دواکەوتوو دادەنێ، ئەم ڕەفتارانەی لێ دەوەشێتەوە. قوتابیان، لە ئاکامی ئەم ڕەفتارانەدا لاقەی کچە قوتابییەکی هاوپۆلی خۆیان دەکەن، مامۆستای بەسالاچووی دەرزی قورئان دارکاری دەکەن و یاخی دەبن. لەلایەکی تر، بەڕێوەبەر لە ماڵەوە پەنا بۆ گریان دەبات و دەیەوێت خۆی بکوژێ، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوەندە بوێر نابێ کارێکی وای لە دەس بێ، چاوەڕێ دەکات خەڵکانی تر بیکوژن. بۆیە لای باوەڕمەندترین قوتابیی قوتابخانەکە -حاشا- قسەی سووک بە حەزرەتی پەیامبەر دەڵێ، بەڵام لەبەرئەوەی عەقڵی لە دەست داوە، قوتابیان دەستی لێ ناوەشێنن. دەچێتە سەر شەقامەکان و بانگ دەکات -حاشا- خودا نییە، پێویستە مزگەوتەکان بکرێن بە دیسکۆ، بانگ دەکات و دەڵێ ئێمە کاتێک وەکو ڕۆژئاواییەکان

دەوڵەمەند دەبین کە هەمووماں ببین بە دیان. لاوانی ئیسلامی دەیانەوێ دەستی لێ بوەشێنن، بەڵام ئەم نیازەی خۆیان پەردەپۆش دەکەن. کاتێک چارەیەک بۆ بەدبەختیی خۆی و خۆکوشتن نابینێتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ هەمان باڵەخانە، لە ژوورکێشەکەدا هەمان کابرای باڵابەرزی لێ پەیدا دەبێتەوە. کابرا بە پێکەنینەوە لە بەڕێوەبەر دەگەیەنێ کە ئاگاداری هەموو بەسەرهاتەکانێتی و بەرگی کتێبەکەی دەستی نیشان دەدات، دەرمانی دەردی خودانەناسیش هەر لەو کتێبەدا دەبێت. بەڕێوەبەر دەستی لەرزۆکی بۆ کتێبەکە درێژ دەکات، بەڵام کابرای باڵابەرز بەر لە ڕاوەستانی ژوورکێشەکە، چەکۆ دەسک گەوهەرینەکەی دەکاتەوە و لە دڵی بەڕێوەبەری دەدات."

پاش ئەوەی نەجیب لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە بووەوە، (کا) بیری کەوتەوە کە تورکە ئیسلامییەکانی ئەڵمانیایش لە ناو خۆیاندا بەسەرهاتێکی هاوشێوەی ئەمەیان دەگێڕایەوە. نەجیب چیرۆکی کتێبە پڕ لە ڕازەکەی کۆتاییی بەسەرهاتەکەی بەداخراوی هێشتەوە، بەڵام مەسعوود ناوی چەند نووسەرێکی هێنا کە پێشتر بەر گوێی (کا) نەکەوتبوون و یەک دوو جووشیان تێدابوو -یەکێکیان دوای سێ ساڵ کوژرا- گوتی کە ئەوانە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن بەرەو خودانەناسی و دوژمنی سەرەکیی ئیسلامی سیاسین.

مەسعوود گوتی: "چەندین ئەتایستی بەدبەختی وەکو بەڕێوەبەری ناو ئەم بەسەرهاتە کە ئیبلیس لە خشتەی بردوون، لە نێوانماندا هەن کە بەدوای بەختەوەری و سەقامگیریدا دەگەڕێن. ئایا ئێوەیش ڕاتان وایە؟"

"نازانم."

مەسعوود کەمێک بە هەڵچوونەوە گوتی: "چۆن نازانن، مەگەر ئێوەش ئەتایست نین؟"

(کا) گوتی: "نازانم."

"دە کەواتە وەڵامم بدەنەوە: ئایا باوەڕتان بەوە هەیە کە سەرانسەری ئەم گەردوونە، هەموو شتێک، ئەو بەفرەی کلوو کلوو لە دەرەوە دەبارێ، خوڵقێنراوی یەزدانی باڵانشینە، ئایا باوەڕتان پێ هەیە؟"



(کا) گوتی: "بەفر خودا دینێتەوە بیرم."

مەسعوود بڕێکی تری نا بە پرسیارەکەیەوە گوتی: "بەڵێ، بەڵام باوەڕتان بەوە هەیە کە بەفر خوڵقێنراوی خودایە؟"

بێ دەنگییەک هاتە گۆڕێ. (کا) تەماشای کرد وا سەگە ڕەشەکە لە دەروازەی وێستگاکە چووە دەرێ و لە ژێر تیشکی زەردی لامپاکان و بەسەر بەفرەکەدا سەرمەستانە ڕادەکات.

مەسعود گوتی: "وەڵام نادەیتەوە، مرۆڤ ئەگەر خودا بناسێ و خۆشی بوێت، هەرگیز لە بوونی ناکەوێتە گومانەوە. ئەمەش واتای ئەوەیە کە تۆ خودانەناسی، بەڵام لە بەر ئەوەی شەرم دەکەیت، نایدرکێنی. ئێمە خۆمان ئەمەمان دەزانی. بۆیە دەمەوێ بەناوی فازیلەوە ئەمەت لێ بپرسم: ئایا تۆیش وەکو ئەو ئەتایستە بەلەنگازەی ناو بەسەرهاتەکە ئازار دەچێژی، ئایا دەتەوێ خۆت بکوژی؟"

(کا) گوتی: "چەندێ کەموکوڕیشم هەبێت، من لە خۆکوشتن دەترسم."

فازیل گوتی: "لەبەر کام هۆ؟ لەبەرئەوەی دەوڵەت دەڵێ مرۆڤ شاکاری داهێنانەکانی خودایە و خۆکوشتنی قەدەغە کردووە؟ ئەوان ئەوەش بەهەڵە تێ گەیشتوون کە مرۆڤ شاکارە. تکایە پێمان بڵێ بۆچی لە خۆکوشتن دەترسن؟"

نەجیب گوتی: "تکایە پێداگرتنی هاوڕێکانم بە سنگ فراوانییەوە پەسەند بکە. ئەم پرسیارە واتایەکی زۆر تایبەتی هەیە بۆ فازیل."

فازیل گوتی: "واتا ئەگەر خۆت لەبەرانبەر بەدبەختی و نائارامیدا بۆ ڕانەگیرێ، ئایا خۆت دەکوژی؟"

(کا) بە کەمێک تووڕەبوونەوە گوتی: "نەخێر."

مەسعوود گوتی: "تکایە هیچمان لێ مەشارنەوە، ئێمە نیازی خراپەکاریمان نییە لەگەڵتاندا لە سۆنگەی ئەوەی کە ئەتایستن."

بێدەنگییەکی ئاڵۆز ئەو ناوەی داگرت. (کا) هەستایە سەرپێ. نەیدەویست بەهیچ جۆرێک وا خۆی نیشان بدات کە ترسی لێ نیشتووە. کەوتە ڕێ.

فازیل گوتی: "ئەوە دەڕۆن، ڕاوەستن تکایە، مەڕۆن." کە (کا) ڕاوەستا، ئەویش بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت.

نەجیب گوتی: "من لەبری ئەو دەیگێڕمەوە، ئێمە هەرسێکمان ئەوینداری ئەو کچانەیەن کە ژیانی خۆیان لە پێناوی بیر و باوەڕیاندا خستووەتە مەترسییەوە. چاپەمەنیی لایسیست دەستەواژەی (کچانی سەرداپۆشراو) بۆ ئەو کچانە بەکاردەبات. ئەوان بەلای ئێمەوە کچانی مسوڵمانن و پێویستە هەموو کچانی مسوڵمانیش لە پێناوی بیر و باوەڕیاندا ژیانیان بخەنە مەترسییەوە."

فازیل گوتی: "کوڕانیش بەهەمان شێوە."

نەجیب گوتی: "بێگومان، من ئەوینداری هیجرانم، مەسعوود، خەندەی خۆش دەوێت، فازیلیش دڵی لە تەسلیمە چووبوو، بەڵام تەسلیمە مرد، یاخۆ خۆی کوشت. بەڵام ئێمە باوەڕ ناکەین کچە مسوڵمانێک کە ئامادەبێ هەموو ژیانی بکاتە قوربانیی باوەڕەکەی، خۆی بکوژێ."

(کا) گوتی: "لەوانەیە لە ژێر ئازارەکاندا خۆی بۆ ڕانەگیرابێ، خێزانەکەیشی زۆریان لێ کردبوو سەری ڕووت بکات و لە قوتابخانەش قاو درابوو."

نەجیب بە هەڵچوونەوە گوتی: "هیچ گوشارێک پاساوی ئەوە نادات کە کەسێکی باوەڕمەند کاری خراپ بکات، ئێمە لە ترسی ئەوەی نەبادا نوێژی بەیانیمان بفەوتێ و گوناهبار بین، شەوان خەو ناچێتە چاومان. هەموو جارێک خێراتر لە جاری پێشوو ڕوو لە مزگەوت دەکەین. کەسێک بەم هەستەوە باوەڕی هێنابێ، هەموو شتێک دەکات بۆ ئەوەی خۆی لە گوناهکاری بەدوور بگرێ، ئەگەر پێویست بکات، ئامادەیە ڕازی بێت لەو پێناوەدا بە زیندوویی پێستی بگروون."

فازیل هەندێکی خستە سەر قسەکانی نەجیب و گوتی: "ئاگادارین کە چاوتان بە خێزانی تەسلیمەش کەوتووە، ئایا ئەوان باوەڕیان وایە کە کچەکەیان خۆی کوشتبێ؟"

"باوەڕ دەکەن. لە پێشدا لەگەڵ دایک و باوکیدا سەیری (ماریانا)ی کردووە، پاشان دەستنوێژی گرتووە و نوێژی کردووە."



فازیل لەسەرخۆ گوتی: "تەسلیمە هەرگیز سەیری ئەڵقەی تەلەفزیۆنی نەدەکرد."

(کا) گوتی: "ئێوە ئەوتان دەناسی؟"

فازیل بە شەرمەوە گوتی: "وەکو کەس، هیچ کاتێک یەکترمان نەناسی و پێکەوە نەدواین، جارێک لە دوورەوە بینیم، زۆر باش خۆی پێچابووەوە. بەڵام بێگومان وەکو ڕۆح دەیناسم: مرۆڤ، ئەو کەسەی ئەوینداری دەبێ، لە هەموو کەس باشتری دەناسێ. وەکو خۆم لە ناخمدا هەست بە ئەویش دەکەم. ئەو تەسلیمەیەی من دەمناسی، مەحاڵە خۆی بکوژێ."

"لەوانەیشە بەتەواوی نەتانناسیبێ."

مەسعوود بە سنگ دەرپەڕاندنەوە گوتی: "لەوانەیشە ڕۆژئاواییەکان تۆیان بۆ پەردەپۆشکردنی مەرگی تەسلیمە بۆ ئێرە ناردبێ."

نەجیب گوتی: "نەخێر، نەخێر، ئێمە متمانەمان پێتان هەیە. گەورەکانمان گوتویانە ئێوە دەروێش و شاعیرن. هەر لەبەرئەوەیش کە متمانەمان پێتان هەیە، پرسیاری بابەتێکتان لێ دەکەین کە ئێمەی زۆر غەمبار کردووە. فازیل بەناوی مەسعوودەوە داوای بەخشینتان لێ دەکات."

فازیل گوتی: "داوای لێبوردن دەکەم." پاشان سوور هەڵگەڕا و فرمێسک ڕژایە چاوی.

مەسعوو د کارێکی وای کرد کە ساتی ئاشتبوونەوەکە بەبێدەنگی تێ پەڕێ.

نەجیب گوتی: "من و فازیل برای گیانی بە گیانیی یەکترین، زۆرجاران هاوکات بیر لەیەک شت دەکەینەوە و هەر یەکەمان دەزانێ ئەوی ترمان بیر لە چی دەکاتەوە. فازیل بە پێچەوانەی منەوە هیچ مەیلی بەلای سیاسەتدا ناچێ. ئێستا ئەو و منیش تکایەکمان لێتان هەیە. لە ڕاستیدا هەردووکمان دەتوانین بڕوا بکەین کە تەسلیمە لە ژێر گوشاری دایکی، باوکی و دەوڵەتدا گوناهی کردووە و خۆی کوشتووە. ئەمە زۆر تاڵ و سەختە. فازیل هەندێ جار وا بیر دەکاتەوە کە (ئەو کچەی خۆشی ویستووە، گوناهی کردووە و خۆی کوشتووە.) بەڵام ئەگەر تەسلیمە خودانەناسێکی نهێنی بووبێ، ئەگەر ئەتایستێکی بەدبەختی وەکو کابرای ناو بەسەرهاتەکە بووبێ و

بەخۆی نەزانیبێ و لەبەر ئەتایستبوونەکەی خۆی کوشتبێ، ئەوا ئەمە بەلای فازیلەوە کارەساتێک دەبێت بۆ خۆی، چونکە ئەگەر وابێ، بەواتا فازیل ئەویندارى ئەتایستێک بووە. تەنیا ئێوە دەتوانن ئەم گومانە قووڵەی هەناومان بڕەوێننەوە و فازیل ئاسوودە بکەن. ئایا تێ گەیشتن بیر لە چی دەکەینەوە؟"

فازیل بە چاوی پڕ لە پاڕانەوە پرسی: "ئایا ئێوە ئەتایستن؟ ئەگەر ئەتایست بن، ئایا دەتانەوێ خۆتان بکوژن؟"

(کا) لە وەڵامدا گوتی: "بگرە ئەگەر ڕۆژگارێک تەواویش لە خودانەناسیی خۆم دڵنیابم، بە پێویستی نازانم پەنا بۆ خۆکوشتن ببەم."

فازیل بە ئاسودەبوونەوە گوتی: "لە پای وەڵامدانەوەی دروستتان زۆر سوپاستان دەکەم. دڵتان پڕە لە میهرەبانی، بەڵام لە باوەڕهێنان بە خودا دەترسن."

(کا) بینی مەسعوود دوژمنکارانە بۆ پێش خۆی دەڕوانێ. ویستی بڕوات. وەکو ئەوەی نیگای گرتبێتە شوێنێکی دوور. هەستی کرد ویستێکی قوڵ و خەیاڵێکی پەیوەست بەو ویستە ناخی داگرتووە، بەڵام بەهۆی جووڵەی دەوروبەرەوە نەیدەتوانی هزری خۆی لەسەر ئەو خەیاڵە چڕ بکاتەوە. ماوەیەک دواتر زۆر بیری لەو ساتانە کردەوە و حاڵی بوو کە سەرچاوەی ئەو خەیاڵەی سەری، تاسەکردنی ئێپەک بووە نەک مردن و نەبوونی توانا بۆ باوەڕهێنان بە خودا. مەسعوودیش لە دوا ساتدا شتێکی تری خستبووە سەر.

نەجیب گوتی: "تکایە بە هەڵە لێمان تێ مەگەن، ئێمە هیچ لاریمان لەوە نییە کەسێک ئەتایست بێ. خودانەناسان لە کۆمەڵی ئیسلامیدا هەمیشە شوێنی خۆیان هەبووە."

مەسعوود گوتی: "بەڵام گۆڕستانەکانیان هەمیشە جیابووە، ناشتنی ئەتایستێک لەهەمان گۆڕستاندا باوەڕمەندان هەراسان دەکات. هەندێ لەو ئەتایستانەی کە بەدرێژاییی ژیانی خۆیان لە شاردنەوەی بێباوەڕیی خۆیاندا سەرکەوتوو بوون، لەسەریان پێویستە نەک هەر لە ژیاندا، بگرە لە گۆڕستانەکانیشدا باوەڕمەندان بێزار نەکەن. وەکو ئەوەی ئازاری هەتا قیامەت ڕاکشان لەپاڵ خودانەناسان لە



هەمان گۆڕستاندا بەس نەبووبێ، پێویستە دوای هاتنە دەرەوەمان لە گۆڕ لە ڕۆژی قیامەتدا، تێ بکۆشین بۆ ڕەواندنەوەی ترسی قوتبوونەوەی ئەتایستێکی شووم لە بەردەممانـدا... شاعیر (کا) بەگ، ئێوە ئیدی ناتوانن نکۆڵی لەوە بکەن کە سەردەمانێک ئەتایست بوون. لەوانەیە ئێستایش هەر وا بن. دە کەوایە پێم بڵێن ئەوەی ئەم بەفرە دەبارێنێ کێیە، نهێنیی ئەم بەفرە چییە؟"

هەموویان لە هەمان چرکەدا نیگایان بڕییە ئەو بەفرەی کە لەبەر ڕۆشناییی گڵۆپە نیۆنەکاندا بەسەر هێڵە ئاسنینە بۆشەکانی شەمەنەفەردا لە دەرەوەی وێستگاکە دەباری.

من لەم جیهانەدا چی دەکەم؟ (کا) ئەم پرسیارەی لە خۆی کرد. کلووە بەفرەکان لە دوورەوە چەند سەرلێشێواو دیارن و ژیانی منیش چەند پەرتەوازەیە؟ مرۆڤ دەژی، پیر دەبێ و دەمرێ. لە سەرێکەوە بیری دەکردەوە کە بوونی نییە، لە سەرێکیشەوە هەستی بە بوونی خۆی دەکرد: خۆی خۆش دەویست، وەکو کلووە بەفرێک بە خۆشەویستی و غەمەوە بەو ڕێیەدا دەڕۆیشت کە ژیان بۆی دەستنیشان کردبوو. باوکی، بۆنێکی دوای تەراشی هەبوو، ئەوەی بیرکەوتەوە. کە یادی ئەو بۆنە لە کەللەی دا، بیرەوەریی گەڕایەوە بۆ پێیە ساردە دەمپیا لە پێکانی دایکی کە لە چێشتخانەکەدا تاشتی ئامادە دەکرد، بۆ شانەیەک، شرووبێکی کۆخەی شیرین و ڕەنگ پەمەیی کە شەوانە دوای بێداربوونەوەی بەدەم کۆخینەوە دەیانکردە قوڕگیەوە، بۆ کەوچکەکەی ناو دەمی، بۆ هەموو ئەو شتە بچووکانەی کە ژیانیان پێک هێنابوو، هەموو شتە پەیوەستەکان بەیەکەوە، بۆ کلووی بەفر...

بەوجۆرە (کا) ئەو بانگە قوڵەی هاتە بەرگوێ کە دەڵێ شاعیرانی ڕاستەقینە لە ژیاندا تەنیا لە ساتەکانی سروش بۆهاتندا دەتوانن بەختەوەر بن. دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵ، یەکەمجار بیرۆکەی شیعرێکی بۆ هات: هێندە لە هەبوون، میلۆدی، لەرینەوە و هێزی ئەم شیعرەی دڵنیا بوو، بەجۆرێک هەموو دەروونی پڕ بوو لە بەختەوەری. بە سێ لاوەکەی گوت کە پەلەیەتی و لە وێستگا چۆڵ و نیمچە تاریکەکە هاتە دەرەوە. بەدەم بیرکردنەوە لەو شیعرەی کە دواتر دەینووسی، بە هەنگاوی خێرا و بەژێر بارینی بەفردا بۆ هوتێلەکەی گەڕایەوە.

# ١٠

## بۆچی ئەم شیعرە جوانە؟

### بەفر و بەختەوەری

(کا) هەر کە گەیشتە ژوورەکەی لە هوتێل، پاڵتۆکەی داکەند. دەفتەرێکی سەوز و لاپەڕە هێڵدار کە لە فرانکفورت کڕیبووی، کردەوە و دەستی کرد بە نووسینەوەی ئەو شیعرەی کە وشە بە وشە بە زەینیدا دەهات. شیعرەکەی هێندە بە ئاسوودەیی دەنووسی هەر وەکو ئەوەی کەسێکی تر وشەکان بە گوێیدا بچرپێنێ، بەڵام هەموو هزری خۆیشی دابووە سەر ئەو بابەتەی کە سەرقاڵی نووسینەوەی بوو. چونکە پێشتر بەو جۆرە و بە بێ ناوبەر شیعری نەنووسیبوو، لە گۆشەیەکی هۆشیدا گومانێک لە بەرامبەر بەهای ئەو شتە دروست بوو کە دەینووسی. بەڵام لەگەڵ نووسینەوەی بەیتەکاندا، بەو لۆژیکەوە بۆ شیعرەکەی دەڕوانی کە شیعرەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە بێ کەموکوڕی و تۆکمەیە، ئەمەیش خرۆش و بەختەوەریی ناو دەروونی ئەوی زیاتر دەکرد. بەمجۆرە، چەند بۆشاییەکی بۆ هەندێک وشە کە وەکو ئەوەی باش بەر گوێی نەکەوتبن، جێ هێشت و بە ئێستێک، سەرجەم سی و چوار نیوە بەیتی نووسی.

شیعرەکەی لەسەر بنەمای چەند شتێک داڕشتبوو کە ماوەیەکی کورت لەوەوبەر لەپڕ بە هۆشیدا هاتبوو: بارینی بەفر، گۆڕستانەکان، سەگە ڕەشەکەی کە بە جۆشەوە بە وێستگاکەدا ڕای دەکرد، یادەوەرییەکانی سەردەمی منداڵی و شێوەی ئیپەک کە لە ڕێی گەڕانەوەیدا بەرەو هوتێل بەدەم هەستێکی تێکەڵ لە بەختەوەری و شڵەژانەوە دەهاتە بەرچاوی. ناوی (بەفر)ی لە شیعرەکەی نا. ساڵانێک دواتر کە بیری لە چۆنێتیی نووسینی ئەم شیعرەی دەکردەوە، کلووە بەفرێکی بە خەیاڵدا دەهات، ئەگەر ئەو کلووە بەفرە گوزارەی لە ژیانی ئەم بکردایە، ئەوا بڕیاری دەدا لەسەر پێویستیی دانانی ئەم شیعرە لە شوێنێکی نزیک لە چەقی کلووە بەفرەکە و لە



سەر خاڵێک کە لۆژیکی ژیان ڕوون بکاتەوە. هەر کوتومت وەکو ئەم شیعرە، زۆر دژوارە بزانرێ تا چەند ئەو بڕیارەی لەو ساتەدا پێکاوە و چەندەیشی ئەنجامی - هەوڵەکانی ئەم کتێبەیە بۆ شیکردنەوە-ی هاوشێوەی شاراوەی ژیانی ئەو.

(کا) لە کاتێکدا خەریک بوو لە نووسینەوەی شیعرەکەی دەبووەوە، هەستایە سەرپێ، بەرەو پەنجەرەکە هەنگاوی نا و بە بێدەنگی نیگای بڕیە کلووی گەورەی بەفر کە لە دەرەوە بە زەرافەتەوە دەباری. دەنگێک لە ناوەوە پێی دەگوت ئەگەر سەیری بەفرەکە بکات، ئەوا بە تەواوی وەکو پێویست کۆتایی بە نووسینەوەی شیعرەکەی دەهێنێ. لە دەرگا درا، (کا) لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا دوایین دوو نیوە بەیتی شیعرەکەی کە خەریکە بوو بۆی دەهات، لە بیر کرد و دواتریش بەدرێژاییی مانەوەی لە قارس، نەکەوتەوە بیری. ئەو کەسەی کە لە دەرگای دا، ئیپەک بوو. بە (کا)ی گوت: "نامەیەکت بۆ هاتووە." و دایە دەستی. (کا) نامەکەی لێ وەرگرت و بێ ئەوەی سەیری بکات، فڕێی دایە گۆشەیەکی ژوورەکە و گوتی:

"زۆر کامەرانم."

ئەو خۆی بڕوای وابوو کە تەنیا کەسێکی ئاسایی دەتوانێ بڵێ "من کامەرانم!" بەڵام ئیدی لەو ساتەدا پەردەی شەرمی دڕاندبوو. بە ئیپەکی گوت: "وەرە ژوورەوە. زۆر جوانی."

ئیپەکیش بەشێوەی کەسێک کە هەموو ژوورەکانی هوتێلەکە وەکو ماڵی خۆی شارەزا بوو، چووە ژوورەوە. (کا) وای بۆچوو کە سەردەمی ڕابردوو ئەوانی زیاتر لەیەکتر نزیک کردبێتەوە.

(کا) گوتی: "نازانم ئەمە چۆن ڕووی دا، لەوانەیە ئەم شیعرەم بەهۆی تۆوە بۆ هاتبێ."

ئیپەک گوتی: "باری تەندروستیی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە زۆر سەخت بووە."

مانەوەی کەسێک لە ژیاندا کە مرۆڤ بە مردووی داناوە، لە خۆیدا هەواڵێکی باشە."

"پۆلیس دەستیان کردووە بە هەڵمەتی پشکنین. بەشەکانی ناوخۆیی زانکۆ و هوتێلەکان دەگەڕێن. هاتنە ئێرەیش، سەیری تۆمارەکانیان کرد و لە یەکە بە یەکەی میوانەکانیان پرسییەوە."

"چیت گوت دەربارەی من؟ پێت گوتن کە ئێمە ژیانی هاوسەری پێکەوە دەنێین؟"

"فرە شیرینی. من داڵغەم بەلای ئەوەوە نەبوو. موختاریان دەستگیر کردووە، دارکارییان کردووە و دواتر مەرەخەسیان کردووە."

"موختار بە مندا پەیامێکی بۆ ناردووی: ئامادەیە هەموو شتێک بکات لە پێناوی دووبارە پێکەوەنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ تۆدا . هەزار جاریش پەشیمانە لەوەی کە بۆ سەرداپۆشین گوشاری بۆ هێناوی."

ئیپەک گوتی: "جا موختار هەموو ڕۆژێک ئەمانە دەدات بە بار گوێمدا . دوای ئازادکردنت لە لایەن پۆلیسەوە، چیت کرد؟"

(کا) گوتی: "بە کوچە و کۆڵانەکاندا گەڕام..." تاوێک بێ بڕیار مایەوە.

"بەڵێ، بڵێ."

"منیان برد بۆ لای شینە. دەبوو ئەمە نەدرکێنم."

ئیپەک گوتی: "نابێ بیدرکێنی، لای ئەویش هیچ باسی ئێمە و باوکمان نەکەیت."

"ئایا پێشتر ناسیووتە؟"

"سەردەمانێک موختار شەیدای ئەو بوو، جاروبار لە ماڵەوە سەری لێمان دەدا . بەڵام موختار دوای ئەوەی بڕیاری دا هێلێکی ئیسلامیی نەرمتر و دیموکراسییانەتر هەڵبژێرێ، لە شینە دوورکەوتەوە."

"لە پێناوی ئەو کچانەدا هاتووە کە لێرە خۆیان دەکوژن."

ئیپەک گوتی: "لێی بترسە و هیچ قسەی لەگەڵدا مەکە، بە ئەگەری زۆر، لە شوێنی حەوانەوەی میکرۆفۆنی پۆلیس دانراوە."

"ئەدی کەواتە بۆ دەستگیری ناکەن؟"



"هەر کاتێک لە بەرژەوەندییاندا بێت، دەستگیری دەکەن."

(کا) گوتی: "با من و تۆ پێکەوە لەم شاری قارسە هەڵبێین."

لە سەردەمی منداڵی و تافی لاویدا کاتێک زیاد لە پێویست کامەران دەبوو، هەستی دەکرد بەدبەختی و ناهومێدی لە شوێنێکی زۆر نزیکن. ئێستا ترسی ئەو هەستە لە دەروونیدا بەرز دەبووەوە.

(کا) هەمیشە دەکۆشا بە شڵەژانەوە کۆتایی بە ساتەکانی شادمانی بهێنێ بۆ ئەوەی لە دواییدا بەدبەختییەکەی زۆر کاریگەر نەبێ، بۆیە هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەگەر بەو شڵەژاوییەی خۆیەوە ئیپەک کە هێشتا بەتەواوی گرفتاری ئەڤینی نەبووبوو، لە ئامێز بگرێ، ئەوا مەیل و لە یەکتر نزیکبوونەوەیان لە چاوتروکانێکدا دەبێتە تۆز و تەفروتونا دەبێ، کامەرانیی پێ ڕەوا نەبینراوی، بە ڕەتکردنەوەیەکی پێ ڕەوابینراو و بە چاوی نزم تێڕوانینەوە کۆتایی پێ دێ و ئەم بیرکردنەوەیش سەبووریی پێ دەبەخشی.

بەڵام بارەکە تەواو پێچەوانە کەوتەوە. ئیپەک باوەشی بە ئەودا کرد. چێژیان لە گوشین و لە باوەشگرتنی یەکتر وەرگرت، بە پەرۆشەوە کەوتنە ڕامووسانی یەکتر و کەوتنە سەر دۆشەکەکە. (کا) بە ماوەیەکی کورت هەستی بە خرۆشێکی زۆر بەهێزی زایەند کرد، بە پێچەوانەی ڕەشبینییەکەی کەمێک لەمەوبەرەوە لە خەیاڵی خۆیدا وای بۆچوو کە هەر ئێستا بە ویستێکی بێ سنوور و بەوپەڕی گەشبینییەوە دەست بە ڕووتکردنەوەی یەکتر دەکەن و تێر و پڕ یەک دەگەوزێن و کوڵ و کەفی دڵی یەکتر دادەمرکێننەوە، بەڵام ئیپەک هەستایە سەرپێ و گوتی: "زۆر خۆشباوەڕی، منیش دەمەوێ لە تەکتدا بخەوم، بەڵام ماوەی سێ ساڵە لەگەڵ کەسدا نەبووم، ئامادە نیم."

(کا)یش لە ناخی خۆیدا گوتی: " منیش چوار ساڵە لەگەڵ کەسدا نەخەوتووم." هەستی کرد ئیپەک ئەمەی لە ڕووخساریدا خوێندەوە.

ئیپەک گوتی: "تەنانەت ئەگەر ئامادەیش بم، کاتێک باوکم لێمەوە نزیک بێت و لە هەمان ماڵدا بێت، لەگەڵ کەسدا ناچمە جێوە."

(کا) گوتی: "ئایا بۆ ئەوەی بە ڕووتی لەگەڵ مندا بێیتە ناو جێوە، پێویستە باوکت

له هوتێلەکە بچێتە دەرەوە؟"

"بەڵێ. کەمجاریش لە هوتێل دەچێتە دەرەوە، چونکە حەز لە کوچە بەفراوییەکانی قارس ناکات."

(کا) گوتی: "باشە، با ئێستا تێکەڵ بە یەک نەبین، بەڵام با چەند جارێک یەکتر ڕاموسینەوە."

"باشە."

ئیپەک خۆی بەسەر قەراغی نوێنەکەی (کا)دا لار کردەوە و بێ ئەوەی ڕێی پێ بدات لێی نزیک بێتەوە، دەمی نایە ناو دەمی و ماوەیەکی درێژ ڕامووسی.

دواتر کاتێک (کا) تێ گەیشت کە چیتر یەکتر ڕاناموسن، گوتی: "با شیعرەکەمت بۆ بخوێنمەوە، بە پەرۆشی بزانی چۆنە؟"

"سەرەتا ئەو نامەیە بخوێنەوە، پیاوێکی گەنج هێنابووی."

(کا) نامەکەی کردەوە و بە دەنگی بەرز دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

"کوڕم، (کا) ئەفەندی بەگ. بمبەخشن ئەگەر گوتەی -کوڕم- بۆ ئێوە لە جێی خۆیدا نەبێ. من دوێنێ شەو ئێوەم لە خەونی خۆمدا بینی. لە خەونمدا بەفر دەباری و هەر کلوویەکی وەکو تیشک بۆ جیهان دەهاتە خوارەوە. وتم خێرە، لە نیوەڕۆ بەدواوە ئەو بەفرە لەبەر پەنجەرەکەمدا دەستی بە بارین کرد. ئێوە لە کۆڵانی بایتارخانە بە بەردەم دەرگای هەژارخانەکەماندا کە ژمارە (١٨)یە، تێ پەڕین. موختار بەگ ئەفەندی کە تازە لە تاقیکردنەوەیەکی خودای پەروەردگار دەرچووبوو، بۆی گێڕامەوە کە ئێوە چی واتایەک بەم بەفرە دەبەخشن. ڕێگامان هەمان ڕێگایە. ئەفەندیم، چاوەڕێ دەکەم. ئیمزا: سەعادەدین جەوهەر."

ئیپەک گوتی: "شێخ سەعادەدینە، بێ دواکەوتن بڕۆ بۆ لای. ئێوارەیش لەگەڵ باوکمدا دێیت بۆ لای ئێمە بۆ نانخواردن."

"بۆچی دەبێ چاوم بە هەموو شێتەکانی قارس بکەوێ؟"

"ڕاستە پێم گوتی لە شینە بترسە، بەڵام وا بەپەلە بە شێخ مەڵێ شێت. شێخ



فێڵبازە، گەمژە نییە."

"دەمەوێ هەموویان لەبیر بکەم. ئێستا شیعرەکەمت بۆ بخوێنمەوە؟"

"بیخوێنەوە."

(کا) لەسەر مێزێکی بچووک دانیشت و بە متمانەوە و جۆشەوە دەستی بە خوێندنەوەی شیعرە نوێیەکەی کرد. ئیپەک گوتی: "وەرە ئەملاوە، دەمەوێ لە کاتی خوێندنەوەدا دەموچاوت ببینم." بە تیلەی چاو ڕوانییە ئیپەک و کەوتەوە خوێندنەوەی شیعرەکە لە دەسپێکەوە. (کا) پاش کەمێک پرسی: "جوانە؟" ئیپەک گوتی: "بەڵێ، جوانە." (کا) زیاتری خوێندەوە و دیسان پرسی: "جوانە؟" ئیپەک گوتی: "جوانە." دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی شیعرەکە بووەوە، لە ئیپەکی پرسی: "کوێیت بەلاوە جوان بوو؟" ئیپەک گوتی: "نازانم، بەڵام زۆر جوان بوو بەلامەوە." موختار بەم شێوەیە شیعری بۆت دەخوێندەوە؟" "نەیدەخوێندەوە." (کا) جارێکی تر شیعرەکەی بە خرۆشەوە خوێندەوە و هەمدیسان لە هەمان شوێندا پرسییەوە: "جوانە؟" چەند جارێکیش گوتی: "فرە جوانە، وا نییە؟" ئیپەک گوتی: "بەڵێ، زۆر جوانە!"

(کا) هێندە بەختەوەر بوو، بەجۆرێک وەکو ئەوەی لە شیعرێکی سەردەمی زوویدا لەسەر منداڵێکی نووسیبێ (تیشکێکی میهرەبان و نایاب)ی بە دەوری خۆیدا پەخش دەکرد و شادمان دەبوو کە دەیبینی بەشێک لەو تیشکە لە سەر ڕووخساری ئیپەک دەدرەوشێتەوە. جارێکی تر ئیپەکی لە ئامێز گرت، بەڵام ژنەکە زۆر میهرەبانانە خۆی کێشایە دواوە.

"گوێ بگرە ئێستا: یەکسەر بڕۆ بۆ لای شێخ ئەفەندی. ئەو کەسێکی زۆر گرنگی ئەم شوێنەیە، لەوە گرنگترە کە تۆ بۆی چوویت: خەڵکێکی زۆری ئەم شارە دەچنە لای، بە لایسیستەکانیشەوە. دەگوترێ کۆمیتانی هۆبەی سوپا و ژنەکەی پارێزگاریش چوونەتە لای، هەندێک لە دەستڕۆیشتووەکان و پلەدارانی سوپایش هاتوچۆی دەکەن. لایەنگری دەوڵەتە. کاتێک گوتی پێویستە کچانی قوتابی زانکۆ و سەرداپۆشراوەکان لە پۆلەکاندا سەریان ڕووت بکەن، ئەندامەکانی پارتی ڕەفا هیچ کاردانەوەیەکیان لە بەرامبەری نەبوو. لە شوێنێکی وەکو قارس، کەسێکی ئاوا بەهێز

بانگت بکات، نابێ ڕەتی بکەیتەوە."

"موختاری بەلەنگازیش تۆ ناردبووت بۆ لای؟"

"ئایا غەمی ئەوەتە دەست بخاتە سەر ترسی خودا لە دڵتدا و دەترسی بتکات بە باوەڕمەند؟"

(کا) گوتی: "ئێستا زۆر شادمانم، هیچ پێویستیم بە ئاین نییە، بۆ ئەمەیش بۆ تورکیا نەگەڕاومەتەوە. تەنیا شتێک دەمبات بۆ ئەوێ: ئەوینی تۆ... ئایا من و تۆ زەماوەند دەکەین؟"

ئیپەک لەسەر کەناری جێگاکە دانیشت و گوتی: "دە کەواتە بڕۆ بۆ لای." بە نیگایەکی ئەفسوناوی و میهرەبانەوە سەیرێکی (کا)ی کرد و گوتی: "بەڵام وریاش بە. کەس نییە هێندەی ئەو خێرا خاڵێکی تێکشکاو و لاواز لە هەناوتدا بدۆزێتەوە و وەکو جنۆکەیش دەچێتە هەناوی مرۆڤەوە."

"چیم بەسەر دێنێ؟"

"لەگەڵتدا دەکەوێتە قسە و دوایی لە ناکاو خۆی دەخاتە سەر زەوی. یەکێک لە وشەکانت دەگرێ و بانگەشەی ئەوە دەکات کە داناییەکی گەورەی تێدایە و خۆیشت بە جوامێر دادەنێ. تەنانەت هەندێک لەسەرەتاوە وا تێ دەگەن کە پێیان ڕادەبوێرێ! بەڵام قودرەتی حەزرەتی شێخ ئەفەندی لێرەدایە. ئەمە بەشێوازێک دەکات کە تۆ باوەڕ دەکەیت بە ڕاستی باوەڕی بە دانایی تۆ هێناوە و بەڕاستیش لە ناخی دڵەوە وا بڕوا دەکات. وا مامەڵە دەکات وەکو ئەوەی کەسێکی لە خۆت باڵاتر لە هەناوی تۆدا هەبێت. پاش کەمێک تۆیش هەست بەو جوانییەی ناو هەناوی خۆت دەکەیت: سەرنج دەدەیت ئەو جوانییەی ناوەوەت کە پێشتر پەیت پێ نەبردووە، جوانیی خودایە و شادمان دەبیت. لە ڕاستیشدا کاتێک لای ئەوێت، جیهانیش جوانە. لە پای گەیاندنت بەم خۆشبەختییە، خۆشەویستیت دەچێتە سەر شێخ ئەفەندی. بەدرێژاییی ئەو ماوەیە ڕەهەندێکی تری هۆشت پێت دەڵێ هەموو ئەمانە گەمەی شێخن و تۆیش کەسێکی بەلەنگاز و بودەڵەیت. بەڵام ئەوەندەی لە موختار تێ گەیشتووم، ئیتر هێزی ئەوەت تێدا نامێنێ گوێ لەو ڕەهەندە خراپەی مێشکت بگری. بیر لەوە دەکەیتەوە کە



تۆ هێندە ڕەبەن و بەدبەختی، مەگەر هەر خودا فریات بکەوێ. لەو کاتەدا عەقڵت کە بەهیچ جۆرێک ئارەزووەکانی ڕۆحت ناناسێ، کەمێک بەرگری دەکات. بەو جۆرە، دەچیتە سەر ئەو ڕێگایەی کە شێخ بۆت دەسانیشان دەکات، چونکە پێت وایە تەنیا بە گرتنەبەری ئەو ڕێگایە دەتوانی لە ژیاندا لەسەر پێی خۆت ڕابوەستی. گەورەترین هونەری حەزرەتی شێخ ئەوەیە هەستێکی وا دەخاتە دەروونی بەلەنگازەکەی بەرامبەریەوە، بەجۆرێک خۆی زۆر باڵاتر لەوەی کە هەیە دێتە بەرچاو، چونکە زۆربەی پیاوەکانی ئەم شاری قارسە زۆر باش دەزانن کە لە تورکیادا لەوان بەلەنگازتر و هەژارتر و دۆڕاوتر نییە. بەو جۆرە سەرەتا باوەڕ بە خۆت و پاشان بە ئیسلام دەهێنن کە پێشتر لەبیرت براوەتەوە. ئەمەیش هێندە خراپ نییە وەکو ئەوەی لە ئەڵمانیاوە بۆی دەڕوانن و چەشنی ئەوەی کە هەندێک لە لاییسیستە ڕووناکبیرەکان بانگەشەی بۆ دەکەن. ڕەنگی ئەوانی تر دەگری، لە خەڵک دەچی و کەمێک لە بەبەختی ڕزگارت دەبێ."

(کا) گوتی: "من ناشاد نیم."

"لە ڕاستیدا هیچ کەسێک نییە هێندە ناشاد بێ، چونکە خەڵکی ئێرە هیوا و دڵدانەوەیەکیان هەیە کە خۆیان پێوە گرێ داوە. ئێرە لە بێباوەڕە لێبوکەکانی ئەستەمبوڵی لێ نییە. کارەکان لێرە سادەترن."

"لەبەرئەوەی تۆ وا ئارەزوو دەکەی، من هەر ئێستا دەڕۆم. کۆڵانی بایتارخانە لە کام لاوەیە، چەند لەوێ بمێنمەوە؟"

ئیپەک گوتی: "هەتا دەروونت ئاسوودە دەبێ بمێنەوە! لە باوەڕهێنانیش مەترسە." لە لەبەرکردنی پاڵتۆکەدا هاوکاریی (کا)ی کرد و لێی پرسی: "ئایا زانیارییەکانی ئیسلامت لەبیر ماوە؟ ئەو نزایانەت لە بیرە کە لە قوتابخانەی سەرەتایی فێریان بووی؟ با دوایی شەرمەزار نەبیت."

(کا) گوتی: "لە کاتی منداڵیمدا کارەکەرەکەی ماڵمان منی دەبرد بۆ مزگەوتی تەشویقیە. ئەو بۆ خوداپەرستی نەدەچوو، بەڵکو زیاتر بۆ بینینی ژنە خاوێنکەرەوەکانی تر دەچوو. ئەوان هەتا بۆیان دەکرا بەدەم چاوەڕێکردنی هاتنی

ساتی نوێژەوە لۆمەی خەڵکیان دەکرد، منیش لەگەڵ منداڵەکاندا بەسەر ڕایەخەکاندا تەقڵەم لێ دەدا و گەمەم دەکرد. لە قوتابخانەیش، بۆ ئەوەی جێی ڕەزامەندیی مامۆستای دەرزی ئاین بم کە بەر زللەی دەداین و کاکۆڵی ڕادەکێشاین و سەرمانی دەخستە سەر کتێبی -ئاین-ی سەر مێزەکەی بەردەممان بۆ ئەوەی سوورەتی فاتیحامان پێ لەبەر بکات، هەموو پاڕانەوەکانم لەبەر کردبوو. فێری هەموو ئەو شتانە بووم کە لە قوتابخانەدا لەسەر ئیسلام دەگوترانەوە، بەلام ئێستا هەموویم لەبیر چووە. بە زەردەخەنەوە گوتی: "ئێستا تاکە زانیاریی من دەربارەی ئیسلام فیلمێکە بە ناوی (پەیام) کە ئەنتۆنی کوین ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەگێڕێ. لە ڕابردوودا لە کەناڵێکی تورکیدا لە ئەڵمانیا، جا بۆ هەر مەبەستێک بووبێ، بە ئەڵمانی نیشان درا. ئێوارە لێرەی، وا نییە؟"

"بەڵێ."

(کا) گوتی: "چونکە دەمەوێ جارێکی تر شیعرەکەمت بۆ بخوێنمەوە." پاشان دەفتەرەکەی خستە گیرفانی پاڵتۆکەیەوە و گوتی: "بە ڕای تۆ شیعرەکەم جوانە؟"

"هەر بەڕاستی زۆر جوانە."

"کوێی جوانە؟"

ئیپەک، لەو دەمەیدا دەرگاکەی خستبووە سەر پشت و دەیویست بڕوات، گوتی: "نازانم، زۆر جوانە."

(کا) بەپەلە باوەشی پێدا کرد و ناو دەمی ماچ کرد.



# ١١

## مەگەر لە ئەورووپا خودایەکی تر هەیە؟

### (کا) لای شێخ ئەفەندی

چەند کەسێک چاویان پێوە بووە چۆن (کا) لە هوتێل هاتووەتە دەرێ و بە پڕتاو بەژێر بەفر و ئالاکانی بانگەشەی هەڵبژاردندا بەرەو کوچەی بایتارخانە ملی ڕێی گرتووە. هێندە کامەران بوو، بەجۆری ساتەکانی ترۆپکی شادمانی لە سەردەمی منداڵیدا، سینەمای هێزی خەیاڵی دەستی کرد بە نیشاندانی دوو فیلم لە هەمان کاتدا. لە یەکەمیاندا، لە شوێنێک لە ئەڵمانیا -لە ماڵەکەی فرانکفورتی نا-، لەگەڵ ئیپەکدا خۆشاوی لێک ئالانیان دەنۆشی. بەردەوام ئەم خەیاڵەی دەکرد و جاروباریش شوێنی لێک ئالانەکەیان ژووری هوتێلەکەی قارس بوو. لە سینەماکەی تری هۆشیدا، فیلمی وشە و خەیاڵەکانی تایبەت بە دواین دوو بەیتی شیعرەکەی (کا) نیشان دەدرا.

بەنیازی ناوونیشان پرسین خۆی کرد بە ڕێستۆرانتی نیشتمانی سەوزدا. دواتر بە وەرگرتنی سروش لە ڕیزێک شووشەی عارەق کە لەسەر ڕەفەکانی تەنیشت وێنەی ئەتاتورک و پۆستەری دیمەنە بەفراوییەکانی سویسراوە ڕیزکرابوون، لەسەر مێزێک دانیشت و بەشێوەی کەسێک کە زۆر پەلەی بێت، داوای پێکێک عارەق و پەنیری سپی و نۆکی کوڵاوی کرد. بێژەری ناو تەلەفزیۆنەکە دەیگوت کە سەرەڕای بارینی بەفر، تەدارەکی پێویست بۆ یەکەم وەشانی تەلەفزیۆنی لە دەرەوەی ستۆدیۆ لە مێژووی قارسدا کە ئەم ئێوارەیە ئەنجام دەدرێ، ڕوو لە تەواوبوونە. دواتر بێژەرەکە کورتەی هەندێک لە ڕووداوەکانی ناوخۆیی و جیهانی پێشکەش کرد. جێگری پارێزگار بە تەلەفۆنێک بڵاوکردنەوەی هەواڵی سەبارەت بە پەلاماردانی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی قەدەغە کردبوو، مەبەستیشی لەم قەدەغەکردنە، خۆی گوتەنی، بۆ ئەوە بوو کارەکە گەورەتر نەبێتەوە و دوژمنان زیاتر هان نەدرێن. (کا) بەدەم سەرنجدان لە هەواڵەکانەوە، بەخێراییی ئاو خواردنەوە، دوو پێک عارەقی خواردەوە.

دوای خواردنەوەی پێکی سێیەم، بە ماوەی چوار خولەک گەیشتە بەر دەروازەی تەکیەی شێخ، دەرگای تەکیەکە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کرایەوە. (کا) کاتێک بەسەر پلیکانە قیتەکاندا سەرکەوت، شیعرەکەی موختاری بەناوی (پلیکانە) کە هێشتا هەر لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا بوو، بیرکەوتەوە. دڵنیا بوو لەوەی کە هەموو شتێک باش دەبێ، بەڵام خۆی وەکو منداڵێک هاتە بەرچاو کە سەرەڕای دڵنیابوونی لەوەی دەرزیی لێ نادرێ، کەچی مل نادات بۆ چوونە ژوورەوەی تیمارخانەی پزیشک. لەگەڵ سەرکەوتنی بە پلیکانەکاندا، لە هاتنی خۆی پەشیمان بووەوە: سەرباری عارەق خواردنەوە، ترسێکی قوڵ هەناوی هەژاندبوو.

جەنابی شێخ دەسبەجێ لەگەڵ بینینی (کا)دا، شوێنەواری ئەو ترسەی لە ڕووخساریدا خوێندەوە. (کا)یش حاڵی بوو کە شێخ هەستی بە ترسەکەی ئەم کردووە، بەڵام ئاکارێکی وا لە شێخدا هەبوو، بەجۆرێک (کا) شەرمی لە ترسەکەی خۆی نەکرد. لە ڕێڕەوی کۆتاییی پلیکانەکەدا ئاوێنەیەکی چوارچێوە هەڵکۆڵدراو بە بزمار بە دیوارەکەوە داکوترابوو. (کا) سەرەتا جەنابی شێخی لەو ئاوێنەیەدا بینی. ماڵەکە هێندە پڕ بوو وەکو ئەوەی میوانەکان ماسی بن و لە قوتوودا ڕیزکرابن. ژوورەکەش بە هەڵمی هەناسە و گەرماییی مرۆڤەکان گەرم داهاتبوو. (کا) ئەوەندەی زانی وا خەریکە دەستی جەنابی شێخ ماچ دەکات. هەموو ئەمانە لە چاوتروکانێکدا ڕوویان دا، ئاپۆرەی دەوروبەر و ناو ژوورەکە هیچ سەرنجی(کا)ی ڕانەکێشابوو.

ئاپۆرەیەکی بیست و چەند کەسی بۆ بەشداریکردن لە سرووتی سادەی ئاینیی ڕۆژانی سێشەم و بۆ گوێگرتن لە وتەکانی شێخ و بەیانکردنی دەردی دڵ لە ژوورەکەدا گردبووبوونەوە. ئەمانە بریتی بوون لە چەند کەسێکی خاوەن کارگەی شیرەمەنی، پیشەکاران، پێنج شەش کەسی چایچی، لاوێکی نیوە ئیفلیج، بەڕێوەبەرێکی خێلی کۆمپانیای پاس و برادەرێکی، ئێشکگری شەوانی دامەزراوەی کارەبا، کابرایەک کە ماوەی چل ساڵە دەرگەوانی نەخۆشخانەی قارسە و چەند کەسێکی تر...

شێخ دوای ئەوەی دانە بە دانەی بێ ئۆقرەییەکانی لە ڕووخساری (کا)دا خوێندەوە، وەکو ئەوەی ڕۆڵ بگێڕێ، دەستی ماچ کرد. ئەمەی بەجۆرێک کرد وەکو



ئەوەی دەستی نازداری منداڵێکی ساوای ماچ کردبێ، نەوەک ڕێزی نواندبێ. (کا) سەرباری ئەوەی کە زۆر باش دەیزانی شێخ بەمجۆرە ڕەفتار دەکات، کەچی سەری سوڕمابوو. ئاگادار لەوەی ئامادەبووان سەیریان دەکەن و بەوردی گوێیان لێ دەگرن، دەستیان بە قسان کرد.

شێخ گوتی: "ڕووناکی خوداتان لەسەر بێ، لە پای وەڵامدانەوەی بانگهێشتنەکەم. تۆم لە خەونمدا بینی. بەفر دەباری."

(کا) گوتی: "حەزرەتی شێخ، منیش ئێوەم لە خەونمدا بینی، بۆ بەدەستهێنانی شادمانی بۆ ئێرە هاتووم."

شێخ گوتی: "پەی بردنت بەوەی لێرە بەختەوەر دەبی، هەموومانی شادمان کرد."

(کا) گوتی: "لێرە، لەم شارەدا لەم ماڵە دەترسم، چونکە ئێوە بە من زۆر نامۆن و من هەمیشە ترسم هەبووە لەم شتانە. هەرگیز نەمویستووە دەستی کەس ماچ بکەم و کەس دەستم ماچ بکات."

شێخ گوتی: "جوانیی دەروونی خۆت بۆ موختاری برامان باس کردبوو، ئەم بەفرە پیرۆزەی کە دەبارێ چی دێنێتەوە بیرت؟"

(کا) سەرنجی دا ئەوەی لە قەراغ پەنجەرەکەی لای ڕاستی دیوانەکەی شێخەوە دانیشتووە، موختارە. دوو پلاستەر بە ناوچەوان و بەسەر لوتیەوە بوو. بەشێوەی ئەو بەسالاچووانەی کە بەهۆی نەخۆشیی ئاوڵەوە کوێر دەبن، چاویلکەیەکی ڕەشی بۆ شاردنەوەی پەڵە مۆرەکانی دەوروبەری چاوی لە چاو کردبوو. بزەیەکی بۆ (کا) کرد، بەڵام هیچ دۆستانە نەدەهاتە بەرچاو.

(کا) گوتی: "بەفر خودای هێناوەتەوە بیرم، ئەوەی هێناوەتەوە یادم کە ئەم جیهانە چەندە ئەفسووناوی و پڕ لە ڕازە و ژیانیش خۆی لە خۆیدا بەختەوەرییە."

پاش ماوەیەک بێدەنگی، بینی وا چاوی ئاپۆرەی ناو ژوورەکە لەسەر ئەوە. خۆشحاڵبوونی شێخ بە ڕەوشەکە، ئەمی تووڕە کرد و لێی پرسی: "بۆچی منتان بانگ کردووە بۆ ئێرە؟"

شێخ گوتی: "ئەستەغفیروڵا، لە قسەکانی موختار بەگەوە تێ گەیشتین کە ئێوە

بەدوای دۆستێکدا دەگەڕێن لەگەڵی بدوێن و دڵی خۆتانی بۆ بکەنەوە."

(کا) گوتی: "باشە، دە کەواتە با قسە بکەین، من بەر لەوەی بێمە ئێرە، لە ترساندا سێ پێک عارەقم خواردووەتەوە."

شێخ وەکو کەسێکی سەرسوڕماو چاوەکانی داچەقاند و گوتی: "بۆچی لێمان دەترسن؟" شێخ پیاوێکی تێکسمڕاو و خوێن شیرین بوو، (کا) هەستی کرد ئەوانەی دەوروبەریش لە ناخەوە بزە گرتوونی.

"دەتوانن پێمان بڵێن بۆ لێمان دەترسن؟"

(کا) گوتی: "دەیڵێم، بەڵام نامەوێ لێم زویر بن."

شێخ لە وەڵامدا گوتی: "زویر نابین، فەرموون وەرن لای منەوە دانیشن. بۆ ئێمە زۆر گرنگە بزانین هۆی ترسەکەت چییە."

شێخ ڕەفتارێکی بەدیوێکدا بەدەربەستانە و بەدیوێکی تردا گاڵتەجاڕانەی ئەوتۆی هەبوو کە ئامادەبوو لە هەر ئان و ساتێکدا موریدەکان بێنێتە پێکەنین. (کا) ئەم ڕەفتارەی بە دڵ بوو، هەر لەگەڵ یەکەم چرکەی دانیشتنیشیدا هەستی کرد مەیلی لە لاساییکردنەوەی ڕەفتارەکانی شێخە.

(کا) گوتی: "من وەکو منداڵێکی باش هەمیشە بەنیازێکی پاکەوە ویستوومە وڵاتەکەم گەشە بکات، مرۆڤەکانی ئازاد و هاوچەرخ بن، بەڵام هەمیشە ئاینەکەمانم وا هاتووەتە بەرچاو کە دژی ئەم خواستانەیە. لەوانەیشە بە هەڵەدا چووبم. بمبەخشن. لەوانەیە ئێستا زۆر سەرخۆش بم، بۆیە دان بەم شتانەدا دەنێم."

"ئەستەغفیروڵا."

"لە خێزانێکی خانەدان لە بەشەشاری نیشانتاشی لە ئەستەمبوڵ گەورە بووم. دەمویست کەسێکی وەکو ئەوروپاییەکانم لێ دەربچێ. لەبەرئەوەی تێ گەیشتم کە ناتوانم لە هەمان کاتدا باوەڕ بە خودایەک کە دەستوور دەدا ژنان سەریان داپۆشن و ڕوویان بشارنەوە و بەئەوروپاییبوون بهێنم، ژیانم دوور لە ئاین بەسەرچوو. کاتێکیش چوومە ئەوروپا، وای بۆ چووم خودایەکی تەواو جیاوازتر لەو خودایە هەبێت کە ڕیشدار و پاشڤەڕۆ و لادێنشینەکان باسی دەکەن."



شێخ دەستێکی بە پشتی (کا)دا هێنا و بەدەم گاڵتەوە گوتی: "مەگەر خودایەکی تر لە ئەوروپا هەیە؟"

"من هەستم بە هەبوونی خودایەک دەکرد کە پێویستی نەکردایە بۆ چوونە بەردەمی پێڵاوەکانم دابکەنم، دەستی ماچ بکەم و بۆی بکەومە سەر ئەژنۆ. خودایەکی ئەوتۆ کە لە تەنیاییی من تێ بگەیشتایە."

شێخ گوتی: "خودا بە توانایە، هەموو شتێک دەبینێ، لە هەموو کەسێک تێ دەگات، لە تەنیاییەکەی تۆیش. ئەگەر باوەڕت پێ هەبوایە و بتزانیبا کە تەنیاییی تۆ دەبینێ، هەستت بە تەنیاییی نەدەکرد."

(کا) هەستی کرد قسە بۆ هەموو ئەوانەی ناو ژوورەکە دەکات و گوتی: "زۆر ڕاستە حەزرەتی شێخ، لەبەرئەوەی تەنیام، ناتوانم باوەڕ بە خودا بهێنم، بەهۆی ئەوەیش کە ناتوانم باوەڕ بە خودا بهێنم، هێزم نییە لە دەست تەنیاییی ڕزگارم بێ. چی بکەم؟"

لەلایەک، پێشبینیی نەدەکرد کە سەرباری سەرخۆشییەکەی، ئاوا بوێرانە و بە ئارەزووەوە گرێی دەروونی خۆی بۆ شێخێکی ڕاستەقینە بکاتەوە، لەلایەکی دی، بە بەشێکی تری هۆشی سوور دەیزانی کە کەوتووەتە هەرێمێکی ترسناکەوە، بۆیە بێدەنگییەکەی شێخ ترساندی.

شێخ گوتی: "بەڕاستی عەقڵت لێم دەوێ؟ وەکو ئێوەش گوتتان، ئێمە کەسانی ڕیشدار و پاشڤەڕۆ و دەشتەکین. ئەگەر تەنانەت ڕیشیشمان بتاشین، ئەوا چارەی لادێیی بوونی خۆمان بۆ ناکرێ."

(کا) گوتی: "منیش دەشتەکیم، بۆ ئەوەیشی زیاتر دەشتەکی بم، دەمەوێ کاتێک بەفر بەسەر پەی پێ نەبراوترین گۆشەی جیهاندا دەبارێ، من لە بیر بکرێم." جارێکی تر دەستی شێخی ماچ کرد. پێی خۆش بوو کە بە ئاسانی ئەمەی کرد، بەڵام لایەکی هۆشی هێشتا ڕۆژئاوایی بوو و بەشێوەیەکی تەواو جیاواز کاری دەکرد. ئەم بەشەی هۆشی، لە پای ئەو دۆخەی تێی کەوتبوو، بە چاوی سووک سەیری (کا)ی دەکرد.

(کا) هەمدیسان گوتی: "لە کەموکوڕیم ببوورن کە بەر لە هاتنم بۆ ئێرە عارەقم

خــــواردەوە، لەبەرئەوەی باوەڕم بە خــــودای هەژاران، بەو خــــودایە نەبووە کــــە نەخوێندەواران و پووره سەرداپۆشراوەکان و مامە تەزبیح بەدەستەکان دەیپەرستن، بەدرێژاییی ژیانم هەستم بە تاوانباری کردووە. بێبڕواییەکەم بەشێکی لە لووتبەرزییەوە بوو، بەڵام ئێستا گەرەکمە باوەڕ بەو خودایە بهێنم کە ئەو بەفرە جوانەی دەرەوە دەبارێنێ. خودایەک هەیە کە ئاگای لە هاوشێوەی نهێنی و نادیاری جیهانە و مرۆڤەکان هاوچەرخانەتر و نیانتر دەکات."

شێخ گوتی: "بێگومان هەیە، کوڕی خۆم."

"بەڵام ئەو خودایە لێرە نییە لە نێو ئێوەدا. لە دەرەوەیە، لە شەوی ڕووت و لە تاریکی و لەو بەفرەدایە کە لە دڵی کەسانی ڕەبەن و بێکەسدا دەبارێ."

"ئەگەر دەتوانی هەر خۆت خودا بدۆزیتەوە، برۆ، لە نیوەی شەودا بەفر دڵت پڕ بکات لە خۆشەویستیی خودا. با ئێمە ڕێت لێ نەگرین. بەڵام لە بیرت نەچێ، بەتەنیا کەسانی لە خۆبایی و بەخۆناز تەنیابالْ دەمێننەوە. خودا بەهیچ چەشنێک لەخۆباییبوونی خۆش ناوێ. ئیبلیس لەبەرئەوەی لە خۆی بایی بوو، لە بەهەشت دەرکرا."

(کا) هەمدیسان ترسێکی لێ نیشت کە سەردەمانێک دوای ئەو دیدارە لە بیری چووەوە. ترسی ئەوەی هەبوو لە پاشملە باسی بکرێ. هەرگیز حەزی نەدەکرد دوای ڕۆیشتنی لەوێ، بوختانی بۆ بکرێ: "چی بکەم حەزرەتی شێخ؟" ویستی جارێکی تر دەستی شێخ ماچ بکات، بەڵام شێخ دەستی کێشایەوە. (کا) زۆر باش هەستی کرد کە بێ ئۆقرەیی و سەرخۆشیی پێوە دیارە و لەبەرئەوەیش بە چاوی سووک سەیر دەکرێ. "دەمەوێ بڕوا بەو خودایە بهێنم کە ئێوە باوەڕتان پێی هەیە، بەڵام بەهۆی ڕۆژئاواییبوونەکەی ناو ناخمەوە، سەرم گێژ دەخوات."

شێخ گوتی: "هێندەیش نیازپاکی، سەرەتایەکی باشە. تۆ جارێ فێری خاکیبوون بە."

(کا) گوتی: "بۆ ئەوە چی بکەم؟" دیسان ئیبلیسێکی گاڵتەجاڕ بە هەناویدا دەگەڕا.

شێخ گوتی: "هەر کەسێک ئارەزووی لە دەمەتەقێ بێ، ئێواران لە قەراغ ئەم دیوانە



کە تۆم لە قەراغی دانیشاندووە، دادەنیشێ. هەموو ئەوانەی ئێرە برای یەکترن."

(کا) دەسبەجێ تێ گەیشت کە ئەو ئاپۆرەیەی لەسەر کورسی و دۆشەکەکان دانیشتبوون، لە ڕاستیدا هەموویان ڕیزیان گرتبوو بۆ ئەوەی لە کەناری دیوانەکە دابنیشن. هەستی کرد شێخ ڕێزێکی زیاتری بۆ ئەو ڕیزە خەیاڵییە هەیە وەکو لەوەی بۆ ئەمی هەبێ، بۆیە وای بۆ چوو کە باشتر وایە هەستێ، وەکو ئەوروپییەک لە هەرە دواوەی ڕیزەکەدا جێی خۆی بکاتەوە و بە دان بە خۆگرتنەوە چاوەڕێ بکات. جارێکی دی دەستی شێخی ماچ کرد، کشایەوە و لەسەر قەراغی دۆشکەکەی هەرە دواوە دانیشت.

پیاوێکی باڵاکورتی شیرین ڕووخسار کە دانەکانی ئەملا و ئەلای چەناگەی لە زێڕ گرتبوو و چایخانەکەی شەقامی ئینونوی بەڕێوە دەبرد، لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو. کابرا بەڕادەیەک بچووک و سەری (کا)یش هێندە شلۆق بوو، بەجۆرێک لە خەیاڵی خۆیدا وای دانا کە هەبێ و نەبێ ئەم کابرایە بۆ گەڕان بەدوای چارەیەکدا بۆ باڵا گرگنەکەی بۆ لای شێخ هاتووە. لە سەردەمی منداڵیی ئەودا، لە گەڕەکی نیشانتاشی کابرایەکی کورتە باڵای زۆر بەڕێز هەبوو کە هەموو ئێوارانێک لە مەیدانی نیشانتاشی گوڵە وەنەوشە یان گوڵە مێخەکێکی لە قەرمچەکان دەکڕی. پیاوە لاواز و بچووکەکەی تەنیشتی پێی گوت ئەمڕۆ کە بەلای چایخانەکەدا تێ پەڕیوە، بینیوێتی، بەڵام بەداخەوە (کا) نەیتوانیبوو لابداتە لای، بەڵام کابرا پێی گوت کە سبەینێ چاوەڕێی دەکات. بەڕێوەبەرە خێلەکەی کۆمپانیای پاس کە پێشتر باسمان کردبوو، تێکەڵ بە گفتوگۆکان بوو؛ بە فسکەوە گوتی کە بەهۆی مەسەلەی کچێک سەردەمانێک ناشاد بووە و خووی داوەتە خواردنەوە و هەتا ڕادەی خودانەناسین یاخی بووە، بەڵام دواتر هەمووی گوزەراوە و گشت گرفتەکانی لەبیرکردووە. بەر لەوەی (کا) بپرسێ "ئایا لەگەڵ کچەکەدا ژیانی هاوسەریتان پێکەوە نا؟"، ئەو گوتی: "کچەکە بۆ من دەستی نەدەدا."

شێخ دواتر دەستی کرد بە قسە لە دژی خۆکوشتن: هەموویان بەبێدەنگی و هەندێکیشان بە سەربادانەوە گوێیان بۆ ڕاگرت. (کا)یش لەگەڵ دوانەکەی تەنیشتیدا دیسانەوە لە نێوان خۆیاندا کەوتنە فسکە فسکە: پیاوە بچکۆلانەکە گوتی: "چەند

حاڵەتێکی تری خۆکوشتن ڕووی داوە، بەڵام هەروەکو چۆن ناوەندی پێشبینیکردنی کەش و هەوا بۆ ئەوەی ورەی میللەت نەڕوخێ، هەواڵی ساردتربوونی هەوا دەشارێتەوە، دەوڵەتیش هەواڵی خۆکوشتنی کچەکان پەردەپۆش دەکات: کچانی خۆیان بەرامبەر بە پارە دەدەن بە کارمەندانی پیر و ئەو پیاوانەی کە خۆشیان ناوێن." بەڕێوەبەرە خێلەکەی کۆمپانیای پاس گوتی: "ژنەکەی منیش لە سەرەتادا کە یەکترمان ناسی، هیچ خۆشیی بە چارەمدا نەدەهات." بێکاری، گرانی، بەدڕەوشتی و بێباوەڕی، خرانە خانەی هۆیەکانی خۆکوشتنەوە. (کا) لەبەرئەوەی هەرچییەک دەگوترا، ئەم بەڵێی بۆ دەکرد، خۆی وەکو کەسێکی دووڕوو دەهاتە بەرچاو. کاتێک پیاوە پیرەکە خەریک بوو خەو بیباتەوە، بەڕێوەبەرە خێلەکەی کۆمپانیای پاس بێداری کردەوە. بێدەنگییەکی درێژ هاتە ئاراوە، (کا) لە ناخی خۆیدا هەستی بە بەرزبوونەوەی شەپۆلی ئارامی کرد: ئەوانە هێندە لە چەقی جیهانەوە دوور بوون، بەجۆرێک کە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات ڕوو لەوێ بکات، ئەمە لەگەڵ بەفر بارینەکەی دەرەوەدا کە دەتگوت کلووەکانی لە هەوادا ڕاوەستاون، هەستێکی وای لای (کا) خوڵقاند وەکو ئەوەی لە دەرەوەی هێزی کێشکردنی زەوی ژیان بەسەر ببات.

کاتێک چیدی کەس خۆی پێوە سەرقاڵ نەکرد، (کا) شیعرێکی تری بۆ هات. دەفتەرەکەی پێ بوو، بەسوود وەرگرتن لە ئەزموونی نووسینەوەی شیعرەکەی پێشووی، هەموو هزری خۆی دایە ئەو دەنگەی کە لە هەناویدا بەرزبووەوە، ئەمجارە لە یەک هەڵمەتدا و بێ ئەوەی یەک وشەی لێ تێ پەڕێنێ، سی و شەش نیوە بەیتی نووسی. لەبەرئەوەی عارەقەکە سەری گەرم کردبوو، زۆر متمانەی بە شیعرەکەی نەبوو. بەڵام بە سروشێکی نوێوە هەستایە سەرپێ، دەستووری لە شێخ خواست و خۆی گەیاندە دەرێ، لەسەر پلیکانە بەرزەکانی تەکیەکە دانیشت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکەی و بۆی ساغ بووەوە کە وەکو شیعرەکەی پێشووی، بێ کەموکوڕییە.

شیعرەکە بەو کەرەسەیە نووسرابوو کە پێش کەمێک بەسەر (کا) هاتبوو و خۆی گەواهیدەری بوو: چوار نیوە بەیت تەرخان کرابوو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شێخدا



دەربارەی هەبوونی خودا. تێڕوانینی پڕ لە تاوانی (کا) بۆ (خودای هەژاران)، تەنیایی و واتای نهێنیی جیهان، دەسەڵاتی عەقڵ بەسەر ژیاندا، پیاوێکی ددان زێڕین، کابرایەکی خێل و کورتە باڵایەکی بەڕێزی گوڵەمێخەک بەدەست کە هەموو ژیانی هێنابووە یادی، لە شیعرەکەی (کا)دا جێیان کرابووەوە. بەدەم سەرسوڕمانەوە لە جوانیی ئەو شتەی نووسیویێتی، لە هزری خۆیدا گوتی: "گەلۆ واتای هەموو ئەمانە چییە؟" شیعرەکەی بەلاوە جوان بوو، چونکە دەیتوانی وەکو شیعرێک کە لە لایەن کەسێکی ترەوە نووسرابێ، بیخوێنێتەوە. هەر لە سۆنگەی جوانیی شیعرەکەوە، سەری لە کەرەسەی شیعرەکە و ژیانی خۆیشی سوڕمابوو. تۆ بڵێی واتای جوانی شیعرەکەی چی بێ؟

کارەبای گڵۆپی ئۆتۆماتیکی سەر پلیکانەکان کوژایەوە و ئەو ناوە نوقمی تاریکی بوو. دووگمەکەی دۆزییەوە و گڵۆپەکەی داگیرساندەوە، چاوێکی تری بە دەفتەرەکەدا گێڕا و ناوی شیعرەکەی بۆ هات. لە سەرەوەی شیعرەکە نووسی (هاوشێوەی شاراوە). دوای تێپەڕبوونی ڕۆژگارێکی درێژ بەسەر ئەو ڕووداوانەدا، بەخێرایی دۆزینەوەی ئەم ناوەی بۆ شیعرەکەی، بە نیشانەی ئەوە دادەنا کە هەموو شیعرەکانی –تەواو وەکو جیهان– لە داڕشتنی خودی ئەم نین. شیعرەکەیشی وەکو یەکەم هۆنراوە، لەسەر تەوەرەی لۆژیک دانا.

## ١٢

# ئەگەر خودا هەبوونی نەبێ، ئەدی واتای ئەو هەموو ئازارە چییە کە هەژاران دەیچێژن؟

### بەسەرهاتی غەمگینیی نەجیب

(کا) لە ڕێگای گەڕانەوەیدا لە تەکیەی جەنابی شێخەوە بۆ هوتێل، لە ژێر بەفرەکەدا بیری لەوە دەکردەوە کە پاش کەمێکی تر ئیپەک دەبینێ. لە شەقامی خالید پاشا، سەرەتا تێکەڵ بە ئاپۆرەی بانگەشەکەرانی هەڵبژاردنی پارتی میللەت و دواتر کەوتە ناو ئەو قوتابیانەوە کە لە هۆڵی تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە زانکۆ دەهاتنە دەرێ: باسی سەیرکردنی تەلەفزیۆن لە ئێوارەدا و چەپەڵیی مامۆستای کیمیایان دەکرد. ئەوانیش، وەکو من و (کا)یش لەو تەمەنەدا دەمانکرد، ستەمکارانە یەکتریان دەرزی ئاژن دەکرد. لە بەردەم دەروازەی باڵەخانەیەکدا، کچێکی بچووکی چاو بە گریانی بینی کە دایک و باوکی دەستیان گرتبوو و لە تیمارخانەی پزیشکی ددانی سەرەوەی باڵەخانەکە دەهاتنە دەرێ. (کا) یەکسەر بە جلوبەرگی بەریاندا حاڵی بوو کە بە دژواری ژیان دەگوزەرێنن، سەرباری ئەوەیش، بۆ ئەوەی کچە لەرزۆکەکەیان ئازاری زیاتر نەچێژێ، لەبری نەخۆشخانەی دەوڵەت، هێناویانە بۆ لای پزیشکی تایبەت. لە دەرگایەکی کراوەی دوکانێکەوە کە گۆرەویی ژنان، دەرزی و دەزووی دوورمان، قەڵەمی بۆیاخ و پاتری و کاسێتی دەفرۆشت، گۆرانیی (ڕۆبێرتا)ی (پەپینۆ دی کاپری)ی کەوتە بەرگوێ. لەگەڵ بیستنی ئەم گۆرانییەدا کە لە سەردەمی منداڵیدا کاتێک بە ئۆتۆمبیلەکەی مامی دەچوون بۆ پیاسە لە بۆغاز، لە ڕادیۆکەوە گوێی لێ دەبوو، وای بۆچوو هەڵچوونی سۆزی دەروونی، شیعرێکی نوێ بێت، بۆیە خۆی کرد بە یەکەم چایخانەی بەردەمیدا، لەسەر یەکەم کورسیی بۆش دانیشت، قەڵەم و دەفتەرەکەی دەرهێنا.



دوای ئەوەی قەڵەم بە دەستەوە و چاو بە فرمێسکەوە ماوەیەک سەیری لاپەڕەکەی بەردەمی کرد، تێ گەیشت کە شیعری بۆنایات، بەڵام گەشبینییەکەی خۆی نەشێواند. بەسەر دیواری چایخانەکەوە کە سیخناخ بوو لە بێکاران و لە قوتابیان، چەند دیمەنێکی سویسرا، پۆستەری شانۆ، کاریکاتۆر و هەواڵی بڕاو لە ڕۆژنامەکان، ئاگادارییەک سەبارەت بە مەرجەکانی تاقیکردنەوەی وەرگرتنی کارمەندان و خشتەی یارییەکانی ئەمساڵی هەڵبژاردەی تۆپی پێی قارسی بینی. ئەنجامی زۆربەی گەمەکان کە بە دۆڕان کۆتاییی هاتبوو، لەسەر خشتەکە بە قەڵەمی جۆربەجۆر دەستنیشان کرابوو، لە تەنیشت گەمەی بەرامبەر بە هەڵبژاردەی تۆپی پێی ئەرزەرووم کە بە شەش گۆڵ بۆ ئەوان بەرامبەر بە گۆڵێک بۆ هەڵبژاردەی قارس کۆتاییی پێ هاتبوو، کەسێک ئەم چەند بەیتەی لای خوارەوەی نووسیبوو. (کا) ڕۆژێک دواتر لە چایخانەی -برایانی بەختەوەر- شیعرێکی بە ناوونیشانی (هەموو مرۆڤایەتی و ئەستێرەکان) نووسیبوو و جێی ئەم شیعرەیشی تێدا کردبووەوە:

**ئانامز چکپ گەلسە جەنەتتەن بزی کۆللاریلە سارسا**

**ئیمانسز بابامز ئۆنو بیر ئاکشامجک دایاکسز براکسا**

**گەنە دە پارا ئەتمەز، بۆکون دۆنار، ڕوحون کورور، ئوموت یۆک!**

**چەک سیفۆنو گیتسن کیشی دویشتویسە شەهری قارسا**

**ئەگەر دایکمان لە بەهەشتەوە بێتە دەرێ و لە ئامێزمان بگرێ**

**ئەگەر باوکە بێباوەڕەکەمان ئێوارەیەک بێ دارکاریکردن وازی لێ بێنێ**

**بەڵام هێشتا پووڵێ ناکات، گووەکەت دەیبەستێ، ڕوحت وشک دەبێتەوە، ئومێد نییە!**

**ئەو کەسەی ڕێی کەوتبێتە شاری قارس، با سیفۆنی ئاودەسەکە ڕاکێشێ و بڕوا**

لە کاتێکدا (کا) بە گەشبینی و بەدەم گاڵتەوە ئەم چوارینەیەی دەنووسییەوە، نەجیب بە ڕوویەکی خۆشەوە کە (کا) هەرگیز بۆی نەچووبوو لەودا ببینێ، لە یەکێک لە مێزەکانی پشتەوە هات و لە دەوری مێزەکەی (کا) دانیشت.

نەجیب گوتی: "زۆر خۆشحاڵ بووم بە دیدارت، ئەوە شیعر دەنووسی؟ داوای لێبووردن دەکەم کە هاوڕێکانم پێیان گوتی ئەتایست. یەکەمجاریانە لە ژیاندا

ئەتایستێک دەبین، بەڵام لە ڕاستیدا ناکرێ تۆ ئەتایست بی، چونکە مرۆیەکی زۆر باشی." ئەو هەندێ شتی تریشی گوت کە (کا) لە سەرەتادا سەری لێ دەرنەکردن: لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە قوتابخانە هەڵهاتبوون بۆ بینینی شانۆگەرییەکەی ئەم ئێوارەیە، بەڵام بڕیاریان دابوو لە ڕیزی پشتەوە دابنیشن، چونکە نەیاندەویست لە وەشانی زیندووی تەلەفزیۆندا نیشان بدرێن و بەڕێوەبەرەکەیان (پێیان بزانێ). زۆر شادمان بوو بە ڕاکردنیان لە قوتابخانە. لەگەڵ هاوڕێکانیدا وایان دانابوو لە هۆڵی شانۆی گەل یەک بگرنەوە. دەشیانزانی کە (کا) لەوێ شیعر دەخوێنێتەوە. لە قارس هەموو کەسێک شیعری دەنووسی، بەڵام (کا) تاکە شاعیر بوو کە شیعری بڵاوکرابێتەوە و ئەم بیناسێ. نەجیب پرسی ئایا دەتوانێ چایەکی بۆ بانگ بکات؟ (کا) گوتی کە پەلەیەتی.

نەجیب گوتی: "کەواتە پرسیارێک، دوا پرسیارت لێ دەپرسم، ئامانجم ئەوە نییە وەکو برادەرەکانم بێڕێزیت بەرامبەر بنوێنم. زۆر بە پەرۆشم."

"بەڵێ."

دەسپێک بە دەستە تووڕەکانی جگەرەیەکی داگیرساند:

"ئەگەر خودا هەبوونی نەبێ، واتای وایە بەهەشتیش نییە. کەواتە ملیۆنان کەسی هەژار و نەدار و چەوساوە ناچنە بەهەشتەوە. ئەگەر وایە، ئەدی واتای ئەو هەموو ئازارە چییە کە هەژاران دەیچێژن؟ بۆچی دەژین و لەبەرچی بەلاش و حەلاش ئەم هەموو تالاوە دەنۆشین؟"

"خودا هەیە و بەهەشتیش هەیە."

"نەخێر، ئەمە بۆ دڵدانەوەی من دەڵێی، چونکە بەزەییت پێماندا دێتەوە. کاتێکیش دەگەڕێیتەوە ئەڵمانیا، وەکو ڕابردوو بیر دەکەیتەوە کە خودا نییە."

(کا) گوتی: "ماوەی چەند ساڵێکە ئەوە یەکەمجارە ئەوەندە شادمان بم، من بۆ باوەڕم نەبێ بەوەی کە تۆ باوەڕت پێیەتی؟"

نەجیب گوتی: "چونکە تۆ بۆرژوایەکی ئەستەمبوڵیت، ئەوانە هەرگیز بڕوا بە خودا ناهێنن. ئەوانە لەبەرئەوەی باوەڕ بەو شتانە دێنن کە ئەوروپاییەکەل باوەڕیان پێی



هەیە، خۆیان لە سەرووی میللەتەوە دەبینن."

(کا) گوتی: "لەوانەیە بۆرژوایەکی ئەستەمبوڵی بووبم، بەڵام لە ئەڵمانیا نامۆیەک بووم کە کەس پولێکی نەدەخستە مستی. لەوێ دەچەوسێنرامەوە."

نەجیب بەدەم داخستنی پێڵوی چاوە جوانەکانیەوە سەیرێکی کرد. (کا) سەرنجی دا کە لاوەکە لە هزری خۆیدا بۆ ساتێک چاو بە ڕەوشی تایبەتی خۆیدا دەگێڕێتەوە و وردی دەکاتەوە. دواتر نەجیب گوتی: "کەواتە بۆچی دەوڵەتت تووڕە کرد و ڕات کرد بۆ ئەڵمانیا؟" کە (کا)ی بە غەمباری بینی، گوتی: "دەی، گوێی مەدەرێ! خۆ ئەگەر دەوڵەمەند بوومایە، شەرمم بە ڕەوشی خۆمدا دەهاتەوە و زیاتر باوەڕم بە خودا دەهێنا."

(کا) گوتی: "خودا یار بێت، ڕۆژێک دێت هەموومان دەوڵەمەند ببین."

"شتەکان هێندە سادە نین وەکو تۆ پێت وایە من بیری لێ دەکەمەوە. منیش ئەوەندە سادە نیم و ناشمەوێ دەوڵەمەند بم. گەرەکیشم نییە ببم بە شاعیر یان نووسەر. ڕۆمانێکی خەیاڵی زانستی دەنووسم. لەوانەیە لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی قارسدا بە ناوی (ڕم) چاپ بکرێ، بەڵام من نامەوێ ڕۆمانەکەم لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاو بکرێتەوە کە حەفتا و پێنج دانەی لێ دەفرۆشرێ، بەڵکو خوازیارم لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵدا کە بە هەزاران دانەی لێ دەفرۆشرێ، چاپ بکرێ. کورتەی ڕۆمانەکەم پێیە. ئەگەر بۆت بخوێنمەوە، دەتوانی پێم بڵێی ئایا دەکرێ لە ئەستەمبوڵ بڵاوبکرێتەوە؟"

(کا) سەیرێکی سەعاتەکەی کرد.

نەجیب گوتی: "زۆر بە کورتی!"

ڕێک لەو کاتەدا کارەبا بڕا و هەموو قارس نوقمی تاریکی بوو. نەجیب لەبەر ڕۆشناییی ئاگردانەکەدا تاوی دایە خۆی و مۆمێکی هەڵگرت و دایگیرساند، دڵۆپێکی بە سەر مێزەکەدا تواندەوە و مۆمەکەی لەسەر قایم کرد. چەند پارچە کاغەزێکی نووشتاوەی لە گیرفانی دەرهێنا و بە دەنگێکی لەرزۆک دەستی بە خوێندنەوەی کرد، جاروباریش لەگەڵیدا تفی قوت دەدایەوە.

"له ساڵی (٣٥٧٩)دا، دانیشتووانی سەر هەسارەی غەزالی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هێشتا نەدۆزراوەتەوە، زۆر دەوڵەمەند بوون. ژیانیشیان لەم ژیانەی ئەمڕۆی ئێمە فرە سادەتر بوو، بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی ماتەرلیستەکانەوە، مرۆڤەکان بەهۆی ئەوەی کە (ئیدی دەوڵەمەند بوون)، مۆراڵ و مەعنەویاتی خۆیان لە بیر نەکردبوو. تەواو بە پێچەوانەوە، دانیشتووان زۆر پەرۆشی بابەتگەلی هەبوون و نەبوون، مرۆڤ و گەردوون، خودا و ڕێساکانی بوون. لەو سۆنگەیەوە، لە دوورترین گۆشەی ئەم هەسارە سوورە، قوتابخانەیەکی زانستی ئیسلامی و وتاردان کرابووەوە کە قوتابی زیرەک و چاپوکی وەردەگرت. دوو برادەری گیانی بە گیانی لەم قوتابخایە دەیانخوێند: ئەم دووانە بە پەرۆشەوە کتێبە نووسراوەکانی (١٦٠٠) ساڵ لەمەوبەری نەجیب فازیلیان دەخوێندەوە کە بابەتەکانی ناویان دەربارەی ناکۆکییەکانی ڕۆژهەڵات–ڕۆژئاوا، هێشتا تازە و هەنووکەیی بوون. دوو قوتابییەکە بە سروش وەرگرتن لە نووسەر، ناوەکانی نەجیب و فازیلیان لە خۆیان نابوو. چەندین بار گەورەترین دانراوی مامۆستای گەورە بە ناونیشانی ڕۆژهەڵاتی گەورە دەخوێننەوە، شەوانە بە دزی ئەوانی ترەوە لە هۆڵی نووستن، لە سەر چرپاکەی فازیل دەگەیشتنە یەکتر، لە ژێر لێفەکەدا ڕادەکشان و سەیری کلووی بەفری شینیان دەکرد کە بەسەر بنمیچە شووشەییەکەدا دەباری و هەر دانەیەکی لە هەسارەیەکی لەناوچوو دەچوو، لەگەڵ ئەوەدا واتای ژیان و ئەو شتانەیان بە گوێی یەکتردا دەچرپاند کە دەیانویست لە داهاتوودا ئەنجامی بدەن.

لە ئاکامی جەفەنگی پڕ لە ئێرەییی کەسانی دڵقرێژدا، ئەم هاوڕێتییە بێگەردە ڕۆژێک لە ڕۆژان گەردی لێ نیشت. هەردووکیان لە هەمان کاتدا دڵیان لە کچێک چوو کە لە شارێکی دوور کاری دەکرد. سەرباری ئەوەی بۆیان ئاشکرابوو کە باوکی هیجران ئەتایستە، کەچی ئەمەیش لەو ئەڤینە بێچارەیە ڕزگاری نەکردن، بگرە گڕی ئەوینیان زیاتر تاوی سەند. بەمجۆرە هەر یەکەیان هەبوونی ئەوی تری لەسەر هەسارەی سوور بە زیادە دەزانی و لە کانگای دڵەوە حاڵی بوون کە پێویستە یەکێکیان بمرێ. لە دەسپێکدا ئەم بەڵێنەیان بە یەکتر دا: هەرکامیان بمرێ، ماوەیەک لە دوای گەیشتنی بە دنیای ئەودیو، جا چەندین ساڵی تیشکیش دوور بێ، دەبێ



بگەڕێتەوە و باسی ئەو شتە بۆ زیندووەکان بگێڕێتەوە کە زۆر بە پەرۆشن بۆ زانینی: باسی ژیانی دوای مردن.

بڕیاریشیان نەدا کێیان چۆن دەمرێ، چونکە هەریەکەیان دەیزانی بەختەوەری ڕاستەقینە لەوەدایە کە خۆی بە قوربانی بەختەوەری ئەوی تر بکات. ئەگەر یەکێکیان، بۆ نموونە فازیل، بیگوتایە با هەردووکمان لە هەمان کاتدا دەستمان بە ڕووتی بکەین بە پلاکی کارەباکەدا، ئەوا نەجیب تێ دەگەیشت کە ئەمە فێڵێکی پڕ لە تەڵەکەی فازیلە بۆ ئەوەی خۆی فیدای ئەم بکات و بمرێ، چونکە نەجیب دەیزانی پلاکی کارەباکەی لای خۆی، تەزوویەکی کەمتری پێدا دەڕوات. ئەم بێ بڕیارییە کە چەندین مانگ درێژەی خایاند و تاڵاوی زۆریشی کرد بە گەرووی هەردووکیاندا، لە شەوێکدا لەناکاو کۆتاییی هات: نەجیب دوای ئەوەی لە دەرزی شەو گەڕایەوە، کەوت بەسەر تەرمی برادەرە خۆشەویستەکەیدا کە لە پێخەوەکەیدا بێ بەزەییانە گولەباران کرابوو.

ساڵی دواتر نەجیب لەگەڵ هیجراندا ژیانی هاوسەریی پێکەوە نا و لە شەوی زەماوەندەکەیاندا سۆز و پەیمانی خۆی لەگەڵ هاوڕێکەیدا بۆ گێڕایەوە و پێی گوت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان تارمایی فازیل دەگەڕێتەوە. هیجرانیش بەوی گوت کە ئەو لە ڕاستیدا دڵی لە فازیل چووە و بەهۆی مردنیشیەوە چەندین ڕۆژ گریاوە هەتاکو چاوەکانی سوورِ هەڵگەڕاون. گوتیشی هەمیشە نەجیبی هەر بە هاوڕێی خۆی داناوە، بەڵام لەبەرئەوەی شێوەی لە فازیل دەچێ، ئێستا شووی پێ کردووە. بۆیە لەگەڵ یەکتریدا نەخەوتن و ئەوینیان لە خۆیان قەدەغە کرد هەتا ئەو ڕۆژەی فازیل دەگەڕێتەوە.

بەڵام بە تێپەڕبوونی ساڵان، سەرەتا ڕۆحیان و پاشان جەستەیان زۆر بەتوندی ئارەزوویان چووە سەر یەکتر. ئێوارانێک لە شاری قارسی بچووکی سەر ڕووی زەمین کە ئەرکێکی پشکنینیان پێ سپێردرابوو، خۆیان بۆ ڕانەگیرا و وەکو دێوانە لە یەک ئاڵان. وا دیار بوو فازیلیان لە بیر کردبوو کە وەکو ئازاری ددان ویژدانی هەردووکیانی دەئێشاند. جۆرێک لە هەستکردن بە تاوان لە دڵیاندا چەکەرەی کردبوو کە بە تێپەڕبوونی کات گەورە دەبوو و دەیترساندن. بۆ ساتێک هەردووکیان

وایانزانی هەستێکی سەیری تێکەڵ بە ترس دەیانخنکێنێ. پێکەوە چوونە جێگاکەوە. لەو ساتەدا پەردەی تەلەفزیۆنەکەی بەرامبەریان لە خۆیەوە ڕووناک بووەوە و بە شێوەیەکی ساف و بریقەدار دیمەنی فازیل هاتە سەری. برینی ئەو فیشەکانەی لە ڕۆژی کوشتنەکەیدا پێوەی نرابوو، هێشتا وەکو خۆی بە ناوچەوان و چەناگەیەوە مابوون و خوێنیان لێ دەچۆڕایەوە.

فازیل گوتی: "بە دەست ئازارەوە دەناڵێنم، شوێنێک نەماوە لە دنیای ئەودیو بۆی نەچووبم و نەمبینیبێ. (نەجیب گوتی: بە وەرگرتنی سروش لە غەزالی و ئیبنی عەرەبی وردەکارییەکانی ئەم گەشتە دەنووسمەوە.) گەیشتمە گەورەترین ڕێزنواندنی فریشتەکانی خودا، گەیشتمە ئەو شوێنانەی عەرش کە لە خانەی پێ نەگەیشتندا دانراون، ئەو سزا ترسناکانەم بینی کە لە دۆزەخ بەسەر خودانەناسە کراڤات لە ملەکان و بەسەر ئەو لە خۆبایی و پۆزیتیڤست و کۆڵۆنیالیستانەدا سەپێنراوە کە سووکایەتییان بە باوەڕی خەڵکی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵخۆش نەبووم، چونکە هۆشم لێرە لەگەڵ ئێوەدا بوو."

ژن و پیاوەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەو تارماییە غەمگینەیان دەکرد. "ئەو شتەی چەندین ساڵە منی غەمگین کردووە، ئەوە نییە کە ئەمشەو هەردووکتانم بە شادی بینی. بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە شادمانیی خۆم زیاتر، خوازیاری شادمانیی نەجیبم. لەبەرئەوەی وەکو دوو هاوڕێ یەکتریمان زۆر خۆش دەویست، نە خۆمان و نە یەکتریشمان بۆ نەکوژرا. هەردووکمان زرێپۆشی نەمریمان پۆشیبوو، چونکە هەر یەکەمان ژیانی ئەوی تری زۆر بەلاوە گرنگ بوو. ئای کە هەستێکی پڕ لە شادی بوو، بەڵام مردنەکەم دەسبەجێ بۆی سەلماندم کە بە باوەڕهێنانم بەو هەستە، هەڵەم کردووە."

نەجیب قیراندی و گوتی: "نەخێر، هیچ کاتێک هێندەی ژیانی تۆ، بایەخم بە ژیانی خۆم نەداوە."

تارماییەکەی فازیل گوتی: "ئەگەر ئەمە ڕاست بوایە، من نەدەمردم و تۆیش لەگەڵ هیجرانی شۆخدا ژیانی هاوسەریت پێکەوە نەدەنا. من بۆیە مردم، چونکە تۆ ویستت مردنەکەم پەردەپۆش بکەیت و تەنانەت لە خۆیشتی بشاریتەوە."



نەجیب زۆر هەوڵی دا وەڵام بداتەوە، بەڵام تارماییەکە گوێی لێ نەبوو.

تارماییەکە گوتی: "هەر بەتەنیا گومانی ئەوە نا کە تۆ مەرگی منت دەویست، بەڵکو ختورەیێ ئەوەی کە پەنجەت هەبێ لە لێدانی نامەردانەی ناوچەوانمدا کاتێک لە تاریکاییی شەودا لە ناو جێگاکەمدا نووستبووم و هەروەها ترسی ئەوەی لەگەڵ نەیارەکانی شەریعەتدا دەستت تێکەڵ کردبێ، لە دنیای ئەودیو هیچ ئارامیی پێ نەبەخشیم و ئۆقرەی لێ بڕیوم." نەجیب نقەی لە خۆی بڕیبوو و چی نارەزاییی دەرنەدەبڕی.

تارماییەکە گوتی: "تەنیا ڕێگایەک هەیە بۆ ئەوەی من لەم نائارامییە ڕزگارم بێت و بتوانم بچمە بەهەشتەوە و تۆیش ئەم گومانە سامناکەت لە کۆڵ بێتەوە! بکوژەکەم کێیە بیدۆزەرەوە. ماوەی حەوت ساڵ و حەوت مانگ تێ پەڕی و تەنانەت گومانلێکراویشیان بۆ نەدۆزراوەتەوە. دەمەوێ تۆڵە لەوانە بکەمەوە کە دەستیان لە کوشتنمدا هەبووە یان تەنانەت نیازیان هەبووە. ئەگەر بکوژ نەدۆزرێتەوە و بە سزای خۆی نەگات، ئەوا من لەم دنیایە و ئێوەش لەو دنیا کاتییە کە بە دنیای ڕاستەقینەی خۆتانی دەزانن، تامی ئارامی ناچێژن."

ژن و پیاوە سەرسوڕماوەکە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە فریای دەربڕینی هیچ جۆرە نارازییەک نەکەوتن. تارماییەکە لەناکاو لەسەر پەردەی تەلەفزیۆنەکە نەما و ڕۆیشت.

(کا) پرسی: "ئێ، ئەدی دوایی چی ڕووی دا؟"

نەجیب گوتی: "هێشتا بڕیارم لەسەر کۆتاییەکەی نەداوە. ئەگەر ئەم بەسەرهاتە بنووسمەوە بە ڕای تۆ فرۆشی دەبێت؟" کاتێک سەرنجی دا (کا) بێدەنگە، دەسبەجێ چەند وشەیەکی تری لە قسەکانی خۆی زیاد کرد: "بەڵام من تەنیا ئەو شتانە دەنووسم کە خۆم باوەڕم بە ڕستە بە ڕستەیان هەیە. ئەم چیرۆکەی کە من دەمخوێندەوە بە ڕای تۆ چ دەگەیەنێ، تۆ هەستت بە چی کرد؟"

"بە مچوڕکە پێداهاتنەوە حاڵی بووم تۆ لە قووڵاییی دڵتەوە باوەڕت وایە کە ئەم ژیانە بەتەنیا تەدارەک سازدانە بۆ ژیانی دنیای ئەودیو."

نەجیب بە خرۆشەوە گوتی: "بەڵێ، باوەڕم وایە، بەڵام ئەمە بەس نییە. خودا دەیەوێ ئێمە لەم دنیایەشدا بەختەوەر بین، بەڵام ئای کە کارێکی دژوارە!"

هەردووکیان بەدەم بیرکردنەوە لەو دژوارییە، بێدەنگ بوون.

لەو کاتەدا کارەبایش هاتەوە، بەڵام ئەوانەی ناو چایخانەکە هەر وەکو ئەوەی تاریکی درێژەی هەبێ، دەنگیان لێوە نەهات. خاوەنی چایخانەکە دەستی کرد بە کێشان بەسەر تەلەفزیۆنەکەیدا بۆ ئەوەی بیخاتە کار.

نەجیب گوتی: "ماوەی بیست خولەکە دانیشتووین، ئێستا برادەران لە پەرۆشیدا شەقیان بردووە."

(کا) گوتی: "برادەران کێن؟ فازیلیشیان لەگەڵدایە؟ ئایا ئەمانە ناوی ڕاستەقینەی خۆتانە؟"

نەجیب بەشێوەیەکی پڕ لە ڕاز وەڵامی دایەوە و گوتی: "بێگومان وەکو نەجیبی ناو بەسەرهاتەکە، ناوەکەی منیش نازناوە. وەکو پۆلیس پرسیار مەکە! فازیلیش هەرگیز بۆ ئەم جۆرە شوێنانە نایات، فازیل مسوڵمانترین کەسی ئێمەیە و تاکە کەسیشە لە ژیانمدا کە من هێندە متمانەم پێی هەبێ. بەڵام ترسی ئەوەی هەیە ئەگەر خوو بداتە سیاسەت، ناوی بخرێتە لیستەوە و لە قوتابخانەش تووڕ بدرێ. مامێکی هەیە لە ئەڵمانیا کە ئامادەیە بیگرێتە خۆی. ئێمەیش وەکو ئەوانەی ناو بەسەرهاتەکە یەکتریمان زۆر خۆش دەوێت و ئەگەر کەسێک بمکوژێ، دڵنیام کە ئەو تۆڵەم بۆ دەکاتەوە. لە ڕاستیدا، ئێمە زۆر لەوە لە یەکتر نزیکترین وەکو لە بەسەرهاتەکەدا گێڕاومەتەوە. پێوەندیمان بەجۆرێکە، چەندەیش لە یەکتر دوور بین، هەریەکەمان دەتوانین بڵێین ئەوی ترمان چی دەکات.!"

"فازیل ئێستا چی دەکات؟"

نەجیب بەدەم لێدانی پۆزێکی سەیرەوە گوتی: "هم، لە هۆڵی نووستنەکە دەخوێنێتەوە."

"هیجران کێیە؟"

"ئەویش وەکو ئێمە ناوی ڕاستەقینەی شتێکی ترە. بەڵام هیجران ناوێک نییە کە



ئەو لە خۆی نابێ، بەڵکو ئێمە ئەم ناوەمان بۆ داناوە. کەسانێک هەن کە بەردەوام نامەی خۆشەویستی و شیعری بۆ دەنووسن، بەڵام لە ترساندا ناوێرن بینێرن. ئەگەر کچێکم هەبوایە، خۆزگەم دەخواست وەکو ئەو جوان و ئاقڵ و بوێر بوایە. ئەو ڕابەری کچانی سەرداپۆشراوە، لە هیچ شتێک سڵ ناکاتەوە، کەسایەتییەکی بەهێزی هەیە. ڕاستییەکەی، دەسپێک لە ژێر کاریگەریی باوکە ئەتایستەکەیدا ئەویش بێباوەڕ بووە، لە ئەستەمبوڵ وەکو مانکەن کاری کردووە، لە تەلەفزیۆن دەرچووە و پاشەڵ و ڕانی خۆی نیشان داوە. بۆ ڕێکلامێکی شامپۆ بۆ تەلەفزیۆن دێتە ئێرە. بە شەقامی غازی ئەحمەد موختاردا کە هەژارترین و پیس و پۆخڵترین، بەڵام جوانترین شەقامی قارسە، دەڕوات و لەناکاو لە بەردەم کامێراکەدا ڕادەوەستێ، بە جووڵەیەک سەری هەتا قەبرغەی درێژ دەکات و بەدەم لەرینەوەی قژە زەردباوە جوانەکەیەوە وەکو ئاڵا، دەڵێ: (سەرەڕای پیس و پۆخڵیی شاری قارسی جوان، لە سایەی شامپۆی بلینداکسدا قژم بریسکەی دێ.) ڕێکلامەکە لە سەرانسەری جیهان نیشان دەدرێ، هەموو جیهانیش بە ئێمە پێ دەکەنێ. دوو کچی پەیمانگای پەروەردە کە ئەودەم تازە دەستیان بە خەباتی سەرداپۆشین کردبوو، لە ڕێی تەلەفزیۆن و لە ڕێی وێنەکانیەوە لە ڕۆژنامەکانی تایبەت بە وتی وتی و قسە و قسەڵۆکدا کە باسی دزێوکاریی ئەویان لەگەڵ لاوانی دەوڵەمەندی ئەستەمبوڵدا بڵاوکردبووەوە، هیجران دەناسنەوە. بە دزییەوە سەرسامیی خۆیان بۆ دەربڕیبوو، بانگهێشتتیان کردبوو بۆ چای خواردنەوە، هیجرانیش بۆ پێ ڕابواردنیان، ڕازی دەبێت و دەچێت. لەوێ دەسبەجێ لە کچەکان بێزار دەبێ وایان پێ دەڵێ: (مادام ئاینەکەتان -بەڵێ، ناڵێ ئاینەکەمان، دەڵێ ئاینەکەی ئێوە- دەرخستنی قژتان و دەوڵەتیش داپۆشینی قەدەغە دەکات، کەوابوو ئێوەش وەکو فلان کەس -لێرەدا ناوی ئەستێرەیەکی بیانیی ڕۆک دەهێنێ- قژتان لە کۆکەوە ببڕن و هەریەکەتان ئەڵقەیەکی ئاسن بکەنە لووتتان! ئەو کاتە هەموو جیهان بایەختان پێ دەدات! کچەکانمان لە گێلی و بەلەنگازیی خۆیاندا بەدەم قسە بێ تامەکانی هیجرانەوە پێ دەکەنن! هیجران لەمەوە بوێرتر دێتە گۆ و دەڵێ: "ئەم پارچە پەڕۆیە کە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، لەسەرتان بکەنەوە.) بەدەم قسەوە دەست بۆ سەرپۆشی پەشۆکاوترین کچیان دەبات و دەیەوێ لە سەری

بکاتەوە، بەڵام ئەو دەستە لەو ساتەدا لە جووڵە دەکەوێ. دەسبەجێ خۆی دەخاتە زەوی و داوای لێبووردن لە کچەکە دەکات. برای کچەکە کە بێ عەقلترین کەسی ناو بێ عەقڵەکانە، لە پۆلی ئێمەیە. ڕۆژی دواتر دەگەڕێتەوە بۆ لای کچەکان، چەند جارێک سەریان لێ دەداتەوە و ئیدی تێکەڵ بە ئەوان دەبێت و ناگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ. باوەڕم پێ بکە، ئەو فریشتەیەکە کە سەرپۆشی کرد بە ئاڵای سیاسیی ژنانی مسوڵمانی چەوساوەی ئەنادۆڵ!"

(کا) پرسی: "ئەی کەوایە، بۆچی لە بەسەرهاتەکەتدا جگە لە باسی ئەوەی کە کچێکی عازەبە، باسی هیچ شتێکی تریت نەکردووە؟ نەجیب و فازیل بەر لەوەی لە پێناوی ئەودا خۆیان بکوژن، بۆچی بە خەیاڵیاندا نەهات بزانن بۆچوونی هیجران چییە؟"

بێدەنگییەکی ئاڵۆز دای گرتن. لەو دەمەدا نەجیب چاوە جوانەکانی کە دوای دوو کاتژمێر و سێ خولەکی تر کەسێک بە فیشەک پارچە پارچەی دەکات، بۆ سەرەوە، بۆ ئاستی کوچەکە هەڵبڕی و بە ڕامانەوە نیگای بڕیە بەفرەکە کە هێدی هێدی وەکو شیعر لە تاریکیدا دەباری. پاشان نەجیب بە چرپە گوتی: " ئا ئەوەتا. ئا ئەوەتا!"

"کێ؟"

"هیجران! وا لە کوچەکەدا!"



# ١٣

## لەگەڵ خودانەناسێکدا ئاینەکەم تاوتوێ ناکەم

### پیاسەیەک لەگەڵ قەدیفە بەژێر بەفردا

لە کوچەکەوە هاتە ژوورەوە. چاکەتێکی بارانیی مۆری لەبەردا بوو، چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاوکردبوو کە شێوەی گۆڕیبووە سەر قارەمانی ناو فیلمە خەیاڵییەکان، سەرپۆشێکیشی لەسەر کردبوو کە هیچ هێمایەکی ئیسلامی سیاسیی پێوە دیار نەبوو، بەڵکو سەرپۆشێکی ئاساییی ئەوتۆ بوو کە (کا) هەر لە سەردەمی منداڵیی خۆیەوە بە سەری هەزاران ژنەوە بینیبووی. کاتێک هەستی کرد کە کچە لاوەکە بەرەو لای ئەو دێت، وەکو چۆن قوتابی لە کاتی هاتنەژوورەوەی مامۆستا بۆ ناو پۆل هەڵدەسێتە سەرپێ، (کا) بەرزەپێ لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی.

کچەکە بە سووکە خەندەیەکەوە گوتی: "من قەدیفەی خوشکی ئیپەکم، هەموان لەسەر خوانی ئێوارە چاوەڕێی ئێوە دەکەن. باوکم ویستی لەگەڵ خۆمدا بتانبەمەوە."

(کا) گوتی: "لە کوێوە زانیتان کە من لێرەم؟"

قەدیفە بێ ئەوەی پێ بکەنێ، گوتی: "لە قارسدا، هەموان بەردەوام ئاگاداری هەموو شتەکانن. بەس نییە ئەمەشمان هەیە لە قارس."

هێمای غەمێک بەسەر ڕوویەوە دەرکەوتبوو: (کا) بەهیچ شێوەیەک سەری لێ دەرنەکرد. (کا) بەدەم ناساندنی (نەجیب)ەوە گوتی: "هاوڕێی شاعیر و ڕۆماننووسم!" سەیرێکی یەکتریان کرد، بەڵام دەستیان نەخستە دەستی یەکترەوە. (کا) هۆیەکەی گەڕاندەوە بۆ شڵەژانی هەردووکیان، بەڵام کاتێک دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژ گەڕایەوە سەر ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، بۆی ڕوون بووەوە کە دوو ئیسلامییەکە لە ڕووی خۆداپۆشینەوە تەوقەیان لەگەڵ یەکتریدا نەکردووە. نەجیب بە ڕوویەکی سپی داگەڕاوی ئەوتۆوە لێی دەڕوانی وەکو ئەوەی هیجران لە ئاسمانی

دەرەوە هاتبێ، بەڵام قەدیفە ئەوەندە ئاسایی دەینواند، تەنانەت هیچ پیاوێکی ئاپۆڕەی ناو چایخانەکە ئاوڕی نەدایەوە و سەیری نەکرد. هێندەی دادەیشی جوان نەبوو.

بەڵام (کا) هەستی بە شادی کرد کاتێک لە ژێر بەفردا لەتەک قەدیفەدا بە شەقامی ئەتاتورکدا پیاسەیان دەکرد. لەبەرئەوەی بە هاسانی لە تەکیدا دەدوا و دەیتوانی وەکو خوشکە گەورەکەی چاو ببڕێتە قوڵاییی چاوە کاڵەکانی و دەموچاوی سادە و جوانی کە سەرپۆشەکەی شێوەیەکی چوارچێوەییی پێ بەخشیبوو، سەرنجڕاکێش هاتە بەر چاوی، بیری بۆ ئەوە چوو کە هەر لە ئێستاوە ناپاکیی لە دادەی کردووە.

سەرەتا دەربارەی بارودۆخی کەش و هەوا قسەیان کرد کە (کا) هیچ چاوەڕێی ئەمەی نەدەکرد. قەدیفە تەنانەت ئاگاداری ئەو وردەکارییانەیش بوو کە مەگەر هەر ئەو پیر و پەککەوتانە بیزانن کە ڕۆژی خۆیان بە گوێگرتن لە هەواڵی ڕادیۆکانەوە بەسەر دەبەن. بەردەوامبوونی شەپۆلی هەوای نزم و شەپۆلی سەرمای هاتوو لە سیبریاوە بۆ ماوەی دوو ڕۆژی تر، نەکردنەوەی ڕێگا و بانەکان هەتا دوو ڕۆژی تر ئەگەر بارینی بەفر بەردەوام بێت، بەرزبوونەوەی ڕادەی بەفر بارین لە ساریقامیش بۆ (١٦٠) سەنتیمەتر، بێ بڕواییی قارسییەکان بە دەزگای مەترۆلۆژی، هەمیشە نیشاندانی پلەی گەرما بە (٥-٦) پلە بەرزتر لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ ئەوەی وورەی دانیشتووان نەڕووخێ، بەربڵاوترین قسە و باسی ناو خەڵکی بوون کە قەدیفە گێڕایەوە. (ڕاستییەکەی کەس نەبوو بابەتێکی لەو جۆرە بۆ (کا) باس بکات.) لە سەردەمی منداڵیاندا لە ئەستەمبوڵ، هەمیشە لەگەڵ ئیپەکی خوشکیدا دەیانویست بەفری زیاتر بباریێ: بەفر لە ناخی ئەودا هەستی جوانی و کورتیی ژیانی دەوروژاند، سەرنجی بۆ ئەوە ڕادەکێشا کە مرۆگەل سەرەڕای دوژمنایەتییەکانیان، لە یەک دەچن، جیهان و زەمان زۆر بەرفراوانن و جیهانی مرۆڤیش زۆر تەنگە. بۆیە مرۆگەل لە کاتی بارینی بەفردا دەگەڕێنەوە بۆ لای یەکتر. بەفر وەکو ئەوە وایە بەسەر دوژمنایەتی، تووڕەیی، ڕق و کینەدا بباریێ و مرۆڤەکان لە یەکتر نزیک بخاتەوە.

کەمێک بێدەنگ بوون. بە شەقامی شەهید جەنگیز تۆپاڵدا کە هەموو دوکانەکانی داخرابوو، تێ پەڕین و تووشیان نەبوو بە تووشی کەسەوە. (کا) هەستی کرد



هێندەی بە پیاسەی ژێر بەفر لەگەڵ قەدیفەدا خۆشحاڵە، هێندەیش شڵەژاوە. نیگای بڕیە ڕووناکیی جامخانەیەکی ئەوسەری شەقامەکە: ترسی ئەوەی هەبوو ئەگەر جارێکی تر چاو ببڕێتە ناو چاوی قەدیفە، عاشقی ببێت. لە خۆی دەپرسی کە تۆ بڵێی گرفتاری ئەڤینی دادەی بووبێ؟ ئارەزوویەکی ژیرانە بۆ ئەڤینداربوونێکی دێوانەیی لە ناخیدا هەبوو، خۆیشی بەمەی دەزانی. کاتێک گەیشتنە کۆتاییی کوچەکە، پەڕەی دەفتەرێکیان بە جامخانەی بیرەخانەی بچووک و تەنگەبەری نەشئەوە بینی کە لەسەری نووسرابوو (کۆبوونەوەی بەڕێز زیهنی سەڤویک-ی پاڵێوراوی پارتی نیشتمانی ئازاد بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی، بەهۆی نمایشی شانۆی ئەم ئێوارەیەوە دواخراوە.) لە بیرەخانەکەی ئەودیو ڕووناکییەکەیشدا سونای زایم و سەرجەم ئەندامانی تیپی شانۆیان بینی کە بیست خولەک بەر لە دەست پێکردنی نمایشەکەیان بە شەوق و زەوقێکی ئەوتۆوە دەیانخواردەوە وەکو ئەوەی دوا خواردنەوەی ژیانیان بێت.

(کا) بەدەم سەیرکردنی پۆستەرێکی لەسەر کاغەزی زەرد چاپکراوەوە کە "مرۆڤ شاکاری خودایە و خۆکوشتن کفرە"ی لەسەر نووسراوبوو و لە نێوان پۆستەرەکانی هەڵبژاردندا بە جامخانەی بیرەخانەکەوە هەڵواسرابوو، لە قەدیفەی پرسی کە داخۆ ڕای چییە لەسەر خۆکوشتنی تەسلیمە.

قەدیفە بە سووکە تووڕەبوونێکەوە گوتی: "ئیدی لە ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ و ئەڵمانیاشدا وەکو بەسەرهاتێکی سەرنجڕاکێش لەسەر تەسلیمە دەنووسی."

(کا) گوتی: "من تازەبەتازە وا خەریکم ئاشنای قارس دەبم، هەرچەند زیاتریش بیناسم، ئەو هەستەم لا دروست دەبێت کە ناتوانم بەسەرهاتەکانی ئێرە بۆ هیچ کەسێکی تر لە دەرەوە بگێڕمەوە. گریانم دێ بۆ تێکشکانی مرۆڤەکان بەرانبەر بە ژیان و بێهودەییی ئەو ئازارانەی کە دەیچێژن."

قەدیفە گوتی: "بەتەنیا ئەتایستانی ئازارنەچێژ پێیان وایە کە ئازارچەشتن کارێکی بێهودەیە، چونکە ئەتایستگەلێک کە تەنانەت تۆزقاڵێکیش ئازاریان چەشتبێ، ماوەیەکی درێژ خۆیان لە بەرامبەر بێباوەڕیدا پێ ڕاناگیرێ و لە ئاکامدا باوەڕ دێنن."

(کا) بە کەللەڕەقییەکەوە کە لە خواردنەوەی مەیەوە سەرچاوەی گرتبوو، گوتی: "بەڵام تەسلیمە لە دوا پنتی ئازاردا خۆی کوشت و بە بێباوەڕی سەری نایەوە."

"بەڵێ، تەسلیمە ئەگەر بە خۆکوشتن کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنابێ، واتای ئەوەیە گوناهی کردووە، چونکە خۆکوشتن لە ئایەتی بیست و نۆیەمینی سورەتی –النساء– دا بە ئاشکرا حەرام کراوە. بەڵام خۆکوشتن و خۆ گوناهبارکردنی ئەم هاوڕێیەمان، بە واتای کەمکردنەوەی خۆشەویستیی ناو دڵمان نایات بەرانبەری کە خەریکە لە بەتینیدا دەگاتە ئاستی ئەڤین."

(کا) لە هەوڵێکدا بۆ ئەوەی کچەکە بخاتە ژێر باندۆری خۆیەوە، گوتی: "دەتەوێ بڵێی، بەدبەختێک سەرباری ئەوەی کارێکی لە لایەن ئاینەوە نەفرەت لێکراویشی ئەنجام دابێ، ئێمە دەتوانین بە دڵ خۆشمان بوێ. دەتەوێ وەکو ڕۆژئاواییەکان کە پێویستیان بە خودا نەماوە، بڵێی ئێمە بە دڵ نا، بەڵکو بە لۆژیک باوەڕ دەهێنین؟"

قەدیفە بە بڕوا بەخۆبوونەوە گوتی: "قورئانی پیرۆز فەرموودەی خودایە، ئێمەی بەندە بۆمان نییە فەرمووده ڕوون و یەکلاییکەرەوەکانی تاوتوێ بکەین. هەڵبەتە ئەمە بە واتای ئەوە نایات کە ناکرێ گفتوگۆ دەربارەی هیچ لایەنێکی ئاینەکەمان بکرێ، بەڵام من ئامادە نیم ئاینەکەم لەگەڵ ئەتایستێکدا، تەنانەت لەگەڵ لایسیستێکیشدا تاوتوێ بکەم. تکایە لەم ڕووەوە بمبەخشە."

"ڕاست دەکەن."

قەدیفە لە سەری ڕۆیشت و گوتی: "هەروەها من لەو ئیسلامییە چەوتانەیش نیم کە هەوڵ دەدەن لە لایسیستەکانی بگەیەنن کە ئیسلام ئاینێکی لایسیستە."

(کا) گوتی: "ڕاست دەکەن."

قەدیفە بەدەم زەردەخەنەوە گوتی: "بۆ هەردووکیان هەر دەڵێن –ڕاست دەکەن–، بەڵام پێم وانییە بەڕاستی باوەڕتان بەمە هەبێ."

(کا) بێ ئەوەی پێ بکەنێ، گوتی: "دیسان ڕاست دەکەن."

ماوەیەک بەبێدەنگی ڕێیان کرد. لە خۆی پرسی کە تۆ بڵێی لە بری دادەی، دڵی لەم بچێ؟ (کا) زۆر باش دەیزانی کە ئارەزووی زایەندی ناچێتە سەر ژنی سەرداپۆشراو،



بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ ساتێک نەیتوانی پابەندی ئەو بۆچوونەی خۆی بێت.

لەگەڵ گەیشتنیاندا بە شەقامی قەرەداغ، سەرەتا قسەی بردەوە سەر شیعر و نەزانانە ئەوەیشی لێ زیاد کرد کە نەجیب شاعیرە، لە قەدیفەی پرسی کە داخۆ ئاگای لەو هەموو هەوادارەی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان هەیە کە بەناوی هیجرانەوە دەیپەرستن.

"بە چ ناوێکەوە؟"

(کا) بە کورتی باسی هەندێ لەو بەسەرهاتانەی تریشی کرد کە دەربارەی هیجران بڵاوبوونەتەوە.

قەدیفە گوتی: "ئەمانە هیچیان ڕاست نین، شتی وایشم لە قوتابیانی پێشنوێژ و وتارخوێنان نەبیستووە." دوای چەند هەنگاوێک بە زەردەخەنەوە گوتی: "بەڵام پێشتر بەسەرهاتی شامپۆکەم بیستووە." دوایی بۆ نیشاندانی سەرچاوەی ئەو شتەی دراوەتە پاڵی، بیری کەوتەوە کە یەکەمجار ڕۆژنامەنووسێکی دەوڵەمەند و نەفرات لێکراوی ئەستەمبوڵی پێشنیازی کردووە کە کچانی سەرداپۆشراو پرچی خۆیان لە کۆکەوە بتاشن بۆ ئەوەی سەرنجی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی بۆ سەر خۆیان ڕابکێشن. "تەنیا شتێک لەم بەسەرهاتەدا ڕاستە: بەڵێ، یەکەمجار بەنیازی پێ ڕابواردن چووم بۆ لای ئەو کچانەی برادەرم کە ناوی کچانی سەرداپۆشراویان بەسەردا براوە! هەندێکیش خۆ تێ هەڵقورتێنەر بووم. ئێ باشە: بە هەستێکی تێکەڵ لە پێ ڕابواردن و خۆ تێ هەڵقورتاندنەوە چووم بۆ لایان."

"دوایی چ قەوما؟"

"هۆی هاتنم بۆ ئێرە ئەوەبوو کە کۆی ژمارەکانم بۆ پەیمانگای پەروەردە دەستی دەدا و ئیپەکی خوشکیشم ماوەیەک بوو لە قارس گیرسابووەوە. ئەو کچانە هەر چییەک بووبن، هاوڕێ و هاوپۆلی خۆم بوون و کاتێک بۆ ماڵەوە بانگهێشتنت دەکەن، تۆ هەر دەچیت کە ئەگەر تەنانەت باوەڕمەندیش نەبیت. بگرە بەپێی بۆچوونی ئەوسایشم هەستم کرد مافی خۆیانە سەرپۆش بەسەر بکەن، چونکە دایک و باوکیان بەوجۆرە پەروەردەیان کردبوون. تەنانەت خودی دەوڵەتیش بە تەرخانکردنی دەرزی

ئاین پشتیوانیی لێ دەکردن. ئەوانە هەر ئەو کچانە بوون کە ساڵانێکی درێژ پێیان گوترابوو (سەرتان داپۆشن)، کەچی دواتر پێیان دەگوترا (سەرتان رووت بکەن، چونکە دەوڵەت وای دەوێ.) منیش هەروا لە رووی پشتیوانی سیاسییەوە بۆ ئەوان، ماوەی رۆژێک سەرپۆشم لە سەر کرد. لەلایەک لەوەی کردبووم، دەترسام و، لەلایەکی تر پێکەنینم پێ دەهات. لەوانەیە لە بەر ئەوە بوویێ کە بیرم دەکەوتەوە من کچی باوکێکی ئەتایستی هەمیشە نەیار بە دەوڵەت بووم. کاتێک دەچووم بۆ ئەوێ، زۆر لەوە دڵنیا بووم کە ئەمەی دەیکەم تەنیا بۆ ماوەی رۆژێکە: وام دەزانی بیروەرییەکی سیاسیی تاڵ یاخۆ –تاقیکردنەوەیەکی ئازادی–یە کە مرۆڤ دوای چەندین ساڵ وەکو گاڵتەیەک بیری دەکەوێتەوە. بەڵام دەوڵەت و پۆلیس و رۆژنامەکانی ئێرە بەشێوەیەکی ئەوتۆ دابەزینە سەرم کە نەمتوانی لایەنی شۆخی و –سادەیی–ی ئەم رفتارەم بخەمە روو و خۆم لەم کارەم رزگار بکەم. بە تۆمەتی سازدانی رێپێوانی بێ مۆڵەت لە گۆشەی گرتووخانە قایمیان کردین. رۆژی دواتر کە ئازادکراین، ئەگەر بمگوتبا – پاشگەز بوومەتەوە، خۆ من هەر لە سەرتایشەوە باوەڕم بەم رەفتارە نەبوو،– ئەوا هەموو خەڵکی قارس تف بارانیان دەکردم. ئێستا دەزانم خودا بۆیە ئەو هەموو گوشارەی بۆ من نارد، بۆ ئەوەی رێی راست بدۆزمەوە. منیش سەردەمانێک وەکو تۆ ئەتایست بووم، ئاوا تێم مەڕوانە، هەست دەکەم بە زەییت پێمدا دێتەوە."

"من وا بۆ تۆ ناڕوانم."

"بەڵێ، وا تێم دەڕوانی. باشیش بزانە خۆم لە تۆ بە گاڵتەجاڕتر نازانم و لە تۆیش زیاتر نیم."

"ڕای باوکت لەسەر هەموو ئەمانە چییە؟"

"هەر چۆنێک بێت شانمان داوەتە بەری و دەیگوزەرێنین، بەڵام رەوشەکەیش بە ئاراستەیەکدا دەبرێ کە نەگوزەرێنرێ و زۆریش دەترسین، چونکە ئێمە یەکتریمان زۆر خۆش دەوێ. باوکم لە سەرەتاوە شانازیی پێوە کردم، ئەو رۆژەی سەرم داپۆشی و چووم بۆ پەیمانگا، باوکم وا هەڵسوکەوتی کرد وەکو ئەوەی من دەیکەم شێوازێکی زۆر تایبەتی سەرهەڵدان بێ. لەگەڵ مندا لە ئاوێنە چوارچێوە مسینەکەی کە لە دایکمانەوە بۆمان ماوەتەوە، سەیری وەستانی سەرپۆشەکەی بەسەر سەرمەوە کرد و



ماچێکیشی کردم. ئەگەر چی زۆر کەمیش لە نێوان خۆماندا لەو بارەیەوە دوابین، شتێکی روون و ئاشکرا لە گۆڕێدا بوو: ئەوەی من دەمکرد لەبەرئەوە نا کە رەفتارێکی ئیسلامی بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی دژ بە دەوڵەت بوو، مایەی رێز لێنان بوو. باوکیشم خۆی وا نیشان دەدا وەکو ئەوەی بڵێ –کچی من ئەمەی لێ دەوەشێتەوە–، بەڵام لە ناخەوە ئەویش وەکو من دەترسا. دەزانم، کاتێک دەستگیر کراین، ترسابوو و پەشیمانیی نواندبوو. بە قسەی ئەو بێت، پۆلیسی سیاسی وازیان لە من هێناوە، بەڵام هێشتا بەدوای ئەوەوەن. کارمەندانی دەزگای هەواڵگریی میللی –میت– کە جاران لێرە بێ هەدادان راپۆرتیان لە چەپ و دیموکراتەکان دەدا، ئێدی چاودێریی ئیسلامییەکانیان دەکرد؛ کارەکەیان شتێک بوو لەو بابەتەی کە لە کچی تێکۆشەرێکی دێرینەوە دەست پێ بکەن. هەموو ئەمانە هەنگاو هاویشتنی منی بۆ دواوە دژوارتر کرد و باوکیشم ناچار بوو پشتیوانی لە هەموو هەنگاوەکانم بکات، بەڵام ئەمە تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوو. هەروەکو چۆن کەسانی بەساڵاچووی وا هەن کە دەنگ و خشپەی ناو ماڵان، ترپەترپی سۆپا، بۆڵەبۆڵی نەبڕاوەی ژنەکانیان سەبارەت بە بابەتی جۆراوجۆر و جیڕەی قوڵفی دەرگای ماڵەوە ببیستن یان نەبیستن، بە لایەنەوە وەکو یەک وایە و بەزانینەوە بەهەند وەری ناگرن: باوکیشم بەرامبەر بە تێکۆشانی من لە تەک کچانی سەرداپۆشراودا بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتی دەکرد. کاتێکیش یەکێک لەو کچانە لە تەکمدا دەهاتەوە بۆ ماڵەوە، باوکم چەشنی دەڵەبەراز خودانەناسیی دەنواند و بەوجۆرە تۆڵەی دەکردەوە، بەڵام لە ئاکامدا کارەکە لەگەڵ ئەو کچانەدا وەرگەڕایە سەر جۆرێک لە دژایەتیکردنی دەوڵەت. کۆبوونەوەکانیشم لە ماڵەوە ساز دەکرد، چونکە بێدەنگ نەبوونی کچەکان و خۆڕاگرتنیان لە بەرامبەر بۆچوونەکانی باوکمدا، بۆ من واتای پێگەیشتن و کامڵ بوونی ئەوانی دەگەیاند. خەندە کە یەکێکە لەو کچانە، ئەم ئێوارەیە دێت بۆ ماڵی ئێمە. لە دوای خۆکوشتنی تەسلیمە، خەندە لە ئاکامی گوشاری خێزانەکەیدا بڕیاری دا سەرپۆش فڕێ بدا، بەڵام بڕیارەکەی بۆ جێبەجێ ناکرێ. باوکم دەڵێ ئەم رووداوانە جاروبار سەردەمی کۆمۆنیستی خۆمم بیردەخاتەوە. دوو جۆر کۆمۆنیست هەن: ئەو لە خۆباییانەی کە لە پێناوی پێگەیاندنی میللەت و پێشخستنی وڵاتدا دەستیان داوەتە ئەو کارە؛ ئەو

سادە و ساویلکانەی کە بە هەوای دادپەوەری و یەکسانییەوە ملی ئەو ڕێیەیان گرتووە. لە خۆباییەکان شەیدای دەسەڵاتن و ڕێ نیشانی هەموو کەسێک دەدەن و بە تەنیایش خراپەیان لێ دەوەشێتەوە. سادە و ساویلکەکانیش زیانیان بەتەنیا بۆ خۆیانە: بەڵام ئەمەیش تەواو ئەو شتەیە کە ئەوان گەرەکیانە. کاتێک لە ڕووی هەستکردن بە تاوانەوە خۆیان دەکەن بە هاوبەشی غەمی هەژاران، خۆیان ئازاری زیاتر دەچێژن. باوکم مامۆستا بوو، لە کار دووریان خستەوە، خستیانە ژێر ئەشکەنجەوە و نینۆکیان دەرهێنا و لە زیندان قایمیان کرد. ساڵانێکی درێژ لەگەڵ دایکمدا دوکانێکی پەڕاو و کەرەسەی نووسینیان بەڕێوەبرد و فۆتۆکۆپییان کرد. تەنانەت لەو سەردەمانەدا دەرگا بە دەرگای ماڵانیان دەکوتا و ئینسکۆپیدیایان بە قیستی مانگانە دەفرۆشت و لە فەرەنسیشەوە ڕۆمانیان وەردەگێڕا. لەو کاتانەدا کە ناشاد و زۆر هەژار بووین، باوکم جاروبار لە ناکاو باوەشی بە ئێمەدا دەکرد و دەگریا. زۆر دەترسا لەوەی شتێکی خراپمان بەسەر بێت. کاتێک دوای تەقەکردن لە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە پۆلیس هات بۆ هوتێلەکەمان، باوکم دیسانەوە ترسی لێ نیشت. ئەمە بە ئەوانیش گوترا. بەر گوێم کەوت کە شینەتان بینیووە. ئەمە بە باوکم نەڵێن."

(کا) گوتی: "نایڵێم." پاشان ڕاوەستا و بەفری سەر لەشی پاک کردەوە. "ئایا ئەوە ڕێی چوونەوە بۆ هوتێل نییە؟"

"لێرەیشەوە دەچێتەوە سەر ڕێگای هوتێل. نە بەفر ڕادەوەستێ و نە قسەش تەواو دەبێ. دەمەوێ شوێنی کوشتارگاکانیشتان نیشان بدەم. شینە چیی لێت دەویست؟"

"هیچ."

"ئایا هیچ باسی ئێمە، باوکم یان دادەمی کرد؟"

(کا) گوزارەیەکی پڕ لە واتای لە ڕووخساری قەدیفەدا بینی و گوتی: نایەتەوە بیرم."

"هەموو کەسێک لێی دەترسێ. ئێمەیش لێی دەترسین. ئەم دوکانانە هەمووی پاوانی قەسابە بەناوبانگەکانی ئێرەیە."



(کا) پرسی: "باوکتان ڕۆژ چۆن بەسەر دەبات، ئایا لە هوتێل دەچێتە دەرێ؟"

"ئەو هوتێلەکە بەڕێوە دەبات. هەموان، سەرکار، خاوێنکەرەوەکە، ژنە جلشۆرەکە و شاگردەکان دەستوور لەو وەردەگرن. من و دادەیشم چاومان بە کارەکانەوەیە. باوکم بەدەگمەن دەچێتە دەرێ. ئێوە لە چ بورجێکن؟"

(کا) گوتی: "بورجی دووانە، دەڵێن دووانە درۆی زۆر دەکەن، بەڵام من نازانم."

"ئایا بورجی دووانە زۆر درۆ دەکەن یاخۆ نازانن کە خۆتان هیچ درۆتان کردبێ؟"

"ئەگەر باوەڕتان بە ئەستێرەکان هەبێ، ئەوا پێویستە بە شتێکدا بزانن کە ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر تایبەتە بۆ من."

"بەڵێ، دادەم گوتی. ئەمڕۆ شیعرتان نووسیوە."

"دادەتان هەموو شتێکتان بۆ دەگێڕێتەوە؟"

"ئێمە لێرە دوو خۆشیمان هەیە. گوتنی هەموو شتێک و سەیرکردنی تەلەفزیۆن. بەدەم سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە قسەیش دەکەین، کە قسە دەکەین، سەیری تەلەفزیۆن دەکەین. دادەم زۆر جوانە، وا نییە؟"

(کا) بەڕێزەوە گوتی: "بەڵێ، زۆر جوانە." پاشان بە ئەدەبەوە درێژەی دایێ و گوتی: "بەڵام ئێوەش جوانن. ئەمەیشی بۆ دەگێڕنەوە؟"

قەدیفە گوتی: "نایگێڕمەوە، با وەکو نهێنی لە نێوانماندا بمێنێتەوە. هاوڕازی باشترین سەرەتایە بۆ هاوڕێیەتییەکی باش."

بەفری خڕبووەوەی سەر چاکەتە بارانییە مۆر و درێژەکەی تەکاند.

# ١٤

## ئێوە چۆن شیعر دەنووسن؟

### بەدەوری خوانی ئێوارەوە سەبارەت بە ئەڤین، خۆداپۆشین و خۆکوشتن

لە بەردەم هۆڵی شانۆی گەلدا ئاپۆڕەیەکیان بینی کە چاوەڕێی -نمایش-ەکەی پاش کەمێکی تریان دەکرد. سەرباری ئەوەی بەفر بێ هەدادان دەباری، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بێکار، قوتابیانی کراس و چاکەت لەبەر کە لە ماڵ و لە بەشە ناوخۆییەکانەوە هاتبوون، منداڵگەلی هەڵهاتوو لە ماڵەوە، بەمەبەستی ئاهەنگێڕان و هەوا گۆڕین هاتبوون و لە بەردەم باڵەخانە تەمەن سەد و دە ساڵییەکە و لەسەر شۆستەکە گردبووبوونەوە. خێزانی واشیان تێدا بوو کە بە ماڵ و منداڵەوە هاتبوون. (کا) بۆ یەکەمجار لە قارسدا چەترێکی ڕەشی کراوەی بینی. قەدیفە دەیزانی کە لە پرۆگرامەکەدا شیعرێکی (کا)یش هەیە، بەڵام (کا) گوتی، لە بەر ئەوەی کاتی نییە، ئامادە نابێ و بەوجۆرە ئەو بابەتەی داخست.

هەستی کردبوو وا شیعرێکی تر بەڕێوەیە. تینی دایە هەنگاوەکانی و تێ کۆشا بەپێی توانا تا دەگەنەوە هوتێل، چیدی قسە نەکات. بەر لە خواردنی ئێوارە، بەبیانووی دەستهێنان بە جلوبەرگەکانی و خۆ پۆشتەکردنەوەدا، چووە ژوورەکەی خۆی، پاڵتۆکەی داکەند، لە بەردەم مێزە بچووکەکەدا دانیشت و بەپەلە دەستی بە نووسین کرد. شیعرەکەی ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە هاوڕێیەتی و هاوڕازییەوە هەبوو. بەفر، ئەستێرە، مۆتیڤەکانی ڕۆژی بەختەوەری و چەند دەستەواژەیەک کە لە دەمی قەدیفە هاتبوونە دەرێ، وەکو خۆیان لە شیعرەکەدا جێگیربوون. (کا) وەکو ئەوەی سەیری تابلۆیەک بکات، بەجۆش و خرۆشەوە سەیری بەیتە لە دوای یەک ڕیزکراوەکانی شیعرەکەی دەکرد. هۆشی بەپێی لۆژیکێکی نادیار ئەو شتانەی دارشتبووەوە کە لەگەڵ قەدیفەدا قسەیان لە بارەوە کردبوو، ئەم شیعرە نوێیەی کە سەردێری (هاوڕێیەتیی ئەستێرەکان)ی پێ بەخشیبوو، مامەڵەی لەگەڵ چەمکێکدا



دەکرد کە هەر مرۆڤێک ئەستێرەیەک، هەر ئەستێرەیەک هاوڕێیەکی هەیە، ئەستێرەی هەر مرۆڤێکیش هاوشێوەیەکی لەوەی خۆی هەیە و ئەم هاوشێوەیەشی وەکو هاوڕازێک لە ناو خۆیدا هەڵگرتووە. سەرەڕای ئەوەی لە ناخەوە هەستی بە ڕیتم و بێ هاوتاییی شیعرەکەی کرد، بەڵام دواتر لە هزری خۆیدا هۆی کەمبوونی چەند بەیت و وشەیەکی گەڕاندەوە بۆ دواکەوتن لە نانی ئێوارە و لە ئیپەک و هەروەها بۆ شادمانیی لە ڕادەبەدەری خۆی.

دوای تەواوکردنی شیعرەکەی، بە هۆڵی پێشوازیدا خۆی گەیاندە خانەی بچووکی شوێنی حەوانەوەی خاوەنی هوتێلەکە. لەوێ، بە دەوری مێزێکدا کە لە ناوەڕاستی ژوورێکی فراوانی بنمیچ بەرزدا دانرابوو، تورگوت بەگ و هەردوو کچەکەی، قەدیفە و ئیپەک، دانیشتبوون. لەو سەری مێزەکەش کچی سێیەم کە سەرپۆشێکی مۆری جوانی لەسەر کردبوو، دانیشتبوو. (کا) لە جێدا حاڵی بوو کە ئەمە خەندەی دەستەخوشکی قەدیفەیە. لە بەرامبەر ئەویشدا سەردار بەگی ڕۆژنامەنووسی بینی. جوانیی بێ هاوتا و پەرش و بڵاوی ئەو مێزەی کە ئەو تاقمە بچووکە بە دەوریەوە دانیشتبوون و لە پای ئەم پێکەوە دانیشتنەشیان نیشانەی ئەوپەڕی ڕەزامەندییان پێوە دیاربوو، ڕەوتی شادیبەخش و پڕ لە هونەری زاهیدەی کچە کوردی خزمەتکار کە بەخێرایی دەچووە چێشتخانەکەی پشتەوە و دەهاتەوە، (کا)یان هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە تورگوت بەگ و کچەکانی، کردوویانە بە خوو و ئێواران تا کاتێکی درەنگ لە دەوری ئەم مێزەدا کۆدەبنەوە.

تورگوت بەگ هەستایە سەرپێ و گوتی: "بەدرێژاییی ڕۆژ بیرم لە ئێوە دەکردەوە، غەمتانم بوو، لە کوێ بوون؟" لە ناکاو لە (کا) نزیک کەوتەوە و بەشێوەیەکی هێندە بەهێز لە ئامێزی گرت، بەجۆرێک وا هاتە بەرچاو وەکو ئەوەی پاش کەمێکی تر بداتە پرمەی گریان. بە نمایشێکی تراژیدییانەوە گوتی: "دەشێ هەموو کاتێک شتی زۆر خراپ بقەومێ."

(کا) لەو جێگایە دانیشت کە تورگوت بەگ لەوبەری مێزەکەوە بۆی دەستنیشان کرد و بە جۆشەوە دەستی کرد بە تێکدانی شۆربا نیسکەکەی بەردەمی. دوای ئەوەی دوو پیاوەکەی تری سەر مێزەکە دەستیان بە عارەق خواردنەوە کرد، سەرنجی

ئامادەبووان چووە سەر پەردەی تەلەفزیۆنەکەی پشت ئەوەوە. لەو ساتەدا (کا) ئەوەی کرد کە ماوەیەکی درێژ بوو بە تاسەی کردنیەوە بوو، تێر و پڕ لە چاوە جوانەکانی ئیپەکی ڕوانی.

من زۆر باش دەزانم کە ئەو لەو ساتەدا هەستی بە چی کردووە، چونکە دواتر هەموو وردەکارییەکانی ئەو کامەرانییە بەرفراوان و بێ سنوورەی لە دەفتەرەکەیدا تۆمار کردبوو: باسک و ڕانەکانی وەکو منداڵی بەختەوەر لە جوڵەی بەردەوامدا بوون، وەکو ئەوەی دەبێ پاش تۆزێکی تر بگەنە ئەو شەمەنەفەرەی کە لەگەڵ ئیپەکدا بۆ فرانکفۆرت دەیانبات، نائارام دەلەرزین. خەیاڵی چوو بۆ ئەوەی تیشکێکی هاوشێوەی ئەوەی لە گڵۆپی سەر مێزە پڕ لە کتێب و ڕۆژنامە و تۆماری هوتێل و پسوولەی شتومەکانی تورگوت بەگەوە پەخش دەبێت، لە داهاتوویەکی نزیکدا و لە ماڵێکی بچکۆلانەدا لە فرانکفورت کە خۆی و ئیپەک بە بەختەوەی تێیدا دەژین، ڕووی ئیپەک ڕووناک دەکاتەوە. دەسبەجێ بینیی وا قەدیفە نیگای لەم بڕیوە کە چاویان یەنگانگیر بووەوە، لە ڕووخساریدا کە هێندەی ڕووی دادەی جوان نەبوو، نیشانەی جۆرێک لە ئیرەیی پێبردن دەرکەوت، بەڵام قەدیفە خەندەیەکی پڕ لە ڕازی بۆ کرد و لە چاوترووکاندنێکدا هێماکەی سەر ڕووخساری خۆی شاردەوە.

ئەوانەی دەوروبەری خوانەکە جاروبار بە تیلەی چاو سەیری تەلەفزیۆنەکەیان دەکرد، تازە دەست کرابوو بە وەشانی ڕاستەوخۆی ئاهەنگەکەی هۆڵی شانۆی گەل، ئەکتەرێکی شانۆییی باڵابەرز و قوچی گۆچان ئاسای سەر بە تیپی شانۆ کە (کا) لە یەکەم ئێوارەی گەیشتنیدا کاتێک لە پاسەکە دابەزیبوو، بینیبووی، بەدەم خۆ لارکردنەوە بە ڕاست و چەپدا، بەرنامەی ئاهەنگەکەی دەخوێندەوە، لەو کاتەیشدا تورگوت بەگ بە کۆنترۆڵەکەی دەستی، کەناڵەکەی گۆڕی. ماوەیەکی درێژ سەیری دیمەنێکی ڕەش و سپیی باراناوییان کرد کە مرۆڤ هیچی لێ حاڵی نەدەبوو.

ئیپەک گوتی: "بابە، بۆچی ئێستا سەیری ئەوە دەکەن؟"

باوکی گوتی: "لێرە بەفر دەبارێ... خۆ هەر هیچ نەبێت، دیمەنێکی ڕاستەقینەیە و هەواڵێکی ڕاستە. دەشزانی سەیرکردنی زۆرم بۆ هەر کەناڵێک هەستی شانازی بە خۆ کردنم بریندار دەکات."



قەدیفە گوتی: "بابە، کەوایە، دە تکایە تەلەفزیۆنەکە بکوژێنەوە، لێرە شتێکی تر لە ئارادایە کە هەستی شانازیی هەموومانی بریندار کردووە."

باوکی بە لە ڕوودامانەوە گوتی: "بۆ میوانەکەمانی بگێڕنەوە، بێئاگایی ئەو لەو بابەتە، من نائارام دەکات."

خەندە گوتی: "منیش." هەڵچوونی پێوە دیاربوو، لە ڕادەبەدەر جوان بوو و دوو چاوی ڕەش و گەورەی پێوە بوون. هەموویان لە ناکاو قوڕ و قوپیان لێ کرد.

قەدیفە گوتی: "خەندە، تۆ بیگێڕەوە، ئەمە شتێکی تێدا نییە کە مایەی شەرم بێت."

خەندە گوتی: "تەواو بە پێچەوانەوە، زۆر شتی مایەی شەرمی تێدایە و هەر لەبەرئەوەیشە کە نامەوێ بیگێڕمەوە." وەکو ئەوەی بیرەوەرییەکی خۆشی هاتبێتەوە یاد، بۆ ساتێک شادییەکی سەیر ڕووخساری گەشاندەوە، بزە گرتی و گوتی: "ئەمڕۆ چلەی خۆکوشتنی تەسلیمەی دەستە خوشکمانە، تەسلیمە باوەڕمەندترین کچی ناو ئێمە بوو کە لە پێناوی باوەڕی خۆی و فەرموودەکانی خودادا تێ دەکۆشا. سەر داپۆشین بەلای ئەوەوە، تەنیا لەبەر خۆشەویستیی خودا نەبوو، بەڵکو واتای باوەڕ و سەربەرزیی ئەوی دەگەیاند. بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات خۆی بکوژێ. لە قوتابخانە مامۆستاکانی و، لە ماڵیشەوە باوکی، گوشارێکی بێ بەزەیییانەیان خستبووە سەری بۆ ئەوەی سەرپۆش فڕێ بدات، بەڵام ئەو بەرپەرچی دەدانەوە. دوای سێ ساڵ خوێندن و نزیکبوونەوە لە تەواوکردنی، خەریک بوو لە پەیمانگا وەدەر دەنرا. ڕۆژێک کارمەندانی ئاسایش باوکە بەقاڵەکەی وەگیر دەهێنن و پێی دەڵێن –ئەگەر کچەکەت سەرپۆش فڕێ نەدات و نەگەڕێتەوە بۆ پەیمانگا، ئەوا دوکانەکەت دادەخەین و لە قارس وەدەرت دەنێین.– لە سۆنگەی ئەمەوە، باوکی لە سەرەتادا هەڕەشەی لە ماڵ دەرکردنی لێ کرد. کاتێک ئەمە پارەی نەکرد، ئەمجار نەخشەی داڕشت بۆ بە شوودانی بە پۆلیسێکی بێوەپیاوی چل و پێنج ساڵە. کار گەیشتە ئەوەی پۆلیسەکە بە چەپکە گوڵەوە دەستی بە هاموشۆی دوکانەکەی باوکی تەسلیمە کردبوو. تەسلیمە، وەکو خۆی بۆمانی گێڕایەوە، هێندە ڕکی لەو پیاوە دەبێتەوە کە ئەو ناوی نابوو –پیاوی چاو کانزایی–، بۆ ئەوەی شووی پێ نەکات، بڕیار دەدات سەری خۆی ڕووت بکات، بەڵام کردی و کۆشای ئەم بڕیارەی بۆ نەبرایە سەر. هەندێکمان

پشتگیریمان لە بڕیاری شووکردنی بە –پیاوی چاو کانزایی– کرد، بڕێکیشمان پێمان گوت –هەڕەشەی خۆکوشتن لە باوکت بکە!–. ئەم پێشنیازەش زیاتر لە منەوە بوو، چونکە بەهیچ جۆرێک نەمدەویست تەسلیمە سەری ڕووت بکات، چەندین جار پێم دەگوت –تەسلیمە، خۆکوشتن باشترە لەوەی مرۆڤ سەری خۆی ڕووت بکات–. هەروا لە خۆڕا ئەمەم گوت. باوەڕمان وابوو هۆی خۆکوشتنی ئەو ژنانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا دەمانخوێندەوە، بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی و پەیوەست بوون بە ژیانی ماددی و ناهومێدبوونەوە و واماندەزانی وشەی خۆکوشتن باوکی دەترسێنێ. تەسلیمە لەبەرئەوەی کچێکی باوەڕمەند بوو، من هەرگیز باوەڕم نەدەکرد پەنا بۆ خۆکوژی ببات، بەڵام کاتێکیش بیستم کە خۆی هەڵواسیوە، من بەر لە هەموو کەسێکی تر بڕوام کرد. چونکە یەکسەر هەستم کرد ئەگەر منیش بام لە جێی ئەو، ئەوا بەهەمان شێوە خۆم دەکوشت."

خەندە دەستی بە گریان کرد. هەموو بێ دەنگبوون. ئیپەک چووە لای خەندەوە، ماچێکی کرد و دەستی بە سەریدا هێنا. قەدیفەیش خۆی گەیاندە ئەوان: کچەکان باوەشیان بە یەکدا کردبوو، تورگوت بەگیش کە کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکەی بەدەستەوە گرتبوو، چەند وتەیەکی شیرینی لە دەم هاتنە دەرێ، بۆ بەرگرتنیش لە گریانەکەی خەندە، هەموویان دەستیان بە گاڵتە و جەفەنگ کرد. تورگوت بەگ وەکو ئەوەی بیەوێ منداڵێکی بچووک ژیر بکاتەوە، سەرنجی ڕاکێشا بۆ سەر چەند زەرافەیەک کە لە سەرپەردەی تەلەفزیۆنەکە دەرکەوتبوون، لەوەیش زیاتر، خەندە وەکو منداڵێکی ئامادە بۆ ژیربوونەوە، بە چاوی پڕ لە گریانەوە سەیری تەلەفزیۆنەکەی کرد: هەموویان، تاوێکی درێژ تا ڕادەی لە بیرکردنی ژیانی خۆیان، سەیری جووتێک زەرافەیان کرد کە لە شوێنێکی زۆر دوور، لەوانەیە ناوەڕاستی ئەفریقا بووبێ، وەکو لە فیلمێکی خاوکراوەدا بن، بە لە خۆڕازیبوون و کەیفەوە بە سێبەری بێشەڵانێکدا ڕێیان دەکرد.

دواتر قەدیفە بە (کا)ی گوت: "خەندە، لە دوای خۆکوشتنی تەسلیمەوە، بۆ ئەوەی چی تر خەفەت نەداتە دایک و باوکی، بڕیاری دا سەری ڕووت بکات و بگەڕێتەوە بۆ دەوام. ئەوان خەندەیان بە دژواری و نەداری، وەکو ئەوەی کوڕێکی تاقانە بێت،



پەروەردە کردووە. دایک و باوکی هەمیشە بیریان لەوە دەکردەوە کە کچەکەیان لە داهاتوودا کۆمەکیان پێ دەکات، چوون خەندە زۆر ژیرە." ئەمەی زۆر بە شیرینی و بە چرپەوە گوت، بەڵام بەجۆرێک کە خەندە گوێی لێ بێ، کچەکە هێشتا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە سەیری پەردەی تەلەفزیۆنەکەی دەکرد و لە هەمان کاتدا گوێی بۆ قەدیفە ڕاگرتبوو: "ئێمەی کچانی سەرداپۆشراو، سەرەتا هەوڵمان دا قایلی بکەین لە تێکۆشان سارد نەبێتەوە، بەڵام کە تێ گەیشتین سەر ڕووت کردن لە خۆکوشتن باشترە، بڕیارمان دا یارمەتیی خەندە بدەین. کچێک کە لەچک بە دەستووری خودا بزانێ و وەکو ئالایەک بۆ خۆی هەڵبژاردبێ، دواتر زۆر دژوارە فڕێی بدات و بچێتە ناو خەڵکەوە. خەندە ماوەی چەندین ڕۆژ خۆی لە سوچی ماڵەوە قایم کرد و لەم بڕیارە ورد دەبووەوە."

(کا)یش وەکو ئەوانی تر بەدەم هەستکردن بە تاوانەوە نقومی خۆی بووبوو، بەڵام کاتێک باسکی بەر باسکی ئیپەک کەوت، شادییەک بە ناخیدا بڵاوبووەوە. لەو دەمەدا تورگوت بەگ بەپەلە خەریکی گۆڕینی کەناڵەکان بوو، (کا) بۆ گەڕان بەدوای هەمان شادمانیدا قۆڵی خستە سەر قۆڵی ئیپەک. کاتێک ئیپەکیش هەمان شتی کرد، (کا) غەمگینیی دەوری خوانەکەی لەبیر کرد. لە پەردەی تەلەفزیۆنەکەدا ئاهەنگەکەی هۆڵی شانۆی گەل بەدیار کەوت. پیاوە باڵا بەرزە لە گۆچان چووەکە، لە سۆنگەی ئەوەی بەشێکە لە یەکەم وەشانی زیندووی شاری قارس، شانازیی بە خۆوە دەکرد. کاتێک دەست بە خوێندنەوەی ناوەڕۆکی بەرنامەی ئاهەنگەکە کرا، (کا) لە نێوان (بەسەرهاتی پڕ لە پەند، دان پێدانانەکانی گۆڵچیی تیپی نیشتمانی، ڕازە شەرمبەخشەکانی مێژووی سیاسیمان، چەند پارچە شانۆیەکی شکسپیر و ڤیکتۆر هۆگۆ، دان پێدانانی چاوەڕوان نەکراو، بێ ئابڕوویی، چەند ناوێکی ڕەنجدەر و لە بیر نەکراوی مێژووی شانۆ و سینەمای تورکیا، گاڵتە و گەپ، گۆرانی و کتوپڕیی دڵ ڕاچڵەکێنەردا)، گوێی لە ناوی خۆی بوو کە وەکو –گەورەترین شاعیرمان کە دوای ساڵانێکی درێژ بەبێدەنگی بۆ نیشتمان گەڕاوەتەوە– خوێنرایەوە. ئیپەک لە ژێر مێزەکەوە دەستی (کا)ی گوشی.

تورگوت بەگ گوتی: "دەتانەوێ ئێوارە بڕۆن بۆ ئەوێ؟"

(کا) باسکی خۆی زیاتر بە باسکی ئیپەکەوە نوساند و گوتی: "بەڕێزم، لە ڕاستیدا لێرە زۆر خۆشحاڵ و فرە شادمانم."

خەندە گوتی: "ڕاستییەکەی من نامەوێ شادیتان لێ تێک بدەم." بۆ ساتێک هەموو سڵیان لێ کردەوە. درێژەی دایێ و گوتی: "من لەبەر خاتری ئێوە بۆ ئێرە هاتووم. هیچ کتێبێکتانم نەخوێندووەتەوە، بەڵام ئەوە بۆ من بەسە کە شاعیرێکن هەتا ئەڵمانیا چوون و جیهانتان بینیوە. پێمان بڵێن تکایە، لەم دواییانەدا شیعرتان نووسیووە؟"

(کا) گوتی: "لە قارس شیعری زۆرم بۆ هاتووە."

"بیرم لێ کردەوە کە ئێوە دەتوانن تێم بگەیەنن چۆن لە بابەتێک ورد ببمەوە. تکایە ئەوەم پێ بڵێن: چۆن شیعر دەنووسن؟ بە وردبوونەوەوە، وا نییە؟"

ئەمە پرسیارێک بوو کە ژنان بە زۆری لەو ئێوارانەی شیعر خوێندنەوەدا دەیانپرسی کە قوتابخانە تورکییەکان لە ئەڵمانیا سازیان دەکرد، بەڵام (کا) هەموو جارێک وەکو ئەوەی پرسیارێکی زۆر تایبەتی لێ کرابێ، پێی قەڵس و گرژ دەبوو. گوتی: "نازانم شیعر چۆن دەنووسرێ. شیعری باش وەکو ئەوە وایە لە دەرەوە، لە جێگایەکی دوورەوە بێت." بینی وا خەندە بە گومانەوە سەیری دەکات. "چی لە وردبوونەوە تێ دەگەن؟ تکایە پێم بڵێن."

خەندە گوتی: "بەدرێژاییی ڕۆژ هەوڵ دەدەم، بەڵام خۆم بێ سەرپۆش نایەتە بەر چاوم. لە جێی ئەوە، ئەو شتانە دێنە پێش چاوم کە دەمەوێ لە بیریان بکەم."

"بۆ نموونە وەکو چی؟"

"کاتێک ژمارەی کچانی سەرداپۆشراو لە زیادیی دا، ژنێکیان لە ئانکاراوە ناردبوو تاکو قایلمان بکات سەرپۆش فڕێ بدەین. ئەم ژنە –قایلکارە– چەندین کاتژمێر لە ژوورێکدا لەگەڵ یەکە بە یەکەماندا گفتوگۆی کرد. سەدان پرسیاری لە جۆری (باوکت لە دایکت دەدات؟ چەند خوشک و بران؟ باوکت لە مانگێکدا چەند لیرەی دەست دەکەوێ؟ بەر لەوەی سەرپۆش بەسەر بکەی، چیت لە سەر دەنا؟ ئایا ئەتاتورکت خۆش دەوێ؟ وێنەی چی بە دیوارەکانی ماڵەوەتانەوە هەڵواسراوە؟ مانگی



چەند جار بۆ سینەما دەچیت؟ ئایا بە ڕای تۆ ژن و پیاو یەکسانن؟ ئایا خودا گەورەترە یان دەوڵەت؟ دەتەوێ چەند منداڵت ببێ؟ لە ناو خێزانەکەتدا دەستدرێژیی سێکسیت کراوەتە سەر؟) پرسی و وەڵامەکانی لە سەر کاغەز نووسییەوە و چەند فۆرمێکی دەربارەمان پڕکردەوە. لێوەکانی و قژی بۆیاخ کردبوو، سەری ڕووت بوو، وەکو وێنەی ناو گۆڤارەکانی جلوبەرگ ڕێکپۆش بوو، بەڵام نازانم چۆنی بڵێم، ڕاستییەکەی زۆر سادە بوو. سەرباری ئەوەی پرسیارەکانی هەندێک لە ئێمەی هێنابووە گریان، بەڵام ئێمە خۆشمان ویست... هەمانبوو دەیگوت خودایە قوڕ و چڵپاوی قارس زەفەریان پێ نەبردبێ. دواتر من لە خەونەکانمدا دەستم کرد بە بینینی، بەڵام لە سەرەتاوە بایەخم پێ نەدا. ئێستایش کە هەر جارێک لە خەیاڵی خۆمدا سەرم ڕووت دەکەم و قژم بەو ناوەدا بەردەدەمەوە و بەناو خەڵکیدا دەگەڕێم، خۆم وەکو ئەو –ژنە قایلکارە– دێتە بەرچاو. لە خەیاڵمدا منیش وەکو ئەو ڕێکپۆشم، پێڵاوی پاژنە باریک لە پێ دەکەم و جلوبەرگی کراوەتر لەوانەی ئەو لەبەر دەکەم. کوڕان ئاوڕم لێ دەدەنەوە، ئەمەم هەم پێ خۆشە و هەم زۆریش شەرمم بە خۆمدا دێتەوە. "

قەدیفە گوتی: "خەندە، حەز دەکەی باسی شەرمەکەت مەکە."

"نەخێر، باسی دەکەم، چونکە لە خەیاڵمدا شەرم دەکەم، بەڵام شەرم لە خەیاڵەکانم ناکەم. ڕاستییەکەی هیچ باوەڕ ناکەم بە ڕووتکردنی سەرم ببم بە ژنێکی هەوەسباز و پیاوان بورووژێنم، چونکە ئەگەر وا بکەم، ئەوا بە پێچەوانەی باوەڕی خۆمەوە دەیکەم. وەلێ دەشزانم لەوانەیە مرۆڤ تووشی هەوەسی ئیرۆتیکی ببێ، جا با باوەڕیشی پێ نەبێ و تەنانەت وا هەست بکات کە پێویستیشی پێی نییە. چ ژن، چ پیاو، شەوانە لە خەونماندا لەگەڵ مرۆڤگەلێکدا کە بە ڕۆژ دەیانبینین، بێ ئەوەی بمانەوێ، گوناه ئەنجام دەدەین. ئایا ئەمە ڕاست نییە؟"

قەدیفە گوتی: "بەسە، خەندە."

"ئایا ڕاست نییە؟"

قەدیفە گوتی: "ڕاست نییە." پاشان ڕووی لە (کا) کرد و گوتی: "دوو ساڵ لەمەوبەر

بڕیار بوو خەندە لەگەڵ لاوێکی زۆر جوانی کورددا ژیانی هاوسەری پێکەوە بنێن، بەڵام کوڕەکە لە سیاسەتەوە گلا و کوشتیان..."

خەندە بە هەڵچوونەوە گوتی: "سەر ڕووتنەکردم هیچ پێوەندیی بەم مەسەلەیەوە نییە، هۆی ڕووتنەکردنی سەرم ئەوەیە کە ناتوانم ورد ببمەوە و شێوەی خۆم بە سەری ڕووتەوە بێنمە بەرچاوم. هەر جارێک هەوڵم دابێ ورد ببمەوە، لە خەیاڵمدا یان دەبم بە نامۆیەکی وەکو -ژنە قایلکارەکە-، یاخۆ دەبم بە ژنێکی هەوەسفرۆش. ئەگەر تەنانەت بۆ جارێکیش بتوانم ئەوە بێنمە بەرچاوی خۆم کەوا بە سەری ڕووتەوە لە دەروازەی قوتابخانە دەچمە ژوورەوە، بە ڕێڕەوەکاندا پیاسە دەکەم و دەچمە پۆلەوە، ئەوا خودا یار بێت هێزی ئەنجامدانی ئەم کارە لە خۆمدا دەدۆزمەوە و ئەو کاتە ئازاد دەبم، چونکە ئەگەر وابێت، ئەوا بە ئارەزووی خۆم سەرم ڕووت دەکەم نەک بە زۆری پۆلیس، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە ناتوانم ورد ببمەوە و ئەو ساتە بێنمە بەرچاوی خۆم."

قەدیفە گوتی: "هێندە بایەخ بەو ساتە مەدە، ئەگەر لەو ساتەدا سەرکەوتوویش نەبی، ئەوا وەکو هەموو کاتێک هەر خەندە گیانەکەی ئێمەی."

خەندە گوتی: "کە نیم، ئەو کاتە لە ناخی خۆتاندا تاوانبارم دەکەن و گومانم دەخەنە سەر لەبەرئەوەی خۆم لە ئێوە دابڕیوە و بڕیارم داوە سەرم ڕووت بکەم." پاشان ڕووی لە (کا) کرد و گوتی: "جاروبار کچێک دێتە بەر چاوم کە بە سەری ڕووتەوە بۆ قوتابخانە دەچێ، لە ڕێڕەوەکاندا دەچێتە پێشەوە، دەچێتە پۆلەکەمانەوە کە من زۆر تاسەم کردووە، تەنانەت لەو کاتەدا بۆنی ڕێڕەوەکان و هەوای گرانی پۆلەکە دێ بە کەپوومدا. ڕێک لەو کاتەدا، ئەو کچە لە جامی نێوان ڕێڕەوەکە و پۆلەکەدا دەبینم، کاتێکیش بۆم ڕوون دەبێتەوە ئەوەی کە بینیومە من نیم، کەسێکی ترە، دەست بە گریان دەکەم."

هەموو پێیان وابوو خەندە دەست بە گریان دەکاتەوە.

خەندە گوتی: "هێندە لەوە ناترسم کە کەسێکی تر بم، ئەوەی دەمترسێنی، ئەوەیە هەرگیز نەتوانم بۆ ئەم دۆخەی ئێستام بگەڕێمەوە و تەنانەت لەبیریشی بکەم.



ڕاستییەکەی مرۆڤ بۆی هەیە لەبەر ئەو هۆیە خۆی بکوژێ." پاشان ڕووی لە (کا) کرد و بە لێو داقرتاندەوە گوتی: "ئایا هیچ جارێک هەوڵتان داوە خۆتان بکوژن؟"

"نەخێر، بەڵام دوای ژنەکانی قارس مرۆڤ دێتە سەر ئەوەی بیر لەم بابەتە بکاتەوە."

"ویستی خۆکوشتن بەلای زۆر لەو کچانەوە کە لەم ڕەوشەی ئێمەدان، بە واتای خۆ بەخاوەنکردنە لە هەبوونی خۆمان. ئەو کچانەی لە خشتە دەبرێن و پەردەی کچێنی دەدۆڕێنن، یاخۆ ئەو کچە عازەبانەی کە بەزۆر بە شوو دەدرێن، هەموویان لەو سۆنگەیەوە خۆیان دەکوژن. لە خۆکوشتندا بەدوای پاکیزەیی و سادەییدا دەگەڕێن. ئایا ڕێ کەوتووە شیعرتان دەربارەی خۆکوشتن نووسیبێ؟" لە ناکاو ڕووی لە ئیپەک کرد و درێژەی بە قسەکانی دا: "میوانەکەتانم زۆر بێزار کرد؟ باشە، با پێم بڵێ ئەو شیعرانەی لە قارس بۆی -هاتووە- لە کوێوە دێن، ئەوسا وازی لێ دەهێنم."

"کاتێک شیعرێکم بۆ دێت، زۆر سوپاسی ئەوە دەکەم کە بۆم دەنێرێ، چونکە زۆر شادمانم دەکات."

"ئایا هەر ئەویشە واتان لێ دەکات لە شیعر ورد ببنەوە؟ ئەوە کێیە؟"

"تەنانەت ئەگەر باوەڕیش نەکەم، هەر هەست دەکەم ئەو ناردوویەتی."

"باوەڕ بە خودا دەکەن یاخۆ بەوەی کە شیعرەکەی بۆ ناردوون؟"

(کا)، وەکو ئەوەی سروشی بۆ هاتبێ، گوتی: "خودا شیعرم بۆ دەنێرێ."

تورگوت بەگ گوتی: "لێرە بۆی ڕوون بووەوە کە بزووتنەوەی ئاینی لە هەڵکشاندایە، لەوانەیە چاویشیان لێ سوور کردبێتەوە... ترساوە و هاتووەتە سەر ڕێگای باوەڕهێنان بە خودا."

(کا) گوتی: "نەخێر، لە هەناومەوە هەڵدەقوڵێ، دەمەوێ منیش وەکو هەر کەسێکی ئێرەم لێ بێت."

"ترساون، ڕەخنەتان لێ دەگرم."

(کا) دەسبەجێ هاواری کرد و گوتی: "بەڵێ، دەترسم، زۆریش."

وەکو ئەوەی ڕووی لوولەی دەمانچەیەکی ئاراستە کرابێ، هەستایە سەرپێ. ئەم ڕەفتارەی، دانیشتووانی سەر خوانەکەی خستە گێژاوەوە. تورگوت بەگ وەکو ئەوەی هەست بکات ڕووی چەکێکی تێ کراوە، هاواری کرد: "لە کوێ؟" خەندە لەبەر خۆیەوە گوتی: "ناترسم و هیچ شتێکیش نامهەژێنێ."

بەڵام ئەویش وەکو ئەوانی تر بۆ ڕەواندنەوەی مەترسییەکە، سەیری ڕووخساری (کا)ی دەکرد. دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک، ڕۆژنامەنووس سەردار بەگ بۆی گێڕامەوە کە ڕووخساری (کا) لەو کاتەدا لە گەچی سپی دەچوو، بەڵام هێمای کەسێکی تێکشکاو لە ترس و گێژبووندا نا، بەڵکو نیشانەی بەختەوەرییەکی قوڵ بە ڕوویەوە دیار بوو. ژنە خزمەتکارەکە زیاتری پێوە نا و بە سووربوونەوە بۆی گێڕامەوە کە تیشکێک لە ژوورەکەدا درەوشاوەتەوە و هەموو شتێکی لە ڕووناکیی خۆیدا نقوم کردووە. هەر لەو ڕۆژەوە (کا) لە دیدی ئەودا پیاوچاکێک بوو. یەکێک لەوانەی ناو ژوورەکە لەو کاتەدا گوتبووی -شیعر هات-، هەر یەکەیان بەجۆرێک شڵەژابوون و ترسابوون، وەکو ئەوەی ڕووی چەکێکیان تێ کرابێ.

دواتر (کا) لە تۆمارکردن و هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە لە دەفتەرێکدا، چاوەڕوانیی پڕ لە شڵەژانی ناو ژوورەکەی لەگەڵ ساتەکانی ئەو ترس و چاوەڕووانییەدا بەراورد کردبوو کە لە سەردەمی منداڵیماندا، لە دانیشتنەکانی بانگکردنی ڕۆحەکاندا بینیبوومان. بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر لەو دانیشتنانەندا کە دایکە پێشوەخت بێوەژنکەوتوو و قەڵەوەکەی هاوڕێیەکمان لە کۆڵانێکی پشتەوەی نیشانتاشی سازی دەکرد و ژنانی تری بەدبەختی ماڵەوە، پیانۆژەنێک کە دواتر پەنجەکانی گۆج بووبوون، ژنە ئەکتەرێکی تووڕە و تەمەن مامناوەندیی سینەما کە ئێمە دەمانپرسی -ئایا ئەویش دێت؟-، خوشکێکی ئەم پاڵەوانە کە هەموو جارێک دەبوورایەوە، ژەنەراڵێکی خانەنشین کە بەردەوام چاوبڕکێی لەگەڵ ژنە ئەکتەرەکەدا دەکرد، هاوڕێکەمان کە ئێمەی بەبێدەنگی لە هۆڵەکەی پشتەوە دەبردە ژوورەوە و من و (کا)یش بەشدار دەبووین. لە ساتە پڕ خورپەکانی چاوەڕوانیدا یەکێک لە ئامادەبووان هاواری دەکرد: "ئەی ڕۆح، ئەگەر هاتووی با دەنگت لێوە بێ!" بەدوای ئەوەدا بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەر ژوورەکەدا دەکێشا. دواتر دەنگێک لە شێوەی



کرتەیەک، جیڕەی کورسییەک، ناڵەیەک یاخۆ دەنگی جووتکەیەک دەهاتە گوێ کە یەکێک لە قاچی مێزەکەی دەسرەواند و یەکێک لە ئامادەبووان بە ترسەوە دەیگوت: "ڕۆح هاتووە." وەلێ (کا) لەو کەسانە نەبوو ڕووبەڕووی ڕۆح ببێتەوە، هەستا و بەرەو دەرگای چێشتخانەکە چوو. هێمایەکی شادیبەخش بە ڕووخساریەوە دیار بوو.

تورگوت بەگ گوتی: "زۆری خواردەوە. بەڵێ، هاوکاریی بکەن."

ئەمەی بەجۆرێک گوت وەکو ئەوەی ئەو ئیپەکی ناردبێ کە بەپەلە خۆی گەیاندبووە لای (کا). (کا) خۆی دا بەسەر کورسییەکی لای دەرگای چێشتخانەکەدا. دەفتەر و قەڵەمەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی: "من ناتوانم ئاوا بنووسم لە کاتێکدا ئێوە هەمووتان هەستاونەتە سەرپێ و تەماشام دەکەن."

ئیپەک گوتی: "با بتبەمە ژوورەوە."

ئیپەک لە پێشەوە و (کا) بەدوویدا بە چێشتخانەکەدا کە بەهۆی ئەو شیرینییەی زاهیدە بەسەر پاقلاوای قەدایفدا ڕژاندبووی، بۆنێکی خۆشی گرتبوو، تێ پەڕین و چوونە ژوورێکی سارد و نیوە تاریکەوە.

ئیپەک گڵۆپەکەی داگیرساند و گوتی: "لێرە بۆت دەنووسرێ؟"

(کا) ژوورێکی پاکژ و دوو پێخەوی ڕێکوپێکی بینی. لە سەر سێپایەک کە خوشکەکان وەکو کۆمەد بەکاریان دەهێنا، تێکەڵەیەکی سادەی پێکهاتوو لە لوولەی کرێم، بۆیاخی لێو، کۆڵۆنیای بچووک، ڕۆنی بادەم، شووشەی ئەلکهول، کتێب، جانتایەکی زنجیرداری پڕ لە فلچە، قەڵەم، مێرووی چاوەزار، قوتوویەکی شۆکۆلاتەی سویسراییی پڕ لە گەردانە و بازنی بینی؛ لە سەر پێخەوی لای پەنجەرە شەختە بەستووەکەوە دانیشت. گوتی: "لێرە دەتوانم بنووسم، بەڵام مەڕۆ و بەجێم مەهێڵە."

"بۆچی؟"

(کا) لە سەرەتادا گوتی: "نازانم." دوایی گوتی: "دەترسم."

لەو کاتەدا دەستی بە نووسینی شیعرەکەی کرد کە سەرەتاکەی وێناکردنی قوتوویەک شۆکۆلاتە بوو کە مامی لە کاتی منداڵیی ئەمدا لە سویسراوە بۆی هێنابوو. هەمان ئەو دیمەنانەی سویسرا بەسەر قوتووەکەوە بوون کە بە دیواری

چاپخانەکانی قارسەوە هەڵواسرابوون. بەگوێرەی ئەو تێبینییانەی کە (کا) دواتر بۆ تێگەیشتن پۆلینکردن و ڕیزکردنی ئەو شیعرانەی کە لە قارس بۆی -هاتبوو-، نووسیبووی سەرەتا لە قوتووەکەدا کاتژمێرێکی گەمە دەرچووبوو. دوای دوو ڕۆژ بۆی ڕوون بووەوە کە سەعاتەکە یادگارییەکەی سەردەمی منداڵیی ئیپەکە. (کا) پێی وابوو دەتوانێ لەم سەعاتەوە دەست پێ بکات و چەند شتێک دەربارەی سەردەمی منداڵی و ژیان بڵێ...

(کا) بە ئیپەکی گوت: "هەرگیز لێم دوور مەکەوە، چونکە دێوانەئاسا گرفتاری داوی ئەوینت بووم."

ئیپەک گوتی: "ئێ تەنانەت خۆ ناشمناسی."

(کا) وەکو ئەوەی دەرزێک بڵێتەوە، گوتی: "دوو جۆر پیاو هەیە، جۆری یەکەمیان، بەر لەوەی عاشق بێ، دەزانێ کچەکە چۆن باوۆڵە دەخوات، قژی چۆن شانە دەکات، حەزی لە چ جۆرە تووڕەهاتێکە، باوکی لە چی تووڕە دەبێ و هەموو ئەو بەسەرهات و ئەفسانانە دەزانێ کە لە بارەی کچەکەوە دەگێڕدرێنەوە. جۆری دووەمیان کە من یەکێکم لەوان، دەبێ زۆر بە دەگمەن لە بارەی کچەکەوە بزانێ بۆ ئەوەی بتوانێ عاشقی ببێ."

"واتا لەبەرئەوەی کە هیچ نامناسی عاشقم بوویت؟ جا بەڕاستی ئەمە ئەوینە؟"

(کا) گوتی: "ئەو عەشقەی کە مرۆڤ هەموو شتێکی خۆی لە پێناودا دەبەخشێ، ئاوایە."

"کاتێک بینیت چۆن باوۆڵە دەخۆم و بە چی تووڕە دەبم، ئەوینەکەت کۆتایی پێ دێ."

"بەڵام ئەو کاتە پێوەندیی نێوانمان قووڵتر دەبێتەوە و دەگۆڕێ بۆ ئارەزوویەک کە جەستەمان دادەگرێ، دەگۆڕێ بۆ بەختەوەری و یادگارێک کە پێکەوەمان گرێ دەدات."

ئیپەک گوتی: "هەڵمەستە، لە قەراغی چرپاکە دابنیشە، من لە ژێر بنمیچێکدا بم لەگەڵ باوکمدا، کەس ماچ ناکەم." سەرەتا بەرپەرچی ماچەکانی (کا)ی نەدایەوە،



بەڵام دواتر پاڵێکی پێوە نا بۆ دواوە و گوتی: "باوکم لە ماڵەوە بێ، پێم جوان نییە."

(کا) جارێکی تر زۆری بۆ هێنا و ناو دەمی ماچ کرد و لە قەراغی پێخەوەکە دانیشتەوە. "پێویستە هەرچی زووترە زەماوەند بکەین و پێکەوە لێرە هەڵبێین. ئایا دەزانی لە فرانکفورت چەند بەختەوەر دەبی؟"

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە.

"کە هیچ نامناسی، ئەدی چۆن ئەویندای من بووی؟"

"لەبەرئەوەی جوانی... چونکە خەیاڵ دەکەمەوە لەگەڵ تۆدا بەختەوەر دەبم... لەبەرئەوەی بێ ئەوەی شەرمت لێ بکەم، دەتوانم هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە. بێ پسانەوە لە خەیاڵمدا پێکەوە دەنووین."

"لە ئەڵمانیا چیت دەکرد؟"

"خۆم بەو شیعرانەوە سەرقاڵ دەکرد کە بۆم نەدەنووسران و بەردەوام دەسپەڕم لێ دەدا... تەنیایی پرسێکە تایبەت بە شانازی؛ مرۆڤ بە لەخۆباییبوونەوە خۆی لە تەپوتۆزی خۆیدا دەنێژێ. گرفتی شاعیری ڕاستەقینە هەمیشە هەمان شتە. ئەگەر ماوەیەکی درێژ بەختەوەر بێ، ئالوودە دەبێ. خۆ ئەگەر ماوەیەکی درێژ ناشاد بێ، هێزی تێدا نامێنێ بۆ ئەوەی شیعر زیندوو ڕابگرێ. دوای ماوەیەک، یان بەختەوەری شیعر و شاعیر ئالوودە دەکات، یاخۆ شیعری ڕاستەقینە بەختەوەری دەشێوێنێ. ئیدی زۆر لەوە دەترسم بگەڕێمەوە فرانکفورت و بەدبەختی بمگرێ."

ئیپەک گوتی: "لە ئەستەمبوڵ بمێنەوە."

(کا) بەوردی تەماشای کرد و بە گوێیدا چرپاند: "دەتەوێ لە ئەستەمبوڵ ژیان بەسەر بەریت؟" زۆر ئارەزووی دەکرد ئیپەک داوای شتێکی لێ بکات. ژنەکەش بەدوایدا گوتی: "هیچ شتێکم ناوێ."

(کا) هەستی بەپەلەکردنی خۆی کرد. ئەوەیشی لەبەر چاو بوو کە ماوەیەکی کورت لە قارس دەمێنێتەوە و دوای چەندێکی تر لێرە هەناسە نادات و لە پەلە کردن بترازێ، هیچ چارێکی تری نەبوو. گوێیان ڕاگرت بۆ دەنگی ناڕوونی قسەکردن لە ژوورەوە و دەنگی تایەکانی گالیسکەیەک کە بەسەر بەفرەکەدا لە بەردەم

پەنجەرەکەوە ڕەت بوو. ئیپەک لە پاڵ دەرگاکەدا بە پێوە ڕاوەستابوو، شانەیەکی بە دەستەوە بوو و لەسەرخۆ پرچی دادەهێنا.

(کا) گوتی: "لێرە شتەکان هێندە هەژار و ناهوکەرن، بەجۆرێک مرۆڤ وەکو تۆ خواستنی هەموو شتێک لە بیر دەکات. لێرە مرۆڤ خەون بە مردنەوە دەبینێ نەک بە ژیانەوە... لە تەکمدا دێی؟" ئیپەک هیچ وەڵامی نەدایەوە. (کا) گوتی: "ئەگەر وەڵامێکی خراپ دەدەیتەوە، ئەوا هیچ مەڵێ."

ئیپەک کە چاوی بڕیبووە شانەکەی دەستی، گوتی: "نازانم، لە ژوورەوە چاوەڕێمان دەکەن."

(کا) گوتی: "لە ژوورەوە دەک و دۆلابێک دەسووڕێ، هەستی پێ دەکەم، بەڵام بەڕاستی نازانم چ دەقەومێ. تۆ بۆم باس بکە."

کارەبا کوژایەوە. ئیپەک لە جێی خۆی نەبزووت، (کا) ویستی باوەشی پێدا بکات، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا دۆخەکە بشێوێنێ و بەتەنیا بۆ ئەڵمانیا بگەڕێتەوە؛ لە جێی خۆی نەجووڵا.

ئیپەک گوتی: "لەم تاریکییەدا شیعرت بۆ نانووسرێ، با بڕۆین."

"چ شتێکت دەوێ بیکەم بۆ ئەوەی منت خۆش بوێت؟"

"ببە بە خۆت." ئیپەک ئەمەی گوت و لە ژوورەکە دەرچوو.

(کا) بە دانیشتنی ئەوێ هێندە شادمان بوو، بەجۆرێک بەزۆر هەستایە سەرپێ. لە بەردەم تیشکی لەرزۆکی مۆمی ژوورە ساردەکەی پێش چێشتخانەکەدا دانیشت و لە دەفتەرە سەوزەکەیدا شیعری (قووتوی شۆکۆلاتە)ی نووسییەوە.

کاتێک هەستایە سەرپێ بۆ ئەوەی بەدوای ئیپەکدا بچێ، لە ئامێزی بگرێ و ڕووی خۆی لە پرچیدا بشارێتەوە، هەموو شتەکانی ناو سەری وەکو ئەوەی لە تاریکیدا بن، لەپڕ تێک چڕژان.

(کا) لەبەر ڕووناکیی مۆمی چێشتخانەکەدا باوەش بە یەکداکردنی ئیپەک و قەدیفەی دەبینی. باسکیان لە ملی یەکدی ئاڵاندبوو، وەکو دوو عاشق یەکیان لە



ئامێز گرتبوو.

قەدیفە گوتی: "باوکم داوای لێ کردم بێم بە دووتاندا."

"باشە گیانەکەم."

"شیعری نووسی؟"

(کا) لە تاریکییەکەوە هاتە دەرەوە و گوتی: "نووسیم، بەڵام ئێستا دەمەوێ هاوکاریی ئێوە بکەم."

کە لەبەر ڕۆشناییی لەرزۆکی مۆمەکەدا چووە چێشتخانەکەوە، کەسی نەبینی. لە چاوتروکاندنێکدا پەرداخێک عارەقی تێ کرد و بێ ئەوەی ئاوی بەسەردا بکات، خواردیەوە. فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە، پەرداخێک ئاوی بۆ خۆی پڕ کرد، لە چێشتخانەکە چووە دەرێ، خۆی لە تاریکییەکی نوتەک و ئەنگوستەچاودا بینییەوە. بەرەو مێزی نانخواردنەکە چوو کە مۆمێک ڕووناکی دەکردەوە. ئەوانەی دەورویەری مێزەکە بە خۆیان و بە سێبەری زەبەلاحی پشتیانەوە بە سەر دیوارەکەوە، خۆیان بەرەو ڕووی (کا) وەرگەڕاند.

تورگوت بەگ گوتی: "شیعرتان بۆ نووسرا؟" ڕاستییەکەی، لە سەرەتادا بۆ چەند ساتێک دەنگی نەکرد، ویستی وای نیشان بدات کە (کا) هێندە گرنگ نییە بەلایەوە.

"بەڵێ."

"پیرۆزباییت لێ دەکەم." پەرداخێکی دایە دەستی (کا) و بۆی پڕ کرد لە عارەق و گوتی: "دەربارەی چی؟"

"لێرە چاوم بە هەرکەسێ بکەوێ و بیدوێنم، مافی دەدەمێ. ئەو ترسەی بە شەقامەکانی ئەڵمانیادا دەسووڕێتەوە، ئێستا چووە هەناومەوە."

خەندە خۆی وەکو کەسێک نیشان دا کە زۆر بزانێ و گوتی: "زۆر باش لێتان دەگەم."

(کا) بە سوپاسەوە بزەیەکی بۆ کرد، لە ناخەوە ئارەزووی دەکرد پێی بڵێ: "سەرت ڕووت مەکە شۆخەکەم."

تورگوت بەگ گوتی: "لەبەرئەوەی کە دەڵێی چاوت بە هەرکەسێک کەوتبێ باوەڕت پێی کردووە و لای شێخ ئەفەندی باوەڕت بە خودا هێناوە، ئەوا من دەمەوێ شتێکت بۆ ڕاست بکەمەوە. شێخ ئەفەندی نوێنەری خودا نییە لە قارس."

خەندە بە هەڵچوونەوە گوتی: "ئەدی کێ لێرە نوێنەرایەتیی خودا دەکات؟"

بەڵام تورگوت بەگ لێی زویر نەبوو. کەللەڕەق بوو و حەزی بە شەڕ دەکرد، بەڵام بۆ ئەوەی ئەتایستێکی سازشنەکەر بێ، دڵێکی نەرمی هەبوو. (کا) هەستێکی وای لا دروست بوو کە تورگوت بەگ هێندەی خەمی بەدبەختیی کچەکانی لەبەر بوو، هەوقاسیش لە تێشکان و تیاچوونی شتە باوەکانی جیهانی تایبەت بە خۆی دەترسا. ئەمە ترسێکی سیاسی نەبوو، بەڵکو خەمی ئەوەی بوو شوێنی خۆی لە دەوری ئەو مێزە لە دەست بدات کە هەموو ئێوارانێک لەگەڵ کچەکانی و میوانەکانیدا، بێ ئەوەی بە یەکدا هەڵپژێن، لە دەوری کۆدەبوونەوە، چەندین سەعات باسی سیاسەت و هەبوون و نەبوونی خودایان تاوتوێ دەکرد و ئەمەش تاکە سەرچاوەی کەیف و سەفای ئەو بوو.

کارەبا هاتەوە و لەپڕ ژوورەکە ڕووناک بووەوە. خەڵکەکە هێندە لەگەڵ بڕین و هاتنەوەی کارەبادا ڕاهاتبوون، بەجۆرێک بە پێچەوانەی هاتنەوەی کارەبا لە سەردەمی منداڵیی (کا)دا لە ئەستەمبوڵ، کەس هاواری خۆشی ناکات و کەس ناڵێ ئەیەڕۆ با ئامێری جلشۆرینەکە نەسووتێ، یاخۆ کەسێک پڕ بدا و بڵێ من مۆمەکان دەکوژێنمەوە. لێرە مرۆگەل وا ڕەفتار دەکەن وەکو ئەوەی هیچ نەقەومابێ. تورگوت بەگ تەلەفزیۆنەکەی داگیرساند و بە کۆنترۆڵەکە دەستی بە گۆڕینی کەناڵەکان کرد. (کا) بە چرپە بە کچەکانی گوت کە قارس بەشێوەیەکی نائاسایی بێدەنگە.

خەندە گوتی: "چونکە ئێمە لێرە تەنانەت لە دەنگی خۆشمان دەترسین."

ئیپەک گوتی: "ئەوە بێدەنگیی بەفرە."

هەموویان بەدەم هەستکردن بە دۆڕانەوە، ماوەیەکی درێژ سەیری تەلەفزیۆنەکەیان کرد کە لە کەناڵێکەوە دەچووە سەر کەناڵێکی تر. (کا) کە لە ژێر مێزەکەوە دەستی خستبووە ناو دەستی ئیپەک، بیری کردەوە کە دەتوانێ لێرە بە ڕۆژ کارێکی



هاکەزایی بکات و ئێوارانیش دەست لە ناو دەست لەگەڵ ئەم ژنەدا بەرامبەر بە تەلەفزیۆنێکی گرێدراو بە ساتەلیتەوە دانیشێ و هەموو ژیانی بەکامەرانی بگوزەرێنێ.

# ١٥

## هەر یەکەمان بەڕاستی شتێک لە ژیانماندا هەیە کە دەمانەوێ

### لە هۆڵی شانۆی گەل

ڕێک دوای تێپەڕبوونی حەوت خولەک بەسەر بیرۆکەی بەسەربردنی هەموو ژیانی لەگەڵ ئیپەکدا لە قارس بە کامەرانی، (کا) بەتاقی تەنیا و بەژێر بەفردا، وەکو ئەوەی بۆ مەیدانی جەنگ بڕوات، بە پرتاو کەوتە ڕێ بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگەکەی هۆڵی شانۆی گەل و بەدەم ڕێگاوە ترپەی دڵی دەهات. لە ماوەی ئەو حەوت خولەکەدا، ڕووداوەکان بەخێراییەک کە مایەی تێگەیشتن بوو، پەرەیان سەند.

سەرەتا تورگوت بەگ وەشانی زیندووی ئاهەنگەکەی هۆڵی شانۆی گەلی هێنابووە سەر پەردەی تەلەفزیۆنەکە، ئامادەبووان، بە بیستنی هەرا و هوریای ئەوێ، درکیان کرد کە شتێکی نائاسایی لەوێ دەگوزەرێ. لەلایەک ئارەزووی دوورکەوتنەوە لە ژیانی لادێیی، ئەگەر بۆ ماوەی شەوێکیش بووە، لە هەناویاندا دەهەژاند، لەلایەکی تریش، شیمانەی ڕوودانی شتێکی خراپ دەیترساندن. هەموویان لە میانەی چەپڵەلێدان و فیکە و هاواری ئاپۆڕەی بێ ئۆقرەی بینەرانەوە حاڵی بوون ئاریشەیەک لە نێوان کەسانی ناوداری شاردا کە لە ڕیزەکانی پێشەوە دانیشتبوون و لە نێوان لاواندا کە لە ڕیزەکانی دواوە دانیشتبوون، سەری هەڵدابوو. کامێرا ناو هۆڵەکەی بەتەواوی نیشان نەدەدا، بۆیە هەموو بە پەرۆشەوە بوون بزانن لەوێ چ دەقەومێ.

گۆڵچییەکی نیشتمانی لەسەر شانۆ بوو کە سەردەمانێک هەموو تورکیا دەیناسی. هەر ئەوەندە فریا کەوت باسی گۆڵی یەکەمی ئەو یازدە گۆڵە بکێڕێتەوە کە پازدە ساڵ لەمەوبەر لە یارییەکی تراژیدیی نیشتمانیدا بەرانبەر بە هەڵبژاردەی ئینگلیز لێی کرابوو، پاشان کە حاڵی بوو وا کابرای قوچی گۆچان ئاسای بێژەری بەرنامەکە کوتومت وەکو تەلەفزیۆنی نەتەوەیی ناوبەرێک دەدات بۆ ڕێکلام، ئەم لای خۆیەوە بێدەنگ بوو. بێژەرەکە مایکرۆفۆنی بەدەستەوە گرت و ماوەی چەند چرکەیەک



لەو کاغەزەدا کە بە دەستییەوە بوو، دوو ڕێکلامی خوێندەوە: (دوکانی وشکەفرۆشی تادال لە شەقامی فەوزی پاشا لە قەیسەرییەوە باسترمەی بۆ هاتووە و قوتابخانەی زانستی دەستی کردووە بە ناونووسین بۆ کۆرسی خۆسازدان بۆ وەرگرتن لە زانکۆ). دواتر بەرنامەی دەوڵەمەندی ئاهەنگەکەی دووبارە کردەوە، بەڕێزەوە سەیرێکی کامێرای کرد و ئەوەی بۆ قسەکانی زیاد کرد کە (کا) لە بەرنامەی ئەمشەودا شیعر دەخوێنێتەوە، "بەڵام ئامادەنەبوونی شاعیری گەورەمان لە نێوماندا کە لە ئەڵمانیاوە بۆ شاری سەرحەد هاتووە، بەڕاستی قارسییەکان غەمگین دەکات."

تورگوت بەگ لەو کاتەدا دەسبەجێ گوتبووی: "ئیدی زۆر شورەییە ئەگەر ئێستا نەچن."

(کا) گوتبووی: "بەڵام لێیان نەپرسیمەوە کە داخۆ لە ئاهەنگەکەدا بەشداری دەکەم."

تورگوت بەگ گوتبووی: "ئیدی لێرە وا باوە، ئەگەر بانگهێشتن بکرابان، نەدەچوون. وەلێ ئێستا پیویستە بڕۆن بۆ ئەوەی ئەوان بە درۆزن دەرنەخەن."

خەندە بە زەوقێکی چاوەڕوان نەکراوەوە گوتبووی: "لێرە سەیرتان دەکەین."

لەو دەمەدا دەرگا کرابووە و ئەو کوڕە لاوەی کە بە شەوان لە پرسگەی هوتێلەکە کاری دەکرد، گوتبووی: "بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە لە نەخۆشخانە گیانی لە دەست داوە."

تورگوت بەگ گوتبووی: "بەلەنگازی بودەڵە..." پاشان نیگای بڕیبووە (کا). "ئیسلامییەکان دەستیان کردووە بە پاککردنەوەی یەکە بە یەکەمان. ئەگەر دەتانەوێ بە پێستی خۆتانەوە بۆی دەربچن، ئەوا باشتر وایە هەرچی زووە باوەڕ بە خودا بێنن، چونکە ترسی ئەوەم هەیە دوای ماوەیەکی تر لە قارسدا ئیسلامبوونێکی میانڕەوانە بەشی ڕزگارکردنی گەردنی کەونە ئەتایستێک نەکات."

(کا) گوتبووی: "ڕاست دەفەرموون، منیش لای خۆمەوە بڕیارم داوە خۆشەویستیی خودا کە بەدرێژاییی ژیانم لە قوڵاییی هەناومدا هەستم پێ کردووە، بەتەواوی ئاشکرا بکەم."

هەموویان زۆر باش تێ گەیشتبوون کە ئەمەی بە گاڵتەجارییەوە گوتووە، بەڵام ئەوانەی دەوروبەری مێزەکە لەبەرئەوەی دڵنیابوون لەوەی (کا) بەتەواوی سەرخۆشە، ئەم وەڵامە دەستوبردەی گومانی ئەوەی لا دروست کردن کە پێشتریش ئەو جۆرە بیرکردنەوانەی هەبووە.

لەو دەمەیدا زاهیدە هاتە ژوورەوە، بەدەستێکی، مەنجەڵێکی گەورەی بەشێوەیەکی هونەری هەڵگرتبوو، ماڵەیەکی فافۆنیشی بە دەستەکەی تریەوە گرتبوو کە لەبەر تیشکی گڵۆپی سەر مێزەکەدا دەبریسکایەوە. بە سۆزێکی دایکانە و بەدەم زەردەخەنەوە لە مێزەکە نزیک کەوتەوە و گوتی: "لە مەنجەڵەکەدا بەشی کەسێک شۆربا ماوە، حەیفە فڕێی بدەم؛ کام کچ دەیەوێ؟"

ئیپەک کە بە (کا)ی گوتبوو نەچێ بۆ هۆڵی شانۆی گەل چونکە دەترسێ، لە ناکاو ڕووی وەرگێڕابوو و لەگەڵ خەندە و قەدیفەدا خۆی تێکەڵ بە قریوە و پێکەنینی ژنە کوردە خزمەتکارەکە کردبوو.

(کا) لەو ساتەدا لە خەیاڵی خۆیدا گوتبووی: "ئەگەر ئیپەک بڵێ –من!–، ئەوا لە تەکمدا دێت بۆ فرانکفورت و شووم پێ دەکات. ئەو کاتە دەچمە هۆڵی شانۆی گەل و ئەو شیعرەی بە ناونیشانی (بەفر) نووسیومە، دەخوێنمەوە."

ئیپەک دەسبەجێ –من–ی گوتبوو و بە بێزەوقی قاپەکەی درێژ کردبوو.

(کا) لە دەرەوە و لە ژێر کلووە بەفرە گەورەکاندا ماوەیەک بیری کردەوە کە ئەو کەسێکی نامۆیە بە شاری قارس و هەر ئەوەندەی لێی دوورکەوتەوە، لە بیری دەکات، بەڵام ئەم هەستە زۆر درێژەی نەخایاند و کەوتە بەر هەستی بڕواهێنان بە چارەنووس؛ بەشێوەیەکی زۆر بەهێز پەی بە هەبوونی ئەندازەیەکی نهێنی برد کە بۆ شیکردنەوەی لۆژیکی ژیان دەست نادات. ئارەزوویەکی قوڵی هەبوو بۆ شیکردنەوەی ئەو لۆژیکە و بەختەوەر بوون، بەڵام لەو کاتەدا خۆی هێندە بەهێز نەدەزانی بۆ ئەو ئارەزووی کامەرانییە.

شەقامە بەرفراوان و بە بەفر داپۆشراوەکەی بەردەمی کە تا بەردەم هۆڵی شانۆی گەل درێژ دەبووەوە و ئالاکانی هەڵمەتی هەڵبژاردن بە سەرییەوە دەشەکانەوە، چۆڵ



و هۆڵ بوو. (کا) بە فراوانیی گوێسەوانەکان، بە دەرگاکان، بە دڵگیریی نەخش و نیگاری سەر دیوارەکان و بە پێش هەیوانی بە ویقاری باڵەخانە کۆنە بەفر لێنیشتووەکاندا هەستێکی وای لا دروست بوو کەوا کەسێک (ئەو ئەرمەنییانەی لە تفلیس کاری بازرگانییان دەکرد؟ پاشاکانی عوسمانی کە باجیان لە خاوەن کارگەی شیرەمەنییەکان وەردەگرت؟) سەردەمانێک لێرە ژیانێکی بەختەوەر و ئارام و تەنانەت ڕەنگینی بەسەر بردووە. وەکو ئەوەی هەموو ئەرمەنی، ڕووس، عوسمانی و تورکەکانی سەرەتای دامەزراندنی کۆمار خۆیان کێشابێتەوە و کەسی تر نەهاتبێتە جێیان، کوچە و کۆڵانەکان چۆڵ و هۆڵ بوون، بەڵام بە پێچەوانەی شارە چۆڵکراوەکانەوە، کوچە بێکەسەکانی قارس ترسیان نەدەخستە دڵی مرۆڤەوە. (کا) سەوداسەرانە سەیری شکانەوەی تیشکی نارنجی و لاوازی گڵۆپەکان و تیشکی کزی نیۆنەکانی پشت جامخانە شەختەبەستووەکانی لەسەر تۆپەڵە بەفری سەر لقی دار زەیتوونی ڕووسی و دار چنارەکان و سەر ستوونەکانی کارەبای دەکرد کە لەملا و لەولاوە پارچە شەختەی زەبەلاحیان گرتبوو. بەفر بە کپییەکی ئەفسوناویی نزیک لە پیرۆزی دەباری. (کا) جگە لە دەنگی نزمی هەنگاوەکانی و هەناسەدانی خێرای خۆی هیچی تری نەدەبیست. هیچ سەگێک نەدەوەڕی. هەر دەتگوت کۆتاییی دنیا هاتووە، هەموو شتێک کە لەو ساتەدا دەیبینی و سەرتاپای گەردوون، نوقمی بەفربارین بوون. (کا) چاوی لە لە کلووە بەفرەکانی دەوروبەری گڵوپێکی کزی کوچەکە بڕی کە چۆن هەندێکیان لەسەرخۆ بەردەبوونەوە و چەند دانەیەکیشیان بەتاو بەرەو ژوور بۆ ناو تاریکاییەکە هەڵدەکشان.

چووە ژێر کەپری دوکانی وێنەگری ئایدنەوە و لە بەردەم تیشکێکی سووری دەرپەڕیو لە ناو تابلۆیەکی ئاگاداریی چوار لا بەفر گرتووەوە، بە چاوی زەقەوە سەیری کلووە بەفرێکی کرد کە چووە قوڵی پاڵتۆکەیەوە.

لەناکاو بایەک هەڵی کرد، جووڵەیەک کەوتە ئەو ناوە، ڕووناکیی سووری تابلۆی ئاگادارییەکەی وێنەگری ئایدن لەپڕ کوژایەوە و دار زەیتوونە ڕووسییەکەی بەرامبەریشی، وەکو ئەوەی ڕەش داگەڕابێ، وابوو. لە بەردەم دەروازەی هۆڵی شانۆی گەلدا ئاپۆڕەیەک کەمێک لەولاترەوە مینیبووسێکی پۆلیس و کۆمەڵێک کەسی بینی،

له نێوان دەرگا نیوەکراوەکەی چایخانەیەکی ئەوبەرەوە سەیری ئاپۆڕەکەی پێش هۆڵی شانۆی گەلیان دەکرد.

هەر کە چووە هۆڵی شانۆکەوە، پاڵ پێوەنان و جووڵەی ژوورەوە سەری هێنایە سوور. بۆنێکی چڕی ئەلکهۆل و هەناسە و جگەرە هەوای هۆڵەکەی قورس کردبوو. خەڵکێکی زۆر لەملا و لاوە بە پێوە ڕاوەستابوون؛ لەسەر مێزێکی چا لە گۆشەیەکدا گازۆز و سیمیت دەفرۆشرا. (کا) لای دەسشۆرەکەوە کە بۆنی کەلاکی تۆپیوی لێ دەهات، چەند لاوێکی بینی بە چرپە دەدوان، بەلای پۆلیسگەلێکی شینپۆش و چەند سڤیلێکی بێتەل بەدەستدا کە لەولاترە ڕاوەستابوون، تێ پەڕی. بێ ئەوەی گوێ بە قەرەباڵغی و هەرای ناو هۆڵەکە بدات، بەوردی سەیری جووڵەی چەند دەنکە نۆکێکی کرد کە منداڵێکی بچووک کە دەستی بەدەستی باوکیەوە بوو، کردبوویە ناو شووشەی گازۆزەکەیەوە.

(کا) سەرنجی دا یەکێک لەوانەی کە لە قەراغەوە ڕاوەستاون، بە شڵەژانەوە دەستی بۆ ڕادەوەشێنێ، بەڵام دڵنیا نەبوو لەوەی داخۆ بۆ ئەمە.

"هەر لە دوورەوە بە پاڵتۆکەتاندا ناسیمنەوە".

(کا) کە لە نزیکەوە ڕووخساری نەجیبی بینی، شەپۆلێکی خۆشەویستیی قووڵ بە هەناویدا تێ پەڕی. باوەشێکی بەهێزیان بەیەکدا کرد.

نەجیب گوتی: "دەمزانی کە دێن، زۆر خۆشحاڵ بووم. ئایا دەتوانم یەکسەر شتێکتان لێ بپرسم؟ دوو شتی زۆر گرنگم لە خەیاڵە."

"شتێکە یان دوو شت؟"

نەجیب گوتی: "ئێوە زۆر ژیرن، تەنانەت هێندە ژیرن تا ڕادەی تێگەیشتن لەوەی کە عەقڵ هەموو شتێک نییە." (کا)ی بەکێش کرد بۆ گۆشەیەکی ئارام تاکو بتوانن باشتر قسە بکەن: "ئایا بە هیجران یاخۆ قەدیفەتان گوت کە عەشقی ئەو لە کەللەی داوم و ئەو تاکە واتای ژیانی منە؟"

"نەخێر."

"ئایا ئەو کاتەی پێکەوە لە چایخانەکە چوونە دەرێ و ڕۆیشتن، هیچ باسی منتان



نەکرد؟"

"گوتم کە تۆ قوتابیی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی."

"وەکو تر؟ ئەدی ئەو هیچی نەگوت؟"

"نەیگوت."

بێدەنگییەک کەوتە نێوانیانەوە.

نەجیب شێلگیرانە گوتی: "تێ دەگەم کە بەڕاستی هیچی تر لە بارەی منەوە قسەتان نەکردووە." تفێکی قووت دا: "چونکە قەدیفە چوار ساڵ بە تەمەن لە من گەورەترە، پێ دەچێ هەر هەستیشی پێ نەکردبم. لەوانەیشە باسی شتی زۆر تایبەتیتان کردبێ لەگەڵیدا. بگرە لەوانەیە خۆتان لە قەرەی بابەتگەلی سیاسیی نهێنیش دابێ. من پرسیاری ئەمانە ناکەم. بەتەنیا پەرۆشی زانینی شتێکم کە ئێستا بۆ من زۆر گرنگە و پاشماوەی ژیانمی پێوە بەندە. قەدیفە ئەگەر هەر هیچ هەستیشی پێ نەکردبم -کە بە ئەگەری زۆر ساڵانێکی زۆری پێ دەچێ تا هەست بە من دەکات و تا ئەو کاتەیش شوو دەکات-، ئەوا ئێستا من لە وەڵامەکەی ئێوەوە تێ دەگەم کە ئایا بەدرێژاییی ژیانم عاشقی دەبم یاخۆ دەسبەجێ لەبیری خۆمی دەبەمەوە. تکایە هەر ئێستا و بێ خۆخەڵەفاندن، ڕاستیم پێ بڵێن."

(کا) بە شێوەیەکی فەرمی گوتی: "چاوەڕێی پرسیارەکەتان دەکەم."

"ئایا هیچ باسی شتگەلی ڕووکەشتان کرد؟ باسی شتی تەوش و تووڕەهاتی ناو تەلەفزیۆن، قسە و قسەڵۆکی بێ بایەخ، ئەو شتە بچووکانەی کە مرۆڤ دەتوانێ بە پارە بیانکڕێ. ئایا لێم تێ دەگەن؟ ئایا قەدیفە وەکو لێی بەدیار دەکەوێ مرۆڤێکی گرانی ئەوتۆیە کە بایەخ بە شتی بچووکی ڕووکەش نادات یاخۆ من بەخۆڕایی عاشقی بووم؟"

(کا) گوتی: "نەخێر، لە بارەی هیچ شتێکی ڕووکەشەوە نەدواین."

هەستی کرد وەڵامەکانی کاریگەرییەکی ڕووخێنەرانە لەسەر نەجیب دادەنێ، لە ڕووخساریشیدا بەدیی کرد کە لاوە خوێن گەرمەکە وا خەریکە بە هەوڵێکی بەدەر لە توانای مرۆڤەوە هێزی خۆی کۆ دەکاتەوە.

"بەڵام بینیتان کە ئەو مرۆڤێکی نائاساییە."

"بەڵێ."

"ئایا دەکرێ تۆیش عاشقی ببی؟ چونکە زۆر جوانە. هەم فرە شۆخە و هەم هێندەیش سەربەخۆیە، بەجۆرێک کە لە هیچ ژنێکی تری تورکدا بەدیم نەکردووە."

(کا) گوتی: ئەگەر مەسەلەکە جوانی بێ، دادەی زۆر جوانترە."

نەجیب گوتی: "ئەدی باشە مەسەلەکە چییە؟ حیکمەت لەمەدا چییە کە خودای پەروەردگار هەمیشە دەمخاتە سەر کەڵکەڵەی بیرکردنەوە لە قەدیفە؟"

هەردوو چاوە گەورە و سەوزەکانی کە مایەی سەرسوڕمانی (کا) بوو و یەکێکیان دوای پەنجا و یەک خولەکی تر دەتەقێنرێ، منداڵ ئاسا داچەقاندبوو.

(کا) گوتی: "نازانم."

"نەخێر دەزانی، بەڵام نایڵێی."

"نازانم."

نەجیب وەکو ئەوەی بیەوێ هاوکاریی بکات، گوتی: "گرنگ گوتنی هەموو شتێکە، ئەگەر نووسەر بام، ئەو شتەی بۆ گوتن نەدەشیا، من دەمگوت. ئایا دەتوانی ئەگەر بۆ جارێکیش بووە هەموو شتێکم پێ بڵێی؟"

"بپرسە."

"هەر یەکەمان بەڕاستی شتێک لە ژیانماندا هەیە کە دەمانەوێ، وا نییە؟"

"ڕاستە."

"ئەوەی تۆ چییە؟"

(کا) خۆی کپ کرد و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد.

نەجیب بە شانازییەوە گوتی: "ئەوەی من زۆر سادەیە، دەمەوێ لەگەڵ قەدیفەدا ژیانی هاوسەریتی پێکەوە بنێم، لە ئەستەمبوڵ ژیان بەسەر بەرم و ببم بە یەکەم نووسەری خەیاڵی زانستیی ئیسلامی. دەزانم ئەمانە کاری نەشیاون، بەڵام سەرباری



ئەوەیش هەر دەمەوێ. تێش دەگەم کە تۆ ئەوەی خۆت نادرکێنی، چونکە لێت تێ دەگەم. تۆ داهاتووی منی. ئێستا ئەمە لەو نیگایەوە تێ دەگەم کە لە چاوانی منت بڕیوە: تۆیش لە مندا لاوێتیی خۆت دەبینی و هەر لەبەرئەوەیشە منت خۆش دەوێ."

زەردەخەنەیەکی شاد و فێڵبازانە کەوتە سەر کەناری لێوی و (کا) لێی ترسا.

"کەواتە تۆ وەکو بیست ساڵ لەمەوبەری منت لێ دێ؟"

"بەڵێ. ئەو ڕۆمانی خەیاڵی زانستییەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەینووسمەوە، دیمەنێکی کوتومتی لەمەی ئێستای تێدا دەبێ. بمبەخشن، ئایا دەتوانم دەست بخەمە سەر ناوچەوانتان؟"

(کا) لەسەرخۆ سەری هێنایە پێشەوە. نەجیب وەکو کەسێک کە لەومەبەر ئەم جووڵەیەی کردبێ، بە ئاسانی لەپی دەستی خستە سەر ناوچەوانی (کا):

"ئێستا پێت دەڵێم کە بیست ساڵ لەمەوبەر بیرت لە چی کردووەتەوە."

"وەکو ئەوەی لەگەڵ فازیلدا دەیکەی؟"

"لەگەڵ ئەودا هەمان کات بیر لە هەمان شت دەکەینەوە. لەگەڵ تۆدا زەمانێک لە نێوانماندایە. تکایە ئێستا گوێ بگرە! ڕۆژێکی زستان، لە قوتابخانە بووی، بەفر دەباری و نوقمی بیرکرنەوە بووبووی. لە ناخەوە گوێت لە دەنگی خودا بوو، بەڵام هەوڵت دەدا لە بیری بکەی. هەستت دەکرد هەموو شتەکان لە یەک شتدا کۆدەبنەوە، بەڵام وا بیرت دەکردەوە کە ئەگەر چاوی خۆت لە ئاستی ئەو سەرچاوەی هەستەدا دابخەی، ئەوا ناشادتر و زیرەکتر دەبی. مافی خۆت بوو، چونکە دەتزانی کە تەنیا ناشاد و ژیرەکان دەتوانن شیعر بنووسن. بۆ ئەوەی شیعری باش بنووسی، زۆر قارەمانانە خۆت دایە بەر ئازارەکانی بێباوەڕی. هێشتا بەتەواوی عەقڵت بەوەدا نەشکابوو کە ئەگەر ئەو دەنگانەی ناوەوەت لەبیر بکەی، ئەوا لە سەرتاسەری گەردووندا بەتەنیا دەمێنیتەوە."

(کا) گوتی: "باشە، ڕاست دەکەی، وەها بیرم دەکردەوە. ئەدی ئێستا تۆیش وا بیر دەکەیتەوە؟"

نەجیب بە شڵەژانەوە گوتی: "دەمزانی کە دەسبەجێ ئەم پرسیارەم لێ دەکەی، ئایا

تۆیش دەتەوێ باوەڕ بە خودا بێنی؟ دەتەوێ، وا نییە؟" لە ناکاوێ دەستە ساردەکەی کە (کا)ی ڕاچەڵەکاند، لەسەر ناوچەوانی هەڵگرت. "دەتوانم لەم بارەیەوە زۆر شتت پێ بڵێم. لە ناخیشمدا گوێم لە دەنگێکە کە پێم دەڵێ -باوەڕ بە خودا مەهێنە-، چونکە باوەڕهێنان بە شتێک بەو هەموو عەشقەوە، بێ هەستێکی گومان یان پەرۆشی دەربارەی نەبوونی، سەرناگرێ. لەمە دەگەی؟ کاتێک تێ دەگەم کەوا بە هێزی باوەڕهێنان بە خودا جوانەکەم لە ژیاندا ماوم -کوتومت وەکو ئەوەی لە سەردەمی منداڵیمدا بیرم دەکردەوە کە ئەگەر دایک و باوکم بمردنایە، من چیم بکردایە-، هەندێ جار بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەگەر خودا نەبوایە، چی دەبوو. لەو کاتەدا شتێک لە بەر چاومدا بەرجەستە دەبێ: دیمەنێک. لەبەرئەوەی دەزانم کە ئەو دیمەنە هێزی خۆی لە خۆشەویستیی خودا وەرگرتووە، لێی ناترسم، بەڵکو بە پەرۆشەوە تەماشای دەکەم."

"ئادەی باسێکی ئەو دیمەنەم بۆ بکە!"

"دەیخەیتە شیعرەکەتەوە؟ پێویستیش ناکات لە شیعرەکەتدا ناوی من بێنی. لە بەرامبەر ئەوەدا تەنیا یەکەم داخوازیم هەیە."

"بەڵێ!"

"لە ماوەی شەش مانگی ڕابردوودا سێ نامەم بۆ قەدیفە نووسیووە. نەمتوانی هیچ کامێکیان بە پۆستدا بنێرم. لەبەر شەرمکردنم نەبووە؛ بەڵکو لەبەرئەوەی کارمەندانی پۆست دەیانکردەوە و دەیانخوێندەوە، چونکە نیوەی قارس پۆلیسی سڤلین. نیوەی ئەم ئاپۆڕەیەی ئێرەیش هەر هەون. هەموویان چاودێریمان دەکەن. لەوەیش زیاتر، برادەرانی خۆیشمان هەر چاودێریمان دەکەن."

"برادەرانی خۆتان کێن؟"

"هەموو ئیسلامییە لاوەکانی قارس. زۆر پەرۆشی زانینی ئەوەن کە داخۆ لەگەڵ تۆدا باسی چی دەکەم. ئەوان هاتوون بۆ ئەوەی لێرە هەرا بنێنەوە، چونکە دەزانن ئەم ئاهەنگە وەردەگەڕێتە سەر خۆنیشاندانی لایسیست و ئەفسەرەکانی سوپا. لایسیستەکان دەیانەوێ کۆنە شانۆنامەی ناسراو بە (چارشێو) نمایش بکەن و لەو



ڕێیەوە لە نرخی کچانی سەرداپۆشراو کەم بکەنەوە. من لە ڕاستیدا نەفرەت لە سیاسەت دەکەم، بەڵام هاوڕێکانم مافی خۆیانە یاخی بن، بەڵام بەهۆی ئەوەی من هێندەی ئەوان گەرم و ئاگری نیم، کەوتوونەتە گومانەوە لێم. واتا ئێستا لەم کاتەدا کە هەمووان سەیر دەکەن، ناتوانم نامەکانت بدەمێ. دەمەوێ ئەو نامانەم بۆ بگەیەنی بە قەدیفە."

"ئێستا کەس سەیر ناکات. هەر ئێستا بمدەرێ، دوایش باسی ئەو دیمەنەم بۆ بگێڕەوە."

"نامەکان لێرەن، بەڵام ئێستا لای خۆم نین. لە پشکنینی بەر دەرگا ترسام. لەوانەیە هاوڕێکانیشم بمپشکنن. با ڕێک دوای بیست خولەکی تر لە بەردەم دەسشۆرەکەی ئەوسەری ڕێڕەوەکەی پشت دەرگای لای شانۆکەوە یەکتر بگرینەوە."

"ئایا ئەو کاتە دیمەنەکەم بۆ دەگێڕیتەوە؟"

نەجیب گوتی: "ئەوا یەکێکیان بەرەو ئێرە دێ." سەیرێکی دووری کرد. "دەیناسم. سەیری ئەولایەوە مەکە، خۆت زیاد بەهەند مەگرە و وا نیشان بدە کە بە شێوەیەکی ئاسایی قسە دەکەی."

"باشە."

"هەموو قارس بە پەرۆشن بزانن کە تۆ بۆچی بۆ ئێرە هاتووی. هەموو پێیان وایە کە دەوڵەتی خۆمان تەنانەت هێزەکانی ڕۆژئاوا بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی نهێنی تۆیان بۆ ئێرە ناردووە. هاوڕێکانم منیان ناردووە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی ئەمانەت لێ بپرسم. ئایا ئەم وتی وتییانە ڕاستن؟"

"نەخێر."

"چییان پێ بڵێم؟ بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟"

"نازانم."

"دەزانی، بەڵام لە شەرماندا نایڵێی." بێدەنگییەک هاتە ئاراوە. نەجیب گوتی: "لەبەرئەوەی غەمگین بووی هاتی بۆ ئێرە."

"بە چیدا ئەمەت زانی؟"

"بە چاوەکانتدا دەزانم: هەرگیز کەسم نەبینیوە وەکو تۆ غەمبارانە بڕوانێ... ئێستا منیش کامەران نیم؛ بەڵام من لاوم. ناکامەرانی هێزم پێ دەبەخشێ. لەم تەمەنەدا ناکامەرانی دەخەمە پێش کامەرانییەوە. لە قارسدا تەنیا دەبەنگ و خراپەکاران دەتوانن شادمان بن. بەڵام کە دەگەمە ئەم تەمەنەی تۆ، دەمەوێ شادمانییەکم هەبێ کە بتوانم پاڵی پێوە بدەم."

(کا) گوتی: "ناکامەرانییەکەم، من لە بەرامبەر ژیاندا دەپارێزێ. خەمی منت نەبێ."

"چەند جوانە. تووڕە نەبووی، وا نییە؟ شتێکی هێندە باش بە ڕووخسارتەوە دیارە، بەجۆرێک پەی دەبەم کە دەتوانم هەموو شتێک کە بە هزرمدا گوزەر دەکات، تەنانەت تەوشترین شتیش، لای تۆ بدرکێنم. ئەگەر ئەو شتانە لای هاوڕێکانم بڵێم، دەسبەجێ دەمکەنە مەسخەرەی خۆیان."

"تەنانەت فازیلیش؟"

"فازیل شتێکی ترە. هەرکەسێ خراپەم دەرهەق بکات، ئەو تۆڵەم بۆ دەکاتەوە و دەشزانێ بیر لە چی دەکەمەوە. دە ئێستا کەمێکیش تۆ قسە بکە. کابرا سەیرمان دەکات."

(کا) گوتی: "کامە کابرا؟" سەیری ئاپۆڕەکەی پشتەوەی دانیشتووانی کرد: پیاوێکی سەر هەرمێیی، دوو لاوی دەموچاو بە قنچکە، چەند لاوێکی برۆ گرژ و جلی هەژارانە لەبەر، هەموویان ڕوویان بەرەو شانۆکە وەرگێڕا و هەندێکیشیان وەکو سەرخۆش خۆیان بادەدا.

(کا) لە بن لێوەوە گوتی: "ئەم ئێوارەیە من تەنیا کەس نیم کە دەخۆمەوە."

نەجیب گوتی: "ئەوانە لە ناکامەرانیی خۆیاندا دەخۆنەوە، ئێوەیش بۆ ئەوەی کامەرانیی شاراوەی ناوەوەتان خۆی ڕابگرێ، خواردووتانەتەوە."

لەگەڵ تەواوکردنی قسەکانیدا، لە پڕ خۆی کرد بەناو ئاپۆڕەکەدا. (کا) دڵنیا نەبوو لەوەی داخۆ باش گوێی لە قسەکانی نەجیب بووە یاخۆ نا، بەڵام هۆشی لە ناوەوە ئەوەندە ئاسوودە بوو کە سەرباری هەموو غەڵبەغەڵب و هەرای ناو هۆڵەکە، وای



دەزانێ گوێی بۆ ئاهەنگێکی مۆسیقای ئارام ڕاگرتووە. یەکێک دەستی بۆ ڕاوەشاند، لە ناو بینەراندا چەند کورسییەکی بۆش هەبوون کە بۆ "هونەرمەندان" جیا کرابوونەوە، کارمەندێکی نیوە بەڕێز و نیوە چەقاوەسووی سەر بە دەستەی شانۆکاران، (کا)ی دانیشاند.

من دوای چەندین ساڵ لەو کاسێتە ڤیدیۆییانەی کە لە ئەرشیفی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس)دا دەرم هێنان، (کا)م ئەو شەوە لەسەر شانۆ بینی. سکێچێکی کورت لەسەر شانۆ نمایش دەکرا کە گاڵتەی بە ڕێکلامی بانکێک دەکرد، (کا) لەبەرئەوەی ساڵانێکی درێژ بوو لە تورکیا سەیری تەلەفزیۆنی نەکردبوو، نەیدەتوانی تێ بگات کامیان هەجووە و کامیان لاساییکردنەوەیە. بەڵام لەوە گەیشت کە ئەو پیاوە لووتبەرزەی کە بۆ پارە خەواندن چووە بانکەکەوە، یەکێک بوو لەو کەسانەی کە دەیویست بە هەر نرخێک بووە خۆی وەکو ڕۆژئاوایی نیشان بدات. تیپی شانۆی برێختچی- باختینچیی سونای زایم لە چایخانەکانی شارۆچکەکانی کەنار و بچووکتر لە قارس، لەو شوێنانەی کە نە ژنیان دەگەیشتێ و نە پیاوەکانی دەوڵەوت، ئەم شانۆیەیان بە شێوەیەکی زۆر بێ ئەدەبانەتر نمایش دەکرد، فیز و لەخۆبایی بوونی کابرای مۆدێرن لە کاتی وەرگرتنی کارتی بانکدا، وەردەگەڕایە سەر قوندانێک کە بینەرانی نوقمی پێکەنین دەکرد. (کا) لە دوا ساتدا بۆی ڕوون بووەوە کە ئەو پیاوە سمێڵ بابڕەی لە سکێچەکەی تردا جلی ژنی لەبەر کردووە و شامپۆی ڕەشی بریقەدار و کرێمی قژی لە سەری داوە، خودی سونای زایمە. سونای بە جلوبەرگی ژنانەوە وەکو ئەو سەردەمانەی کە دەویسترا بە (پروپاگەندەی دژی سەرمایەداری) ئاپۆڕەی تووڕە و هەژاری چایخانە پیاوانەکانی قەراغ شارەکان هێور بکرێتەوە، لەلایەک جنێوی پیسی دەدا و لەلایەکی تریش، وای نیشان دەدا کە لە دواوە شووشە درێژەکەی شامپۆ بە قونی خۆیدا دەکات. پاشان فوندا ئەسەری ژنی سونای دەستی کرد بە لاساییکردنەوەی ڕێکلامی جۆرێک لە باسترمە کە دانیشتوان زۆر حەزیان لێ دەکرد. سجوقێکی بەدەستەوە گرت و گوتی "ئەسپە یان کەر؟" بە نەشئەیەکی زۆر بێ ئەدەبانەوە هەندێک بەدەستیەوە کێشای و بێ ئەوەی زیاتر درێژەی پێ بدات سەر شانۆی بەجێ هێشت.

دواتر ڤورالی گۆڵچیی ناسراوی ساڵی شەستەکان هاتە سەر شانۆ، دەستی کرد بە گێڕانەوەی چۆنێتیی خواردنی یازدە گۆڵ کە لە یارییەکی نیشتمانیدا لە ئەستەمبوڵ هەڵبژاردەی تۆپی پێی ئینگلیز لێیان کردبوو. باسی بێ ئابڕوویی و تەڵەکەبازیی خۆی لەگەڵ ژنە ئەکتەرەکانی ئەو سەردەمەدا کرد. بینەران بە پێکەنینەوە، بەدەم زەوقێکی سەیری ئازارچێشتن و بەهەوای بەلەنگازیی تێکەڵ لە بەزمێک لە شێوازی تورکی گوێیان بۆ بەسەرهاتەکانی ڕاگرت.



# ١٦

# ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە

## ئەو دیمەنەی نەجیب بینیبووی و شیعرەکەی (کا)

کاتێک (کا) دوای بیست خولەک گەیشتە ئاودەستخانەکانی ئەوسەری ڕێڕەوە ساردەکە، سەیری کرد وا نەجیبیش هاتووە و لە پشتی چەند میزکەرێکەوە ڕاوەستاوە. ماوەیەک وەکو دوو کەسی نائاشنا بەیەکتر، لە بەردەم دەرگا قفڵدراوەکانی ئاودەستەکاندا چاوەڕێیان کرد. (کا) سەیرێکی گوڵ و گەڵا نەخشێنراوەکانی سەر بنمیچی بەرزی ئاودەستخانەکەی کرد.

ئاودەستێک چۆڵ بوو و ئەمان خۆیان پێدا کرد. (کا) هەستی کرد کە پیرە پیاوێکی ددان لە دەمدا نەماو ئەمانی بینی. دوای ئەوەی چوونە ژوورەوە و سولگییەکەیان ڕاکێشا، نەجیب گوتی: "نەبینراین." دواتر بە خۆشییەوە باوەشی بە (کا)دا کرد. بە جووڵەیەکی جەربەزانە، بە پێڵاوە وەرزشییەکانی پێیەکی نا بە پنتێکی دیواری ئاودەستەکەدا، خۆی بەرز کردەوە و دەستی درێژ کرد و زەرفەکانی سەر دەسکی ئاوڕێژەکەی دۆزییەوە. دابەزیە خوارێ، بە تاسەوە فووی لە تۆزی سەر زەرفەکان کرد و پاکی کردنەوە، گوتی: "لە کاتێکدا کە ئەم نامانە دەدەیتە قەدیفە، دەمەوێ شتێکی پێ بڵێی. زۆر بیرم لەمە کردەوە. لە دوای ئەوەی ئەم نامانەی من دەخوێنێتەوە، ئیدی من لە ژیاندا هیچ ئومێدێکم بە قەدیفە نامێنێ و چاوەڕێی هیچی لێ ناکەم. دەمەوێ ئەمەی زۆر بەڕاشکاوی پێ بڵێی."

"دوای ئەوەی لە عەشقی تۆ ئاگادار دەبێتەوە و دەزانێ کە هیچ ئومێدێکیش نییە، ئیدی بۆچی عەشقی خۆتی بۆ بەیان دەکەی؟"

نەجیب گوتی: "من وەکو تۆ لە ژیان و خۆزگە و هەوەسەکانم ناترسم." ترسا (کا)ی نیگەران کردبێ: "ئەم نامانە تەنیا چارەسەرن بۆ من: من ناتوانم بژیم ئەگەر بێت و

عاشقی کەسێک نەبم و جوانییەکەیم خۆش نەوێ. پێویستە کەسێکی ترم بە کامەرانی خۆش بوێ، بەڵام دەبێ لە سەرەتادا قەدیفە لە سەری خۆم دەربێنم. دەزانی دوای قەدیفە هەموو حەز لێکردنم بۆ کێ دەکەم بە دیاری؟"

نامەکانی دایە دەستی (کا).

(کا) بەدەم هەڵگرتنی نامەکانەوە لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا پرسی: "بۆ کێ؟"

"بۆ خودا."

"ئەو دیمەنەم بۆ بگێڕەوە کە بینیووتە."

"جارێ ئەو پەنجەرەیە بکەرەوە! ئێرە بۆگەنی لێ هەڵدەستێ."

(کا) دەستی نا بە دەسکە ئاسنینەکەدا و پەنجەرە بچووکەکەی سەرئاوەکەی کردەوە. بە سەرسوڕمانەوە و وەکو ئەوەی سەیری پەرجوویەک بکەن، نیگایان لە کلووە بەفرەکان بڕی کە بە هێمنی لە تاریکاییی دەرەوەدا دەبارین.

نەجیب بە چرپە گوتی: "ئای خودای گەورە، چەندە جوانە!"

(کا) گوتی: "بە بۆچوونی تۆ جوانترین ڕەهەندی ژیان کامەیە؟"

کەمێک بێدەنگی هاتە ئاراوە. نەجیب وەکو ئەوەی نهێنییەک بدرکێنێ، گوتی: "هەمووی!."

"باشە مەگەر ژیان ناشادمان ناکات؟"

"دەیکات، بەڵام ئەوە تاوانی خۆمانە، نەک تاوانی گەردوون و خوڵقێنەرەکەی."

"دیمەنەکەم بۆ بگێڕەوە."

نەجیب گوتی: "جارێ دەست بخەرە سەر ناوچەوانم و داهاتووی خۆمم بۆ بخوێنەوە." چاوەکانی، کە یەکێکیان دوای بیست و شەش خولەکی تر لەگەڵ مێشکیدا دەپرژێندرێ، بە باشی کردەوە. "دەمەوێ ژیانێکی بەختەوەر و تێروتەسەل بەسەر بەرم و زۆر شتی جوانیش بە هزرمدا ڕادەبوورێ، وەلێ زۆر بە پەرۆشم بزانم کە دوای بیست ساڵی تر چۆن بیر دەکەمەوە."



(کا) لەپی دەستی خستە سەر پێستە تەنکەکەی ناوچەوانی نەجیب. وەکو ئەوەی دەستی خستبێتە سەر شتێکی زۆر گەرم و داخبوو، بەگاڵتەوە دەستی کێشایەوە و گوتی: "ئاه، ئەی هاوار خودای گەورە! لێرەدا بزاوتێکی زۆر هەیە."

"بیڵێ."

(کا) گوتی: "دوای بیست ساڵی تر، واتە ئەو کاتەی تەمەنی تۆ دەبێت بە سی و حەوت ساڵ، لە ئاکامدا تێ دەگەیت کە هەموو خراپەکارییەکانی جیهان، واتا نەداری و بێ عەقڵیی لە ڕادەبەدەری هەژاران و دەوڵەمەندی و ژیریی بێ سنووری دەستڕۆیشتووان، زۆرداری، توندوتیژی و دڵڕەقی، بە واتایەکی تر، هەموو ئەو شتانەی کە ویستی مردن و هەستی گوناهباری لە تۆدا دەوروژێنێ، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێک وەکو ئەوی تر بیر دەکاتەوە. بۆیە درک بەوە دەکەی لەم سەرزەمینەدا کە هەرکەسێک بەڕەوشت دێنە بەرچاو و دواتر دەبەنگ دەبێ و دەمرێ، تۆ تەنیا دەتوانی وەکو مرۆڤێکی بەدڕەوشت و خراپ دەربکەوی. بەڵام حاڵیش دەبی کە ئەمە ئاکامێکی زۆر خراپی دەبێ، چونکە لە ژێر دەستی لەرزۆکمدا هەست بەم دەرئەنجامەیش دەکەم..."

"ئەوە چییە؟"

"تۆ زۆر ژیریت و هەر ئەمڕۆیش دەزانی ئەوە چییە. بۆیە دەمەوێ لە پێشدا تۆ بیدرکێنی."

"چییە؟"

"لە ڕاستیشدا دەزانم لەم سۆنگەیەوەیە کە لە بەرامبەر بەدبەختی و بێ نەواییی هەژاندا هەست بە تاوانباریی خۆت دەکەی."

نەجیب گوتی: "واتا حاشا من باوەڕ بە خودا ناکەم؟ ئەگەر وا بێ، ئەوا دەمرم."

"وەکو بەسەرهاتی بەڕێوەبەرە بەلەنگازەکەی کە لە ناو ژوورکێشەکەدا بوو بە ئەتایست، ئەمە بە شەوێک ڕوونادات! هێندە بەخاوی ڕوودەدات کە بگرە هەستیشی پێ ناکەیت. وەکو ئەو کەسەت لێ دێ کە بەیانیانێک زیاد لە پێویست عارەقی خواردبووە و هێندە بە خاوی مردبوو، بەجۆرێک وای زانیبوو ساڵانێکی درێژە لە

دنیای ئەودیوە."

"ئەو کەسە تۆی؟"

(کا) دەستی لەسەر ناوچەوانی نەجیب هەڵگرت: "تەواو بە پێچەوانەوە. چەندین ساڵە من هێدی هێدی باوەڕم بە خودا هێناوە. ئەمە هێندە لەسەرخۆ ڕووی دا کە تەنیا لە هاتنمدا بۆ قارس توانیم پەی پێ ببەم. لەبەر ئەوە لێرە کامەرانم و دەتوانم شیعر بنووسم."

نەجیب گوتی: "ئێستا هێندە بەختەوەر و ژیر دێیتە بەر چاوم کە دەمەوێ لێت بپرسم: ئایا بەڕاستی مرۆڤ دەتوانێ پێشبینیی داهاتوو بکات؟ ئەگەر بۆیشی نەکرێ، ئایا دەتوانێ باوەڕ بکات کە ئەمەی لە دەست دێ و هەست بە ئاشتی و ئارامی دەکات؟ ئەمە دەخەمە یەکەم ڕۆمانی خەیاڵی زانستیمەوە."

(کا) گوتی: "هەندێ مرۆڤ هەن کە دەزانن... فەرموو بڕوانە، سەردار بەگی خاوەنی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) لە زووەوە پێشبینیی ڕووداوەکانی ئەم ئێوارەیەی کردووە، هەمووی نووسیووە و لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاوی کردووەتەوە." هەردووکیان سەیری ئەو ڕۆژنامەیەیان کرد کە (کا) لە گیرفانی دەرهێنا: "... نمایشەکە جاروبار بە چەپڵەلێدان و دەربڕینی ڕەزامەندی، ڕاگیرا." نەجیب گوتی: "ئەمە دەبێ ئەوە بێت کە مرۆڤ پێی دەڵێ بەختەوەری. ئەگەر ئەوەی بە سەرماندا دێ پێشتر لە ڕۆژنامەکاندا بماننووسیبا و پاشان ئەو شتە جوانانەی کە نووسیومانە بقەومانایە، ئەوسا دەبووین بە شاعیری ژیانی خۆمان. ڕۆژنامەکە نووسیوێتی کە تۆ دوا شیعری خۆت خوێندووەتەوە. کامە شیعرە؟"

لە دەرگای ئاودەسەکە درا. (کا) داوای لە نەجیب کرد دەسبەجێ -ئەو دیمەنە-ی بۆ بگێڕێتەوە.

نەجیب گوتی: "ئێستا دەیگێڕمەوە، بەڵام لای کەس ناڵێی کە لە منت بیستووە. زۆریان پێ خۆش نییە کە پێوەندیم لەگەڵ تۆدا هێندە توندوتۆڵ بێ."

(کا) گوتی: "بە کەس ناڵێم، هەر ئێستا بۆم بگێڕەوە."

نەجیب بەخرۆشەوە گوتی: "خودام زۆر خۆش دەوێ. جاروبار -حاشا- بێ ئەوەی



بمەوێ لە خۆم دەپرسم کە ئەگەر نەبوایە، چی دەقەوما، لەگەڵیدا دیمەنێکی تۆقێنەر دێتە بەرچاوم."

"بەڵێ."

"لە تاریکاییی شەوێکدا لە پەنجەرەیەکەوە سەیری ئەو دیمەنە دەکەم. لە دەرەوە دوو دیواری سپیی بەرز و بێ پەنجەرەی وەکو دیواری قەڵا دەبینم. وەکو ئەوەی دوو قەڵا لە بەرامبەر یەکتردا ڕاوەستابن! من بە ترسەوە سەیری لێژاییی نێوانیان دەکەم کە وەکو کوچەیەکی تەنگبەر دێتە بەرچاوم. ئەو کوچەیەی کە خودای لێ نییە، وەکو ئەوانەی قارس بەفراوی و قوڕاوییە، بەڵام ڕەنگی مۆرە! شتێک لە ناوەڕاستی کوچەکەدایە کە پێم دەڵێ -ڕاوەستە-، بەڵام من سەیری ئەوپەڕی کوچەکە، سەیری کۆتاییی دنیا دەکەم. لەوێدا دارێک هەیە، دواین داری ڕووتەڵە و بێ گەڵا. لەپڕ لەبەرئەوەی من سەیری دەکەم، سوور دادەگرێ و گڕ دەگرێ. لەو ساتەدا لە پای پەرۆشیم بۆ زانینی ئەو جێیەی خودای لێ نییە، هەست بە تاوانباری دەکەم. دوای ئەوە دارە سوورەکە، ڕەنگە تاریکە کۆنەکەی خۆی وەردەگرێتەوە. بە خۆم دەڵێم چیدی سەیر ناکەم، بەڵام خۆم بۆ ڕاناگیرێ، سەیر دەکەمەوە و دارەکەی ئەوپەڕی دنیا دیسان سوور دادەگەڕێ، گڕ دەگرێ و دەست بە سووتان دەکات. ئەمە تا بەرەبەیان درێژە دەخایەنێ."

(کا) پرسی: "بۆچی ئەم دیمەنە هێندە دەتترسێنێ؟"

"چونکە جاروبار لە ژێر کاریگەریی ئیبلیسدا وا دێت بە خەیاڵمدا کە لەوانەیە ئەم دیمەنە سەر بەم دنیایەش بێت، بەڵام ئەو شتەی کە لە بەرچاومدا بەرجەستە دەبێ، پێویستە شتێک بێت کە من داڵغەم پێوەی لێ دابێ، چونکە ئەگەر جێیەکی وەکو ئەوەی باسم کرد، لەم جیهانەدا هەبوایە، ئەوا ئەو کاتە -حاشا- واتای نەبوونی خودای دەگەیاند. بەو پێیەی ئەمە لە ڕاستی بەدوورە، تەنیا شیمانەیەک دەمێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە من باوەڕم بە خودا نییە. ئەمەیش لە مردن خراپترە."

(کا) گوتی: "تێ دەگەم."

"سەیری ئەنسکۆپیدیایەکم کرد، سەرچاوەی وشەی ئەتایست -ئاتۆس-ی یۆنانییە.

ئەو وشەیەش بۆ کەسێک بەکار نابرێ کە خودا نەناسێ، بەڵکو بەو کەسە دەگوترێ کە لە لایەن خوداوەندەکانەوە ترۆ کراوە. ئەمەیش نیشانی دەدات کە مرۆڤ لە قارس هیچ کاتێک خودانەناس نابێ، چونکە ئەگەر تەنانەت خۆیشمان داوای لێ بکەین، خودا لێرە جیمان ناهێڵێ. ئەو کەسەی بیەوێ ببێ بە خودانەناس، پێویستە سەرەتا ببێ بە ڕۆژئاوایی."

(کا) گوتی: "من دەمویست لە یەک کاتدا ڕۆژئاوایش بم و باوەڕیش بهێنم."

"مرۆی ترۆکراو لە لایەن خوداوە، ئەگەر تەنانەت هەموو ئێوارەیەک بچێتە چایخانە، لەگەڵ هاوڕێکانیدا بتریقێتەوە و یاریی کاغەز بکات، هەموو ڕۆژێک لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا قاقا لێ بدا، بەزم بگێڕێ، هەموو ڕۆژەکانی بە گفتوگۆ و دەمەتەقێ لە تەک دۆست و هاوڕێکانیدا بەسەر ببات، ئەوا هێشتا هەر تەنیایە."

(کا) گوتی: "سەرباری ئەوەیش دەکرێ خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە و دڵدانەوە هەبێ."

"پێویستە ئەویش تۆی خۆش بوێ، هەروەکو چۆن تۆ ئەوت خۆش دەوێ."

دیسانەوە لە دەرگا درا، نەجیب باوەشی بە (کا)دا کرد، وەکو منداڵ ڕوومەتەکانی ماچ کرد و چووە دەرەوە. (کا) بینی ئەوا کەسێک چاوەڕێیە بێچێتە ئاودەستەکەوە، بەڵام ڕێک لەو ساتەدا بۆ ئاودەستێکی تر تاوی دا. (کا) دیسان سولگی دەرگاکەی قایم کرد و بەدەم سەیرکردنی بەفربارینی ئەفسانە ئاساوە جگەرەیەکی داگیرساند. وەکو ئەوەی شیعرێکی بیر بکەوێتەوە، وشە بە وشەی ئەو دیمەنەی هاتەوە یاد کە نەجیب بۆی گێڕابووەوە. ئەگەر کەس لە پۆرلۆک-ەکەوە نەهاتایە، ئەوا دەیتوانی ئەو دیمەنەی کە نەجیب بینیوێتی، وەکو شیعر لە دەفتەرەکەیدا تۆمار بکات.

ئەو پیاوەی کە لە پۆرلۆک-ەکەوە دێ! لە ساڵانی کۆتاییی قۆناغی ئامادەیی و لەو ڕۆژانەدا کە تا نیوەی شەو سەبارەت بە ئەدەبیات قسەمان دەکرد، ئەمە خۆشەویستترین بابەتی من و (کا) بوو. هەرکەسێک کەمێک ئاشنای شیعری ئینگلیزی بێ، ئاگادارە کە (Coleridge) لە سەرەتای شیعری (قوبیلای خان)دا بە ناونیشانی (خەیاڵێکی بینراو لە خەوندا، بەشێک لە شیعرێک)، باس لەوە دەکات کە



چۆن لە ژێر کاریگەریی دەرمانێکدا کە بەهۆی نەخۆشکەوتنیەوە بەکاری هێناوە (لە ڕاستیدا بۆ زەوق ئەفیۆنی کێشاوە)، خەوی لێ کەوتووە، بەر لەوەی خەو بیباتەوە، کتێبێکی بەدەستەوە بووە و خوێندوویەتیەوە، لە خەونێکی ناوازەدا دەبینێ ڕستەکانی ناو کتێبەکە هەریەکەیان بوون بە شتێک و بوون بە شیعر، شیعرێکی هێندە بەرز، وەکو ئەوەی هیچ هێزی هزری بۆ نەخرابێتە کار و هەر لە خۆیەوە پێک هاتبێ! لەوەیش گرنگتر، Coleridge، کاتێک لە خەو هەڵدەستێ، وشە بە وشەی ئەم شیعرە بەرزەی لەبەر دەبێ، کاغەز و پەڕەمووچ و مەرەکەب دەردێنێ و بەپەلە دەست بە نووسینەوەی بەیت بە بەیتی شیعرەکەی دەکات. نووسینەوەی ئەو بەیتانەی شیعرەکەی کە بەلای ئێمەوە ئاشکرایە، تەواو دەکات و ڕێک لەو کاتەدا لە دەرگا دەدرێ، هەڵدەستێ و دەرگا دەکاتەوە: کابرای بەر دەرگا کەسێک بوو کە لە شاری پۆرلۆکی نزیکەوە بۆ قەرزی پارە هاتبوو). Coleridge دوای لە کۆڵ کردنەوەی کابرا، بەپڕتاو بۆ سەر مێزەکەی دەگەڕێتەوە، بەڵام دوای چی! تێ دەگات پاشماوەی شیعرەکەی لە بیر چووە و بەتەنیا ڕیتمەکەی و تاک و تەرا وشە لە هزریدا ماوە.

لەبەرئەوەی کەس لە پۆرلۆک-ەوە نەهاتبوو تا سەرنجی (کا) پەرش بکات، کاتێک بانگ کرا بۆ سەر شانۆ، هێشتا شیعرەکەی لە بیر مابوو. لەسەر شانۆ باڵای لە هەمووان بەرزتر بوو، پاڵتۆ ڕەنگ خۆڵەمێشییە ئەڵمانییەکەیشی ئەوی لە هەموو ئەوانی تر جیاکردبووەوە.

غەڵبە غەڵب و هەرای ناو هۆڵەکە لە ناکاو بڕا. هەندێکیان، قوتابیانی زیرەک، بێ کاروبارەکان و ئیسلامییە سیاسییە ڕەخنەگرەکان، لەبەرئەوەی نەیاندەزانی بە چی پێ بکەنن و نارەزایی لە دژی چی دەربڕن، بێدەنگ بووبوون. فەرمانبەران، پۆلیسەکان کە بەدرێژاییی ڕۆژ بەدوای (کا)وە بوون، جێگری پارێزگار، جێگری بەڕێوەبەری ئاسایش و مامۆستاکان کە لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوون، دەیانزانی (کا) شاعیرە. بێژەرە قوچەکە بێدەنگیی ناو هۆڵەکەی شڵەقاند. پرسیارێکی لەو جۆرەی لە (کا) کرد کە لە -بەرنامەی چاند-ی تەلەفزیۆنیدا لە میوان دەکرێ. "شاعیرن، شیعر دەنووسن. ئایا شیعر نووسین سەختە؟" لە کۆتاییی ئەم گفتوگۆ کورت و لەبەردڵ گرانەدا، کە هەموو جارێ لە کاتی سەیرکردنی کاسێتی ڤیدیۆکەدا

دەمەوێ لەبیری بکەم، ئەوانەی لە هۆڵەکەدا دانیشتبوون، نەیاندەزانی شیعرنووسین سەختە یاخۆ نا، هەموویان تەنیا ئەوە تێ گەیشتن کە (کا) لە ئەڵمانیاوە هاتووە.

بێژەرەکە دواتر پرسی: "شاری قارسی جوانی ئێمەت چۆن هاتە بەرچاو؟"

(کا) دوای ساتێک لە بێ بڕیاری گوتی: "زۆر جوان، گەلێک هەژار و فرە غەمبارە."

دوو قوتابی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان لە دواوە پێکەنینیان بەم قسەیە هات. یەکێکی تر نەڕاندی: "ڕۆحی تۆ هەژارە." شەش حەوت کەسێکی تر غیرەت گرتنی، هەستانە سەرپێ و دەستیان بە هات و هاوار کرد. نیوەیان شۆخییان دەکرد، نیوەکەی تریش، کەس لێیان تێ نەدەگەیشت کە چ دەڵێن. دواتر کە چوومە قارس، تورگوت بەگ بۆی گێڕامەوە و گوتی کاتێک خەندە لە تەلەفزیۆندا گوێی لەم قسەیە بوو، دەستی کرد بەگریان. بێژەرەکە گوتی: "لە ئەڵمانیا نوێنەرایەتیی ئەدەبی تورکیتان دەکرد."

یەکێک نەڕاندی و گوتی: "با پێمان بڵێ بۆچی هاتووە بۆ ئێرە."

(کا) گوتی: "بۆیە هاتووم، چونکە زۆر ناشاد بووم، لێرە کامەرانترم. تکایە گوێ بگرن، ئێستا شیعرەکەم دەخوێنمەوە."

دوای تاوێک شپرزەیی و هەرا و هوریا، (کا) دەستی کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکەی. کاتێک دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ کاسێتی ڤیدیۆی ئەو شەوەم دەست کەوت، بە سەرسوڕمان و خۆشەویستییەوە سەیری هاوڕێکەم کرد. ئەوە یەکەم جارم بوو ببینم کە لە بەردەم ئاپۆڕەیەکی گەورەدا شیعر دەخوێنێتەوە. وەکو کەسێک بەوردی و هێدی هێدی هەنگاو بنێ، بە سەری جەنجاڵەوە دەچووە پێشەوە. ئای چەندە لە فیز و خۆبادان بە دوور بوو! جگە لە ڕاوەستانی دوو جار، وەکو ئەوەی بیەوێ شتێکی بیر بکەوێتەوە، ئەگەر نا، شیعرەکەی بێ ناوبەر و بە ئاسانی خوێندەوە.

نەجیب هەستی کرد وشە بەوشەی ئەو –دیمەن––ەی سەبارەت بەو –شوێنەی کە خودای لێ نییە– کە پێش کەمێک بۆ (کا)ی گێڕابووەوە، خراوەتە شیعرەکەوە. وەکو ئەوەی جادووی لێ کرابێ لە جێی خۆی ڕاست بووەوە، بەڵام (کا) کە بیری لە بارینی



بەفرەکە کردەوە، لە خێراییی خۆی کەم نەکردەوە. دەنگی یەک دوو چەپڵە بیسترا. یەکێک لە ڕیزەکانی دواوە هەستا و دەستی کرد بەهاوار کردن، هەندێکی تریش بەدوایدا هەمان شتیان کرد. نەدەزانرا کە داخۆ وەڵامی بەیتەکانی شیعرەکەیان دەدایەوە، یاخۆ بێزار بووبوون. ئەگەر ئەو تارماییە حساب نەکەین کە دوای کەمێک کەوتە سەر تەختەدیکۆرێکی سەوز، ئەو دیمەنانە دەبوونە دواین دیمەنەکانی ئەو هاوڕێ بیست و حەوت ساڵییەم کە من بینیبێتم.

# ١٧

## "نیشتمان یان سەرپۆش"

### پیەسێک سەبارەت بەو کچەی کە سەرپۆشەکەی خۆی دەسووتێنێ

دوای ئەوەی (کا) لە خوێندنەوەی شیعرەکەی بووەوە، کابرای بێژەر بەجووڵەی سەیر و بەدەم دەربڕینی وشەی قەبەوە، پێشکەشکردنی پیەسی داهاتوو (نیشتمان یان سەرپۆش)ی ڕاگەیاند و بەگەورەترین نمایشی ئاهەنگەکەی دانا.

لە ڕیزەکانی ناوەڕاست و پشتەوە کە قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژان و وتارخوێنان دانیشتبوون، دەنگی چەند ناڕازیبوونێک، یەک دوو فیکە، هۆیهاکێشان و لە ناو فەرمانبەرانی ڕیزی پێشەوەیش، دەنگی چەپڵەی پشتیوانی و هاندان بیسترا. ئاپۆڕەیەی ناو هۆڵەکە، نیوەیان بەپەرۆشەوە و نیوەکەی تر بەڕێزەوە چاویان لە شانۆکە بڕیبوو و چاوەڕێی بڕگەی داهاتوویان دەکرد. نمایشە -پڕوپووچەکان-ی پێشووتری تیپی شانۆ، لاساییکردنەوەی بێتامی ڕێکلامەکان لە لایەن فوندا ئەسەرەوە، قوونبادانی لە هەموو بارێکی گونجاو و نەگونجاودا، نواندنی ڕۆڵی پیاوی گەندەڵی ژنە سەرۆک وەزیرێکی پێشووتر لەگەڵ سونای زایمدا، بەپێچەوانەی بڕێک لە فەرمانبەرانی ڕیزەکانی پێشەوە، دڵی ئاپۆڕەی بینەرانی لە ئاهەنگەکە سارد نەکردبووەوە، بگرە گەرمتری کردبوون.

(نیشتمان یان سەرپۆش)یش ئامادەبووانی هێنایە جۆش، بەڵام هەرا و فیکەی قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان و دەنگ هەڵبڕینی بەردەوامیان، مرۆڤی بێزار دەکرد، بۆیە کەس لە دیالۆگەکانی سەر شانۆ حاڵی نەدەبوو، بەڵام ئەم پیەسە بیست خولەکییە سوواو و -مۆدە بەسەرچووە- بناغەیەکی دراماتیکیی هێندە پتەوی هەبوو، بەجۆرێک کە کەڕ و بێزمانیش لێی تێ دەگەیشتن.

١- ژنێک سەرپۆشێکی ڕەشی قەترانیی بەسەرەوەیە و بەکوچە و کۆڵانەکاندا دەڕوات بەڕێوە، لەگەڵ خۆیدا دەدوێ و بیر دەکاتەوە. لەبەر هۆیەک کە نازاندرێ چییە، غەمبارە.

٢- ژنەکە سەرپۆشەکەی لەسەر دەکاتەوە و ئازادبوونی خۆی ڕادەگەیەنێ. ئێستا بێ سەرپۆشە و دڵشادە.

٣- خێزانەکەی، دەزگیرانەکەی، خزم و ناسیاوانی، ڕیشداران و پیاوانی مسوڵمان، بەهۆی جۆربەجۆرەوە بەرەنگاری ئەم ئازادییە دەبنەوە و دەخوازن ژنەکە سەرلەنوێ سەرپۆش لە سەر بکاتەوە. ئەمەیش وا لە ژنەکە دەکات کە لە ساتێکی هەڵچووندا سەرپۆشەکەی بسووتێنێ.

٤- پەڕگیر و وشکەسۆفیی ڕیش تۆپن و تەزبیح بەدەست، بەتوندی بەرەنگاری ئەم یاخیبوونە دەبنەوە، لەو کاتەدا ژنەکە بەقژ ڕادەکێشن و خەریکن بیکوژن...

٥- سەربازە لاوەکانی کۆمار بەهانایەوە دێن و ڕزگاری دەکەن.

ئەم پیەسە کورتە، بەپشتیوانیی دەوڵەتی بەڕۆژئاواییبوو و بەمەبەستی دوور ڕاگرتنی ژنان لە سەرپۆش و گوشاری ئاینی، لە ناوەڕاستی ساڵەکانی ١٩٣٠ و لە میانەی شەڕی دووەمی جیهاندا چەندین جار لە قوتابخانەکان و مەڵبەندە میللییەکانی ئەنادۆڵدا نمایشکراوە. لە ١٩٥٠ بەدواوە و لەگەڵ پاشەکشەکردنی تەوژمی شۆڕشی کەمالیستی لە بەرامبەر بەهێزبوونی دیموکراسیدا، ئەم پیەسە لەبیر چووبووەوە. فوندا ئەسەر کە لەم پیەسەدا ڕۆڵی ژنەکەی دەگێڕا، دوای چەندین ساڵ لە ستۆدیۆیەکی تۆمارکردنی دەنگ لە ئەستەمبوڵ بینیمەوە، بۆی گێڕامەوە و گوتی کە دایکی شانازی بەوەوە دەکات کە لە ساڵی ١٩٤٨دا لە ئامادەیی کوتاهیا هەمان ڕۆڵی بینیوە، گوتیشی زۆر بەداخە کە بەهۆی ڕووداوەکانی قارسەوە، ئەم نەیتوانیوە چێژ لە هەمان شادمانیی ڕەوا وەربگرێ. سەرەڕای باری داڕزان و ماندوویی و چاوبەرەوژێری کە لە ئەنجامی تلیاک کێشاندا تووشی شانۆکاران دەبێ و هەموو شتێک لەبیر دەکەن، من زۆرم لە فوندا ئەسەر کرد کە بەسەرهاتەکانی ئەو شەوەم بۆ بگێڕێتەوە. لەبەرئەوەیش کە خەڵکانێکی زۆرم لە بینەرانی ڕووداوەکەی ئەو شەوە دواندووە، لێرەدا دەست بەگێڕانەوەی وردەکاریەکان دەکەم:

بینەرانی قارس کە هۆڵی شانۆکەیان پڕ کردبوو، لە پەردەی یەکەمدا پەشۆکابوون. ناوی (نیشتمان یان سەرپۆش) ئەوانی بۆ گەمەیەکی هەنوکەیی و سیاسی سازدابوو، بەڵام یەک دوو پیاوی بەساڵاچووی لێ دەربچێ کە ئەم پیەسە کورتەیان لەبیر مابوو، کەسی تر چاوەڕێی ژنی سەرپۆش بەسەری نەدەکرد. لە خەیاڵی ئەواندا سەرپۆش هێمای ئیسلامی سیاسی بوو. زۆرێک لە ئامادەبووان کەوتنە بەر کاریگەریی شێوازی ڕەوت و شانازی بەخۆکردنی ژنێکی پڕ لە ڕازی سەرپۆش بەسەر کە بەوپەڕی بڕوا بەخۆبوونەوە لەسەر شانۆ هەنگاوی دەنا. بگرە فەرمانبەرە -ڕادیکاڵەکان-یش کە سووکایەتییان بەپۆشاکی ئاینی دەکرد، ڕێزیان بۆ ئەو ژنە هەبوو. کاتێک قوتابییەکی وریای ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان پەی بە ژنە سەرپۆش بەسەرەکە برد، قاقایەکی هێندە بەهێزی لێ دا، بەجۆرێک تووڕەیی ئەوانەی ڕیزی پێشەوەی بۆ خۆی مسۆگەر کرد.

لەو کاتەدا کە ژنە سەرپۆش بەسەرەکە لە تابلۆی دووەمدا و لە هەڵمەتێکی ڕووناکبیری و ئازادیدا دەست بەکردنەوەی سەرپۆشەکەی دەکات، هەمووان هەست بەترس دەکەن! دەتوانین ئەمە وا ڕوون بکەینەوەوە کە تەنانەت لایسیستە بەرۆژئاواییبووەکانیش لە دەرئەنجامی بیرکردنەوەکانی خۆیان دەترسان. لە ڕاستیشدا ئەوان، لەبەرئەوەی لە ئیسلامییە سیاسییەکان دەترسان، لە مێژبوو بەوە ڕازی بووبوون هەموو شتێک وەکو ڕابردوو پاڵ پێوە بنرێ و بڕوا. ئەوان ئیدی وەکو ساڵەکانی سەرەتای کۆمار بیریان لەوە نەدەکردەوە دەوڵەت بەزۆر سەری ژنان ڕووت بکات، بەڵکو تەنیا دەیانویست (لای ئێمە وەکو ئێرانی لێ نەیات و ژنان لە ئەنجامی گوشار و لە ترسی ئیسلامییەکان سەرپۆش لەسەر نەکەن.) دواتر تورگوت بەگ بە(کا)ی گوتبوو: "ڕاستییەکەی هەموو ئەتاتورکچییەکانی ڕیزی پێشەوە، ئەتاتورکچی نین، بەڵکو بودەڵە و ترسنۆکن." هەمووان ترسی ئەوەیان لێ هاتبوو کە نیشاندانی سەر ڕووتکردنی ژنێکی سەرپۆش بەسەر لەسەر شانۆ، نەک تەنیا تیلەتەنگ و وشکباوەڕان، بگرە بێکار و بارهەڵگرەکانیش دێنێتە هەڵچوون. لەو ساتەدا مامۆستایەک لەوانەی لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوون، هەستاوەتە سەرپێ و لە کاتێکدا فوندا ئەسەر بەدەم جووڵەی شیرین و بەبڕوا بەخۆبوونەوە سەرپۆشەکەی



داکەندووە، ئەم چەپڵەی بۆ لێ داوە، بەڵام بەبۆچوونی برێک لە ئامادەبووان، ئەم چەپڵەلێدانە چالاکییەکی سیاسیی نوێخوازانە نەبووە، بەڵکو کابرا لەبەر خاتری قۆڵی ڕووت و خرپن و گەردنی جوانی ژنەکە و لە ژێر کاریگەریی مەی خواردنەوەدا ئەمەی لێ وەشاوەتەوە. لە ڕیزەکانی دواوە لاوێکی چنگپڕ بەتووڕەبوون و هەڵچوون وەڵامی ئەو مامۆستا بێکەس و هەژارەی داوەتەوە.

کۆماریخوازەکانی ڕیزی پێشەوەیش ئەم ڕەوشەیان بەدڵ نەبوو. ئەوان چاوەڕێ بوون دوای لابردنی سەرپۆشەکە، کچێکی لادێیی سادە، چاویلکە لەچاو و ڕووخسار ڕووناکی شەیدای خوێندن ببینن، وەلێ کە فوندا ئەسەری سەماکەریان بینیبوو، سەریان تەڤلیهەڤ بووبوو. گەلۆ ئەمە واتای ئەوەی دەگەیاند کە داخۆ تەنیا ژنانی لەشفرۆش و بەدڕەوشت سەر ڕووت دەکەن؟ ئەوە لەو سەردەمەدا پەیامی ئیسلامییە سیاسییەکان بوو. لە ڕیزەکانی پێشەوە دەنگی جێگری پارێزگار بیسترا کە دەیگوت: "ئەم کارە هەڵەیە، هەڵە." هەندێکی تریش کە لەوانەیە لە ڕووی سالووسییەوە بووبێ، دەنگی خۆیان خستە پاڵ دەنگی ئەو، بەڵام هیچ کاری لە فوندا ئەسەر نەکرد. لە کاتێکدا ئەوانەی ڕیزی پێشەوە بەڕێز و ئەندێشەوە سەیری کچە کۆماریخوازەکەیان دەکرد کە بەبۆچوونی ئەوان بەرچاوی ڕوون بووەتەوە و بەرگریی لە ئازادیی خۆی دەکرد، لە ناو قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانەوە دەنگی یەک دوو هەڕەشە کەوتە بەرگوێ. جێگری پارێزگار، قاسم بەگی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشی بەسام و ناسراو بەوەی کە لە سەردەمی خۆیدا ڕەگی پەکەکەی لە بن دەرهێناوە، کاربەدەستانی تری پایەبەرز، بەڕێوەبەری لقی تاپۆ لە پارێزگا، بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری کە ئەرکی ئەو تەنیا بریتی بوو لە کۆکردنەوەی کاسێتی مۆزیکی کوردی و ناردنی بۆ ئانکارا (ژنەکەی، دوو کچی، چوار کوڕی کراڤات لە ملی خۆی و سێ برازای نێرینەی هاتبوون) و چەند ئەفسەرێک کە جلوبەرگی مەدەنییان پۆشیبوو و لەگەڵ ژنەکانیاندا لە ڕیزەکانی پێشەوە دانیشتبوون، هیچ باکیان نەبوو لە هەرا و ئاژاوەگێڕیی چەند لاوێکی خۆنەناسی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە لە ڕاستیدا نیازی ئاژاوەنانەوەیان هەبوو. دەکرێ بگوترێ ئەوانە متمانەی تەواویان بەپۆلیسی سڤیلی دابەشبووی ناو هۆڵەکە، بەپۆلیسی فەرمیی ئەمبەر و ئەوبەری هۆڵەکە و بەسەربازەکانی پشت شانۆکە هەبوو. لە

هەمووی گرنگتر، پەخشی زیندووی ئاهەنگەکە لە تەلەفزیۆنەوە، سەرباری ئەوەی وەشانێکی هەرێمی بوو، بەڵام لای ئەوان هەستێکی وەهای دروست کردبوو کە سەرتاسەری تورکیا و ئانکارا سەیری ئەوان دەکەن. پایەدارانی تری دەوڵەتیش لە ڕیزەکانی پێشەوە وەکو ئاپۆڕەی ناو هۆڵەکە، لەگەڵ سەیرکردنی نمایشەکەدا، بەشێکی هۆشیان لای ئەوە بوو کە گەورە و بچووکی ڕووداوەکانی سەر شانۆ لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرێ، بۆیە شتە ئاساییەکانی سەر شانۆ، جنێوە سیاسییەکان و تورەهاتەکانی تر، زەریفتر و ئەفسوناویتر لەوەی کە هەبوون، دەیاننواند. هەندێک لەوانەی ڕیزەکانی پشتەوە بۆ ئەوەی بزانن کامێراکە کار دەکات یاخۆ نا، جاروبار دەستیان بەرز دەکردەوە و ڕایان دەوەشاند، وەلێ برێکی تریان لە ترسی ئەوەی "ئەمان، لە تەلەفزیۆندا دەبینرێین"، خۆیان خزاندبووە پەناوە و لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. سەرباری ئەوەی بەرنامەی ئاهەنگەکە ڕاستەوخۆ لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرا، کەچی قارسییەکان لەبری ئەوەی لە ماڵەوە دابنیشن و لە تەلەفزیۆندا سەیری نمایشەکانی سەر شانۆ بکەن، ئارەزوویان بوو خۆیان بگەیەننە هۆڵی شانۆی گەل و لەوێ ببینن کارمەندانی تەلەفزیۆن چۆن وێنەی ئاهەنگەکە دەگرن.

فوندا ئەسەر، سەرپۆشەکەی سەری کە پێش تاوێک دای کەندبوو، وەکو جلی چڵکن هاویشتە ناو تەشتێکی میسی سەر شانۆکە و وەکو ئەوەی ئاوی بەسەردا بکات، بەنزینی بەسەردا ڕژاند. لەبەرئەوەی بەنزینەکەی کردبووە شووشەی شلە سابوونی –ئاکیف–ەوە کە لەو سەردەمەدا هەموو ژنانی قارس بەکاریان دەهێنا، نەک بەتەنیا ئامادەبووانی ناو هۆڵەکە، بگرە هەموو دانیشتووانی قارس ئاهێکیان بەبەردا هاتەوە و وایانزانی کچە یاخیبووەکە بیری گۆڕیوە و دەیەوێ سەرپۆشەکەی بشوات و لە لەکە پاکی بکاتەوە.

یەکێک لە دواوە هاواری کرد: "بیشۆ کچم، باش پاکی بکەرەوە." دەنگی قاقا بەرز بووەوە. بەتەنیا فەرمانبەرەکانی ڕیزی پێشەوە پێ نەکەنین، وەلێ ئەمە تێڕوانینی سەرجەم بینەرانی ناو هۆڵەکە بوو. یەکێکی دی هاواری کرد: "ئەدی کوا ئۆمۆکەی؟" ئەمانە، دەستەیەک لە قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان بوون



و فوندا ئەسەر لێیان زویر نەبوو، چونکە هاوکات لەگەڵ تێکدانی ئارامیی هۆڵەکەدا، ئامادەبووانیشیان دەهێنایە پێکەنین. فەرمانبەرانی دەوڵەت لە ڕیزەکانی پێشەوە و زۆربەی ئامادەبووانی ناو هۆڵەکە خۆزگەیان دەخواست ئەم پیەسە سیاسییە ناهاوچەرخ و ژاکۆبەنە (ژاکۆبەن: ڕادیکاڵترین ئەندامانی یانە سیاسییەکانی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا)، بێ ڕوودانی هیچ ئابڕووچوونێک و بەزووترین کات کۆتاییی پێ بێت. کەسانێکی زۆر کە ساڵانێک دواتر دواندمن، پێیان گوتم ئەوانیش هەمان هەستیان هەبووە: هەر لە فەرمانبەرانەوە تا بەقوتابیانی هەژاری کورد دەگات، زۆربەی قارسییەکانی ناو هۆڵی شانۆی گەل تامەزرۆ بوون ئەو شەوە شتێکی نوێ تاقی بکەنەوە و کەمێک بای باڵیان بدەن. پێ دەچوو برێک لە قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان نیازی تێکدانی ئاهەنگەکەیان هەبووبێ، بەڵام تا ئەو ساتەیش کەس مەترسیی شتێکی وەهای لێ نەکردبوون.

فوندا ئەسەریش وەکو ژنانی ناو ڕێکلامەکان کە جلشۆرینیان گۆڕیوە بۆ کەیف و سەفا، دیمەنەکەی زۆر درێژ کردەوە. سەرپۆشە ڕەشە تەڕەکەی لە تەشتەکە دەرهێنا و وەکو ئەوەی بەپەتی تەنافدا هەڵبواسێ، نیشانی بینەرانی دا و وەکو ئاڵا لەبەر یەکی کردەوە. بەبەرچاوی بینەرانەوە کە هەموویان بەپەرۆش بوون بزانن چ دەقەومێ، چەرخێکی لە گیرفانی دەرهێنا و لە لای خوارەوە ئاگری تێ بەردا. ماوەیەک بێ دەنگی هاتە ئاراوە. دەنگی کڵپەی ئاگرەکە کە هەموو سەرپۆشەکەی دایەبەر، لە ناو هۆڵەکەدا بیسترا. سەرتاسەری هۆڵەکە بەتیشکێکی سەیر و سەرسوڕهێنەر ڕووناک بووەوە. زۆر کەس بەواق وڕمانەوە هەستانە سەرپێ.

هیچ کەسێک چاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد. تەنانەت لایسیستەکانیش کە ئامادەی بچووکترین سازش نەبوون، ترسیان لێ نیشت. کاتێک ژنەکە سەرپۆشە گڕ تێبەربووەکەی هاویشتە سەر زەوییەکە، ئامادەبووان ترسان ڕایەخی تەمەن سەد و دە ساڵەی سەر شانۆکە و پەردە قەدیفە پیناوی و چڵکگرتووەکەی پاشماوەی دەوڵەمەندترین سەردەمەکانی قارس گڕ بگرن. زۆربەی بینەران پەیان بەدەرپەڕینی تیرلە کەوان بردبوو و ئەبڵەق بووبوون. ئیدی پێشبینیی قەومانی هەموو شتێک دەکرا.

لە ناو قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانەوە دەنگی غەڵبەغەڵب و تەقوتۆق هاتە گوێ. دەنگی هۆیها و هاوار و قیڕەی تووڕەبوون بیسترا. یەکێک هاواری لێ هەستا و گوتی: "خودانەناسانی دوژمن بەئاین، ئەتایستانی بێباوەڕ!" ئەوانەی ڕیزی پێشەوە هێشتا سەرسوڕمان بەری نەدابوون. دیسانەوە مامۆستا بێکەس و بوێرەکە هەستایە سەرپێ و گوتی: "بێدەنگ بن، تەماشا بکەن!"، بەڵام کێ گوێی دەگرت! کاتێک ڕوون بووەوە کە هۆیهاکێشان و نەڕە و هاوار و دروشم گوتنەوە ڕاناوەستێ، بایەکی شڵەژان لە ترسی گەورەبوونەوەی ڕووداوەکان هەڵی کرد. دکتۆر نەوزادی بەڕێوەبەری تەندروستیی پارێزگا، کوڕە چاکەت لەبەر و کراڤات لە ملەکانی، کچە قژ هۆنراوەکەی و ژنەکەی کە ڕۆبێکی کرێمی ڕەنگ تاوسی لەبەر کردبوو و ڕێکپۆشترین ژنی ناو هۆڵەکە بوو، هەستانە سەرپێ و ڕوویان لە دەرگای دەرەوە کرد. سادق بەگ کە یەکێک بوو لە دەوڵەمەندەکانی پێشووی قارس و لە ئانکاراوە بۆ بەسەرکردنەوەی کاروبارەکانی هاتبوو، خۆی و پارێزەر سابیت بەگی ئەندامی پارتی گەل کە هەر لە سەردەمی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییەوە هاوڕێی یەکتربوون، پێکەوە ڕابوونە سەر لنگان. (کا) بینی ترسێک باڵی بەسەر ڕیزەکانی پێشەوەدا کێشاوە، لەو جێیەی لێی دانیشتبوو، بێ بڕیار مایەوە: لەبەرئەوەی ترسی ئەوەی هەبوو نەبادا لە ئەنجامی هەرا و هوریا و ئاژاوەی چاوەڕوانکراوەوە شیعرەکەی لەبیر بچێ کە هێشتا لە دەفتەرە سەوزەکەیدا تۆماری نەکردبوو، بیری لە ڕۆیشتن کردەوە، ویستی هۆڵەکە جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ لای ئیپەک. هەر لەو کاتەدا ڕەجایی بەگی بەڕێوەبەری دەزگای تەلەفۆن کە بەهۆی زانابوون و ویقاریەوە هەموو قارسییەکان ڕێزیان لێ دەگرت، بەناو دووکەڵەکەدا خۆی لە شانۆکە نزیک کردەوە و گوتی: "کچم، پیەسە ئەتاتورکچییەکەتانمان بەگەند کرد. وەلێ دەسا فریا بکەوە. بنواڕن، هەمووان ئارامیان لەبەر بڕاوە، خەڵکەکە وا هەڵدەچن." ئاگری سەرپۆشی فڕێدراوی سەر زەوییەکە کوژابووەوە و فوندا ئەسەر لە ناو تەپ و دووکەڵدا دەستی کردبوو بەخوێندنەوەی ئەو مەنەلۆژەی کە نووسەری –نیشتمان یان سەرپۆش– لە هەموو مەنەلۆژەکانی تر زیاتر شانازیی پێوە دەکرد. خۆیشم دەقی تەواوی پیەسەکەم لە ناو بڵاوکراوەکانی دەزگای پەخشی –خانەی گەل–دا دۆزییەوە



کە لە ساڵی ١٩٣٦دا چاپ کراوە. نووسەری تەمەن نەوەد و دوو ساڵی –نیشتمان یان سەرپۆش– کە دوای چوار ساڵ تێپەڕبوون بەسەر ڕووداوەکاندا لە ئەستەمبوڵ بینیم و هێشتا لەسەرخۆ بوو، لەلایەک بەدەست بەڵا و بێکەڵکیی نەوەکانیەوە (لە ڕاستیدا کوڕانی نەوەکانی بوون) دەیناڵاند، لەلایەکی دی، بەداخەوە بۆی گێڕامەوە ئەم پیەسەی بەپێچەوانەی بەرهەمەکانی تریەوە (ئەتاتورک دێ، پیەسەکانی ئەتاتورک بۆ ئامادەییەکان، بیرەوەرییەکانی ئەتاتورک و... هتد)، لەم سەردەمەدا لە بیر کراوە. ئەمە لە کاتێکدا کچانی ئامادەیییەکان و فەرمانبەران لە ساڵانی ١٩٣٠دا هەڵدەستانە سەرپێ و بە چەپڵەڕێزان و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە پێشوازییان لێ دەکرد. (هیچی لەبارەی نمایش و ڕووداوەکانی قارسەوە نەبیستبوو.)

ئیدی جگە لە هۆیهاکێشان و هەڕەشە و هاواری تووڕەی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان دەنگی هیچی تر نەدەبیسترا. سەرەڕای بێدەنگیی پڕ لە ترس و تاوانی ڕیزەکانی پێشەوە، کەسانێکی کەم توانیان گوێیان لە وشەکانی فوندا ئەسەر بێت. بۆچی کچە تووڕەکە سەرپۆشەکەی فڕێ دا و بۆچی دەیگوت نەک بەتەنیا مرۆڤ، جەوهەری میللەتانیش لە جلوبەرگیاندا نییە، بەڵکو لە ڕۆحیاندایە، دەبا ئێستا، خۆمان لە هۆکاری تاریککردنی ڕۆحمان و هێمای دواکەوتوویی، لە چارشێو، سەرپۆش، فێس، و شاڵ و پەچە ڕزگار بکەین و خۆمان بگەینە ئاستی میللەتانی خاوەن شارستانی و هاوچەرخ لە ئەورووپا، ڕەنگە ئەم ڕستانە نەگەیشتبنە گوێی زۆربەی بینەرانی ناو هۆڵەکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕیزەکانی دواوە دەنگی وەڵامێکی تووڕەی گونجاو لەگەڵ ڕەوشەکەدا کەوتە بەر گوێ.

"تۆش بەڕووتی بڕۆ بۆ ئەورووپاکەت، بە ڕووت و قووتی بڕۆ!"

تەنانەت لە ڕیزەکانی پێشەوەی هۆڵەکەش دەنگی قاقا و چەپڵەی پشتگیری بیسترا. ئەمەیش، خەیاڵی دانیشتووانی تری ڕیزەکانی پێشەوەی شکاند و ترسیان لێ نیشت. لە هەر سەرێکەوە دەنگێکی جیاواز دەردەچوو، ڕیزەکانی پشتەوە بە هەڵچوونەوە دەیاننەڕاند؛ هەندێکیان لە ڕۆیشتنیاندا بەرەو دەرگاکان، ئاوڕیان بۆ دواوە دەدایەوە؛ فوندا ئەسەریش کە چەند کەسێکی کەم گوێیان لە دەنگی بوو، هێشتا لەسەر خوێندنەوەی شیعرەکەی بەردەوام بوو.

## ١٨

# تەقە مەکەن، تفەنگەکان لەسەر پێن!

## شۆڕشی سەر شانۆ

لەوە بەدواوە ڕەوتی ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی چوونە پێش. لەپڕ لەسەر شانۆ دوو ڕیش پانی کڵاو لەسەر پەیدابوون، هەریەکەیان پەتێک و خەنجەرێکی بەدەستەوە بوو. بە سەرتاپای هەڵسوکەوتیاندا دیار بوو کە دەیانویست فوندا ئەسەر سزا بدەن، چونکە بە داکەندنی سەرپۆشەکەی و ڕووتکردنی سەری بەڕووی فەرموودەکانی خودادا وەستابووەوە.

کاتێک فوندا ئەسەر کەوتە بەردەستیان، بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات، بە ئەنجامدانی جووڵەی هەوەس بزوێن کەوتە پەلەپرۆزێ. لە ڕاستیدا وەکو قارەمانێکی ڕێ ڕۆشنکەرەوە نا، بەڵکو هەڵسوکەوتی زیاتر لە "ژنێک کە دەستدرێژیی کراوەتە سەر" دەچوو کە بە زۆری لە شانۆی گەڕۆکی ناوچە پەڕ و دوورەدەستەکاندا نمایش دەکرا. فوندا ئەسەر وەکو قۆچی قوربانی ملی لارکردبووە و بە چاوی پاڕانەوەوە ڕووی بانگەوازی لە لایەنی هەوەس بزوێنی بینەرانی پیاو کردبوو، بەڵام خرۆشانێک کە چاوەڕوانیی دەکرد، لە پیاواندا بەدیی نەکرد. یەکێک لە توندڕەوە ڕیش پانەکان (هەر باوکەکەی کەمێک لەمەوبەر بوو و ماکیاژێکی نەزانانەی کردبوو)، بە قژ ڕاکێشانەوە لەسەر زەوی تەختی کرد. ئەوی تریشیان، بە پۆزێکی لەجۆری ئەوەی لە تابلۆکانی سەردەمی ڕێنیسانسدا دەبینرێ و چۆنێتیی بە قوربانیکردنی کوڕەکەی حەزرەتی ئیبراهیم نیشان دەدات، خەنجەری خستە سەر گەردنی فوندا ئەسەر. لە سەرجەم ئەم تابلۆیەدا برێکی زۆر لە پێشبینیی پڕ لە مەترسیی "یاخیبوونی پاشڤەڕۆیان و توندڕەوان" هەبوو کە لە ساڵانی سەرەتای دامەزراندنی کۆماردا لە ناو ڕۆشنبیرانی بەڕۆژئاواییبوو و فەرمانبەراندا باو بوو. سەرەتا، فەرمانبەرانی بەتەمەنی ڕیزەکانی پێشەوە و کۆنەپارێزانی ڕیزەکانی دواوە ترسیان لێ نیشت.



ئەو پۆزەی کە فوندا ئەسەر و "دوو شەریعەتخوازەکە" دەقیان پێوە گرتبوو، بێ بزاوتن لە شوێنی خۆیان، هەژدە چرکەی تەواوی خایاند. زۆرێک لەو قارسییانەی کە دواتر دواندمن، پێیان گوتم لەبەرئەوەی ئاپۆڕەی بینەرانی ناو هۆڵەکە لەوەدا دەبن لەو ساتەدا لە پێستی خۆیان بێنە دەرێ، ئەو سیانە ماوەیەکی زۆر درێژخایەنتر لە جێی خۆیان وشک بوون. ئەوەی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی تووڕە و هار کردبوو، ناحەزی و بەدی و شێوەی کاریکاتۆرییانەی "دوو شەریعەتخوازە توندڕەوەکان"ی سەر شانۆ یاخۆ نمایشکردنی ئەو ژنە نەبوو کە لەبری کچانی سەرپۆش بەسەر، سەری خۆی ڕووت کردبوو. هەموویان هەستیان کردبوو کە مەبەستی گێچەڵگێڕان لە پشت نیشاندانی بێباکانە و بوێرانەی ئەو پیەسەوە هەیە. بۆیە هاواریان دەکرد و دەیانقیڕاند و هەندێک شتیان دەگرتە سەر شانۆ -نیوە پرتەقاڵێک، سەرینێک- و بە دەربڕینی تووڕەییی خۆیاندا زیاتر بۆیان ئاشکرا بوو کە کەوتوونەتە داوەوە و هەر لەبەرئەوەیش تا دەهات لە بێچارەییدا ڕق ئەستوورتر دەبوون. عەبدول ڕەحمان ئوێزی بالاکورت و خاوەن بەرزترین ئاستی ئەزموونی سیاسی لە نێو هەموویاندا و قوتابیی قۆناغی کۆتاییی (باوکی کە سێ ڕۆژ دوای ڕووداوەکان لە سیواسەوە بۆ وەرگرتنەوەی تەرمەکەی هات، ناوێکی تری لەبری ناوی ڕاستەقینەی خۆی دابوو)، هەوڵی دا خۆی بگەیەنێتە هاوڕێکانی و ئارامیان بکاتەوە و دایانبنیشێنێ، بەڵام لە هەوڵەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو. دەنگی هۆیهاکێشان و چەپڵەکوتان کە لە گۆشەکانی تری هۆڵەکەوە دەهات، قوتابیانی هێندەی دی هەراسان کرد. لە هەمووی گرنگتر: لاوانی ئیسلامیی قارس کە بە بەراورد لەگەڵ هاوبیرانی خۆیاندا لە پارێزگاکانی دەوروبەر، هێشتا "بێ کاریگەری" بوون، توانییان لەو شەوەدا پێکڕا و بوێرانە دەنگی خۆیان بگەیەنن و بە سەرسوڕمان و بەختەوەرییەوە ببینن کە چۆن ترسیان خستووەتە دڵی پایەدارانی دەوڵەت و پیاوانی سوپای دانیشتووی ڕیزەکانی پێشەوەی هۆڵی شانۆوە. لە کاتێکدا تەلەفزیۆن ورد و درشتی ڕووداوەکانی بۆ هەموو شوێنەکانی شار دەگوێزایەوە، بینەرانی تووڕە و ڕق هەستاو نەیانویست ئەم هەلە لە دەست خۆیان بدەن و ئامادە نەبوون دەست هەڵگرن تا ئەم خۆنمایشکردنەی دەوڵەت تێک نەدەن. ئیدی بەوجۆرە

ئەوەیش لە بیر کرا کە ئەم هەرا خێرا پەرەسەندووە، ویستی بەزم گێڕانیشی لە پشتەوە بووە. لەبەرئەوەی چەندین جار سەیری کاسێتی ڤیدیۆکەم کردبوو، دەمبینی هەندێک لە قوتابیان بەدەم وتنەوەی دروشم و جنێودانەوە، پێ دەکەنین. ئەو چەپڵە و هەرا و هوریایەشی کە دەبووە هۆی هاندانی زیاتری قوتابیان، لە هەندێک هاوڵاتیی ئاساییەوە دەهات کە دەیانویست لە کۆتاییی شەوێکی "شانۆ"ی تێکەڵ و پێکەڵدا، بۆ خۆیان کەمێک بەزم بگێڕن و بێزاریی خۆیان نیشان بدەن. گوێم لە هەندێک خەڵک بوو کە دەیانگوت: "ئەگەر ئەوانەی ڕیزی پێشەوە ئەم هەرا وشکەیان هێندە بەهەند نەگرتبا و دانیان بە خۆیاندا گرتبا، ئەوا ڕووداوەکانی تر هەرگیز نەدەقەومان." هەندێکی دی دەیانگوت: "شڵەژانی فەرمانبەرانی پایەبەرزی دانیشتوو لە ڕیزەکانی پێشەوە لە ماوەی ئەو هەژدە چرکەیەدا و هەستانیان لە جێی خۆیان و هەروەها ڕابوونی هەندێک لە دەوڵەمەندەکان و کۆکردنەوەی ئەندامی خێزانەکانیان، دەیسەلمێنێ کە ڕووداوەکان پێشتر لە ئانکارا نەخشەی بۆ کێشراوە."

(کا)، چونکە ترسی ئەوەی هەبوو لەو هەرا و هۆسەیەدا شیعرەکە لەبیر بکات، لەو ساتەدا لە هۆڵەکە چووە دەرەوە. لە هەمان کاتدا ئەو فریادڕەسە هاتە سەر شانۆ کە فوندا ئەسەری لە دەستی هێرشکارانی ڕیش پان و "پاشڤەڕۆ" ڕزگار دەکرد: ئەویش سونای زایم بوو؛ سدارەیەکی نابووە سەر لەوانەی کە ئەتاتورک و قارەمانەکانی شەڕی ڕزگاری لە سەریان دەکرد و جلێکی سەربازیی پاشماوەی ساڵەکانی ۱۹۳۰ی پۆشیبوو. هەر کە بەدەم هاویشتنی هەنگاوی پتەوەوە گەیشتە سەر شانۆ (بێ ئەوەی بهێڵێ کەمێکیش شەلینی پێوە دیار بێ)،

دوو توندڕەوە ڕیش پان و پاشڤەڕۆکان لە ترساندا خۆیان دا بە زەویدا. هەمان مامۆستای تەنیا و بەساڵاچوو هەستایە سەرپێ و کەوتە چەپڵەلێدان بۆ سونای زایم. چەند کەسێکی تریش هاواریان لێ بەرز بووەوە: "بژی، هەر بژی!" کە ڕووناکییەکی بەهێز خرایە سەری، بەلای هەموو قارسییەکانەوە وێ دەچوو سونای زایم بلیمەتێک بێت و لە جیهانێکی ترەوە هاتبێ.

هەموو پەیان بە شۆخی و ڕۆشنبیرییەکەی بردبوو. هاتوچۆی سەختی ئەنادۆڵ کە هەمیشە ئازاری بە لاقی چەپی دەگەیاند، نەیتوانیبوو زەفەر بە ڕەفتارە سەخت و



بوێر و تراژیدییەکانی و تەنانەت جوانییە نیمچە ژنانییەکەیشی ببات کە لە ساڵانی ۱۹۷۰دا لە میانەی بینینی ڕۆڵی هەر یەکە لە گیڤارا و ڕۆبێسپیر و ئەنوەر پاشای شۆڕشگێڕەوە سەرنجی خوێندکارانی چەپی بۆ سەر خۆی ڕاکێشابوو. دەستەوانەیەکی لە دەست کردبوو، بە جووڵەیەکی نازک پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی لە بری لێوی، بۆ ژێر چەناگەی بەرز کردەوە و گوتی: "بێدەنگ بن."

لە ڕاستیدا پێویستی بەمەش نەدەکرد، چونکە ئەو ڕستەیە هەم لە تێکستەکەدا نەبوو و هەم دانیشتووانی ناو هۆڵەکەش خۆبەخۆی خۆیان قوڕ و قوپیان لێ کردبوو. ئەوانەی لە ڕیزەکانی پێشەوە هەستابوونە سەرپێ، دەسبەجێ دانیشتنەوە و گوێیان لە دیالۆگێکی تر بوو:

"لە ناو ئازاردا!"

پێ دەچوو ئەم دیالۆگە بە نیوەناچڵی گوترابێ، چونکە کەس حاڵی نەبوو کێ لە ئازاردایە. لە سەردەمانی کۆندا ئەم دەستەواژەیە گەل و میللەتی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ؛ کەچی ئێستا قارسییەکان تێ نەگەیشتن کە داخۆ هەموو ئەو شتانەی کە بەدرێژاییی شەو سەیریان کردبوو، خودی خۆیان، فوندا ئەسەر یاخۆ کۆمار لە ئازاردایە؟ سەرباری ئەوەیش، ئەو هەستەی کە ئەم دەستەواژەیە ئاماژەی پێ دابوو، ڕاست دەرچوو. سونای زایم گوتی: "ئەی میللەتی تورکی سەربەرز و خۆشەویست کەس ناتوانێ ئەو کاروانە گەورە و ڕەسەنەت بگێڕێتە دواوە کە خستووتەتە سەر ڕێی ڕۆشنگەری. خەمت نەبێ. کەسانی پاشڤەڕۆ، مێشک پۆخڵ و جاڵجاڵۆکەیی هەرگیز ناتوانن لەمپەر بخەنە بەردەم ڕەوڕەوەی مێژووت. ئەو دەستانەی بۆ کۆمار، ئازادی و ڕۆشنگەری درێژ دەکرێن، لە بندا دەبڕدرێنەوە."

بەتەنیا وەڵامێکی گاڵتەجاڕییانەی هاوڕێیەکی بوێر و پڕ لە جۆشی نەجیب بیسترا کە دوو کورسی دوورتر لەو لای ئەوەوە دانیشتبوو. وەکو تر، بێدەنگییەکی قوڵی تێکەڵ بە سەرسوڕمان و ترس باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشابوو. هەمووان بێ جووڵە، وەکو پەیکەری لە مێو دروستکراو دانیشتبوون، چاوەڕێ بوون فریادڕەسەکە واتایەک بە ئاهەنگەکە ببەخشێ و یەک دوو وشەی ڕەق و شیرین بڵێ و یەک دوو بەسەرهاتی داستان ئاسایان بۆ بگێڕێتەوە کە ئەمان بتوانن ئێواران لە ماڵەوە قسەی لەسەر

بکەن، کەچی ئەو لەپڕ بێدەنگ بوو. لە هەمان کاتدا لەمبەر و ئەوبەری پەردەکەوە دوو سەرباز پەیدا بوون. سیانی تر لە دەرگای پشتەوە هاتنە ژوورەوە و بە نێوان ڕیزی کورسییەکاندا خۆیان گەیاندە دوانەکەی دی لەسەر شانۆ. ڕۆیشتنی ئەکتەرەکان، وەکو لە شانۆی هاوچەرخدا باوە، لە سەرەتاوە قارسییەکانی ترساند، بەڵام کەمێک دواتر خۆشحاڵی کردن. هەر لەو ساتەدا، بینەران ئەو منداڵە پەیامنێرە چاویلکە لە چاوەیان ناسییەوە کە ڕای کردە سەر شانۆ و ئەمان پێی پێ کەنین. ئەمە برازا چاوکراوە و خۆشەویستەکەی خاوەنی دوکانی ڕۆژنامەفرۆشیی بەرانبەر هۆڵی شانۆی گەل بوو کە بەهۆی ڕاوەستانی ڕۆژانەیەوە لە بەردەم دوکاندا، بەلای هەموو قارسییەکانەوە ئاشنا بوو. لە سونای زایم نزیک کەوتەوە، ئەو خۆی چەماندەوە و ئەمیش شتێکی بە گوێیدا چرپاند. هەموو قارسییەکان بینییان کە چۆن سونای زایم بە بیستنی شتەکان خەم دای گرت.

سونای زایم گوتی: "ئاگادار کراینەوە کە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە لە نەخۆشخانە گیانی لە دەست داوە. ئەم تاوانە، دوا هێرش دەبێت لەدژی کۆمار و لایسیسزم و داهاتووی تورکیا!"

هێشتا بینەرانی ناو هۆڵەکە ئەم هەواڵە خراپەیان هەرس نەکردبوو کە سەربازەکانی سەر شانۆ چەکەکانیان لە شانیان داگرت، میلیان ڕاکێشا و نیشانیان لە بینەران گرتەوە. هەر یەکەیان فیشەکێکی تەقاند و بە هەموویانەوە ناڵەیەکی گەورەیان خوڵقاند. دەکرا بگوترێ کە ئەمە ترساندنێکی شیرین بوو، ناردنی هێمایەکیش بوو لە جیهانی خەیاڵیی شانۆکەوە بۆ هەواڵە تاڵەکەی ناو ژیان. قارسییەکان کە لە بواری شانۆدا خاوەن ئەزموونێکی هەژار بوون، پێیان وابوو ئەمە نوێخوازییەکی شانۆیە و لە ڕۆژئاواوە وەرگیراوە.

دیسانەوە لە ناو ڕیزەکانەوە هەست بە جووڵەیەکی بەهێز و هەژانێک کرا. ئەوانەی لە دەنگی تەقەکان ترسابوون، ئەم ترسانەیان بەوە لێک دایەوە کە ئەوانی تریش ترساون. وا هاتە پێش چاو وەکو ئەوەی کە یەک دوو کەس لە شوێنی خۆیان هەستابنە سەر پێ، "پاشڤەڕۆ ڕیش پانەکان"ی سەر شانۆ زیاتر خۆیان بە زەوییەکەوە نووساند.



سونای زایم گوتی: "کەس جووڵە نەکات!"

سەربازەکان جارێکی تر میلی چەکیان ڕاکێشا و نیشانیان لە ئاپۆڕەی ناو هۆڵەکە گرتەوە. قوتابییە باڵاکورت و چاو نەترسەکەی کە لەولای نەجیبەوە دانیشتبوو، ڕێک لەو ساتەدا هەستایە سەرپێ و دەستی بە گوتنەوەی دروشم کرد: "بمرن خودانەناس و لایسیستان، بمرن فاشیستانی بێباوەڕ!" سەربازەکان جارێکی تر دەستیان بە پەلەپیتکەی تفەنگدا نا و زرمەیان لێ هەستاند. لەگەڵ ناڵەی تەقینەوەکاندا، لە هۆڵەکەدا هەست بە شەپۆلێکی تری ترس و شڵەژان کرا.

دانیشتووان لە ڕیزەکانی دواوە بە چاوی خۆیان بینییان ئەو لاوەی کە پێش کەمێک دروشمی دەگوتەوە، بەسەر کورسییەکەیدا کەوت، بەهەمان خێرایی هەستایەوە سەرپێ و بە شێوەیەکی لاسەنگ دەست و قۆڵی ڕادەوەشاند. چەند کەسێک کە بەدرێژاییی ئەو شەوە بە موزیرِی و سەیر و سەمەرەکانی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان پێ کەنیبوون، هەم بەم دیمەنە و هەم دواتریش بە لاربوونەوەی مردوو ئاسای قوتابییەکە پێ کەنین کە بەدەم جووڵەی سەیرەوە بەناو ڕیزی کورسییەکاندا ڕێی دەکرد.

لە چەند شوێنێکی هۆڵەکەدا ئامادەبووان دوای دەستڕێژی سێیەم ئەوسا پەیان پێ برد کە بەڕاستی تەقەیان لێ دەکرێ، چونکە بە پێچەوانەی تەقەی وشکەوە، مرۆڤ نەک هەر بە گوێ، بەڵکو وەکو لە شەوانی ڕاونانی تیرۆریستان بە کوچەکاندا، بە گەدەیش گوێی لێ دەبوو. سۆپا قەبە و پەڕپووتەکەی دەستکردی ئەڵمان کە ماوەی چل و چوار ساڵ بوو هۆڵەکەی گەرم دەکردەوە، دەنگێکی سەیری لێوە دەهات. بەهۆی ئەوەی لوولە تەنەکەییەکانی کونیان تێ کەوتبوو، بە وێنەی هەڵمی لوولەی کترییەکی هەڵچووی سەر ئاگر، دووکەڵیان لێ دەهاتە دەرێ. بینەران کەسێکیان بەدی کرد کە بە سەری خەڵتانی خوێنەوە لە ڕیزەکانی ناوەڕاستەوە بەرەو شانۆکە ملی نا، هەر لەو کاتەیشدا بۆنی بارووت چوو بە کەپوویاندا. هەست بە سەرەتای شڵەژانێک کرا، بەڵام زۆربەی بینەرانی ناو هۆڵەکە هێشتا وەکو بت لە جێی خۆیان دانیشتبوون. هەستێکی لەو جۆرەی کە مرۆڤ لە کاتی بینینی خەونی خراپدا پەی پێ دەبات، باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشابوو. هەر لەو ساتەدا نووریە خانمی

مامۆستای ئەدەبیات کە خووی بەوەوە گرتبوو لە هەموو چوونێکیدا بۆ ئانکارا، سەیری هەموو نمایشەکانی شانۆی دەوڵەت بکات، لەبەرئەوەی شەیدای ڕاستیی ئەفێکتەکانی نمایشەکە بوو، لە جێی خۆی لە ڕیزەکانی پێشەوە هەستایە سەرپێ و کەوتە چەپڵەلێدان بۆ ئەوانەی سەر شانۆ. نەجیبیش ڕێک لەو کاتەدا وەکو قوتابییەکی شڵەژاو کە داوای مافی ئاخاوتن بکات، هەستابووە سەرپێ.

یەکسەر بەدوای ئەوەدا سەربازەکان دەستڕێژی چوارەمیان کرد. بەپێی ڕاپۆرتی تێروتەسەل و فرە بە نهێنی ئامادەکراو لە لایەن ئەفسەرێکی پشکێنەرەوە کە دواتر لە ئانکاراوە نێردراو، لە دەستڕێژی چوارەمدا دوو کەس کوژرابوون. یەکێکیان نەجیب بوو کە فیشەک بەر چاو و ناوچەوانی کەوتبوو. چونکە زۆر قسەڵۆکی ترم لەو بارەیەوە بیستووە، ناتوانم بڵێم کە نەجیب دەسبەجێ لەو کاتەدا گیانی سپاردووە. ئەگەر خاڵێک هەبێ کە دانیشتوانی ڕیزەکانی ناوەڕاست و پێشەوە لەسەری کۆک بن، ئەوەیە کە نەجیب دوای دەستڕێژی سێیەم هەستی بە هەبوونی فیشەک لە هەوادا کردووە و ئەمەش بە شێوەی جیاواز لێک دەدرایەوە. نەجیب دوو چرکە بەر لەوەی بەر بکەوێ، هەستاوەتە سەرپێ و بە دەنگێک کە زۆربەیان گوێیان لێ بووە (بەڵام لە کاسێتی ڤیدیۆکەدا تۆمار نەکراوە)، هاواری کردووە:

"ڕاوەستن، تەقە مەکەن، تفەنگەکان لەسەر پێن!"

بەوجۆرە نەجیب شتێکی درکاند کە بینەرانی ناو هۆڵەکە بە دڵ هەستیان پێ کردبوو، بەڵام بە عەقڵ نەیاندەویست پەسەندی بکەن. یەکێک لەو پێنج فیشەکەی کە لە دەستڕێژی یەکەمدا تەقێنرابوون، بەر گەڵاکانی نیگاری سەر ئەو لۆژە کەوتبوو کە دواین کونسوڵی سۆڤیەت، بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر خۆی و سەگەکەی لێی دادەنیشتن و سەیری فیلمیان دەکرد، چونکە سەربازە کوردەکەی خەڵکی شاری سیرت نەیویستبوو کەس بکوژێ. فیشەکێکی تر، بەهەمان مەبەست بەڵام نەزانانەتر نرابوو بە بنمیچی هۆڵەکەوە و گەچ و بۆیەی سەد و بیست ساڵ لەمەوبەری وەکو بەفر بەسەر بینەرانی شڵەژاودا باراندبوو. فیشەکێکی تر تەختەی خۆ پێوەگرتنی ژێر بەرزاییی دیاریکراو بۆ کامێرای وەشانی زیندووی کون کردبوو. سەردەمانێک کچانی نەدار و سەوداسەری ئەرمەنی بلێتی هەرزانیان دەکڕی و بە پێوە لەسەر ئەو تەختەیە سەیری نمایشەکانی گرووپی شانۆ و ئاکرۆباتگەلی لە مۆسکۆوە هاتوویان دەکرد. فیشەکی چوارەم پشتی کورسییەکی ئەولاوەی کامێراکەی کونکردبوو و کەوتبووە کۆشکی محێدین بەگی فرۆشیاری پارچەی تراکتۆر و کەرەسەی کشتوکاڵی کە لەگەڵ ژنەکەی و ژن خوشکە بێوەژنەکەیدا لە ڕیزەکانی پشتەوە دانیشتبوون. سەرەتا وای زانیبوو لەگەڵ کەوتنە خوارەوەی پارچە گەچ و بۆیەی بنمیچەکەدا شتێک کەوتووەتە کۆشییەوە، بۆیە هەستابووە سەرپێ. فیشەکی پێنجەم، جامی چەپی چاویلکەی باپیرێک کە کەمێک لە دوای قوتابیانەوە دانیشتبوو، بڕیبوو و چووبووە سەریەوە و کوناودیوی کردبوو. باپیرەکە لە ترابزۆنەوە هاتبوو بۆ دیدەنیی کوڕەزاکەی کە ماوەی سەربازیی لە قارس بەسەر دەبرد. کابرای بەساڵاچوو، بەهۆی ئەوەی خەوی لێ کەوتبوو، هەستی بە مردنی خۆی نەکردبوو و بەبێدەنگی گیانی سپاردبوو. فیشەکەکە لە پشت ملیەوە سەری کردبوو و لە هێلکەیەکی کوڵاوی ناو توورەکەی منداڵێکی کوردی دوازە ساڵ چەقیبوو کە لەواش و هێلکەی دەفرۆشت و لەو کاتەدا لە ڕیزی پشت کابرای بەساڵاچووەوە پاشماوەی پارەی وردەی کڕیارێکی دەگەڕاندەوە.

ئەم وردەکارییانە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە نانووسم کە بۆچی ئاپۆڕەکەی ناو هۆڵی شانۆی گەل سەرەڕای تەقەکردن بەسەریاندا، جووڵەیان لە خۆیان بڕیبوو. ئەو قوتابییەیش کە لە دەستڕێژی دووەمی سەربازەکاندا قەبرغە و مل و کەمێک لە سەرووی دڵیەوە بەرکەوتبوو، بەهۆی ئەوەی پێشتر بوێریی زیادی نیشان دابوو، وەکو بەشێکی سەفابەخشی نمایشە ترسناکەکە هاتبووە بەرچاو. یەکێک لە دوو فیشەکەکەی تر، سنگی قوتابییەکی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی پێکابوو (کچەکەی پووری، یەکەم -کچی خۆکوژ-ی شار بوو). فیشەکێکی دی، میلی سەعاتی سەر دیوارەکەی پێکابوو کە دوو مەتر لە سەرووی پرۆژەکتۆرەکەوە هەڵواسرابوو و شەستساڵی ڕەبەق بوو لە کار کەوتبوو و بە تۆز و ڕایەڵی جاڵجاڵۆکە داپۆشرابوو. لە دەستڕێژی سێیەمیشدا فیشەکێک بەر هەمان شوێن کەوتبوو، ئەمەش بەڵای ئەفسەری پشکێنەرەوە بەڵگە بوو بۆ ئەوەی کە یەکێک لە سەربازانی نیشانشکێن کە دەمەوئێوارەی ئەو ڕۆژە بۆ ئەو ئەرکە دەستنیشان

کرابوون، پابەندی سوێند خواردن بە قورئان نەبووە و خۆی لە کوشتنی خەڵک پاراستووە. ئەفسەری پشکێنەر لە چوارچێوەی پرسێکی هاوشێوەدا، دۆسیەی کوژرانی قوتابییەکی ئاگرینی تری ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی گرتبووە دەست کە لە هەمان کاتدا سیخوڕێکی چالاک و ئەرکپەروەری لقی دەزگای هەواڵگریی میللی –میت– بووە لە قارس و لە دەستڕێژی سێیەمدا پێکرابوو. لە کەوانەیەکیشدا ڕوونی کردبووەوە کە هیچ بناغەیەکی یاسایی لە ئارادا نییە بۆ ئەوەی دەوڵەت بنەماڵەی قوتابییە کوژراوەکە قەرەبوو بکاتەوە. دواین فیشەکیش، ڕەزا بەگی خۆشەویستی لای هەموو کۆنەپارێزان و ئاینپەروەرانی قارس و دروستکەری سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی گەڕەکی قەڵایچی و خزمەتکارەکەی کە ڕۆڵی گۆچانی بۆ ئەم دەگێڕا، پێکابوو. سەرباری گیان کێشان وناڵەی ئەم دوو هاوڕێ گیانی بە گیانییە لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا، بەشێکی زۆری بینەران لە جێی خۆیانەوە و بێ ئەوەی جووڵەیان لێوە بێت، سەیری سەربازەکانیان دەکرد کە دیسانەوە چەکەکانیان هێنابووە سەرپێ. لە ڕاستیشدا لێکدانەوەی ئەم ڕەفتارەی بینەران کارێکی دژوارە. خاوەنی کارگەیەکی شیرەمەنی کە هێشتا نایەوێ ناوی ئاشکرا بکرێ، دوای چەندین ساڵ پێی گوتم: "ئێمە، ئەوانەی لە ڕیزەکانی دواوە دانیشتبووین، زۆر باش حاڵی بووبووین کە شتێکی خراپ قەوماوە. ترسی ئەوەمان هەبوو ئەگەر لە شوێنی خۆمان بجووڵێین و سەرنج بۆ سەر خۆمان ڕابکێشین، ئەوا بەڵاکە بەرۆکی ئێمەش دەگرێتەوە، بۆیە بەبێ دەنگی سەیری ڕووداوەکانمان دەکرد."

ئەفسەری پشکێنەر بۆی نەسەلمێنرابوو کە یەکێک لە فیشەکەکانی دەستڕێژی چوارەم بەر کوێ کەوتووە. فیشەکێکی تریان، فرۆشیارێکی لاوی بریندار کردبوو کە لە ئانکاراوە بۆ فرۆشتنی ئەنسکلۆپیدیا و گەمەی ناو هۆڵەکان بە قیستی مانگانە بۆ قارس هاتبوو. (بەهۆی خوێن بەربوونەوە دوای دوو سەعات گیانی سپاردبوو.) فیشەکێکی دی، کونێکی گەورەی لە دیواری لای خوارەوەی ئەو لۆژە تایبەتەدا دروست کردبوو کە گریگۆر چزمەجیانی گەورەدەوڵەمەندی ئەرمەن و بازرگانی پێستە لە سەرەتای ساڵانی ٩٠٠ دا لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا کە هەموویان جلوبەرگی لە پێست دروستکراویان دەپۆشی، تێیدا دادەنیشتن. دوو فیشەکەکەی تر، دانەیەک



لە چاوە سەوزەکانی نەجیب و ناوەڕاستی ناوچەوانە پانەکەی پێکابوو. بەگوێرەی چەند دەمگۆیەک نەجیب دەسبەجێ گیانی لە دەست نەدابوو، بەڵکو بەپێی گێڕانەوەکان، دواتر ڕووی هاواری لە شانۆ کردووە و گوتویەتی: "چاوم دەبینێ!"

ئەوانەی بەرەو دەرگاکان هەڵهاتن و کەوتبوونە هاوار و قیرە، لەگەڵ ئەم دەستڕێژەدا بەیەکجاری زەندووقیان چووبوو. کامێرامانی سەر کامێراکەی وەشانی زیندوو خۆی دابووە پاڵ دیوارێک؛ کامێراکەی کە بەردەوام ڕاست و چەپی دەکرد، ئیدی جوڵەی لێ بڕابوو. بینەرانی شار لە پەردەی تەلەفزیۆنەکەدا تەنیا ئاپۆڕەی سەر شانۆکە و بینەرانی بێدەنگ و بەڕێزی ڕیزەکانی پێشەوەیان دەبینی، وەلێ سەرباری ئەوەیش، زۆربەی خەڵکی شار لە میانەی دەنگی میل هێنانەوە و تەقە و قیڕە و هەرا کە لە پەردەی تەلەفزیۆنەکەوە دەبیسترا، تێ گەیشتبوون کە شتێکی سامناک لە هۆڵی شانۆی گەل دەقەومێ. بگرە ئەوانەیش کە لە نیوەی شەودا لە نمایشەکە بێزار بووبوون و خەریک بوو چاویان گەرم دەکرد و دەنووستن، دوای ئەوەی گوێیان لە دەنگی تەقەی هەژدە چرکەی ڕابردوو بوو، هوشیار بوونەوە و چاویان بڕیە پەردەی تەلەفزیۆنەکانیان.

سونای زایم بەشی ئەوە بەئەزموون بوو کە پەی بەم ساتی بایەخپێدانە ببات: "سەربازە قارەمانەکان، ئێوە ئەرکی خۆتان ڕاپەڕاند." پاشان بە جووڵەیەکی نازکەوە ڕووی لە فوندا ئەسەر کرد کە هێشتا لەسەر زەوییەکە ڕاکشابوو، بە پێوەنانەوە خۆی نووشتاندنەوە و دەستی بۆ درێژ کرد. ژنەکەیش دەستی فریادڕەسەکەی گرت و هەستایە سەرپێ.

فەرمانبەرێکی خانەنشینی ڕیزی پێشەوە هەستایە سەرپێ و چەپڵەیەکی بۆ لێ دا. چەند کەسێکی تری پێشەوە وەکو ئەویان کرد. لە ڕیزەکانی پشتیشەوە دەنگی چەند چەپڵەیەک هات کە یان لە ترساندا بوو یاخۆ خووگرتن بوو بەلاساییکردنەوەی چەپڵەلێدەران. پاشماوەکەی تری ئەوانەی ناو هۆڵەکە وەکو شەختە بێدەنگ بوون. هەمووان لەوە دەچوون تازە سەرخۆشی بەری دابن؛ هەندێکیان سەرباری بینینی چەند کەسێک بەدەم گیانکێشانەوە، وەکو ئەوەی هەموو شتەکان بەشێک بن لە جیهانی سەر شانۆکە، بێباکانە لەبنەوەڕا بزەیان دەهاتێ، بڕێکی تریان لەو

گۆشانەوە کە خۆیان تێ خزاندبوو، سەریان دەرهێنا، بەڵام دەنگی سونای زایم دەیترساندن. سونای بەدەنگێکی پڕ لە ئێشەوە گوتی: "ئەم نمایش نییە، ئەمە سەرەتای شۆڕشێکە. چیمان لە دەست بێ لە پێناوی نیشتماندا دەکەین. متمانەتان بە سوپای بەشەرەفی تورک هەبێ! سەربازەکان، ئەمانە دوور بخەنەوە."

دوو سەرباز، دوو "پاشڤەڕۆ" ڕیش پانەکەیان دایە پێش خۆیان و بردیانن. سەربازەکانی تر چەکەکانیان کردەوە شان و دابەزینەوە ناو بینەران. هەر لەو کاتەدا کەسێکی سەمەرە خۆی گەیاندە سەر شانۆ. سەمەرە بوو، چونکە هەروەکو ئەوەی سەرباز نەبوو، بە جووڵە ناشیرین و سستەکانیشیدا دیار بوو کە ئەکتەر نییە و سەر شانۆی لێ ناوەشێتەوە. زۆرێک لە قارسییەکان بە هیوای ئەوەی کە ڕووداوەکان بەجۆرێکی تر بن، بە ئومێدەوە چاویان تێ بڕی.

ئەو کەسە هاواری کرد: "بژی کۆمار! بژی سوپا! بژی میللەتی تورک! بژی ئەتاتورک!" لەو کاتەدا پەردەی شانۆکە لەسەرخۆ دادەخرا . ئەویش دوو هەنگاو لەگەڵ سونای زایمدا هاتە پێشەوە و لە دیوی لای هۆڵی پەردەکە مایەوە. دەمانچەیەکی دەستکردی –کرککالە–ی بەدەستەوە بوو، دەستێک جلی مەدەنیی پۆشیبوو و جووتێک پۆستاڵی سەربازیی لە پێ کردبوو. هاواری کرد: "بمرن توندڕەوان!" بە پلیکانەکاندا بۆ ناو بینەران دابەزی. دوو کەسی تری چەک بەدەستیش لە پشتیەوە پەیدا بوون. سەربازەکان لەو دەمەدا کەوتبوونە دەستگیرکردنی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان و بینەرانیش بە چاوی پڕ لە ترسەوە سەیری سێ کەسە چەک بەدەستەکەیان دەکرد. ئەوانیش بێ ئەوەی ئاوڕ لە بینەران بدەنەوە، بەدەم گوتنەوەی دروشمەوە ڕوویان لە دەرگای دەرەوە کرد و بە بڕوا بەخۆبوونەوە بۆی دەرباز بوون.

زۆریش شاد و فرە بەجۆش و خرۆش بوون، چونکە دوای مامەڵە و گفتوگۆیەکی درێژ و لە دوا ساتدا بڕیار درابوو لە شۆڕشە بچووکەکەی قارس و لە نمایشەکەدا بەشداری بکەن. سونای زایم کە لە یەکەم شەوی گەیشتنیدا بۆ قارس ئەمانەی پێ ناسێندرابوو، پێی وا بوو کەسانی سەرچڵ و چەک بەدەست و لە کاری ڕەشەوە گلاوی وەکو ئەمانە، (کارێکی هونەری) کە ئەم دەیەوێ نمایشی بکات، خەوشدار



دەکەن، بۆیە بەدرێژایی ڕۆژێکی تەواو خۆی نەدابوو بەدەستەوە و ڕەزامەندیی لەسەر بەشداربوونیان دەرنەبڕیبوو، بەڵام لە دوا ساتدا خۆی لە بەرامبەر ئەو بیانووە زەقەدا ڕانەگرتبوو کە ئەوانە لە هونەر تێ ناگەن و لەوانەیە چەک لەدژی تیپی گەڕۆکی شانۆ بەکار بهێنن. دەگوترا گوایە سونای زایم دوای چەند سەعاتێک لەم بڕیارەی خۆی زۆر پەشیمان بووەتەوە و لەبەرئەوەی ئەو سەرسەری و لات و چەقۆکێشانە خوێنیان ڕشتووە، ئەم ئازاری ویژدانی چەشتووە. بەڵام ئەمانەیش وەکو زۆر شتی تر بەتەنیا قسە و قسەڵۆک بوون.

دوای چەندین ساڵ کە چوومە قارس، موختار بەگی خاوەن کۆگای ئارچەلیک منی بەناو هۆڵی شانۆی گەلدا گەڕاند کە لایەکی ڕووخابوو و لایەکەی تریشی کرابوو بە کۆگای دوکانی ئارچەلیک. موختار بەگ بۆ ئەوەی خۆی لە پرسیارە پڕ لە سەرسوڕمانەکان سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەو شەوە و ڕۆژانی دواتر بدزێتەوە، پێی گوتم کە هەر لە سەردەمی ئەرمەنەکانەوە تا ئێستا لە قارسدا چەندین تاوان و خراپەکاری و شەڕ و شۆڕ ڕوویان داوە. بەڵام من ئەگەر بمویستایە مرۆڤەکانی ئەو شارە کەمێک دڵخۆش بکەم، دەبوو لە گەڕانەوەمدا بۆ ئەستەمبوڵ، باسێک لە تاوانەکانی مێژووی ڕابردووی قارس نەکەم، بەڵکو پێویست بوو دەربارەی پاک و خاوێنیی هەواکەی، جوانی و دڵگیرییەکەی و دڵسافیی مرۆڤەکانی بنووسم. هۆڵی شانۆکە کە گۆڕاوە بۆ ئەمبارێکی تاریک و کەڕووگرتوو، لە نێوان تارماییی بەفرگر و جلشۆر و سۆپاکانەوە تەنیا یەک پاشماوەی ئەو شەوەی نیشانم دا: ئەویش ئەو کونە گەورەیە بوو کە فیشەکێک لە دیواری ئەو لۆژەدا هەڵی کۆڵیبوو کە گریگۆر چزمەجیان لێیەوە سەیری شانۆی دەکرد.

# ١٩

## ئای کە بەفرەکە چەند بەجوانی دەباری!

### شەوی شۆڕشەکە

سەردەستەی ئەو سێ کەسە دڵخۆشەی کە دوای داخستنی پەردەی شانۆکە بەدەمانچە و تفەنگ و بەدەم هاوارکردنەوە، بەناو نیگای پڕ لە ترسی ئاپۆڕەی بینەراندا تاویان دا بۆ دەرەوە، کۆنە ڕۆژنامەنووسێکی کۆمۆنیست و کابرایەکی کەتە بوو کە ناوی خوازراوی ز. دەمیرکۆڵ-ی لە خۆی نابوو. لە ساڵانی ١٩٧٠دا لە ڕێکخراوە کۆمۆنیستییەکانی لایەنگری سۆڤیەتدا وەکو شاعیر و نووسەر و هەرە زیاتریش وەکو "پارێزڤان" بینرا بوو. لە دوای کودەتای سەربازیی ساڵی ١٩٨٠ بۆ ئەڵمانیا هەڵاتبوو، پاش ڕووخانی دیواری بەرلین بە لێبووردنێکی تایبەت و بەمەبەستی پاراستنی دەوڵەتی هاوچەرخ و کۆمار لە بەرامبەر گەریلا کوردەکان و "شەریعەتخوازەکان"دا گەڕابووەوە بۆ تورکیا. دوو کەسەکەی تر، لەو تاقمە تورکییە ڕەگەزپەرستانە بوون کە لە ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٠دا لەگەڵ ز. دەمیرکۆڵدا لە شەڕە تەقەی شەوانی کوچەکانی ئەستەمبوڵدا بەشدارییان کردبوو، ئێستایش ڕۆحی سەرچڵکێشیان لە ژێر پەردەی پاراستنی دەوڵەتدا بەیەکی گەیاندبوون. بەگوێرەی بۆچوونی هەندێ کەسی تر، ئەوانە هەر لە سەرەتاوە سیخوڕی دەوڵەت بوون. ئەوانەیشی کە لە هەوڵدا بوون هۆڵی شانۆی گەل چرکەیەک زووتر بە جێ بهێڵن و بەپەلە بە پلیکانەکاندا دەچوونە خوارێ، لەبەرئەوەی نەیاندەزانی سێ کەسەکە کێن، بەجۆرێک هەڵسوکەوتیان لە تەکیاندا کرد وەکو ئەوەی بەشێک بن لە نمایشەکەی سەر شانۆ کە هێشتا درێژەی هەبوو.

ز. دەمیرکۆڵ کاتێک گەیشتە ناو کوچەکە و کەڵەکەبوونی بەفرەکەی بینی، وەکو منداڵ بە خۆشحاڵییەوە شەقێکی وەشاند، دوو فیشەکی بە ئاسماندا تەقاند و هاواری کرد: "بژی میللەتی تورک، بژی کۆمار!" ئاپۆڕەی بەر دەرگاکە بڵاوەیان لێ



کرد و خۆیان دایە لاوە. هەندێکیان بزە گرتبوونی و بە ترسەوە سەیریان دەکردن. بڕێکی تریان وەکو داوای پۆزش بکەن لەوەی کە ئاوا زوو بۆ ماڵەوە دەڕۆنەوە، لە جێی خۆیان ڕاوەستان. ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی بەرەو سەرەوەی شەقامی ئەتاتورک تێیان تەقاند. دروشمیان دەگوتەوە و وەکو سەرخۆش بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. چەند کەسێکی بەساڵاچوو کە بۆ خۆپاراستن لە خلیسکان قۆڵیان بە قۆڵی یەکدا کردبوو و بە ڕێگادا دەڕۆیشتن و باوکانی خێزانی منداڵدار کە بە باشی خۆیان پێکەوە نووساندبوو، هەر ئەوەندەیان لەدەست هات چەپڵە بۆ ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی لێ بدەن.

سێ کەسە دڵخۆشەکە لە گۆشەی شەقامی کوچووک کازم بەگ (کا)یان گرتەوە. کاتێک هەستی بە نزیکبوونەوەیان کرد، وەکو ڕێگا بۆ ئۆتۆمبیل چۆڵ بکات، لای دایە سەر شۆستەی ژێر دار زەیتوونێکی ڕووسی. ز. دەمیرکۆڵ گوتی: "شاعیر بەگ، پێش ئەوەی ئەوان بتکوژن، دەبێ تۆ بیانکوژی. تێ گەیشتی؟"

(کا) ڕێک لەو ساتەدا ئەو شیعرەی لەبیر چوو کە هێشتا نەیتوانیبوو بینووسێ و بەنیاز بوو ناوی بنێ (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە.)

ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی بە شەقامی ئەتاتورکدا بەرەو سەرەوە هەڵدەکشان. (کا) لەبەرئەوەی نەیویست دوایان بکەوێ، بەلای ڕاستدا پێچی کردەوە بۆ شەقامی قەرەداغ، هەستی کرد ئیدی هیچ شتێک لە شیعرەکەی لە خەیاڵدا نەماوە.

لە هەناویدا پەی بەو شەرم و تاوانە برد کە دوای تەواوبوونی کۆبوونەوە سیاسییەکانی تافی لاوی هەستی پێ دەکرد. شەرمەکەی لەبەرئەوە نەبوو کە ئەم بەچکە بۆرژووایەکی سەر بە خێزانێکی دەوڵەمەندی بەشەشاری نیشانتاشییە، بەڵکو بەهۆی ئەوە بوو کە گفتوگۆی کۆبوونەوەکان پڕ بوو لە قسەی توند و منداڵکارانەی زۆر پێوەنراو. بەئومێدی ئەوەی شیعرە لەبیرچووەکەی بیر بکەوێتەوە، بڕیاری دا ڕێی خۆی درێژ بکاتەوە و ڕاستەڕێ بۆ هوتێل نەگەڕێتەوە.

چەند کەسێکی بەرچاو کەوت کە بە بینینی ڕووداوەکان لە تەلەفزیۆندا شڵەژابوون و لە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە سەریان هێنابووە دەرەوە. لێرەدا زۆر دژوارە بگوترێ

گەلۆ (کا) تا چەندە ئاگای لە ڕووداو و هەراکەی ناو هۆڵی شانۆی گەل بووە. هێشتا لە هۆڵەکە نەچووبووە دەرێ کە تەقە دەستی پێ کردبوو، بەڵام لەوانەیشە هەم دەستڕێژەکان و هەم ز. دەمیرکۆڵیشی بە بەشێک لە نمایشەکە زانیبێ.

هەموو سەرنجی خۆی خستبووە سەر شیعرە لەبیر کردووەکەی. کاتێکیش هەستی کرد وا شیعرێکی تر لە جێی ئەو چەکەرە دەکات، لە لایەکی هۆشیدا هێشتیەوە بۆ ئەوەی گەشە بکات و پێ بگات.

لە دوورەوە قرمەی دوو دەستڕێژ هات، دەنگی تەقەکان لە بەفرەکەدا دەنگی نەدایەوە و ون بوو. ئای کە بەفرەکە چەند بە جوانی دەباری! بە کلووی گەورە و بە باوەڕ بەخۆبوونەوە، بەبێدەنگی و وەکو ئەوەی هەرگیز ڕاوەستانی بۆ نەبێت! شەقامی فراوانی قەرەداغ کە تا ئەژنۆ بەفر گرتبووی، هەورازێک بوو بە ئاراستەی تاریکاییی شەودا دەڕۆیشت و مرۆڤی تێدا ون دەبوو، سپی و لێوانلێو بوو لە نهێنی! باڵەخانەی سێ نهۆمیی شارەوانی کە پاشماوەی سەردەمی ئەرمەنییەکان بوو، کەسی تێدا نەبوو. شەختەی شۆڕەوەبوو لە لقەکانی دار زەیتوونێکی ڕووسی، لەگەڵ بەفری کەڵەکەبووی سەر ئۆتۆمبیلێکی بە چاونەبینراوی ژێری، یەکیان گرتبوو و پەردەیەکی تەنکی نیوە شەختە و نیوە بەفریان پێک هێنابوو. (کا) بە بەردەم ماڵێکی یەک نهۆمیی چۆڵی ئەرمەنیدا کە پەنجەرەکانی بە تەختە قایمکرابوون، تێ پەڕی. بەدەم بیستنی دەنگی هەناسە و زرمەی پێی خۆیەوە، لە هەناوی خۆیدا هەستی بە هێزێک کرد بۆ پشتکردنە بانگی ژیان و خۆشبەختی کە وێ دەچوو جاری یەکەمی بێ بەرگوێی کەوتبێ.

لە پارکە خنجیلانەکەی بەردەم بارەگای پارێزگادا کە پەیکەرێکی بچووکی ئەتاتورکی تێدا دانرابوو، کەس بەدی نەدەکرا. لە بەردەم باڵەخانەی دەفتەرداریشدا کە ورشەدارترین باڵەخانەی پاشماوەی سەردەمی ڕووسەکان بوو، (کا) کەسی نەبینی. حەفتا ساڵ لەمەوبەر، کاتێک قەیسەر و پاشا سوپای خۆیان لە هەرێمەکە کێشایەوە، ئەم شوێنە ناوەند و بارەگای ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیە بوو کە تورکەکان دایانمەزراندبوو. لە بەرامبەریشیدا باڵەخانەیەکی ئەرمەنی هەبوو کە بەهۆی ئەوەی جێی بارەگای سەرۆکایەتیی ئەو دەوڵەتە بوو، لە لایەن سەربازەکانی ئینگلیزەوە



پەلامار درابوو. (کا) لە باڵەخانەکە کە لەم ڕۆژگارەدا بارەگای پارێزگارە و لە ژێر پاراستنی چڕدایە، نزیک نەکەوتەوە، بەڵکو بەرەو لای پارکەکەی دەستەڕاستی ملی ڕێی گرت. تازە گەیشتبووە بەردەم باڵەخانەیەکی تری ئەرمەنیی جوان و غەمگینی هاوشێوەی ئەوانی تر تانکێکی بینی کە بێدەنگ و لەسەرخۆ وەکو ئەوەی دیمەنێک بێ لە خەودا، لە دەشتەکەی ئەولاترەوە دەهاتە پێشەوە. لە دوورتریش، ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری سەربازی لە نزیک ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان ڕاگیرابوو. (کا) بە کەمیی بەفری کەڵەکەبووی سەریدا تێ گەیشت کە بارهەڵگرەکە کەمێک پێشتر لەو شوێنە ڕاگیرابوو. دەستڕێژێک کرا. گەڕایە دواوە. بێ ئەوەی پۆلیسەکانی ناو کولبەی جام بەستووی بەردەم بارەگای پارێزگا کە تێ دەکۆشان خۆیان گەرم بکەنەوە، بیبینن، بە شەقامی سوپادا چووە خوارێ. هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە تەنیا بە گەڕانەوەی بۆ ژوورەکەی لە هوتێل و بە دەرنەچوونی لەم کپیی بەفرەدا دەتوانێ شیعرە نوێیەکەی خەیاڵی و بیرەوەرییەکی پەیوەست بەهەمان شیعر بپارێزێ.

گەیشتبووە نیوەی هەورازەکە، لە شۆستەکەی بەرامبەرەوە دەنگی هەرایەک هات، (کا) هەنگاوەکانی خاوکردەوە. دوو کەس دەرگای بەڕێوەبەرایەتیی تەلەفۆنیان دابووە بەر شەق.

لە ناو بەفرەکەوە ڕوناکیی گڵۆپەکانی ئۆتۆمبیلێک بەدەرکەوتن، پاشان (کا) گوێی لە دەنگی خۆشی تایە زنجیردارەکانی ئۆتۆمبیلەکە بوو. ئۆتۆمبیلە ڕەشە سڤیلکە لەنزیک بەڕێوەبەرایەتیی تەلەفۆنەوە ڕاوەستا، کابرایەکی کەتە و کەسێکی چەکداری لێ دابەزی کە (کا) لە کاتی بەجێهێشتنی هۆڵی شانۆی گەلدا بینیبوونی.

هەموویان لە بەردەم دەرگاکەدا گردبوونەوە، دەمەقاڵێیەک دەستی پێ کرد. (کا) بە دەنگیاندا و لەبەر ڕووناکیی گڵۆپەکانی ئۆتۆمبیلەکەدا بۆی ڕوون بووەوە کە ئەوانەی بەردەرگاکە ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانین.

یەکێکیان گوتی: "چۆن کلیلت پێ نییە! مەگەر تۆ بەڕێوەبەری فەرمانگەی تەلەفۆن نیت؟ ئەی تۆیان نەهێناوە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی تەلەفۆنەکان ببڕی؟ چۆن کلیلەکان لەبیر دەکەی؟"

بەڕێوەبەرەکە گوتی: "تەلەفۆنەکان لێرەوە نابڕدرێن، لە سەنتراڵە نوێیەکەی شەقامی وێستگاوە دەبڕدرێن."

ز. دەمیرکۆڵ گوتی: "ئەمە شۆڕشە و ئێمە دەمانەوێ لێرە بچینە ژوورەوە. ئەگەر بمانەوێ پیاوی خۆمان بۆ شوێنەکەی تریش دەنێرین. حاڵی بووی؟ کلیلەکان لە کوێن؟"

"کوڕی خۆم، ئەم بەفرە دوو ڕۆژی تر خۆشی دەکاتەوە و ڕێگا و بانەکان دەکرێنەوە. دوایی دەوڵەت لە هەموومان دەپرسێتەوە."

ز. دەمیرکۆڵ دەنگی بەرز کردەوە و گوتی: "ئەو دەوڵەتەی تۆ زەندووقت لێی چووە، ئێمەین. زوو کە دەرگاکە بکەرەوە؟"

"بێ نووسراوی فەرمی دەرگاکە ناکەمەوە."

ز. دەمیرکۆڵ گوتی: "ئێستا دەبینین." دەمانچەی هەڵکێشا و دوو فیشەکی بە ئاسماندا تەقاند. "بیبەن و بیدەنە پاڵ ئەو دیوارە، ئەگەر لەسەر کەللەڕەقی بەردەوام بێ، گوللەبارانی دەکەین."

کەس بڕوای بە قسەکانی نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاوە چەک بەدەستەکانی ز. دەمیرکۆڵ ڕەجایی بەگیان دایە پێش خۆیان بۆ بن دیواری باڵەخانەی فەرمانگەی تەلەفۆن. بۆ ئەوەی نەبادا فیشەک زیان بە جامی پەنجەرەکان بگەیەنێ، کەمێک بۆ لای ڕاست پاڵیان پێوە نا، بەهۆی ئەوەی بەفرەکەی ئەو لایە زۆر نەرم بوو، ڕەجایی بەگ کەوتە سەر زەوی. داوای لێبووردنیان لێ کرد، دەستیان گرت و هەڵیان ساندەوە سەرپێ. کراڤاتەکەیان لە ملی داکەند و دەستیان لە پشتەوە گرێ دا. بەدەم ئەو ڕەفتارانەیانەوە، لە نێوان خۆیاندا قسەیان دەکرد و دەیانگوت کە تا بەیانی قارس لە سەرجەم ناپاکانی نیشتمان پاک دەکەنەوە.

پیاوەکان بە فەرمانی ز. دەمیرکۆڵ چەکیان لە شان داگرت و وەکو تیمی تیرباران کردن لە بەردەم ڕەجایی بەگدا ڕیز بوون. ڕێک لەو کاتەدا لە دوورەوە دەنگی تەقە هات. (ئەوە دەنگی تەقەی سەربازەکانی ناو باخچەی بەشی ناوخۆیی قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان بوو بۆ چاوترساندن.) هەموو بێدەنگ



بوون و چاوەڕێیان کرد. بەفر کە بەدرێژایی ڕۆژ بێ ناوبەر باریبوو، خەریک بوو خۆشی دەکردەوە. هەست بەبێدەنگییەکی لە ڕادەبەدەر جوان و ئەفسوناوی دەکرا. پاش کەمێک، یەکێکیان گوتی ئەم پیرە پیاوە (هیچیش پیر نەبوو) مافی خۆیەتی دوایین جگەرە بکێشێ. جگەرەیەکیان نا بە دەمی ڕەجایی بەگەوە و بە چەرخ بۆیان داگیرساند. لە کاتێکدا بەڕێوەبەر جگەرەکەی دەکێشا، ئەمان لەبەرئەوەی بێزار بووبوون، بە قۆنداغە تفەنگ و بە پۆستاڵەکانیان کەوتنە شکاندنی دەرگای فەرمانگەی تەلەفۆن.

بەڕێوەبەر گوتی: "حەیفە بۆ ماڵی دەوڵەت، دەستم بکەنەوە، من دەرگاکە دەکەمەوە."

دوای ئەوەی ئەوان چوونە ژوورەوە، (کا) لەسەر ڕۆیشتنی خۆی بەردەوام بوو. لە دوورەوە تاک و تەرا دەنگی تەقە دەهات، بەڵام ئەم هەر ئەوەندەی دەنگی سەگوەڕ بایەخی پێ دا. بەهەموو هێزی خۆیەوە سەرنجی بڕیبووە جوانیی ئەو شەوە بێ جووڵەیە. ساتێک لە بەردەم ماڵێکی کۆن و چۆڵی ئەرمەنیدا ڕاوەستا، پاشان بە ڕێزەوە سەیری ئەو شەختانەی کرد کە بە کەلاوەی کڵێسایەکی ئەرمەنی و لقی دارەکانی ناو باخچەکەیدا شۆڕ بووبوونەوە. سەرجەم شتەکان لەبەر ڕووناکیی گڵۆپە زەرد و لاوازەکانی کوچەکانی شاردا لەوە دەچوون کە لە خەونێکی غەمگینەوە هاتبنە دەرەوە، ئەم دۆخە وای لە (کا) کرد کە هەست بە تاوانباری بکات. لە لایەکی تر، ناخی تژە بوو لە سوپاس و پێزانین بۆ ئەم وڵاتە بێ دەنگ و لەبیرکراوە کە هەناوی پڕ کردبوو لە شیعر.

کەمێک لەولاترەوە، دایکێکی تووڕەی بینی کە لە پەنجەرەوە بانگی دەکرد و زۆری بۆ کوڕەکەی دەهێنا بۆ ماڵەوە بگەڕێتەوە. کوڕەکەیش دەیگوت: "دەڕۆم بزانم چی قەوماوە." (کا) بە نێوانیاندا تێ پەڕی. دوو پیاوی هاوتەمەنی خۆی بینی، یەکێکیان زرتە زەلام و ئەوی تریان باریکەڵەیەکی منداڵ ئاسا بوو کە لە دوکانێکی پێڵاوفرۆشی گۆشەی شەقامی فایەق بەگەوە بە شڵەژاوی دەهاتنە دەرێ. ئەم دوو ئەویندارە کە ماوەی دوازدە ساڵ بوو هەفتەی دوو جار بە ژنەکانی خۆیان دەگوت: "دەڕۆین بۆ چایخانە"، لەم دوکانە بۆن زەمقاوییەدا بەیەک دەگەیشتن. لە تەلەفزیۆنی هاوسێکەی سەرووی خۆیانەوە چەند جارێک بانگەوازی قەدەغەکردنی چوونە دەرەوەیان بەر گوێ

کەوتبوو، بە ڕاگەیاندنەکە شڵەژابوون. (کا) دوای ئەوەی خۆی گەیاندە شەقامی فایەق بەگ و دوو کۆڵان بەرەو خوارەوە چوو، لە بەردەم دوکانێکدا کە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە مێزێکی ماسی فرۆشی لێ بینیبوو، تانکێکی بەدی کرد. تانکەکەیش وەکو کۆڵانەکە لە بێدەنگییەکی ئەفسووناویدا نقووم بووبوو، هێندە بێ جووڵە و مردوو بوو، بەجۆرێک ئەم وایزانی کە کەسی تێدا نییە. بەڵام لەپڕ سەری تانکەکە هەڵدرایەوە، سەری سەربازێکی لێوە هاتە دەرەوە و داوای لێ کرد دەسبەجێ بۆ ماڵەوە بڕواتەوە. (کا) پرسیاری ڕێی هوتێلی بەفرپالاسی لێ پرسی، بەڵام بەرلەوەی سەربازەکە لێو هەڵبێنێتەوە، ئەم لە تاریکاییەکەی ئەوبەردا نووسینگەی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ی بینی و ڕێی گەڕانەوەی هوتێلی دۆزییەوە.

گەرمیی بێ هوتێلەکە و ڕووناکی هۆڵی پێشوازیکردن، دڵی ئەمی پڕ کرد لە کامەرانی. بە ڕووی میوانەکانەوە کە بەدەم جگەرەکە کێشانەوە سەیری تەلەفزیۆنیان دەکرد، دیار بوو کە ڕووداوێکی نائاسایی قەوماوە، بەڵام وەکو منداڵێک کە بخوازێ باز بەسەر بابەتێکی نابەدڵدا بدات، هۆشی بە ئازادی و لەسەرخۆیی بەسەر شتەکاندا دەخزا. بەو هەستی لەش سووکییەوە خۆی کرد بە ماڵەکەی تورگوت بەگدا، هەموو تاقمەکە هێشتا لە دەوری مێزەکە بوون و سەیری تەلەفزیۆنیان دەکرد. تورگوت بەگ کە (کا)ی بینی، هەستایە سەرپێ، بە گلەیی کردنەوە گوتی کە بەهۆی دواکەوتنییەوە دڵیان لای بووە. ویستی شتێکی تریش بڵێ، لەو کاتەدا نیگای (کا) و ئیپەک کەوتنە سەریەک. ئیپەک گوتی: "زۆر بە جوانی شیعرەکەت خوێندەوە، شانازیم پێوە کردی." (کا) یەکسەر حاڵی بوو کە تا لە ژیاندا ماوە، ئەم ساتەی لەبیر ناچێ. ئەوەندە کامەران بوو، بەجۆرێک ئەگەر پرسیاری کچەکانی تر و حاڵی شێواوی تورگوت بەگ نەبوایە، ئەوا فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە.

تورگوت بەگ گوتی: "پێم وابێ سەربازەکان شتێک دەکەن." بەهۆی ئەوەی نەیدەزانی بڕیار بدات گەشبین بێ یاخۆ خەم بخوات، تەواو تەنگاو بووبوو.

خوانەکە پەرش و بڵاوکرابووەوە، یەکێک کە پێ دەچوو ئیپەک بێ، سوتووی جگەرەکەی کردبووە ناو توێکڵە پرتەقاڵەکانەوە. پوورە منیرە کە خزمێکی لاو و دووری باوکی بوو، لە سەردەمی منداڵیی (کا)دا هەمان شتی دەکرد. دایکی (کا) لە



قسەکردن لەگەڵیدا، لە وشەی "ئەفەندم" کەمتری بەکارنەدەهێنا، کەچی ئەو گوێی نەدەدایێ و لەسەر بەزمی خۆی بەردەوام دەبوو.

تورگوت بەگ گوتی: "چوونە دەرەوە قەدەغە کراوە، بۆمان بگێڕەوە لە شانۆکە چی قەماوە."

(کا) گوتی: "من هیچ پێوەندیم بە سیاسەتەوە نییە!"

سەرەتا ئیپەک و دواتر ئەوانی تر تێ گەیشتن ئەوەی کە دەری بڕی، سەدای دەنگێکە لە هەناویدا، لەگەڵ ئەوەشدا (کا) شەرمی بەخۆیدا هاتەوە.

ئێستا دەیویست ماوەیەکی درێژ لەوێ هیچ قسە نەکرێ و دابنیشێ و سەیری ئیپەک بکات، بەڵام (کەشی شەوی شۆڕش)ی ناو ماڵەکە، نائارامی دەکرد، نەک لەبەرئەوەی کە شەوەکانی کودەتای سەربازیی سەردەمی منداڵی بە خراپی بیرکەوتبووەوە، بەڵکو بەهۆی ئەوەی هەرکەسە شتێکی لێ دەپرسی. خەندە لە سووچێکدا خەوتبوو. قەدیفە سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد و (کا) خۆی لە سەیرکردنی دەپاراست. تورگوت بەگیش، لەبەرئەوەی شتی سەمەرە ڕووی دابوو، لە خۆی ڕازی بوو، بەڵام شڵەژانی پێوە دیار بوو.

(کا) ماوەیەک لەوێ دانیشت و دەستی ئیپەکی گرت، داوای لێ کرد لەگەڵیدا سەر بکەوێتە سەرەوە بۆ ژوورەکەی. کاتێک تێ گەیشت کە نەتوانین بۆ خۆ نزیکخستنەوەی زیاتر لە ئیپەک ئازاری دەدات، سەرکەوتە سەرەوە بۆ ژوورەکەی. بە ماندوویی پاڵتۆکەی بە بزماری پشت دەرگاکەدا هەڵواسی. گڵۆپی بچووکی سەر نوێنەکەی داگیرساند: ماندوویی وەکو ناڵەیەک کە لە جیهانی ژێرەوە هاتبێ، بەتەنیا جەستە و پێڵووەکانی نا، بگرە هەموو ژوورەکە و سەرتاپای هوتێلەکەی دابووە بەر. بۆیە بەپەلە لە دەفتەرەکەیدا دەستی کرد بە نووسینەوەی ئەو شیعرە نوێیەی کە تازە بۆی هاتبوو. بەدەم دانیشتنەوە لە قەراغ نوێنەکەی هەستی دەکرد بەیتەکانی شیعرەکەی، پێخەوەکەی، باڵەخانەی هوتێلەکە و شاری بەفراویی قارس، بەردەوامبوونێکی هەموو جیهانە.

شیعرەکەی ناو نا (شەوی شۆڕشەکە). سەرەتای شیعرەکە بەوە دەستی پێ دەکرد

که لە شەوانی کودەتای سەربازیی سەردەمی منداڵیی ئەودا هەموو ئەندامانی خێزان لە خەو هەڵدەستان و بە بیجامەوە گوێیان لە ڕادیۆ و سروود دەگرت، دواتریش دۆخەکە وەردەگەڕایە سەر پێکەوە خواردنی نانی جەژن. لەم سۆنگەیەوە هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە سروشی شیعرەکەی لە شۆڕشێکی ڕاستەقینەوە نەهاتووە، بەڵکو لە خەیاڵی خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە و دواتریش هەر بەوجۆرە لەسەر نیگاری گەردیلەی بەفرەکە داینا. پرسێکی گرنگی شیعرەکە بە ڕادەی پەی پێبردنی هۆشی شاعیر بوو بەو کارەساتانەی کە باڵیان بەسەر جیهاندا کێشاوە. تەنیا ئەو شاعیرەی ئەمەی بۆ بکرایە، دەیتوانی لە دۆخی هەنووکەییدا بە خەیاڵ بژی: ئەمە کارێک بوو کە سەرکەوتنی شاعیری تێدا دژوار بوو! (کا) دوای ئەوەی لە نووسینەوەی شیعرەکەی بووەوە، جگارەیەکی داگیرساند و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد.



# ٢٠

## خێری پێوە بێ بۆ نیشتمان و بۆ میللەت!

### شەو، کاتێک (کا) نووست و، بەرەبەیان

(کا)، دە سەعات و بیست خولەکی ڕێک و بێ ئەوەی لە شەودا بێدار بێتەوە، بۆی نووست. جاروبار لە خەونیدا بەفر دەباری. کەمێک پێشتریش، لە کوچە سپییەکەدا کە لەمیانەی پەردە نیوەکراوەکەوە بەدی دەکرا، بەفر بارین دەستی پێ کردبووەوە. لەبەر ڕووناکیی تیشکی کزیی تابلۆ پەمەییەکەی هوتێلی بەفرپالاسدا، بەفرەکە لەڕادەبەدەر نەرم دەهاتە بەرچاو. لەوانەیشە هۆی نووستنی ئارامی (کا) بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نەرمیی سەیر و ئەفسووناویی بەفرەکە دەنگی ئەو تەقانەی هەڵلووشیبێ کە لە کوچە و شەقامەکانی قارسدا تەقێنرابوون.

ئەمە بە مەرجێک بەشی ناوخۆییی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە بە تانکێک و دوو بارهەڵگری سەربازی هێرشی کرابووە سەر، تەنیا دوو کۆڵان لە سەرووی هوتێلەکەوە بوو. لە بەردەم دەرگای سەرەکیی قوتابخانەکەدا نا کە هێشتا نیشانەی هونەرکاریی ئاسنگەریی ئەرمەنی پێوە دیار بوو، بەڵکو لە پێش دەروازەی تەختەییی بەشی ناوخۆییدا کە بەسەر دوا هۆڵی نووستن و هۆڵی کۆبوونەوەکاندا دەیڕوانی، هەڵپڕژانێک قەومابوو. سەربازەکان، سەرەتا بەمەبەستی ترساندنی قوتابیان لە باخچە بەفراوییەکەوە تەقەیان بە تاریکاییی ئاسماندا کردبوو. لەبەرئەوەی توندڕەوترین قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان ئامادەی ئاهەنگەکەی هۆڵی شانۆی گەل بووبوون و لەوێ دەستگیر کرابوون، ئەوانەی لە بەشی ناوخۆیی مابوونەوە، یان نەزان بوون یاخۆ بێ ئاگا، بەڵام بەو ڕووداوانەی لە تەلەفزیۆندا بینیبوویان، هاتبوونە جۆش و لە پشت دەرگاکەوە بە مێز و ڕیزبوونی خۆیان بەربەستێکیان دروست کردبوو. بەدەم چاوەڕوانی کردنەوە (ئەڵاهو ئەکبەر) و دروشمی تریان گوتبووەوە. یەک دوو قوتابی شێتەڵۆکە بڕێک

چنگاڵ و چەقۆیەکیان لە چێشتخانەی بەشی ناوخۆیی دزیبوو و لە پەنجەرەی دەستشۆرەکەوە گرتبوویانە سەربازەکان. هاوکات بە تاقە دەمانچەیەک کە لەبەردەستیاندا بوو، دەستیان بە گەمە کردبوو، بۆیە لە ئاکامدا جارێکی تر دەنگی چەک دەبیسترێ، قوتابییەکی باڵا نەونەمام و ڕووخسار شیرین، گوللەیەک بەر ناوچەوانی دەکەوێ و دەمرێ. قوتابیانی قۆناغی ناوەندی بە بیجامەوە، ئەو قوتابییە بێ بڕیارانەی کە تەنیا بۆ ئەوەی شتێک بکەن، بەشدارییان لەم بەرگرییەدا کردبوو و دواتر پەشیمان بووبوونەوە، سەرجەم ئەو جەنگاوەرانەی کە هەر لە سەرەتاوە ڕووخساریان خەڵتانی خوێن کرابوو و زۆربەیان دەگریان، هەر هەموویان پێکەوە سواری ئۆتۆمبیل کران و بەدەم شەق و تێ هەڵدانەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش ڕاپێچ کران. بەهۆی بارینی بەفرەوە خەڵکانێکی کەم لە شاردا بەم ڕووداوەیان زانیبوو.

زۆرینەی خەڵکی شار هێشتا لەسەر پێ بوون، بەڵام نیگاکان لە سەر پەنجەرە و کوچەکان نەبوون، بەڵکو هێشتا لەسەر پەردەی تەلەفزیۆن بوون. دوای ئەوەی سونای زایم لە وەشانی زیندووی سەر شانۆی گەلدا گوتبووی ئەمە نمایش نییە، بەڵکو شۆڕشە، سەربازەکان دەستیان کردبوو بە کۆکردنەوەی دەم بە هاوارەکان و گواستنەوەی تەرم و بریندارەکان بە دارەمەیت. لەو کاتەدا ئومان بەگی جێگری پارێزگار کە هەموو قارسییەکان لە نزیکەوە دەیناسن، چووبووە سەر شانۆ و وەکو هەمیشە بە دەنگێکی فەرمی و تووڕە، بەڵام متمانە بەخش و کەمێکیش قەڵس، لەبەرئەوەی یەکەمجاری بوو لە (وەشانی زیندوو)دا دەرچووبوو، ڕای گەیاندبوو کە تا سەعات دوازەی ڕۆژی دواتر هاتنە دەرەوە لە قارس قەدەغە کراوە. دوای دابەزینی ئەو، کەسی تر نەهاتبووە سەر شانۆ، بۆیە بینەرانی قارس بەدرێژاییی بیست خولەک لە تەلەفزیۆندا تەنیا سەیری پەردەی شانۆی گەلیان کردبوو. دواتر پچڕانێک کەوتبووە پەخشەکەوە و ئەو پەردە کۆنەی کە پێشتر باسم کرد، هاتبووەوە سەر پەردەی تەلەفزیۆن. پاشان پەردەکە لەسەرخۆ کرابووە و دەست کرابووەوە بە نیشاندانەوەی (ئاهەنگ)ەکە لە نووکەوە.

ئەم بارودۆخە ترسی لە دڵی زۆربەی ئەو بینەرانەی قارسدا دروست کردبوو کە



بەدیار تەلەفزیۆنەکانیانەوە دانیشتبوون و دەکۆشان بزانن لە شارەکەیاندا چ قەوماوە. چاو بە خەو و نیمچە سەرخۆشەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو ئاڵۆزییەکی بێ سەروبن دەست پێ بکاتەوە، هەندێکیشان هەستیان وا بوو کە ئاهەنگەکە و کوشتنەکانیش خۆیان دووبارە دەکەنەوە. بەشێک لەو بینەرانەی کە ڕەهەندی سیاسیی ڕووداوەکەیان بەلاوە مەبەست نەبوو، کوتومت وەکو من کە دوای چەندین ساڵ هەر وای بۆ چووبووم، ئەم دووبارە نیشاندانەوەیەی ئاهەنگەکەیان بە هەلێک زانیبوو بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی ئەو شەوەی قارس.

بەو جۆرە لە کاتێکدا بینەرانی قارس سەیری فوندا ئەسەریان دەکرد کە بەدەم لاساییکردنەوەی ژنە سەرۆکوەزیرێکی پێشووترەوە پێشوازیی لە کڕیارە ئەمەریکاییەکاییە دەکرد، یاخۆ دوای شۆخیکردن بە فیلمێکی ڕێکلام لە ناخەوە و بە کەیفخۆشی خۆی سوڕ دەدا، ئا لەو کاتەدا تیمێکی شارەزای سەر بە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش لە شەقامی خالید پاشا بەبێدەنگی هەڵیان کوتابووە سەر بارەگای لقی پارتی یەکسانیی گەلان. تاکە خزمەتکارێکی کورد کە لەوێ دەبێ، دەستگیر دەکەن و هەرچی کاغەز و دەفتەر و تۆماری ناو دۆلاب و کشاوەکانیشە، کۆی دەکەنەوە. هەمان ئەو ئۆتۆمبیلە تایە زنجیردارانەی پۆلیس دانە بە دانەی ئەندامانی لقی پارتەکە کە لە پەلامارەکانی دوێنێ شەودا دەستنیشانیان کردبوون، دەستگیر کردبوو و بە تاوانی جوداخوازی و نەتەوەپەرستیی کوردی دەست بە سەریان کردبوون.

ئەوانە کۆی هەموو کوردە نەتەوەپەرستەکانی قارس نەبوون. بەرەبەیانی زوو، تاکسییەکی سووتاوی مارکەی مورات لەسەر ڕێی دیگۆر، بەر لەوەی بەفر دایپۆشێ، سێ تەرمی لێ دەرهێنرابوو. - بەپێی زانیاریی هێزەکانی ئاسایش- کوژراوەکان سەر بە شانە چەکدارەکانی پەکەکە بوون. ئەم سێ لاوە کە چەند مانگێک لەوەوبەر هەوڵیان دابوو بێنە شارەوە، بە ڕووداوەکانی دوێنێ ئێوارێ شڵەژابوون، سواری تاکسییەک بووبوون و بڕیاریان دابوو ڕوو لە چیا بکەن. کاتێک بینیبویان بەفر ڕێگا و بانەکانی داپۆشیوە، ورەیان ڕووخابوو. لێیان بووبوو بە دەمەقاڵێ، یەکێکیان نارنجۆکێکی تەقاندبووەوە و هەموویان مردبوون. دایکی یەکێک لە کوژراوەکان کە لە

نەخۆشخانە کاری پاقژکردنەوەی دەکرد، لە وتەکانی لە بەردەم لێپرسراواندا گوتبووی کە چەند کەسێکی چەکداری نەناسراو لە دەرگایان داوە و کوڕەکەیان داوەتە پێش و لەگەڵ خۆیان بردووە. برا گەورەی شۆفێری تاکسییەکەیش گوتبووی کە براکەی نەک هەر نەتەوەپەرستی کورد نییە، بگرە کوردیش نییە. بەڵام وتەی هەردووکیان پشتگوێ خرابوو.

ڕاستییەکەی، کاتێک دوو تانک وەکو تارمایی بە شاردا سووڕابوونەوە، سەرجەم دانیشتووانی قارس زانیبوویان کە شۆڕشێک ڕووی داوە و هیچ نەبێ کۆمەڵێک ڕووداوی سەیر قەوماون. بەڵام لەبەرئەوەی هەموو شتەکان هاوزەمان لەگەڵ نیشاندانی نمایشێکدا لە تەلەفزیۆنەوە و هاوکات لەگەڵ بەفردا کە وەکو چیرۆکی ناو داستانە کۆنەکان، بێبڕانەوە لە بەردەم پەنجەرەکاندا دەباری، ڕوویان دابوو، هەست بە ترس نەدەکرا. تەنیا ئەوانە شپرزە بووبوون کە سەر و سەکوتیان لە سیاسەت دەخورا.

بۆ نموونە، ڕۆژنامەنووس و فۆلکلۆریست سەعدوڵا بەگ کە جێگای ڕێزی هەموو کوردەکانی قارس بوو، لەبەرئەوەی بەدرێژاییی ماوەی ژیانی چەند کودەتایەکی سەربازیی بینیبوو، هەر کە لە تەلەفزیۆنەوە گوێبیستی بڕیاری قەدەغەکردنی هاتوچۆ بووە، خۆی بۆ ڕۆژانی زیندان سازداوە کە پێی وابووە نزیک بووەتەوە. بیجامە نەخشینە شینەکانی کە بێ ئەوانە خەوی لێ نەدەکەوت، دەرمانی پرۆستاتەکەی و حەبی خەوەکانی، کڵاوە خورییەکەی و گۆرەوییەکانی، وێنەی کچەکەی ئەستەمبوڵی کە کچەزاکەی لە باوەشیدا پێ دەکەنی و کتێبێک کە بە هەزار دەردی سەری دەربارەی لاوکی کوردی نووسیبووی، نابووە دۆڵابەکەی. لەگەڵ ژنەکەیدا چایەکی خواردبووەوە و بەدەم سەیرکردنی قونبادانی فەندا ئەسەرەوە لە تەلەفزیۆندا، کەوتبووە چاوەڕووانی. کاتێک درەنگانێکی شەو لە دەرگا درابوو، ئەمماڵئاواییی لە ژنەکەی کردبوو، باوڵەکەی نابووە بن دەستی و دەرگای حەوشەی کردبووە، بەڵام کەسی نەبینیبوو. چووبووە کوچە بەفراوییەکە و لەبەر ڕووناکیی پڕ لە ئەفسوونی گڵۆپە ڕەنگ کبریتییەکاندا و بە سەرسامی لە ناو جوانیی کۆڵانە بێدەنگەکەدا، ئەوەی بیر کەوتبووەوە کە چۆن لە دەورانی منداڵیدا لە قوتابخانە پێڵاوەکانی لە



بەفردا نقووم دەبوون. لەو ساتەدا کەسانێکی نەناسراو ڕیزێک فیشەکیان نابوو بە سەر و سنگیەوە و کوشتبوویان.

بەوەدا کاتێک دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک بەفر توایەوە و تەرمی کۆمەڵێک کەسی تر دۆزرایەوە، دەرکەوت کە ئەو شەوە زنجیرەیەک تاوانی تریش ئەنجام دراوە. بەڵام منیش وەکو چاپەمەنیی خۆپارێزی قارس بۆ ئەوەی خوێنەرەکانم لەوە زیاتر غەمگین نەکەم، خۆم لە قەرەی باسکردنی ئەو ڕووداوانە نادەم. قسە و قسەڵۆکی سەبارەت بەوەی کە ئەم تاوانی "فاعیلی مەجهول"انە لەسەر دەستی ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی ئەنجام دراون، بەلانی کەمەوە بۆ ساتەکانی سەرەتای ئەو شەوە ڕاست نەبوون. ئەوان، ئەگەرچی درەنگیش بووبێ، دەستیان کردبوو بە شکاندنی تەلەفۆنەکان، پەلاماری تەلەفزیۆنی قارسیان دابوو و لەوە دڵنیا بووبوون کە وەشانی زیندوو پشتیوانی لە شۆڕشەکەیان دەکات. دەمەوبەیانیش غیرەتیان هێنابووە بەر خۆیان و هەوڵی دۆزینەوەی "دەنگبێژێکی دەنگگری سەرحەد"یان دابوو. بۆ ئەوەی شۆڕش لە شۆڕشێکی ڕاستەقینە بچێ، دەبوو لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا سروودی قارەمانی و گۆرانییەکانی سەرحەد بڵاو بکرێنەوە.

دوای پرسیارکردن لە سەربازگاکان، نەخۆشخانەکان، ئامادەییی زانستی سروشتی و چایخانەکانی دەمەوبەیانی، لەئاکامدا کابرای دەنگبێژیان لای پیاوانی ئێشکگری تیمەکانی ئاگرکوژێنەوە دۆزیبووەوە. کابرا سەرەتا وای زانیبوو دەستگیری دەکەن و تەنانەت بە خەیاڵیدا هاتبوو کە لەوانەیە لە پەنای دیوارێکدا گوللەبارانی بکەن، کەچی بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەوەوە دەمودەست بردبوویان بۆ ستۆدیۆ. کاتێک (کا) سەرلەبەیانی لە خەو هەستا، یەکەم شت کە بیستی دەنگی شاعیرانەی دەنگبێژەکە بوو کە لە تەلەفزیۆنەکەوە دەهات، دیوارەکان و تەنە گەچینەکان و پەردەکانی دەبڕی. ڕووناکیی بەفرەکە بە هێزێکی نائاسایی لە پەردە نیوەکراوەکەوە دەهاتە ژوورێ و لە بنمیچی بەرزی ژوورەکەی دەدا. زۆر باش خەوتبوو و ماندوێتیی بەتەواوی حەسابووەوە، بەڵام هێشتا لە پێخەوەکەی نەهاتبووە دەرێ کە لە هەناوی خۆیدا هەستی بەجۆرێک لە تاوانباری کرد و ئەم هەستەیش هێز و ورەی لەبەر بڕیبوو. وەکو میوانێکی ئاساییی هوتێل، چێژی لە بوونی خۆی لە

جێگایەکی تر و لە دەسشۆرێکی تر وەرگرت، دەموچاوی شۆری، تەراشی کرد، خۆی وشک کردەوە و جلەکانی پۆشی. کلیلی ژوورەکەی کە بە تەنێکی قورسی مسینەوە بەسترابوو، هەڵگرت و دابەزی بۆ هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکە.

بە بینینی دەنگبێژەکە لە تەلەفزیۆندا هەستی بە قوڵیی ئەو بێدەنگییە کرد کە باڵی بەسەر هوتێلەکە و شاردا کێشابوو. (ئەوانەی هۆڵی پێشوازی بە چرپە لەگەڵ یەکدیدا دەدوان.) هەموو ئەو شتانەی کە هۆشی لێی شاردبووەوە و وردەکارییەکانی ڕووداوەکانی دوێنێ شەوی باشتر بۆ دەرکەوت. زەردەخەنەیەکی ساردی بۆ لاوەکەی کارمەندی پرسگەکە کرد، وەکو ڕێبوارێکی بەپەلە کە ڕێ نەدات توندوتیژی و گومڕاییی سیاسی ژیانی خراپ بکات و نیازی نەبێ چیدی لەم شارەدا کات بە فیڕۆ بدات، دەسبەجێ ڕووی لە هۆڵی نانخواردنەکە کرد و داوای بەرچاییی کرد. لە گۆشەیەکدا قۆرییەکی خڕیلە نرابووە سەر سەماوەرێک، لە قاپێکیشدا پەنیری جنراوی قارس و لە جامێکدا هەندێک زەیتوونی ڕەنگ مردوو و ورشە لێبڕاوی بینی.

(کا) لەبەر مێزێکی بەردەم پەنجەرەکەدا دانیشت. بە سەرسامی نیگای بڕیە شەقامە بە بەفر داپۆشراوەکە کە لە پەردەکەوە هەموو جوانییەکەی دەردەکەوت. ڕووخسارێکی هێندە غەمگین بە شەقامە چۆڵ و ساردەکەوە بوو، بەجۆرێک (کا) یەکەبەیەکەی قەدەغە کردنەکانی هاتنە دەرەوەی دەورانی منداڵی و تافی لاویی خۆی کە تایبەت بوون بە سەرژمێریی گشتی و هەڵبژاردن و پشکنینە گشتییەکان و کودەتا سەربازییەکان کە هەموویانی لە دەوری ڕادیۆ کۆدەکردەوە، هاتەوە یاد. (کا) هێندەی ئاهەنگی شەوانی ڕەمەزان حەزی لەو ڕۆژانەی کو دەتای سەبازی دەکرد کە هەمووانی لە دەوری یەک بابەت کۆ دەکردەوە و پوورەکانی، مامەکانی و هاوسێکانی بەیەک دەگەیاند. بنەماڵەکانی چینی ناوەند و خانەدانەکانی ئەستەمبوڵ کە (کا) ژیانی دەورانی منداڵیی لە ناویاندا بەسەر بردبوو، دوای هەر کودەتایەکی سەربازی ژیانیان مسۆگەرتر دەبوو، بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕووی خۆپارێزییەوە خۆشحاڵیی خۆیان کەمێک بشارنەوە، بەبێدەنگی، بە ڕەفتارە بێ واتاکانی دوای هەر کودەتایەک پێ دەکەنین و دەرزی ئاژنیان دەکرد. (وەکو بە گەچ سپیکردنی هەموو شۆستەکانی ئەستەمبوڵ لە سەر شێوازی سەربازگاکان و ڕاگرتنی کەسانی سمێڵ درێژ و ڕیش



پان لە لایەن پۆلیس-سەربازەوە لە کوچەکان و بە زۆر ڕیش پێ تاشینیان.) بۆرژوا باڵاکانی تورکی ئەستەمبوڵ نشین لە لایەک تا بلێی لە سوپا دەترسان و لە لایەکی دی، لە ژێرەوە رقیان لەو کارمەندانە دەبووەوە کە ژیانیان لە چاوەڕوانیی موچە و لە نێو دیسپلیندا بەسەر دەبرد.

لە خوارەوەی ئەو شەقامەی کە شارێکی سەدان ساڵ لەمەوبەر چۆڵکراوی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ، ئۆتۆمبیلێکی سەربازی پەیدابوو. (کا)، وەکو لە منداڵییەوە کردبووی بە خوو، چاوی تێ بڕی. کابرایەک کە دەستێک جلی جامبازانەی لە بەردابوو و تازە خۆی بە ژووردا کرد، لەپڕێ باوەشی بە (کا)دا کرد و ڕوومەتەکانی ماچ کرد. "چاومان ڕوون ئەفەندی بەگ! خێری پێوە بێ بۆ نیشتمان و بۆ میللەت!"

(کا) بیری کەوتەوە کە دەوڵەمەندەکانی ناو کۆمەڵگا لە دوای هەر کودەتایەکی سەربازی، وەکو ئەوەی جەژن لە یەکدی پیرۆز بکەن، ئاوا پیرۆزباییان دەکرد. ئەویش وەکو کابرا بە منگە منگ شتێکی لە شێوەی "خێری پێوە بێ"ی گوت، بەڵام شەرمیشی بە خۆیدا هاتەوە.

دەرگای چێشتخانەکە کرایەوە و (کا) هەستی کرد لەپڕ هەموو خوێنی ڕووخساری مژراوە. ئیپەک لە دەرگاکەوە هاتە ژوورێ. چاویان بە چاوی یەک کەوت و (کا) بۆ ساتێک نەیزانی چی بکات. لە ناخەوە دەیویست هەستێتە سەرپێ، وەلێ ئیپەک زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و ڕووی لەو پیاوە کرد کە پێش کەمێک دانیشتبوو. سینییەکی بەدەستەوە بوو، فنجانێک و قاپێکی لەسەر بوو. ئیپەک وەکو گارسۆنێک فنجانەکە و قاپەکەی لەسەر مێزی کابرا دانا. جۆرێک لە ڕەشبینی و پەشیمانی و هەستکردن بە تاوان (کا)ی هەڵپێچایەوە: لەبەرئەوەی وەکو پێویست سڵاوی لە ئیپەک نەکردبوو، خۆی بە تاوانبار دەزانی، بەڵام ئەمە شتێکی تر بوو و یەکسەر حاڵی بوو کە ناتوانێ لە خۆیشی بشارێتەوە. هەموو شتەکان هەڵە بوون، هەموو ڕەفتارەکانی دوێنێی؛ ڕاوەستان لە بەردەمی ژنێکی بیانیدا و هێنانە ئاراوەی پێشنیازی زەماوەند، ماچ و موچ لەگەڵ ئەودا (باشە، ئەمەیان جوان بوو)، ئەو هەموو سەر سوڕانەوەیەی، گرتنی دەستی ئەو لەو کاتەدا کە هەموویان پێکەوە نانیان دەخوارد، لە هەمووی خراپتر، وەکو لاوانی ئاساییی تورک سەرخۆش بووبوو و بە

بەرچاوی هەمووانەوە و بێشەرمانە سەرسوڕمانی خۆی بۆ دەربڕیبوو. ئێستا لەبەرئەوەی نەیدەزانی چیی پێ بڵێ، ئاواتەخواز بوو ئیپەک تا هەتایە لە مێزەکەی ئەولا "گارسۆنی" بکات.

ئەو کابرایەی کە جلی جامبازانی پۆشیبوو، بەدەنگێکی قەبە هاواری کرد: "چای!" ئیپەک بە سینییە بەتاڵەکەی دەستییەوە و بەشێوەیەک کە لەسەری ڕاهاتبوو ڕووی لە سەماوەرەکە کرد. چای کابرای گەیاند و دواتر ڕووی لە مێزەکەی (کا) کرد. (کا) لە کونە لووتی خۆیدا هەستی بە بەرزبوونەوەی لێدانی دڵی کرد.

ئیپەک بەدەم خەندەوە گوتی: "چی ڕووی دا؟ باش خەوتی؟"

ئەم سۆزە کە بەرامبەر دوێنێ شەو و شادمانییەکانی دوێنێی نوێنرابوو، (کا)ی ترساند. بە زۆر لە خۆکردنەوە گوتی: "وا دیارە بەفرەکە نیازی نییە خۆشی بکاتەوە."

بەبێدەنگی نیگایان لە یەکدی بڕی. (کا) حاڵی بوو هیچی بۆ ناگوترێ و ئەگەر شتێکیش بڵێ، ئەوا زۆر لە خۆی دەکات. نقەی لە خۆی بڕی و نیشانیشی دا کە هەر ئەوەندەی لە دەست دێ، چاوی بڕیە ناو چاوە خومار و هەنگوینییەکانی. ئیپەک هەستی کرد کە باری دەروونیی (کا) بە بەراورد لەگەڵ دوێنێدا شتێکی ترە و تێ گەیشت ئێستا ئەو کەسێکی تەواو جیاوازە. (کا) هەستی کرد کە ئیپەک پەی بە تاریکاییی دەروونی ئەم بردووە و بگرە تێگەیشتنیشی بۆی هەیە. هەستیشی کرد ئەم تێگەیشتنە، بەدرێژاییی ژیان بەو ژنەوەی دەبەستێتەوە.

ئیپەک وردبینانە گوتی: "ئەم بەفرە هەر ئاوها درێژەی دەبێ."

(کا) گوتی: "نان نییە."

"ئا، داوای لێبووردن دەکەم." ئیپەک ئەمەی گوت و ڕووی لە گۆشەی سەماوەرەکە کرد، سینییەکەی دانا و دەستی کرد بە نان لەتکردن.

(کا) بۆیە داوای نانی کرد، چونکە لە بەرامبەر ڕەوشەکەدا خۆی بۆ ڕانەگیرابوو. ئێستا بە پۆزەوە و لە دواوە سەیری ژنەکەی دەکرد، وەکو ئەوەی بڵێ "لە ڕاستیدا منیش دەتوانم لەتی بکەم."

ئیپەک بلوزێکی لە خوری چنراوی سپی و ئەتەکێکی قاوەییی درێژی لەبەر کردبوو.



کەمەربەندێکی ئەستووریش کە تا حەفتاکانیش مۆدی مابوو و لەو کاتە بەدواوە کەس نەیدەبەست، لە پشت کردبوو. بەژنی زراڤ بوو، سمتەکانی چوست و سفت بوون، باڵای لەگەڵ باڵای (کا)دا دەگونجا، مەچەکەکانی دڵگیربوون بۆی. بڕوای وابوو کە ئەگەر لە قارسەوە نەیبات بۆ فرانکفورت، ئەوا تا لە ژیاندا ماوە دەبێ بە ئازارچێشتنەوە بیر لەوە بکاتەوە کە چۆن لێرە دەستی دەگرت، چۆن ماچی نیوە گاڵتە و نیوە ڕاستی دەکرد و چەند کامەران دەبوو کاتێک شۆخیی لەگەڵدا دەکرد.

کاتێک ئەو دەستەی ئیپەک کە نانەکەی پێ لەت دەکرد لە جووڵە کەوت، پێش ئەوەی خۆی وەرچەرخێنێ، (کا) سەری بۆ لای ئەو بادایەوە. ئیپەک گوتی: "پەنیر و زەیتوونیش دەخەمە سەر سینییەکەی ئێوە." (کا) حاڵی بوو کە ئیپەک بۆیە "ئێوە"ی گوت، بۆ ئەوەی بیری بخاتەوە کە لە هۆڵەکەدا بەتەنیا نین. (کا) بەهەمان تۆنی دەنگەوە گوتی: "بەڵێ، تکایە." ئەمەی گوت و ڕووی وەرگێڕایەوە بۆ لای ئەوانی تر. کاتێک نیگایان چووەوە سەر یەک، (کا) لە ڕووخساری ئیپەکدا ئەوەی بەدی کرد ژنەکە زۆر باش درکی پێ کردووە کە ئەم پێش کەمێک لە دواوە تەماشای کردووە. بیریشی کەوتەوە ئیپەک زۆر باش لە پێوەندیی ژن و پیاو و وردەکارییەکانی ئەو دیپلۆماسییەتە تێ دەگا کە ئەم هڕی لە بڕی ناکاتەوە و ئەمەش ترساندی. پێشتریش ترسی ئەوەی هەبوو ئیپەک تاکە شیمانەی بەختەوەریی ئەو بێ لە ژیاندا.

ئیپەک گوتی: "نانەکە پێش کەمێک ئۆتۆمبیلێکی سەربازی گەیاندی." بەو نیگا شیرینەی کە دڵی (کا)ی دەبڕی، بزەیەکی خستە سەر لێوی و گوتی: "زاهیدە خانم، لەبەر قەدەغە بوونی هاتوچۆ نەیتوانی بێ، بۆیە من سەروکاری چێشتخانەکە دەکەم... کە سەربازەکانم بینی، زۆر ترسام، چونکە دوور نەبوو بۆ دەستگیرکردنی خەندە یان قەدیفە هاتبن، تەنانەت باوکیشم..."

ئیپەک بە چرپە بە (کا)ی گوت: "کرێکارە ئێشکگرەکانی نەخۆشخانەیان بردووە بۆ سڕینەوەی پەڵە خوێنەکانی هۆڵی شانۆی گەل." بەرامبەر (کا) دانیشت.: "هێرشیان بردووەتە سەر هۆبەی زانکۆکان، قوتابخانەی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان و بارەگای پارتەکان..." لەو جێیانەش کوژراو هەبووە. بەسەدان کەس دەستگیر کراون، بەڵام لای بەیانی ئازاد کراون. ئەم شێوە چرپەدوانەی ئیپەک کە زیاتر تایبەتمەندیی

سەردەمەکانی پڕ لە گوشاری سیاسیی پێوە دیار بوو، بەسەرهاتی ئەو زۆرداری و ئەشکەنجانەی هێنایەوە بیری (کا) کە قوتابیانی زانکۆکان بیست ساڵ لەمەوبەر لە یانەکاندا بە چرپە، بەڵام هەم بە ڕق و غەمباری و هەم بە شانازییەوە باسیان دەکرد. ئەو سەردەمانە دەیویست بگەڕێتەوە ماڵەوە و دەست بکات بە کتێب خوێندنەوە بۆ ئەوەی لەبیری خۆی بباتەوە کە بە هەستی خۆ بەتاوانبارزانین و بە ڕەشبینییەوە لە تورکیا دەژی. ئێستایش ڕستەیەکی ئامادە کردبوو بەنیازی یارمەتیدان بۆ تەواوکردنی قسەکانی ئیپەک، بەڵام هەر جارێک نیازی دەربڕینی هەبوایە، هەستی دەکرد زۆر دەستکرد دەبێت، بۆیە دەیگێڕایە دواوە و بەدەم هەستکردن بە تاوانەوە نان و پەنیرەکەی دەخوارد. بەوجۆرە ئیپەک چرپاندی بە گوێیدا کە ئەو ئۆتۆمبیلانەی بۆ گوندە کوردییەکان بەڕێ کراون بۆ ئەوەی باوکانی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان بهێنن تاکو تەرمی کوڕەکانیان دەستنیشان بکەن، لە ڕێگا پەکیان کەوتووە. ماوەی ڕۆژێکیش دیاری کراوە بۆ ئەوانەی چەکیان هەیە تاکو ڕادەستی دەوڵەتی بکەن، خولەکانی فێربوونی قورئان و چالاکیی پارتە سیاسییەکان قەدەغە کراوە. (کا) سەیرێکی دەستەکانی، ناو چاوەکانی، پێستی جوانی لاملی درێژی و شۆڕبوونەوەی قژە کاڵەکەی بەسەر ملیدا کرد. ئایا دەیتوانی خۆشی بوێ؟ هەوڵی دا بۆ ساتێک ئەو دیمەنە بێنێتە بەرچاوی خۆی کە بە شەقامی کایزەردا لە فرانکفۆرت پیاسە دەکەن، لای ئێوارە دەچنە سینەما و شەویش بۆ ماڵەوە دەگەڕێنەوە، بەڵام ڕەشبینی بەخێرایی بە هەناویدا تەشەنەی دەکرد. سەرنجی چووە سەر ئیپەک کە چۆن نانەکانی بە گەورەیی لەت دەکرد، وەکو ئەوەی لە ماڵە هەژارەکاندا دەکرێ. لەوەیش خراپتر، وەکو لە ڕێستۆرانتە میللییەکاندا باوە، بە لەتە نانە گەورەکان پیرامیدی دروست دەکرد. (کا) وردبینانە گوتی: "تکایە ئێستا باسی شتی ترم بۆ بکە." ئیپەک لەوەدا بوو بۆی بگێڕێتەوە کەوا کەسێک لەبەرئەوەی هەواڵی لێ دراوە، لە کاتی تێپەڕبوونی بە باخچەی پشتەوەی دوو باڵەخانەی ئەولاتردا دەستگیر کراوە. لەپڕ بێدەنگ بوو.

(کا) لە چاوەکانیدا ترسێکی بینی: "دوێنێ زۆر کامەران بووم، دەزانی، دوای چەندین ساڵ ئەوە یەکەمجارم بوو شیعرم دەنووسی، بەڵام ئێستا بەرگەی ئەم



حەمکە بەسەرهاتە ناگرم."

ئیپەک گوتی: "شیعرەکەی دوێنێت زۆر جوان بوو."

"ئایا دەتوانی بەر لەوەی غەمباری هەموو جەستەم بگرێتەوە، یارمەتییەکەم بدەی؟"

"چی بکەم؟"

(کا) گوتی: "ئێستا دەچمە سەرەوە بۆ ژوورەکەم. پاش کەمێک وەرە و سەرم بخەرە نێوان لەپەکانتەوە. تۆزێک، زیاتر نا."

(کا) بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکات بە چاوە ترساوەکانی ئیپەکدا تێ گەیشت کە ئەمەی بۆ ناکات. هەستا و ڕۆیشت. بێگانە بوو بە (کا) و داوای شتێکی لێ کردبوو کە بێگانەیەک نەیدەتوانی لێی تێ بگات. بۆ ئەوەی کاردانەوەی ناوچاوانی ژنەکە نەبینێ، دەبوو هەر لەسەرەتاوە ئەم داخوازە قۆڕەی نەکردایە. کاتێک بە پلیکانەکاندا سەرکەوتە سەرەوە، ڕەخنەی لە خۆی گرت لە پای ئەوەی باوەڕی بە خۆی هێناوە کە ئیپەکی خۆش دەوێ. چووە ژوورەکەی، خۆی هاویشتە سەر چرپاکەی، سەرەتا بیری کردەوە کە بە هاتنی لە ئەستەمبوڵەوە بۆ قارس کارێکی چەند گەوجانەی کردووە، پاشان هاتنی خۆی لە فرانکفورتەوە بۆ ئەستەمبوڵ بە هەڵە زانی. دایکی کە بەنیازی ئەوەی کوڕەکەی ژیانێکی ئاسایی بەسەر بەرێ، بیست ساڵ لەمەوبەر لە شیعر و ئەدەب دووری دەخستەوە، گەلۆ دەبوایە ئێستا چی بگوتبا ئەگەر بیزانیبا کە بەختەوەریی کوڕە چل و دوو ساڵانەکەی بە ژنێکەوە بەستراوەتەوە کە لە قارس"چێشتخانەیەک بەڕێوە دەبات" و نانەکان بە گەورەیی لەت دەکات؟ ئەی دەبوو بابی چی گوتبا ئەگەر بیزانیبا کوڕەکەی لە بەردەم شێخی گوندێکی دەوروبەری قارسدا بە چۆکدا هاتووە و بە چاوی پڕ لە گریانەوە باسی لە باوەڕهێنان بە خودا کردووە؟ کلووە گەورە و غەمگینەکانی بەفر کە لە دەرەوە دەستی بە بارین کردبووەوە، هێدی هێدی بە بەردەم پەنجەرەکەدا تێ دەپەڕین.

لە دەرگا درا. (کا) لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی و بەئومێدەوە کردیەوە. ئیپەک بوو، بەڵام ئاماژەیەکی تەواو جیاواز بە ڕووخسارییەوە دیار بوو: گوتی کە ئۆتۆمبیلێکی سەربازی هاتووە، دوو کەسی تێدایە، یەکێکیان سەربازە و پرسیاری (کا)یان

کردووە. ئەمیش پێی گوتبوون کە بە (کا) دەڵێ بە دوایدا هاتوون.

(کا) گوتی: "باشە."

ئیپەک گوتی: "ئەگەر دەتەوێ با دوو خولەک سەرت بشێلم."

(کا) ڕای کێشایە ژوورەوە، دەرگای داخست، ماچێکی لێ ئەستاند و لە قەراغ پێخەوەکە دای نیشاند. خۆیشی لەسەر جێگاکە ڕاکشا و سەری خستە باوەشی ئەوەوە. بەوجۆرە ساتێک بەبێدەنگی مانەوە و لە پەنجەرەکەوە سەیری پۆلێک قەلەڕەشیان کرد کە لە بەفری سەر گوێسوانەی باڵەخانە سەد و دە ساڵانەکەی شارەوانیدا بە دەوری یەکتردا دەخوولانەوە.

(کا) گوتی: تەواو، بەسە، زۆر سوپاست دەکەم." لەسەرخۆ پاڵتۆکەی لە بزماری پشت دەرگاکە کردەوە و چووە دەرەوە. کاتێک بە پلیکانەکاندا دەچووە خوارێ بۆنێکی پاڵتۆکەی کرد، فرانکفۆرتی بیر کەوتەوە و بۆ ساتێک تاسەی ژیانی خۆی لە ئەڵمانیا بە هەموو ڕەنگەکانیەوە کرد. لە بازاڕی کاوفهۆف کە ئەم پاڵتۆکەی لێ کڕیبوو، فرۆشیارێکی قژ زەرد و چاوشین هەبوو کە لە ڕۆژی کڕینی پاڵتۆکەدا یارمەتیی دابوو. دوو ڕۆژ دواتریش کە بۆ کورتکردنەوەی پاڵتۆکە چوو بوو، دیسان بینیبووی. فرۆشیارە ئەڵمانەکە ناوی هانز هانزن بوو. (کا) هاتەوە بیری کە دوێنێ شەو لە کاتی بێداربوونەوەیدا بیری لەو کردووەتەوە. لەوانەیشە لەبەرئەوە بووبێ کە ناوەکە ئەڵمانییەکی تۆخە و خاوەنەکەیشی قژزەرد و چاوشینە.



## ٢١

## بەڵام هیچ کامێکیان ناناسم

### (کا) لە ژوورە نسرم و ترسناکەکاندا

بارهەڵگرێکی لە جۆری -ژەمسێ- کە تەنانەت لەو دەورانەدا لە تورکیاش بە کەمی بەکار دەهێنرا، بەدوای (کا)دا نێردرابوو. پیاوێکی گەنجی سەرنجڕاکێش کە لووتی لە تەورداس دەچوو و دەستێک جلی سڤیلی لەبەردابوو، لە پرسگەی هۆتێلەکە بە پیر (کا)وە هات و دواتر بردی لە ناوەڕاستی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەدا دای نیشاند. خۆیشی لە تەنیشتیەوە، لای دەرگاکەوە، وەکو ئەوەی بیەوێ ڕێ لە (کا) بگرێ نەبادا دەرگاکە بکاتەوە هەڵبێ، دانیشت. بەڵام زۆر بە ڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ (کا)دا دەکرد و بە "ئەفەندم" دەیدواند. (کا)، بەمەدا بۆی دەرکەوت کە کابرا پۆلیسی سڤیل نییە، بەڵکو ئەفسەرێکی سەر بە دەزگای هەواڵگریی میللی -میت-ە. ئەنجامێکی وایشی هەڵهێنجا کە ڕەفتاری خراپی لە تەکدا نانوێنن.

هێدی هێدی بە کوچە چۆڵ و هۆڵ و سادە و سپییەکانی شاردا تێ پەڕین. لەبەرئەوەی شوێنی دانیشتنی شۆفێرەکە کە ئۆتۆمبێلە سەربازییەکەی بە چەند دانەیەک دەرزیی لە کارکەوتوو خەمڵاندبوو، تا ڕادەیەک بەرز بوو، (کا) توانی لە میانەی پەنجەرە تاک و تەرا کراوەکانەوە ناوەوەی چەند ماڵێک ببینێ. لە هەموو شوێنێک تەلەفزیۆنەکان داگیرسابوون، بەڵام سەرجەم قارسییەکان پەردەیان دادابووە و خۆیان خزاندبووە کونی ماڵەوە. (کا) هەستێکی وای لا چێ بوو وەکو ئەوەی بە شەقامەکانی شارێکی تەواو جیاوازدا بازۆن، بەهۆی کاریگەریی جوانیی دار زەیتوونە ڕووسییە بە بەفر داپۆشراوەکان، کەونە ماڵانی ڕووسیی بنیادنراو لەسەر شێوازی بیناسازیی باڵتیک و جوانیی ئەو شەقامانەی کە لە پشت فلّچەی ئۆتۆمبێلەکەوە دەردەکەوتن کە بە ئاستەم فریای سڕینەوەی بەفرەکە دەکەوت، (کا) پێی وابوو شۆفێرەکە و کابرای لووت تەورداس گەورەتر لە قەوارەی خۆیان دەنوێنن.

لە بەردەم بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشدا ڕاوەستان و لەبەرئەوەی لە ئۆتۆمبیلەکەدا سەرمایەکی باشیان بووبوو، بەپەلە خۆیان کرد بە ژوورەوەدا. بە بەراورد لەگەڵ دوێنێدا، ژوورەوە هێندە قەرەباڵەغ و جەنجاڵ بوو، بەجۆرێک (کا)، سەرباری ئەوەی پێشوەختیش پێشبینیی دۆخەکەی کردبوو، کەچی ترسی لێ نیشت. هاتوچۆ و پەرش و بڵاوییەکی سەیری تایبەت بەو جێیانە بەدی دەکرا کە ژمارەیەکی زۆر تورک پێکەوە کاری تێدا دەکەن. (کا) بەو دیمەنانەدا، ڕێڕەوی دادگاکان، دەروازەی یاریگاکانی تۆپی پێ و گەراجەکانی ڕاوەستانی پاسی بیر کەوتەوە. لە شوێنەکەدا بۆنێکی توندی مردن دەهات، بۆنێکی لە جۆری بۆنی ئەو بۆیاغی یۆدەی کە لە نەخۆشخانە بۆندارەکاندا هەستی پێ دەکرێ. بیری ئەوەی کەسێک لە نزیکەوە ئەشکەنجە درابێ، لە شێوەی هەستی تاوانباری و ترسدا ڕۆحی داپۆشی.

لەگەڵ سەرکەوتنیدا بەو پلیکانانەدا کە دوێنێ ئێوارە لەگەڵ موختاردا پیایدا سەرکەوتبوون، خۆبەخۆ هەوڵی دا ڕەفتار و لە خۆ ڕازیبوونی کەسانی دەستڕۆیشتووی شوێنەکە بپەژرێنێ. لە دەرگا کراوەکانەوە گوێی لە کرتەکرتی داکتیلۆ، قسەی پڕ لە هاواری بێتەلەکان و بانگکردنی چایچییەکە بوو کە لە پلیکانەکانەوە هاواری بەسەردا دەکرا و داوای چای لێ دەکرا. کۆمەڵێک لاوی بینی کە بە کەلەپچە پێکەوە بەسترابوونەوە و لەسەر کورسیی بەردەم دەرگاکان لە چاوەڕووانی لێپرسینەوەدا دانرابوون. (کا) تێ کۆشا چاو نەبڕێتە چاویان.

بردیانە ژوورێکی هاوشێوەی ئەوەی کە دوێنێ لەگەڵ موختاردا تیایدا دانیشتبوون. سەرباری ئەوەی گوتبووی کە ڕووخساری بکوژی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی نەبینیوە و دوێنێش لە ناو وێنەکاندا بکوژەکەی بۆ دەستنیشان نەکرابوو، پێیان گوت بەڵکو ئەمڕۆ بکوژەکە لە ناو ئەو قوتابییە ئیسلامییانەدا دەستنیشان بکات کە لە نهۆمی ژێرەوەدا دەستبەسەرن. (کا) لەمەوە حاڵی بوو کە پۆلیس لە دوای "شۆڕش"ەکەوە کەوتووەتە ژێر کۆنترۆڵی میت-ەوە و بۆی ڕوون بووەوە کە لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا ناکۆکی هەیە.

کارمەندێکی دەموچاو خڕیلەی ئاسایش لە (کا)ی پرسی کە دوێنێ دەوروبەری سەعات چوار لە کوێ بووە.



ڕووخساری (کا) لەپڕ ڕەنگێکی خۆڵەمێشیی لێ نیشت، خەریک بوو بڵێ: "پێیان گوتبووم خراپ نابێت ئەگەر سەرێک لە شێخ سەعادەدین ئەفەندیش بدەم." کابرای دەموچاو خڕیلە قسەکەی پێ بڕی و گوتی: "نەخێر، پێش ئەوە؟"

کاتێک (کا) بێدەنگ بوو، کابرا بیری خستەوە کە چاوی بە شینە کەوتووە. کابرا هەر لە سەرەتاوە هەموو شتێکی دەزانی، بەڵام دەیویست بەو ڕەفتارانە (کا) شەرمەزار بکات و ئازاری پێ بگەیەنێ. (کا) تێ کۆشا لەم ڕەفتارەیشدا جۆرێک لە نیازپاکی بەدی بکات. ئەگەر کابرا کۆمیسەرێکی ئاسایی پۆلیس بوایە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە (کا) دیدارەکەی خۆی لەگەڵ شینەدا پەردەپۆش کردووە، بەدەم لووت خوراندنەوە دەیگوت کە پۆلیس بە هەموو شتێک دەزانێ و بە توندی مەسەلەکەی بە ڕوویدا دەدایەوە. کارمەندە دەموچاو خڕیلەکەی ئاسایش بە ڕیتمێک کە بۆنی (خۆتان سەلامەت بن)ی لێ دەهات، باسی ئەوەی کرد کە شینە تیرۆریستێکی بێبەزەیی، ئاژاوەگێڕ و دوژمنێکی گەورەی سوێندخواردووی دژ بە کۆمارە کە لە لایەن ئێرانەوە بەکاردەهێنرێ. کوشتنی بێژەرێکی تەلەفزیۆنی بەسەردا ساغ بووەتەوە و لەبەرئەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە. بەهەموو تورکیادا دەسووڕێتەوە و شەریعەتخوازان ڕێک دەخات. "کێ ئێوەی گەیاندە لای ئەو؟"

(کا) گوتی: "قوتابییەکی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە ناوەکەی نازانم."

کارمەندە دەموچاو خڕیلەکەی ئاسایش گوتی: "ئێستا هەوڵ بدەن ئەو کەسە دەستنیشان بکەن، بەوردی سەیر بکەن. لە پەنجەرەی چاودێریی سەر دەرگای ژوورەکانەوە تەماشا دەکەن. مەترسن، ئەوان ئێوە ناناسنەوە."

(کا)یان بە پلیکانەیەکی پان و بەریندا بردە خوارێ. بەر لە سەد و ئەوەندە ساڵ، کاتێک ئەم باڵەخانە باریک و درێژە نەخۆشخانەیەکی سەر بە وەقفێکی ئەرمەنی بوو، ئەم شوێنە وەکو کۆگای ئازووقە و جێی حەوانەوەی کارمەندەکان کەڵکی لێ وەردەگیرا. دواترێ، کاتێک باڵەخانەکە گۆڕدرا بۆ ئامادەییی دەوڵەت، دیوارەکانی ناوەوە ڕووخێنرابوون و ئێرە کرابوو بە هۆڵی خواردن. ژمارەیەکی زۆر لە لاوانی قارس، لە ساڵانی دواتری تەمەنیاندا بووبوون بە کۆمۆنیستی دوژمن بە ڕۆژئاوا، لە

ساڵانی ١٩٦٠دا، کاتێک لە ژیانیاندا یەکەمین حەپی ڕۆنی ماسییان لەگەڵ ماستاوی شیری وشکدا قوت دابوو (هەردووکیان لە لایەن –یونسێف–ەوە نێردرابوون)، بە بۆنی پیسی حەپەکان گەدەیان شێوابوو بەسەر یەکدا و لەبەرئەوە بۆ ئێرە گوێزرابوونەوە. ئەم ژێر زەمینە فراوانە، ئێستا کراوە بە چواردە ژوور کە بەسەر ڕێڕەوێکدا دەڕوانن.

پۆلیسێک کە بە هەڵسوکەوتیدا دیار بوو پێشتر ئەو کارەی زۆر ئەنجام دابێ، کڵاوی ئەفسەرێکی سەربازیی نایە سەری (کا). کارمەندە لووت تەورداسەکەی ئاسایش کە (کا)ی لە هوتێلەکەوە هێنابوو، وەکو کەسێک کە لە بواری خۆیدا زۆر شارەزا بێ، گوتی: "ئەمانە زۆر لە کڵاوی ئەفسەر دەترسن."

لەگەڵ نزیکبوونەوەیاندا لە یەکەم دەرگای دەستەڕاست، پۆلیسەکە بە جووڵەیەکی زۆر دڵڕەقانە پەنجەرەی سەر دەرگا ئاسنینەکەی ژوورەکەی کردەوە و هەتا هێزی تێدابوو، نەڕاندی: "وریا بن، کۆمیتان هات!" (کا) لە پەنجەرەکەوە کە هێندەی ناو لەپێکی دەست دەبوو، سەیرێکی ناوەوەی کرد. لە ژوورەکەدا کە شتێک لە یاتاخێک فراوانتر بوو پێنج کەسی بینی. لەوانەیە زیاتریش بووبن: چونکە بەسەر یەکەوە بوون. هەموویان خۆیان خزاندبووە پاڵ دیوارە قرێژەکەی بەرامبەر و پاڵیان پێوە دابوو. لەبەرئەوەی سەربازییان نەکردبوو بە شێوەیەکی نەزانانە لە حاڵەتی سڵاوقوچی سەربازیدا ڕاوەستابوون. وەکو پێشتر فێرکرابوون، چاویان نووقاندبوو. ((کا) هەستی کرد کە هەندێکیان لە ژێر پێلووە نیوە داخراوەکانیانەوە سەیری ئەم دەکەن.) سەرباری ئەوەی تەنیا یازدە سەعات بەسەر "شۆڕش"ەکەدا تێ پەڕیبوو، کەچی سەری هەموویان سفرکرابوو و هێندەیان تێهەڵدان خواردبوو، هەموو دەموچاویان شین هەڵگەڕابوو. ناوەوەی ژوورەکە لە ڕێڕەوەکە ڕووناکتر بوو، بەڵام هەموویان بەلای (کا)وە لە یەکتر دەچوون. دامابوو: جۆرێک لە بەزەیی و ترس و شەرم هەناوی داپۆشی. شادمان بوو بە نەبینینی نەجیب لە نێو دەستگیرکراوەکاندا.

کاتێک لە پەنجەرەی دووەم و سێیەمیشەوە کەسی بۆ دەستنیشان نەکرا، کارمەندە لووت تەورداسەکەی ئاسایش گوتی: "هیچ هۆیەک نییە بۆ ترساندنتان، ئاشکرایە هەر



ئەوەندەی ڕێگا و بانەکان کرانەوە، ئێوە ئێرە بەجێ دەهێڵن."

(کا) بە سووکە کەڵلەڕەقییەکەوە گوتی: "بەڵام هیچ کامێکیان ناناسم." بەڵام پاش کەمێک چەند کەسێکی لێ ناسینەوە: زۆر بە باشی هاتەوە بیری یەکێکیان ئەو کەسەیە کە جنێوی بە فوندا ئەسەری سەر شانۆ دەدا. یەکێکی تریشیان ئەوە بوو کە پەیتاپەیتا دروشمی دەگوتەوە. ماوەیەک بیری کردەوە کە ئەگەر هەواڵ لەمانە بدات، ئەوا دەیسەلمێنێ کە نیازی هەبووە هاوکاری پۆلیس بکات. دەیشیتوانی لە کاتی ڕووبەڕووکردنەوەدا نەجیب فەرامۆش بکات، (چونکە هەر چۆنێک بوو تاوانی لاوەکان هێندە گەورە نەبوو.)

لەگەڵ ئەوەیشدا هەواڵی لە کەس نەدا. لاوێکی دەموچاو خوێناوی لە یەکێک لە ژوورەکاندا بە پاڕانەوەوە بە (کا)ی گوت: "کۆمیتانم، تکام وایە دەستوور بدەن کەس هەواڵ بە دایکم نەگەیەنێ."

بە ئەگەری زۆر، لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشەکەدا ئامێر بەکار نەهێنرابوو، بەڵکو ئەو لاوانە بە مستەکۆڵە و شەق دارکاری کرابوون. (کا) لە دوایین ژووریشدا کەسێکی نەبینی شێوەی بچێتەوە سەر ئەو کەسەی کە تەقەی لە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە کردبوو. زۆریش ئاسوودە بوو بەوەی کە نەجیب لێرە لە ناو لاوە زراوڕژاوەکاندا نەبوو.

لە نهۆمی سەرەوە تێ گەیشت کە کابرای دەموچاو خڕیلە و هەموو ئەوانەی فەرمانی پێ دەدەن، سوورن لەسەر ئەوەی بە زووترین کات بکوژی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە دەستگیر بکرێ و چالاکییەکە وەکو سەرکەوتنێکی شۆڕشەکە بە خەڵکی قارس بفرۆشنەوە و ئەگەریش پێویست بکات دەسبەجێ لە سێدارە بدرێ. نەقیبێکی خانەنشینیش هاتبووە ژوورەکە. کابرا کە سەرباری قەدەغەی هاتوچۆ ڕێگایەکی دۆزیبووە و خۆی گەیاندبووە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش، دەیویست برازا دەستگیرکراوەی ئازاد بکەن. تکای وابوو خزمە لاوەکەی بە ئەشکەنجەدان (بە کۆمەڵگا نامۆ نەکرێ). گوتیشی کە دایکە هەژارەکەی ئەم منداڵە لە ئاکامی بڕواهێنانی بەو درۆیەی کە گوایە دەوڵەت پاڵتۆ و چاکەتی خووری بەخۆڕایی بەسەر قوتابیاندا دەبەخشێتەوە، کوڕەکەی لە ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان

ناونووس کردووە، ئەگەر نا، ئەوانە هەر بە خێزان کۆماریخواز و ئەتاتورکچین. کابرای دەموچاو خڕیلە قسەی بە ئەفسەرە خانەنشینکراوەکە بڕی و گوتی: "نەقیبم، لێرە ڕەفتاری خراپ لەگەڵ کەسدا ناکرێ." (کا)ی ڕاکێشایە لاوە: لەوانەیە بکوژ و پیاوەکانی شینە ((کا) درکی بەوە کرد کە کابرا پێی وایە ئەو دووانە هەمان کەس بن) لە نێوان ئەو قوتابییانەدا بن کە لەسەرەوە لە کۆلیژی پزیشکیی ڤێتەرنەری ڕاگیراون.

بەوجۆرە لەگەڵ کابرای لووت تەورداسدا کە (کا)ی لە هوتێلەکەوە هێنابوو سواری هەمان ئۆتۆمبیلی سەربازی بوونەوە. (کا) بەدرێژایی ڕێگا هێندە بە بینینی جوانیی شەقامەکان و بە ڕزگابوونی لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش کامەران بوو، بەجۆرێک ئارەزووی چووە سەر کێشانی جگەرەیەک. لایەکی هۆشی پێی دەگوت کە کودەتای سەربازی ڕووی داوە و لە ژێریشەوە دڵخۆش بوو بەوەی کە وڵات نەکەوتووەتە دەستی ئیسلامییەکان، بۆیە سوێندی خوارد بۆ ئاسوودەکردنی ویژدانی خۆی، هاوکاری لەگەڵ پۆلیس و سوپادا نەکات. دواتر هێندە بەهێز و گەشبینانە سروشی شیعرێکی بۆ هات کە پاڵی پێوە نا لە کابرای لووت تەورداسی میت بپرسێ: "ئایا دەکرێ لە چایخانەیەک ڕابووەستین و چایەک بخۆینەوە؟"

زۆربەی چایخانەکانی بێکاران کە ژمارەیان لە شاردا یەکجار زۆر بوون، داخرابوون. بەڵام لە شەقامی کەناڵ چایخانەیەکی کراوەیان بینی کە ڕاگرتنی ئۆتۆمبیلێکی سەربازی لە تەنیشتییەوە سەرنجی ڕانەدەکێشا. جگە لە شاگردێکی منداڵکارە، سێ لاویش لە گۆشەیەکەوە دانیشتبوون و چاوەڕێی کۆتایی هاتنی قەدەغەی هاتوچۆیان دەکرد. بە بینینی هاتنە ژوورەوەی دووکەس کە یەکێکیان کڵاوی سەربازیی لە سەردا بوو و ئەویتریان سڤیل بوو، شڵەژان.

کابرای لووت تەورداس دەسبەجێ دەمانچەکەی لە پاڵتۆکەی دەرهێنا و بە شێوەیەکی پیشەیی ئەوتۆ کە بووە مایەی ڕێزنیشاندانی (کا)، لاوەکانی دایە پاڵ دیوارێک کە دیمەنێکی گەورەی سویسرای بەسەرەوە بوو، لەشیانی پشکنی و ناسنامەکانی لێ وەرگرتن. (کا) کاتێک هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە شتێکی ئەوتۆ ناقەومێ، لەسەر کورسییەکی تەنیشت سۆپا کوژاوەکەوە دانیشت و زۆر بە



ئاسوودەیی شیعرەکەی نووسی.

خاڵی دەسپێکی شیعرەکەی کە دواتر سەردێری (کوچەکانی خەون)ی پێ بەخشی، کوچە بەفراوییەکانی قارس بوو، بەڵام لەو سی و شەش بەیتەدا، زۆر شت سەبارەت بە شەقامە کۆنەکانی ئەستەمبوڵ، شاری خەیاڵی -ئانی-ی پاشماوەی ئەرمەنییەکان و ئەو شارە چۆڵ و ترساو و دڵگیرانە هەبوو کە (کا) لە خەوندا دەیبینین.

(کا) لە نووسینەوەی شیعرەکەی بووەوە، بینی وا لە تەلەفزیۆنە ڕەش و سپییەکەدا، نیشاندانی شۆڕشەکەی هۆڵی شانۆی گەل جێی دەنگبێژەکەی لای بەیانی گرتووەتەوە. بەو پێیەی ڤوراڵی گۆڵچی تازە دەستی کردبوو بە گێڕانەوەی ماجەرای مێبازییەکانی و ئەو گۆڵانەی کە خواردبوونی، (کا) دەیتوانی دوای بیست خولەکی تر خۆی لە تەلەفزیۆندا ببینێ کە شیعر دەخوێنێتەوە. هەر لەو کاتەدا دەیویست ئەو شیعرەی بیر بکەوێتەوە کە لەبیری کردبوو و لە دەفتەرەکەیدا نەینووسیبووەوە.

چوار کەسی تریش لە دەرگای پشتەوە خۆیان کرد بە چایخانەکەدا، کارمەندە لووت تەورداسەکەی میت دەمانچەی لەوانیش هەڵکێشا و پاڵی دان بە دیوارەکەوە. کوردەکەی هەڵسوڕێنەری چایخانەکە بە (کۆمیتانم) ڕووی لە کابرای لووت تەورداس کرد و پێی گوت کە ئەوانە یاسای قەدەغەکردنی هاتوچۆیان پێشێل نەکردووە، چونکە لە باخچەی حەوشەکەوە هاتوونەتە ژوورەوە.

کارمەندەکەی میت بڕیاری دا لە ڕاستیی ئەو قسەیە بکۆڵێتەوە. یەکێک لە پیاوەکان ناسنامەی پێ نەبوو و لە ترساندا هەڵدەلەرزی. کارمەندەکەی میت داوای لێ کرد ئەم بەهەمان ڕێگادا بگەیەنێتە ماڵی خۆیان. شۆفێرەکەی بانگ کرد و لاوەکانی پاڵ دیوارەکەی ڕادەستی ئەو کرد. (کا)یش دەفتەری شیعرەکەی نایە باخەڵی و کەوتە دوایان. لە دەرگای پشتەوە چوونە حەوشێکی بە بەفر داپۆشراو و شەختەبەندەوە، بەسەر دیوارێکی نزمدا پەڕینەوە و بە سێ پلیکانەی شەختەبەستوودا چوونە خوارێ. بەناو وەڕینی سەگێکی بە زنجیر بەستراوەدا چوونە ژێرزەمینێکی چیمەنتۆیی کە وەکو زۆربەی ژێرزەمینەکانی تری قارس بێ ڕەنگ و بێ کەڵک بوو. شوێنەکە بۆنێکی پیسی خەڵووز و خەوی لێ دەهات. کابرا چووە پێشەوە و خۆی کرد بە گۆشەیەکدا کە لە تەنیشت مەنجەڵێکی گەورەی

ویزەویزکەری شۆفاژەوە دروست کرابوو: (کا) لە ناو جێگایەکی پەرپووتدا ژنێکی پێست سپی و زۆر شۆخی بینی، خۆبەخۆ سەری سوڕاند. لەو کاتەدا کابرای بێ ناسنامە پاسەپۆرتێکی دایە دەست کارمەندە لووت تەورداسەکەی میتەوە. (کا) لەبەر ویزەویزی مەنجەڵە گەورەکە نەیتوانی گوێی لە گفتوگۆی نێوانیان بێت، بەڵام چاوی پێوە بوو کابرا لە نیمچە تاریکییەکدا پاسەپۆرتێکی تریشی دەرهێنا.

ئەمانە ژن و پیاوێکی گورجی بوون کە بۆ کارکردن و پارە پەیداکردن هاتبوونە تورکیا. گەڕانەوە بۆ چایخانەکە، کارمەندەکەی میت ناسنامەی لاوەکانی گەڕاندەوە. لاوەکان دەسبەجێ دەستیان کرد بە گازندە لە دژی ژن و پیاوەکە: ژنەکە وەرەمی هەیە، بەڵام لەشفرۆشی دەکات. دەچێتە شار و لەگەڵ خاوەن کارگەکانی شیرەمەنی و بازرگانەکانی پێستەدا دەنوێ. پیاوەکەیشی، لەبەرئەوەی ئامادەیە وەکو هەر گورجییەکی تر بە نیوەکرێ کار بکات، ئەگەر چل ساڵ جارێکیش کارێک لە بازاڕدا پەیدا بێ، ئەوا ئەم لە دەستی هاووڵاتیانی تورکی دەردەهێنێ. ئەمانە هەژار و دەستگرتوون و پارەی هوتێلیان بۆ نادرێ، مانگی پێنج دۆلاری ئەمەریکی دەخەنە مستی کارمەندێکی بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری ئاو و ئەویش مۆڵەتی پێ داون لەم ژێرزەمینی مەنجەڵە ئاوەدا بژین. بە قسەی خۆیان بێ، لە گەڕانەوەیاندا بۆ وڵاتەکەیان، خانوویەک دەکڕن و تا لە ژیاندا ماون، کار ناکەن. کارتۆنەکانیش پڕن لە شتومەکی لە چەرم دروستکراو کە لێرە بە هەرزان کڕیویانە و لە گەڕانەوەیاندا، لە تفلیس بە نرخێکی گرانتر دەیفرۆشنەوە. تا ئێستا دووجار سنووربەدەر کراون، بەڵام دیسان چارەیان دۆزیوەتەوە و بۆ "ماڵەکەیان" ژێرزەمینەکە گەڕاونەتەوە. ئەم میکرۆبانە کە پۆلیسە بەرتیلخۆرەکان بۆیان پاک ناکرێتەوە، دەبێ دەسەڵاتی سەربازی پاکیان بکاتەوە.

لاوە بێکار و بێ هێزەکان، بەوجۆرە بە نواندنی سوپاسی زۆر لە خاوەن چایخانەکە کە چای پێشکەش کردبوون، کەوتنە چا خواردنەوە و پشت ئەستوور بە کارمەندە لووت تەورداسەکەی میت، چەندین قسە و قسەلۆکیان سەبارەت بە هیوا و چاوەڕوانییەکانی خۆیان لە کودەتای سەربازی و دەربارەی گازندەی خۆیان دژ بە سیاسەتمەدارانی ڕزیو لەسەر شێوەی هەواڵ گێڕایەوە: باسی ئەو دەوروبەرانەیان



کرد کە قاچاخچێتیی ئاژەڵ دەکەن، ئەو فڕ و فێڵانەی کە لە کۆگاکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا ڕوودەدەن، ئەوانەی کە بە ئۆتۆمبیلی گۆشت گواستنەوە لە ئەرمەنستانەوە کرێکاری نایاسایی بۆ تورکیا دێنن، چونکە بە نیوەکرێ کار دەکەن، لە کولانە و کەپردا دەیانخەوێنن و تەواوی ڕۆژ کاریان پێ دەکەن و لە ئاکامیشدا پارەیان نادەنێ... وێ دەچوو ئەو لاوانە لەوە گێلتر بوون درک بکەن کە "کودەتا سەربازییەکە" لەدژی "ئیسلامییەکان" کە لە بردنەوەی هەڵبژاردنەکانی شارەوانی نزیک کەوتبوونەوە و لەدژی کوردە نەتەوەپەرستەکان بەرپا کراوە. ئەوان وا ڕەفتاریان دەکرد وەکو ئەوەی ئەو پێشهاتانەی لە دوێنێوە لە قارس دەقەومێن، هەمووی بۆ نەهێشتنی بێکاری و بێڕەوشتییە لە شاردا و لە پێناوی دابینکردنی کاردایە بۆ ئەمان. (کا) لە ئۆتۆمبیلە سەربازییەکەدا کارمەندە لووت تەورداسەکەی میتی بینی کە پاسپۆرتی ژنە گورجییەکەی دەرهێنا و سەیری وێنەکەی کرد. لەوەوە هەستی بە خرۆشان و شەرمێکی سەیر کرد.

(کا)، کاتێک پێی نایە ناو باڵەخانەی کۆلێژی پزیشکیی ڤێتەرنەری، دەسبەجێ حاڵی بوو ڕەوشی ئێرە زۆر لەوە خراپترە کە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش بینیبووی. کاتێک بە ڕێڕەوەکانی ئەم باڵەخانە ساردەدا تێ پەڕی، یەکسەر تێ گەیشت کەس لێرە کاتی ئەوەی نییە بەزەییی بەوانی تردا بێتەوە. نەتەوەپەرستەکان، ئەو تیرۆریستە چەپانەی کە لێرە و لەوێ بۆمبایان تەقاندبووەوە و بەیاننامەیان بڵاوکردبووە و زۆربەی ئەوانەی کە لە تۆمارەکانی میتدا وەکو هاوکار تۆمار کرابوون، هێنرابوونە ئەم شوێنە. پۆلیس و سوپا و سەردۆزگەر شێوازی زۆر توند و بێبەزەییانەیان بەکار دەهێنا بۆ لێکۆڵینەوە سەبارەت بە چالاکیی هاوبەشی ئەو دوو دەستەیە، لەمەڕ ئەوانەی هاوکاریی گەریلا کوردەکانیان کردبوو لە هەوڵیاندا بۆ دزەکردنە ناو شارەوە، هەروەها دەربارەی ئیسلامییە سیاسییەکان کە گومانی چالاکیی جۆراوجۆریان لێ دەکرا.

پۆلیسێکی کەتەی باڵابەرز، وەکو ئەوەی یارمەتیی کەسێکی پەککەوتەی بەساڵاچوو بدات کە نەتوانێ بڕوا بەڕێوە، قۆڵی کرد بە قۆڵی (کا)دا و بەسەر سێ هۆڵی دەرزگوتنەوەدا گەڕاندی کە کاری زۆر هۆڤانەی تێدا ئەنجام دەدرا. من هەوڵ دەدەم

لێرەدا زۆر باسی ئەو ڕەفتارانە ناکەم کە لە هۆڵەکاندا پەیڕەو کراون و هاوڕێکەم لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا تۆماری کردوون.

کاتێک چوونە هۆڵی یەکەمەوە و دوای ئەوەی چوار پێنج چرکە چاوی بە دۆخی گومان لێکراوەکاندا گێڕا، دەسپێک خەیاڵی بۆ ئەوە چوو کە گەشتی مرۆڤ بە ژیاندا چەندە کورتە. لەگەڵ بینینی بارودۆخی دوای لێپرسینەوەی گومان لێکراوەکاندا، وەکو ئەوەی لە خەوندا بێ، چەند خەون و خەیاڵێکی تایبەت بە سەردەمەکانی تر، شارستانییە دوورەکان و ئەو وڵاتانەی کە هەرگیز نەبینرابوون هاتە بەر چاوی.

(کا) و هەموو ئەوانی تری ناو هۆڵەکە وا هەستیان دەکرد کە ئەو ژیانەی پێیان بەخشراوە، وا خەریکە وەکو مۆمێکی تا کۆتایی سووتاو، دەکوژێتەوە. (کا) لە دەفتەرەکەیدا ناوی (ژووری زەرد)ی بەم هۆڵە بەخشیوە.

(کا) هەستێکی وای هەبوو کە ماوەیەکی کورتتر لە هۆڵی دووەمدا ماوەتەوە. هاتەوە بیری ئەوانەی لێرە نیگای لەگەڵ نیگایاندا یەکانگیر بوو، دوێنێ لە کاتی پیاسەکردنی بە شاردا، لە چایخانەیەک بینیبوونی، بەدەم هەستکردن بە تاوانەوە چاوی لەسەر هەڵگرتن. وا هەستی دەکرد وەکو ئەوەی ئەوان ئێستا لە وڵاتێکی دووری ناو خەونەکاندا بن.

لە هۆڵی سێیەم و لە ناو ناڵە و فرمێسک و بێدەنگییەکی قووڵ و پەرەسەندوو لە هەناویدا، (کا) هەستی کرد هێزێک کە پەی بەهەموو شتێک بەرێ زانیاری بە ئێمە نابەخشێ و لەو میانەیەشەوە ژیانی لەم جیهانە وەرگێڕاوەتە سەر ئازار. لەو هۆڵەدا توانیی چاو نەبڕێتە چاوی کەس. تەماشای دەکرد، بەڵام شتەکانی پێش چاوی خۆی نەدەبینی، بەڵکو ڕەنگی ناو هۆشی خۆی دەبینی. لەبەرئەوەی ئەم ڕەنگە، زیاتر مەیلەو سوور دەینواند، ناوی (ژووری سوور)ی بەم هۆڵە بەخشی. هەستی ئەوەی کە ژیان کورتە و مرۆڤ تاوانبارە کە (کا) لە دوو هۆڵەکەی پێشتردا پەی پێ بردوو، لێرە یەکیان گرت و سەرباری ترسناکیی دیمەنەکان، جۆرێک لە ئاسوودەییی بە (کا) بەخشی.

بەوەدا کە لە کۆلێژی پزیشکی ڤێتەرنەریش کەسی بۆ دەستنیشان نەکرابوو،



هەستی کرد جۆرێک لە گومان و بێ متمانەیی خوڵقاندووە. بە نەبینینی نەجیب باری لەشی هێندە سووک بووبوو، بەجۆرێک ئامادە بوو یەکسەر لە سەر داخوازی کابرای لووت تەورداس وەکو دوا هەوڵ و دیسان بەمەبەستی دەست نیشانکردن، بچن بۆ مەیتخانەکەی نەخۆشخانەی میللی بۆ چاوگێڕان بە تەرمەکاندا.

لە مەیتخانەی ژێرزەمینی نەخۆشخانەی میللی، دەسپێک تەرمی گومان لێکراوترین کەس نیشانی (کا) درا. ئەوە تەرمی میلیتانێکی ئیسلامی بوو کە لە کاتی دووەم دەستدرێژی سەربازەکاندا دروشمی گوتبووەوە و سێ فیشەکی بەرکەوتبوو. بەڵام (کا) بەهیچ جۆرێک نەیدەناسی. بە هوشیاری لە تەرمەکە نزیک کەوتەوە و بە ڕێز و شپرزەییەوە، وەکو ئەوەی سڵاوی لێ بکات، چاوی تێ بڕی. تەرمی دووەم کە وەکو شەختە لەسەر زەوییەکە ڕاکێشرابوو، باپیرە تەن بچووکەکە بوو. دوای ئەوەی فیشەکێک چاوی چەپی تەقاندبوو، شوێنی چاوی گۆڕابوو بۆ کونێکی خوێناوی و ڕەشی قەترانی. پۆلیس بۆیە ئەویان نیشانی (کا) دا، چونکە لە ڕەوشێکدا نەبوون بیسەلمێنن کابرا لە ترابزۆنەوە بۆ دیدەنی کوڕەزاکەی هاتووە کە لە قارس سەربازی دەکات. هەروەها لەشە بچکۆلانەکەیشی جێی گومان بوو. (کا) بەدەم نزیکبوونەوە لە تەرمی سێیەم، بە گەشبینی ئیپەکی بیر کەوتەوە کە چاوەڕێی دەکرد پاش کەمێکی تر بیبینێ. ئەم تەرمەیش تەنیا چاوێکی پێکرابوو، لەپڕ وای بە خەیاڵدا هات کە هەموو تەرمەکانی مەیتخانەکە هەمان شتیان بەسەر هێنرابێ. کاتێک زیاتر نزیک کەوتەوە و ڕووخساری لاوە مردووەکەی لە نزیکەوە بینی، هەناوی داخورپا.

نەجیب بوو. هەمان دەموچاوە منداڵانەکەی. لێوە درێژکراوەکانی، وەکو منداڵێک کە بیەوێ پرسیاری شتێک بکات. (کا) هەستی بە ساردی و بێدەنگیی نەخۆشخانەکە کرد. هەمان قنچکەی لاوان. هەمان لووتی چەماوە. هەمان چاکەتی چڵکنی قوتابی. (کا) بۆ ساتێک باوەڕی کرد کە دەبێ بگری و لەپڕ شڵەژا. شڵەژانەکە فریای کەوت و ڕۆندک بە ڕوومەتەکانیدا نەهاتە خوارێ. شوێن فیشەکێک بە تەختی ناوچەوانیەوە بوو کە (کا) دوازدە سەعات لەمەوبەر دەستی خستبووە سەر. ئەو شتەی کە نەجیبی وەکو مردوو نیشان دەدا، سپێتیی زەردباو و شینباوی

ڕووخساری نەبوو، بەڵکو درێژکردنی جەستەی بوو وەکو پارچە تەختەیەک. (کا) لە پای ئەوەی لە ژیاندا مابووەوە، هەستێکی سوپاس کردن بە هەناویدا تێ پەڕی. ئەمە لە نەجیبی دوورخستەوە. بەرەو پێشەوە چەمایەوە، دەستەکانی کە لە پشتەوە لە یەکی گرێ دابوون، کردەوە. هەردوو کڵاوەی شانی نەجیبی گرت و ڕوومەتەکانی ماچ کرد، سارد و سڕ بوون، بەڵام ڕەق نەبوون. تاکە چاوە سەوزە نیوەکراوەکەی بۆ (کا)ی دەڕوانی. (کا) خۆی ڕێک خستەوە و بە کابرای لووت تەورداسی گوت کە ئەم "برادەرە" دوێنێ لە ڕێگا ڕای گرتووە و پێی گوتووە کە نووسەری خەیاڵی زانستییە، دواتریش گەیاندوویەتیە لای شینە. پێشی گوت بۆیە ماچی کرد، چونکە ئەو لاوە جوانخاسە خاوەنی دڵێکی سافی بوو.



## ٢٢

# ئەو کەسەی کە دەبوو کوتومت ڕۆڵی ئەتاتورک بگێڕێ

## پێگەی سونای زایم لە سەربازی و لە شانۆی هاوچەرخدا

دەستنیشانکردنی یەکێک لە تەرمەکانی مەیتخانەکەی نەخۆشخانەی میللی لە لایەن (کا)وە بە دەستوبرد خرایە سەر کاغەز و ئیمزا کرا. (کا) و کابرای لووت تەورداس سواری هەمان ئۆتۆمبیلی سەربازی بوونەوە، بە شەقامە چۆڵەکاندا کە پۆستەرەکانی هەڵبژاردن و دژ بە خۆکوشتنیان پێوە هەڵواسرابوون و سەگە ترساوەکانی ناوەڕاستیان بۆ ئەمبەر و ئەوبەری ڕایان دەکرد و سەیری ئەمانیان دەکرد، تێ پەڕین. (کا) بەدەم ڕێگاوە دەیتوانی نێوان پەردە داخراوەکان، منداڵانی گەمەکەر و باوکانی پەرۆش ببینێ کاتێک ئاوڕیان لە ئۆتۆمبیلەکە دەدایەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێک هۆشی لای خۆی نەبوو. دیمەنی ڕووخساری نەجیب و ڕاکشانی وشک و برینگی تەرمەکەی لەبەر چاوی نەدەڕەوییەوە. لە خەیاڵی خۆیدا وای بۆچوو کاتێک دەگاتەوە هوتێل، ئیپەک دڵنەواییی دەداتەوە، بەڵام ئۆتۆمبیلەکە دوای برینی مەیدانی چۆڵی شار لای دایەوە بەرەو خوارەوەی شەقامی ئەتاتورک و کەمێک لەو لای باڵەخانەیەکی تەمەن نەوەد ساڵەی پاشماوەی سەردەمی ڕووسەکاندا ڕاوەستا کە دوو کوچە دەکەوتە خوار هۆڵی شانۆی گەلەوە.

ئێرە باڵەخانەیەکی یەک نهۆمی بوو کە جوانییەکەی و فەرامۆشکراوییەکەی لە یەکەم ئێوارەی گەیشتنیدا بە قارس، (کا)ی غەمگین کردبوو. دوای ئەوەی لە ساڵانی سەرەتای کۆماردا شار کەوتبووە دەست تورکەکان، مارف بەگ کە بازرگانێکی ناودار بوو و لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا بازرگانی خەڵووز و پێستەی دەکرد، بەخۆی و خێزانی، چێشتلێنەرەکانی، منداڵەکانی، شەش ڕامیاری ئەسپەکانی و گالیسکەکانیەوە، بیست و سێ ساڵی پرشنگدار لەم باڵەخانەیەدا ژیابوو. لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانیدا و لەگەڵ سەرەتای دەس پێکردنی شەڕی سارددا،

ئاسایشی میللی بە تاوانی سیخوڕیکردن کەوتبووە ڕاوەدوونان و گوشار خستنەسەر ئەو دەوڵەمەندانەی قارس کە لەگەڵ سۆڤیەتدا بازرگانییان کردبوو. لەمەوە مارف بەگ خۆی ون کرد و کەس سۆراغی نەزانی. باڵەخانەکەیش لەبەر بێ خاوەنی و داوای میراتگران نزیکەی بیست ساڵێک بە چۆڵی مابووەوە. لە ناوەڕاستی سالانی ١٩٧٠دا گرووپێکی مارکسیی توندڕەو ئێرەی داگیر کردبوو و وەکو بارەگای سەرکردایەتی کەڵکی لێ وەرگرتبوو، نەخشەی چەندین تاوانی سیاسیی تێدا دارێژرابوو (سەرۆکی شارەوانی پارێزەر موزەفەر بەگ بە برینداری ڕزگاری بووبوو). باڵەخانەکە لە دوای کودەتای ساڵی ١٩٨٠ چۆڵ کرابوو، ماوەیەک دواتر فرۆشیارێکی لێزانی یەخداڵ و سۆپا دوکانەکەی تەنیشتی کڕیبوو و کردبووی بە کۆگا. سێ ساڵ دواتریش، بەرگدروویەکی خەیاڵپەرست و خاوەن سەرمایە، پاش گەڕانەوەی بۆ شارەکەی، بەو پارەیەی کە بە کاری بەرگدروویی لە ئەستەمبوڵ و عەرەبستانی سعودی پێکەوەی نابوو، لێرە کارگەیەکی دوورینی جلوبەرگی بە ئامێری ئۆڤەلۆک دانابوو.

(کا) لەگەڵ چوونە ژوورەوەیدا، لەبەر ڕۆشنایی نەرمی کاغەزە ڕەنگ نارنجییەکانی قەد دیوارەکاندا، کۆمەڵێک ئامێری دووگمە و ئامێری دوورینی گەورە و مۆدێل کۆن و چەندین مقەستی زلی بینی کە بە بزمار بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون و هەر یەکەیان لە ئامێرێکی سەیر و سەمەرەی ئەشکەنجەدان دەچوو.

سونای زایم پاڵتۆیەک و بلوزێکی پەڕپووتی پۆشیبوو کە (کا) دوو ڕۆژ لەمەوبەر لە یەکەم بینینیدا لە بەریدا بینیبووی، جووتێک پۆستاڵی سەربازیی لە پێ کردبوو، جگەرەیەکی بێ فیلتەری بە نێوان پەنجەکانی گرتبوو و بە ژوورەکەدا ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد. کاتێک چاوی بە (کا) کەوت، چەشنی ئەوەی دۆستێکی دێرین و خۆشەویستی بینیبێ، ڕووخساری گەشایەوە و پڕی دایێ و ماچی کرد. ئەم ماچ کردنە، بە بارێکدا دەچووەوە سەر گوتەی کابرای قیافەت جامبازی هوتێلەکە کە گوتبووی "کودەتاکە خێری پێوە بێ بۆ میللەت)، بە بارێکی تریشدا، ڕەهەندی دۆستایەتییەکی زۆر بەهێزی تێدا بوو کە بەلای (کا)وە نامۆ بوو. دواتر ئەم



دۆستایەتییەی وا لێک دایەوە کە دوو ئەستەمبوڵی لە هەلومەرجێکی دژواردا لە شارێکی هەژار و دوورەپەرێزی وەکو قارسدا بە یەکگەیشتوون، بەڵام ئیدی بۆی ڕوون بووبووە کە سونای، بۆخۆی هۆکاری بەشێک لەو هەلومەرجەیە.

سونای بە دەنگێکی لێوانلێو لە ڕاز و بە شانازییەوە گوتی: "هەڵۆی تاریکیی غەم هەموو ڕۆژێک لە هەناومدا لەتر دەدات، بەڵام خۆمی بۆ ناهەژێنم، تۆیش خۆت ڕابگرە. هەموو شتێک بە دڵی خۆمان دەبێ."

بە ژوورەکەدا کە ڕۆشنایی بەفر لە پەنجەرەکەوە ڕووناکی دەکردەوە و گۆشەی بنمیچە بەرزەکانی بە نەخش و نیگار خەملێنرابوون و سۆپایەکی زەبەلاحی تێدابوو و هاواری دەکرد کە سەردەمانێکی باشتر لەمڕۆی بینیوە، بە پیاوە بێتەل بە دەستەکاندا، بە دوو پاسەوانی کەتەدا کە بۆ ساتێکیش نیگایان لەسەری لانەدەبرد، بەو نەخەشەیەدا کە لەسەر مێزێکی لای دەرگای سەر ڕێڕەوەکە دانرابوو، بە چەک و داکتیلۆ و دۆسییەکاندا، (کا) دەسبەجێ بۆی دەرکەوت کە ئێرە ناوەندی بەڕێوەبردنی "شۆڕشەکە"یە و سونایش، هێزێکی زۆری لە بەر دەستدایە.

سونای بەدەم پیاسەکردن بە ناو ژوورەکەدا، گوتی: "لە دەورانێکدا کە سەختترین سەردەمانی ئێمە بوو، کاتێک دەمزانی لە شارە هەرە دوور و نابووت و دڵڕەقەکان، نەک شوێن بۆ نمایشکردنی بەرهەمەکانمان نادۆزینەوە، بگرە ژووری هوتێلێکیش شک نابەین بۆ ئەوەی سەری خۆمانی تێدا کز بکەین، کاتێک دەمزانی، هەندێک هاوڕێی دێرین کە بیستبووم لەوێن، باریان کردووە و ئەو شار و ناوچانەیان جێ هێشتووە، غەمی هەناوم کە پێی دەگوترێ ڕەشبینی و کۆستباری، دەستیدەکرد بە خۆهەژاندن. بۆ ئەوەی نەکەومە چنگی، هەڵدەهاتم و دەچووم دەرگای پزیشک و پارێزەر و مامۆستایانم دەکوتا، تاکو بزانم ئاخۆ کەسێک لە شاردا هەیە خوولیای هونەری هاوچەرخ بێت و بایەخ بە ئێمەی پەیامبەری جیهانی هاوچەرخ بدات. کاتێک دەمزانی هیچ کەسێک لەو ناوونیشانانەی بەردەستم نادۆزمەوە، یاخۆ کە تێ دەگەیشتم پۆلیس مۆڵەتمان پێ نادات بەرهەمەکانمان نمایش بکەین، یاخۆ -وەکو دوا ئومێد- کاتێک بۆ وەرگرتنی مۆڵەت دەمویست بچمە دیدەنیی قایمقام و ئەویش بگرە پێشوازیشی لێ نەدەکردم، ئیدی بە ترسەوە حاڵی دەبووم کە تاریکایی هەناوم

وا خەریکە دێتە کوڵ. هەڵۆی نووستووی ناو سینەیشم باسکەکانی دەکردەوە، لە شەقەی باڵی دەدا، دەفڕی و لەوەدا دەبوو بمخنکێنێ. ئەو کاتە، لە نابووتترین چایخانەی سەر ڕووی ئەم زەمینەدا، ئەگەر ئەویش نەبوایە، ئەوا لەسەر شۆستەی بەردەم گەراجەکانی پاسدا، هەندێک جاران لە وێستگای شەمەنەفەر، ئەویش دوای ئەوەی کە بەڕێوەبەری وێستگا تەماحی دەچووە یەکێک لە کچە ئەکتەرەکان، لە گەراجەکانی دەزگای ئاگرکوژێنەوەدا، لە پۆلی قوتابخانە چۆڵەکاندا، لە جامخانەی دوکانێکی سەرتاشیندا، لەسەر پلیکانەی خانەکان، لە ئاخوڕ و لەسەر شۆستەکان، نمایشەکانی خۆمان پێشکەش دەکرد و خۆم ڕادەستی غەم نەدەکرد."

کاتێک فوندا ئەسەر لە ڕێڕەوەکەوە بە دەرگا کراوەکەدا خۆی کرد بە ژووردا، سونای شێوەی گێڕانەوەی قسەکانی لە "من"ەوە گۆڕی بۆ "ئێمە". نێوانخۆشییەکی هێندە بەهێز لە نێوان ئەو جووتەدا هەبوو، بەجۆرێک (کا) هیچ هەستی بەوە نەکرد ئەو گۆڕینە دەستکرد بێ. فوندا ئەسەر جەستەی قەبە و نازکی خۆی بە زەرافەتەوە نزیک خستەوە و دەستی (کا)ی گووشی. چەند شتێکی بە گوێی پیاوەکەیدا چرپاند و بەهەمان هەوای سەرقاڵییەوە کشایەوە و ڕۆیشت.

سونای گوتی: "ئەو دەورانە، خراپترین سەردەمانی ئێمە بوون. هەموو ڕۆژنامەکان دەیاننووسی کە ئێمە لەبەر چاوی کۆمەڵ و بودەڵەکانی ئەستەمبوڵ و ئانکارا کەوتووین. ئەو ڕۆژەی کە گەورەترین هەلی ژیانم کەوتە دەست -کە تەنیا دەست کەسانی بلیمەت دەکەوێ-، بەڵێ، ڕێک ئەو ڕۆژەی خەریک بوو بە هونەرەکەمەوە لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا بجەنگم، لەپڕ بەرە لە ژێر پێم ڕاکێشرا و کەوتمە ناو نابووتترین قوڕ و چڵپاوەوە. لەوەشدا نەترسام، بەڵام لەگەڵ غەمدا دەستمان نایە بینەقاقای یەکتر. سەرباری زیاتر چەقین و نقوومبوونم بەو چڵپاوەدا، بە قرێژی و دڵڕەقی و نەداری و نەزانیدا، هەرگیز بڕوام بە ئامانجی سەرەکی، بە گەیشتن بەو گەوهەرە گەورەیە، لەق نەبوو. تۆ بۆ دەترسی؟"

لە ڕێڕەوەکەدا پزیشکێکی کراس سپی بە خۆی و جانتای دەستییەوە دەرکەوت. پزیشکەکە بە شڵەژانێکی دەستکردەوە ئامێری گوشارپێوەکەی دەرهێنا و لە قۆڵی سونای بەست، سونای بە شێوەیەکی هێندە "تراژیدی" سەیری ئەو تیشکەی کرد کە



لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژووری، بەجۆرێک (کا) سەرەتایساڵی هەشتاکانی بیر کەوتەوە، کاتێک سونای لەبەر چاوی کۆمەڵ کەوتبوو." بەڵام (کا) ئەو ڕۆڵانەی ساڵانی ١٩٧٠یشی لەبیر بوو کە بناغەی ناوبانگ پەیداکردنی سونای بوون. لەو سەردەمەدا کە بە ساڵانی زێرینی شانۆی سیاسیی چەپ دادەنرێ، ئەو شتەی سونای لە نێوان ژمارەیەکی زۆر تیپی شانۆییی بچووکدا هێنابووە پێشەوە، بە تەنیا کارامەیی و توانای نواندن و لێهاتوویی ئەو نەبوو، بەڵکو بەشێکی ناوبانگەکەی دەگەڕایەوە بۆ توانای ڕابەرایەتیکردن کە بینەران لە ڕۆڵە سەرەکییەکانی سونایدا بەدییان دەکرد. بینەری لاوی تورکی، سونایان لە نواندنی ڕۆڵی کەسایەتییە مێژووییە دەسەڵاتدارەکانی وەکو ناپلیۆن، لینین، ڕۆبێسپیر، یان شۆڕگێڕانی ژاکۆبەنی وەکو ئەنوەر پاشا، یاخۆ قارەمانە خۆماڵییەکانی لە چەشنی ئەواندا زۆر خۆش دەویست. قوتابیانی ئامادەیی و خوێنکارانی (پێشڤەڕۆ)ی زانکۆکان بە چاوی پڕ لە ڕۆندک و بە چەپڵەڕێزانەوە سەیریان دەکرد کە سونای چۆن بەدەنگێکی بەرز و کاریگەر خەمی گەلی چەوساوەی دەخوارد، چۆن کاتێک بە دەستی زۆرداران زللەیەکی دەخوارد، بە شانازییەوە سەری بەرز دەکردەوە و دەیگوت: "ڕۆژێک دێت تۆڵەی ئەمە بکەینەوە"، چۆن لە خراپترین ڕۆژگاردا (هەر دەبوو ڕۆژێک بکەوێتە گرتووخانە) بە ئازارەوە دانی جیڕ دەکردەوە و ئومێدی بە هاوڕێکانی دەبەخشی، بەڵام ئەگەر پێویستی بکردایە، ئامادە بوو لە پێناوی بەختەوەریی گەلەکەیدا بێبەزەییانە پەنا بۆ توندوتیژی ببات، تەنانەت ئەگەر دڵیشی لەتوپەت بکرێ. بەتایبەتیش کاتێک لە کۆتاییی نمایشەکاندا دەسەڵاتی دەگرتە دەست و بە سووربوونەوە خراپەکارانی سزا دەدا، دەنگۆی ئەوە هەبوو کە کاریگەریی پەروەردە سەربازییەکەی بەو سووربوونەوەیەوە دیار بێ. لە کۆلێژی سەربازیی قولەلی خوێندبووی. لەبەرئەوەی بە بەلەم بۆ ئەستەمبوڵ هەڵهاتبوو و دەوروخوولی شانۆکانی بەیئۆغلوی دابوو و بەهۆی هەوڵدانی لە کۆلێژ بۆ پێشکەشکردنی شانۆگەریی (بەر لەوەی بەفرەکان بتوێنەوە)، لە دوا ساڵی خوێندندا لە کۆلێژ دەرکرابوو.

کودەتای سەربازیی ساڵی ١٩٨٠ هەموو تیپیەکانی شانۆی سیاسیی چەپی قەدەغە کرد و دەوڵەت بڕیاری دا بە بۆنەی یادی سەد ساڵەی لە دایکبوونیەوە فیلمێکی

گەورە لەسەر ئەتاتورک بەرهەم بهێنێ. لە ڕابردوودا بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات کە تورکێک ڕۆڵی ئەم مرۆڤە قژزەرد و چاوشینەی قارەمانی گەورەی بەڕۆژئاواییبوون بگێڕێ. هەموو کەسێک بێ چەند و چوون پێیان وابوو کە ڕۆڵێکی لەو جۆرە دەبێ بدرێتە ئەکتەرەکانی وەکو لاورانس ئۆلیڤەر، کورد یورگەنس و چارلتۆن هەستۆن. بەڵام ئەمجار ڕۆژنامەی (حورییەت) خۆی هاویشتبووە ئەو کارەوە و توانیبووی ڕای گشتیی تورک بەوە قایل بکات کە تورکێک ڕۆڵی ئەتاتورک بگێڕێ. ڕۆژنامەکە ڕای گەیاندبوو کە کۆپۆن بۆ خوێنەرانی چاپ دەکات تاکو لەو ڕێیەوە ئەکتەری شیاو بۆ گێڕانی ڕۆڵی ئەتاتورک دەستنیشان بکەن. لە دوای دیاریکردنی ماوەی پێویست بۆ خۆناساندنی دیموکراتییانەی ئەو ئەکتەرانەی کە لە لایەن لیژنەیەکی ناوبژیوانەوە دەست نیشان کرابوون و سونای یەکێک بوو لەوان، هەر لە یەکەم ڕۆژی دەنگدانەوە دەرکەوت کە سونای بە جیاوازییەکی زۆر لە ڕیزی پێشەوەیە. بینەری تورک پەی بەوە بردبوو، سونای کە ساڵانێکی درێژ ڕۆڵی ژاکۆبەنانەی بینیوە و ئەکتەرێکی شۆخ و بە هەیبەت و متمانەبەخەشە، دەتوانێ ڕۆڵی ئەتاتورک ببینێ.

یەکەم هەڵەی سونای ئەوە بوو کە هەڵبژاردنی خۆی لە لایەن خەڵکەوە زۆر بە هەند گرتبوو. هەر تاوناتاوێک لە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکاندا دەردەکەوت و لێدوانی ڕاگەیاند، لەگەڵ فوندا ئەسەردا چەندین وێنەی تایبەت بە بەختەوەریی ژیانی هاوسەرێتییان گرت و بڵاو کردەوە. ماڵەکەی و ژیانی ڕۆژانە و بیر و بۆچوونی سیاسییانەی خۆی بۆ خەڵک ڕادەگەیاند و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە شیاوترین کەسە بۆ گێڕانی ڕۆڵی ئەتاتورک. لێکدالێکدا دەیگوت کە هەندێک لە چێژ و خووەکانی (عارەق خواردنەوە، سەماکردن، ڕێکپۆشین، بەهەیبەتی)ی دەچنەوە سەر ئەتاتورک. کتێبەکانی (نوتق)ی ئەتاتورکی بەدەستەوە دەگرت و پەیتاپەیتا دەیخوێندەوە. (گۆشەنووسێکی سەر بەگۆبەن و ئاژاوەگێڕ زوو هاتە دەست و کەوتە تانە لێدان و نووسی ئەوەی سونای دەیخوێنێتەوە، دەقی ڕەسەنی نوتقەکان نییە، بەڵکو کورتکراوەی دەقەکانە بە زمانی تورکیی هاوچەرخ. لەمەوە سونای لە کتێبخانەکەیدا بە بەرگە ڕەسەنەکانی -نوتق-ەوە وێنەی گرتبوو، (بەڵام مخابن، سەرباری هەوڵێکی زۆر، وێنەکان لە هەمان ڕۆژنامەدا لە چاپ نەدرابوون.) لە




کردنەوەی پێشانگاکاندا، لە کۆنسێرتەکاندا و لە یارییە گرنگەکانی تۆپی پێدا ئامادە دەبوو، هەموو کاتێک لێدوانی بە هەموو کەسێک دەدا و سەبارەت بە بابەتەکانی وەکو ئەتاتورک و نیگارکێشی، ئەتاتورک و موزیک و ئەتاتورک و وەرزشی تورکی، قسەی بۆ پەیامنێرانی پلە سێ دەکرد. بۆ ئەوەی خۆشەویستیی خەڵک بۆ خۆی مسۆگەر بکات و بە شێوەیەک کە لە ژاکۆبەنی نەدەوەشایەوە، لێدوانی دەدا بە ڕۆژنامە (پاشڤەڕۆ)کانی دژ بە ڕۆژئاوایش. لە وەڵامی پرسیاری یەکێک لەو ڕۆژنامانەدا کە لە ڕاستیدا نیازی دنەدانیشی لە پشتەوە نەبوو، گوتبووی: "بێگومان ئەگەر میللەت بە شیاوم بزانێ، ئەوا دەتوانم ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕۆڵی حەزرەتی محەمەدیش بگێڕم." ئەم لێدوانە بەدبەختە سەرەتای شێواندنی مەسەلەکان بوو بەسەر یەکدا.

لە گۆڤارە بچووکەکانی ئیسلامیدا دەست کرا بە نووسینی ئەوەی کە هیچ کەسێک -حاشا- ڕۆڵی حەزرەتی پەیامبەر ناگێڕێ. ئەم تووڕەبوونە سەرەتا لە ڕۆژنامەکاندا بە مانشێتی (بێڕێزی بەرانبەر بە پەیامبەرمان نواندووە) ڕەنگی دایەوە، دواتریش دەستەواژەی (سووکایەتی پێکردن) خرایە مانشێتەکانەوە. کاتێک سوپایش نەیتوانی ئیسلامی سیاسی بێدەنگ بکات، ئەرکی کوژاندنەوەی ئاگرەکە کەوتە ئەستۆی سونای خۆی. بەمەبەستی ئارامکردنەوەی بارودۆخەکە، قورئانی پیرۆزی بە دەستەوە دەگرت و دەیویست لە خوێنەرانی کۆنەپارێزی بگەیەنێ کە حەزرەتی محەمەد کەسێکی نوێخواز بووە و ئەم زۆر خۆشی دەوێ. گۆشەنووسانی کەمالیست کە دەمێک بوو بەلاساییکردنەوەی ئەتاتورک لە لایەن سونایەوە تووڕە بووبوون، ئەم هەلەیان قۆستەوە: دەستیان کرد بە نووسینی ئەوەی کە ئەتاتورک هیچ کاتێک چاپلووسیی لە تەک پاشڤەڕۆیان و توندڕەواندا نەنواندووە. ڕۆژنامەکانی لایەنگری کودەتای سەربازی لێکدالێکدا ئەو وێنەیەی سونایان بە قورئانەوە بڵاو دەکردەوە و دەیانپرسی: "ئەمەیە ئەتاتورک؟" چاپەمەنیی ئیسلامی سیاسی کەمتر خۆی بە سونایەوە سەرقاڵ کرد و زیاتر کەوتە خۆپاراستن و دەستی بە هێرشی پێچەوانە کرد. ئەو ڕۆژنامانە کەوتنە بڵاوکردنەوەی ئەو وێنانەی کە عارەق خواردنەوەی سونای نیشان دەدەن و دەستیان کرد بە دانانی مانشێتی لە جۆری: (ئەویش وەکو ئەتاتورک عارەقخۆرە!) یاخۆ : (ئایا ئەمەیە دەیەوێ ڕۆڵی حەزرەتی پەیامبەرمان بگێڕێ؟)

شەڕی تاوسەندووی نێوان ئیسلامی-لایسیستەکان کە هەر دوو مانگ جارێک لە چاپەمەنی ئەستەمبوڵدا بەرپا دەبوو، بەمجۆرە ئەمجاریان لەسەر سونای سەری هەڵدا و ماوەیەکی کورتیشی خایاند.

لە ماوەی هەفتەیەکدا ژمارەیەکی زۆر وێنەی سونای بڵاو کرایەوە: لە وێنەیەکدا کە لە فیلمێکی ڕێکلامی چەندین ساڵ لەمەوبەر دەرهێنراودا وەرگیرابوو، بە تاسووقەوە بیرەی دەخواردەوە، لە وێنەیەکی تری فیلمێکی سەردەمی لاویدا تێهەڵدان دەخوات، لە یەکێکی دیدا لە بەردەم ئالایەکی داس و چەکوشدا مستەکۆڵەی خۆی بە گرمۆڵەکراوی نیشان داوە... چەندین لاپەڕە بە هەواڵ و قسە و قسەڵۆک سەبارەت بە سونای پڕکرانەوە: (ژنەکەی هاوجنسبازە، خۆیشی، ئێستایشی لەگەڵدا بێ هەر کۆمۆنیستە، فیلمی پۆرنۆی قاچاخی دۆبلاژ کردووە، لە پێناوی پارەدا، نەک ئەتاتورک، بگرە ئامادەیە هەموو ڕۆڵێک بگێڕێ، شانۆنامەکانی برێشتی بەو پارانە نمایش کردووە کە لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە بۆی نێردراوە، لە دوای کودەتای سەربازی، گازندەی لە تورکیا کردبوو گوایە "ئەو ژنانەی سەر بە کۆمەڵەیەکی سویدی کە لە دەرەوە بۆ لێکۆڵینەوە هاتبوون، ئەشکەنجە دراون.") هەر لەو ڕۆژگارەدا، (ئەفسەرێکی پایەبڵند) سونای بانگ کرد بۆ سەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپا و بڕیاری سوپای سەبارە بەپێویستبوونی خۆکێشانەوەی لە خۆ پاڵاوتن بۆ ڕۆڵی ئەتاتورک پێ ڕاگەیاند. ئەم ئەفسەرە لەو پیاوە دڵنەرم و کاریگەرانە نەبوو کە ڕۆژنامەنووسە خەوخۆشەکانی ئەستەمبوڵ بە گرنگیان زانیوە و لە پای دەستێوەردانی سوپا لە کاروباری سیاسەت ڕەخنەیان لێ گرتووە، جا ئەم بانگی کردبن بۆ ئانکارا و سەرەتا سەرزەنشتی کردبن، دواتر بۆ دڵدانەوەیان شیرینییان پێشکەش بکات. ئەو ئەفسەرەیش سەر بە (بیرۆی پێوەندییەکان) بوو، بەڵام پیاوێکی جەسوورتر و قسەخۆشتر بوو. بە بینینی غەمگینی و ترسی سونای، نەرمیی نەنواند، بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە گاڵتەی بە سونای کرد کە لەگەڵ وێنەکانی (ئەتاتورکی هەڵبژێردراو)دا بۆچوونی سیاسیی ڕاگەیاندووە. دوو ڕۆژ لەوەوبەر سونای سەردانێکی شارەدێی شوێنی لە دایکبوونی خۆی کردبوو، لەوێ وەکو سیاسەتمەدارێکی خۆشەویست، بە کاروانی ئۆتۆمبیل و لە لایەن هەزاران بێکار و بەرهەمهێنەرانی توتنەوە پێشوازیی لێ کرابوو، ڕووی لە پەیکەرەکەی ئەتاتورک لە



مەیدانی شارەدێیەکەدا کردبوو و لە ناو چەپڵەڕێزانی ئامادەبوواندا دەستی ئەتاتورکی گوشیبوو. لە دوای ئەم بایەخپێدانە، گۆڤارێکی میللی لە ئەستەمبوڵ لێی پرسیبوو: "ئایا نیازتان هەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شانۆوە دەربازی سیاسەت بن؟" سونای لە وەڵامدا گوتبووی: "ئەگەر میللەت بخوازێ، بەڵێ!" سەرۆکایەتیی وەزیران ڕای گەیاند کە "لەم کاتەدا" بەرهەمهێنانی فیلمەکەی ئەتاتورک دوادەخرێ.

سونای لەوە بە ئەزموونتر بوو کە ئەم تێکشکانە خراپە کاری تێ بکات، بەڵام پێشهاتەکانی دواتر پشتیان شکاند: لە ماوەی مانگێکدا هێندە هاتبووە سەر تەلەفزیۆن بۆ ئەوەی ڕۆڵەکە بۆ خۆی مسۆگەر بکات، ئیدی هەموو کەسێک دەنگی ئەو بە دەنگی ئەتاتورک تێ دەگەیشتن، بۆیە چیدی کاری دۆبلاژی نەدرایێ. هەروەها کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی ڕێکلامی تەلەفزیۆنیش کە پێشتر بەدوایدا دەگەڕان و ڕۆڵی باوکێکی هۆشمەندیان دەدایێ کە بەروبوومی باشی هەڵدەبژارد، پشتیان تێ کرد، چونکە نیشاندانی ئەتاتورکێکی سەرنەکەوتوو لە کاتی بۆیاغکردنی دیواردا، یاخۆ کاتێک دەیگوت کە لە بانکەکەی ڕازییە، زیانی بە بەربوومەکان دەگەیاند. بەڵام لە هەمووی خراپتر، باوەڕهێنانی خەڵک بوو کە بە عەشقەوە بڕوایان بە هەموو هەواڵ و نووسراوی ڕۆژنامەکان دەکرد، بەوەی کە سونای دوژمنی ئەتاتورک و ئاینە: تەنانەت هەندێک باوەڕیان کردبوو کە سونای چاوپۆشی دەکات لە ماچکردنی ژنەکەی لە لایەن کەسانی ترەوە. بەلانی کەمەوە بۆچوونێک هەبوو کە دووکەڵ بێ ئاگر نابێ. هەموو ئەم پێشهاتانە ژمارەی ئەوانەی کەم کردبووەوە کە بۆ بینینی نمایشەکان دەهاتن. چەندین کەس لە شەقامەکان ڕایان دەگرت و پێیان دەگوت: "حەیف بوو بۆت!" قوتابییەکی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە باوەڕی کردبوو سونای زماندرێژیی دەرهەق بە پەیامبەر کردووە و دەیویست ناوی بکەوێتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان، لە شەوێکی نمایشدا چووە سەر شانۆ و چەقۆی هەڵکێشا و تفی لە چەند کەسێک کرد. هەموو ئەمانە لە ماوەی پێنج ڕۆژدا ڕوویان دابوو. ژن و پیاوەکە خۆیان لەبەر چاوان ون کرد.

دواتریش چەندین قسە و دەمگۆیان بۆ هەڵبەسترا، وەکو: چوونەتە بەرلین و لای تیپی بەرلینی برێشتچی لە ژێر پەردەی فێربوونی هونەری شانۆدا فێری کاری

تیــرۆریســتی دەبن، یاخــۆ بــە کــۆمــەکی وەزارەتی ڕۆشنبــیــریــی فــەرەنــســا، لە نەخــۆشــخـــانەی دەروونیی (La Paix) ی فــەرەنسی لە شــیــشلی خــەوێندراون. ڕستییەکەی، پەنایان بردبووە بەر ماڵی دایکی فوندا ئەسەر کە ژنێکی نیگارکێش بوو و لە کەناری دەریای ڕەش دەژیا. ئەمە حاڵیان بوو تا ساڵێک دواتر توانیان لە هوتێلێکی هاکەزاییی شاری ئەنتاڵیادا کارێکی ئانیماتۆری بدۆزنەوە. بەیانیان لەگەڵ دوکاندارە ئەڵمانەکان و گەشتیارانی هۆڵەندیدا لەسەر لمی قەراغ دەریا گەمەی ڤۆلیبۆلیان دەکرد، نیوەڕۆیان پۆشاکی (چاوڕەش و هاجیڤات)یان دەپۆشی و بە ئەڵمانییەکی تێکشکاو منداڵانیان دەهێنایە پێکەنین، ئێوارانیش وەکو پاشا و کەنیزەکە سەماکەرەکەی دەچوونە سەر شانۆ. بۆ فوندا ئەسەر، ئەمە سەرەتای فێربوونی سەمای ڕۆژهەڵاتی بوو کە دواتر و لە ماوەی دە ساڵدا لە ناوچە بچووک و دوورە دەستەکان پەرەی پێ دا و پێشی خست. سونای کە توانیبووی سێ مانگ بەرگەی ئەو هەموو مەسخەرەیە بگرێ، ڕۆژێک لە بەرچاوی گەشتیاران سەرتاشێکی سویسراییی دارکاری کردبوو، چونکە بەوەوە نەوەستابوو هەر لەسەر شانۆ گاڵتە بە کەنیزەک و فێسی تورکی بکات، بەڵکو بەیانیان لەسەر لمەکەش هەر چەنەی دەدا و لەگەڵ فوندا ئەسەریشدا کەوتبووە چاوبرکێ. لەوە بەدواوە، زانراوە کە لە هۆڵەکانی زەمــاوەندی ئەنتــاڵیــا و دەوروبــەریدا و لە شــەوئاهــەنگەکــاندا، کــاری بێــژەری و سەماکردن و (نمایش)یان دۆزیوەتەوە. سونای ڕۆڵی گۆرانبێژانی هەرزانبەها کە زۆر بە وشکی لاساییی گۆرانبێژە ڕەسەنەکانی ئەستەمبوڵیان دەکردەوە، هۆقەبازانی ئاگرخۆر و ئەکتەرانی کۆمیدیی پلە سێی نمایش دەکرد. فوندا ئەسەریش بەدوای وتارێکی کورتدا سەبارەت بە خانەی هاوسەرگیری، کۆمار و ئەتاتورک، دەکەوتە سەما و سمت بادان. پاشان هەردووکیان لە کەشێکی تژە لە دیسیپلیندا و بۆ ماوەی هەشت نۆ خولەک، پەردەیەکیان لە ماکبێ نمایش دەکرد و مەرگی پاشایان نیشان دەدا و بەدوای ئەوەدا چەپڵەڕێزان دەکران. یەکەم تۆوی ئەو تیپی شانۆیییەی کە ساڵانی دواتر بە ئەنادۆڵدا دەگەڕا، لەو ئاهەنگانەدا چێنرا.

لەو کاتەدا کە پاڵەپەستۆی خوێنەکەی پێورا، یەکێک لە پاسەوانەکان بێتەلێکی دایە دەست و ئەمیش لە بێتەلەکەدا فەرمانی بۆ کەسێک دەرکرد. هەر لەو ساتەدا پارچە



کاغەزێک خرایە بەردەستی، سونای لەگەڵ خوێندنەوەیدا ڕووی خۆی گرژ کرد و گوتی: "هەر هەموویان زمان لە یەکتری دەدەن. بەدرێژاییی ئەو ساڵانەی کە لە ناوچە دوورە دەستەکانی ئەنادۆڵدا نمایشم کردووە، بینیوومە کە تەواوی لاوانی ئەم وڵاتە لە غەم و پەژارەدا گۆج و ئفلیج بوون. بەیانی تا ئێوارە لە چایخانەکان دادەنیشن و هیچ ناکەن. لە هەر شارەدێیەکدا سەدان، لە سەرانسەری تورکیادا سەدان هەزار، ملیۆنان پیاوی بێکار، شکستخواردوو، بەدبەخت، سست و بەلەنگاز هەیە. ئەم برایانەم تاقەتیان نییە دەستێک بە سەر و ڕووخساری خۆیاندا بێنن، ئیرادەی ئەوەیان نییە دوگمەی چاکەتە چەور و لەکەدارەکانیان دابخەن، هێزی جووڵاندنی دەست و قۆڵەکانیان نییە، حەوسەڵەیان نییە تا کۆتایی گوێ بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتێک ڕابگرن و ئەوەندە زەوقیان نییە بەدەم گێڕانەوەی جۆکێکەوە پێ بکەنن." سونای درێژەی دایێ و گوتی: "زۆربەیان لە بەدبەختیی خۆیاندا خەویان لێ نەدەکەوت، بە چێژەوە جگەرەیان دەکێشا بەهیوای ئەوەی بیانکوژێ، بەشی زۆریان ڕستەیەکیان تا کۆتایی بۆ نەدەگوترا و لە نیوەدا دەستیان لێ هەڵدەگرت، دانیشتنیان لە بەرامبەر تەلەفزیۆندا لەبەر ئەوە نەبوو کە حەز لە بەرنامەکان دەکەن و دەیانهێنێتە جۆش، بەڵکو بەهۆی خۆڕانەگرتنیان بوو لە بەردەم تەنگاوییەکانی دەوروبەردا، لە ڕاستیدا دەیانویست سەر بنێنەوە، بەڵام خۆیان بەشایەنی خۆکوشتن نەدەزانی، لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگیان دەدا بە دڵڕەقترین پاڵێوراوی نابووتترین پارت بۆ ئەوەی ئەمان بگەیەنن بەو سزایەی کە شایەنیانە، ئەفسەرانی کودەتاچی کە هەمیشە بە زمانی سزادان دێنە گۆ، بەلای ئەوانەوە باشتربوون لەو سیاسەتمەدارانەی کە بەردەوام بەڵێنی بەختەوەرییان دەدا." لەو کاتەدا فوندا ئەسەر هاتە ژوورەوە و سونایش لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو: "لە ماڵیشەوە ژنە بەدبەختەکانیان بە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان ڕادەگەن و نازانن پیاوەکانیان لە کوێن. لە پێناوی چوار پێنج قورووشدا خزمەتکاری، کاری تووتن، فەرش چنین یاخۆ پەرستیاری دەکەن. ئەگەر ئەم ژنانە نەبوونایە کە هەمیشە بەسەر منداڵەکانیاندا دەقیژێنن و بە پەتی گران خۆیان بە ژیانەوە بەستووەتەوە، ئەوا بە ملیۆنان پیاوی کراس لەکەدار، ڕیش دەرهاتوو، بێزەوق، بێکار و تەمەڵ کە هەموویان شێوەیان دەچێتەوە سەر یەک و بە هەموو ئەنادۆڵدا تەشەنەیان کردووە، وەکو سواڵکەر لە

شەوانی سارد و بەستەڵەکدا لە گۆشەی کوچە و کۆڵانەکان ڕەق هەڵدەهاتن، یاخۆ چەشنی سەرخۆشی تازە دەرچوو لە مەیخانەکان دەکەوتنە کونی زێرابەکانەوە، یان ئەوەتا وەکو باپیرە خڵەفاوەکان بە بیجامە و دەمپاوە بۆ نان کڕین بۆ لای بەقاڵ دەنێردران و ون دەبوون. جا وەکو دەبینین لەم (شارە داماوەی قارس)دا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لەو پیاوانە هەن کە تاکە سەرچاوەی بەزم و خۆشییان، ئازاردانی ژنەکانیانە، ئەو ژنانەی کە ئەمان بە ژیانی خۆیان پێیان قەرزارن و بە عەشقێکی شەرمنەوە خۆشیان دەوێن.

سونای بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی تاسەباریی پێوە دیار بێ، گوتی: "لە ئەنادۆڵدا دە ساڵی خۆم بەخشی بۆ ئەوەی ئەم برایانەم لە غەم و پەژارە ڕزگاریان بێ. چەندین جار تاوانی کۆمۆنیستی، سیخوڕیی ڕۆژئاوا، هاوجنسبازی، گەواهیدەری یەهۆڤا، گەوادی و لەشفرۆشی درایە پاڵمان. خراینە بەندیخانەوە و ئەشکەنجە دراین و فەلاقە کراین. هەوڵیان دا دەست بۆ ئابڕوومان درێژ بکەن، بەردەباران کراین، بەڵام جەماوەر فێربوون ئەو بەختەوەری و ئازادییەیان خۆش بوێ کە نمایشەکانی خۆم و تیپی شانۆکەم پێی دەبەخشین. ئێستایش کە گەورەترین هەلم بۆ ڕەخساوە لە ژیانمدا، ئامادە نیم خۆم لاواز بنوێنم."

دوو کەس هاتنە ژوورەوە و یەکێکیان دیسان بێتەلێکی بۆ سونای درێژ کرد. (کا) لە قسەی بێتەلەکەوە گوێی لێ بوو کە دەوری یەکێک لە کوڵێتەکانی گەڕەکی سوقاپی گیراوە، لە ناوییەوە تەقەکراوە و ماڵەکە گەریلایەکی کورد و خێزانێکی تێدایە. ئەفسەرێک لەسەر هێڵی بێتەلەکە بوو کە هەم فەرمانی دەدا و هەمیش دەیگوت: "کۆمیتانم." هەمان ئەفسەر دوای کەمێک وەکو ئەوەی لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا قسە بکات، نەک لەگەڵ سەرکردەی شۆڕشێکدا، سەرەتا، هەندێک زانیاریی لەمەڕ بابەتێک دا بە سونای و پاشان ڕا و بۆچوونی لێ پرسی.

سونای کە بینی وا (کا) بە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکان ڕاگرتووە، گوتی: "قارس ژمارەیەکی کەم سەربازی لێیە. دەوڵەت، لە ساڵەکانی شەڕی سارددا هێزی بنەڕەتیی بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی ڕووسی لە ساریقامیش مۆڵ داوە. ئەمانەی ئێرە هەر ئەوەندەیان لە دەست دەهات کە لە پەلاماری یەکەمدا ڕووسەکان بخافڵێنن.



ئێستا زیاتر بۆ پاراستنی سنووری لای ئەرمەنستانەوە لێرە دانراون."

سونای گێڕایەوە هەمان ئەو شەوەی کە لەگەڵ (کا)دا لە پاسەکەی ئەرزەرووم دابەزیوە، لە ڕیستۆرانتی نیشتمانی سەوز چاوی کەوتووە بە عوسمان نووری چۆلاک کە ماوەی سی و ئەوەندە ساڵە دۆست و هاوڕێی یەکترن. لە کۆلێژی سەربازیی قولەلی هاوپۆلی یەکدی بوون. ئەو سەردەمە، ئەو تاکە کەس بووە کە زانیویێتی پیراندیلۆ کێیە و شانۆکانی سارتەر کامانەن. سونای درێژەی دایێ و گوتی: "ئەو نەیتوانی وەکو من بێ دیسپلینی بنوێنێ و لە کۆلێژ دەربکرێ، بەڵام بە هەموو هێزی خۆیشییەوە باوەشی بە سەربازیدا نەکردووە، بۆیە هەرگیز نەگەیشتە پلەی ڕوکن. کەسانێک هەبوون بە چرپە دەیانگوت بەهۆی کورتیی بالآیەوە هەرگیز ناکرێ بە ئەفسەری پایەبڵند. تووڕە و غەمبارە، بەڵام بە بۆچوونی من، لەبەر پیشەکەی نییە، بەڵکو لە پای ئەوەیە کە ژنەکەی منداڵەکانیانی بردووە و بەتەنیا جێی هێشتووە. لە دەست تەنیایی و بێکاری و قسە و قسەڵۆکی ئەم شارە بچووکە زۆر بێزارە، بەڵام بێگومان هەری زیاد ئەو خۆی وتیوتی دێنێ و دەبات. ئەو شەوە لە ڕیستۆرانتەکەدا ئەو یەکەم کەس بوو کە سەبارەت بە قەسابە قاچاخەکان، قەرزەکانی بانکی کشتوکاڵ و کۆرسەکانی قورئان کە من دوای شۆڕشەکە دەستم دانێ، قسەی کرد. بڕێکیش زیادی دەخواردەوە. بە بینینی من زۆر خۆشحاڵ بوو، گلەییی لە تەنیاییی خۆی دەکرد. وەکو بیانووهێناوەیەک بە شانازییەوە گوتی کە ئەو شەوە فەرمان و بەڕێوەبردنی شاری قارس لە دەستی ئەودایە، بۆیە پێویستە زوو ڕابێ. فەرماندەی یەکەی سەربازیی شاری قارس کە باداریی هەبوو، لەگەڵ ژنەکەیدا چووبووە ئانکارا، ئەفسەرەکەی جێگریشی، بۆ کۆبوونەوەیەکی بەپەلە بۆ ساریقامیش بانگ کرابوو. پارێزگاریش لە ئەرزەرووم بوو. هەموو هێز لە دەستی خۆیدا بوو. بەفریش بەردەوام دەباری و دیاریش بوو کە وەکو هەموو زستانێک، ماوەیەک ڕێگا و بانەکان دادەخرێن. دەسبەجێ زانیم ئەمە هەلی ژیانمە و داوای پێکێکی تر عارەقم بۆ دۆستەکەم کرد."

بە گوێرەی لێکۆڵینەوەی ئەو ئەفسەرەی کە دوای ڕووداوەکان لە ئانکاراوە ڕەوانە کرابوو، ئالبای عوسمان نووری چۆلاک -یاخۆ بە وتەی سونای: چۆلاک-ی هاوڕێی

سونای لە کۆلێژی سەربازی کە (کا) پێش کەمێک لە بێتەلەکەدا گوێی لە قسەکانی بوو، سەرەتا وەکو گاڵتەیەک ڕەزامەندیی خۆی لەسەر ئەم بیرۆکە سەمەرەیەی کودەتای سەربازی دەربڕیوە کە وەکو بەزمێکی خەیاڵی لەسەر مێزی عارەقخواردنەوە داڕێژرابوو. بابەتەکەی هێندە سانا وەرگرتبوو، بەجۆرێک گوتبووی کە ئەم کارە بە دوو تانک مەیسەر دەبێ. پاشان بەهۆی پێداگرتنی سونایەوە و بۆ ئەوەی پیاوەتیی نەڕووشێ و بەهۆی باوەڕهێنانی بەوەی کە ئانکاراش لە ئاکامدا بەم کارەیان دڵخۆش دەبێ، خۆی هاویشتبووە ئەم کارەوە، ئەگەر نا، بڕیارەکەی لە سۆنگەی ڕق و قین یاخۆ بەرژەوەندیی تاکە کەسییەوە نەبووبوو. (بە پێی ڕاپۆرتی ئەفسەرەکەی ئانکارا، بەداخەوە چۆلاک بەهۆی مەسەلەی ژنێکەوە ئەم بنەمایەی پێشێل کردبوو و لە گەڕەکی کۆماری دابووی بەسەر ماڵی پزیشکێکی ددانی ئەتاتورکچیدا.) لە پەلاماری شەوی شۆڕشکەدا بۆ سەر ماڵان و قوتابخانەکان، جگە لە نیو یەکەی سەربازی، چوار ئۆتۆمبیل و دوو تانکی جۆری (تی-١) کە بەهۆی نەبوونی پارچەی یەدەکەوە بە باشی کاریان نەدەکرد، هیچ هێزێکی تری سەربازی بەکار نەهێنرابوو. ئەگەر "تیمی تایبەت"ی ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی کە ڕووداوەکانی "فاعیلی مەجهول"یان گرتبووە ئەستۆی خۆیان، حساب نەکەین، ئەوا تەواوی ئەرکەکان لەسەر دەستی کارمەندە چاپوکەکانی میت و ئاسایش ئەنجام درابوو، چونکە ئەوان پێشبینیی قۆناغێکی ئاوا نائاساییان کردبوو، چەندین ساڵ بوو سەرژمێری هەموو قارسیان کردبوو و لە هەر دە کەس لە دانیشتووان، یەکێکیان هاوکاری دەزگای ئاسایش بوون. ئەم کارمەندانە، دوای ئاگادار کردنەوەیان لە نەخشەی سەرەتایین کودەتاکە، وایان بە شاردا بڵاوکردەوە کە لایسیستەکان لە هۆڵی شانۆی گەل خۆیان نمایش دەکەن. هێندەش کامەران بوون، بەجۆرێک تەلەگرافی فەرمییان نارد بۆ ئەو هاوڕێیانەیان کە بە مۆڵەت چووبوونە دەرەوەی قارس و داوایان لێ کردبوون بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ئەم بەزمە لەدەست خۆیان نەدەن.

لەو کاتەدا، (کا) لە قسەی بێتەلەکانەوە تێ گەیشت کە شەڕەکەی گەڕەکی سوقاپی گەیشتووەتە قۆناغێکی تر. سەرەتا لە بێتەلەکەوە دەنگی سێ دەستڕێژ هات، دوای چەند چرکەیەک کە گوێی لە دەنگی کپی تەقە بوو کە لە پێدەشتە بەفراوییەکەوە



دەهاتە بەر گوێ، هەستی کرد ئەو دەنگەی کە بێتەلەکە گەورەی دەکاتەوە، خۆشترە.

سونای گوتی: (هۆڤ مەبن، بەڵام نیشانی بدەن کە شۆڕش و دەوڵەت بەهێزن و مۆڵەت نادەن کەس گاڵتەیان پێ بکات." چەناگەی لەسەر شێوەی بیرکردنەوە و بە جووڵەیەکی هێندە تایبەت بە پەنجەی سێیەمی دەستی چەپی و بە پەنجەی دۆشاومژەی گرتبوو، بەجۆرێک (کا) بیری کەوتەوە کە سونای لە ناوەڕاستی ١٩٧٠دا هەمان ڕستەی لە نمایشێکی مێژووییدا گوتووە. چیدی وەکو جاران کەشخە نەبوو، ماندوو و پەرپووت و لاواز دیار بوو. دووربینێکی سەربازیی پاشماوەی ساڵانی ١٩٤٠ی دانراوی سەر مێزەکەی هەڵگرت. پاڵتۆ لبادییە ئەستوور و پەڕپووتەکەی کە ماوەی دە ساڵ لە گەشتەکانی ئەنادۆڵدا پۆشیبووی، کردە بەر و کڵاوە چەرمەکەی کردە سەر، قۆڵی (کا)ی گرت و چوونە دەرەوە. سەرماکە لە ناکاو (کا)ی تووشی سەرسوڕمان کرد، هەستی کرد کە ویست و خەیاڵەکانی مرۆڤ، سیاسەت و فڕوفێڵی ڕۆژانە چەندە بچووک و لاوازن لە بەرامبەر سەرمای قارسدا. هەمان کات بۆی دەرکەوت کە لنگی چەپی سونای لەوە زیاتر دەلەنگێ وەکو ئەم بۆی چووبوو. کاتێک بەسەر شۆستە بە بەفر داپۆشراوەکاندا دەڕۆیشتن، شەقامە سپی و چۆڵەکان و هەستی ئەوەی کە تەنیا ئەوان بە شاردا پیاسە دەکەن، هەناوی پڕ کرد لە شادی. ئەمە تەنیا ئەو خۆشەویستی و زەوقی ژیانە نەبوو کە شاری شۆخی ناو بەفر و قۆناغە کۆن و چۆڵەکان بە مرۆڤیان دەبەخشی: ئێستا (کا) زەوقی لەوەش وەردەگرت کە لە دەسەڵاتەوە نزیکە.

سونای گوتی: "ئێرە جوانترین شوێنی قارسە، لە ماوەی دە ساڵی ڕابردووا، ئەمە جاری سێیەمە خۆم و تیپەکەم دێینە قارس. هەر جارێکیش کە تاریکایی دادێ، دێمە ژێر دار زەیتوونە ڕووسی و سپیندارەکانی ئێرە و بە غەمگینی گوێ لە دەنگی قەلەڕەش و تیتیرواسک دەگرم و سەیری قەڵا، پرد و گەرماوە چوارسەد ساڵییەکە دەکەم."

گەیشتبوونە سەر پردی سەر ڕووبارە بەستووەکەی قارس. سونای ئاماژەی کرد بۆ یەکێک لە کوڵیتە تاک و تەراکانی سەر گردەکەی لای دەستی چەپ. (کا) لەو سەری ڕێگاکەی خوار گردەکەوە تانکێک و لەولاتریشەوە ئۆتۆمبیلێکی سەربازیی

بینی. سونای لە بێتەلەکەدا گوتی: "دەتانبینین." پاشان بە دووربینەکەی تەماشای کرد. پاش کەمێک، سەرەتا لە بێتەلەکەوە دەنگی دوو دەستڕێژ هاتە بەر گوێ. پاشان گوێیان لە دەنگێک بوو کە لە دۆڵی بەردەم ڕووبارەکەوە دەهاتە بەر گوێ و دەنگی دایەوە. تۆ بڵێی ئەمە سڵاوێک بێ بۆ ئەوان نێردرابێ؟ کەمێک لەولاترەوە، لە دەروازەی پردەکەدا دوو پاسەوان چاوەڕێی ئەمانیان دەکرد. سەیرێکی گەڕەکی کوڵێتنشینەکانیان کرد کە دوای سەد ساڵ لە شوێنێکدا بنیادنرابوون کە پێشتر شوێنی نیشتەجێی پاشا دەوڵەمەندەکانی عوسمانی بوون و بە تۆپی ڕووسەکان وێران کرابوون. سەیری پارکەکەی قەراغی ئەو بەرەوەی ڕووبارەکەیان کرد کە سەردەمانێک بۆرژوواکانی قارس بەزمیان تێدا دەگێڕا. سەیری ئەو بەشەی شاریان کرد کە دەکەوتە پشت پارکەکەوە.

سونای گوتی: "هێگل یەکەم کەس بوو بۆی دەرکەوت کە دیرۆک و شانۆ لە هەمان کەرەستە خوڵقێنراون. ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە لە مێژوویشدا وەکو شانۆ -ڕۆڵ- دابەش دەکرێ. کوتومت وەکو لە شانۆدا، لە مێژوویشدا هەر کەسانی بەجەرگ دێنە سەر تەختەی شانۆ..."

هەموو دۆڵەکە بە دەنگی تەقینەوەیەک لەرزی. (کا) تێ گەیشت کە تفەنگی سەر تانکەکەیش دەستی بە کارکردووە. تانکەکەیش تۆپی تەقاندبوو، بەڵام سەری کردبوو. دەنگەکانی دواتریش، دەنگی نارنجۆکی دەستی سەربازەکان بوون. سەگێک دەوەڕی، دەرگای کوڵێتەکە کرایەوە، دوو کەسی لێ هاتنە دەرەوە و دەستیان بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. (کا) کڵپەی ئاگری بینی کە لە پەنجەرە شکاوەکانەوە دەردەچوون. ئەوانەی لە کوڵێتەکە هاتبوونە دەرێ و دەستیان بەرز کردبووەوە، خۆیان هاویشتە سەر بەفرەکە. سەگێکی ڕەش کە بەدرێژاییی ئەو هات و هاوارە بە زەوقەوە دەوەڕی و لەو ناوە هەڵدەبەزی، بە کلک بادانەوە خۆی گەیاندە سەر ئەوانەی کە خۆیان دابوو بەسەر بەفرەکەدا. دواتر (کا) کەسێکی بینی کە لە پشتەوە ڕای دەکرد و چاوی لە تەقەکردنی سەربازەکان بوو. کابرا کەوتە سەر زەوی. پاشان هەموو دەنگەکان کپ بوون. دوای ماوەیەکی درێژ یەکێکیان هاواری کرد، بەڵام سەرنجی سونای پەرش و بڵاو بوو.



پاسەوانەکانی پشتەوەیان گەڕانەوە بۆ کارگەی بەرگدوورینەکە. لەگەڵ بینینی کاغەزە جوانەکانی باڵەخانە کۆنەکەدا، (کا) تێ گەیشت کە خۆی لە بەرانبەر بە شیعرێکی نوێی هەناویدا بۆ ڕاناگیرێ، خۆی خزاندە گۆشەیەکەوە.

(کا) بێ هیچ دوودڵییەک، زەوقی هاوجووتی لەگەڵ دەسەڵاتدا کە پێش کەمێک لەگەڵ سونایدا هەستی پێ کردبوو، چێژی هاوڕێیەتیکردن لەگەڵیدا و هەستی خۆ بە تاوانبارزانین لە بەرامبەر خۆکوشتنی کچاندا خستە ئەم شیعرەوە و ناوی لێ نا (خۆکوشتن و دەسەڵات.) دواتر هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە هەموو ئەو پێشهاتانەی لە قارسدا بینیبووی، لەم شیعرە (تەندروست)ە دا بە هەموو هێزی خۆیان و بێ دەستکاری گوزارەیان لێ کراوە.

# ٢٣

## خوا هێندە دادپەوەرە کە بزانێ گرفتەکە بەتەنیا کێشەی عەقڵ و باوەڕ نییە، بەڵکو ئاریشەی سەرلەبەری ژیانە

### لە فەرماندەیی لەگەڵ سونایدا

کاتێک سونای بینی کە (کا) لە نووسینەوەی شیعرەکەی بووەوە، لە بەردەم مێزی کارەکەی کە پڕ بوو لە کاغەز، هەستایە سەرپێ، پیرۆزباییی لێ کرد، چووە لایەوە و گوتی: "ئەو شیعرەی دوێنێ لەسەر شانۆ خوێندتەوە، زۆر هاوچەرخانە بوو، بەڵام جێی داخە بینەری وڵاتی ئێمە لە ئاستێکدا نییە کە لە هونەری هاوچەرخ تێ بگات. لەم سۆنگەیەوەیە کە لە شاکارەکانمدا ژنانی سەماکەر و سەرچڵییەکانی ڤوراڵی گۆلچی بەکاردەهێنم، چونکە میللەت لەوە دەگەن. دواتر و بێ نواندنی هیچ سازشێک، نوێترین –شانۆگەریی ژیان–ی ئاوێتەبووی ژیانی بەسەردا دەکەم. من هونەرێکی هاوکات نابووت و ڕەسەنم لەگەڵ خەڵکدا پێ باشترە وەک لەوەی بە قەرزی بانکەکان لە ئەستەمبوڵ ڕۆڵی کۆمیدییە لاساییکەرەوەکانی بولڤارەکان بگێڕم. ئێستا وەکو برادەرێک پێم بڵێ بۆچی تاوانبارانی ناو ئەو توندڕەوە گومان لێکراوانەت دەستنیشان نەکرد کە لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و لە کۆلێژی پزیشکیی ڤێتەرنەری نیشانت دران؟"

"کەسم بۆ نەناسرایەوە."

"لێپرسراوانی سوپا، دوای ئەوەی لە خۆشەویستیی لە ڕادەبەدەری تۆ بۆ ئەو کوڕە لاوە تێ گەیشتن کە تۆی بۆ لای شینە بردبوو، ویستیان دەستگیرت بکەن. هاتنت بەم بەرەبەری شۆڕشە لە ئەڵمانیاوە و ئامادەبوونت لە جێی کوژرانی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە، گومانی لای ئەوان خوڵقاندووە. دەیانویست بتخەنە ژێر لێکۆڵینەوە و چی لە ناختدا هەیە و نییە بە ئەشکەنجە لێتی دەربێنن، بەڵام من ڕام گرتن و بووم بە کەفیلت."



"زۆر سوپاس."

"هێشتا ڕوون نەبووەتەوە بۆچی تەرمی ئەو لاوەت ماچ کردووە کە تۆی بۆ لای شینە بردبوو."

(کا) گوتی: "دەزانم، ڕەهەندێکی زۆر ڕەسەن و لە ناخەوەی هەبوو. وام دەزانی سەد ساڵ دەژی."

"ئەو نەجیبەی تۆ خەمی بۆ دەخۆی، بۆت بخوێنمەوە چی نەجیبێک بووە؟" کاغەزێکی دەرهێنا و دەستی بە خوێندنەوەی کرد: نەجیب لە مانگی ئاداری پاردا جارێک لە قوتابخانە هەڵهاتووە، لە ڕووداوی شکاندنی جامخانەی بیرەخانەی نەشئەدا بەبیانووی ئەوەی لە مانگی ڕەمەزاندا بیرەی فرۆشتووە، بەشدار بووە، لە بارەگای لقی پارتی ڕەفا کاری سەرپێیی کردووە، بەڵام یان لەبەر بیر و بۆچوونە توندەکانی، یاخۆ بەهۆی ئەوەی فێیەکی مەترسیداری هەبووە، لەوێ دەرکراوە (لە بارەگای لقی پارتی ڕەفادا زیاد لە سیخوڕێک هەبوو)، لە ماوەی هەژدە مانگی ڕابردوودا هەوڵی داوە لە هاتنەکانی شینەدا بۆ شار، خۆیی لە ناوبراو نزیک بخاتەوە، چونکە زۆر شەیدای بووە، بەسەرهاتێکی نووسیوە کە بەلای کارمەندانی میتەوە مایەی "تێ نەگەیشتنە" و لە بەردەم دەرگای ڕۆژنامەیەکی ئیسلامیی قارسدا کە حەفتا و پێنج ژمارەی لێ دەفرۆشرێ، فڕێی داوە. دوای ئەوەی دەرمانگرەوەیەکی خانەنشین کە لەو ڕۆژنامەیەدا گۆشەیەکی هەبوو، چەند جارێک نەجیبی بە شێوەیەکی سەیر ماچ کردووە، نەجیب لەگەڵ فازیلی هاوڕێیدا نەخشەی کوشتنیان داڕشتووە (کۆپیی ڕاستەقینەی ئەو نامەیەی کە بەنیاز بووبوون لە شوێنی تاوانەکە جێی بهێڵن، لە ئەرشیفەکانی میت دزرابوو، ئەوەی لە دۆسییەکەدا بوو، کۆپییەکی لەبەرگیراوەی نامەکە بوو.)، لە کاتی جۆراوجۆردا لەگەڵ برادەرەکانیدا بە شەقامی ئەتاتورکدا تێ پەڕیوە و جارێک لەو جارانە و لە مانگی ئۆکتۆبەری ڕابردوودا، لە دواوە پۆزی بەسەر ئۆتۆمبیلێکی پۆلیسی سڤیلدا لێ داوە کە بەلایاندا تێ پەڕیوە.

(کا) گوتی: "دەزگای هەواڵگریی میللی لێرە زۆر چالاکە."

"ئەوان دەزانن تۆ چوویتەتە تەکیەی شێخ سەعادەدین ئەفەندی کە لە هەموو

سووچێکیدا میکرۆفۆن چێندراوە. خۆت هاویشتووەتە بەردەمی و دەستەکانیت ماچ کردووە و بە چاوی پڕ لە گریانەوە باوەڕهێنانی خۆت بە خودا ڕاگەیاندووە. لە ناو دەست و پێوەندەکانیدا خۆت خستووەتە دۆخێکی نەشیاوەوە. بەڵام ئەوان سەریان لەوە سوڕماوە تۆ بۆچی هەموو ئەمانەت کردووە؟ زۆر شاعیری چەپ لەم وڵاتەدا سەریان لێ شێواوە و لە سۆنگەی ئەوەی -بە قوربانە با بەر لەوەی دەسەڵات بگرنە دەست، ببمە ئیسلامی-، سەنگەریان گواستووەتەوە."

(کا) سوور هەڵگەڕا، کاتێکیش هەستی کرد کە سونای ئەم شەرمەی بە خاڵی لاوازی بۆ دەحەسبێنێ، هێندەی دی شەرمی بە خۆیدا هاتەوە.

"دەزانم ئەو شتانەی کە ئەم بەیانییە بینیووتن، غەمگینیان کردووی. هەڵسوکەوتی پۆلیس لەگەڵ لاوەکاندا زۆر خراپە، تەنانەت ئاژەڵی وایان تێدایە کە تەنیا بۆ چێژوەرگرتن تێلا دەوەشێنێ. بەڵام ئێستا با ئەمە بخەینە لاوە..."

جگەرەیەکی بۆ (کا) درێژ کرد. "منیش وەکو تۆ لە تافی لاویمدا بە شەقامەکانی نیشانتاشی و بەیئۆغلودا پیاسەم دەکرد، وەکو دێوانە سەیری فیلمە ڕۆژئاواییەکانم دەکرد و هەموو کتێبەکانی سارتەر و زۆلام دەخوێندەوە، باوەڕم وابوو کە داهاتووی ئێمە لە ئەوروپادایە. ئێستایش، لە کاتێکدا کە ئەم جیهانە لەبەریەک هەڵبووەشێ، خوشکەکانت ناچار بکرێن سەرپۆش لەسەر بکەن و شیعرەکانت لەبەرئەوەی لەگەڵ ئایندا یەک ناگرنەوە، وەکو ئەوەی لە ئێران باوە، قەدەغە بکرێن، من باوەڕ ناکەم تۆ بێدەنگ بیت و تەنیا تەماشا بکەیت. چونکە تۆ سەر بە جیهانەکەی منی. لە قارسدا کەسێکی تر شک نابەم کە شیعرەکانی ت.س. ئەلیوتی خوێندبێتەوە."

(کا) گوتی: "موختاری پاڵێوراوی پارتی ڕەفا بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی، خوێندوویەتیەوە، ئەو زۆر ئالوودەی شیعرە."

سونای بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "باوەڕت هەبێ هیچ پێویستی نەکرد دەستگیری بکەین. نامەی خۆکێشانەوەی پاڵاوتنی بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی لەسەر کاغەزێک نووسیبوو و واژۆی کردبوو و دابوویە دەستی یەکەم سەرباز کە لە دەرگای ماڵەکەی دابوو."



تەقینەوەیەک ڕووی دا، جام و چوارچێوەی پەنجەرەکان لەرینەوە. هەردووکیان نیگایان لەو پەنجەرانە بڕی کە بەسەر ڕووباری قارس و سەرچاوەی تەقینەوەکەدا دەیانڕووانی، بەڵام جگە لە سپیندارە بە بەفر داپۆشراوەکان و باڵەخانە هاکەزایی و شەختەبەستووەکەی ئەوبەری ڕێگاکە، هیچی تریان نەبینی. بۆیە لە پەنجەرەکان نزیک بوونەوە. جگە لە پاسەوانی بەردەم دەرگاکە، کەسی تر بە کوچەکەوە نەبوو، قارس، تەنانەت لە دەمی دوانیوەڕۆشدا زۆر غەمگین بوو.

سونای بە ئەدایەکی سووکی نمایشکارانەوە گوتی: "ئەکتەرێکی باشە، ئەو هێزانە نمایش دەکات کە ساڵانێکی درێژە، سەدان ساڵە لە مێژوودا کەڵەکە بووە و خراوەتە پەڕاوێزەوە، نەتەقیوەتەوە، نەهاتووەتە دەرەوە و نەهێنراوەتە سەر زمان. بەدرێژاییی ژیانی، لە دوورەدەستترین شوێنەکان، لە ڕێگا و بانە هیچ خۆ لێ نەدراو و تاقی نەکراوەکان و لەسەر سەختترین شانۆکان، بەدوای دەنگێکدا دەگەڕێ کە ئازادییەکی ڕاستەقینەی پێ ببەخشێ. ئێستایش کە ئەوەی دۆزیوەتەوە، پێویستە بێ ترس و سڵەمینەوە بڕوات و ڕانەوەستێ."

(کا) گوتی: "دوای سێ ڕۆژی تر بەفر دەتوێتەوە، ڕێگا و بانەکان دەکرێنەوە و ئانکارا حسابی ئەو خوێنە دەپرسێ کە لێرە ڕژاوە. نەک لەبەر پەرۆشیان بۆ خوێن نەڕشتن، بەڵکو لەبەرئەوەی حەز ناکەن کەسێکی تر لەبری ئەوان ئەم کارە بکات. قارسییەکانیش نەفرەت لە خۆت و لەم نمایشە سەمەرەیەت دەکەن. ئەوسا چی دەکەی؟"

سونای گوتی: "پزیشکەکەت بینی؟ نەخۆشیی دڵم هەیە، گەیشتوومەتە کۆتاییی ژیانم، دەربەس نیم. سەرنج بدە، شتێکم بیرکەوتەوە: دەڵێن ئەگەر کەسێک، بۆ نموونە ئەوەی کە تەقەی لە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە کردووە، دەستگیر بکەین و هەڵی بواسین و ئەمەیش لە وەشانی زیندووی تەلەفزیۆندا نیشان بدەین، ئەوا قارس وەکو ماستی مەییوی لێ دێ.

(کا) گوتی: "هەر لە ئێستاوە لە ماستی مەییو دەچێ."

"خۆیان بۆ هێرشی خۆکوژی ئامادە دەکەن."

"ئەگەر یەکێکیان لێ هەڵبواسن، بارودۆخەکە مەترسیدارتر دەبێ."

"ئایا ترسی ئەوت هەیە ئەوروپاییەکان ڕەفتارەکانی ئێرەمان ببینن و شەرمت بە خۆتدا بێتەوە؟ گەلۆ دەزانی ئەوان چەند مرۆڤیان هەڵواسی تاکو ئەو جیهانە هاوچەرخەیان بەدی هێنا کە ئێستا تۆ شەیدای بوویت؟ ئەتاتورک کەسێکی مێشک چۆلەکەی وەکو تۆی هەر لە ڕۆژی یەکەمدا هەڵدەواسی. شتێکیش هەیە زۆر باش بیزانە، ئەو قوتابیانەی ئامادەیی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە ئەمڕۆ لە زیندان بینیتن، شێوەی تۆیان بۆ هەمیشە لە مێشکی خۆیاندا چەسپاندووە. دەتوانن بۆمباکانیان لە هەموو شوێنێک و بە هەموو کەسێکدا بتەقێننەوە، ئەوەندەیان بەسە دەنگیان ببیسترێ. سەرباری ئەوەیش، تۆ لەبەرئەوەی دوێنێ شیعرت خوێندووەتەوە، ئێستا بە ئەندامی گرووپەکەی ئێمە دادەنرێی... هەر کەسێک کە تۆزقاڵێک خووی ڕۆژئاوایی گرتبێ، بە تایبەتیش ئەو ڕۆشنبیرە لووتبەرزانەی کە بە چاوی نزمەوە لە خەڵک دەڕوانن، پێویستیان بە سوپایەکی لایسیست هەیە، ئەگەر نا، ئەوا ئیسلامییەکان، خۆیان و ژنە دەموچاو بۆیاخراوەکانیان بە چەقۆی کوول لەتوپەت دەکەن. کەچی ئەو زماندرێژانە خۆیان بە ئەوروپایی دەزانن و پۆز بەسەر ئەو سوپایەدا لێ دەدەن کە لە ڕاستیدا ئەوان دەپارێزێ. بۆچی تۆ پێت وایە ئەو ڕۆژەی ئێرەیش وەکو ئێرانی لێ دێ، کەس ئەوەی بیر دەکەوێتەوە کە لیبراڵێکی دڵنەرمی وەکو تۆ فرمێسکی بۆ لاوەکانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان هەڵڕشتووە؟ ئەو کاتە، لەبەرئەوەی کەمێک ڕۆژئاواییت، لە ترساندا بیسمیلات نەکردووە، لووتبەرزی، کراڤاتت گرێ داوە، یاخۆ لەبەرئەوەی ئەم پاڵتۆیەت پۆشیووە، دەتکوژن. ئەم پاڵتۆ جوانەت لە کوێ کڕیوە؟ ئایا دەتوانم لە نمایشێکدا لەبەری بکەم؟"

"بێگومان."

"بۆ ئەوەی کون نەکەوێتە پاڵتۆکەت، پاسەوانێک دەخەمە تەکت. پاش کەمێک لە تەلەفزیۆندا ڕای دەگەیەنم کە قەدەغەی هاتوچۆکردن دەکرێ تەنیا لە نیوەڕۆدا هەڵبگیرێ. مەچۆ دەرەوە."

(کا) گوتی: "تیرۆریستی –ئیسلامی–ی ئەوتۆ لە قارسدا نین کە مایەی ترس بن بۆ سەر مرۆڤ."



سونای گوتی: "ئەوانەی کە ئێستا هەن، بەسن. سەرباری ئەوەیش، ئەم وڵاتە تەنیا بە شێوەیەک دەبرێ بەڕێوە کە ترسی ئاین لە دڵی میللەتدا بچێنرێ. ئەگەر میللەت لە ئیسلامییەکان نەترسێ و پەنا بۆ دەوڵەت و سوپا نەبات، ئەوا وەکو لە هەندێک هۆزە دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیادا باوە، دەکەوێتە باوەشی دواکەوتوویی و توندوتیژییەوە."

ڕەپ ڕاوەستانی و شێوازی دووانی وەکو ئەوەی کە فەرمان دەربکات، ڕووانینی درێژخایەنی بۆ خاڵێکی خەیاڵیی بە بۆشاییی سەر بینەرانەوە، ئەو پۆزانەی خستەوە بیری (کا) کە سونای بیست ساڵ لەمەوبەر لەسەر شانۆ لێی دەدا. بەڵام پێکەنینیشی بە سەرجەم ڕەوشەکە دەهات و وا هەستی دەکرد کە خۆیشی بەشێک بێت لەم نمایشە مۆدە بەسەرچووە.

(کا) گوتی: "ئیدی پێم بڵێن چیتان لە من دەوێ؟"

ئەگەر من نەبم، مەحاڵە بتوانی لەمەودوا لەم شارەدا خۆت لەسەر پێ بۆ ڕابگیرێ. هەرچەندیش ماستاو بۆ ئیسلامییەکان سارد بکەیتەوە، لە ئاکامدا هەر کون دەکەنە پاڵتۆکەت. تاکە داڵدە و دۆستی تۆ لە قارسدا، هەر منم. لە بیریشت نەچێت، ئەگەر دۆستایەتیی من لە دەست بدەی، ئەوا دەخزێیتە ژوورەکانی نهۆمی خوارەوەی بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و دەکەویتە بەر ئەشکەنجە. هاوڕێکانیشت لە ڕۆژنامەی جمهورییەت باوەڕ بە تۆ ناکەن، بە سوپای دەکەن. ئەمانە بزانە."

"دەزانم."

"دە کەوابوو ئەو شتانەم پێ بڵێ کە ئەم بەیانییە لە پۆلیست شاردەوە و بەهۆی هەستکردن بە تاوانەوە، لە سووچێکی دڵتدا حەشارت داوە."

(کا) بەدەم زەردەخەنەوە گوتی: "وێ دەچێ لێرە باوەڕ بە خودا بێنم، پێم وابێ هێشتا ئەمە لە خۆم دەشارمەوە."

"خۆت لە خشتە دەبەیت! ئەگەر باوەڕیش بێنی، هیچ کەڵکی نییە، چونکە هەر خۆتی بەتەنیا. گرفتەکە لەوەدایە کە وەکو هەژارەکان باوەڕ بێنی و ببی بە یەکێک لەوان. تۆ کاتێک دەتوانی باوەڕ بە خودای ئەوان بێنی، لەوە بخۆیت کە ئەوان

دەیخۆن، لەناویاندا بژیت، لەگەڵ پێکەنینی ئەواندا پێ بکەنی و لەگەڵ گریانیاندا بگری. تۆ ناتوانی باوەڕ بەهەمان خودا بێنی و ژیانێکی تەواو جیاوازیشت لەوەی ئەوان هەبێ. خودا هێندە دادپەروەرە کە بزانێ گرفتەکە بەتەنیا کێشەی عەقڵ و باوەڕ نییە، بەڵکو ئاریشەی سەرلەبەری ژیانە. بەڵام ئەوەی تۆ وەڵامی پرسیارەکەی من نەبوو. دوای نیو سەعاتی تر دەچمە تەلەفزیون و قسە بۆ قارسییەکان دەکەم. دەمەوێ مزگێنییەکیان بدەمێ. لە قاو دەدەم کە بکوژی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە دەستگیرکراوە. بە ئەگەری زۆر، بەڕێوەبەری شارەوانیش هەر لەسەر دەستی هەمان کەس کوژراوە. ئایا دەتوانم بە بینەران ڕابگەیەنم کە تۆ ئەم بەیانییە پەنجەت خستووەتە سەر ئەو تاوانبارە؟ دوایی تۆیش دێیتە سەر تەلەفزیۆن و هەموو شتێک دەگێڕیتەوە."

"بەڵام من نەمتوانی هیچ کەسێک دەستنیشان بکەم."

سونای بە جووڵەیەکی تووڕەوە کە زۆر لە کەشی شانۆ دوور بوو، قۆڵی (کا)ی گرت و چوونە دەرەوە، بە ڕێڕەوێکی فراواندا تێ پەڕین و بردیە ژوورێکی سپیی سادە کە بەسەر حەوشی ناوەوەدا دەیڕوانی. (کا) هەر کە چاوی بە ژوورەکە کەوت، ویستی ڕووی خۆی وەربگێڕێ، چونکە لە تایبەتمەندییەکەی ترسا، نەک لە پیس و پۆخڵییەکەی. تەنافێک کە سەرێکی بە دەسکی پەنجەرەکە و سەرەکەی تری بە بزمارێکی سەر دیوارەکەوە بەسترابوو، چەند جووتێک گۆرەویی پێدا هەڵواسرابوو. لە باوڵێکی کراوەی گۆشەیەکدا، ئامێرێکی وشککردنەوەی قژ، دەستکێش، کراس و هەروەها مەمکدانێکی گەورەی بینی کە مەگەر هەر فوندا ئەسەر لەبەری بکردایە. فوندا ئەسەریش لەسەر کورسییەک لەولاوە دانیشتبوو، خەریکی کەوچک لێدان بوو لە قاپێک ((کا) لە خۆی پرسی داخۆ ئەمە شەربەتە یان شۆربا؟) کە لە تەنیشت تڕ و تفاقی ماکیاژەکانیەوە لەسەر مێزێکی بە کاغەز داپۆشراو دانابوو و لەگەڵیشیدا دەیخوێندەوە. سونای بەدەم زیاتر گوشینی قۆڵی (کا)وە گوتی: "ئێمە لە پێناوی هونەری هاوچەرخدا لێرەین... و وەکو گۆشت و نینۆک پێکەوە لکاوین."

(کا) نەیتوانی لە مەبەستی سونای تێ بگات و بۆی ڕوون نەبووەوە کە داخۆ ئەمەی نمایشە یاخۆ ڕاستی.



فوندا ئەسەر گوتی: "ڤورالّی گۆلّچی ونە. سەرلەبەیانی دەرچووەتە دەرەوە و نەگەڕاوەتەوە."

سونای گوتی: "بزانە خۆی خزاندووەتە چ پەسارێکەوە."

ژنەکەی لە وەڵامدا گوتی: "لە کوێ خۆی دەشارێتەوە؟ هەموو جێیەک داخراوە. کەس ناڕواتە دەرەوە. سەربازەکان دەستیان کردووە بە گەڕان بە دوایدا. ترسی ئەوەیان هەیە ڕفێنرابێ."

سونای گوتی: "خودا بکات ڕفێنرابێ. ئەگەر پێستی بگروون و زمانی لە بندا ببڕن، ئەوا منیش ڕزگارم دەبێ لە دەستی."

سەرباری زبریی دیمەنەکە و ڕەقیی وشەکان، (کا) گاڵتە و گەپێکی ڕۆحسووک و هارمۆنییەکی هێندە پتەوی نێوان ڕۆحی ئەو جووتەی بینی، بەجۆرێک لە ناخەوە و بە ئیرەیی پێ بردنەوە لە بەرانبەریاندا هەستی بەڕێز کرد. هەر لەو ساتەدا کە نیگای کەوتە سەر نیگای فوندا ئەسەر، خۆبەخۆ خۆی چەماندەوە و سڵاوی لە ژنەکە کرد.

(کا) بە دەنگێکی دروستکراوەوە، بەڵام لە ناخەوە هەڵقوڵاو گوتی: "خانمی خانمان، دوێنێ بێ وێنە بوون لەسەر شانۆ."

ژنەکە بە سووکە شەرمێکەوە گوتی: "زیاد لە پێویست ستایش دەکەیت گیانەکەم. لە شانۆی ئێمەدا ماریفەت بەلای ئەکتەرەوە نییە، بەلای بینەرەوەیە."

ڕووی لە پیاوەکەی کردەوە. ژن و پیاوەکە وەکو پاشایەک و شاژنێک کە خەمی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتێکیان لەبەر بێ، بەپەلە قسەیان دەکرد. بە بەرچاوی (کا)وە کە نیو شەیدا و نیو سەرسووڕماو تێی دەڕوانین، گفتوگۆیەکی خێرایان کرد و بڕیاریان لەسەر ئەرکەکان دا: سونای کە پاش کەمێکی تر دەچێتە سەر تەلەفزیۆن، ئایا چی بپۆشێ (جلوبەرگی سڤیل، سەربازی یاخۆ کوستووم؟)، ئامادەکردنی دەقی وتارەکە (بەشێکی لە لایەن فوندا ئەسەرەوە نووسرابوو)، داوای پارێزگاری لێکردن و زمان لێدانێکی خاوەنی هوتێلی -شەنگ قارس- سەبارەت بە دوو میوان کە پێش لە ڕووداوەکان لای ئەو ماونەتەوە (بەهۆی ئەوەی کە سەربازەکان لێکدالێکدا خۆیان بە هوتێلەکەیدا کردبوو و بە پشکنین بێزاریان کردبوو، خۆی زمانی لە دوو میوانی لاوی

گومان لێکراو دابوو)؛ بەرنامەی دوانیوەڕۆی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) کە لەسەر کاغەزی پاکەتە جگەرەیەک نووسرابووەوە (وەشاندنی ئاهەنگەکەی شانۆی گەل بۆ جاری چوارەم و جاری پێنجەم، سێ جار بڵاوکردنەوەی وتارەکەی سوونای، پێشکەشکردنی فیلمی گەشتیاری کە قارەمانی و مۆزیکی سەرحەد و جوانکارییەکانی قارس دەخاتە ڕوو، فیلمی خۆماڵی: گوڵعوزار.)

سونای پرسی: "ئەدی چی لەم شاعیرەمان بکەین کە هۆشی لە ئەورووپایە و دڵی لای میلیتانەکانی پێشنوێژ و وتارخوێنانە و سەریشی جەنجاڵە؟"

فوندا ئەسەر بەدەم خەندەیەکی شیرینەوە گوتی: "بە ڕوویدا دیارە کوڕێکی باشە، یارمەتیمان دەدات."

"بەڵام ئەو فرمێسک بۆ ئیسلامییەکان دەڕێژێ."

فوندا ئەسەر لە وەڵامدا گوتی: "شاعیرەکەمان، بەهۆی ئەوەی کە ئەڤینداره، لەم ڕۆژانەدا هەستی زۆر ناسک بووەتەوە."

سونای زایم بە ئاماژەیەکی پێوەنراوی دەستەوە گوتی: "ئاوها، شاعیرەکەمان ئەڤیندارە؟ تەنیا شاعیرە سادە و ساویلکەکان لە کاتی شۆڕشەکاندا بە ئەڤینەوە سەرقاڵ دەبن."

فوندا ئەسەر گوتی: "بەڵام ئەم شاعیرێکی سادە نییە، عاشقێکی سادەیە."

ژن و پیاوەکە کەمێکی تر بە بێ هەڵە درێژەیان بە گەمەکەیان دا و بەوەیش (کا)یان هەم زویر کرد و هەم گێژ. دواتر لە دەوری مێزە گەورەکەی کارگەی بەرگدوورینەکە بەرامبەر بەیەک دانیشتن و چایان خواردەوە.

سونای گوتی: "بۆ ئەوە دەیڵێم تاکو بڕیار بدەی، هاوکاریکردنت لەگەڵ ئێمەدا ژیرانەترین کارە. قەدیفە دۆستی شینەیە. کابرا لە پیناوی ئەویندا دێت بۆ قارس، نەک بۆ سیاسەت. دەستگیرکردنی ئەم بکوژە دوا خرا بۆ ئەوەی ئەو لاوە ئیسلامییانە دەستنیشان بکرێن کە ئەو پێوەندییان پێوە دەکات. ئێستا کارمەندانی ئاسایش پەشیمانن، چونکە دوێنی کەمێک بەر لە هێرشەکانی سەر بەشە ناوخۆییەکان، لە چاوترووکاندنێکدا ون بووە. هەموو لاوە ئیسلامییەکانی قارس



شەیدای ئەون و پێوەی پەیوەستن. لە شوێنێکدایە لە قارس و بێگومان دیسانەوە بە دوای تۆدا دەگەڕێ. لەوانەیشە زۆرت بۆ دژوار بێ کە بتوانی ئاگادارمان بکەیتەوە: وەکو ئەوەی لەگەڵ خودالێخۆشبوو بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەدا کرابوو، میکرۆفۆنێکیش -تەنانەت دوانیش- لەسەر جەستەت دەبەسترێ و شەپۆلهاوێژێکی بێتەلیش دەخرێتە پاڵتۆکەتەوە. پێویست ناکات بترسی. هەر کە تۆ دوور کەوتیتەوە، ئەو دەستگیر دەکرێ." سونای دەسبەجێ بە ڕووخساری (کا)دا بۆی دەرکەوت کە بیرۆکەکەی بە دڵ نییە. بەدویدا گوتی: "زۆرت لێ ناکەم، بەڵام بە ڕەفتارەکانی ئەمڕۆتدا دیارە کە خۆت دوورەپەرێز دەگری. دەزانی چۆن خۆت بپارێزی، بەڵام سەرباری ئەوەیش وشیارت دەکەمەوە لەگەڵ قەدیفەدا وریا بیت و ئاگات لە خۆت بێت. گومانی ئەوەی لێ دەکرێ، هەرچییەکی دەیبیستێ، دەیگەیەنێتە شینە؛ بە گفتوگۆی ئێوارانی نێوان باوکی و میوانەکانیشیەوە. ڕەنگە لەبەرئەوە بێ کە چێژ لە ناپاکیکردن لە باوکی وەردەگرێ، بەڵام لەبەرئەوەیشە کە ئەڤین بە شینەوەی گرێ داوە. تۆ چ شتێک لەو کەسەدا شک دەبەی کە هێندە شایەنی ئەڤینداربوون بێت؟"

(کا) پرسی: "لە قەدیفەدا؟"

سوناکی بە ڕقەوە گوتی: "بێگومان لە شینەدا، بۆچی هەموو کەسێک شەیدای ئەو پیاوکوژە دەبێ؟ بۆچی لە هەموو ئەنادۆڵدا ناوێکی ئەفسانەیی هەیە؟ تۆ کە لەگەڵیدا دوواوی، ئایا دەتوانی ئەمەم بۆ ڕوون بکەیتەوە؟"

فوندا ئەسەر شانەیەکی پلاستیکیک دەرهێنا و بە دلۆڤانی و بایەخەوە کەوتە شانەکردنی پرچی سیسەوەبووی پیاوەکەی. سەرنجی (کا) بەتەواوی پەرش و بڵاو بووەوە و نقەی لێوە نەهات.

سونای گوتی: "لە تەلەفزیۆندا گوێ لە وتارەکەم بگرە. ئێستایش وا دەکەم کە بە ئۆتۆمبیل بتگەیەننەوە هوتێل."

هێشتا چل و پێنج خولەکی مابوو بۆ هەڵگرتنی قەدەغەی هاتوچۆکردن. (کا) داوای کرد ڕێی پێ بدەن بەپێ بۆ هوتێل بگەڕێتەوە. ڕێیان پێ دا.

چۆڵیی شەقامی بەرفراوانی ئەتاتورک، بێدەنگیی کوچە بە بەفر داپۆشراوەکانی

ئەمبەر و ئەوبەری، جوانیی خانووە ڕووسییە کۆنەکان و دار زەیتوونە ڕووسییەکان ئاهێکیان بەبەردا هێنایەوە. لەو ساتەدا هەستی کرد کەسێک بە دوایەوەیەتی. چووە سەر شەقامی خالید پاشا، لە شەقامی کوچووک کازم پاشا بەلای چەپدا بای دایەوە. هەواڵدزەکەی پشتەوەی بە هەڵەداوان تێ دەکۆشا خۆی پێ بگەیەنێ. سەگە ڕەشە کەیفسازەکە کە پەڵەیەکی سپی بە ناوچەوانیەوە بوو و دوێنێ بە وێستگاکەدا ڕای دەکرد، کەوتبووە دوای. (کا) خۆی کرد بە دوکانی یەکێک لە جاوفرۆشەکانی شەقامی یوسف پاشادا و چاودێریی ئەوانی کرد، هەواڵدزەکەی پشتەوەی، لەناکاو کەوتە پێشی.

"ئایا بۆ زانیاری بەدەستهێنان دوام کەوتوون، یاخۆ بۆ پاراستنم؟"

"بەخودا ئەفەندی بەگ چۆنی تێ دەگەن، با وا بێ."

بەڵام کابرا هێندە پەڕپووت و ماندوو دەینواند، نەک (کا)، بگرە خۆیشی بۆ نەدەپارێزرا. بەلانی کەمەوە تەمەنی شەست و پێنج ساڵێک دەبوو، دەموچاوێکی چرچ و دەنگێکی زیقی پێوە بوو، ڕووناکیی چاوەکانی کوژابوونەوە، وەکو پۆلیسێکی سڤیل بۆ (کا)ی نەدەڕووانی، بەڵکو لە کەسێک دەچوو کە ترسی لە پۆلیس هەبێ. (کا) کە بینی پێشەوەی پێڵاوەکانی کە مارکەی سۆمەر-بانک بوو و پۆلیسی سڤیل لە پێیان دەکرد، هەڵتەقیوە، بەزەییی بە کابرادا هاتەوە.

"ئێوە پۆلیسن، ئەگەر ناسنامەتان پێیە، دەچینە مەیخانەی نیشتمانیی سەوز و کەمێک دادەنیشین."

بێ ئەوەی پێویست بکات زیاد لە دەرگا بدەن، دەرگای مەیخانەکە کرایەوە. لەگەڵ کابرای هەواڵدزدا کە بۆی دەرکەوت ناوی سافەتە، دەستیان بەعارەقخواردنەوە کرد، سەگە ڕەشەکەشیان لە خواردنی بۆرەک بێ بەشنەکرد، لە تەلەفزیۆنیشدا گوێیان لە وتارەکەی سونای گرت. وتارەکەی هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ وتاری ئەو سەرۆکانەی کە لە دوای هەر کودەتایەکی سەربازی دەیاندا و ئەم پێشتر بینیبوونی. سونای کاتێک گەیشتە ئەوەی کە بلێ هاندانی کوردە نەوەتەوەپەرستەکان لە لایەن دوژمنانی دەرەکیمان و هەوڵی بێ پەروای سیاسەتمەدارە ڕەمەکییەکان بۆ



بەدەستهێنانی دەنگی ئیسلامییەکان و دەنگدەرانی تر، قارسی گەیاندووەتە لێواری تەقاندنەوە، ئیدی (کا) تەواو بێزار بوو. لەو کاتەدا (کا) پێکی دووەمی هەڵدا، کابرای هەواڵدز بە ڕێزەوە ئاماژەی کرد بۆ سونای لە تەلەفزیۆنەکەدا. تەمی هەواڵدزی بە ڕووخسارییەوە ڕەوییەوە، زیاتر وەکو هاوولاتییەکی بەلەنگاز دەهاتە بەرچاو کە سکالانامە دەخاتە بەردەستی فەرمانبەرێک. گوتی: ئێوە ئەو زاتە دەناسن. لەوەیش بترازێ، زۆر ڕێزی بۆتان هەیە. تکایەکم لە بەڕێزتان هەیە کە گەرەکمە پێی بگەیەنن بۆ ئەوەی لەم ژیانی دۆزەخ ئاسایە ڕزگارم بێت. تکایە با لەم لێکۆڵینەوەی ژەهراویکردنە دوورم بخەنەوە و بمگوازنەوە بۆ شوێنێکی تر."

لەسەر داخوازی (کا) لە جێی خۆی هەستا، دەرگای مەیخانەکەی سولگی دا، گەڕایەوە سەر مێزەکە و دەستی بە گێڕانەوەی (لێکۆڵینەوەی ژەهراویکردن) کرد.

ئەم بەسەرهاتە کە کابرای هەواڵدزی بێچارە بە زۆر لە خۆکردنەوە گێڕایەوە، بەهۆی ئەوەی نەیتوانی مەبەستی خۆی بگەیەنێ و لەبەرئەوەی عارەقەکەیش سەری (کا)ی کاس کردبوو، هێندەی دی ئالۆز خۆی دەنوواند. بەسەرهاتەکە بەوە دەستی پێ دەکرد، کاتێک سوپا و ئاسایش گومانیان کردبوو کە جۆرە شەربەتێکی دارچینی کە لە دوکانێکی بابۆڵە-جگەرە فرۆشدا بەناوی بۆفیەی هاوچەرخ دەفرۆشرا و بە زۆری سەربازەکان ڕوویان تێ دەکرد، ژەهراوی کرابێ. یەکەم ڕووداو لە سەربازێکی پیادەی ئەستەمبوڵی قەومابوو. ئەم سەربازە، دوو ساڵ لەمەوبەر و بەر لە مانۆڕێکی سەربازی کە پێشبینی دەکرا زۆر سەخت بگوزەرێ، تووشی لەرز و تا دێ و لەسەر پێ خۆی بۆ ڕاناگیرێ. دوای ئەوەی کە بۆ نەخۆشخانە دەگوازرێتەوە، بۆی دەردەکەوێ ژەهراوی بووە و پێی وادەبێ لە مردن نزیک بووەتەوە، ئەو شەربەتە تاوانبار دەکات کە لە دوکانێکی سەر گۆشەی شەقامی کوچووک کازم پاشا و شەقامی قەرەبەکردا بە لەزەتەوە خواردووبوویەوە و پێی وابووە شتێکی نوێیە. سەرەتا، ژەهراویبوونەکە بە ڕووداوێکی سادە دادەنرێ و بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادرێ، بەڵام دواتر کە دوو سەربازی تر لە دوو کاتی جیاوازدا بە زەویدا دەکوتێ و لە نەخۆشخانە دەردەکەوێ کە ئەوانیش ژەهراوی بوون، جارێکی تر باسی ڕووداوەکە دێتەوە گۆڕێ. هەردوو سەربازەکە دەکەونە لەرزین و لەبەر خراپبوونی ڕەوشی

تەندروستییان، خۆیان لەسەر پێ بۆ ڕاناگیرێ. ئەوانیش لە داخاندا هەمان ئەو شەربەتە دارچینییە گەرمە تاوانبار دەکەن کە لە هەمان دوکان خواردبوویانەوە. ئەم شەربەتە گەرمە، داهێنراوی ژنە کوردێکی دانیشتووی گەڕەکی ئەتاتورک بوو و لە ماڵەکەی خۆیدا دەیگرتەوە. دوای ئەوەی کە هەموو لایەک ڕایان لەسەر دەبێ، لە دوکانەکەدا کە برازاکانی سەروکاری دەکەن، دەست کرابوو بە فرۆشتنی. ئەم زانیارییانە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکدا بەدەست هاتبوو کە فەرماندەیی سوپا هاوکات لەگەڵ ڕووداوەکاندا ئەنجامی دابوو. بەڵام نموونەی شەربەتی ژنەکە کە بە دزییەوە وەرگیرابوو، لە تاقیگای کۆلێژی پزیشکیی ڤێتەرنەری تاقی کرابووەوە و ژەهری تێدا نەدۆزرابووەوە. لەوەدا دەبێ پەردە بەسەر ڕووداوەکەدا بدرێ کە ژەنەراڵێک بابەتەکە بۆ ژنەکەی باس دەکات، بەڵام کابرای ژەنەراڵ بە زراوی تۆقیوەوە گوێ بۆ ژنەکەی ڕادەگرێ کە پێی دەڵێ پێی وابووە ئەو شەربەتە بۆ باداری باشە و هەموو ڕۆژێک لێوانێکی لێ خواردووەتەوە. ژمارەیەکی زۆر لە ژنانی سەربازەکان، بەڵێ، لە ڕاستیدا زۆربەی سەربازەکانیش، بەبیانووی ئەوەی کە ئەم شەربەتە بۆ تەندروستی باشە و هەروەها لەبەر بێ تاقەتی و بۆ کات بەسەر بردن، بەردەوام خواردوویانەتەوە.

دوای لێکۆڵینەوەیەکی کورت ئاشکرا دەبێ کە سەربازەکان و خێزانەکانیان، ئەو سەربازانەی بۆ بەسەربردنی پشوو ڕوو لە بازاڕ دەکەن و کەسوکاری سەربازەکانیش کە بۆ بەسەرکردنەوەی کوڕەکانیان دێن، لێکدالێکدا لەم شەربەتە دەخۆنەوە کە بە تاکە داهێنراوی شار دادەنرێ و لە چەقی بازاڕدا دەفرۆشرێ. ژەنەراڵەکە لەگەڵ بەدەستهێنانی زانیارییە سەرەتاییەکاندا ترس دای دەگرێ و لە ترسی ئەوەی نەبادا شتێکی خراپ بقەومێ، دۆسییەکە ڕادەستی دەزگای هەوڵگری و پشکێنەرانی سەرکردایەتیی ئەرکانی سوپا دەکات. سوپا لەو ڕۆژگارەدا، لە باشووری ڕۆژهەڵات لە بەرانبەر گەریلاکانی پەکەکەدا کەوتبووە شەڕێکی دەستەویەخە و هاوشان لەگەڵ سەرکەوتنەکانی سوپادا، خەیاڵی تۆڵەسەندنەوەی ترسناک و سەیر و سەمەرە بەناو لاوە بێکار و بێهێز و ئومێد لێبڕاوەکانی کورددا کە بیریان دەکردەوە پێوەندی بە ڕیزەکانی گەریلاوە بکەن، بڵاو دەبێتەوە. بێگومان



هەواڵدزانی سەر بە دەزگای هەواڵگری کە گۆشەی چایخانەکانیان بەر نەدەدا، لە چەندین خەیاڵی تووڕەی وەکو تەقاندنەوە، ڕفاندن، ڕووخاندنی پەیکەری ئەتاتورک، ژەهراویکردنی ئاوی خواردنەوەی شار و تەقاندنەوەی پردەکان ئاگادار دەبن، بۆیە سەرلەنوێ گرنگی بە مەسەلەکە دەدرێ، بەڵام لەبەر هەستیاریی بابەتەکە، بە گونجاو نازاندرێ خاوەنی بۆفیەی هاوچەرخ و شارگردەکانی بگیرێن و ئەشکەنجە بدرێن. لەبری ئەوە، هەواڵدزێکی سەر بە پارێزگا دەخزێندرێتە ئاشپەزخانەی ژنە کوردەکەوە کە ئەو دەمانە بەهۆی فرۆشی زۆری شەربەتەکەیەوە لە لوتکەی کامەرانیدا دەبێ. یەکێکی تریش لە دوکانی شەربەتەکە دەچێنرێ. هەواڵدزی دانراو لە دوکانەکە، سەرەتا لە ڕاپۆرتێکدا سەلماندی کە هیچ تۆزێکی نەناسراو بە شەربەتی دارچینی داهێنراوی ژنەکەوە، بە پەرداخە شووشەکانەوە، بە پارچە پەڕۆی ناو مەنجەڵە تەنەکەییەکانەوە، بە قوتووی پارە وردەکانەوە، بە کەوگیرە ژەنگاوییەکان و بەدەست و پلی کرێکارانەوە بەدی ناکرێ. بەڵام دوای هەفتەیەک بە گومانی هەبوونی هەمان ژەهر لە لەشیدا، دەست بە لەرزین دەکات و لەبەرئەوەی زۆر دەڕشێتەوە، ناچار دەبێ دەست لە کارەکەی هەڵبگرێ. ئەو هەواڵدزەی کە لە ماڵی ژنەکە لە گەڕەکی ئەتاتورک دانرابوو، زۆر چالاکانە ئەرکی خۆی ڕادەپەڕاند. هەموو ئێوارانێک، هاتوچۆی خەڵک بۆ ماڵەکە و کڕینی کەرەسە (گێزەر، سێو، هەڵووژە، تووی وشک، گوڵە هەنار و شیلان و گوڵە هێرۆ)ی دەکرد بە ڕاپۆرت و بۆ شوێنی مەبەست بەرزی دەکردەوە. ئەم ڕاپۆرتانە لە ماوەیەکی کورتدا بوون بە ڕەچەتە بۆ پیاهەڵدانی شەربەتەکە و هەر لەخۆوە ئیشتیهای مرۆڤیان دەکردەوە. هەواڵدزەکە ڕۆژی پێنج شەش سوراحیی لە شەربەتەکە دەخواردەوە، لە ڕاپۆرتەکانیدا ڕای دەگەیاند کە سوودەکانی بۆ دەرکەوتووە، نەک زیانەکانی. دەینووسی شەربەتەکە بە دەردی کەسانی نەخۆش دەخوات و خواردنەوەیەکی ڕاستەقینەی "چیا"یە و لە داستانی بەناوبانگی کوردی مەم و زیندا ناوی هاتووە. ئەو شارەزایانەی لە ئانکاراوە هاتبوون، متمانەی خۆیان بەم هەواڵدزە، لەبەرئەوەی کورد بوو، لە دەست دابوو بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی کە بە شارەزایان گوترابوو، شەربەتەکە، تورکەکانی ژەهراوی دەکرد و کاری لە کوردەکان نەدەکرد، بەڵام ئەم بۆچوونەیان لای کەس نەدرکاند، چونکە لەگەڵ

سیاسەتی دەوڵەتدا کە جیاوازی لە نێوان تورک و کورددا ناکات، یەکی نەدەگرتەوە. بەدوای ئەوەدا دەستەیەکی پزیشک لە ئەستەمبوڵەوە گەیشتن و لە نەخۆشخانەی میللی، خانەیەکی دابڕاوی تایبەتیان بە لێکۆڵینەوەکە دامەزراند. بەڵام بەهۆی ئەوەی خانەکە پڕ بوو لە هاوولاتیانی سپ و ساغی قارس، ئەوانەی کە دەیانویست بە خۆڕایی خۆیان بخەنە بەر پشکنین و ئەو کەسانەی کە نەخۆشیی باوی وەکو قڕژووتانەوە، دەردە ڕێوی، فدق و ناوک چوونیان هەبوو، ئەنجامی لێکۆڵینەوەی دەستە پزیشکییەکە نرخ و بەهای خۆی لە دەست دا. بەو جۆرە ئەرکی چارەسەرکردنی ئەم پلانی شەربەتە کە تا دەهات تەشەنەی دەکرد و ئەگەر ڕاست بوایە، ئەوا دەبووە هۆی مردنی هەزاران سەرباز، بۆ ئەوەی ورەی جەماوەر نەڕووخێ، سەرلەنوێ خرایە ئەستۆی کارمەندە چالاکەکانی دەزگای هەواڵگری قارس کە سافەت یەکێک بوو لە ئەوان. ژمارەیەکی زۆر هەواڵدز دەستنیشانکران بۆ چاودێری کردنی ئەو کەسانەی کە شەربەتی داهێنراوی ژنە کوردە کامەرانەکەیان دەخواردەوە. ئیدی لەوە بەدواوە گرفتەکە ئەوە نەبوو کە ژەهرەکە چۆن بەناو قارسییەکاندا تەشەنە دەکات، بەڵکو هەوڵدان بوو بۆ تێگەیشتن لەوەی کە ئایا قارسییەکان بە ڕاستی ژەهراوی دەبن یاخۆ نا؟ بەو شێوەیە هەواڵدزەکان کەوتنە چاودێریکردنی ئەو کەسانەی، چ سەرباز، چ سڤیل کە بە لەزەتەوە شەربەتی دارچینی ژنەکەیان دەخواردەوە. تەنانەت جاری وا هەبوو تا ماڵیشەوە دوایان دەکەوتن و چاودێریی شەربەت خواردنەوەکەیان دەکرد. (کا) بەڵێنی دا دەردی ئەم هەواڵدزە کە لە ئاکامی ئەو ئەرکە پڕ مەسرەف و ماندووکەرەدا پێڵاوەکانی تەقیوە و خۆیشی هێزی لەبەر بڕاوە، بگەیەنێ بە سونای کە هێشتا لە تەلەفزیۆنەکەدا قسەی دەکرد.

هەواڵدزەکە هێندە بەم بەڵێنە ڕازی بوو، بەجۆرێک لە کاتی ڕۆیشتندا خۆی لارکردەوە و بە منەتبارییەوە (کا)ی ماچ کرد، سولگیی دەرگاکەیشی بە دەستی خۆی کردەوە.



# ٢٤

## من، (کا)

### گەردیلەی شەشپاڵوویی بەفر

(کا) بە ڕێی گەڕانەوەوە بەرەو هوتێل، چێژی لە سەگە ڕەشەکەی دواوەی و دڵگیریی شەقامە چۆڵ و بە بەفر داپۆشراوەکان وەردەگرت. لە هۆڵی پێشوازی، تێبینییەکی بۆ ئیپەک نووسی "بەپەلە وەرە" و دای بە جاوید کە پێی بگەیەنێ. لە ژوورەکەی، خۆی هاوێشتە سەر جێیەکەی و بەدەم چاوەڕێکردنەوە بیری لە دایکی کردەوە، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند، چونکە دوای کەمێک هۆشی چووە سەر ئیپەک کە هێشتا نەگەیشتبووە لای. ئەو ماوە کورتەی چاوەڕێکردنی ئیپەک هێندە بە ئازار بوو، بەجۆرێک (کا) بە پەشیمانییەوە هەستی کرد کە حەزکردنی لە ئیپەک و لە بنەڕەتەوە هاتنیشی بۆ قارس کارێکی گەوجانە بووە. بەڵام ئیدی زۆری خایاند و ئیپەکیش هەر نەهات.

دوای تێپەڕبوونی سی و هەشت خولەک بەسەر گەڕانەوەی (کا)دا بۆ هوتێلەکە، ئیپەک گەیشتە لای و گوتی: "چووم بۆ لای خەڵوزفرۆشەکە، لە ترسی ئەوەی نەبادا لە دوای هەڵگرتنی قەدەغەی هاتوچۆکردن ڕیزی درێژ ببەسترێ، سەعات دوازدە کەم دە خولەک لە دەرگای حەوشەی پشتەوە دەرچووم. لە دوای دوازدەیش کەمێک خۆم بە سەیرکردنی ناو بازاڕەوە خەریک کرد. ئەگەر بمزانیبا، دەسبەجێ دەگەڕامەوە."

(کا) بەو ژینداری و گەشدارییەی کە ئیپەک لەگەڵ خۆیدا هێنابوو هێندە کامەران بوو، خەمی ئەوەی بوو ئەم ساتە بەختەوەرەی ژیانی لێ بشێوێ. سەرێکی قژە درێژ و بریسکەدارەکەی ئیپەک و دەستە بچووکەکانی کرد کە لە جووڵە نەدەکەوتن. (لە ماوەیەکی کورتدا، دەستی چەپی برد بۆ قژی، لووتی، کەمەری، قەراغ دەرگاکە، گەردنی درێژ و جوانی، دیسانەوە قژی و ملوانکەیەکی شین، تازە لە ملی کردبوو و یەکەمجار بوو (کا) دەیبینی.)

(کا) گوتی: "خراپ گرفتاری ئەڤینت بووم و ئازار دەچێژم."

"مەترسە، ئەڤینێک کە بەخێرایی کڵپە بسێنێ، بەهەمان خێرایش دادەمرکێتەوە."

(کا) بە شڵەژانەوە باوەشی پێدا کرد و هەوڵی دا ماچی بکات، بەڵام ئیپەک تەواو بە پێچەوانەی شڵەژانەکەی (کا)وە، زۆر بە ئارامی ماچی کرد. (کا) هەستی کرد ژنەکە بە دەستە بچووکەکانی کڵاوەی شانی ئەمی گرتووە، ڕامووسانەکانیش هێندە شیرین بوون، بەجۆرێک (کا)ی گێژ کرد. بەوەدا کە ئیپەک جەستەی خۆی لێ نزیک کردەوە، (کا) حاڵی بوو ژنەکە دەیەوێت ئەم جارە لەگەڵیدا بنوێ. (کا) ئێستا لە سایەی پەڕینەوەی خێرا لە ڕەشبینییەکی قوڵەوە بۆ بەختەوەرییەکی بەجۆش، هێندە کامەران بوو کە چاوەکانی، هۆشی و یادەوەریی، بۆ ئەو ساتە و بۆ هەموو جیهان کردبووەوە.

ئیپەک ساتێک نیگای بڕیە پێش خۆی. دەسبەجێ چاوە خومارەکانی هەڵهێنا و بە بڕیارەوە بڕینیە چاوەکانی (کا) و گوتی: "منیش دەمەوێ لە تەکتدا بنووم، بەڵام وەکو پێم گوتی، ناتوانم ئەمە بکەم، لە کاتێکدا باوکم لێرە لەبەر لووتماندا بێ."

"باوکت کەی دەچێتە دەرەوە؟"

ئیپەک گوتی: "هیچ ناچێتە دەرەوە." دەرگای کردەوە، گوتی: "دەبێ بڕۆم." ئەمەی گوت و دوورکەوتەوە.

ئیپەک هەتا لە پلیکانەکانی ئەوسەری ڕێڕەوە نیمچە تاریکەکەوە چووە خوارەوە، (کا) لە دواوە سەیری کرد. دەرگاکەی پێوە دا و لە قەراغ جێیەکەی دانیشت. دەفتەرەکەی بەر باخەڵی دەرهێنا و لاپەڕەیەکی پاکی هەڵدایەوە و دەستی کرد بە نووسینەوەی شیعرێک و سەردێری (بێچارەیی، دژواری)ی بۆ دانا.

(کا) دوای ئەوەی لە نووسینەوەی شیعرەکەی بووەوە، لە قەراغی چرپاکەی مایەوە، لەو ساوە کە بۆ قارس هاتووە، بۆ جاری یەکەم بیری لەوە کردەوە کە لەم شارەدا، لە نەرمکردنی ئیپەک و شیعرنووسین بترازێ، هیچ کارێکی تری نییە: ئەمە لەلایەک هەستی بێچارەیی و لەلایەکی دی، هەستی ئازادیی پێ دەبەخشی. ئێستا تێ گەیشتبوو کە ئەگەر ئیپەکی بۆ لە خشتە ببرێ و لە شاری قارس دوور بکەونەوە،



ئەوا تا لە ژیاندا ماوە کامەران دەبێ. سوپاسی بەفرەکەی کرد کە بەهۆی بەستنی ڕێگا و بانەکانەوە، کات و شوێنی بۆ ئەم ڕەخساندووە تاکو بتوانێ ئیپەک قایل بکات.

پاڵتۆکەی لەبەر کرد و بێ ئەوەی کەس بیبینێ، لە هوتێل چووە دەرەوە و ڕووی لە کوچە بەفراوییەکان کرد. پشتی لە شارەوانی کرد و بەلای چەپدا بەرەو شەقامی ڕزگاریی میللی کەوتە ڕێ. چووە دەرمانخانەی زانستی و چەند دانەیەک حەپی ڤیتامین –C– ی کڕی. لە شەقامی فایەق بەگ بەلای چەپدا سووڕایەوە. بەدەم سەیرکردنی جامخانانەی ڕیستۆرانتەکانەوە خۆی کرد بە شەقامی کازم پاشادا. ئاڵاکانی پروپاگەندەی هەڵبژاردن کە دوێنێ شەقامەکەیان پڕ کردبوو لە ورشە، داگیرابوون و هەموو دوکانەکان کرابوونەوە. لە دوکانێکی بچووکی پەڕاو-کاسێتفرۆشەوە دەنگی موزیک دەهات. ئاپۆرەی خەڵکەکە کە تەنیا بەمەبەستی هاتنە دەرەوە لەو ناوە بوون، سەر شۆستەکانیان پڕ کردبوو و بە هەڵلەرزینەوە سەیری یەکدی و جامخانەی دوکانەکانیان دەکرد و ئەمسەر و ئەوسەری شەقامەکانیان دەپێوا. ئەو ئاپۆرەیەی کە لە ناوچەکانی دەوروبەرەوە بە سواری مینیبووس بۆ شار دەهاتن و کاتی خۆیان بە دانیشتن لە چایخانەکان و بە سەر و ڕیش تاشینەوە بەسەر دەبرد، ئەمڕۆ نەهاتبوون؛ (کا) بە چۆڵیی چایخانە و سەرتاشخانەکان دڵخۆش بوو. منداڵانی ناو کوچە و کۆڵانەکانیش ترس و دڵەڕاوکێکەیان ڕەواندووە و کۆڵێک دڵخۆشیان کرد. بڕێک منداڵی چڵمنی بینی کە لە ڕووبەرە بۆش و بچووکەکاندا، لە مەیدانە ڕچیوەکاندا، لە باخچەی فەرمانگاکانی دەوڵەت و لە حەوشەی قوتابخانەکاندا و بەسەر لێواری پردەکانی سەر ڕووباری قارسەوە بەفرەخلیسکێیان دەکرد، شەڕەتۆپەڵیان دەکرد، هەڵدەبەزینەوە، بە یەکدیدا هەڵدەگژان و جنێویان بە یەکتر دەدا. بەدەگمەن تیایاندا هەبوو پاڵتۆی پۆشیبێ، زۆربەیان چاکەتی قوتابخانەیان لەبەردا بوو، ملپێچیان لە مل و کڵاویان لەسەر کردبوو. (کا) بەدەم سەیرکردنی ئەو ئاپۆرە دڵخۆشەوە کە بەهۆی داخستنی قوتابخانەکانەوە بە دڵخۆشی پێشوازییان لە کودەتا سەربازییەکە کردبوو، بەتەواوی سەرما کاری تێ کرد. خۆی گەیاندە نزیکترین چایخانە، لەسەر کورسییەکی لە

بەرامبەر سافەتی هەواڵدز دانیشت. چایەکی خواردەوە و دیسانەوە چووەوە دەرێ.

(کا) لەبەرئەوەی بە سافەتی هەواڵدز ڕاهاتبوو، سڵی لێ نەدەکردەوە. دەیزانی کە ئەگەر بەنیاز بن چاودێریی بکەن، ئەوا دەتوانن هەواڵدزێک بخەنە دوای کە ئەم نەیبینێ. هەواڵدزە بینراوەکە بە کەڵکی شاردنەوەی هەواڵدزە نەبینراوەکە دەهات. بۆیە کاتێک (کا) سافەتی هەواڵدزی لێ ون بوو، شپرزەیی دای گرت و کەوتە گەڕان بە دوایدا . سافەتی لە گۆشەی شەقامی فایەق بەگ، لەو شوێنەی دوێنێ شەو تووشی تانکەکە بووبوو، بینییەوە. سافەت کیسەیەکی پلاستیکی بەدەستەوە بوو و لە گەڕان بە دوای (کا)دا هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو. هەواڵدزەکە گوتی: "پرتەقاڵ زۆر هەرزان بوو، خۆم بۆ ڕانەگیرا."

سوپاسی (کا)ی کرد لە پای ئەوەی چاوەڕێی کردووە، هەڵنەهاتووە و خۆی لە چاو ون نەکردووە، بەم کارەیشی "نیازپاکی"ی خۆی سەلماندووە. "ئەگەر لەمەودوا پێم بڵێن ڕوو لە کوێ دەکەن، ئەوا هیچ کاممان خۆمان بەخۆڕایی ماندوو ناکەین."

(کا) بۆ خۆی نەیدەزانی ڕوو لە کوێ دەکات. تاوێک دواتر، چووە چایخانەیەکی چۆڵ کە جامەکانی شەختەی بەستبوو، بە خەیاڵیدا هات دوو پێک عارەق بخواتەوە و دوایی سەرێک لە شێخ سەعادەدین ئەفەندی بدات. مەحاڵ بوو بتوانێ لەو ساتەدا جارێکی تر ئیپەک ببینێتەوە، ڕۆحیشی بە نێوان بیرکردنەوە لەو و ترسی ئەشکەنجەدا دەهات و دەچوو. دەیویست لای شێخ ئەفەندی خۆشەویستیی هەناوی خۆی بۆ خودا بەیان بکات و بە ڕێزەوە دەربارەی واتای خودا و جیهان قسە بکات، بەڵام بیری کەوتەوە کە کارمەندانی ئاسایش تەکیەکەیان میکرۆفۆنڕێژ کردووە و بە پێکەنینەوە گوێ بۆ قسەکانی ڕادەگرن.

سەرباری ئەوەیش کاتێک بە پێش ماڵە خاکییەکەی شێخدا لە کوچەی بایتارخانە تێ پەڕی، ئێستێکی کرد و سەیرێکی پەنجەرەکانی کرد.

دواتر دەرگای کتێبخانەی گشتیی قارسی بەکراوەیی بینی، چووە ژوورەوە و بە پلیکانە قوڕاوییەکاندا سەرکەوتە سەرەوە. هەر حەوت ڕۆژنامە ناوخۆییەکانی قارس، دانەبەدانە بە تابلۆی ئاگادارییەکانی سەر نەردەوانەکەوە هەڵواسرابوون.



لەبەرئەوەی ئەوانیش وەکو (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) دوێنێ دوای نیوەڕۆ بە چاپ گەیەنرابوون، لەبری هەرا و شۆڕشەکە، هەموویان باسیان لە سەرکەوتنی ئاهەنگەکەی دوێنێ ئێوارەی شانۆی گەل کردبوو. سەرباری داخستنی قوتابخانەکانیش، لە هۆڵی خوێندنەوەکەدا پێنج شەش قوتابی و چەند فەرمانبەرێکی خانەنشینی بینی کە لە تاو سەرما لە ماڵەکانیان هەڵاتبوون. لە گۆشەیەکدا و لە ناو چەند فەرهەنگێکدا کە بەهۆی زۆر خوێندنەوە و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانیانەوە هەلاهەلا بووبوون، یاخۆ ئەنسکلۆپیدیای وێنەداری منداڵاندا، ئەوانیش لە دڕان بێبەش نەبوون، زنجیرە کتێبی ئەنسکلۆپیدیای (ژیانی کۆن)ی دۆزییەوە کە لە سەردەمی منداڵیدا زۆری حەز لێ دەکرد. لە بەرگی دواوەی هەر دانەیەک لەو کتێبانەدا تابلۆیەکی هێڵکاریی ڕەنگاوڕەنگ هەبوو کە لەگەڵ هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی بە دیوی ناوەوەدا، بەشەکانی ئۆتۆمبیلێک، پیاوێک یاخۆ کەشتییەکی نیشان دەدا. (کا) بە غەریزە لە بەرگی دواوەی کتێبی چوارەمدا بەدوای ئەو ساوایەدا گەڕا کە وەکو هێلکە لە سکە خڕەکەی دایکیدا خۆی گرمۆڵە کردبوو، بەڵام وێنەکان لە کتێبەکە کرابوونەوە، تەنیا شوێنەواری لاپەڕە دڕێندراوەکانی بەسەر کتێبەکەوە بینی. لە هەمان بەرگدا (IS-MA) و لە لاپەڕەی ٣٢٤ دا ئەم مادەیەی بەوردی خوێندەوە:

**بەفر**: شێوەی بەستووی ئاوە کاتێک لە هەوادا دەکەوێتە خوارەوە، دەگەڕێ، یاخۆ بەرز دەبێتەوە. بەگشتی لە شێوەی کریستاڵێکی ئەستێرەیی جواندایە کە لە شەش گۆشە پێک دێ. هەر دانە کریستاڵێک پێکهاتەیەکی شەشگۆشەییی تایبەت بە خۆی هەیە. هەر لە چاخە کۆنەکانەوە نهێنییەکانی بەفر مایەی بایەخ پێدانی مرۆڤ بووە و خەیاڵی ئادەمیزادی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە. قەشە ئۆلاوس ماگنوسی سویدی، بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٥٥٥دا لە شاری ئوپسالا سەلماندی کە هەر کریستاڵێکی بەفر پێکهاتەیەکی شەشپاڵوویی تایبەت بە خۆی هەیە، وەکو لە وێنەکەدا دیارە...

من لێرەدا ناتوانم بڵێم (کا) لە قارس چەند جار ئەو مادەیەی خوێندووەتەوە و لەو ماوەیەدا تا چ ڕادەیەک وێنەی ئەو کریستاڵە بەفرەی لە بیرەوەریی خۆیدا هەڵگرتووە. دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ چوومە ماڵەکەیان لە نیشانتاشی. ڕۆژێک لەگەڵ باوکە چاو بە فرمێسکەکەیدا کە وەکو هەمیشە نائارام و بەگومان بوو، بە دوور و

درێژی باسی (کا)مان کرد. پاشان داوای مۆڵەتم لێ کرد کە چاوێک بە کتێبخانەکەی ماڵەوەیاندا بگێڕم. هۆشم لەسەر کتێبخانەکەی باوکی بوو کە دەکەوتە گۆشەیەکی تاریکی ژووری دانیشتنەکەوە، نەک لای کتێبخانەکەی سەردەمی منداڵی و تافی لاویی (کا) لە ژوورەکەیدا. لەوێدا، لە نێوان کۆمەڵێک کتێبی یاسایی بەرگ تێگیراوی شیک، چەندین کتێبی ڕۆمانی خۆماڵی و وەرگێڕدراوی ساڵانی ١٩٤٠ و برێک دەفتەری ناوونیشان و تەلەفۆندا، هەمان زنجیرە کتێبی (ئەنسکلۆپیدیای ژیان)م بینی. لە بەرگی کتێبی چوارەمدا چاوێکم گێڕا بە هێڵکاریی ژنە دوو گیانەکەدا. خودا و ڕاسان کتێبی چوارەمم کردەوە و لە خۆوە لاپەڕەی ٣٢٤ لە بەردەممدا کرایەوە. لەوێدا، لە تەنیشت هەمان مادەی بەفرەکەوە، کاغەزێکی وشکهەڵاتووی سی ساڵ لەمەوبەرم بینی.

(کا) بەدەم سەیرکردنی ئەنسکلۆپیدیاکەوە، وەکو قوتابییەک کە بیەوێ ئەرکی ماڵەوە جێبەجێ بکات، دەفتەرەکەی لە باخەڵی دەرهێنا، دەستی کرد بە نووسینەوەی دەیەمین شیعر کە لە قارسدا بۆی هاتبوو. (کا) لە دانەبەدانەی کلووە بەفرەکانەوە و لە شێوەی کۆرپەی ناو سکی دایکەکەوە کە وێنەکەی لە (ئەنسکلۆپیدیای ژیان)دا دەرهێنرابوو، ڕێچکەی بەست و شوێنی خۆی و ژیانی لەم جیهانەدا، ترس و دڵەڕاوکێکانی، تایبەتمەندییەکانی و بێهاوتاییەکانی خۆی لەم شیعرەدا داڕشت و سەردێری (من، (کا)ی بۆ دانا.)

هێشتا لە نووسینەوەی شیعرەکەی نەبووبووەوە کە هەستی کرد کەسێک لەو بەری مێزەکەوە لە بەرامبەری دانیشتووە. کاتێک سەری لەسەر دەفتەرەکەی هەڵبڕی، سەری سووڕما: خۆ ئەوە نەجیبە. لە ناخی خۆیدا هەستی بە سەرسووڕمان نەکرد، بەڵکو هەستی بە تاوان کرد لە پای ئەوەی بڕوای بە مردنی کەسێک کردووە کە وا بە ئاسانی نامرێ.

گوتی: "نەجیب." خۆی لار کردەوە و ویستی ماچی بکات.

لاوەکە گوتی: "من فازیلم، ئێوەم لە ڕێگا بینی و کەوتمە دواتان." سەیرێکی ئەو مێزەی کرد کە سافەتی هەواڵدز لەسەری دانیشتبوو، گوتی: "خێرا پێم بڵێن: ڕاستە نەجیب کوژراوە؟"





"ڕاستە، بە چاوی خۆم بینیم."

"ئەی کەوایە بۆچی بە نەجیب ناوی منتان هێنا؟ کەواتە دڵنیا نین لە مردنی."

"دڵنیا نیم."

ڕووخساری فازیل لە ناکاو ڕەش داگەڕا، پاشان بە زۆر خۆی بۆ ڕاگیرا.

"داوام لێ دەکات تۆڵەی بسێنمەوە. لەمەوە تێ دەگەم کە کوژرابێ. بەڵام دەمەوێ کاتێک کە قوتابخانە کرایەوە، وەکو جاران دەست بکەمەوە بە دەرز و دەوری خۆم، نامەوێ خۆم لە سیاسەت و تۆڵەسەندنەوە بئاڵێنم."

"سەرباری ئەوەیش، تۆڵەسەندنەوە شتێکی ترسناکە."

فازیل گوتی: "بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەگەر بەڕاستی داوام لێ بکات، تۆڵەی بۆ دەکەمەوە. باسی ئێوەی بۆم کردبوو. ئایا ئەو نامانەی کە بۆ هیجران یاخۆ بۆ قەدیفەی نووسیبوو، داتنە دەستی؟"

(کا) گوتی: "گەیاندم." بە نیگاکانی فازیل ئارامی لەبەر هەڵگیرا. لە خەیاڵی خۆیدا گوتی: "گەلۆ ڕستەکە ڕاست بکەمەوە و بڵێم بەتەما بووم بیدەمە دەستی؟" وەلێ ئیدی وەدرەنگانێ کەوتبوو. سەرباری ئەوە، هەستی درۆکردن هەناوی داپۆشیبوو. بەو ئازارەی بەسەر ڕووی فازیلەوە بەدەرکەوت، نائارام بوو.

فازیل دەموچاوی خستە نێوان هەردوو لەپی دەستییەوە و کەمێک گریا، بەڵام ئەوەندە تووڕە بوو، فرمێسک بە چاویدا نەهاتە خوارەوە. کاتێک بینی (کا) چرپەی لە خۆی بڕیوە، چاوی بڕیە چاوەکانی و گوتی: "ئەگەر نەجیب کوژرابێ، من تۆڵەی لە کێ بۆ بکەمەوە؟ ئێوە دەیزانن."

(کا) گوتی: "هەندێ جار ئێوە لە هەمان کاتدا بیرتان لە هەمان شت کردووەتەوە، ئێستا کاتێک تۆ بیر دەکەیتەوە، واتای وایە ئەو لە ژیاندایە."

فازیل گوتی: "ئەو شتەی ئەو دەیەوێ بیری لێ بکەمەوە، هەناومی پڕ کردووە لە ئازار." (کا) بۆ یەکەمجار تیشکی چاوەکانی نەجیبی لە چاوی ئەمدا بینی. هەستی کرد کە لە بەردەم تارماییەکدا دانیشتووە.

"ئەو شتە چییە کە ناچارتان دەکات بیر بکەنەوە؟"

فازیل گوتی: "تۆڵەکردنەوە." دوای کەمێک دەستی کرد بەگریان.

(کا) دەسبەجێ درکی بەوە کرد کە فازیل لە ڕاستیدا بیر لە تۆڵەکردنەوە ناکاتەوە. چونکە دوای ئەوەی سافەتی هەواڵدز کە بە سەرنجەوە سەیری مێزەکەی ئەمانی کردبوو و خۆی گەیاندبووە لایان، فازیل ئەو نیازەی خۆی بە (کا) گوتبوو.

سافەت بە نیگایەکی تیژەوە لە فازیلی ڕووانی و گوتی: "ناسنامەکەتانم بدەنێ."

"ناسنامەی قوتابخانەکەم لەسەر مێزی کتێب وەرگرتنەکەیە."

(کا) بینی فازیل دەسبەجێ پەی پێ بردووە کە لە بەرامبەر پۆلیسێکی سڤیلدا ڕاوەستاوە و هەوڵ دەدات ترسی خۆی بشارێتەوە. پێکڕا ڕوویان لە مێزی کتێب وەرگرتنەکە کرد. هەواڵدزەکە ناسنامەکەی لە دەستی ژنە تۆقیوەکەی فەرمانبەری کتێبخانە دەرهێنا، کاتێک سەیری کرد و بۆی دەرکەوت کە فازیل قوتابی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانە، بە نیگایەکی تاوانبارکردنەوە سەیرێکی (کا)ی کرد و گوتی: "ئێمە خۆمان بەمەمان دەزانی." پاشان وەکو چۆن منداڵێک دەست بە تۆپەکەی خۆیەوە دەگرێ، ئاوا ناسنامەکەی نایە گیرفانی و گوتی: "دێیتە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و ناسنامەی قوتابخانەی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانت وەردەگریتەوە."

(کا) گوتی: "کارمەند بەگ، ئەو منداڵە هەری لە بڕی ناکاتەوە. هەر ئێستایش زانی کە خۆشەویستترین هاوڕێی کوژراوە، ناسنامەکەی بدەنەوە."

بەڵام سافەت سەرباری ئەوەی کە دانی نیوەڕۆ تکای شتێکیشی لە (کا) کردبوو، هیچ نەرمیی نەنواند.

(کا) لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو کە لە چەپە گۆشەیەکدا ناسنامەکەی نەجیب لە سافەت وەردەگرێتەوە، لەگەڵ فازیلدا بڕیاریان دا سەعات شەش لای پردە ئاسنینەکە یەک ببینن. فازیل دەسبەجێ لە کتێبخانەکە چووە دەرێ. نائارامی باڵی بەسەر هەموو هۆڵی خوێندنەوەکەدا کێشابوو، هەموو وایان دەزانی کە داوای ناسنامەیان لێ دەکرێ. بەڵام سافەت خەڵکی ئەوێ نەبوو و کەسەکانی نەدەناسی، گەڕابووەوە



سەر مێزەکەی خۆی، بەرگەکانی گۆڤاری (ژیان)ی سەرەتای ساڵانی ١٩٦٠ی هەڵدەدایەوە، سەیری وێنەکانی سورەیای شازادەی غەمگینی ئێرانی کە بەهۆی منداڵنەبوونەوە تووشی جیابوونەوە لە شا هاتبوو و سەیری دواین وێنەکانی پێش لە سێدارەدانی سەرۆکوەزیران عەدنان مەندەرەسی دەکرد.

کاتێک (کا) تێ گەیشت کە ناتوانێ ناسنامەکە لە هەواڵدزەکە وەربگرێتەوە، لە کتێبخانەکە چووە دەرێ. بە بینینی دڵگیریی شەقامە بەفراوییەکان و بڕێک منداڵی شاگەشکە کە بە خرۆشەوە شەڕەتۆپەڵیان دەکرد، هەموو ترس و دڵەڕاوکێکانی خۆی لە بیر کرد. لە ناخەوە حەزی دەکرد ڕابکات. لە مەیدانی حکومەت، ئاپۆرەیەکی پیاوی بینی کە کیسەی قوماش و پاکەتی لە ڕۆژنامە پێچراو و بە بەن گرێدراویان بە دەستەوە بوو و بە هەڵلەرزینەوە لە ڕیزێکدا ڕاوەستابوون. ئەمانە ئەو قارسییە خۆپارێزانە بوون کە ڕاگەیاندنی باری نائاساییان بەهەند گرتبوو و هاتبوون وەکو مەڕ چەکەکانی ماڵەوەیان ڕادەستی دەوڵەت بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی دەوڵەت هیچ متمانەی پێیان نەبوو، مۆڵەتی بە ئەوسەری ڕیزەکە نەدەدا بچنە بارەگای پارێزگاوە، بۆیە ئەمانیش هەموویان لە سەرمادا هەڵدەلەرزین. زۆربەی دانیشتووانی شار، دوای بیستنی ئەو ئاگادارییە، لە نیوەی شەودا بەفریان هەڵدابووەوە و چەکەکانیان لە شوێنی وەهادا خستبووە ژێر خاکەوە کە کەس عەقڵی بۆ نەدەچوو.

(کا) کاتێک بە شەقامی فایەق بەگدا ڕێی دەکرد، تووشی بوو بە تووشی قەدیفەوە و ڕەنگ و ڕووخساری سوورهەڵگەڕا. پێش کەمێک بیری لە ئیپەک دەکردەوە، قەدیفەی وەکو شتێکی لە ڕادەبەدەر جوان و نزیک لە ئیپەک هاتە بەرچاو. ئەگەر خۆی بۆ ڕانەگیرایە، پەلاماری کچە سەرپۆش بەسەرەکەی دەدا و ماچبارانی دەکرد.

قەدیفە گوتی: "پێویستە زۆر بەپەلە قسەتان لەگەڵدا بکەم، بەڵام کەسێک لە دواتانەوەیە، بە بەرچاوی ئەوەوە نابێ. ئایا دەتوانن سەعات دوو لە هوتێلەکە بێن بۆ ژووری ژمارە ٢١٧؟ دواین ژووری ڕێڕەوی ئەو نهۆمەیە کە ژوورەکەی ئێوەی لەسەرە."

"ئایا دەتوانین لەوێ بە ئاسوودەیی بدوێین؟"

"هیچ کەسێک -قەدیفە چاوەکانی داچەقاند- بە ئیپەکیش نالّێی کە باسی چیمان کردووە. با کەس پێی نەزانێ."

لەبەرئەوەی ئاپۆڕەکە چاودێرییان دەکرد، بە جووڵەیەکی زۆر فەرمی دەستی (کا)ی گووشی.

"ئێستا بە تیلەی چاو بڕوانن و بزانن هەواڵدزێکم بە دوواوەیە یان دووان، دووایی پێم بڵێن."

(کا) بە لالێوی سووکە خەندەیەکی بۆ کرد و بە سەر "بەڵێ"یەکی ئەوتۆی بۆ کرد، بەجۆرێک خۆیشی سەری لەم خوێندساردییەی خۆی سوورِما. ئەمە لە کاتێکدا کە بیرۆکەی دیدار لەگەڵ قەدیفە و بەتەنیا لە ژوورێکدا، هۆشی لە سەری فڕاندبوو.

دەسبەجێ بە خەیاڵیدا هات کە بەر لە دیداری لەگەڵ قەدیفەدا، نابێ لە هوتێلەکە ئیپەک ببینێ، تەنانەت ئەگەر بە ڕێکەوتیش بووە. بۆ ئەوەی تاکو وادەی دیدارەکەی کات بەسەر ببات، کەوتە سووڕانەوە بە کۆڵانەکاندا. وێ نەدەچوو هیچ کەسێک گلەیی لە کودەتا سەربازییەکە هەبێ؛ کوتومت وەکو سەردەمی منداڵیی ئەو، دەسپێکێکی نوێ و گۆڕانێک لە ژیانی دەقبەستوودا بەدی دەکرا. ژنانی جانتا لە شان و منداڵ لە کۆڵ و بەدەست دەستیان کردبوو بە هەڵدانەوەی میوە و سەوزەی دوکانی بەقاڵەکان و سەودا و مامەڵەکردن. پیاوە سمێڵ بابڕەکان خزابوونە گۆشەی شەقامەکانەوە و بەدەم کێشانی جگەرەی بێ فیلتەرەوە سەیری هاتوچۆی ڕێبوارانیان دەکرد و قسە و قسەلۆکیان دەکرد. سواڵکەری ژێر گوێسووانەی باڵەخانە کۆنەکەی بۆشاییی نێوان گەراجە کۆنەکان و بازاڕ کە لاسایی کوێرانی دەکردەوە و ئەم دوێنێ دوو جاری بینیبوو، لە شوێنی خۆی نەبوو. (کا) ئەو پیکابانەیشی نەبینی کە لە چەقی کۆڵانەکاندا ڕاوەستابوون و پرتەقاڵ و سێویان دەفرۆشت. لە ڕاستیشدا هاتوچۆی ئۆتۆمبیل زۆر لە کەمیی دابوو، بەڵام دژوار بوو بزاندرێ ئایا بەهۆی کودەتا سەربازییەکەوەیە یاخۆ لەبەر بەفرەکەیە. ژمارەی پۆلیسی سڤیل لە شاردا زیادکرابوو (بڕێک منداڵ کە لە خوارەوەی شەقامی خالید پاشا تۆپانێیان دەکرد، یەکێک لە پۆلیسە سڤیلەکانیان کردبوو بە گۆلچی)، هەردوو هوتێلی (پان هوتێل و هوتێلی حوریەت)ی لای گەراجەکان کە کاری لەشفرۆشییان



تێدا دەکرا، ئارەزوومەندانی شەڕە کەڵەشێر و قەسابە نایاساییەکان، چالاکییەکانی خۆیان بۆ کاتێکی نەزانراو دوواخستبوو. قارسییەکان بە بیستنی دەنگی تەق و تۆقی ناوبەناوی گەڕەکە کولێتنشینەکان کە بە زۆری لە شەودا دەهاتە بەرگوێ، ڕا هاتبوون و کەس باکی پێ نەبوو. (کا) لە پای ئەوەی کە لە ناخەوە زۆر بە باشی پەیّ بەو هەستی ئازادییە برد کە زادەی موزیکی ئەو بێباکییە بوو، لە دوکانی بۆفیەی هاوچەرخی هەڵکەوتوو لە گۆشەی شەقامی کوچووک کازم پاشا و شەقامی کازم قەرەبەکر، شەربەتێکی دارچینی گەرمی کڕی و بە زەوقەوە هەڵی دا و نۆشی کرد.

## ٣٥

# تاکە چرکەساتی ئازادی لە قارسدا

## (کا) و قەدیفە لە ژووری هوتێلەکەدا

کاتێک (کا) شازدە خولەک دوواتر گەیشتە ژووری ژمارە ٢١٧ی هوتێلەکە، لە ترسی ئەوەی نەبادا بیبیندرێ، زۆر شڵەژابوو. بەمەبەستی کردنەوەی بابەتێکی خۆش و جیاواز، باسی شەربەتە دارچینییەکەی بۆ قەدیفە کرد کە هێشتا تامەکەی لە دەمیدا مابووەوە.

قەدیفە گوتی: "ماوەیەک باو بوو دەگوترا ئەو کوردانەی لە سوپا تووڕەن، ژەهر دەکەنە شەربەتەکەوە. تەنانەت دەوڵەت بۆ لێکۆڵینەوە لەم کێشەیە پشکێنەری نهێنیی ناردبوو."

(کا) پرسی: "ئایا ئێوە بڕوا بەم چیرۆکانە دەکەن؟"

قەدیفە گوتی: " هەموو ئەو خوێندەوار و بەڕۆژئاواییبووانەی دێنە قارس، هەر کە گوێیان لەم چیرۆکانە دەبێ، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن باوەڕیان بەم قسە و قسەڵۆکانە نییە، دەچن لە شەربەتەکە دەخۆنەوە و زۆر گەوجانە خۆیان ژەهرخواردوو دەکەن، چونکە قسە و باسەکان ڕاستن. هەندێک لە کوردەکان هێندە ناشاد و بەدبەختن کە ئیدی خودایان نەماوە."

"باشە دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو کاتە دەوڵەت چۆن مۆڵەت بە شتی وا دەدات؟"

"بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن، وەکو هەموو ڕۆشنبیرانی بەڕۆژئاواییبوو بەتەواوی متمانەتان بە دەوڵەت هەیە. میت، هەر وەکو ئاگای لە هەموو شتێکە، بەم کارەش دەزانێ، بەڵام ڕای ناگرێ."

"باشە دەزانێ کە ئێمە لێرەین؟"

قەدیفە بەدەم زەردەخەنەوە گوتی: "مەترسن، هێشتا پێیان نەزانیوە. بەڵام ڕۆژێک



دێ کە پێی بزانن، "وەلێ تا ئەو کاتە ئێمە لێرە ئازادین. ئەم کاتە کورتخانەیە ئازادترین چرکەساتی قارسە. نرخەکەی بزانن، تکایە پاڵتۆکەتان داکەنن."

(کا) گوتی: "ئەم پاڵتۆیە منی لە خراپەکاری پاراستووە." هێمای ترسێکی بە ڕووخساری قەدیفەوە بەدی کرد و "ئێرەیش ساردە"ی بۆ قسەکانی زیاد کرد.

ئێرە نیوەی ژوورێکی بچووک بوو کە سەردەمانێک وەکو ژووری سندووق کەڵکی لێ وەردەگیرا. پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوو کە بەسەر حەوشەی ناوەوەدا دەکرایەوە، تەختێکی بچووکی خەوی تێدابوو کە ڕادەکێشرا و ئەمان لەمسەر و ئەوسەری دانیشتبوون. ژوورەکە بۆنێکی شێداری تایبەت بەو ژووری هوتێلانەی هەبوو کە هەواگۆڕکێ نایانگرێتەوە. قەدیفە خۆی لار کردەوە و هەوڵی دا کلیلی شۆفاژەکە با بدات، بەڵام لەبەرئەوەی خراپ گیر بووبوو، وازی لێ هێنا. کە بینی (کا) وا بە تووڕەیییەوە هەستاوەتە سەرپێ، تێ کۆشا زەردەخەنەیەک بخاتە سەر لێوی خۆی.

دەسبەجێ (کا) حاڵی بوو قەدیفە لە پای بەتەنیا ئامادەبوونی لە ژوورێکدا لەگەڵ ئەمدا حەزێک سەرتاپای جەستەی دارتووە. خۆیشی دوای ئەو هەموو ساڵە درێژانەی تەنیایی، خۆشحاڵ بوو بەوەی لەگەڵ کچێکی شۆخدا لە هەمان ژووردایە، بەڵام ئەوەی لە ڕووخساری قەدیفەدا بەدی دەکرا، زەوقێکی "نەرم" نەبوو، بەڵکو شتێکی قوڵتر و تێکدەرانەتر بوو.

"مەترسن، چونکە لەو بەلەنگازە بترازێ کە کیسەیەک پرتەقاڵی بە دەستەوە بوو، پۆلیسی تری سڤیل بە دوواتانەوە نەبوو. ئەمەیش لە ڕاستیدا واتای ئەوە نییە کە دەوڵەت لێتان دەترسێ، بەڵکو تەنیا دەیانەوێ کەمێک بتترسێنن. ئەدی کێ لە پشتی منەوە بوو؟"

(کا) بە شەرمەوە گوتی: "لەبیرم چوو سەیری دوواتانەوە بکەم."

"چۆن؟" قەدیفە لە ناکاو بە دوو چاوی پڕ لە ژەهرەوە بۆی ڕووانی. "عاشقن، زۆر خراپ گرفتاری ئەڤین بوون." دەسبەجێ خۆی کۆکردەوە و گوتی: "بمبەخشن، هەموومان زۆر دەترسین." دیسان هێمایەکی تەواو جیاواز ڕووخساری داپۆشی. "دادەم بەختەوەر بکەن، مرۆڤێکی زۆر باشە."

(کا) وەکو ئەوەی بە چرپە بدوێ، گوتی: "بە بۆچوونی ئێوە، ئەو منی خۆش دەوێ؟"

قەدیفە گوتی: "خۆشی دەوێن، پێویستە خۆشی بوێن؛ مرۆڤێکی زۆر باشن."

کاتێک بینی (کا)ی بەم وشانە هەژاند، گوتی: "چونکە ئێوە دوانەن." هەولی دا بە تیۆری بیسەلمێنێ کە بۆچی پیاوی دووانە و کچی عازەب پێکەوە دەگونجێن. پیاوانی دوانە، شانبەشانی ئەوەی کە خاوەن کەسایەتییەکی هاوجووتن، هەمان کات جۆرێک لە ڕۆحسووکی و ڕووکەشیشیان پێوەیە کە ژنی لاو هەم بەختەوەر دەبێ بەمە و هەم بێزیشی لێ دەکاتەوە. درێژەی بە قسەکانی دا و وەکو دڵدانەوەیەکیش گوتی: "هەردووکیشتان شایەنی ئەڤینێکی بەختەوەرن."

"ئایا لە قسەکردن لەگەڵ دادەتاندا بۆنی دەمیتان کردووە کە داخۆ لە گەڵمدا دێ بۆ ئەڵمانیا؟"

قەدیفە گوتی: "ئێوە زۆر قۆزن بەلای دادەمەوە، بەڵام بڕواتان پێ ناکات. باوەڕکردنیشی کاتی دەوێ، چونکە کەسانی بێ ئارامی وەکو ئێوە، بیر لەوە ناکەنەوە ژنێکیان خۆش بوێ، بەڵکو دەیانەوێ بەدەستی بێنن."

"ئایا ئەمەی بە ئێوە گوتووە؟" (کا) ئەمەی گوت و برۆکانی بەرز کردەوە: "ئێمە لەم شارەدا کاتمان نییە."

قەدیفە سەیرێکی سەعاتەکەی کرد: "سەرەتا سوپاستان دەکەم لە پای هاتنتان بۆ ئێرە. ئێوەم بۆ بابەتێکی زۆر گرنگ بانگ کردووە. شینە دەیەوێ پەیامێکتان پێ ڕابگەیەنێ."

(کا) گوتی: "ئەم جارە دوام دەکەون و یەکسەر دەستگیری دەکەن. هەموویشمان دەخەنە ژێر ئەشکەنجەوە. دراوە بەسەر ئەو ماڵەدا. پۆلیس گوێی لە هەموو گفتوگۆکان بووە."

قەدیفە گوتی: "شینە دەزانێ گوێی لێ گیراوە. ئەوە پەیامێکی فەلسەفی بوو کە بەر لە کودەتاکە ئاراستەی ئێوە و لە ڕێی ئێوەشەوە ئاراستەی ڕۆژئاوای کرد. پێی دەگوتن ئێوە دەست مەخەنە خۆکوژییەکانی لای ئێمەوە. ئێستا هەموو شتێک گۆڕاوە، بۆیە دەیەوێ پەیامە کۆنەکەی هەڵبوەشێنێتەوە. بەڵام لە هەمووی گرنگتر:



پەیامێکی تەواو نوێی پێیە."

قەدیفە زۆر پێی داگرت، (کا) خۆی بۆ یەکلایی نەکرایەوە، دوای ساتێکی درێژ گوتی: " لەم شارەدا مەحاڵە لە شوێنێکەوە بچیت بۆ شوێنێک و کەس نەتبینێ."

"عەرەبانەیەکی دوای ئەسپ هەیە کە هەر یەک دوو ڕۆژ جارێک دێتە بەردەم دەرگای پشتەوەی ئاشپەزخانەکە لە حەوشی پشتەوە و بۆتڵی ئای گاز، خەڵووز و شووشەی ئاومان بۆ دەهێنێ. کابرا شتومەک بەسەر شوێنی تریشدا دابەش دەکات و بۆ ئەوەی بارەکەیشی لە بەفر و باران بپارێزێ، خێوەتێکی بەسەردا دەدات. عارەبانچییەکەیش جێگای متمانەیە."

"ئایا پێویستە وەکو دز خۆم لە ژێر خێوەتدا بشارمەوە؟"

قەدیفە گوتی: "من زۆر خۆم شاردووەتەوە. زۆر خۆشە مرۆ بە هەموو شاردا بگەڕێ و کەس هەستی پێ نەکات. ئەگەر ئەم دیدارە ئەنجام بدەن، ئەوا لە ناخەوە لە مەسەلەی ئێپەکدا هاوکاریتان دەکەم، چونکە دەمەوێ ئێوە پێکەوە زەماوەند بکەن."

"بۆچی؟"

"هەموو خوشکێک حەز دەکات دادەی بەختەوەر بێت."

(کا) هیچ بڕوای بەم قسەیە نەکرد، نەک لەبەرئەوەی ئەمە جۆرێک بوو لە نەفرەت و پشتیوانیی ناچاری کە بەدرێژاییی ژیانی لە خوشک و برایانی تورکی بینیبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی هەڵسوکەوتی قەدیفەی بە دروستکراو هاتە بەرچاو (بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، برۆی بەرەو ژوور هەڵکشابوو، وەکو دیمەنێکی بێ تاوانی وەرگێڕاو لە فیلمێکی تورکی، لێوەکانی بە شێوەی منداڵێک کە بیەوێ لە پڕمەی گریان بدات، کردبووەوە). کاتێک قەدیفە سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی کە دوای حەڤدە خولەکی تر عەرەبانەکە دێ و ئەگەر بەڵێنی پێ بدا لەگەڵیدا بچێ بۆ لای شینە، ئەوا هەموو شتێکی بۆ دەگێڕێتەوە، (کا) لەپڕ گوتی: "بەڵێن دەدەم کە دێم، بەڵام بەر لە هەموو شتێک پێم بڵێن بۆچی هێندە متمانەی بە منە."

"ئێوە دەروێشن، ئەمە قسەی شینەیە. باوەڕی وایە کە خودا ئێوە لە لەدایکبوونەوە تا مردن بە پاکی دەهێڵێتەوە."

(کا) بەپەلە گوتی: "باشە. ئیپەکیش بەم تایبەتمەندییەم دەزانێ؟"

"بۆچی بیزانێ؟ ئەمە قسەی شینەیە."

"تکایە هەمووشتێکم سەبارەت بە تێڕوانینی ئیپەک بۆ من پێ بڵێن."

قەدیفە گوتی: "ڕاستییەکەی هەموو ئەو شتانەم گوت کە لە نێوان خۆماندا قسەی لەسەر دەکەین."

کاتێک بینی (کا) تووشی خەیاڵشکان بووە، کەمێک بیری کردەوە، یاخۆ خۆی وا نوواند وەکو ئەوەی بیر بکاتەوە -(کا) لە تاو شڵەژانی خۆی، هیچیانی لێک نەکردەوە- "زۆر بە قسەخۆشتان دەزانێ، دەڵێ لە ئەڵمانیاوە هاتوون و دەتوانن زۆر شت بگێڕنەوە!"

"ئایا دەبێ چی بکەم بۆ قایلکردنی؟"

"ئەگەر لە یەکەم نیگاشدا نەبێ، ئەوا ژن دەتوانێ لە دە خولەکی سەرەتادا لە ناخەوە پەی ببات کە پیاوەکەی بەرامبەری کێیە، بۆ ئەم چ واتایەک دەگەیەنێ و ئایا خۆشی دەوێ یاخۆ نا؟ پێویستی بە کەمێک کات هەیە بۆ بەتەواوی تێگەیشتن لەم پەی پێبردنە. بە بۆچوونی من لە میانەی تێپەڕبوونی ئەو کاتەدا، هیچ ئەرکێک نییە کە پیاو ئەنجامی بدات. بۆی باس بکەن هەست بە چی دەکەن لە بەرانبەریدا، بۆچی خۆشتاندەوێ و لەبەر چی دەتانەوێ زەماوەندی لەگەڵدا بکەن؟"

(کا) بێدەنگ بوو. کاتێک قەدیفە بینی وا (کا) وەکو منداڵێکی غەمگین چاوی لە پەنجەرەکە بڕیوە، گوتی ئەوە دێنێتە بەرچاوی خۆی (کا) و ئیپەک لە فرانکفورت بەختەوەر دەبن، ئیپەک هەر لەگەڵ دوورکەوتنەوەیدا لە قارس خۆشحاڵ دەبێ و بە شەقامەکانی فرانکفورتدا دەسووڕێنەوە و ئێواران دەچنە سینەما. پاشان گوتی: "ناوی سینەمایەکی فرانکفورتم پێ بڵێن کە بۆی دەچن، هەر سینەمایەک بێ."

(کا) گوتی: "فیلم فۆرم هوێخست."

"ئەی ناوی سینەمای وەکو ئەلحەمرا، ڕوویا و ماژیستیک لە ئەڵمانیا نییە؟"

(کا) گوتی: "هەیە. ئەلدۆرادۆ."



لەو دەمەدا کە سەیری حەوشەکەیان دەکرد کە کلووە بەفرەکان تیایدا سەرشێتانە سەمایان دەکرد، قەدیفە گێڕایەوە و گوتی لە ساڵانی زانکۆدا، کاتێک لە شانۆکاندا ڕۆڵی بینیووە، جارێک ئامۆزای هاوپۆلێکی ناڕاستەوخۆ پێشنیاری ڕۆڵێکی لە بەرهەمێکی هاوبەشی ئەڵمانی-تورکیدا خستووەتە بەردەست، بەڵام ئەم ڕۆڵەکەی ڕەت کردووەتەوە. گوتی ئێستا ئیپەک و (کا) لەو وڵاتە بەختەوەر دەبن، لە ڕاستیدا دادەی بۆ ئەوە خولقاوە کە بەختەوەر بێ، بەڵام لەبەرئەوەی پەی پێ نەبردووە، تا ئێستا شادی ڕووی تێ نەکردووە، منداڵنەبوونیش هێندەی دی ناخی خواردووە، بەڵام غەمگینیی ڕاستەقینە لەوەدایە کە سەرباری ئەوەی دادەی هێندە شۆخ، میهرەبان، هوشیار و دروستە و ڕەنگە هەر لەم سۆنگەیەشەوە بێ کە ناشادە (لێرەدا دەنگی شکا)، لە سەردەمی منداڵی و لە تافی لاویدا باشی و جوانییەکەی دادەی بۆ ئەم نموونە بووە (جارێکی تریش دەنگی شکا)، لەپاڵ ئەم باشی و جوانییەدا، ئەم هەمیشە خۆی پێ خراپ و ناشیرین بووە، بۆ ئەوەی ئەم بەمجۆرە هەست نەکات، دادەی هەمیشە جوانییەکەی خۆی دەشاردەوە. (ئێستا، لە دوای قسەکانی دەستی بە گریان کردبوو.) بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەردەوام بوو و گوتی کاتێک لە قۆناغی ناوەندی دەیخوێند ("ئەو کاتە لە ئەستەمبوڵ بووین و هێندە هەژار نەبووین،" (کا)یش لە وەڵامدا گوتی کە "ئێ ئێستایش" هەژار نین. قەدیفە بەدەم گوتنی "بەڵام لە قارس دادەنیشین"ەوە بەپەلە ئەم کەوانەیەی داخست)، ڕۆژێک درەنگ گەیشتووەتە قوتابخانە، مەسرورە خانمی مامۆستای گیانەوەرزانی لێی پرسیوە "ئایا خوشکە ژیرەکەیشت دواکەوتووە؟" و پاشان پێی گوتووە "لەبەرئەوەی دادەتم زۆر خۆش دەوێ، ڕێت پێ دەدەم بێیتە پۆلەوە." بێگومان قەدیفە دوانەکەوتبوو.

عەرەبانەی دوای ئەسپەکە هاتە حەوشەکەوە.

عەرەبانەیەکی کۆن و سادەی دوای ئەسپ بوو کە دیمەنی گوڵی سوور، گوڵە بەیبوون و پەلکی سەوز لەسەر قەراغەکانی نەخشێنرابوو. قەراغی کونە لووتەکانی ئەسپە شەکەت و بەساڵاچووەکە شەختەی بەستبوو و هەڵاوی لێ هەڵدەستا. بەفر، پاڵتۆ و کڵاوی خاوەنە ناوشان پان و کەمێک کووڕی عەرەبانەکەی داپۆشیبوو. (کا) بە دڵەکوتێوە بینی کە بەفر خێوەتەکەیشی داپۆشیوە.

قەدیفە گوتی: "هیچ ترست نەبێ، ناتکوژم."

(کا) دەمانچەیەکی بەدەست قەدیفەوە بینی، بەڵام تێ نەگیشت بۆچی ئاراستەی ئەو کراوە.

قەدیفە گوتی: "تووشی هەڵچوون و شتی لەو جۆرە نەهاتووم، بەڵام ئەگەر ئێستا هەر چەوت و چێڵییەک بەرانبەرم بنوێنێ، باوەڕ بکە تەقەت لێ دەکەم... ئێمە لە هەموو ئەو ڕۆژنامەنووس و کەسانەی کە بۆ لێدوان وەرگرتن دەچنە لای شینە، بەگومانین."

(کا) گوتی: "ئێوەن کە بە دوای مندا گەڕاون."

"ڕاستە، بەڵام کارمەندانی میت پێشبینییان کردووە کە تۆ بە دوامان‌دا دەگەڕێیت، لەوانەیە بێ ئەوەی بە خۆت بزانی، ئامێری گوێگرتنیان لە سەر لەشت و لە جلەکانتدا دانابێ. گومانم هەیە لەبەر ئەو هۆیە پاڵتۆ خۆشەویستەکەت دانەکەند. ئێستا خێرا بە پاڵتۆکەت داکەنە و لە قەراخ پێخەوەکە دایبنێ."

(کا) فەرمانەکەی بەجێ هێنا. قەدیفە بە دەستەکانی کە چەشنی دەستەکانی دادەی بچووک بوون، هەموو کون و کەلەبەری پاڵتۆکەی پشکنی. کاتێک هیچی نەدۆزییەوە، گوتی: "لێم ببوورە. چاکەت و کراس و فانیلەکەشت دابکەنە، چونکە ئامێری تۆمارکردنی دەنگ لە پشت و لەسەر سنگ دەبەستن. لەوانەیە لە قارسدا سەد کەس هەبن کە بەیانی تا ئێوارە بە میکرۆفۆنەوە دەسووڕێنەوە."

(کا) چاکەتەکەی داکەند و وەکو منداڵێکیش کە بیەوێ سکی نیشانی پزیشک بدات، کراس و فانیلەکەی بۆ سەرەوە هەڵکێشا.

قەدیفە سەیرێکی کرد و گوتی: "بسووڕێرەوە." بێدەنگییەک هاتە ئاراوە.

"باشە. بۆ دەمانچەکەیش بمبوورە... کەسانێک کە ئامێری تۆمارکردنی دەنگیان لێ بەستراوێ، دژی پشکنین دەوەستنەوە و ئارام نابن..." بەڵام دەمانچەکەیشی دانەگرت. بە دەنگێکی هەڕەشە ئامێزەوە گوتی: "ئێستا گوێم لێ بگرە، بەهیچ جۆرێک لای شینە باسی گفتوگۆکانمان و ئەم برادەرایەتییەمان ناکەیت." وەکو پزیشکێک قسەی دەکرد کە دوای پشکنین هەڕەشە لە نەخۆش بکات: "بەهیچ جۆرێک



باسی ئیپەک و عاشقبوونت نایەتە سەر زمانت. شینە حەزی لەم پۆخەڵەواتانە نییە... باسی بکەیت و ئەو نەتسووتێنێ، باوەڕ بکە من خۆم گرت تێ بەردەدەم. لەبەرئەوەی لە جنۆکە دەچێ، لەوانەیە پەی بە هەندێ شت ببات و قسەت لێ دەربێنێ. خۆت وا نیشان بدە، وەکو ئەوەی ئیپەکت یەک دوو جار بینیبێ و بەس. تێ گەیشتی؟"

"باشە."

"لە بەردەم شینەدا ڕێز بنوێنە. وریا بە، بە ڕابردووی خۆت وەکو دەرچووی قوتابخانەیەکی باڵا و وەکو کەسێکی ئەوروپادیو، لە خۆبایی نەبیت و بە کەم بۆی نەڕوانی. ئەگەر لە ناخیشەوە هەستت بە گەوجییەکی لەو جۆرە کرد، ئەوا هەوڵ بدە بەهیچ جۆرێک پێ نەکەنی... لەبیرت نەچێت، هیچ باکی لەو ئەوروپییانە نییە کە تۆ بە شەیدابوونەوە لاساییان دەکەیتەوە... بەڵام تا ڕادەی مردن لە شینە و هاوشێوەکانی دەترسن."

"دەزانم."

قەدیفە بە پێکەنینێکەوە کە لە فیلمە خراپەکاندا دەبیسترێ، گوتی: "من هاوڕێتم، دروست بە لەگەڵمدا."

(کا) گوتی: "عەرەبانچییەکە خێوەتەکەی هەڵدایەوە."

لە پێشدا قەدیفە چووە خوارەوە. لەو دەمەدا ئەو چووە ئاشپەزخانەکەوە، (کا) بینی وا عەرەبانەکە بەژێر تاقی نێوان حەوشی ناوەوە و شەقامەکەدا هاتە ژوورەوە. وەکو لەسەری ڕێک کەوتبوون، لە ژوورەکە چووە دەرێ و دابەزی بۆ خوارەوە. بە نەبینینی هیچ کەسێک لە ئاشپەزخانەکەدا، شڵەژا، بەڵام عەرەبانچییەکە لە نێوان دەرگای حەوشەکەدا چاوەڕێی دەکرد. بەبێدەنگی لە بۆشایی نێوان بوتڵە غازەکاندا لە تەنیشت قەدیفەوە ڕاکشا.

ئەم گەشتەیان کە ئێستا هەستی کرد بۆ هەتاهەتایە لە بیری ناچێتەوە، تەنیا هەشت خولەکی خایاند، بەڵام بەلای (کا)وە وابوو کە زۆر لەوە درێژتری خایاندووە. بە پەرۆش بوو بزانێ لە کوێی شاردان، لە ناو دەنگی تەقە تەقەی عەرەبانەکەدا، گوێی لە دەنگی ئەو قارسییانەی کە بەلای عەرەبانەکەدا تێ دەپەڕین و لە نێوان خۆیاندا

دەدووان و گوێی لە دەنگی هەناسەی قەدیفە بوو کە لە تەنیشتیەوە ڕاکشابوو. بڕێک منداڵ کە خۆیان بەدوای عەرەبانەکەدا هەڵواسیبوو و بەدرێژاییی شەقامەکە خۆیان دەخلیسکاند، ماوەیەک شڵەژاندی، بەڵام خەندە شیرینەکەی قەدیفەی هێندە پێ خۆش بوو، بەجۆرێک وەکو منداڵەکان هەستی بە شادی کرد.



## ٢٦

# لە سۆنگەی هەژاریمانەوە نییە کە هێندە بەخوای خۆمانەوە پەیوەستین

## لێدوانی شینە بۆ سەرتاسەری ڕۆژئاوا

تایە لاستیکەکانی عەرەبانەکە شیرین شیرین بەسەر بەفرەکەدا دەخولانەوە. لەو دەمەدا کە (کا) خەریک بوو بە ڕاکشانەوە سروشی چەند دێرێکی شیعرێکی نوێی بۆ دەهات، عەرەبانەکە تەکانێکی دا، چووە سەر شۆستەیەک و ڕاوەستا. دوای ماوەیەکی درێژ کە (کا) لە میانەیدا چەند بەیتێکی تریشی بۆ هات، کابرای عەرەبانچی خێوەتەکەی هەڵدایەوە. (کا) حەوشەیەکی چۆڵ و بە بەفر داپۆشراوی بینی کە بە دوکانی فیتەری و لحێمچی و تراکتۆرێکی شکاو دەورە درابوو. سەگێکی ڕەشیش کە لە گۆشەیەکدا بە زنجیر بەسترابووەوە، لەگەڵ بینینی کەسانی دابەزیو لە عەرەبانەکە، دەستی بە حەپەحەپ کرد.

بە دەرگایەکی دارگوێزدا چوونەژوورەوە، (کا) دوای ئەوەی لە دەرگای دووەم چووە ژوورەوە، شینەی بینی کە لە پەنجەرەیەکەوە سەیری ناو حەوشە بەفراوییەکەی دەکرد. قژە قاوەییەکەی، وردە خاڵی دەموچاوی و چاوە شینەکانی، وەکو جاری پێشوو (کا)ی سەرسام کرد. سادەیی ژوورەکە، هەندێ شتومەک (هەمان شانە، هەمان جانتای دەستی نیوەکراوە و هەمان تەپڵەکی جگەرە کە قەراغەکانی بە نیگاری عوسمانی نەخشێنرابوون و -ئەرسین ئەلەکتریک-ی لەسەر نووسرابوو)، بۆچوونێکی وای لای (کا) دروستکرد کە شینە دوێنێ شەو ماڵەکەی نەگۆڕیوە، بەڵام (کا) زەردەخەنەیەکی خوێنساردانەی بە ڕووخساریەوە بینی، وەکو ئەوەی ئێستا ڕووداوەکانی دوێنێ شەوی قەبووڵ کردبێ. (کا) دەسبەجێ حاڵی بوو کابرا بەهۆی قورتاربوونی لە کودەتاچییەکان، پیرۆزبایی لە خۆی دەکات.

شینە گوتی: "چیدی لە بارەی کچانی خۆکوژەوە نانووسی."

"بۆچی؟"

"سوپایش ناخوازێ لەسەریان بنووسرێ."

(کا) بە هوشیاری گوتی: "من وتەبێژی سوپا نیم."

"دەزانم."

ساتێک بێدەنگ لە یەکتریان ڕوانی.

شینە گوتی: "دوێنێ پێت گوتم کە دەتوانی لە ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوادا وتار دەربارەی کچانی خۆکوشتوو بڵاو بکەیتەوە."

(کا) لە پای ئەم درۆ گەورەیە کە کردبووی، شەرمی بە خۆیدا هاتەوە.

شینە پرسی: "لەم کام ڕۆژنامەی ڕۆژئاواییدا؟ لە کێژان ڕۆژنامەی ئەڵمانی دۆست و ئاشنات هەن؟"

(کا) گوتی: "لە ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاو."

"کێ؟"

"ڕۆژنامەنووسێکی دیموکراتی ئەڵمانی."

"ناوی چییە؟"

(کا) زیاتر خۆی خزاندە پاڵتۆکەیەوە و گوتی: "هانز هانزن."

شینە گوتی: "لێدوانێکم هەیە بۆ هانز هانزن سەبارەت بە کودەتا سەربازییەکە. هێندە کاتمان بە دەستەوە نییە، دەمەوێ یەکسەر دەست بە نووسینەوە بکەیت."

(کا) لە پشتی دەفتەری شیعرەکەی دەستی بە تۆمارکردنی تێبینی کرد. شینە گوتی کە لە کودەتای شانۆکەوە تا ئەو ساتە، بەلانی کەمەوە هەشتا کەس کوژراون (ژمارەی ڕاستی، بەوانەیشەوە کە لە هۆڵەکە پێکرابوون، حەڤدە بوون)، لە پەلاماردا بە بەکارهێنانی تانک نۆ ماڵ و قوتابخانە رووخێنراون (لە ڕاستیدا چوار کوڵێت بوو). ئاماژەی کرد بۆ کوژرانی قوتابیان لە ژێر ئەشکەنجەدا و بۆ شەڕ و پێکدادانەکانی کوچەکانی پشتەوە کە (کا) لێیان بێ ئاگا بوو. زۆر لەسەر دەرد و ئازاری کوردەکان ڕانەوەستا و بە سەریدا بازی دا، بەڵام بە پێوەنانەوە گازندەی ئیسلامییەکانی گێڕایەوە. شینە گوتی دەوڵەت خۆی سەرۆکی شارەوانی و



بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی کوشتووە بۆ ئەوەی زەمینە بۆ کودەتاکە خۆش بکات. بەبۆچوونی ئەو، هەمــوو ئەو ڕەفــتــارانەی دەوڵەت "بۆ ڕێگرتن بووە لە سەرکەوتنی ئیسلامییەکان لە هەڵبژاردنە دیموکراتییەکاندا." لە کاتێکدا شینە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە وردەکاریی قەدەغەکردنی چالاکیی پارتە سیاسییەکان و کۆمەڵەکان و هتد... دەگێڕایەوە، (کا) چاوی بڕیە ناو چاوی قەدیفە کە سەرمەستانە گوێی بۆ شینە ڕاگرتبوو. لە دامێنی ئەو لاپەڕانەدا کە (کا) دواتر دڕاندبوونی و لە دەفتەری شیعرەکەی کردبووەوە، بە یادی ئیپەکەوە چەند نیگار و هێڵکارییەکی کێشا: گەردن و قژی ژنێک، لە پشتەوە، دووکەڵێکی زراڤ لە دووکەڵکێشێکی بچووکی ماڵێکی خنجیلانەوە دەهاتە دەرێ... (کا) ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر بە منی گوتبوو ئەو ڕاستییە بەهێزانەی کە شاعیر بە ڕاستیان دەزانێ، بەڵام ترسی ئەوەی هەیە شیعری لێ بشێوێنێ، پێویستە تەنیا بە دەوریاندا بخولێتەوە و هونەری ئەویش لە موزیکی شاراوەی ئەم خولخواردنەدا خۆی دەنوێنێ. (کا) هەندێک لە وشەکانی شینەی هێندە بەلاوە جوان بوو کە دانەبەدانە لە دەفتەرەکەیدا نووسینییەوە. "ئێمە لێرە، هۆی پەیوەستبوونمان تا ئەو ڕادەیە بە خودای خۆمانەوە، بە پێچەوانەی بۆچوونی ڕۆژئاواییەکانەوە، لەبەرئەوە نییە کە زۆر هەژارین، بەڵکو لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە لە هەموو کەسێک بە پەرۆشترین بۆ ئەوەی بزانین لەم جیهانە چ کارێکمان هەیە و لە دنیای ئەودیو چ دەقەومێ."

شینە، لەبری ئەوەی لە ڕستەکانی کۆتاییدا دابەزێتە خوارەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەی ئەم پەرۆشییە و ڕووناکی بکاتەوە کارمان لەم جیهانەدا چییە، ڕووی بانگەوازی لە ئەورووپا کرد: بە خۆبادانەوە پرسی: "ڕۆژئاوا کە لە فەرمایشتی خودا زیاتر باوەڕی بە دیموکراتیی داهێنراوی خۆی هەیە، ئایا لە دژی ئەم کودەتا دژبەرەی دیموکراتی لە قارس ڕادەوەستێ؟ یاخۆ گرنگ دیموکراتی، ئازادی و مافی مرۆڤ نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە پاشماوەی جیهان وەکو مەیموون لاسایی ڕۆژئاوا بکاتەوە؟ ئایا ڕۆژئاوا دیموکراتییەک پەسەند دەکات کە دوژمنانی تەواو جیاواز لەوان بەدەستی بخەن؟ هەروەها جگە لە ڕۆژئاوا، دەمەوێ ڕووی بانگەوازم لە پاشماوەکەی تری جیهان بکەم: برایان، ئێوە تەنیا نین... ساتێک کپ بوو. بەڵام ئایا هاوڕێکەت لە

رۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاو سەرجەمی ئەم هەواڵە بڵاو دەکاتەوە؟"

(کا) بەهوشیارییەوە گوتی: "شتێکی جوان نابێ ئەگەر بەردەوام باسی ڕۆژئاوا بکرێ، وەکو ئەوەی ڕووی قسە لەیەک کەس و یەک بۆچوون بکرێ."

شینە لە دواییدا گوتی: "باوەڕم بەمە هەیە، بەڵام یەک ڕۆژئاوا هەیە بە یەک بیر و بۆچوونەوە. ئێمەیش نوێنەرایەتیی بۆچوونەکەی تر دەکەین."

(کا) گوتی: "سەرباری ئەوەیش ڕۆژئاواییەکان بەو شێوەیە ناژین. خەڵکی ئەوێ بە پێچەوانەی خەڵکی ئێرەوە، شانازی بەوەوە ناکەن کە وەکو کەسانی تر بیر دەکەنەوە. هەرکەسە، تەنانەت بەقاڵێکی هەرە بچووک و سادەیش شانازی بەوەوە دەکات کە خاوەنی بیر و ڕای تایبەت بە خۆیەتی. بۆیە ئەگەر لەبری ڕۆژئاوا بڵێین دیموکراتەکانی ڕۆژئاوا، ئەوا دەتوانین باشتر دەنگی خۆمان بگەیەنین بە ویژدانی مرۆڤەکانی وێندەرێ."

"باشە، چۆنتان پێ باشە، وا بکەن. ئایا پێویست بە ڕاستکردنەوەی دی دەکات بۆ بڵاوکردنەوە؟"

"بە زیادکردنی دواین بانگەوازتان، لێدوانەکەتان سنووری هەواڵی تێ پەڕاند و قاڵبی ڕاگەیەندراوێکی هەواڵئامێزی لە خۆ گرتووە. لە خواریشەوە واژۆی ئێوەی دەخەینە سەر... لەوانەیە چەند ڕستەیەکیش بۆ ناساندنتان..."

شینە گوتی: "ئەوەیشم ئامادەکردووە، ئەوەندە بەسە بڵێین ئیسلامیی هەرە لە پێشی تورکیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست."

"ئەگەر وابێ، هانز هانزن ڕاگەیەندراوەکە بڵاو ناکاتەوە."

"چۆن؟"

(کا) گوتی: "چونکە بڵاوکردنەوەی ڕاگەیەندراوێک بەناوی تەنیا یەک ئیسلامیی تورکەوە لە ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاوی سۆسیال دیموکراتدا، بەلای ئەوانەوە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە لایەنگرییان کردووە."

شینە گوتی: "کەواتە ئەگەر بەڕێز هانز هانزن شتێکی بەدڵ نەبێت، هەڵدەتیزێنێ.



باشە، چی بکەین بۆ ئەوەی قایلی بکەین؟"

"دیموکراتەکانی ئەڵمانیا ئەگەر تەنانەت هەڵوێستیش لە دژی کودەتایەکی سەربازی لە تورکیا ڕادەگەیەنن -کودەتایەکی ڕاستەقینە، نەوەک لەسەر شانۆ- لە ئاکامدا نائارام دەبن لەوەی ئەگەر پشتیوانییان لە ئیسلامییەکان کردبێ."

شینە گوتی: "بەڵێ، ئەوانە هەموویان لێمان دەترسن."

(کا) بۆی ڕوون نەبووەوە کە داخۆ ئەمەی بەشانازیکردنەوە گوت، یاخۆ وەکو سکاڵا دەربڕین لە بەرانبەر جۆرێک لە خراپ لە یەکتر گەیشتن. گوتی: "لەبەرئەوە، ئەگەر بێت و کۆنە کۆمۆنیستێک و نەتەوەپەرستێکی کوردیش واژۆی خۆیان بخەنە سەر ئەم ڕاگەیاندنە، ئەوا ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاو زۆر بە ئاسانی بڵاوی دەکاتەوە."

"واتا چۆن؟"

(کا) گوتی: "دەتوانین دوو کەسی تر لە قارس بدۆزینەوە و دەسبەجێ پێکەوە ڕاگەیەندراوێک ئامادە بکەین."

شینە گوتی: "ئامادە نیم لە پێناوی خۆ شیرینکردندا لای ڕۆژئاواییەکان شەراب بخۆمەوە. ناشتوانم هەوڵ بدەم وەکو ئەوان ڕەفتار بکەم تاکو لێم نەترسن و کارەکانم بۆ ڕاپەڕێنن. ئامادەیش نیم ڕوو لە دەرگای ئەم هانز هانزنە بکەم لە پێناوی ئەوەدا کە ئەتایستە خودانەناسەکان هاوبەشی ئازارەکانمان بن. ئەم ڕێزدار هانز هانزنە کێیە؟ بۆچی ئەو هەموو مەرجە دەسەپێنێ؟ ئایا جوولەکەیە؟"

بێدەنگییەک ئەو ناوەی داگرت. شینە بە نەفرەتەوە بۆ (کا)ی ڕووانی، چونکە پەی بەوە برد کە (کا) پێی وایە ئەم شتێکی هەڵەی گوتووە. "جووەکان گەورەترین چەوساوەی ئەم سەدەیەن. بەر لەوەی هیچ گۆڕانکارییەک لە لێدوانەکەمدا بکەم، دەمەوێ ئەو هانز هانزنە بناسم. تۆ ئەمەت چۆن ناسی؟"

"برادەرێکی تورک پێی گوتم شرۆڤە-هەواڵێک لە ڕۆژنامەی فرانکفۆرتەر ڕوندشاودا سەبارەت بە تورکیا دەردەچێ و نووسەرەکەی دەیەوێ ڕای کەسێکی شارەزا لەو بارەیەوە وەربگرێ."

"باشە بۆچی هانز هانزن پرسیارەکانی خۆی لەو برادەرە تورکە نەکرد و لە تۆی کرد؟"

"ئەو برادەرە کەمتر لە من بایەخی بەو کارانە دەدا..."

شینە گوتی: "با من پێت بڵێم ئەو کارانە چین، شتگەلێکی لە جۆری ئەشکەنجە، زۆرداری و بارودۆخی زیندانەکانە کە لە بەهای ئێمە کەم دەکاتەوە."

(کا) گوتی: "پێم وایە دەربارەی کوشتنی ئەتایستێک بوو لە مەلاتیا لەسەر دەستی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان."

شینە بە هوشیارییەوە گوتی: "ڕووداوێکی وام نایاتەوە بیر. چەندە نامەردییە بۆ ئیسلامییەکان کاتێک لە پێناوی ناوبانگ دەرکردن و دەرچوون لە تەلەفزیۆندا ئەتایستێکی بەلەنگاز دەکوژن، هێندەیش مایەی ڕەزالەتە بۆ ڕۆژهەڵاتناسەکان کاتێک بەمەبەستی بچووک نیشاندانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە جیهاندا هەواڵەکە بەجۆرێک پێوەنانەوە بڵاودەکەنەوە وەکو ئەوەی دە پازدە کەس کوژرابن. ئەگەر ڕێزدار هانز هانزن کەسێکی لەو بابەتەیە، با لە بیرخۆمانی بەرینەوە."

"هانز هانزن چەند شتێکی سەبارەت بە یەکێتی ئەوروپا و تورکیا لە من پرسی. دوای هەفتەیەکیش تەلەفۆنی بۆ کردم و بانگهێشتنی کردم بۆ خواردنی ئێوارە لە ماڵەوە."

"هەر وا بە ئاسانی؟"

"بەڵێ."

"زۆر جێی گومانە. چیت بینی لە ماڵەکەیدا؟ ئایا ژنەکەی خۆی پێت ناساند؟"

(کا) سەرنجی دا قەدیفەیش کە لە نزیک پەردە بەتەواوی کراوەکانی پەنجەرەکەوە دانیشتبوو، بەوردی گوێی بۆ قسەکان گرتووە.

(کا) گوتی: "خێزانی ڕێزدار هانز هانزن، خێزانێکی جوان و بەختەوەر بوو. ئێوارەیەک لە ڕێی گەڕانەوەیدا لە ڕۆژنامەوە بۆ ماڵەوە، منی لە وێستگای شەمەنەفەر هەڵگرت. دوای نیوسەعات، گەیشتینە ماڵێکی ڕووناکی ناو باخچەیەک.



هەڵسوکەوتێکی زۆر باشیان لە بەرانبەرم نواند. مریشکی برژاوی فڕن و پەتاتەمان خوارد. ژنەکەی لە پێشدا پەتاتەکەی کوڵاندبوو و دوایی لە فڕندا سووری کردبووەوە."

"ژنەکەی کەسێکی چۆن بوو؟"

(کا) هانز هانزنی فرۆشیارەکەی بازاڕی کاوفهۆفی هێنایەوە بەرچاوی خۆی: "هانز هانزن چەندە قژزەرد و چاوشین و ناوشان پان بوو، ئینگەبۆرگ و منداڵەکانیشی هێندە قژزەرد و چاوشین و جوان بوون."

"ئایا خاچ بە دیوارەکانیانەوە هەبوو؟"

"بیرم نایاتەوە، نەبوو."

شینە گوتی: "هەبووە، وەلێ تۆ باش سەرنجت نەداوە. بە پێچەوانەی خەیاڵی ئەتایستەکانی ئێمەوە کە شەیدای ڕۆژئاوان، سەرجەم ڕۆشنبیرەکانی ئەوروپا بەتوندی بە ئاینەکەیان و بە خاچەکانیانەوە پەیوەستن. بەڵام ئەوانەی ئێمە کە دێنەوە بۆ تورکیا باسی ئەمە ناکەن، چونکە مەراقی ئەوان ئەوەیە بیسەلمێنن کە سەردەستیی تەکنۆلۆژیای ڕۆژئاوا سەرکەوتنێکی ئەتایستییە... بۆم بگێڕەوە چیت دی و باسی چیتان کرد."

"ڕێزدار هانز هانزن، سەرباری کارکردنی لە بەشی هەواڵی دەرەوەی ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاو، ئەدەبدۆستیشە. قسە هاتە سەر شیعر. باسی شاعیران و وڵاتەکانیان و بەسەرهاتەکانیانمان کرد. نازانم چۆن کاتەکە وا بە خێرایی تێ پەڕی."

"ئایا میهرەبان بوون لە تەکتدا؟ ئایا هەڵسوکەوتیان دۆستانە بوو لەگەڵتدا لەبەرئەوەی تۆ تورکیت، بەلەنگازی، دوورخراوەیەکی سیاسیی ڕەبەن و تەنیایت، یاخۆ بەسۆز بوون بەرانبەرت لە سۆنگەی ئەوەی لاوانی ئەڵمانی کاتێک دەخۆنەوە و سەرخۆش دەبن، تورکە بێکەسەکانی وەکو تۆ دەسووتێنن؟"

"نازانم، ئەوان زۆریان لێم نەدەکرد."

"با زۆریشیان لێت نەکردبێ و وایان نیشان نەدابێ کە بەزەییان پێتدا دێتەوە، لە

ناخی مرۆدا ویستێک بۆ بەزەیی پێداهاتنەوە هەیە. دەیان هەزار ڕۆشنبیری تورک و کورد لە ئەڵمانیا هەن کە ئەم ویستی بەزەییەیان کردووە بە سەرچاوەی پەیداکردنی بژێوی ژیان."

"خێزانەکەی هانز هانزن و منداڵەکانی، هەموویان مرۆگەلی باش و نەرم و نیان بوون. لەوانەیشە لە میهرەبانیی خۆیانەوە بوویێ، نەیانهێشتبێ هەست بکەم کە بەزەییان پێمدا دێتەوە. تەنانەت ئەگەر بەزەییشیان پێمدا بهاتباوە، چیدی بەلامەوە گرنگ نەدەبوو."

"واتە ئەو ڕەوشە بەهیچ جۆرێک هەستی شانازیی تۆی نەڕووشاند؟"

"لەوانەیشە، بەڵام سەرباری ئەوەیش، ئەو ئێوارەیە من لای ئەوان زۆر کامەران بووم. گڵۆپەکانی قەراغ مێزەکە تیشکێکی پرتەقاڵیی زۆر جوانیان هەبوو... چنگاڵ و چەقۆکانیان بابەتێک بوون کە من هەرگیز لەوە پێشتر نەمدیبوون، بەڵام هێندەیش نامۆ نەبوو کە مرۆڤ بێزار بکات... تەلەفزیۆنەکەیان بەردەوام داگیرسابوو، ناوبەناو سەیرێکیان دەکرد، ئەمەیش وای لێ دەکردم هەست بکەم کە لە ماڵەوەم. جارویار کە دەیانزانی ئەڵمانییەکەم بڕ ناکات، بە ئینگلیزی لەگەڵم دەدووان. دوای نانخواردن، منداڵەکان پرسیاری دەرزەکانیان لە باوکیان کرد، دایک و باوکەکە، منداڵەکانیان بەر لە خەوتنیان ماچ کرد. زۆر هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد، لە دوای خواردنەکە، بۆ دووەم جار پارچەیەک کێکم هەڵگرت. کەس هەستی بەمە نەکرد، دواتریش زۆر بیرم کردەوە کە ئەگەر تەنانەت هەستیشیان پێ بکردایە، زۆر بەلایانەوە ئاسایی بوو."

قەدیفە پرسی: "کێکی چی بوو؟"

"کێکی ڤیەنایی بە هەنجیر و بە شۆکۆلاتە."

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە.

قەدیفە پرسی: "ڕەنگی پەردەکان چۆن بوون و نیگاری چۆنیان پێوە بوو؟"

(کا) خۆی وا نیشاندا وەکو ئەوەی بیەوێ شتێکی بیر بکەوێتەوە: "سپیی سادە یاخۆ زەردی کایی بوون. نیگاری ماسیی بچووک، گوڵ، ورچ و میوەی ڕەنگاوڕەنگیان



بەسەرەوە بوو."

"واتە وەکو قوماشی منداڵان؟"

"نەخێر، چونکە کەشێکی بەدەربەستی هەبوو. پێویستە بڵێم کە: بەختەوەر بوون، بەڵام وەکو ئێمە لە وەخت و ناوەختدا پێ نەدەکەنین. زۆر بەدەربەست بوون. لەوانەیشە لەم سۆنگەیەوە بێ هێندە کامەران بوون. ژیان بەلای ئەوانەوە شتێک بوو پێویستی بە لێپرسراوێتی هەبوو. نەک لای ئێمە کە یان ماندووبوونێکی کوێرانەیە، یاخۆ تاقیکردنەوەیەکی تاڵە، بەڵام بەدەربەستی ئەوان شتێکی زیندوو و ئەرێنی بوو. کامەرانییەکی پێوراو و ڕەنگینی وەکو نەخش و نیگاری ورچ و ماسییەکانی سەر پەردەکانیان هەبوو."

قەدیفە هەڵیدایێ و پرسی: "ڕایەخی سەر مێزەکە چ ڕەنگێکی هەبوو؟"

(کا) گوتی: "لەبیرم چووە." وا خۆی نیشاندا وەکو ئەوەی کە نوقمی بیرکردنەوە بێ بۆ ئەوەی بیری بکەوێتەوە.

شینە بە سووکە ڕقێکەوە گوتی: "چەند جار چوویت بۆ ئەوێ؟"

"ئەو شەوە لەوێندەرێ هێندە کامەران بووم کە ئارەزووم دەکرد جارێکی تریش بانگهێشتم بکەنەوە. وەلێ هانز هانزن جارێکی دی بانگی نەکردمەوە."

سەگە ڕەشە بە زنجیر بەستراوەکە دەستی بە وەڕینێکی درێژ کرد. (کا) پەڵەی غەمێکی بە ڕووی قەدیفەوە بینی، لە ڕووخساری شینەیشدا گومانێکی تووڕەی بەدی کرد.

(کا) سەختگیرانە گوتی: "چەندین جار تەلەفۆنم بۆ کردن. جارویار وای بۆ دەچووم کە هانز هانزن تەلەفۆنی بۆ کردووم و بۆ نانی ئێوارە بانگی کردووم، بەڵام من لە ماڵ نەبووم. بۆیە کاتێک لە کتێبخانە دەهاتمە دەرێ، بە زۆر خۆم پێ ڕادەگیرا کە بە ڕاکردن نەچمەوە ماڵەوە. لە ناخەوە ئارەزووم دەکرد جارێکی دی ئەو ئاوێنە قات قاتە جوانە، قەنەفەکان کە ڕەنگیانم لەبیر چووە -پێم وابێ زەردی لیمۆیی بوو-، تەختەی نانبڕینی سەر خوانەکە کە نانیان لەسەر دەبڕی و لێیان دەپرسیم -ئایا ئاوا باشە؟- ، (ئێوە دەزانن کە ئەوروپاییگەل زۆر کەمتر لە ئێمەمانان نان دەخۆن)؛ ئەو دیمەنە

جوانانەی چیاگەلی ئالپ بەسەر دیوارە بێ خاچەکانەوە و ئەو شتانە ببینمەوە."

(کا) چاوی لێ بوو کە شینە ئێستا بە ئاشکرا بە نەفرەتەوە سەیری ئەم دەکات. "دوای سێ مانگ برادەرێک هەواڵی نوێی لە تورکیاوە هێنابوو. بەبیانووی گەیاندنی هەواڵی ئەم ئەشکەنجەیە و پەلامار و زۆرداریییەی پێ بگەیەنم، تەلەفۆنێکم کرد بۆ هانز هانزن. بە سەرنجەوە گوێی لێ گرتم، وەکو هەمیشە بە نەزاکەت و بەرێز بوو. هەواڵێکی بچووکیش لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوکرایەوە. ئەو هەواڵی ئەشکەنجە و مردنە هیچ بە دەردی منی نەخوارد. من دەمویست ئەو لێم بپرسێتەوە، بەڵام هەرگیز تەلەفۆنی بۆ نەکردمەوە. جاروبار بە خەیاڵمدا دەهات نامەیەکی بۆ بنووسم و بپرسم گەلۆ چ هەڵەیەکم کردووە، بۆچی پێوەندیم پێوە ناکەن؟"

ئەم هەوڵەی (کا) بۆ خۆنیشاندانی وەکو گاڵتەجاڕ، شینەی هێور نەکردەوە. شینە بە شۆخی پێکردنەوە گوتی: "ئیدی لەومەودا بیانوویەکتان بە دەستەوە دەبێ بۆ گەڕان بە دوایدا."

(کا) گوتی: " بەڵام پێویستە گەلاڵەی ڕاگەیەندراوێکی هاوبەش دابڕێژین کە لەگەڵ پێوانەکانی ئەڵمانیادا یەک بگرێتەوە بۆ ئەوەی لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوبکرێتەوە."

"ئەو کوردە نەتەوەپەرست و کۆمۆنیستە نەرمە کێن کە پێویست دەکات ڕاگەیەندراوێکی هاوبەشیان لەگەڵدا بنووسم؟"

(کا) گوتی: "ئەگەر مەترسیتان هەیە ئەو کەسانە سەر بە پۆلیس بن، ئەوا ئێوە خۆتان ناوەکان پێشنیار بکەن."

"لە ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان چەندین لاوی کورد هەن کە دڵیان پڕە لە ڕق لە پای ئەوەی بەسەر هاوپۆلەکانیاندا هێنراوە. بێ هیچ گومانێک ئەتایستێکی نەتەوەپەرستی کورد، لای ڕۆژنامەنووسانی ڕۆژئاوایی لە ئیسلامییەکی کورد بەنرخترە. لاوێکی کورد دەتوانێ لەم ڕاگەیەندراوەدا نوێنەرایەتیی کورد بکات."

(کا) گوتی: "باشە، ئێوە ئەو قوتابییە لاوە ئامادە بکەن. دەتوانم بڵێم ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاو بەمە قایل دەبێ."

شینە بە شۆخی پێکردنەوە گوتی: "بێگومان، تۆ هەر چۆنێک بێ لای ئێمە



نوێنەرایەتیی ڕۆژئاوا دەکەی."

(کا) هیچ خۆی تێک نەدا. "گونجاوترین کەسیش بۆ کۆنە کۆمۆنیست-تازە دیموکرات، تورگوت بەگە."

قەدیفە بە نیگەرانییەوە گوتی: "باوکم؟" کاتێک (کا) بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، قەدیفە ڕوونی کردەوە کە باوکی هەرگیز لە هوتێلەکە ناچێتە دەرەوە. هەموو تێکڕا دەستیان بە قسە کرد. شینە هەوڵی دا ڕوونی بکاتەوە کە تورگوت بەگیش وەکو هەموو کۆنە کۆمۆنیستەکانی تر لە ڕاستیدا کەسێکی دیموکرات نییە و لەبەرئەوەی لە ئیسلامییەکان دەترسێ پێشوازیی لە کودەتا سەربازییەکە کردووە، بەڵام بۆ ئەوەی چەپێتیی خۆی لەکەدار نەکات، سەختەکاری دەکات.

قەدیفە گوتی: "باوکی من سەختەکار نییە."

(کا) دەسبەجێ بە لەرەی دەنگی قەدیفە و بە گڕی لەناکاوی چاوە تووڕەکانی شینەدا بۆی دەرکەوت ئەو جووتە لە سەرەتای یەکێک لەو شەڕانەدان کە چەندین جار خۆی دووبارە کردووەتەوە. حاڵیش بوو جووتەکە وەکو دوو کەسی ماندووی دەستی شەڕی درێژخایەن، چیدی بەلایانەوە گرنگ نییە ناکۆکییەکانیان لە کەسانی دی بشارنەوە. لە قەدیفەدا سووربوونێکی تایبەت بە ژنانی ئەڤینداری بینی کە بەهەموو نرخێک پەیوەستی دوا وتەی خۆیانن، لە شینەیشدا میهرەبانییەکی نائاساییی تێکەڵ بە هەستی لە خۆبایی بوونی بەدی کرد. بەڵام لەپڕ هەموو شتەکان گۆڕان و جۆرێک لە سووربوون لە چاوەکانی شینەدا دەرکەوت.

شینە گوتی: "لە ڕاستیدا باوکی تۆیش یەکێکە لە سەختەکارانی هاوشێوەی ئەتایستەکان و چەپە ڕۆشنبیرەکانی شەیدای ئەوروپا کە نەفرەت لە گەل دەکەن!"

قەدیفە دەستی دایە تەپڵەکە پلاستیکەکەی لە جۆری ئەرسین ئەلەکتریک و تا هێزی تێدابوو، گرتیە شینە، بەڵام وێ دەچوو بەئەنقەست نیشانی نەپێکابێ. تەپڵەکەکە بەر دیمەنەکەی ڤینیسیای سەر دیوارەکە کەوت و بە کپی کەوتە خوارەوە.

شینە گوتی: "هەروەها باوکت چاوپۆشی لەوەیش دەکات کە کچەکەی ژێراوژێر ئەڤینداری ئیسلامییەکی ڕادیکاڵە."

قەدیفە بەنەرمی بە هەردوو دەستی کێشای بە ناوشانی شینەدا و دەستی بە گریان کرد. شینە لەسەر کورسییەکی قەراغ ژوورەکە داینیشاند، هەردووکیان بە ڕیتمێکی ئەوتۆ دەدووان، بەجۆرێک (کا) خەریک بوو بێتە سەر ئەو باوەڕەی کە سەرلەبەری ئەم بەزمە نمایشێکی سازکراوە بۆ کاریگەری دانان لەسەر ئەم.

قەدیفە گوتی: "قسەکەت بگێڕە دواوە."

شینە، وەکو ئەوەی بە سۆزەوە منداڵێکی بچووکی چاو بەگریان ژیر بکاتەوە، گوتی: قسەی خۆم دەکێشمە دواوە. بۆ سەلماندنی ئەمەیش، ئامادەم لەگەڵ باوکتدا واژۆ بخەمە سەر ڕاگەیاندنەکە بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەم کە باوکت ڕۆژ تا ئێوارە خەریکی گێڕانەوەی جۆکی زەندیقانەیە. بەڵام بەهۆی ئەوەی نەبادا ئەمە کەمینێک بێت کە نوێنەرەکەی هانز هانزن -بزەیەکی بۆ (کا) کرد- بۆی نابینەوە، من ئامادە نیم بێم بۆ هوتێلەکەتان. حاڵی بووی گیانەکەم؟"

قەدیفە بە وڕکێکی کچانەوە کە (کا)ی سەرسام کرد، گوتی: "باوکم هەرگیز لە هوتێل نایاتە دەرەوە، چونکە هەژاریی قارس میزاجی تێک دەدات."

(کا) کە پێشتر هیچ ڕەنگێکی فەرمی بە قسەکانی لەگەڵ قەدیفەدا نەدابوو، ئەمجار بە ڕیتمێکی فەرمی پێی گوت: "قەدیفە، قایلی بکەن با بێتە دەرەوە." نیگای لەگەڵ نیگای قەدیفەدا یەکانگیر بوونەوە: "بەفر هەموو شتێکی داپۆشیوە."

ئەمجار قەدیفە تێ گەیشت. گوتی: "باشە، بەڵام باوکم بەر لەوەی لە هوتێل بێتە دەرێ، پێویستە قایل بکرێ کە لەتەک ئیسلامییەک و نەتەوەپەرستێکی کورددا واژۆ بخاتە سەر هەمان ڕاگەیەندراو. کێ ئەم ئەرکە ڕادەپەڕێنێ؟"

(کا) گوتی: "من ڕای دەپەڕێنم و ئێوەیش هاوکاریم دەکەن."

قەدیفە گوتی: "لە کوێ یەکدی دەبینن؟ باشە ئەگەر باوکە بەستەزمانەکەم لەسەر ئەم تووڕەهاتانە دەستگیر کرا و بەم کۆتاییی تەمەنە خرایە زیندانەوە؟"

شینە گوتی: "ئەمە تووڕەهات نییە، ئەگەر یەک دوو هەواڵ لە ڕۆژنامەکانی ئەورووپادا بڵاوبکرێنەوە، ئەوا ئانکارا کەمێک گوێی پیاوەکانی خۆی لێرە ڕادەکێشێ و ئەمانیش کەمێک پاشەکشە دەکەن."



قەدیفە گوتی: "مەسەلەکە زیاتر دەرکەوتنی ناوی تۆیە، نەک بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە ڕۆژنامەکانی ئەورووپادا."

کاتێک شینە ئەمەیشی بە تێگەیشتنەوە پەسەند کرد و زەردەخەنەیەکی شیرینی بەسەردا کرد، (کا) لە بەرامبەریدا هەستی بە ڕێز کرد. بۆ یەکەمجار ئەوەی بە خەیاڵدا هات ئەگەر هەر هەواڵێک لە ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاودا بڵاوبکرێتەوە، ئەوا ڕۆژنامە ئیسلامییە بچووکەکانی ئەستەمبوڵ شانازیی پێوە دەکەن و بە پێوەنانەوە وەری دەگێڕن. ئەمەیش، بە واتای ناسینی شینەیە لە هەموو تورکیادا.

بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەریاندا کێشا. قەدیفە دەسرێکی دەرهێنابوو و چاوی خۆی دەسڕییەوە. (کا) هەستی کرد دەسبەجێ لەگەڵ چوونە دەرەوەی ئەمدا، ئەم جووتە ئەڤیندارە سەرەتا دەبێتە شەڕیان و دواتر لەگەڵ یەکدیدا دەنوون. ئایا خواستیان بوو ئەم بە زووترین کات بڕواتە دەرەوە؟ فڕۆکەیەک بە قوڵاییی ئاسمانەوە دەفڕی. هەموویان چاویان بڕیە ئاسمان کە لە بەشی سەرەوەی پەنجەرەکەوە بەدی دەکراو گوێیان ڕاگرت.

قەدیفە گوتی: "لە ڕاستیدا هەرگیز فڕۆکە بە ئاسمانی ئێرەدا نافڕێ."

شینە گوتی: "ڕووداوی نائاسایی قەوماون." دوایی پێ کەنینی بەم بێ متمانەیییەی خۆیدا هات. کاتێک سەرنجی دا (کا) بەدوای ئەودا پێکەنی، ئەم کێچ کەوتە کەوڵی: "دەگوترێ پلەی گەرما زۆر دابەزیوە بۆ ژێر بیست پلەی خوار سفرەوە، کەچی دەوڵەت ڕادەگەیەنێ کە تەنیا بیست پلە لە ژێر سفرەوەیە." ئەمەی بەجۆرێک دەربڕی وەکو ئەوەی مەیدانبازی لەتەک (کا)دا بکات.

قەدیفە گوتی: "ئارەزووم دەکرد ژیانێکی ئاساییم هەبوایە."

شینە گوتی: "تۆ ژیانی ئاساییی سەرمایەداریت ڕەت کردووەتەوە. هەر ئەمەیشە تۆی کردووە بە مرۆڤێکی جیاواز لەوانی تر."

"من نامەوێ لەوانی تر جیاواز بم، دەمەوێ وەکو هەموو کەسێک مرۆیەکی ئاسایی بم. ئەگەر ئەم کودەتایە نەبوایە، لەوانەبوو پەچە فڕێ بدەم و وەکو ئەوانی تر بم."

شینە گوتی: "لێرە هەموو ژنان سەرپۆش لەسەر دەکەن."

"وا نییە. زۆرینەی ژنانی خوێندەواری وەکو من سەریان داناپۆشن. ئەگەر مەسەلەکە ئەوە بێ وەکو هەموو ژنێک و کەسانی سادە بم، ئەوا بە داپۆشینی سەرم، خۆم لە هاوشێوەکانی خۆم دوورخستووەتەوە. لەمەیشدا جۆرێک لە بەخۆدانازین هەیە کە حەزی پێ ناکەم."

شینە گوتی: "کەواتە سبەینێ سەرپۆشەکەت فڕێ بدە. ئەودەم هەموو کەسێک ئەمە بە سەرکەوتنێک بۆ کودەتا سەربازییەکە لە قەڵەم دەدات."

قەدیفە گوتی: هەموو کەس دەزانێ من وەکو تۆ نیم هەمیشە بە بیری ئەوەوە بژیم داخۆ ئەوانی تر چۆن بیر دەکەنەوە." لە حەژمەتاندا و لەبەر زەوق ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو.

شینە زەردەخەنەیەکی شیرینی بۆ ئەمەیش کرد، بەڵام (کا) بە ڕووخساریدا بۆی دەرکەوت ئەمجارە هەموو توانای خۆی بەکار هێناوە. شینەیش حاڵی بوو کە (کا) هەموو ئەمانەی بینی. ئەمە هەردوو پیاوەکەی گەیاندبووە بەر دەروازەی قۆناغی زۆر تایبەتیی نێوان شینە و قەدیفە، واتا ئەو سەرزەمینەی کە هەرگیز نەیاندەویست پێکەوە لێی بن. کاتێک قەدیفە بە دەنگێکی نیوە هارەوە بەرپەرچی شینەی دایەوە، (کا) هەستی کرد لە ڕاستیدا قەدیفە تایبەتمەندیی خۆی لەگەڵ شینەدا هاویشتە زەوی و لە جێی لاوازەوە برینداری کرد. (کا)یشی خستە هەڵوێستی خۆ بەتاوانبار زانینەوە، چونکە هەموو ئەمانە بە بەرچاوی ئەوەوە قەومابوون. نەیزانی بۆچی لەم کاتەدا ئەو نامەی ئەڤینانەی بیرکەوتەوە کە نەجیب بۆ قەدیفەی نووسیبوون و ئەم لە دوێنێ شەوەوە لە گیرفانی ناون؟

قەدیفە بەهەمان ڕیتمی بەرچاو ڕەشییەوە گوتی: "ناوی هیچ یەکێک لەو ژنانەی کە بەهۆی سەرداپۆشینەوە مامەڵەی خراپیان لە تەکدا دەکرێ و لە قوتابخانە قاو دەدرێن، لە ڕۆژنامەکاندا بڵاونەکراوەتەوە. لە ڕۆژنامەکاندا، لەبری ئەو ژنانەی کە بەهۆی سەرداپۆشینەوە ژیانیان لێ شێواوە، وێنەی ئەو گوندی و خۆپارێز و ئیسلامییە نەرمانە دەردەچێ کە بەناوی ئەوانەوە دەدوێن. ژنی مسوڵمان کاتێک



دەکەوێتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان کە پیاوەکەی سەرۆکی شارەوانی یاخۆ شتێکی لەو بابەتە بێت و لە بۆنە و جەژنەکاندا لە تەنیشتییەوە ڕاوەستابێ. بۆیە دەرنەچوون نا، بگرە دەرچوون لەم ڕۆژنامانەدا باری غەمی من گران دەکات. ڕاستییەکەی بەزەییم بەو پیاوە بێدەسەڵاتانەدا دێتەوە کە هەڵپەی خۆدەرخستنیانە، لە کاتێکدا ئێمەی ژنان لە پێناوی پاراستنی تایبەتمەندییەکانی خۆماندا ئەو هەموو ئازارە دەچێژین. لەبەر ئەم هۆیەیە کە دەمەوێ وتار لەسەر کچانی خۆکوشتوو بنووسرێ. هەروەها پێم وایە منیش مافی خۆمە ڕاگەیەندراوێک بگەیەنم بە هانز هانزن."

(کا) بێ لێکدانەوە گوتی: "فرە باش دەبێت، تۆیش بە نوێنەرایەتیی ژنانی فێمینیستی مسوڵمان واژۆ بخەرە سەر ڕاگەیەندراوەکە."

قەدیفە گوتی: "نامەوێ نوێنەرایەتیی کەس بکەم. گەرەکمە بەتەنیا خۆم، بە چیرۆکی خۆم و بە هەموو گوناه و کەموکورتییەکانمەوە لەوێ بەرامبەر ئەوروپاییەکان ڕابووەستم. مرۆڤ ئامادەیە بەسەرهاتی خۆی و شتی تریش بۆ کەسێک بگێڕێتەوە کە دڵنیایە جارێکی تر نایبینێتەوە... لە ڕابردوودا، کاتێک ڕۆمانە ئەوروپاییەکانم دەخوێندەوە، وام دەزانی پاڵەوانەکان بەسەرهاتەکانی خۆیان بەوجۆرە بۆ نووسەران گێڕاوەتەوە. ئارەزوومە چوار پێنج کەس لە ئەوروپا بەو شێوەیە چیرۆکی من بخوێننەوە."

لە جێیەکی نزیک لەو دەووروبەرە تەقینەوەیەک ڕووی دا، سەرانسەری ماڵەکە هەژا و جامەکان زرنگانەوە. شینە و (کا) دوای یەک دوو چرکە بە ترسەوە هەستانە سەرپێ.

قەدیفە گوتی: "من دەڕۆم و سەیرێک دەکەم." ئەو خوێنساردترین کەسی نێوانیان بوو.

(کا) پەردەی پەنجەرەکەی کەمێک لادایە لاوە. گوتی: "عەرەبانچییەکە لەوێ نییە، ڕۆیشتووە."

شینە گوتی: "مانەوەی لێرە جێی مەترسییە. تۆیش کە ڕۆیشتی، لە دەرگای ئەولای حەوشەکەوە بڕۆ دەرێ."

(کا) هەستی کرد شینە ئەمەی بە واتای "دە ئیدی برۆ" گوت، بەڵام چاوەڕێی کرد و خۆی نەجووڵاند. بە نەفرەتەوە سەیرێکی یەکتریان کرد. (کا) لە ساڵانی زانکۆدا، کاتێک لە ڕێڕەوە چۆڵ و تاریکەکاندا نەتەوەپەرستانی توندڕەو و قوتابیانی چەک بەدەستی دەبینی، ترسی لێ دەنیشت. ئێستا ئەو ترسەی بیر کەوتبووەوە، بەڵام لەو سەردەمەدا لە نێوان پیاواندا ناکۆکی لەسەر ژن نەدەهاتە ئاراوە.

شینە گوتی: "لەوانەیە هەندێک بەگومان بم، بەڵام ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێ کە تۆ سیخوڕی ڕۆژئاوا نیت. ئەگەر بە خۆیشت نەزانی کە سیخوڕیت و نیازێکی ئەوتۆیشت نەبێ، ئەوا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ. بێگانەی ناومان تۆی. ئەو گومان و سەمەرانەی کە تۆ لەم کچە باوەڕ پتەوەدا خوڵقاندت، بێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بکات، بەڵگەی ئەمەن. بە نیگای ڕۆژئاواییت کە بۆ خۆت پەسەندت کردووە، ئێمەت دادگایی کرد، لەوانەیشە لە ناخەوە پێکەنینت پێماندا هاتبێ... وەلێ من بە خەیاڵمدا نەهات، قەدیفەیش بەهەمان شێوە، بەڵام تۆ بە ساویلکەییی خۆت بەڵێنی بەختەوەری و خەیاڵی ڕاستگۆییی ئەورووپات خستە نێوانمانەوە و سەرت لێ شێواندین. لێت زویر نابم، چونکە وەکو هەموو مرۆڤێکی باش خراپە دەکەیت و هەستی پێ ناکەیت. بەڵام لەبەرئەوەی ئێستا ئەمەم پێت گوت، ئیدی لەمەودوا حسابی مرۆیەکی پاک و بێ گوناهت بۆ ناکرێ."



# ٢٧

## دان بە خۆتدا بگرە کچم، لە قارسەوە کۆمەکت پێ دەگات

## (کا) تێ دەکۆشێ تورگوت بەگ لە ڕاگەیەندراوەکەدا بەشداری بکات

(کا) لە ماڵەکە چووە دەرێ و بێ ئەوەی کەس لە دوکانی فیتەرەکانی سەر حەوشەکەوە چاوی پێوە بێ، خۆی کرد بە بازاڕدا. چووە دوکانێکی بچووکی گۆرەوی، پەڕاو و کاسێتفرۆشی کە دوێنێ (ڕۆبێرتا)ی (پەپینۆ دی کاپری)ی تێدا بیستبوو. پەڕە بە پەڕەی ئەو نامانەی کە نەجیب بۆ قەدیفە نووسیبوونی، دایە دەستی فرۆشیارە لاوە خوێن تاڵ و ڕەنگ زەردەکەی پشت مێزەکەوە و کۆپیی لەبەر گرتنەوە. بۆ ئەمە پێویست بوو پێشتر زەرفەکان هەڵتەکێنێ. دواتر نامە ڕاستەقینەکانی خستە زەرفی کاڵ و هەرزانبەهای لە هەمان بابەت و بە لاساییکردنەوەی دەستنووسی نەجیب، قەدیفە یلدزی لەسەر زەرفەکان نووسی.

شێوەی ئیپەک کە ئەمی بۆ درۆ و بۆ شەڕ لە پێناوی بەختەوەریدا بانگ دەکرد، هاتە بەرچاوی و بە هەنگاوی خێرا بۆ هوتێل گەڕایەوە. بەفر سەرلەنوێ دەستی پێ کردبووە و بە کلووی گەورە گەورە دەباری. لە شەقامەکاندا هاتوچۆی ئێوارەیەکی ئاساییی بەدی کرد. لە گۆشەی لێکدانی کوچەی ڕێگای سەرا و شەقامی خالید پاشادا کە بەهۆی کەڵەکەبوونی بەفرەوە بەرتەسک بووبووەوە، عەرەبانە خەڵووزێکی دوای ئەسپێکی شەکەت، ڕێگاکەی بەستبوو. فلچەکانی ئۆتۆمبیلە ڕاوەستاوەکەی پشت عەرەبانەکەوە هەر فریای ئەوە دەکەوت جامەکان بە پاکی ڕابگرێ. کاتێک بینی وا هەرکەسە بە توورەکەی پلاستیکەوە بەرەو ماڵەوە، ڕووەو بەختەوەریی سنووردراری خۆیان دەگەڕێنەوە، غەمێکی لە جۆری ئەوەی کە لە ئێوارانی خۆڵەمێشیی سەردەمی منداڵیدا هەستی پێ دەکرد، بەری ئاسمانی گرتبوو. بەڵام سەرباری ئەوەش، وەکو ئەوەی لە سەرەتای ڕۆژێکی نوێدا بێ، لە خۆیدا هەستی بە گوڕ و بە تین دەکرد.

دەسبەجێ چووە ژوورەکەی خۆی، کۆپیی نامەکانی نەجیبی لە بنی جانتاکەیدا

شـاردەوە. پاڵتـۆکـەی داکـەند و هـەڵی واسی. بە وردەکـارییـەکی فـرە سـەیرەوە دەسـتەکانی شۆری. لە خۆیەوە ددانەکانی شـۆری (ئێواران ئەم کارەی ڕادەپەڕاند)، پێی وابوو شیعرێکی نوێی بۆ دێ، بۆیە ساتێکی درێژ لە پەنجەرەکەوە بۆ دەرەوەی ڕووانی. لەلایەکی دی، بە کەڵوەرگرتن لە گەرمیی شۆفاژی بەردەم پەنجەرەکە، لە بری شیعر، هەندێک لە بیرەوەرییە لە بیرکراوەکانی سەردەمی منداڵی و تافی لاویی بیرکەوتەوە: سەر لە بەیانییەکی ڕۆژێکی بەهاری لەگەڵ دایکیدا بۆ قۆپچە کڕین چووبوون بۆ بازاڕی بەیئۆغلو و (پیاوێکی قرێژ) دوایان کەوتبوو... لە چاو ونبوونی ئەو تاکسییەی کە دایک و باوکی دەگەیاندنە فرۆکەخانە بەمەبەستی گەشتوگوزار لە ئەوروپا، لە گۆشەی نیشانتاشی... لە ئاهەنگێکدا، لە دوورگەی گەورە، کچێکی باڵابەرز، قژدرێژ و چاوسەوزی ناسیبوو و چەندین سەعات سەمای لە تەکدا کردبوو، دواتر نەیزانیبوو چۆن جارێکی تر ببینێتەوە و چەندین ڕۆژ لە تاو ئەڤین تووشی ژانەسک هاتبوو... هیچ ڕایەڵەیەک لە نێوان ئەم بیرەوەرییانەدا نەبوو، (کا) ئێستا زۆر باش حاڵی بووبوو کە ژیانی ئەو لە بری ئەڤینداربوون و بەختەوەربوون، لە زنجیرەیەک ڕووداوی ئاسایی، بێ واتا و ناپەیوەست بەیەکەوە پێک دەهات.

دابەزییە خوارەوە، بە بڕوا بەخۆبوونی کەسێکەوە کە ساڵانێک بێ نەخشەی سەردانێکی داڕشتبێ، بە خۆێنساردییەکی ئەوتۆوە کە خۆیشی سەرسام کردبوو، ئەو دەرگا سپییەی کوتا کە شوێنی حەوانەوەی خاوەن هوتێلەکەی لە هۆڵی پێشوازیکردن جیادەکردەوە. وا هەستی کرد کە ژنە خزمەتکارە کوردەکە کوتومت وەکو ڕۆمانەکەی تورگەنیەڤ بە ڕیتمێکی (نیمچە ڕازدار و نیمچە ڕێزداری)یەوە پێشوازیی لێ کرد. چووە ئەو ژوورەوە کە دوێنێ ئێوارە نانیان تێدا خواردبوو، بینی وا تورگوت بەگ و ئیپەک لەسەر قەنەفەیەکی درێژ و پشت لە دەرگا، لە بەردەم تەلەفزیۆندا دانیشتوون.

تورگوت بەگ گوتی: "قەدیفە لە کوێیە؟ دەست پێ دەکات."

ئەم ژوورە بەرفراوان و بنمیچ بەرزەی کەونە ماڵی ڕووسی، لەبەر ڕووناکیی لاوازی بەفرەکەدا کە لە دەرەوە خۆی بە ژوورەوەدا دەکرد، بەلای (کا)وە زۆر جیاوازتر لەو ژوورەی دەنواند کە دوێنێ نانیان تێدا خواردبوو.



کاتێک باوک و کچ هەستیان کرد ئەوەی کە هاتە ژوورەوە، (کا)یە، وەکو جووتێک مرۆڤ کە تایبەتمەندییان پێشێل کرابێ، ساتێک ئۆقرەیان لێ بڕا. کەمێک دواتر، (کا) دەرەوشانەوەیەکی لە چاوی ئیپەکدا بەدی کرد و ئەمەش دڵخۆشی کرد. لەسەر کورسییەک کە هەم باوک و کچەکە و هەمیش تەلەفزیۆنە داگیرساوەکەی لێوە دەبینی، دانیشت، بە سەرسامییەوە تەماشای کرد ئیپەک زۆر لەوە شۆختر کە بە خەیاڵی ئەمدا هاتبوو. ئەمە مەترسیی هەناوی گەورەتر دەکردەوە، بەڵام ئێستا باوەڕی وابوو کە لە ئاکامدا بەیەک دەگەن و پێکەوە بەختەوەر دەبن.

"من سەعات چواری هەموو ڕۆژێک لێرە لە گەڵ کچەکانمدا دادەنیشم و سەیری ماریانا دەکەم." تورگوت بەگ ئەمەی بەکەمێک شەرمەوە گوت، تۆزێکێش بە گوزارەیەکەوە کە واتای "ئامادەش نیم کەس حسابم لێ بپرسێ "ی دەگەیاند.

ماریانا، زنجیرەیەکی میلۆدرامایی مەکسیکی بوو کە کەناڵێکی گەورەی تەلەفزیۆن لە ئەستەمبوڵ پێنج جار لە هەفتەدا بڵاوی دەکردەوە و لە سەرانسەری تورکیادا زۆر حەزی پێ دەکرا. ماریانا کە زنجیرەکە بەناوی ئەوەوە ناونرابوو، کچێکی بەژن کورت، چاو گەورە و سەوز، دڵگیر و هەڵقوون بوو. سەرباری سپێتیی پێستی، کەسێکی سەر بە توێژی خوارەوە بوو. هەر کاتێک ڕووبەڕووی هەڵوێستی دژوار، تاوانبارکردنی ناڕەوا، ئەڤینی یەکلایەنە و بەدحاڵیبوون بووبوایە، بینەر، قژی درێژ و ڕابردووی هەژارانەی ماریانای ڕووخسار خاوێنی بیردەکەوتەوە. لەو ساتەدا، تورگوت بەگ و کچەکانی، وەکو پشیلە خۆیان لە قەنەفەکەدا گرمۆڵە دەکرد و زیاتر یەکتریان دەگوشی. کچەکان لەملا و لاوە سەریان دەخستە سەر سنگی باوکیان و پاڵیان دەدا بە شانییەوە و هەریەکەیان یەک دوو دڵۆپ فرمێسک لە چاوی دەهاتە خوارەوە. تورگوت بەگ بەهۆی ئەوەی شەرمی بەخۆیدا دەهاتەوە کە هێندە ئالوودەی زنجیرەیەکی میلۆدرامییە، ناوبەناو جەختی لەسەر هەژاریی ماریانا و مەکسیک دەکرد و دەیگوت ئەم کچەیش لەسەر شێوازی خۆی لە دژی سەرمایەداران تێ دەکۆشێ. جاروباریش ڕووی لە پەردەی تەلەفزیۆنەکە دەکرد و دەیگوت: "دان بە خۆتدا بگرە کچم، لە قارسەوە کۆمەکت پێ دەگات." بەدوایدا، کچە چاو بە فرمێسکەکانی، سووکە بزەیەکیان بۆ دەکرد.

لەگەڵ دەست پێکردنی زنجیرەکەدا، بزەیەک کەوتە سەر لێوی (کا)، بەڵام کە چاوی بە چاوی ئیپەک کەوت، حاڵی بوو ئەمەی بە دڵ نەبووە، بڕۆکانی گرژ کردەوە.

لە ماوەی یەکەمی ڕێکلامەکاندا، (کا) بەخێرایی و بە متمانە بەخۆبوونەوە بابەتی ڕاگەیەندراوەکەی لای تورگوت بەگ کردەوە و توانی لە ماوەیەکی کورتدا سەرنجی بۆ سەر بابەتەکە ڕابکێشێ. تورگوت بەگ زیاتر بەوە دڵخۆش بوو کە بەهەند گیرابوو. پرسی کێ خاوەنی بیرۆکەی ئەم ڕاگەیەندراوەیە و کێ ناوی ئەمی پێشنیار کردووە.

(کا) لە وەڵامدا پێی گوت کە لەبەر ڕۆشنایی گفتوگۆکانی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسانی دیموکراتی ئەڵمانیدا، خۆی لێرە ئەم بڕیارەی داوە. تورگوت بەگ پرسیاری ئەوەی کرد کە داخۆ ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاو چەند دانەی لێ دەفرۆشرێ و ئایا هانز هانزن کەسێکی (مرۆدۆستە) یاخۆ نا. (کا) بۆ ئەوەی تورگوت بەگ بۆ شینە ساز بکات، وای تێ گەیاند کە شینە ئیسلامییەکی ترسناکە کە لە بەهای دیموکراسی حاڵی بووە، بەڵام بەرامبەرەکەی خۆی لەم باسە پاراست و گوتی پەنابردن بۆ ئاین یەکێکە لە ئاکامەکانی هەژاری، بە بیریشی هێنایەوە کە ئەگەرچی باوەڕی بە دۆزی کچەکەی و هاوڕێکانی نییە، بەڵام ڕێزی بۆیان هەیە. گوتیشی بەهەمان هەستەوە ڕێز لە لاوێکی کوردی نەتەوەپەرستیش -سا هەر کێ بێ- دەگرێ، ڕوونیشی کردەوە ئەگەر خۆی لاوێکی کورد بایە و لەم شارە بژیایە، ئەوا دەبوو بە کوردێکی نەتەوەپەرست. وا ڕەفتاری دەکرد وەکو ئەوەی لە یەکێک لەو ساتە پڕ لە جۆشانەیدا بێ کە تیایدا پشتیوانی لە ماریانا دەکات. بە خرۆشەوە گوتی: "شتێکی هەڵەیە ئەگەر ئەمە بە ئاشکرا بڵێم، بەڵام من دژی کودەتای سەربازیم." (کا) پێی گوت کە ئەم ڕاگەیەندراوە لە تورکیا بڵاو ناکرێتەوە، بەمە کەمێک ئارامی کردەوە. دواتر گوتی: "ئەم کۆبوونەوەیەش تەنیا دەکرێ لە ژوورێکی ئازووقەی نهۆمی هەرە سەرەوەی هوتێلی ئاسیا بێ ترس ببەسترێ. مرۆڤ دەتوانێ، بێ ئەوەی ببیندرێ، لە دەرگای پشتەوەی دوکانێکی ناو بازاڕە داخراوەکەدا بە حەوشەیەکدا بچێتە هوتێلەکەوە.

تورگوت بەگ لە وەڵامدا پێی گوت: "پێویستە نیشانی جیهان بدرێ کە مرۆڤی دیموکرات لە تورکیاش هەن." لەبەرئەوەی زنجیرەکە دەستی پێ کردەوە، بەپەلە ئەو



بۆچوونەی خۆی ڕاگەیاند. بەر لەوەی ماریانا لەسەر پەردەی تەلەفزیۆنەکە دەرکەوێ، سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و پرسی: "قەدیفە چی بەسەر هات؟"

(کا)یش وەکو باوک و کچەکە بە بێدەنگی سەیری ماریانای کرد.

ماریانا، ساتێک بە دەردی ئەڤینەوە شان بە شانی خۆشەویستەکەی بە پلیکانەیەکدا سەرکەوتنە سەرێ و کە دڵنیابوون کەس نایانبینێ، یەکدییان لە ئامێز گرت. یەکیان ڕانەمووسی، بەڵام شتێکی تریان کرد کە زۆر کاری لە (کا) کرد: بەتەواوی هێزی خۆیانەوە باوەشیان بە یەکدیدا کرد. لە بێدەنگییەکدا کە ماوەیەکی درێژی خایاند، (کا) حاڵی بوو کە هەموو قارس؛ ئەو پیاوانەی لە بازاڕەوە بۆ ماڵەوە ڕۆیشتوونەتەوە، خانمانی ماڵەوە و کچانی قوناغی خوێندنی ناوەندی و بەساڵاچووەکانیش سەیری ئەم زنجیرەیە دەکەن. هەروەها پێشبینیی کرد کە نەک تەنیا شەقامە غەمگینەکانی قارس، بگرە شەقامەکانی هەموو تورکیا بەهۆی سەیرکردنی ئەم زنجیرەیەوە چۆڵن و کەسیان بەسەرەوە نییە. هەروەها تێ گەیشت ئەو ژیانە وشک و برینگەی کە بەهۆی لە خۆباییبوونی ڕۆشنبیریی، دەرد و گرفتی سیاسی و خۆ بەتێگەیشتوو زانینی لە ژیانیدا، دوور لەو هەستانەی کە ئەم زنجیرەیە دەیانوروژێنێ، بەسەری دەبات، هەموو لە بوودەڵەیی خۆیەتی. دڵنیابوو لەوەیش کە شینە و قەدیفە پاش پێکەوە نووستن، ئێستا خۆیان خزاندووەتە گۆشەیەکەوە و بە ڕاکشانەوە باوەشیان بە یەکدا کردووە و بە خۆشەویستییەوە سەیری ماریانا دەکەن.

کاتێک ماریانا بە خۆشەویستەکەی گوت: "بەدرێژاییی ژیانم چاوەڕێی ئەم ڕۆژەم دەکرد"، (کا) هەستی کرد هەروا بەڕێکەوت نییە کە ئەم ڕستەیە لەگەڵ بۆچوونی ئەمدا یەک دەگرێتەوە. هەوڵی دا چاو ببڕێتە چاوی ئیپەک. خۆشەویستەکەی، سەری خستبووە سەر سنگی باوکی، چاوە گەورەکانی کە لە تاو غەم و ئەڤین هەڵاوسابوون، بڕیبووە پەردەی تەلەفزیۆنەکە، بە ئارەزووی خۆی، خۆی هاویشتبووە ناو ئەو (سۆزان)ەوە کە زنجیرەکە نیشانی دەدان.

خۆشەویستە ڕێکپۆش و ڕووخسار خاوێنەکەی ماریانا گوتی: "سەرباری ئەوەش زۆر نیگەرانم. بنەماڵەکەم دەستوور نادات ئێمە بەیەک بگەین."

ماریانای گەشبین گوتی: "ئەگەر یەکترمان خۆش بوێ، نابێ ڕووداوی ترسناک

بقەومێ."

تورگوت بەگ خۆی لە گفتوگۆکەیان هەڵقورتاند و گوتی: "کچی خۆم، دوژمنی ڕاستەقینەی تۆ، ئەو پیاوەیە."

ماریانا گوتی: "خوازیارم بێ ترس منت خۆش بوێ."

(کا) دوای هەوڵێکی شێلگیرانە بۆ بینینی ناو چاوانی ئیپەک، لە بینینی چاوانیدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا، بەڵام ژنەکە دەسبەجێ چاوی خۆی وەرگێڕا. لەگەڵ دەست پێکردنی ماوەی ڕێکلام لە تەلەفزیۆنەکەدا، ڕووی لە باوکی کرد و گوتی: "بابە گیان، بە ڕای من، چوونتان بۆ هوتێلی ئاسیا بێ مەترسی نییە."

تورگوت بەگ گوتی: "نیگەران مەبە."

"سالانێکی درێژە دووپاتی دەکەنەوە و دەڵێن کە هەر دەرچوونێکتان بۆ شەقامەکانی قارس، نەگبەتییەکی بەدواوە بووە."

تورگوت بەگ گوتی: "بەڵێ، بەڵام پێویستە نەچوونم بۆ ئەوێ لەبەر بنەمایەک بێ، نەک لە ترساندا." ڕووی کردەوە (کا): "پرسیار ئەوەیە: ئێستا من وەکو کەسێکی کۆمۆنیست، نوێخواز، لایسیست، دیموکرات و نیشتمانپەروەر، ئایا پێویستە سەرەتا باوەڕ بە ڕۆشنگەری بکەم یاخۆ بە ویستی میللەت؟ ئەگەر بێ سنوور باوەڕم بە ڕۆشنگەری و ڕۆژئاواییبوون هەبێ، پێویستە پشتیوانی لەم کودەتا سەربازییە بکەم کە دژ بە ئیسلامییەکان بەرپا کراوە. خۆ ئەگەر ویستی میللەت لە پێش هەموو شتێکی ترەوە بێ و منیش دیموکراتێکی سادە و بێ چەند و چۆن بم، ئەوا دەبێ بڕۆم واژۆی خۆم بخەمە سەر ئەو ڕاگەیەندراوە. ئێوە بڕواتان بە کامیان هەیە؟"

(کا) گوتی: "لایەنی زۆر لێکراوان بگرن و بڕۆن واژۆی خۆتان بخەنە سەر ئەو ڕاگەیەندراوە.

"هەر ئەوەندە بەس نییە مرۆڤ زۆر لێکراو بێ، پێویستە لەسەر مافیش بێ. زۆربەی زۆر لێکراوان تا ڕادەی تووڕەهاتی لەسەر ماف نین. بڕوا بە چی بێنین؟"

ئیپەک گوتی: "ئەو بڕوای بەهیچ نییە."



تورگوت بەگ گوتی: "هەرکەسە بڕوای بە شتێک هەیە. تکایە پێمان بڵێن بیر لە چی دەکەنەوە؟"

(کا) هەوڵی دا ڕوونی بکاتەوە کە ئەگەر تورگوت بەگ واژۆ بخاتە سەر ڕاگەیەندراوەکە، ئەوا دیموکراسی لە قارسدا کەمێکی تر گەشە دەکات. ئێستا بە شڵەژانەوە هەستی دەکرد کە نەهاتنی ئیپەک لەگەڵیدا بۆ فرانکفورت، ئەگەرێکی بەهێزە، ترسی ئەوەی هەبوو بە خوێنساردیی خۆی تورگوت بەگی پێ قایل نەکرێ و لە هوتێلەکە بۆی نەکرێتە دەرەوە. لە پای ئەوەی هەندێ شتی دەگوت بێ ئەوەی خۆی باوەڕی پێ هەبێ، لە ناخەوە هەستی بە ئازادییەکی سەرسوڕهێنەر کرد. لە بن لێوەوە باسی ڕاگەیەندراوەکە و هەندێک شتی تری زاندراوی لەکن لایەنگرانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ کرد، لە چاوی ئیپەکدا تیشکێکی بینی و ئەوەی تێدا خوێندەوە کە بڕوا بەهیچ کامێک لە قسەکانی ئەم ناکات. بەڵام ئەوە تیشکێکی شوورەییئامێز و ڕەوشتپارێزانە نەبوو؛ بگرە تەواو بە پێچەوانەوە، بارگراویکراو بە زایەند و گێچەڵ بوو کە دەیگوت: "دەزانم، هەموو ئەم درۆیانە لە پای ئەوە دەکەی کە منت دەوێ." بەمجۆرە (کا) دەسبەجێ لە میانەی بایەخی هەستیاریی میلۆدراماکەوە، گەیشتە ئەو بڕیارەی پەنجەی خستووەتە سەر ڕاستییەکی تر کە بەدرێژاییی ژیانی لێی تێ ناگات: ئەو پیاوانەی جگە لە ئەڤین بڕوا بەهیچ شتێکی تر ناکەن، زیاتر جێی سەرنجی ژنانن... بە خرۆشی ئەم زانیارییە نوێیەوە، وتەیەکی درێژی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ، ئازادیی بیر و ڕا دەربڕین، دیموکراسی و شتی لەو جۆرە پێشکەش کرد. چەند ڕستەیەکی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ گوتەوە کە ڕۆشنبیرە گێژەکانی ئەورووپا و لاساییکەرەوەکانیان لە تورکیا لێکداڵێکدا دووبارەی دەکەنەوە و چاوی بڕیە ئیپەک بەو خەیاڵەوە کە دەتوانێ لەگەڵیدا بنوێ.

تورگوت بەگ گوتی: "ڕاست دەکەن." بەدوای تەواوبوونی ڕێکلامەکاندا پرسی: "قەدیفە چی بەسەر هات؟"

تورگوت بەگ لەگەڵ دەست پێکردنەوەی فیلمەکەدا ئۆقرەی لێ بڕابوو، دڵی پێوە بوو بڕوا بۆ هوتێلی ئاسیا، بەڵام دەیشترسا. بە غەم و مەینەتیی پیاوێکی بەساڵاچوو و نقومبووی ناو خەیاڵ و بیرەوەری، بەدەم سەیرکردنی ماریاناوە، هێدی هێدی

سەبارەت بە بیرەوەرییەکانی تافی لاوی، ترسی زیندانیکردن و لێپرسراوێتیی مرۆڤ قسەی کرد. (کا) هەستی کرد، ئیپەک لە لایەک نەفرەتی لێ دەکات لەبەرئەوەی تورگوت بەگی خستووەتە ترسەوە، لەلایەکی دیش ستایشی دەکات، چونکە توانیوێتی قایلی بکات. گوێی بەوە نەدا کە ئیپەک هیچ سەیری ئەم ناکات. لەگەڵ تەواوبوونی زنجیرەکەدا باوەشی بە باوکیدا کرد و گوتی: "ئەگەر دڵتان پێوەی نییە، مەڕۆن. لە پێناوی کەسانی تردا بەشی خۆتان ئازارتان چەشتووە."

(کا) لە ڕووخساری ئیپەکدا تارماییەکی بەدی کرد، بەڵام سروشی شیعرێکی نوێ و کامەرانی بۆ هاتبوو. بەبێدەنگی لەسەر ئەو کورسییەی لای دەرگای ئاشپەزخانەوە کە پێش کەمێک زاهیدە خانم لەسەری دانیشتبوو و بەدیار زنجیرەکەوە فرمێسکی بۆ هەڵدەڕشت، دانیشت و بە گەشبینییەوە شیعرە تازەکەی نووسییەوە.

کاتێک (کا) شیعرەکەی بێ کێماسی نووسییەوە و زۆر دواتر، لەوانەیشە مەبەستی واتایەکی توێکڵدار بووبێ، ناوی (بەختەوەر دەبم)ی بۆ دانا. لەگەڵ تەواوبوونی شیعرەکەیدا، قەدیفە بێ ئەوەی ئەم ببینێ، بەپەلە خۆی کرد بە ژوورەوەدا. تورگوت بەگ بەرزەپێ لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی، لە ئامێزی گرت و ماچی کرد، لێی پرسی کە لە کوێ بووە و بۆچی دەستەکانی هێندە ساردن. دڵۆپێک فرمێسک لە چاوەکانی هاتبوونە خوارەوە. قەدیفە گوتی کە سەرێکی لە خەندە داوە، لەوێ کەمێک دوا کەوتووە، نەیویستووە ماریانا لە دەست بدات و تا کۆتایی لەوێ تەماشای کردووە. تورگوت بەگ گوتی: "کچەکەمان چۆنە؟" (مەبەستی ماریانا بوو)، بەڵام بێ ئەوەی گوێ بۆ وەڵامی قەدیفە ڕابگرێ، چووە سەر بابەتەکەی تر کە ئۆقرەی لەبەر بڕیبوو و هەموو جەستەی هێنابووە لەرزین و بەپەلە ئەو شتانەی گێڕایەوە کە لە (کا)ی بیستبوو.

قەدیفە وا خۆی نیشان نەدا وەکو ئەوەی یەکەمجاری بێت کە گوێی لەم مژارە دەبێ، کاتێکیش (کا)ی لەوسەری ژوورەکەدا بینی، وای نواند وەکو ئەوەی زۆری بەلاوە سەیر بێ کە (کا) لێرەیە. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ داپۆشینی سەری، گوتی: "خۆشحاڵ بووم بە بینینتان لێرە"، بەڵام بەر لەوەی سەری داپۆشێ، لە بەردەم تەلەفزیۆنەکە دانیشت و کەوتە ئامۆژگاریکردنی باوکی. سەرسوڕمان نواندنەکەی



قەدیفە هێندە لە ڕاستییەوە نزیک بوو، کاتێک هەوڵی دا باوکی بە ڕۆیشتن بۆ کۆبوونەوەکە و واژۆ خستنە سەر ڕاگەیەندراوەکە قایل بکات، (کا) بیری بۆ ئەوە چوو کە ئەم کچە لە بەردەم باوکیدا ڕۆڵ دەگێڕێ. بەو پێیەی کە شینەیش دەیویست ڕاگەیەندراوەکە بە شێوەیەک بێ کە لە دەرەوەی وڵات بڵاو بکرێتەوە، وێ دەچوو ئەو گومانە لە جێی خۆیدا بێ، بەڵام (کا) لەو ترسەدا کە لە ڕووخساری ئیپەکدا بەدیی کرد، هەستی کرد هۆیەکی تریش لە ئارادایە.

قەدیفە گوتی: "باوکە گیان، با منیش لەگەڵتاندا بێم بۆ هوتێل ئاسیا."

تورگوت بە ڕیتمێکی وەرگیراو لەو زنجیرانەی کە لە سەردەمانێکدا پێکەوە سەیریان کردووە و لەو ڕۆمانانەی کە پێکرا خوێندوویانەتەوە، گوتی: "بەهیچ جۆرێک نامەوێ بەهۆی منەوە بەڵا بەسەر خۆتدا بهێنی."

ئیپەک گوتی: "باوکە گیان، لەوانەیە دەس تێوەردانتان لەم کارە ببێتە هۆی خزانە ناو مەترسییەکی ناپێویست."

(کا) هەستی کرد کە ئیپەک لە میانەی قسەکردن لەگەڵ باوکیدا چەند شتێکی بە ئەمیش گوتووە، لە ڕاستیدا قسەکانی ئەویش وەکو قسەی هەموو ئەوانی تری ناو ژوورەکە، دوو واتای هەبوو، لابردنی ناوبەناوی نیگاکانی و جاربەجاریش چڕکردنەوەیان لەسەر ئەم، هەبوونی جووتواتایی قسەکانی تۆختر دەکردەوە. پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژ، بۆی دەرکەوتبوو کە -جگە لە نەجیب- هەموو کەسێک لە قارس لە خۆوە قسەی دووواتایی دەکەن، لە خۆی دەپرسی کە ئایا پێوەندی بە هەژاری، ترس و تەنیایی یاخۆ بە تێکشکانی ژیانەوە هەیە. کاتێک ئیپەک دەیگوت "باوکە گیان مەڕۆن"، (کا) هەستی دەکرد ئەمە گێچەڵە و بەمی دەکات، کاتێکیش قەدیفە باسی لە پەیوەستبوونی خۆی بە ڕاگەیەندراوەکە و بە باوکیەوە دەکرد، (کا) دەیزانی کە ئەم پێ داگرتنەی لە ڕووی پابەندبوونێتی بە شینەوە.

بەوجۆرە کەوتە لە شتێکدا چەقی کە سالانێک دواتر پێی دەگوت "قووڵترین گفتوگۆی دووواتایی لە ژیانمدا." بەهێزەوە هەستی بەوە کردبوو کە ئەگەر ئێستا تورگوت بەگی بۆ نەرم نەکرێ و لە هوتێلەکە نەیکاتە دەرێ، ئەوا هەرگیز ناتوانێ

لەگەڵ ئیپەکدا بنوێ، ئەمەی لە چاوەکانی ئیپەکیشدا کە مەیدانبازییان لەگەڵدا دەکرد، دەخوێندەوە، گەیشتە ئەو بڕیارەی ئەمە دوا هەلی ژیانێتی بۆ گەیشتن بە بەختەوەری. دەسبەجێ حاڵی بوو ئەو قسە و بیر و ڕایانەی کە بۆ قایلکردنی تورگوت بەگ بە خەرجی دەدان، هەمان ئەو بیر و بۆچوونانە بوون کە ڕێیان بۆ بە خۆڕایی بەسەرچوونی ژیانی ئەم خۆش کردبوو. ئەمەیش، لە ناخیدا ئارەزووی تۆڵە سەندنەوەی لە ئیدیالە چەپڕەوەکانی تافی لاوی کە ئێستا بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، خەریک بوو لە بیری دەکرد، وروژاند. لە ناخی خۆیدا هەستی بە ڕاستگۆییەکی چاوەڕواننەکراو کرد، کاتێک بەمەبەستی قایلکردنی تورگوت بەگ و دەرپەڕاندنی لە هوتێلەکە باسی لە کردنی کارێک لە پێناوی ئەوانی تردا، لە بەرپرسیارینواندن لە بەرانبەر هەژاریی وڵات و مەینەتییەکانی، ویستی شارستانیبوون و هەستی پشتیوانی لێکردن کرد. جۆش و خرۆشی چەپڕەویی تافی لاوی، سووربوونی لەسەر ئەوەی کە نەبێ بە سەرمایەدارێکی ئاسایی و بەربادی تورک و ئارەزووی ژیانی ناو کتێب و ئیدیاکاندا کەوتبووەوە بیری. بەوجۆرە، بە جۆشی لاوێکی بیست ساڵەوە کەوتە گێڕانەوەی دووپاتکردنەوەی بیر و باوەڕەکانی خۆی بۆ تورگوت بەگ، ئەو بیر و باوەڕانەی کە دایکی لە دژی دەوەستایەوە بۆ ئەوەی ڕێ لە بەشاعیربوونی کوڕەکەی بگرێ و لەمەیشدا لەسەر ماف بوو، ئەو بیر و باوەڕانەی کە هەموو ژیانی بە با دا و لە ئاکامدا دووری خستەوە بۆ کونە مشکێک لە تاراوگەی فرانکفۆرت. لەلایەکی تریش، هەستی دەکرد کە زبریی وشەکانی بۆ ئیپەک واتای "دەمەوێ بەهەمان زبری لەگەڵتدا بنووم" دەنوێنێ. بیری بۆ ئەوە چوو ئەو زاراوە چەپانە کە هەموو ژیانی خۆی لە پێناویاندا بەخت کرد، لە ئاکامدا بە کەڵکی شتێک دێن و دەتوانێ لە سایەیاندا لەگەڵ ئیپەکدا بنوێ؛ تەواو لە زەمانێکیشدا کە چیدی بڕوا بەو دەستەواژانە ناکات، بەڵکو ئەوەی هاتە بەرچاو کە گەورەترین بەختەوەری لە ژیاندا ئەوەیە بتوانێ کچێکی جوان و ژیر لە ئامێز بگرێ و لە گۆشەیەکدا شیعر بنووسێ.

تورگوت بەگ گوتی کە "هەر ئێستا" بۆ کۆبوونەوەکەی هوتێل ئاسیا دەڕوات. بۆ خۆئامادەکردن و خۆگۆڕین لەگەڵ قەدیفەدا چووە ژوورەکەی خۆی.



(کا) خۆی لە ئیپەک نزیک خستەوە، هەر لەو گۆشەیە دانیشتبوو کە پێش کەمێک لەگەڵ باوکیدا سەیری تەلەفزیۆنی لێوە دەکرد. هێشتا وا دانیشتبوو وەکو ئەوەی کە پاڵی بە باوکیەوە دابێ. (کا) بە چرپە پێی گوت: (لە ژوورەکەم چاوەڕێت دەکەم."

ئیپەک گوتی: "منت خۆش دەوێ؟"

"زۆرم خۆش دەوێی."

"ئایا ئەمە ڕاستییە؟"

"زۆر ڕاستە."

ماوەیەک بێ دەنگ بوون. (کا) سەرنجی لە نیگای ئیپەک دا و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. بەفر دەستی بەبارین کردبووەوە. گڵۆپی کوچەی بەرانبەر هوتێلەکە داگیرسابوو، سەرباری ئەوەی کلووە بەفرە گەورەکانی ڕووناک دەکردەوە، لەبەرئەوەی بەتەواوی تاریک دانەهاتبوو، وەکو ئەوە وا بوو کە لە خۆڕایی داگیرسێندرابێ.

ئیپەک گوتی: "تۆ بڕۆ بۆ ژوورەکەت. دوای ڕۆیشتنی ئەوان، من دێم بۆ لات."

## ۲۸

# ئەو شتەی کە ئازاری چاوەڕوانی لە ئەڤین جیا دەکاتەوە

## (کا) و ئیپەک لە ژووری هوتێلەکەدا

بەڵام ئیپەک دەسبەجێ نەهات. ئەمەش بوو بە یەکێک لە ئەشکەنجە هەرە گەورەکانی ژیانی (کا). بیری کەوتەوە لە ترسی ئەم ئازارەماڵوێرانکەرەی چاوەڕوانی، هەمیشە لە عاشقبوون ترساوە. لەگەڵ گەیشتنیدا بۆ ژوورەکەی، سەرەتا خۆی فرێ دایە سەر چرپاکە، لە پڕ هەستایەوە، دەستێکی بە جلوبەرگەکانیدا هێنایەوە، دەستەکانی شۆری، هەستی کرد خوێنی قۆڵەکانی و قەراغ لێوەکانی دەکێشرێ، بە دەستە لەرزۆکەکانی قژی داهێنا، سەیری شێوەی خۆی لە جامی پەنجەرەکەدا کرد و بە دەست شێواندی، دواتر هەستی کرد هەموو ئەمانە چەند ساتێکی زۆر کورتی خایاندووە و بە سەرسوڕمانەوە لە پەنجەرەکەوە چاوی بڕیە دەرەوە.

پێش هەموو شتێک، دەبوو لە پەنجەرەکەوە ڕۆیشتنی تورگوت بەگ و قەدیفەی بدیبا، لەوانەیشە لەو کاتەدا ڕۆیشتبن کە (کا) لە ژووری سەرشۆرکەدا بووە. بەڵام خۆ ئەگەر لەو کاتەیشدا دەرچووبن، دەبوو تا ئێستا ئیپەک هەر بهاتایە. لەوانەیشە ئێستا ئیپەک لە ژوورەکەی خۆیدا کە ئەم دوێنێ شەو بینیبووی، بۆن و بەرامە لە خۆی بدات و هێدی هێدی خۆی بخەملێنێ. بڕیارێکی چەند هەڵەیە ئەو کاتانەی کە دەبێ پێکەوە بەسەری بەرن، لەم شتانەدا بە فیڕۆ بدرێن! مەگەر ئیپەک نەیدەزانی کە (کا) ئەوی چەند خۆش دەوێ؟ هیچ شتێک پاساوی ئازاری خۆ لەبەر ڕانەگیراوی وەکو ئازاری چاوەڕوانیی ئەم ساتەی نەدەدایەوە؛ ئیپەک بهاتبا، ئەمەی پێ دەگوت، بەڵام جا دێ؟ لە هەموو ساتێک زیاتر بڕوای وابوو کە ئیپەک لە دوا چرکەدا بیری گۆڕیوە و نایات.

عەرەبانەیەکی دوای ئەسپ لە هوتێلەکە نزیک کەوتەوە، تورگوت بەگ شانی دابوو بەسەر قەدیفەدا و بە هاوکاریی زاهیدە خانم و جاویدی کارمەندی پرسگەی



هوتێلەکە، سواری عەرەبانەکە کرا. چاوی پێوە بوو خێوەتی قەراغ عەرەبانەکە دادرانەوە، بەڵام عەرەبانەکە لە جێی خۆی نەبزووت. کلووە بەفرەکانیش کە لەبەر ڕۆشناییی گڵۆپی کوچەکەدا زۆر لە قەوارەی خۆیان گەورەتر دەیانواند، لەبەرەوە بەسەر عەرەبانەکەدا کەڵەکە دەبوون. (کا) پێی وابوو کاتیش لە جێی خۆیدا ڕاوەستاوە، وای زانی شێت دەبێ. دواتر زاهیدە خێرا ڕای کرد و شتێکی بۆ ناو عەرەبانەکە درێژ کرد کە (کا) نەیبینی. لەگەڵ بەڕێکەوتنی عەرەبانەکەدا، دڵی (کا) دەستی بە ترپە کرد.

بەڵام هەمدیسان ئیپەک نەهات.

گەلۆ ئەو شتە چییە کە ئازاری چاوەڕوانی لە ئەڤین جیا دەکاتەوە؟ کوتومت وەکو ئازاری عەشق، ئازاری چاوەڕوانیش لە شوێنێکی نێوان ماسولکەکانی بەشی سەرەوەی گەدەیەوە دەست پێ دەکات، لەوێوە سنگ و بەشی سەرەوەی ڕانەکانی و ناوچەوانی دەتەنێتەوە و هەموو جەستەی گۆج دەکات. هەوڵی دا لە میانەی گوێگرتن لە تەق و هوڕی ناو هوتێلەکەوە تێ بگات کە ئیپەک لەم ساتەدا چی دەکات. ژنێک کە بە کۆڵانەکەدا تێ پەڕی و هیچ بەو نەدەچوو، وایزانی ئیپەکە. ئای کە بەفر چەند بەجوانی دەباری! ئای ساتێک لە بیرچوونەوە چەند جوان دەبوو! کاتێک لە سەردەمی منداڵیشیدا بۆ دەرزی لێدان دەیانبردە هۆڵی نانخواردنی قوتابخانە و قۆڵی هەڵدەماڵی و لە ناو بۆنی بۆیاخی یۆد و داخکردندا ڕیزی دەبەست، بەهەمان شێوە سکی دەیدا لە ژان و مەرگی بە ئارەزوو دەخواست. دەیویست لە ژوورەکەی خۆیدا بێت لە ماڵەوە، خۆزگەی دەخواست لە ژوورە بەربادەکەی خۆی بێت لە فرانکفورت. هەڵەیەکی چەند گەورەی کردبوو بە هاتنی بۆ ئێرە! ئێستا تەنانەت شیعریشی بۆ نەدەهات، بگرە لە تاو ئازار سەیری بەفربارینی کوچە چۆڵەکەیشی بۆ نەدەکرا. سەرباری ئەوەیش، ڕاوەستان لە بەردەم پەنجەرە گەرمەکەدا، لە کاتێکدا لە دەرەوە بەفر دەباری، تام و چێژی تایبەتی خۆی هەبوو؛ ئەم دۆخە لە مردن باشتر بوو، چونکە ئەگەر ئیپەک نەیات، ئەوا لەوانەبوو ئەم بمرێ.

کارەبا بڕا.

ئەمەی بە ئاماژەیەک دانا کە ئاراستەی خۆی کرابێ. لەوانەیە ئیپەک بە بڕانی

کارەبای زانیبێ، بۆیە نەهاتووە. چاوەکانی لە کوچە تاریکە بە بەفر داپۆشراوەکەدا بەدوای شتێکدا دەگەڕا تا خۆی پێوە خەریک بکات، شتێک کە هۆی تا ئێستا نەهاتنی ئیپەکی بۆ ڕوون بکاتەوە. ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری بینی لەوێدا، ئایا بارهەڵگرێکی سەربازییە؟ نەخێر، خۆ لە خشتەبردن بوو، ئەو دەنگانەیش کە ئێستا لەسەر پلیکانەکان دەیبیست، بەهەمان شێوە بوون، چوون کەس نەدەهات. لە بەردەم پەنجەرەکە دوورکەوتەوە و بە پشتدا خۆی هاویشتە سەر جێگاکەی، ژانە سکەکەی وەرگەڕایە سەر ئازارێکی توند و قووڵ و سەر بێچارەییەکی بارگاویکراو بە پەشیمانی. وای بە خەیاڵدا هات کە هەموو ژیانی بەبا چووە و لێرە بەدەست بەدبەختی و تەنیاییەوە سەر دەنێتەوە. هێزی ئەوەیشی لە خۆیدا شک نەدەبرد جارێکی تر خۆی بکاتەوە بە کونە مشکەکەیدا لە فرانکفۆرت. ئازاری دەروون و ماڵوێرانییەکەی لە تاو بەدبەختی نەبوو، بەڵکو لەبەر تێگەیشتنی بوو لەوەی کە ئەگەر کەمێک هۆشمەندانەتر هەڵسوکەوتی بکردایە، ئەوا دەیتوانی ژیانێکی بەختەوەرانەتر بەسەر ببات. لە هەمووی سامناکتر ئەوە بوو کە هیچ کەس پەی بە بەدبەختی و تەنیاییەکەی نەدەبرد. ئەگەر ئیپەک پەی بردبێ، ئەوا دەسبەجێ و بێ چاوەڕێکردن دەهاتە سەرێ بۆ لای! ئەگەر دایکی بەم حاڵەوەی بیدیبا، ئەوا تەنیا ئەو بە داخ دەبوو بۆی و بەدەم دەستهێنان بە قژیدا، دڵنەوایی دەدایەوە. لە پەنجەرەکانەوە کە قەراغەکانیان شەختەیان بەستبوو، تیشکە کزەکانی قارس و ڕەنگی نارنجی ناو ماڵەکان دەهاتنە بەرچاو. ئەگەر بەدەست ئەو بوایە، ئارەزووی دەکرد بەفر، بە ڕۆژان و بە مانگان بەم خێراییە هەر باریبا، شاری قارسی بەجۆرێک داپۆشیبا کە هیچ کەسێک جارێکی تر بۆی نەدۆزرایەتەوە، خۆیشی لەسەر ئەم جێیە ڕاکشابا و خەوی لێ کەوتبا و دەمەوبەیانییەکی خۆرەتاو، لە منداڵی خۆیدا لەگەڵ دایکیدا لە خەو هەستابا.

لە دەرگا درا. (کا) وای بۆچوو یەکێک بێت لە کارمەندانی ئاشپەزخانەکە. گوڕی دایە خۆی، هەستایە سەرپێ و دەرگاکەی کردەوە. لە تاریکییەکەدا هەستی بە هەبوونی ئیپەک کرد.

"چیت لێ هات؟"



"دوا کەوتم؟"

بەڵام وێ دەچوو (کا) گوێی لەو نەبووبێ. دەسبەجێ و بەهەموو هێزی خۆیەوە باوەشی پێدا کرد؛ سەری خستە نێوان مل و قژییەوە؛ لەوێدا بێ جووڵە ڕاوەستا. هێندە خۆی بە بەختەوەر دەزانی، بەجۆرێک پێکەنینی بە ئازاری چاوەڕوانییدا دەهات. بەڵام چاوەڕوانیکردنەکە شەکەتی کردبوو و هەر لەو سۆنگەیەشەوە وەکو پێویست جۆش و خرۆشی نەبوو. بۆیە، سەرباری ئەوەی سووریش دەیزانی کە هەڵەیە، لۆمەی درەنگ هاتنەکەی ئیپەکی کرد و گازندەی دەربڕی. بەڵام ئیپەک گوتی کە یەکسەر دوای ڕۆیشتنی باوکی، ئەم هاتووەتە سەرەوە: ها، بەڵێ، چووبووە ئاشپەزخانەکە و یەک دوو شتی بە زاهیدە گوتبوو بۆ ئێوارە، بەڵام ئەمە لە خولەکێک زیاتری نەخایاندبوو؛ بۆیە هیچ بیری بۆ ئەوە نەچووبوو (کا) لە چاوەڕوانی ئەمدایە. بەمجۆرە (کا) هەستی کرد وای نیشانداوە کە ئەم هەر لە سەرەتای پێوەندییەکەیاندا هەوەسساویتر و هەستیارترە و لە هاوکێشەی هێزدا لە ژێرەوەیە. لە ترسی ئەم بێهێزییەی، ئەو ئازاری چاوەڕوانییەی کە چەشتبووی، شاردەوە. ئەمەیش وای کرد (کا) کەمێک هەست بە بێدەربەستی بکات. ئەدی باشە نەیدەویست عاشق بێت بۆ ئەوەی هەموو شتێک لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دابەش بکات؟ مەگەر ئەڤین ویستی گوتنی هەموو شتێک نییە؟ لە پڕ و بە خرۆشی دان پیدانانەوە زنجیرەی هەموو ئەم هزرانەی بۆ ئیپەک گێڕایەوە.

ئیپەک گوتی: "ئێستا هەموو ئەمانە لە بیر خۆت ببەرەوە. هاتووم بۆ ئێرە بۆ ئەوەی لەگەڵتدا بنووم."

یەکیان ڕامووسی و بە خاوبوونێکەوە کە (کا) زۆری بە دڵ بوو، خۆیان هاویشتە سەر جێیەکە. ئەمە ساتێکی ناوازە بوو بۆ (کا)یەک کە چوار ساڵ بوو لەگەڵ هیچ ژنێکدا نەچووبووە جێوە. لەو سۆنگەیەوە، زۆر بایەخی بە چێژی جەستەیی ئەو بەیەکگەیشتنە نەدا، بەڵکو سەری پڕ بوو لە بیرۆکەی تایبەت بە جوانی و خۆشیی ئەو ساتە. وەکو ئەزموونەکانی ناو جێگای لە ساڵانی تافی لاویدا، لە خەیاڵی خۆیدا، لە سێکس زیاتر، بیری لەوە دەکردەوە کە خۆی سێکس دەکات. ئەم بیرکردنەوەیە، لە دەسپێکدا (کا)ی لە هەڵچوون و خرۆشی بێ سنوور پاراست. هەمان کات، دیمەنی

چەند فیلمێکی ڕووت کە ئەم لە فرانکفورت یەکێک بوو لە ئالوودەبووانی، بە لۆژیکێکی شاعیرانە کە ئەم هێشتا نهێنییەکانی بۆ ئاشکرا نەکرابوو، بەخێرایی بە بەرچاویدا تێ پەڕین. ئەمەی بۆ لەبەرئەوە نەبوو بەدەم سێکسەوە بیر لە دیمەنی فیلمە ڕووتەکان بکاتەوە بۆ ئەوەی باشتر زەوقی هەڵبسێ؛ بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، وەکو بیەوێ لە ئاکامدا ئەگەری بوون بە بەشێک لە دیمەنی فیلمە ڕووتەکان کە هەمیشە بە پاراوی لە خەیاڵیدا بوو، پیرۆز بکات، هەستی دەکرد ئەو جۆش و خرۆشەی سەرتاپای جەستەی داگرتبووە، ئاراستەی ژنێکی ناو فیلمە ڕووتەکان و پەرجووی هاتنە سەر جێی ئەو ژنەی کردووە نەک ئاراستەی ئیپەک. تا بەشێوەیەکی هۆڤانە و گەوجانە نەکەوتە داکەندنی جلوبەرگەکانی و ڕووتکردنەوەی، ئیپەک هەستی پێ نەکرد. مەمکەکانی گەورە بوون، پێستی لامل و ناوشانی زۆر نەرم بوو، بۆنی شتێکی نایاب و نامۆی لێ دەهات. لەبەر ڕۆشنایی بەفرەکەدا کە لە دەرەوە دەهاتە ژوورێ، (کا) سەیرێکی کرد و لە چاوە گەشاوەکانی ترسا کە لەپڕێکدا درەوشانەوە. چاوەکانی زۆر لە خۆیان دڵنیابوون؛ (کا) ترسی ئەوەی هەبوو بزانێ ئیپەک وەکو پێویست هەستیار نییە، بۆیە قژی ڕاکێشا و ئازاری پێ گەیاند، بەمە زیاتر زەوقی هەستا و ئیپەکی کەللەڕەقانەتر بەرەو لای خۆی ڕاکێشا، زۆری لێ کرد لاسایی دیمەنی فیلمە ڕووتەکانی ناو خەیاڵی ئەم بکاتەوە و بە موزیکی غەریزەیەکی چاوەڕواننەکراوەوە، بەتوندی هەڵسوکەوتی لە تەکدا کرد. کاتێک هەستی کرد ئەویش ئەمەی پێ خۆشە، ختووکەی سەرکەوتنی هەناوی وەرگەڕایە سەرجۆرێک لە هەستی خوشک و برایانە. وەکو ئەوەی نەوەک بەتەنیا خۆی، بگرە بیەوێ ئیپەکیش لە بەلەنگازیی شاری قارس بپارێزی، بەهەموو هێز و تینی خۆی باوەشی پێدا کرد، بەڵام کاتێک وەکو پێویست هەستی بە کاردانەوە نەکرد، خۆی کێشایە دواوە و لێی دوورکەوتەوە. لەو کاتەدا بە بەشێکی هۆشی، هارمۆنی و ڕەوتی ئاکرۆباتیکی سێکسی بە پێوانەیەکی هیچ نەگونجاو لەگەڵ خۆیدا تاقی دەکردەوە. بەوجۆرە، دوای خۆ دوورخستنەوە لە ئیپەک لە ساتێکی هۆشمەندیدا، جارێکی تر بە گوڕەوە لە ژنەکە نزیک کەوتەوە و ویستی ئازاری پێ بگەیەنێ. بەپێی چەند تێبینییەک سەبارەت بەم پێکەوەنووستنە کە (کا) تۆماری کردوون و منیش پێم وایە دەبێ بە خوێنەرانمی



بگەیەنم، لەوە بەدواوە بە گوڕ و بە تینێکی زۆرەوە لە یەک نزیک کەوتوونەتەوە و ئاگایان لە پاشماوەی جیهان نەماوە. هەمدیسان بە گوێرەی تێبینییەکانی (کا)، ماوەیەکی کورت بەر لە تەواوبوونیان، ئیپەک بە دەنگێکی نزم ناڵاندوویەتی، (کا)یش بەو بەشەی هۆشی کە زۆر بە باشی دەرگای بە ڕووی گومان و ترسدا خستووەتە سەر پشت، وای بۆچووە لەبەر ئەمە بووە هەر لە سەرەتاوە ئەم ژوورەی گۆشەیەکی ئەوپەڕی هوتێلەکەیان بەم داوە. بە سۆزێکی تێکەڵ لەگەڵ هەستی تەنیاییشدا پەی بەوە برد کە هەردووکیان زەوقیان لە ئازاردانی یەکتر چەشتووە. ئەم ڕێڕەوە دوورەی هوتێلەکە و ژوورەکەی، لە خەیاڵی (کا)دا لە هوتێلەکە دابڕێندرابوون و لە کوچەیەکی قەراغ شاری قارس بەجێ کرابوون. لەو شارە چۆڵەشدا کە کپیی دوای قیامەتی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ، بەفر دەباری.

ماوەیەکی درێژ پێکەوە لە جێگاکەدا ڕاکشان و بێ ئەوەی یەک وشە بدرکێنن، سەیری بەفر بارینەکەی دەرەوەیان کرد. (کا) جاروبار بەفری باریوی لە چاوانی ئیپەکیشدا دەبینی.

# ٢٩

## کێماسیی من

### لە فرانکفورت

دوای چوار ساڵ گەڕانەوەی لە قارس و پاش چل و دوو ڕۆژ لە مردنی (کا)، لە فرانکفورت سەرم لەو خانووە بچووکە دا کە (کا) هەشت ساڵی دوایی ژیانی خۆی تێدا بەسەر بردبوو. ڕۆژێکی بەفراوی، باراناوی و تۆفی مانگی شوبات بوو. سەرلەبەیانی بە فڕۆکە لە ئەستەمبوڵەوە گەیشتمە فرانکفورت، شارەکە بێتامتر بوو لە دیمەنی سەر ئەو پۆستکارتانەی کە (کا) بەر لە شازدە ساڵ بۆی ناردبووم. جگە لە ئۆتۆمبیلە ڕەنگ تاریک و تیژ تێپەڕەکان، ترامڤاکان کە وەکو تارمایی دەردەکەتن و ون دەبوون، ژنانی ماڵەوە کە چەتر بە دەست و خێرا ڕێیان دەکرد، شەقامەکان چۆڵ و هۆڵ بوون. کەش هێندە داخراو و تاریک بوو، بەجۆرێک تیشکی زەرد و مردووی گڵۆپی سەر شەقامەکان لە کاتی نیوەڕۆیشدا داگیرسێندرابوون.

لەسەر شۆستەکانی دەوروبەری وێستگای سەرەکی شەمەنەفەر کە چەندین دوکانی دۆنەر، نووسینگەی گەشتوگوزار، بەستەنی و دوکانی سێکسی بەسەرەوە بوو، هەستم بە هەبوونی شوێنەواری ئەو وزە نەمرە کرد کە شارە گەورەکان لەسەر پێ ڕادەگرێ و ئەمەیش، سەرباری هەموو شتێک، زۆر دڵخۆشی کردم. لە هوتێل خۆم دامەزراند، بە تەلەفۆن لەگەڵ لاوێکی تورک–ئەڵمانی ئەدەبدۆستدا کە لەسەر داوای خۆم منی بۆ پێشکەشکردنی وتارێک لە یانەی ماڵی گەل بانگهێشتن کرد، قسەم کرد، دواتر لە قاوەخانەیەکی ئیتاڵی لە ناو وێستگای سەرەکیدا چاوم بە تارکوت ئۆێلچوین کەوت. ژمارەی تەلەفۆنەکەیم لە خوشکی (کا) لە ئەستەمبوڵ وەرگرتبوو. ئەم پیاوە نیازپاک و ماندووە کە تەمەنی شەست ساڵێک دەبوو، نزیکترین کەس بوو لە (کا)وە لە ساڵانی فرانکفورتیدا. لە لێکۆڵینەوەی دوای مردنی (کا)دا زانیاری بە پۆلیس دابوو، تەلەفۆنی بۆ ئەستەمبوڵ کردبوو، پێوەندیی بە کەسوکاریەوە کردبوو و



لە ناردنەوەی تەرمەکەیدا بۆ ئەستەمبوڵ هاوکاریی کردبوو. ڕەشنووسی دیوانی شیعرەکانی (کا) کە خۆی پێی گوتبووم دوای چوار ساڵ گەڕانەوەی لە قارس ئەوسا بۆی تەواو کراوە، من لەو ڕۆژانەدا پێم وابوو لە ناو شتومەکەکانیدا بێ لە ئەڵمانیا. لە باوکی و لە خوشکیم دەپرسی گەلۆ (کا) چی لە پاش) بەجێ ماوە. ئەوان لەبەرئەوەی لەو کاتەدا هێزی گەشتیان بۆ ئەڵمانیا نەبوو، تکایان لە من کرد کەلوپەلەکانی کۆ بکەمەوە و خانووەکەی چۆڵ بکەم.

تارکوت ئۆێلچوین یەکێک بوو لەو کۆچبەرانەی لە سەرەتای شەستەکاندا لە فرانکفورت گیرسابووەوە. چەندین ساڵ لە کۆمەڵە تورکییەکان و لە ڕێکخراوە خێرخوازەکاندا مامۆستایی و ڕاوێژکاریی کردبوو. دوو منداڵی هەبوو، کچێک و کوڕێک کە لە ئەڵمانیا لە دایک بووبوون، دەسبەجێ وێنەکانی دەرهێنان و نیشانی منی دا، شانازیشی کرد کە توانیوێتی هەردووکیان بگەیەنێتە زانکۆ. بۆ خۆیشی پایەیەکی جێگای ڕێزی لە ناو تورکەکانی فرانکفورتدا هەبوو، بەڵام لە ڕووخساری ئەویشدا هەمان ئەو هەستی تەنیایی و تێکشانە بێوێنەیەی ژیانم بەدی کرد کە لە سیمای تورکەکانی نەوەی یەکەمی کۆچبەران و دوورخراوە سیاسییەکاندا دەبینرا.

تارکوت ئۆێلچوین سەرەتا جانتایەکی بچووکی گەشتوگوزاریی نیشان دام کە (کا) لە کاتی هێرشدا بۆ سەری، پێی بووە. جانتاکەی لە بەرانبەر واژۆکردندا لە پۆلیس وەرگرتبووەوە. دەسبەجێ کردمەوە و کەوتمە پشکنینی. دەستێک چاکەت و بیجامەی خەو کە (کا) هەژدە ساڵ لەمەوبەر لە ئەستەمبوڵەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، کراسێکی سەوز، تاقمی تەراش و فڵچەی ددان، جووتێک گۆرەوی و جلوبەرگی پاکی ژێرەوە و ئەو گۆڤارە ئەدەبییانەم تێدا بینییەوە کە من لە ئەستەمبوڵەوە بۆم ناردبوو، بەڵام دەفتەرە سەوزەکەی شیعری تێدا نەبوو.

دواتر، کاتێک بەدەم سەیرکردنی دوو تورکی بەساڵاچووەوە کە لە پێشەوە لە ناو ئاپۆڕەی وێستگاکەدا بەدەم قسەکردن و پێکەنینەوە زەوییەکەیان دەسڕیەوە، پێی گوتم: "ئۆرهان بەگ، (کا) بەگی هاوڕێتان پیاوێکی تەنیا بوو. کەس لە فرانکفورتدا، بەمنیشەوە، نەیدەزانی چی دەکات." سەرباری ئەوەیش بەڵێنی دامێ کە هەرچی لە بارەی (کا)وە دەیزانێ، بۆمی بگێڕێتەوە.

سەرەتا بەناو باڵەخانە سەد ساڵ کۆنەکانی کارگە و کەونە قشڵەکانی سەربازیی پشت وێستگاکەدا تێ پەڕین و چووین بۆ خانووەکەی (کا) لە نزیک شەقامی گوتلۆیت کە (کا) هەشت ساڵی دوایی ژیانی تێدا بەسەر بردبوو. باڵەخانەکە کە بەسەر مەیدانێکی بچووک و باخچەیەکی منداڵاندا دەیڕوانی، خاوەنەکەیمان نەدۆزییەوە تاکو دەروازەی باڵەخانەکە و دەرگای خانووەکەی (کا)مان بۆ بکاتەوە. لە کاتێکدا لە ژێر بەفر و باراندا لە چاوەڕوانی دەرگا کۆن و بۆیاغ سوواوەکەی باڵەخانەکەدا ڕاوەستابووین، وەکو ئەوەی بەشێک بن لە بیرەوەرییەکانی خۆم، چاوم بڕیە ئەو شوێنانەی (کا) لە نامەکانیدا و لە پێوەندییە تەلەفۆنییە دەگمەنەکانیدا (لەبەرئەوەی (کا) بە ترس و گومانەوە بیری لەوە دەکردەوە کە گوێ لە قسەکانی دەگیرێ، حەزی نەدەکرد تەلەفۆن بۆ تورکیا بکات) بۆی باس دەکردم؛ باخچەیەکی بچووک و فەرامۆشکراوی شوێنی گەمەی منداڵان، دوکانی بەقاڵیی گۆشەی کوچەکە و جامخانەی تاریکی دوکانێکی پێشەوەتری جگەرە و ئەلکهولفرۆش. تەختە کورسییەکانی تەنیشت جۆلانێ و تەختەخلیسکێی ناو باخچەکە کە (کا) ئێوارانی هاوین لەگەڵ کرێکارانی ئیتاڵی و یۆگسلافیایی بیرەی لە سەریان دەخواردەوە، ئێستا بە ئەستوورایی پەنجەیەک بەفریان لەسەر بارییەوە.

بەو ڕێگایەدا کە (کا) هەموو بەیانییەکی ئەم ساڵانەی دوایی بۆ ڕۆیشتن بۆ کتێبخانەی شارەوانی دەیگرتە بەر، چووینە مەیدانی وێستگا. هەر وەکو (کا) کە حەزی دەکرد بەناو ئاپۆڕەی ئەو خەڵکانەدا ڕێ بکات کە بەپەلە بۆ سەر کارەکانیان دەچوون، لە دەرگایەکی وێستگاکەوە چووینە ژوورەوە و خۆمان کرد بە بازاڕی نهۆمی خوارەوەدا. لە شەقامی کایزەر بە بەردەم دوکانەکانی سێکس، فرۆشیارانی شتومەکی گەشتوگوزاری، شیرینیخانە و دەرمانخانەکاندا تێ پەڕین و تا مەیدانی هاوپتڤاخە نەوەستاینەوە. تارکوت ئۆیلچوین سڵاوی لە چەند تورک و کوردێک کرد کە لێرە و لەوێ لە دوکانی دۆنەر، کەبابخانە و بەقاڵییەکاندا کاریان دەکرد و گوتی کاتێک (کا) بەیانیان لە هەمان سەعاتی دیاریکراودا لێرەوە بۆ کتێبخانەی شارەوانی دەچوو، ئەم کەسانە سڵاویان لێ دەکرد و دەیانگوت: "ڕۆژباش پرۆفیسۆر." لەبەرئەوەی پێشتر پرسیاری شوێنەکەیم کردبوو، بە ئاماژەی دەست لە قەراغی



مەیدانەکە مەغازەیەکی گەورەی نیشان دام: کاوفهۆف. پێم گوت ئەو پاڵتۆیەی (کا) لە قارس لەبەری دەکرد، لێرە کڕیبووی، بەڵام پێشنیازەکەیم بۆ چوونە ژوورەوەی بازاڕی کاوفهۆف ڕەت کردەوە.

کتێبخانەی شارەوانیی فرانکفورت کە (کا) هەموو بەیانییەک ڕووی تێ دەکرد، باڵەخانەیەکی هاوچەرخی بێ ناسنامەی هەبوو. لە ژوورەوە ژمارەیەک میوانی تایبەت بەمجۆرە کتێبخانانە بەدی دەکرا؛ ژنانی ماڵەوە، پیاوانی بەساڵاچووی کاتکوژ، بێکاران، یەک دوو عەرەب و تورک، کۆمەڵێک قوتابی کە بەدەم پێکەنین و هات و هاوارەوە ئەرکی ماڵەوەیان دەنووسییەوە. چەند کەسێک لە دەوامکارانی ئاساییی ئەم شوێنانەیشم بینی؛ کەسانی زۆر قەڵەو، کەمئەندامان، شێت و کەسانی بە دەروون نەخۆش. لاوێک لەوانە کە لیک لە دەمی دەڕژا، سەری لەسەر کتێبە وێنەدارەکەی بەردەمی بەرزکردەوە و زمانی لێ دەرهێنام. چاوساغەکەم کە لە ناو کتێبەکاندا هەستی بە بێزاری دەکرد، لە قاوەخانەیەکی خوارەوە دام نیشاند. ڕووم لە ڕەفەی کتێبی ئینگلیزی کرد و لە پسووڵەی کتێب وەرگرتنی بەرگی دواوەی کتێبەکاندا بەدوای ناوی هاوڕێکەمدا گەڕام: ئاودن، برۆڤنینگ، کۆلەردیگ... هەر کاتێکیش نیگام دەکەوتە سەر واژۆی (کا)، چاوم پڕ دەبوو لە فرمێسک بۆ هاوڕێکەم کە ژیانی خۆی لەم کتێبخانەیەدا بەسەر بردبوو.

ئەم لێکۆڵینەوەیەم کە منی زۆر غەمگین کرد، لە کورتی بڕاندەوە. لە تەک دۆستە چاوساغەکەمدا بەبێدەنگی بەهەمان ئەو شەقامانەدا گەڕاینەوە کە پیایاندا هاتبووین. لە ناوەڕاستی شەقامی کایزەردا و بە پێش دوکانێکدا بەناوی (مەڵبەندی سێکسی جیهانی) کە ناوێکی بێ واتا بوو، بەلای چەپدا سووڕاینەوە و کوچەیەک خوارتر چووینە سەر شەقامی موینشنەر. لەوێدا دوکانی بەقاڵی و کەبابخانە و سەرتاشخانەیەکی چۆڵی تورکم بینی. زۆر لەمێژ بوو لەوە حاڵی بووبووم لێرە چیم نیشان دەدرێ. لێدانی دڵم زیادی کرد، چاوم بڕیە پرتەقاڵ و بەستە پیازەکانی دوکانی بەقاڵێک، سواڵکەرێکی یەک قاچ، شکانەوەی تیشکی لایتی ئۆتۆمبیلەکان لە جامخانە تاریکەکەی پێشەوەی هوتێل "ئەدەن"دا و پیتێکی (ک)ی دروستکراو لە گڵۆپی نیۆنی پەمەیی لارەوە بوو کە لە ڕەنگی خۆڵەمێشیی لای ئێوارەدا

دەدرەوشایەوە.

تارکوت ئۆیلچوین گوتی: "لێرەدا، بەڵێ، ڕێک لێرەدا تەرمی (کا) دۆزرایەوە."

بە چاوی ڕووت سەیری شۆستە شێدارەکەم کرد. دوو منداڵ کە هەردووکیان بەخێرایی لە دوکانی بەقاڵێکەوە دەرپەڕین، یەکێکیان پێی نا بە سەر بەردەکانی ئەو شۆستە شێدارەدا کە تەرمی(کا) دوای پێکرانی بە سێ گوللە کەوتبووە سەری. تیشکی سووری ئۆتۆمبیلێک کە کەمێک لەولاترەوە ڕاوەستابوو، لە قیری سەر جادەکەدا ڕەنگی دەدایەوە. (کا) دوای ئەوەی چەند خولەکێک لەسەر ئەم بەردانە بە ئازارەوە گینگڵ دەدات، بەر لە گەیشتنی ئۆتۆمبیلی فریاگوزاری، گیان دەسپێرێ. لەپڕ سەرم هەڵبڕی و سەیری ئەو پارچە ئاسمانەم کرد کە لە کاتی گیان سپاردندا بینیبووی: کۆمەڵێک باڵەخانەی کۆنم بینی کە لە نهۆمەکانی خوارەوەیاندا دوکانی دۆنەری تورک، نووسینگەی گەشتوگوزاری، سەرتاشخانە و بیرەخانە دەبیندران و لە نێوان تەلی گڵۆپەکانی سەر شەقامیشەوە ئاسمانم لێوە دیاربوو. (کا) دەورووبەری سەعات دوازدەی شەو پێکرابوو. تارکوت ئۆیلچوین پێی گوتم لەو ساتانەدا تاک و تەرای هەوەسفرۆشان بەو ناوەدا دێن و دەڕۆن. ڕاستییەکەی، (کاری لەشفرۆشی) کوچەیەک سەرووتر لە شەقامی کایزەر دەکرێ، بەڵام لە شەوانی بەجووڵە و لە کۆتایی هەفتە و لە ڕۆژانی پێشانگادا، (ژنان) خۆیان دەگەیەننە ئێرەیش. کاتێک وەکو ئەوەی بەدوای شتێکدا بگەڕێم، سەیری ڕاست و چەپی خۆم کرد، ئەو گوتی: "لێرە هیچیان نەدۆزییەوە. پۆلیسی ئەڵمان وەکو پۆلیسی تورک نین، زۆر باش کاردەکەن."

کاتێک خۆم بە دوکانەکانی دەورووبەردا دەکرد و لێیان دەهاتمە دەرێ، ئەو بە بەزەییەکی هەڵقوڵاو لە ناخەوە یارمەتیی دەدام. کچانی سەرتاشی ناو سەرتاشخانەکان تارکوت ئۆیلچوینیان دەناسی و هەواڵیان دەپرسی، بێگومان ئەمان لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا لە دوکانەکانیان نەبوون و هیچیان سەبارەت بە ڕووداوەکە نەبیستبوو. لە دەرەوە پێی گوتم: "خێزانە تورکەکان کچانیان تەنیا فێری سەرتاشی دەکەن. لە فرانکفورتدا بەسەدان ژنە سەرتاشی تورک هەن."

کوردەکانی ناو دوکانی میوە و سەوزەفرۆشانیش، بە زیادەوە ئاگاداری



وردەکارییەکانی تاوانەکە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری پۆلیس بوون. ڕەنگە هەر لەبەرئەوەیش بێ زۆر خۆشیان بە چارەی ئێمەدا نەهات. ئەو گارسۆنە دڵفراوانەی ئێستا بە پارچە پەڕۆیەکی چڵکن مێزە فۆرمیکاکانی کەبابخانەی بایرامی دەسڕییەوە، لە سەعات دوازدەی شەوی ڕووداوەکەدا هەمان پارچە پەڕۆی بە دەستەوە بووە، گوێی لە دەنگی تەقەکان بووە و دوای کەمێک چاوەڕوانی هاتووەتە دەرێ و دواکەس بوو کە (کا)ی لە ژیاندا بینیبوو.

دوای دەرچوونم لە کەبابخانەکە، بەپەلە خۆمان کرد بە یەکەم دەروازەی بەردەمماندا و گەیشتینە حەوشەی تاریکی پشت باڵەخانەیەکەوە. بە چاوساغیی تارکوت ئۆیلچوین دوو پلیکانە چووینە خوارێ، لە دەرگایەکەوە چووینە ژوورێ و خۆمان لە شوێنێکی سامناکدا بینیەوە کە هێندەی فڕۆکەیەکی هانگار گەورە بوو و وا دیار بوو ماوەیەک وەکو کۆگا کەڵکی لێ وەرگیرابوو. ئێرە ژێرزەمینێک بوو کە لە ژێر باڵەخانەکەوە تا شۆستەکەی ئەوبەری کوچەکە درێژ دەبووەوە. بە فەرشەکانی ناوەڕاستیدا وێ دەچوو شوێنێکە وەکو مزگەوت بۆ نوێژی بە کۆمەڵی ئێواران بۆ پەنجا و شەش کەس کەڵکی لێ وەربگیرێ. دەورووبەریشی، وەکو ژێرزەمینەکانی ئەستەمبوڵ، بە دوکانی پۆخڵ و تاریک دەوردرابوو: زیوفرۆشێک کە ڕووناکی لە جامخانەی دوکانەکەیدا بەدی نەدەکرا، بەقاڵێکی نیمچە گرگن، کەمێک لەولاترەوە قەسابێکی سەرقاڵ و بەقاڵێکم بینی کە لەپشت مێزەکەیەوە سەیری تەلەفزیۆنی قاوەخانەکەی دەکرد و لە هەمان کاتدا قەف قەف باسترمەی دەفرۆشت. لەولاتریشەوە مێزێکم بینی کە ئاوی میوەی هاتوو لە تورکیاوە، ماکەرۆنی تورکی و خواردنی ناو قوتوو و کتێبی ئایینیی لەسەر دەفرۆشرا. هەر لە تەنیشتیەوە، قاوەخانەیەکی زۆر قەرەباڵغتر لە مزگەوتەکەم بینی. ئاپۆرەی پیاوانی ماندوو، لە ناو چرەدووکەڵی ناو قاوەخانەکەدا سەیری فیلمێکی تورکییان لە تەلەفزیۆندا دەکرد، جاروبار یەک دوویەکیان هەڵدەستان و بەمەبەستی دەست بەئاوگەیاندن، ڕوویان لە دەستشۆرێک دەکرد کە بەرمیلێکی ئاوی پلاستیکیی بەسەرەوە بوو. تارکوت بەگ گوتی: "لە نوێژەکانی جەژن و هەینیدا دووسەد کەس دێنە ئێرە. لە پلیکانەکانەوە تا حەوشەی پشتەوە جێگا دەگرن." هەر بۆ ئەوەی نیشان بدەم کە شتێکم کردووە،

لەسەر مێزی کتێب و ڕۆژنامەکان گۆڤارێکی –تەبلیغ–م بە دەستەوە گرت.

دواتر لە بیرەخانەیەکی بنیادنراو لەسەر شێوازی کۆنی میونیخ کە ڕێک دەکەوتە سەر مزگەوتەکە، دانیشتین. تارکوت ئوێلچوین بەدەست ئاماژەی بۆ زەوییەکەی ژێر پێمان کرد و گوتی: "ئەمە مزگەوتی سلێمانچییەکانە. بەڵام ئاینداران پێوەندییان بە تیرۆرەوە نییە. ئەوان وەکو گرووپەکانی هەڵگری دیدی نەتەوەیی یاخۆ وەکو پیاوانی جەمالەدین کاپلان لە دژی دەوڵەتی کۆماری تورکیا ناکەونە شەڕەوە." سەرباری ئەوەیش، بە گومانی ناو نیگاکانم و بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی گۆڤاری –تەبلیغ–یش کە وەکو ئەوەی بەدوای بەڵگەدا بگەڕێم ئەمدیو و ئەودیوم دەکرد، ئۆقرەی لەبەر بڕا و بۆی گێڕامەوە کە هەموو ئەو شتانەی لە بارەی کوژرانی (کا)وە دەیزانێ، لە پۆلیس و لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە بەدەستی هێناوە.

چل و دوو ڕۆژ لەمەوبەر و سەعات ۲۳,۳۰ی یەکەم شەممەی ساڵی نوێ، (کا) دوای بەشداریکردنی لە ئێوارە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەدا، لە هامبورگ گەڕابووەوە. دوای شەش سەعات گەشت بە شەمەنەفەر، دەسبەجێ لە دەروازەی باشووری وێستگاکەوە چووبووە دەرێ، لە بری ئەوەی ڕاستەوخۆ بۆ ماڵەکەی خۆی لە نزیک شەقامی گوتلۆیت بگەڕێتەوە، تەواو بە پێچەوانەوە چووبووە شەقامی کایزەر. لە ناو پیاوانی زگورتی، گەشتیاران، ئاپۆڕەی مەست و سەرخۆشان، دوکانەکانی سێکس کە تا ئەو ساتە کراوە بوون و لە ناو لەشفرۆشاندا کە چاوەڕێی کڕیاریان دەکرد، بیست و پێنج خولەکی بەسەر بردبوو. دوای نیو سەعات لای مەڵبەندی سێکسی جیهانییەوە بەلای ڕاستدا بایدابووەوە، بە گەیشتنی بۆ سەر شۆستەکەی شەقامی موینشنەر، تەقەی لێ کرابوو. بە ئەگەری زۆر، ویستوویەتی بەر لەوەی بۆ ماڵەوە بگەڕێتەوە، لە دوکانی بەقاڵی ئانتالیای دڵگیر کە دوو دوکان لەولاترەوە بوو، پرتەقاڵ بکڕێ. ئەو دوکانی بەقاڵییە تاکە دوکان بوو لەو دەوروبەرە کە تا نیوەشەو بە کراوەیی دەمایەوە، فرۆشیارەکانیش بیریان کەوتووە (کا) شەوانە هاتووە و لای ئەوان پرتەقاڵی کڕیوە.

پۆلیس هیچ کەسێکی نەدۆزیبووەوە بکوژەکەی (کا)ی بینیبێ. گارسۆنەکەی کەبابخانەی بایرام گوێی لە دەنگی تەقەکان بووبوو، بەڵام لەبەر دەنگی تەلەفزیۆن و



هەرای میوانەکان تێ نەگەیشتبوو چەند دەستڕێژ کراوە. لە جامە تەڵخکراوەکانی بیرەخانەی سەر مزگەوتەکەوە بە ئاستەم دەرەوە دەبینرا. سووربوونی فرۆشیاری ئەو دوکانی بەقاڵییەی کە گومان دەکرا (کا) بۆ پرتەقاڵ کڕین ڕووی تێ کردبێ، لەسەر ئەوەی ئاگای لە هیچ شتێک نییە، پۆلیسی خستبووە گومانەوە. فرۆشیارەکە ماوەی شەوێک دەستگیر کرابوو، بەڵام پۆلیس بە ئەنجام نەگەیشتبوو. لەشفرۆشێک کە لەو ساتەدا لە کوچەیەکی خوارتردا بەدەم جگەرەکێشانەوە چاوەڕێی کڕیار بووە، گوتبووی کەسێکی باڵاکورت و ئەسمەری وەکو تورکی بینیوە کە پاڵتۆیەکی ڕەشی لەبەردا بووە و لەو کاتەدا بەرەو شەقامی کایزەر ڕای کردووە، بەڵام نەیتوانیبوو نیشانەکانی ئەو کەسەکە بەوردی باس بکات. ئەو ئەڵمانەی کە بەڕێکەوت دوای کەوتنی (کا) لەسەر شۆستەکە هاتبووە باڵکۆنەی خۆی و تەلەفۆنی بۆ ئۆتۆمبیلی فریاگوزاری کردبوو، کەسی لەو ناوە نەبینیبوو. فیشەکی یەکەم لە پشتی سەری (کا) درابوو و لە چاوی چەپیەوە هاتبووە دەرەوە. دوو فیشەکەکەی تر، دەمارەکانی دەوروبەری دڵ و جگەری پچڕاندبوو، پاڵتۆ ڕەنگ خۆڵەمێشییەکەیشی، لە پشت و پێشەوە کونی تێ کەوتبوو و خەڵتانی خوێن بووبوو.

پشکێنەرێکی پیری لەوچە و چەنەباز گوتبووی: "بەپێی ئەوەی لە دواوە لێی دراوە، کەسی بکوژ بە بەرنامەوە دوای کەوتووە و سوور بووە لەسەر کوشتنی." لەوانەیشە هەر لە هامبورگەوە بەدوایەوە بووبێ. پۆلیس بیری لە ئەگەری تریش کردبووەوە: شتی وەکو دڵپیسیی زایەندی و داوێنپیسی و ناکۆکیی سیاسیی نێوان تورکەکان. (کا) بایەخی بە جیهانی ژێرزەمینیی دەوروبەری وێستگا نەدەدا. یەکێک لەو فرۆشیارانەی کە سەیری وێنەکەیان کردبوو، بە پۆلیسی گوتبوو بینیویەتی بەمەبەستی سەیرکردنی فیلمی ڕووت چووەتە یەکێک لە کابینە بچووکەکانەوە. بەهۆی ئەوەی هیچ هەواڵێکی ڕاست یان درۆ نەگەیشتبوو، لەبەرئەوەیش هیچ دەزگایەکی ڕاگەیاندن یاخۆ هیچ دەوروبەرێکی بەهێز گوشاریان بۆ دۆزینەوەی بکوژەکە بەکار نەهێنابوو، دوای ماوەیەک پۆلیس لێکۆڵینەوە و لێگەڕانی ڕاگرتبوو.

کابرای پیرە پشکێنەری قورگ بە کۆخە کە بە شێوەیەکی وا هەڵسوکەوتی دەکرد وەکو ئەوەی ئامانجی لە بیربردنەوەی تاوانەکە بێت، نەک لێکۆڵینەوە، کاتی دیداری

لەگەڵ ناسیاوەکانی (کا)دا دادەنا و چاوی پێیان دەکەوت. بەڵام لە کاتی لێکۆڵینەوەکاندا زیاتر باسی خۆی دەکرد. تارکوت ئۆیڵچوین لە سایەی ئەم پشکێنەرە قەڵەندەر و تورکدۆستەدا بۆی دەرکەوتبوو (کا) لەو هەشت ساڵەی بەر لە چوونیدا بۆ قارس، دوو ژن لە ژیانیدا هەبووە. ژمارەی تەلەفۆنەکانی ئەم دوو ژنە کە یەکێکیان تورک و ئەوی تریان ئەڵمان بوو، بەوردی لە دەفتەرەکەمدا نووسیەوە. (کا) لەو چوار ساڵەی دوای گەڕانەوەی لە قارس، پێوەندیی لەگەڵ هیچ ئافرەتێکدا نەبووە.

بێ ئەوەی نقەمان لێوە بێ، بەژێر بەفردا گەڕاینەوە بۆ ماڵەکەی (کا). لەوێ چاومان بە خانمە ڕووخۆش و دەم بە گازندەی خاوەن خانووەکە کەوت. بەدەم کردنەوەی دەرگای نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەکەوە کە بۆنی فێنکی و شێی لێ دەهات، بەدەنگێکی تووڕەوە گوتی خەریکە خانووەکە بەکرێ دەدات، پێی گوتین ئەگەر ئێمە شتەکانی ناو ژوورەکە و ئەو هەموو پیسییە نەبەین، ئەوا ئەو هەمووی فرێ دەدات. خانمەکە ئەمەی گوت و ڕۆیشت. کاتێک چوومە ئەو ژوورە تاریک و نزم و بچووکە کە هەشت ساڵی کۆتاییی ژیانی تێدا بەسەر بردبوو، ئەو بۆن و بەرامە بێ وێنەیەی (کا)م هەڵمژی کە هەر لە منداڵییەوە پێی ئاشنابووم و چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک. ئەم بۆنە، لەو بلووزە خوورییانەی کە دایکی بەدەست بۆی دەچنی، لە جانتای قوتابخانە و کاتێکیش دەچووم بۆ ماڵیان، لە ژوورەکەی دەهات. مارکەی بۆنەکەم نەدەزانی و بە هۆشیشمدا نەهاتبوو پرسیاری بکەم، بەڵام هەمیشە پێم وابوو بۆنی جۆرێک لە سابوونی تورکییە.

(کا) لە ساڵەکانی سەرەتای ژیانیدا لە ئەڵمانیا، کاری وەکو کۆڵبەری لە بازاڕە گەورەکاندا، ماڵ گواستنەوە، وتنەوەی دەرزی زمانی ئینگلیزی بە منداڵانی تورک و بۆیاخچێتیی کردبوو. دوای ئەوەی خۆی وەکو (پەنابەری سیاسی) دەداتە پەسەندکردن و (موچەی پەنابەری) وەردەگرێ، خۆی لە کۆمۆنیستەکانی دەوروبەری کۆمەڵە تورکییەکان کە ئەو کارانەی لەکن دۆزیبووەوە، دابڕیبوو. کۆمۆنیستە دوورخراوەکانی تورک (کا)یان بە کەسێکی مەند و (سەرمایەدار) دادەنا. سەرچاوەکانی تری داهاتی (کا) لە ماوەی دوازدە ساڵی ڕابردوودا بریتی بوو لە داهاتی ئەو کۆڕە شیعرییانەی کە لە کتێبخانەی شارەوانی، خانەی ڕۆشنبیری و



کۆمەڵە تورکییەکاندا بۆی سازدەکرا. ئەم کۆڕانە کە تەنیا تورکەکەکان بۆی دەهاتن (زۆر بە دەگمەن ژمارەیان بیست کەسی تێ دەپەڕاند)، ئەگەر مانگی سێ جار بۆی ڕێک بخرایە، پێنجسەد مارکێکی دەستکەوت دەبوو، ئەمەیش لەگەڵ چوارسەد مارکی موچەی پەنابەریی سیاسیدا بەشی تا کۆتاییی مانگی دەکرد، بەڵام ئەمە زۆر بە کەمی مەیسەر دەبوو. کورسی و تەپڵەکەکانی ژوورەکەی شکاو و پەرش و بڵاوبوون، سۆپا کارەباییەکەی ژەنگی گرتبوو. لەبەرئەوەی خانمی خاوەن خانووەکە لە سەرەتادا تووڕەی کردم، بیرم کردەوە هەموو شتومەکانی هاوڕێکەم: سەرینەکەی کە بۆنی قژی ئەوی گرتبوو، قایش و کراڤاتەکانی کە بیرم کردەوە لە قۆناغی خوێندنی ئامادەیشدا لە پشت و ملی دەکرد، پێڵاوەکانی مارکەی بالی کە پەنجەی پێی، پێشەکەی کون کردبوو و ئەم وەکو (دەمپای ماڵەوە بەکاری دەهێنا) و لە یەکێک لە نامەکانیدا بۆی باس کردبووم، فڵچەی ددان شۆرین و لێوانێکی چڵکن کە فڵچەکەی تێدا بوو، نزیکەی سێسەد و پەنجا کتێبێک، تەلەفزیۆنێکی کۆن و ڤیدیۆیەک کە هیچ بۆ من باسی نەکردبوو، چاکەتە پەڕپووتەکەی و کراسەکانی و ئەو بیجامانەی کە هەژدە ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ خۆیدا لە تورکیاوە هێنابوونی، بخەمە باوڵە کۆنەکەی خۆی و توورەکەوە و لەگەڵ خۆمدا بیانبەم، بەڵام کاتێک لە دەرگای ژوورەکە چووم بەودیودا و ئەسڵی مەبەستم کە لە پێناوی ئەودا بۆ فرانکفورت هاتبووم، لەسەر مێزی کارەکەی نەبینی، خوێنساردیی خۆم لە دەست دا.

(کا) لە دواین نامەکانی خۆیدا کە لە فرانکفورتەوە بۆی ناردبووم، بە خۆشییەوە بۆی نووسیبووم دوای چوار ساڵ لە هەوڵ و کۆشش، دیوانی شیعرەکەی بە ئەنجام گەیاندووە. ناوی کتێبەکەی "بەفر" بوو. زۆربەی شیعرەکانی لەوانە بوون کە (لە ناکاو) لە قارس سروشەکانی بۆ هاتبوو و لە دەفتەرێکی سەوزدا نووسیبوونی. دوای گەڕانەوەی لە قارس، هەستی بەوە کردبوو دیوانەکەی نەزمێکی (قووڵ و پڕ لە ڕاز) کە خۆیشی سەری لێ دەرناکات، لە خۆ دەگرێ. چوار ساڵی ڕابردووی لە فرانکفورت بە تەواوکردنی (کێماسی)یەکانی دیوانەکەیەوە بەسەربردبوو. ئەمە هەوڵێکی هێزپڕوکێن و ماندووکەر بوو، چونکە ئەو سروشەی لە قارس بۆی دەهات و وای لێ دەکرد بەچەشنێک شیعر بنووسێ وەکو ئەوەی کەسێک بە گوێیدا بچرپێنێ، لە

فرانكفورت بۆی نەدەهات.

لەم سۆنگەیەوە دەستی كردبوو بە گەڕان بەدوای لۆژیكی دیوانەكەیدا كە زۆرینەی شیعرەكانی لە قارس نووسیبوو، لە تەواوكردنی كەموكورتییەكانی كتێبەكەشیدا شوێنپێی ئەو لۆژیكەی هەڵگرتبوو. لە دوا نامەدا بۆی نووسیبووم هەوڵەكانی بە ئەنجام گەیاندووە، شیعرەكانی لە هەندێک لە شارەكانی ئەڵمانیا دەخوێنێتەوە و تاقییان دەكاتەوە، لە كۆتایشدا هەموویان لەیەک جێدا كۆدەكاتەوە، كارێكی وا دەكات بە داكتیلۆ بنووسرێنەوە، كۆپییەک بۆ من و كۆپییەكیش بۆ وەشانخانەیەكی ئەستەمبوڵ دەنێرێ. داوای لە من كردبوو داخۆ دەتوانم چەند وشەیەک بۆ بەرگی دواوەی كتێبەكەی بنووسم و بینێرم بۆ فاخیری دۆستی هەردووكمان كە دەبوو ئەركی چاپكردنی كتێبەكەی لە ئەستۆ بگرتایە.

مێزی كاری (كا) كە بە پێچەوانەی ئەوەی لە شاعیرێک چاوەڕوان دەكرێ، تا بڵێی ڕێكوپێک بوو، دەیڕوانی بەسەر سەربانەكانی فرانكفورتی نقوم بوو لە بەفر و تاریكاییی ئێواراندا. لە سووچی لای ڕاستی مێزەكە كە بە پەڕۆیەكی سەوز داپۆشرابوو، ئەو دەفتەرانەی (كا)م بینی كە لە ماوەی مانەوەیدا لە قارس تێبینییەكانی خۆی و لێكدانەوەی شیعرەكانی تیایاندا تۆمار كردبوو. لای چەپیشەوە چەند كتێب و گۆڤارێک داندرابوون كە بە نۆرە دەیخوێندنەوە. گڵۆپێكی ڕەنگ برۆنزی و تەلەفۆنێكیشی لە هەمان دووریی هێڵێكی خەیاڵیی ناوەڕاستی مێزەكەدا دانابوو. بەپەرۆشەوە، كشاوەكان، نێوان كتێبەكان و دەفتەرەكان، نێوان ئەو پارچە ڕۆژنامانەی كە زۆربەی توركانی هەندەران كۆیان دەكردنەوە، دۆڵابی جلوبەرگەكانی، ناو جێگاكەی، دۆڵابە بچووكەكانی سەرشۆر و ئاشپەزخانەكەی، ناو بەفرگرە و توورەكەی بچووكی جلە چڵكنەكانی، هەر گۆشەیەكی ماڵەوە كە بكرێ دەفتەرێكی تێدا بشاردرێتەوە، گەڕام. من نەمتوانی بڕوا بكەم ئەو دەفتەرە ون بووبێ، لە كاتێكدا تاركوت ئۆیلچوین جگەرەی دەكێشا و بەبێدەنگی سەیری فرانكفورتی نقومبووی ناو بەفری دەكرد، من جارێكی تر هەموو شوێنەكانی پێشوو بەدوای دەفتەرەكەدا گەڕام. لەبەرئەوەی لەو جانتا دەستییەدا نەبوو كە لەگەڵ خۆیدا بۆ فرانكفورت بردبووی، دەبوو لەوێ، لە ماڵەوە بێ. (كا) هەتا دیوانی شیعرەكەی تەواو نەكردایە، كۆپیی هیچ



شیعرێكی دەرنەدەهێنا، هەمیشە دەیگوت ئەمە دەبێتە مایەی نەگبەتی، بەڵام وەكو بە نامە منی ئاگادار كردبووەوە، دیوانەكەی تەواو كردبوو.

دوای دوو سەعات، لەبری ئەوەی بڕوا بە ونبوونی ئەو دەفتەرە سەوزە بێنم كە (كا) لە قارس شیعرەكانی خۆی تێدا نووسیبووەوە، بڕوام بە خۆم هێنا كە دەفتەرەكە یان بەلانی كەمەوە شیعرەكان، لە ژێر دەستی خۆمدان، بەڵام لەبەر شڵەژان و پەشۆكان بۆم نادۆزرێتەوە. لەو ساتەدا كە خاوەن خانووەكە لە دەرگای دا، من هەموو ئەو دەفتەرانەی كە لەسەر مێزەكە و لە كشاوەكاندا دۆزیبوومنەوە و هەموو ئەو كاغەزانەی كە دەستنووسی (كا)یان بەسەرەوە بوو، كردە چەند توورەكەیەكەوە. كاسێتی فیلمە ڕووتەكانیش كە بێ بایەخانە لە تەنیشت ڤیدیۆكەوە فڕێ درابوون (ئەمە نیشانەیەک بوو بۆ ئەوەی هەرگیز میوان ڕووی لە ماڵەكەی (كا) نەكردووە)، كۆكردەوە و كردمە توورەكەیەكی شتومەک كڕینەوە كە "كاوفهۆف"ی لەسەر نووسرابوو. وەكو ڕێبوارێک كە دانەیەک لە شتە ئاساییەكانی ژیانی لەگەڵ خۆیدا بۆ گەشتێكی دوور و درێژ دەبات، بەدوای دواین بیرەوەریی (كا)دا بۆ خۆم گەڕام. بەڵام وەكو هەمیشە تووشی ساتێک لە ساتەكانی بێ بڕیاری بووم و نەک تەنیا شتومەكی سەر مێزەكەی لە تەپڵەک، پاكەتی جگەرە و چەقۆیەک كە بۆ هەڵپچڕینی نامە بەكاری هێنابوو، بگرە سەعاتی سەر مێزی لای جێگاكەی، ڕۆكە كۆن و تەمەن بیست و پێنج ساڵانەكەی كە شەوانی زستان بەسەر بیجامەكەیدا لەبەری دەكرد و بۆن و بەرامەی ئەوی گرتبوو، وێنەیەک كە لەگەڵ خوشكەكەیدا لەسەر شۆستەی دۆڵمەباخچە گرتبووی، هەر لە گۆرەوییە چڵكنەكانییەوە تا بە دەسڕی ناو دۆڵابەكەی كە هەرگیز بەكاری نەهێنابوو، لە چنگاڵی ئاشپەزخانەكەوە تا بەو پاكەتە جگەرانە دەگات كە لە تەنەكەی زبڵەكە دەرم هێنانەوە و چەندین شتی تریشم بە ئەڤینی كەسێكی شەیدای شتومەكی ئانتیكەوە ئاخنیە توورەكەی بەتاڵەوە. لە دواین دیدارماندا لە ئەستەمبوڵ، (كا) پرسیاری دوا ڕۆمانی منی كرد كە خەریكی نووسینی بووم. منیش چیرۆكی (مۆزەخانەی بێتاوانی)م بۆ گێڕایەوە كە زۆر بەوردی لە هەموو كەسێكی ترم شاردبووەوە.

لە چاوساغەكەم جیا بوومەوە و بۆ هوتێلەكەم گەڕامەوە. هەر كە گەیشتمە

ژوورەکەم، دەستم کرد بە گەڕان بەناو شتومەکەکانی (کا)دا، ئەمە بەمەرجێک بڕیارم دابوو بۆ ڕزگاربوون لەو غەمە سووتێنەرەی کە تێی کەوتبووم، ئەو شەوە هاوڕێکەم لەبیر بکەم. بەر لە هەموو شتێک سەیرێکی کاسێتی فیلمە ڕووتەکانم کرد. لە ژووری هوتێلەکەدا ڤیدیۆ نەبوو، بەڵام بەو تێبینیانەدا کە بە دەستی خۆی لەسەر کاسێتەکان نووسیبوونی، بۆم دەرکەوت هاوڕێکەم بایەخێکی تایبەتی بە ئەستێرەیەکی فیلمی ڕووتی ئەمەریکی بەناوی مەلیندا داوە.

لەو کاتەدا دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەو دەفتەرانەی کە (کا) لێکدانەوەی شیعرەکانی قارسی تێدا تۆمار کردبوون. ئایا (کا) بۆچی ئەم هەموو سەرسوڕمان و ئەڤینەی کە لە قارس بەسەری هاتبوو، لە من شاردووەتەوە؟ وەڵامی ئەمەم لە نزیکەی چل نامەی خۆشەویستیدا دۆزیەوە کە لە کشاوەکان دەرم هێنابوون و لە توورەکەم نابوون. هەمووی بۆ ئیپەک نووسرابوو، بەڵام هیچیانی نەناردبوو،

هەموویشی بەهەمان ڕستە دەستی پێ دەکرد: "گیانەکەم، زۆر بیرم کردەوە ئەمانەت بۆ بنووسم یاخۆ نا." لە هەر نامەیەکدا یادگارییەکی نوێ سەبارەت بە قارس، ئازارچێشتنی تایبەت بە نووستنەکانی لەگەڵ ئیپەکدا، وردەکارییەکی تر کە فرمێسکی لە چاو دەهێنا و یەک دوو تێبینی سەبارەت بە ژیانی ڕۆژانەی (کا) لە فرانکفورت هەبوو. (سەبارەت بە سەگێکی شەل کە لە باخچەی فۆن-بێتمان بینیبووی یاخۆ مێزە چینکۆ غەمبەخشەکانی مۆزەخانەی جووەکان نامەی بۆ منیش نووسیبوو.) نەنووشتاندنەوەی نامەکان نیشاندەری ئەوە بوون کە (کا) هێندە بەبڕیار نەبووە بیانخاتە زەرفەوە.

(کا) لە نامەیەکدا نووسیبووی: "بە یەک وشەی تۆ دەگەڕێمەوە بۆ ئەوێ." لە نامەیەکی تردا نووسیبووی: "جارێکی تر بەهیچ جۆرێک ناگەڕێتەوە بۆ قارس، چونکە مۆڵەت بە ئیپەک نادات لەوە زیاتر بە هەڵە لێی تێ بگات." لە نامەیەکی دیدا ئاماژەی کردووە بۆ شیعرێکی ونبوو، دانەیەکی تریان هەستێکی وا لای خوێنەر دەخوڵقێنێ وەکو ئەوەی لە وەڵامی نامەیەکی ئیپەکدا نووسیبێتی. (کا) نووسیبووی: "چەند جێگای داخە لە نامەکەیشم بە هەڵە تێ گەیشتووی." ئەو شەوە هەموو شتەکانی ناو توورەکەکانم دەرهێنا و بە ناو ژووری هوتێلەکەدا و بەسەر جێیەکەمدا بڵاوم کردنەوە



و پشکنیمن. دڵنیابووم (کا) تەنانەت یەک نامەیشی لە ئیپەکەوە پێ نەگەیشتبوو. دوای چەندین هەفتەیش کە چوومە قارس و چاوم بە ئیپەک کەوت، پێی گوتم هەرگیز نامەی بۆ (کا) نەناردووە. لەو نامانەدا کە بەر لە نووسینیان دەیزانی نایاننێرێ، ئایا (کا) بۆچی وای دەنووسی وەکو ئەوەی وەڵامی نامەی ئیپەک بداتەوە؟

پێ دەچێ گەیشتبینە دڵی بەسەرهاتەکەمان. ئایا تا چ ڕادەیەک دەکرێ لە ئازار و ئەڤینی کەسێکی تر تێ بگەین؟ گەلۆ تا چەندە دەتوانین لەو کەسانە بگەین کە بە بەراورد لەگەڵ ئێمەدا لە ئازار و تەنگانە و چەوسانەوەی قوڵتردا ژیاون؟ ئەگەر تێگەیشتن بریتی بێ لەوەی خۆمان بخەینە جێی کەسێکی جاواز لە خۆمان، ئایا دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارانی جیهان هیچ لە ملیاران هەژاری گۆشەگیرکراو تێ گەیشتوون؟ گەلۆ ئۆرهانی ڕۆماننووس بڕی چەند لە تاریکاییی ژیانی دژوار و پڕ لە ئازاری هاوڕێ شاعیرەکەی دەبینێ؟

(کا) لە جێیەکدا نووسیبووی: "هەموو ژیانم لە هەستی ونبوون و کەموکوڕیدا وەکو ئاژەڵێکی بریندار بەدەم ئازارکێشانەوە بەسەرچوو. ئەگەر هێندە بە دەور و خوولتدا نەهاتبام، لە ئاکامدا هێندە تووڕەم نەدەکردی و ئەو هاوسەنگییەی لە ماوەی دوازدە ساڵدا پێی گەیشتبووم، ونم نەدەکرد و نەدەگەڕامەوە بۆ خاڵی سەرەتایی. ئێستا هەمدیسان لە ناخمدا هەست بە ونبوون و فەرامۆشکردن دەکەم و ئەمەیش سەرتاپام لە خوێن هەڵدەکێشێ. هەندێک جار بیر دەکەمەوە کێماسیی ژیانم هەر تۆ نیت، بەڵکو هەموو جیهانە." ئەمانەم دەخوێندەوە، بەڵام ئایا تێ دەگەیشتم؟

ئەو وێسکییەی لە مینی باڕی ژووری هوتێلەکە دەرم هێنا و خواردمەوە، کەللەی گەرم کردم و درەنگانی شەو بۆ سۆراخکردنی مەلیندا ڕووم لە شەقامی کایزەر کرد.

مەلیندا دوو چاوی گەورە، زۆر گەورەی غەمگین و ڕەنگ زەیتوونیی هەبوو. پێستی سپی و ڕانەکانی درێژ بوون، لێوەکانی لەو گێلاسانە بچووکتر بوون کە شاعیرانی کلاسیک بۆ وەسفی لێو بەکاریان هێناوە، بەڵام کەمێک گۆشتن بوو. زۆر بەناوبانگ بوو: لە بەشی کاسێتی ڤیدیۆی مەڵبەندی سێکسی جیهانی کە بیست و چوار سەعات کراوە بوو، لە لێکۆڵینەوەیەکی بیست خولەکیدا، شەش کاسێتم بەراورد کرد کە ناوی ئەویان بەسەرەوە بوو. دواتر، کاتێک ئەم فیلمانەم بردەوە ئەستەمبوڵ و

سەیرم کردن، هەستم بەو ڕەهەندانەی مەلیندا کرد کە پێ دەچێ کاریان لە ناخی (کا) کردبێ. ئەو پیاوەی کە نێوان ڕانەکانی مەلیندای دەلێسایەوە، چەندەیش قێزەون و زرتەبۆز بوایە، کاتێک کابرا لە تاو زەوق دەینالاند و لە هۆش خۆی دەچوو، نیشانەیەکی بەزەیی تایبەت بە دایکان لەسەر ڕووخساری زەردهەڵگەڕاوی مەلیندا دیاری دەدا. بە جلوبەرگەوە (ژنە سەرمایەدارێکی چاوبرسی، ژنێکی ماڵەوەی ناڕازی لە بێدەسەڵاتیی پیاوەکەی، ستێواردێکی ئارەزووبزوێن) چەندە هەوەسبزوێن بوو، بە ڕووتیش بەهەمان ڕادە هەستیار بوو. دواتر کە چوومە قارس، دەسبەجێ تێ گەیشتم چاوە گەورەکانی، جەستە گەورە و تەندروستەکەی و هەندێک لە هەڵسوکەوتەکانی دەچوونەوە سەر ئیپەک.

زۆر باش دەزانم ئەگەر بڵێم هاوڕێکەم لە ماوەی دوایین چوار ساڵی ڕابردوودا زۆربەی کاتی خۆی بە سەیرکردنی کاسێتی لەمجۆرەوە بەسەر بردووە، ئەوا ئەو کەسانەم لێ زیز دەبن کە دەیانەوێ لە سۆنگەی خەیاڵپەرستی و لاوازیی تایبەت بە هەزارانەوە شاعیرێکی بێ هەڵە و خۆشەویست لە (کا)دا ببینن. کاتێک لە مەڵبەندی سێکسی جیهانی بەناو پیاوانی تەنیای وەکو خێودا بەدوای فیلمی تری مەلینددادا دەگەڕام، بیرم لەوە کردەوە تاکە شتێک کە پیاوانی هەژاری جیهان یەک دەخات، خۆ خزاندنە گۆشەیەکەوەیە بۆ سەیرکردنی فیلمی ڕووت بەدەم هەستکردن بە تاوانەوە. ئەم پیاوە هەژارانە کە لە سینەماکانی شەقامی چل و دووەمینی نیویۆرک، لە شەقامی کایزەری فرانکفورت یاخۆ لە سینەماگەلی کوچەکانی پشتەوەی بەیئۆغلوییی ئەستەمبوڵ بینیبوومن، بە شەرم و هەستێکی نابووتی خۆ ونکردنەوە سەیری فیلمی ڕووتیان دەکرد و هەوڵیشیان دەدا لە کابینەکاندا نیگایان نەچێتە سەر یەکتر، هێندە لە یەکدی دەچوون، بەجۆرێک سەریان لە هەموو ڕێساکانی بریاری پێشوەختی نەتەوەپەرستان و ئەنترۆپۆلۆژی شێواندبوو. کاسێتەکانی مەلیندام کردە توورەکەیەکی پلاستیکی ڕەشەوە و لە مەڵبەندی سێکسی جیهانی هاتمە دەرەوە. بە شەقامە چۆڵەکاندا و بەژێر کلووە گەورەکانی بەفردا گەڕامەوە بۆ هوتێلەکەم.

لە باری هۆڵی پێشوازی، دوو پێکی تر ویسکیم خواردەوە و بۆ ئەوەی کارم تێ بکات، بەدەم چاوەڕێکردنەوە لە پەنجەرەکەوە سەیری بەفر بارینەکەی دەرەوەم



دەکرد. پێم وابوو ئەگەر بەر لە چوونم بۆ ژوورەکەم کەمێک مەست بم، ئەوا ئەمشەو ئیدی داڵغە لە مەلیندا یاخۆ دەفتەرەکانی (کا) نادەم، بەڵام هەر کە چوومە ژوورەکەم، لە خۆمەوە دەستم بۆ یەکێک لە دەفتەرەکان برد، بێ ئەوەی جلەکانم بگۆڕم، خۆم هاویشتە سەر جێیەکەم و دەستم بە خوێندنەوە کرد. دوای سێ چوار لاپەڕە ئەم نیگاری گەردیلە بەفرەم کەوتە پێش چاو:

## ٣٠

# جارێکی دی کەی بەیەک دەگەینەوە؟

## شادییەکی کورتخایەن

(کا) و ئیپەک، دوای پێکەوە نووستنیان، یەکیان لە ئامێز گرت و ماوەیەک بێ جووڵە ڕاکشان. سەرتاپای جیهان هێندە کپ و (کا)یش هێندە کامەران بوو، بەجۆرێک پێی وابوو ئەمە ماوەیەکی زۆر درێژ بووبێ. هەر لەبەرئەوەیش ئۆقرەی لێ بڕا، بەرزە پێ ڕاپەڕی و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. دواتر بیری لەوە کردەوە ئەو ساتە درێژەی بێدەنگی کامەرانترین ساتی ژیانی بووە و لە خۆی دەپرسی بۆچی خۆی لە ئامێزی ئیپەک دەرهێناوە و کۆتاییی بەو ساتە بێوێنەیەی خۆشبەختی هێناوە. بە شـــپـــرزەبوونێک لە ڕوویدا وەڵامی ئەو پرســـیـــارەی دایەوە، وەکـــو ئەوەی لەودیو پەنجەرەکەوە، لە ناو بەفرەکەدا شتێک قەومابێ و ئەم ناچار بێ فریا بکەوێ.

لە ڕاستـیـشـدا لەو دیوی پەنجـەرەکـەوە، جگە لە بارینی بەفر، هیچ شـتـێکی تر نەقەومابوو. بەڵام کارەبا هێشتا نەهاتبووەوە، تیشکی مۆمێک کە لە ئاشپەزخانەکەی نهۆمی خوارەوەدا دەسووتا، لە پەنجەرە شەختەبەستووەکەوە بۆ دەرەوە دزەی دەکرد، کلووە بەفـــرەکـــانیش کـــە زۆر بەخـــاوی دەبارین، بە تیـــشکێکی نارنجی ڕووناک دەبوونەوە. زۆر دواتریش (کـــا) وای بۆچووبوو بەهـۆی ئەوەی زۆر بـەرگـــەی شـــادی ناگـرێ، بۆیە زوو کـۆتاییی بە کـامــەرانتـرین ســاتی ژیانی هـێناوە. ئەوەیش هەبوو کاتێک لە سەرەتادا لە ئامێزی ئیپەکدا نووستبوو، نەیزانیبوو هێندە کامەران دەبێ؛ لە ناخەوە هەستی بە ئارامی و ئۆقرە دەکرد، ئەمەیش شتێکی هێندە سروشتی بوو، بەجۆرێک وەکو ئەوەی لە بیری چووبێ بۆچی لە ڕابردوودا ژیانی بە هەستێکی تێکەڵ لە دەرد و غەم و دڵەڕاوکێدا بەسەر بردووە. ئەم ئارامییـە دەچووەوە سەر بێدەنگیی پێش هاتنی شیعرێکیش، بەڵام بەر لەوەی شیعرەکە بێت، جیهان بە هەموو واتایەک بە ڕووت و قـووتی دەینواند، جۆشـێک سـەرتاپـای دەتەنی. لەم سـاتی کـامەرانییـەدا



ڕووناکییـەکی ئەوتۆ لە ناخیدا نەبوو؛ بەڵکو پاکییـەکی سـادە و منداڵانە هەبوو: وەکو منداڵێک کەوا تازە فێری ئەو وشانە دەبێ کە واتای جیهان دەگەینێ.

وشە بە وشەی ئەو بابەتەی هاتەوە یاد کە دوانیوەڕۆ لە کتێبخانەی شار سەبارەت بە پێکهاتەی گەردیلەی بەفر خوێندبوویەوە. لەو سۆنگەیەوە چووبوو بۆ کتێبخانەکە بۆ ئەوەی ئامـادەکاری بۆ هاتنـی شـیـعـرێکی تر دەربارەی بەفـر بکات، بەڵام ئێسـتـا شـیـعـرەکەی لە خـەیاڵ نەمـابوو. پێکهـاتەی شـەشـپـاڵوویی گـەردیلـەی بەفر کـە لە ئەنسکلۆپیدیای منداڵاندا بینیبووی، بەراورد کرد لەگەڵ ڕیتمی ئەو شیعرانەدا کە دانە دانە وەکو بەفر بۆی دەهات. لەو ساتەدا بە خەیاڵیدا هات پێویستە شیعرەکانی ئاماژەیەک بن بۆ واتایەکی قووڵتر.

ئیپەک ڕێک لەو دەمەدا لێی پرسی: "چی دەکەیت لەوێ؟"

"سەیری بەفر دەکەم گیانەکەم."

هەستی وابوو ئیپەک پەی بەوە بردبێ کە ئەم لەودیو جوانیی پێکهاتەی ئەندازەییی گەردیلەی بەفرەوە واتایەکی دۆزیوەتەوە، بەڵام بەلایەکی تری هۆشی دەیزانی شتی وا نابێت. لەلایەکی دی، ئیـپـەک پێی ناخـۆش بوو (کـا) جگە لەم، بە شـتـێکی ترەوە سـەرقـاڵ بێ. (کـا) بەهۆی ئەوەی خـۆی لە بەرانبـەر ئیـپـەک زۆر بە ئاڵۆش و لەبەرئەوەیش زۆر بێ چـەک دەزانی، ئەم دۆخـەی پێ خـۆش بوو و حاڵی بوو لە پێکەوە نووستندا، ئەگەرچی کەمیش بێت، شتێک هێزی بۆ خۆی بەدەست هێناوە.

ئیپەک پرسی: "بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

(کا) گوتی: "دایکم." دوایش تێ نەگەیشت بۆچی لەپڕ ئەمەی گوت، چونکە دایکی کە ماوەیەکی درێژیش بەسەر مردنیدا تێ نەپەڕیبوو، لە خـەیاڵی ئەمدا نەبوو. بەڵام سـاڵانی دواتر کـاتێک ئەو ساتەی بیر دەکـەوتەوە، ئەم ڕستـەیەی بۆ قـسـەکەی زیاد دەکرد: "لە ڕێی گەشتمدا بۆ قارس، هەمیشە بیرم لە دایکم دەکردەوە."

"چی شتێکی دایکت؟"

"ئەوەی کـە شـەوێک لە پەنجـەرەکـەوە سـەیری بـەفـرم دەکـرد و ئەویش دەسـتی بە قژمدا دەهێنا."

"ئایا بە منداڵی کامەران بوویت؟"

"کاتێک مرۆڤ کامەران بوو ئیدی هەست بەکامەرانیی خۆی ناکات. دوای ساڵانێکی درێژ گەیشتمە ئەو باوەڕەی لە منداڵیمدا بەختەوەر بووم: لەڕاستیدا بەختەوەر نەبووم، بەڵام وەکو ساڵانی دواتری تەمەنیشم بەدبەخت نەبووم. لە منداڵیمدا بایەخم بە کامەرانبوونم نەدەدا."

"کەی دەستت کرد بە بایەخ پێدانی؟"

(کا) ویستی بڵێ : "هیچ کاتێک"، بەڵام هەم ڕاست نەبوو و هەم زۆریش بەخۆ باوەڕبوون بوو. سەرباری ئەوەیش لەپڕ بە خەیاڵیدا هات وا بڵێ و بەوجۆرە کاریگەری لەسەر ئیپەک دابنێ، بەڵام ئەوەی ئێستا لە ئیپەک چاوەڕێی دەکرد، شتێک بوو زۆر قوڵتر لە کاریگەربوون. (کا) گوتی: "کاتێک بەدبەختی هیچی لێ سەوز نەبوو، دەستم کرد بەبیرکردنەوە لە بەختەوەری."

لە خۆی پرسی ئایا باشی کرد ئەمەی گوت؟ بێدەنگییەکەی ئیپەک هەراسانی کردبوو. ئایا چۆن دەیتوانی باسی تەنیایی و نەداریی خۆی لە فرانکفورت بکات و ئیپەک قایل بکات لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ئەوێ؟ لە دەرەوە بایەکی تووڕە هەڵی کرد و کلووە بەفرەکانی تەخشان و پەخشان دەکرد. (کا) هەستی بەو بێ ئۆقرەییە کرد کە لە کاتی هەستانیدا لە ناو جێگاکەیدا تووشی بووبوو، ئێستا زیاتر هەستی بەو ئازاری ئەڤین و چاوەڕوانبوون کە سکی دەهێنایە ئێش. پێش کەمێک هێندە بەختەوەر بوو، ئێستا بیرکرنەوە لە لە دەستدانی ئەم بەختەوەرییە، هۆشی لە سەردا نەهێشتبوو. ئەمەیش لە کامەرانییەوە دەیخستە گومانەوە. دەیویست لە ئیپەک بپرسێ: "لە تەکمدا دێی بۆ فرانکفورت؟"، بەڵام ترسی ئەوەی هەبوو ئەو وەڵامەی نەداتەوە کە ئەم دەیەوێ.

گەڕایەوە بۆ ناو جێیەکە، بەهەموو هێزی خۆی لە پشتەوە باوەشی بە ئیپەکدا کرد، گوتی: "دوکانێک هەیە لە دەرەوە پارچە موزیکێکی زۆر کۆنی (پەپینۆ دی کاپری)ی بەناوی (ڕۆبێرتا) لێ دەدا. ئەوەیان لە کوێ پەیدا کردووە؟"

ئیپەک گوتی: "چەندین بنەماڵەی کۆن لە قارسدا هەن کە هێشتا شاریان بەجێ



نەهێشتووە. لە ئاکامدا دایکان و باوکان دەمرن و منداڵان شتومەکەکان دەفرۆشن و شار بەجێ دەهێڵن. ئەوسا شتومەکی سەمەرەی ئەوتۆ کە لەگەڵ هەژاریی ئێستای شاردا ناگونجێن، دەکەونە بازاڕەوە. لە ڕابردوودا کۆنەفرۆشێک هەموو پایزانێک لە ئەستەمبوڵەوە دەهات و شتومەکە کۆنەکانی دەکڕی و لەگەڵ خۆیدا دەیبردنەوە. بەڵام ئێستا تەنانەت ئەویش نایات."

(کا) وای زانی ساتی بێوێنەی کامەرانییەکەی کەمێک لەمەوبەری دۆزیەوە، بەڵام ئیدی ئەمە هەمان هەست نەبوو. هەستی جارێکی تر ترسی نەدۆزینەوەی ئەو ساتە لە ناخیدا گەورە بووەوە و وەرگەڕایە سەر شپرزەیییەک کە هەموو شتێکی بەردەمی خۆی ڕادەماڵی: بە ترسەوە پەی پێ برد کە هەرگیز ناتوانێ ئیپەک قایل بکات لەگەڵیدا بڕوات بۆ فرانکفورت.

ئیپەک گوتی: "دەی گیانەکەم، من ئیدی دەبێ هەستم."

سەرباری ئەوەی ئیپەک پێی گوت "گیانەکەم" و لە هەستانیشدا ڕووی تێ کرد و ماچێکی شیرینی کرد، کەچی (کا) دانەساکا.

"جارێکی دی کەی بەیەک دەگەینەوە؟"

"غەمی باوکمە. بەدووری نازانم پۆلیس چاودێریی کردبن."

(کا) گوتی: "منیش غەمی ئەوانمە... بەڵام ئێستا دەمەوێ بزانم جارێکی دی کەی بەیەک دەگەینەوە."

"ئەگەر باوکم لە هوتێل بێ، من پێ نانێمە ئەم ژوورەوە."

(کا) گوتی: "بەڵام ئێستا هیچ شتێک وەکو جاران نییە." لەپڕ بە ترسەوە بیری کردەوە کە هیچ شتێک بەلای ئیپەکەوە کە لە تاریکاییەکەدا بە هونەرەوە جلەکانی لەبەر دەکردەوە، نەگۆڕاوە. گوتی: "من دەچمە هوتێلێکی تر و تۆیش یەکسەر وەرە بۆ لام."

بێدەنگییەکی کوشندە هاتە ئاراوە. شڵەژانێکی بارگاویکراو بە ئیرەیی پێبردن و بێچارەیی (کا)ی دایە بەر. بیری بۆ ئەوە چوو ئیپەک خۆشەویستێکی تری هەبێ. بەشێکی هۆشی ئەوەی دەهێنایەوە بیری کە لەوانەیە ئەم هەستە ئیرەیی پێبردنێکی

ئاساییی ئەڤینێکی بێ ئەزموون بێ، بەڵام هەستێکی زۆر بەهێز لە ناوەوە پێی دەگوت پێویستە بە هەموو گوڕ و تینی خۆی باوەش بە ئیپەکدا بکات و هەر لە ئێستاوە پەلاماری ئاستەنگە چاوەڕوانکراوەکانی نێوانیان بدات. پەی بەوە برد کە بەپەلەکردن بۆ زیاتر خۆ نزیکخستنەوە لە ئیپەک، خۆی دەخاتە دۆخێکی دژوارەوە، بۆیە بێ بڕیاردان بەبێدەنگی چاوەڕێی کرد.



# ٣١

## ئێمە دەبەنگ نین، ئێمە تەنیا هەژارین

### کۆبوونەوە نهێنییەکەی هوتێل ئاسیا

ئەو شتەی زاهیدە لە دوا چرکەدا گەیاندبوویە ئەو عەرەبانەیەی دوای ئەسپەی کە دەبوو تورگوت بەگ و قەدیفە بگەیەنێتە شوێنی کۆبوونەوە نهێنییەکەی هوتێل ئاسیا، جووتێک دەسکێشی خوریی کۆن بوو. (کا) لە کاتێکدا لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیدا بەدەم چاوەڕێکردنی ئیپەکەوە سەیری ئەم دیمەنەی کردبوو، لەو کاتەدا لە تاریکییەکەدا بۆی دەرنەکەوتبوو زاهیدە چی بە عەرەبانەکە گەیاندبوو. تورگوت بەگ، بۆ ئەوەی بڕیار بدات بۆ کۆبوونەوەکە چی بپۆشێ، دوو چاکەتی پاشماوەی سەردەمی مامۆستایی کە یەکێکیان ڕەش و ئەوی تریان خۆڵەمێشی بوو، کڵاوە چەرمەکەی کە لە جەژنەکانی کۆمار و پشکنینەکانی سەردەمی کاری قوتابخانەدا لەگەڵ خۆیدا دەیگەڕاند و کراڤاتە نەخشێنراوەکەی بە چوارگۆشەی بچووک کە ساڵانێک بوو کوڕەکەی زاهیدە تەنیا بۆ گەمەکردن لە ملی دەکرد، بەسەر جێگاکەیدا بڵاوکردبووەوە و ماوەیەکی درێژ سەیری جل و بەرگی ناو دۆڵابەکانی کردبوو. کاتێک قەدیفە بینیبووی باوکی سەری لێ شێواوە و وەکو ژنێکی تازە عاشقبوو نازانێ چی لەبەر بکات، خۆی دانەبەدانەی پۆشاکەکانی باوکیی هەڵبژاردبوو، بەدەستی خۆی دوگمەی کراسەکەی قایم کردبوو و چاکەت و پاڵتۆکەی لەبەر کردبوو. لە دوا ساتیشدا توانیبووی جووتێک دەسەوانەی سپیی لە چەرمی سەگ دروستکراو بکاتە دەستە بچووکەکانی باوکی. لەو ساتەدا تورگوت بەگ دەسکێشە خورییە کۆنەکانی بیرکەوتبووەوە و پێی لەسەر دۆزینەوەیان داگرتبوو. ئیپەک و قەدیفە سەیری ناو دۆڵاب و سندووقەکانیان کردبوو و بە شڵەژانەوە هەموو ناوماڵەکەیان دابوو بەسەر یەکدا، دوای دۆزینەوەیان بینینی کونی ئەسپێ تیایاندا، فڕێیان دابووە لاوە. تورگوت بەگ لە ناو عەرەبانەکەدا ورکی گرتبوو و گوتبووی: "بێ

ئەوانە نارۆم." وەکو خۆی گێرابوویەوە، چەندین ساڵ لەمەوبەر لە پای چەپایەتی دەکەوێتە زیندانەوە، ژنە خودالێخۆشبووەکەی ئەم جووتە دەسەوانە خوورییەی بۆ چنیووە و بۆی هێناوە بۆ زیندان. قەدیفە کە لە خۆی باشتر ئاکاری باوکی دەناسی، دەسبەجێ تێ گەیشتبوو زیاتر ترس لە پشت ئەم داخوازەوەیە، نەک پابەندبوون بە بیرەوەرییەکانەوە. دوای گەیشتنی دەسەوانەکان، عەرەبانەکە بەژێر بەفرەکەدا کەوتبووە ڕێ، قەدیفە وەکو ئەوەی یەکەمجاری بێ گوێ بۆ بیرەوەرییەکانی باوکی لە زیندان ڕابگرێ (هەڵڕشتنی فرمێسک لەگەڵ گەیشتنی نامەکانی ژنەکەیدا، خۆبەخۆ فێربوونی زمانی فەڕەنسی، لە دەستکردنی ئەم دەستکێشانە لە شەوانی زستاندا و خەوتن پێیانەوە)، بە چاوی داچەقاوەوە گوێی گرتبوو و گوتبووی: "باوکە گیان، ئێوە مرۆڤێکی زۆر چاونەترسن." تورگوت بەگ وەکو هەموو جارێک کە لە کچەکانیەوە گوێی لەم قسانە دەبوو (لەم ساڵانەی دواییدا کەمتر دەیبیست)، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک و باوەشی بە کچەکەیدا کرد و بەدەم لەرزینەوە ماچی کرد. لەو کوچانەی کە تازە عەرەبانەکە پێی گەیشت، کارەبا نەبڕابوو.

دوای ئەوەی لە عەرەبانەکە دابەزین، تورگوت بەگ گوتی: "لێرە کام دوکانانە کراونەتەوە، ڕاوەستە با سەیرێکی ئەم جامخانانە بکەم." قەدیفە لەبەرئەوەی دەیزانی باوکی بۆ دواوە هەنگاو دەنێ، هیچ پەلەی لێ نەکرد. تورگوت بەگ داوای کردبوو لە چایخانەیەک چایەکی زیرفۆن بخواتەوە، گوتیشی ئەگەر هەواڵدزیان بەدواوە بێ، ئەوا ئەمان دەتوانن بەم کارەیان سەری لێ بشێوێنن. چوونە چایخانەیەکەوە و چاویان بڕیە دیمەنی ڕاوەدوونان لە تەلەفزیۆندا و بەکپی دانیشتن. لە هاتنە دەرەوەیاندا تورگوت بەگ کەونە سەرتاشەکەی خۆی بینی و هەمدیسان دانیشتنەوە. تورگوت بەگ وا خۆی نیشان دا وەکو ئەوەی گوێی بۆ سەرتاشە قەڵەوەکە گرتبێ، هەمان کات چرپاندی بە گوێی کچەکەیدا و گوتی: "ئایا دوا نەکەوتووین، عەیبدار نابین ئەگە هەر نەچین؟" کاتێک قەدیفە چووە بن دەستی، ئەم بۆ حەوشەی پشتەوە نەچوو، بەڵکو چووە دوکانێکی پەڕاوفرۆشی و لەسەرخۆ پێنووسێکی شینی تۆخی هەڵبژارد. کاتێک لە دەرگای دوکانی ئەرسین ئەلەکتریکەوە چوونە حەوشەی پشتەوە و ڕوویان لە دەرگای دواوەی هوتێل ئاسیا کرد، قەدیفە بینی وا باوکی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە.



دەروازەی پشتەوەی هوتێلەکە بێدەنگ بوو، باوک و کچ زیاتر خۆیان بەیەکەوە نووساند و کەوتنە چاوەڕێکردن. کەس بەدوایانەوە نەبوو. دوای چەند هەنگاوێک هێندە تاریک داهات، بەجۆرێک قەدیفە بە دەست پیاخشاندن پلیکانەکانی هۆڵی پێشوازیی دۆزیەوە. تورگوت بەگ گوتی: "قۆڵم بەرمەدە." هۆڵی پێشوازیی هوتێلەکە کە پەنجەرە بەرزەکانی بە پەردەی ئەستوور داپۆشراون، نیمچە تاریک بوو. تیشکێکی مردوو کە لە گڵۆپێکی کز و چڵکنی هۆڵی پێشوازییەکەوە دەردەچوو، زۆر بە دژواری دەموچاوی کارمەندە پەرپووت و ڕیش دەرهاتووەکەی هوتێلەکەی ڕووناک دەکردەوە. لە تاریکییەکەدا گوێیان لە دەنگی پێی یەک دوو کەسێک بوو کە بە هۆڵەکەدا هاتوچۆیان دەکرد یاخۆ بە پلیکانەکاندا دادەبەزین. زۆربەی ئەو کەسانە پۆلیسی سڤیل، قاچاخچیی ئاژەڵ و خەڵووز، یاخۆ ئەو کەسانە بوون کە لەو دیو سنوورەوە کرێکاری نایاساییان دەهێنا. هەشتا ساڵ لەمەوبەر بازرگانە ڕووسەکان و دواترێ ئەو تورکانەی کە بۆ بازرگانیکردن لەگەڵ ڕووسیادا لە ئەستەمبوڵەوە داهاتن، ئەو نەجیبزادانەی کە لە سنووری ئەرمەنستانەوە سیخوڕیان دەخزاندە ناو یەکێتیی سۆڤێتەوە و سیخوڕە دووسەرەکانی ئینگلیز لایان دەدایە ئەم هوتێلە. ئێستایش بووە بە جێی حەوانەوەی ئەو ژنانەی کە لە گورجستان و ئۆکرایناوە بۆ بازرگانیی جانتا و لەشفرۆشی دێنە تورکیا. پیاوانی گوندنشینی دەوروبەری قارس سەرەتا لەم هوتێلەدا ژووریان بۆ ئەم ژنانە بەکرێ دەگرت و دواتریش ژیانێکی نیمچە هاوسەرییان لەگەڵدا بەسەر دەبردن. کاتێکیش ئێواران دادەهات، پیاوەکان بەدواین مینیبووس بۆ گوندەکانیان دەگەڕانەوە، ژنەکانیش لە ژوورەکانیان دەهاتنە دەرێ و لە باڕە تاریکەکەی هوتێلەکەدا چا و کۆنیاکیان دەخواردەوە. کاتێک تورگوت بەگ و قەدیفە بەسەر پلیکانەکاندا کە لە سەردەمانی زوودا بە فەرشی سوور داپۆشرابوو، سەرکەوتن، ڕوویان بە ڕووی یەکێک لەو ژنە قژزەرد و ماندووانەدا تەقیەوە و تورگوت بەگ بە چرپە بە کچەکەی گوت: "هوتێلی گراند-یش لە لۆزان کە شوێنی حەوانەوەی عیسمەت ئوێنونو پاشا بوو، ئاوا کۆزمۆپۆلیتیک بوو." پێنووسەکەی دەرهێنا و گوتی: "منیش وەکو ئەوەی عیسمەت پاشا لە لۆزان کردی، بە پێنووسێکی تەواو نوێ واژۆ دەخەمە سەر ڕاگەیەندراوەکە." قەدیفە نەیزانی کە

ئایا باوکی بۆ پشوودان یاخۆ بۆ خۆ دواخستن ئاوا زوو زوو لەسەر پلیکانەکان ڕادەوەستێ. تورگوت بەگ لە بەردەم ژووری ٣٠٧دا گوتی: "واژۆ دەکەین و دەسبەجێ دەڕۆین."

ژوورەوە هێندە جەنجاڵ بوو، بەجۆرێک قەدیفە لە سەرەتادا وای بۆ چوو چووبنە ژوورێکی ترەوە. کاتێک بینی وا شینە لەگەڵ دوو چالاکڤانی ئیسلامیدا بە ڕووی ترشەوە لە بەردەم پەنجەرەکەدا دانیشتووە، دەستی باوکی گرت و لەوێ داینیشاند. سەرباری گڵۆپێکی ڕووتەڵەی بنمیچەکە و گڵۆپێکی ماسی ئاسای سەر مێزی نانخواردنەکە، ژوورەکە بەتەواوی ڕووناک نەبووبووەوە. لە چاوی ئەم ماسییەدا کە لەسەر کلکی خۆی ڕاوەستابوو و بە دەمی کراوەی گڵۆپێکی هەڵگرتبوو، مایکرۆفۆنێکی دەوڵەت دانرابوو.

فازیلیش لە ژوورەکەدا بوو؛ لەگەڵ بینینی قەدیفەدا هەستابووە سەرپێ، بەڵام لەگەڵ ئەوانی تردا کە بۆ ڕێزگرتن لە تورگوت بەگ هەستابوونە سەرپێ، دانەنیشتەوە. ساتێکی درێژ وەکو ئەوەی جادووی لێ کرابێ، بە شەیدابوونەوە سەیری کردبوو. هەندێک لەوانەی ناو ژوورەکە وایان زانیبوو قەدیفە شتێکی پێ دەڵێ، بەڵام قەدیفە هەر نەشیبینیبوو. سەرنجی چووە سەر ئەو گرژییەی کە لەپڕ لە نێوان شینە و باوکیدا هاتە ئاراوە.

شینە قایل بووبوو بەوەی ئەگەر ئەو کەسەی بەناوی نەتەوەپەرستانی کوردەوە واژۆ دەخاتە سەر ڕاگەیەندراوەکە بۆ بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاودا، کەسێکی ئەتایست بێ، ئەوا کاریگەریی زیاتری بۆ سەر ڕۆژئاوا دەبێ، بەڵام لاوێکی ڕەنگ زەرد و باریکەڵە کە بە هەزار دەردی سەر قایلیان کردبوو، لەگەڵ هاوڕێکانی کۆمەڵەکەیاندا لەسەر ناوەڕۆکی ڕاگەیەندراوە بیر و بۆچوونی جیاوازیان هەبوو. ئێستا هەرسێکیان پێکەوە بە گرژ و مۆنی دانیشتبوون و چاوەڕێی نۆرە قسەی خۆیان دەکرد. لاوانی بێکار و تووڕەی کورد کە هەموویان شەیدای گەریلا کوردەکانی سەر چیاکان بوون، ماڵی ئەندامێکی ناوەندییان دەکردە بارەگای خۆیان و تیایدا کۆ دەبوونەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم کۆمەڵانە ناوبەناو دادەخران و بەڕێوەبەرانی بەردەوام دەستگیر و دارکاری دەکران و دەخرانە ژێر ئەشکەنجەوە،



کارێکی زۆر دژوار بوو بتوانرێ لە دوای کودەتاکە بدۆزرێنەوە. گرفتێکی تر ئەوە بوو جەنگاوەرانی سەر چیاکان ئەم لاوانەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە لە ژوورە گەرمەکانی شاردا ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەن و خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی کۆماری تورکیادا گونجاندووە. تاوانبارکردنی کۆمەڵەکان بەوەی وەکو پێویست بەرئەندامی گەریلا بۆ شاخ نانێرن، ورەی ئەو ئەندامە کەمانەی کە هێشتا نەکەوتبوونە زیندان، بەتەواوی ڕووخاندبوو. دوو (سۆسیالیست)ی سەر بە نەوەی پێشووتر کە تەمەنیان لە سییەکاندا بوو، ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون. ئەمانە لە ڕێی لاوانی کۆمەڵە کوردییەکانەوە کە بۆ شانازی بەخۆکردن و بەدەستهێنانی ڕاوێژ و ڕێنمایی بابەتەکەیان لایان باس کردبوو، بیستبوویان بڕیار وایە ڕاگەیەندراوێک بدرێ بە چاپەمەنیی ئەڵمانیا. ئەم میلیتانە زوو پیربووانە جۆرێک لە شکست بە ڕووخساریانەوە دیاربوو، هۆیەکەیشی ئەوە بوو کە سۆسیالیستە چەک بەدەستەکان وەکو جاران لە قارسدا بەهێز نەبوون، بێ مۆڵەت و هاوکاریی گەریلا کوردەکان، چالاکیی وەکو گرتنی ڕێگا و بانەکان، پۆلیس کوشتن و دانانەوەی پاکەتی بۆمبڕێژکراویان بۆ ئەنجام نەدەدرا. گوتبوویان هێشتا ژمارەیەکی زۆر مارکسی لە ئەورووپا هەن و بێ بانگهێشتکردنیش بۆ کۆبوونەوەکە هاتبوون. یەکێک لە کۆنە سۆسیالیستەکان بە بێزارییەوە پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو، بەڵام هاوڕێ ڕووخسار خاوێن و ئارامەکەی تەنیشتی، بەهۆی ئەوەی کە دەبوو هەموو وردەکارییەکانی کۆبوونەوەکە بە داوودەزگاکانی دەوڵەت بگەیەنێ، هەستی بە پەشۆکان دەکرد. ئەمەی لە نیازخراپی نەبوو، بەڵکو بۆ ڕێگرتنی بوو لە ئازاردانی زیاد لە پێویستی ڕێکخراوەکەیان لە لایەن پۆلیسەوە. دەوڵەتی لەو چالاکییانە ئاگادار کردبووەوە کە ئەو لە ئاکامدا بە ناپێویستی زانیبوون و بێ بایەخ لە قەڵەمی دابوون. لەلایەکی دی، لە ناخی دڵە یاخیبووەکەیەوە شانازیی بە بەشداربوونی لەو چالاکییانەدا دەکرد و بە شانازییەوە باسی گوللەباران کردن، مرۆڤ ڕفاندن و لێدان، بۆمبانانەوە و ڕووداوەکانی کوشتنی دەگێڕایەوە.

سەرجەم ئامادەبووان هێندە دڵنیا بوون لەوەی کە پۆلیس گوێ لە گفتوگۆکانی ناو ژوورەکە دەگرێ و بەلایەنی کەمەوە چەند هەواڵدزێکی لە ناو ئاپۆرەکەدا چاندووە،

بەجۆرێک کەس ئامادە نەبوو بدوێ. ئەوانەیشی قسەیان دەکرد، لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەیان دەکرد و دەیانگوت بەفر هێشتا هەر دەبارێ، یاخۆ یەکدییان وشیار دەکردەوە و دەیانگوت: "جگەرەکانتان فڕێ مەدەنە سەر زەوی." ئەم بێدەنگییە درێژەی کێشا تا ئەو کاتەی پووری یەکێک لە لاوە کوردەکان کە سەرنجی هیچ کەسێکی لە ژوورەکەدا ڕانەکێشابوو، هەستایە سەرپێ و کەوتە گێڕانەوەی چۆنێتیی ونبوونی کوڕەکەی (ئێوارەیەک لە دەرگا دەدرێ، کوڕەکەی دەگرن و دەیبەن.) تورگوت بەگ بە نیوگوێ بەسەرهاتی ونبوونی ئەم لاوەی بیست و بۆی بەپەرۆش بوو. ڕفاندنی لاوانی کوردی لە نیوەی شەودا و کوشتنیانی بە کارێکی نامۆ دەزانی، بەڵام هەر لە خۆیەوە لەوە تووڕە بوو کە گوترا لاوەکە "بێتاوانە." قەدیفە دەستی باوکی گرت و هەوڵی دا ڕووخساری بێزار و گاڵتەجاڕی شینە بخوێنێتەوە. شینە بیری لەوە دەکردەوە تەڵەی بۆ نرابێتەوە، بەڵام لەوە نیگەران بوو ئەگەر هەستێ و بڕوا، ئەوا هەموو لە دژی قسە دەکەن، بۆیە بە نابەدڵی دانیشتبوو. دواترێ: ١. لاوێکی "ئیسلامی" کە لە تەنیشت فازیلەوە دانیشتبوو و دوای چەند مانگێک سەلمێندرابوو کە پێوەندیی بە تاوانی کوشتنی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەوە هەیە، هەوڵی دا بیسەلمێنێ کە سیخوڕێکی دەوڵەت ئەو تاوانەی ئەنجام داوە. ٢. شۆڕشگێڕان زانیاریی دوور و درێژیان سەبارەت بە مانگرتنی هاوڕێکانیان لە زیندان ڕاگەیاند. ٣. سێ لاوی سەر بە کۆمەڵە کوردییەکان، هەڕەشەی ئەوەیان کرد ئەگەر ڕاگەیەندراوەکە لە ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاودا بڵاونەبێتەوە، ئەوا ئەمان واژۆکانی خۆیان دەکێشنەوە و بەوردی و بە کەڵلەیەکی داگیرساوەوە دەقێکی دوور و درێژیان سەبارەت بە پایەی کولتوور و ئەدەبیاتی کوردی لە مێژووی جیهاندا خوێندەوە. کاتێک دایکی لاوە ونبووەکە پرسیاری ئەو "ڕۆژنامەنووسە ئەڵمانە"ی کرد کە دەیویست سکاڵانامەکەی خۆی بداتێ، قەدیفە هەستایە سەرپێ و بەدەنگێکی هێورکەرەوە گوتی (کا) لە قارسە و بۆیەش بەشدار نەبووە، تاکو (بێلایەنی)ی کۆبوونەوەکە نەکەوێتە ژێر پرسیارەوە. ئەوانەی لەوێ بوون، لەسەر ئەوە ڕانەهاتبوون ژنێک لە کۆبوونەوەیەکی سیاسیدا هەستێتە سەرپێ و بە بڕوا بەخۆبوونەوە قسە بکات؛ هەموویان بۆ ساتێک ڕێزیان بۆ دەربڕی. دایکی لاوە ونبووەکە باوەشی بە



قەدیفەدا کرد و دەستی بە گریان کرد. قەدیفە بەڵێنی دایێ ئەوپەڕی هەوڵ بدات کێشەکەی لە ڕۆژنامە ئەڵمانییەکەدا بڵاو بکرێتەوە و کاغەزێکی لێ وەرگرت کە ناوی کوڕەکەی لەسەر نووسرابوو.

ئەو میلیتانە چەپەی کە بەنیازی پاکەوە هەواڵی کۆبوونەوەکەی بە دەوڵەت دەگەیاند، لەو ساتەدا ڕەشنووسی یەکەمی ڕاگەیەندراوەکەی کە بەدەست لەسەر کاغەزێک نووسیبوویەوە، دەرهێنا و بە پۆزێکی سەیرەوە دەستی بە خوێندنەوەی کرد.

سەردێری ڕەشنووسەکە بەمجۆرە بوو: "ڕوونکردنەوەیەک سەبارەت بە ڕووداوەکانی قارس بۆ ڕای گشتیی ئەوروپا." لە دەسپێکدا هەمووان ئەمەیان پێ جوان بوو. فازیل دواتر هەستی ئەو کاتەی خۆی بە پێکەنینەوە بۆ (کا) گێڕابووەوە و گوتبووی: "بۆ یەکەمجار توانیم پێشبینی بکەم شارە بچووکەکەم دەچێتە مێژووی جیهانەوە!"، ئەم دەربڕینەش چووبووە ناو شیعرێکی (کا)وە بە ناوونیشانی (هەموو مرۆڤایەتی و ئەستێرەکان). شینە دژایەتیی خۆی بۆ سەردێری ڕەشنووسی ڕاگەیاندنەکە دەربڕی و گوتی: "ئێمە ڕووی بانگەواز لە ئەوروپا ناکەین. ئێمە ڕووی بانگەوازمان لە هەموو مرۆڤایەتی دەکەین. با هاوڕێیانمان لەوەدا نەکەونە هەڵەوە کە ئێمە دەتوانین ڕاگەیەندراوەکەمان لە قارس یاخۆ لە ئەستەمبوڵ نا، بەڵکو لە فرانکفورت بڵاو دەکەینەوە. ڕای گشتیی ئەوروپا دۆستی ئێمە نییە، دوژمنمانە. نەک لەبەرئەوەی ئێمە دوژمنی ئەوانین، بەڵکو ئەوان هەر لە خۆوە بە چاوی نزمەوە بۆ ئێمە دەڕوانن."

ئەو چەپەی کە ڕەشنووسی ڕاگەیەندراوەکەی نووسیبوو، گوتی کە سەرمایەدارانی ئەوروپا بە چاوی نزمەوە سەیرمان دەکەن نەک هەموو مرۆڤایەتی، هەژاران و کرێکاران برای ئێمەن، بەڵام هیچ کەسێک، تەنانەت هاوڕێ خاوەن ئەزموونەکەیشی، بڕوای بە قسەکانی نەکرد. یەکێک لە لاوە کوردەکان گوتی: "لە ئەوروپا هیچ کەسێک وەکو ئێمە هەژار نییە."

تورگوت بەگ پرسی: "کوڕم، ئایا ئێوە هیچ سەرتان لە ئەوروپا داوە؟"

"خۆم هێشتا هەلم بۆ نەڕەخساوە، بەڵام زاواکەم لە ئەڵمانیا کرێکاری دەکات."

هەندێک لە ئامادەبووان سووکە خەندەیەکیان بۆ کرد. تورگوت بەگ خۆی لەسەر کورسییەکەی ڕاست کردەوە و گوتی: "سەرباری ئەوەیش کە واتای زۆر شت دەگەیەنێ بەلای منەوە، بەڵام هەرگیز نەچووم بۆ ئەورووپا. ئەمە بۆ پێکەنین نییە. تکایە ئەوانەی ئەورووپایان بینیوە، با دەست بەرز بکەنەوە." هیچ کەسێک، بگرە شینەیش کە ساڵانێکی زۆری لە ئەڵمانیا بەسەر بردبوو، دەستی بەرز نەکردەوە.

تورگوت بەگ درێژەی دایێ و گوتی: "بەڵام هەمووومان دەزانین کە ئەورووپا چ واتایەک دەگەیەنێ. ئەورووپا لە داهاتوودا جێگای ئێمەیە لە ناو مرۆڤایەتیدا. بۆیە ئەگەر ئەم ڕێزدارە –ئاماژەی بۆ شینە کرد–، لەبری ئەورووپا مرۆڤایەتی دەڵێ، ئەوا دەتوانین سەردێڕی ڕاگەیەندراوەکەمان بەو شێوەیە بگۆڕین."

شینە بە زەردەخەنەوە گوتی: "ئەورووپا داهاتووی من نییە. من بیر لەوە ناکەمەوە بەدرێژایی ژیانم لاساییی ئەورووپاییگەل بکەمەوە و خۆم بە کەم بزانم لەبەرئەوەی لەوان ناچم."

تورگوت بەگ گوتی: "لەم وڵاتەدا، نەک بەتەنیا ئیسلامییەکان، بەڵکو کۆماریخوازەکانیش هەستی شانازییی نەتەوەییان هەیە... چی دەبێ ئەگەر لە جێی ئەورووپا بنووسرێ مرۆڤایەتی؟"

نووسەری ڕەشنووسەکە، سەردێڕی ڕاگەیەندراوەکەی وەها خوێندەوە: "ڕوونکردنەوە سەبارەت بە ڕووداوەکانی قارس بۆ مرۆڤایەتی." دواترێ گوتی: "زۆر قەبە دیارە."

لە جێی وشەی "مرۆڤایەتی" کە پێشنیاری تورگوت بەگ بوو، بیر لەوە کرایەوە وشەی "ڕۆژئاوا" بنوسرێ، بەڵام لاوە دەموچاو قنچکاوییەکەی تەنیشت شینە دژی ئەم پێشنیارە ڕاوەستا. یەکێک لە لاوە کوردەکان، دەنگ زیقنەکەیان، پێشنیاری کرد تەنیا "ڕوونکردنەوە" بەکار بهێنن و هەمووانیش ئەم پێشنیارەیان پەسەند کرد.

ڕەشنووسی ڕاگەیەندراوەکە، بە بەراورد لەگەڵ قەوارەی ڕووداوەکاندا، زۆر کورت بوو. ڕستەکانی سەرەتا باسی ئەوەی دەکرد لە کاتێکدا باوەڕی تەواو هەبووە کە



پاڵێوراوانی ئیسلامی و کورد هەڵبژاردنەکانی قارس دەبەنەوە، کودەتایەکی سەربازی (نمایش کراوە). هیچ کەسێک لاریی لەم ڕستانە نەبوو، تورگوت بەگ نەبێ کە دژیان وەستایەوە و گوتی: "ئەو شتەی لە ئەورووپا پێی دەڵێن ڕاپرسی، بەهیچ جۆرێک نابێ بە پێوانە بۆ هەڵبژاردنەکانی قارس، چونکە دەنگدەری ئێرە شەوێک بەر لە هەڵبژاردنەکان، بگرە سەر لە بەیانیی ئەو ڕۆژەی ڕوو لە مەڵبەندی هەڵبژاردن دەکات، بە ئاسانی ڕای خۆی دەگۆڕێ و دەنگ بە پارتەکەی بەرانبەر دەدات، بۆیە ناکرێ بگوترێ فلان کەس هەڵبژاردنەکان دەباتەوە."

میلیتانە چەپە هەواڵدەرەکەی کە ڕەشنووسی ڕاگەیەندراوەکەی ئامادە کردبوو، لە وەڵامدا گوتی: "هەموو کەسێک دەزانێ کودەتاکە بەر لە هەڵبژاردنەکان و دژ بە ئەنجامەکانی بەرپاکراوە."

تورگوت بەگ گوتی: "ئەمانە هەبن و نەبن، گرووپێکی شانۆیین و بەهۆی ئەوەی بەفر ڕێگا و بانەکانی گرتووە، هێندە سەرکەوتوو بوون. لە ماوەی چەند ڕۆژی داهاتوودا هەموو شتێک دەگەڕێتەوە دۆخی خۆی."

لاوێکی تر گوتی: "کە لە دژی کودەتاکە نین، ئەدی بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟"

ئەم بێڕێزییە لەو کەسەوە هات کە لە تەنیشت شینەوە دانیشتبوو و وەکو چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو، بەڵام نەزاندرا ئاخۆ بەر گوێی تورگوت بەگ کەوت یاخۆ نا. لە هەمان کاتدا قەدیفە هەستایە سەرپێ (هەر ئەو بوو کە لە کاتی قسەکردندا هەڵدەستایە سەرپێ و هیچ کەسێک، بگرە خۆیشی، سەرنجی لەم ڕەفتارە سەیرەی خۆی نەدابوو)، چاوەکانی لە تووڕەییدا دەدرەوشانەوە و گوتی کە باوکی لە پای بیر و بۆچوونی سیاسی، گرتن و زیندانی چەشتووە و هەموو کاتێکیش بەرەنگاری زۆردەستیی دەوڵەت بووەتەوە.

باوکی دەسبەجێ پاڵتۆکەی ڕاکێشا و دای نیشاند. دواترێ گوتی: "لە وەڵامی پرسیارەکەتاندا، من بۆیە هاتم بۆ ئەم کۆبوونەوەیە، بۆ ئەوەی بۆ ئەورووپاییەکانی بسەلمێنم لە تورکیاش مرۆڤی دیموکرات و هوشیار هەن."

کەسە ڕووخسار سوور هەڵگەڕاوەکە بە ڕیتمێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی: "ئەگەر

ڕۆژنامەیەکی گەورەی ئەڵمانی دوو دێری بۆم بڵاو بکردبایەوە، من یەکەم شت هەوڵی سەلماندنی ئەوەم نەدەدا." ویستی هەندێک شتی تریش بڵێ، بەڵام شینە قۆڵی گرت و هوشیاری کردەوە.

ئەوەندە بەس بوو بۆ ئەوەی تورگوت بەگ لە هاتنی بۆ ئەم کۆبوونەوەیە پەشیمان بێتەوە. هەر کە گەیشتبووە ئێرە، باوەڕی بە خۆی هێنابوو بچێتە دەرەوە. وەکو کەسێک کە سەری پڕ بێ لە شتی جیاوازتر، هەستایە سەرپێ و دوو سێ هەنگاوی نا بەرەو دەرگاکە، لەو ساتەدا نیگای چووە سەر بەفرەکەی شەقامی قەرەداغ و ڕووی لە پەنجەرەکە کرد. قەدیفەیش، وەکو ئەوەی باوکی بێ هاوکاریی ئەو نەتوانێ بڕوا بە ڕێوە، هەستا و خۆی خستە بن باڵی. باوک و کچ، وەکو دوو منداڵ کە بیانەوێ غەمەکانی خۆیان لە بیر بکەن، ساتێکی درێژ لە پەنجەرەکەوە سەیری عەرەبانەیەکی دوای ئەسپیان کرد کە بە شەقامەکەدا تێ دەپەڕی.

لاوە دەنگ زیقنەکەی سێ لاوەکەی کۆمەڵە کوردییەکان، پەرۆشیی خۆی بۆ ڕام نەکرا و ئەویش بەرەو ڕووی پەنجەرەکە ڕۆیشت، لەگەڵ باوک و کچەدا سەیری شەقامەکەی خوارەوەی کرد. ئاپۆڕەی ناو ژوورەکەیش بە نەزمێکی نیوە ڕێزلێنان و نیوە سەرسوڕمان سەیری ئەوانیان دەکرد. هەست بە بێ ئۆقرەیی و ترسی پەلاماردان دەکرا. لایەنەکان لە شپرزەییدا بە ماوەیەکی کورت لەسەر پاشماوەی ڕاگەیەندراوەکە ڕێککەوتن.

دەربڕینێک لە ڕاگەیەندراوەکەدا هاتبوو کە دەیگوت کودەتاکە لە لایەن سەرچڵێکی پشت ئەستوورەوە ئەنجام دراوە. شینە نارەزاییی لە دژی ئەمە دەربڕی. بەگومانەوە دژی چەند دەستەواژەیەکی گشتگیرتری دیکەیش ڕاوەستا کە لە جێی ئەوەی پێشوو پێشنیاز کرا، بیانوویشی ئەوە بوو ئەو دەستەواژانە بۆچوونێکی وا لای ڕۆژئاواییەکان دەخولقێنن وەکو ئەوەی لە سەرانسەری تورکیادا کودەتا کرابێ. بەوجۆرە لایەنەکان لەسەر دەستەواژەی (کودەتایەکی هەرێمی بە پشتیوانی ئانکارا) ڕێککەوتن. هەروەها بەشێکی کورت لە ڕاگەیەندراوەکە تەرخان کرا بۆ گێڕانەوەی هەواڵی ئەو لاوە کوردانەی کە لە شەوی کودەتاکە لە ماڵان براونەتە دەرێ و تیرۆر کراون، یاخۆ ئەو زۆرداری و ئەشکەنجەیەی دژ بە قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی



پێشنوێژ و وتارخوێن ئەنجام درابوو. دەستەواژەی (پەلامارێک بۆ سەر تەواوی جەماوەر)یشیان گۆڕی بۆ (پەلامارێک بۆ سەر جەماوەر و ورە و ئاینەکەی.) بەو گۆڕانەی کە لە دوا ڕستەدا کرابوو، ئیدی نەک تەنیا ڕای گشتیی ئەورووپا، بگرە داوا لە هەموو جیهان دەکرا دەوڵەتی کۆماری تورکیا سەرکۆنە بکات. تورگوت بەگ لە کاتی خوێندنەوەی ئەم بەشەدا سەیرێکی ناو چاوی شینەی کرد و بۆی دەرکەوت کابرا زۆر دڵخۆشە. لەبەر ئامادەبوونی لەو شوێنە، لە ناخەوە هەستی بە پەشیمانی کرد.

شینە گوتی: "ئەگەر کەس گلەییی نەماوە، با هەر ئێستا واژۆی بخەینە سەر، چونکە ڕێی تێ دەچێ لە هەر کاتێکدا بدرێ بەسەر ئەم کۆبوونەوەیەدا." هەموو تاویان دا بۆ ناوەڕاستی ژوورەکە بۆ ئەوەی تا زووە واژۆی خۆیان بخەنە سەر ڕاگەیەندراوەکە کە بەهۆی کەوانەدانان و لێ کەمکردنەوە و لێ زیاکردنەوە بەسەر یەکدا ئۆسکابوو. لە کاتێکدا چەند کەسێک کە کاری خۆیان تەواو کردبوو و لەوەدا بڕۆن، قەدیفە هاواری کرد: "ڕاوەستن، باوکم دەیەوێ چەند شتێک بڵێ!"

ئەمە دۆخەکەی زیاتر شێواند. شینە، لاوە ڕەنگ سوورەکەی ناردە لای دەرگاکە و ڕێی چوونە دەرەوەی لە ئامادەبووان گرت و گوتی: "کەس نەچێتە دەرەوە. با ئێستا گوێ لە ڕەخنەکانی تورگوت بەگ بگرین."

تورگوت بەگ گوتی: "ڕەخنەم نییە، بەڵام بەر لەوەی واژۆی خۆمی بخەمە سەر، شتێکم بەم لاوە گەرەکە." کەمێک بیری کردەوە. "ئەمەم هەر لەو ناوێ، بەڵکو لە هەموو ئامادەبووانی ئێرەم دەوێ. " ئاماژەی بۆ ئەو لاوە سوورهەڵگەڕاوە کرد کە پێش کەمێک یەکدییان بە گیر و گاز هێنابوو و ئێستایش بەری دەرگاکەی گرتبوو بۆ ئەوەی کەس لە ژوورەکە هەڵنەیات. "ئەگەر وەڵامی ئەو پرسیارەم نەدەنەوە کە سەرەتا لەم لاوە و دواتر لە هەمووتانی دەکەم، ئەوا واژۆی خۆم ناخەمە سەر ڕاگەیەندراوەکە. "ڕووی وەرگێڕا بۆ لای شینە بۆ ئەوەی بزانێ تێ گەیشتووە ئەم چەند لەسەر داواکەی خۆی سوورە.

شینە گوتی: "فەرموون، تکایە پرسیارەکەتان بکەن. ئەگەر وەڵامدانەوە لە دەستی ئێمەدا بێ، ئەوا بە خۆشحاڵییەوە وەڵام دەدەینەوە."

"گشتتان پێم پێ کەنین. ئێستا هەمووتان پێم بڵێن: ئەگەر ڕۆژنامەیەکی گەورەی ئەڵمانیا جێی دوو ڕستەی پێتان بدایە، چیتان بە ڕۆژئاواییگەل دەگوت؟ لە پێشدا ئەو بیڵێ."

لاوە سوور هەڵگەڕاوەکە بەهێز و بەتین بوو و خۆی لە قەرەی هەموو بابەتێک دەدا، بەڵام بۆ پرسیارێکی لەو جۆرە ئامادە نەبوو. بەدەم گوشینی دەسکی دەرگاکەوە سەیری شینەی کرد و بە نیگای چاوەکانی تکای هاوکاری لێ کرد.

شینە بە زۆر لێکردنەوە زەردەیەکی خستە سەر لێوی و گوتی: "تەنانەت ئەگەر دوو ڕستەیش بووە شتێک بڵێ و با بڕۆین، ئەگەر نا، ئەوا پۆلیس پەلاماری ئێرە دەدات."

لاوە سووور هەڵگەڕاوەکە وەکو ئەوەی بیەوێ لە تاقیکردنەوەیەکی زۆر گرنگدا وەڵامی پرسیارێکی بیر بکەوێتەوە کە زۆر دڵنیایە لە زانینی، نیگای دەهێنا و دەبرد.

شینە گوتی: "کەوابوو، با یەکەمین کەس من وەڵام بدەمەوە. ئەوروپاییگەل بەلای منەوە پۆخڵن... بۆ نموونە دەمتوانی پێیان بڵێم: بەسە، سێبەر بەسەر منەوە مەکەن... وەلێ ڕاستی ئەوەیە کە ئێمە لە سێبەری ئەواندا دەژین."

تورگوت بەگ گوتی: "کۆمەکی پێ مەکەن، با ئەوە بڵێ کە لە دڵی خۆیەوە هەڵدەقوڵێ. ئێوە لە دوای هەمووان قسە دەکەن." بزەیەکی کرد بۆ لاوە سوور هەڵگەڕاوەکە کە لە بێچارەییدا ماخۆلانی پێ کەوتبوو. "بڕیاردان هەروا ئاسان نییە، چونکە ئەمە مەسەلەیەکی دژوارە. پیاو ناتوانێ ئاوا لە پەنای دەرگادا چارەسەری بکات."

یەکێک لە دواوە گوتی: "ئەمە بیانووە، بیانوو! نایەوێ واژۆ بخاتە سەر ڕاگەیەندراوەکە."

هەرکەسە خۆی کێشایەوە بۆ ناو بیرکردنەوەکانی خۆی. چەند کەسێک ڕوویان لە پەنجەرەکە کرد و بە ڕامانەوە سەیری عەرەبانەیەکی دوای ئەسپیان کرد کە بە شەقامی قەرەداخی بە بەفر داپۆشراودا تێ دەپەڕی. کاتێک فازیل دواترێ باسی ئەم ساتە "بێدەنگییە ئەفسوناوی"یەی بۆ (کا) گێڕابووەوە، گوتبووی: "وام دەزانی هەمووومان لەو ساتەدا لە هەموو کاتێک زیاتر برای یەکین." سەرەتا، دەنگی



فڕۆکەیەک کە بەقوڵاییی ئاسمانی تاریکدا دەفڕێ، زنجیری بێدەنگییەکەی پساندبوو. لە کاتێکدا هەمووان بەوردی گوێیان بۆ دەنگی فڕۆکەکە ڕاگرتبوو، شینە بە چرپە گوتی: "ئەمە فڕۆکەی دووەمە لە ئەمڕۆدا."

یەکێک هاواری کرد و گوتی: "من دەڕۆمە دەرێ."

ئەمە پیاوێکی ڕەنگ سیس و چاکەت زەرد بوو کە تەمەنی لە نێوان سی بۆ چل ساڵاندا بوو و پێشتر سەرنجی کەسی بۆ سەر خۆی ڕانەکێشابوو. یەکێک بوو لەو سێ کەسەی خاوەن کار کە لە ژوورەکەدا بوون. چێشت لێنەری نەخۆشخانەی میللی بوو و هەر جارنەجارێک سەیری سەعاتەکەی دەکرد. لەگەڵ خێزانی ونبووەکاندا هاتبووە ژوورێ. بەگوێرەی گێڕانەوەکانی دواتر، برا گەورەکەی کە مەیلی سیاسەتی هەبووە، شەوێک بەمەبەستی وەرگرتنی قسەکانی، براوە بۆ پۆلیسخانە و ئیدی لەو ساتەوە بێ سەر و شوێنە. هەر بەپێی گێڕانەوەکان، ئەم پیاوە بۆ ئەوەی بتوانێ براژنە شۆخەکەی بخوازێ، داوای گەواهینامەی مردنی کاکی لە دەوڵەت کردبوو. دوای ساڵێک لە بێسەر و شوێنکردنی برا گەورەکەی، چەندین جار بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش، دەزگای هەواڵگریی میللی، داواکاری گشتی و یانە سەربازییەکانی بەسەر کردبووە، بەڵام لە هەموو ئەو شوێنانە دەست بە ڕوویەوە نرابوو، بۆیە پێش دوو مانگ پێوەندیی بە خێزانی بێسەر و شوێنکراوانەوە کردبوو. ئەمەیشی لەبەر تۆڵەسەندنەوە نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی بوو تەنیا لەگەڵ ئەواندا دەیتوانی باسی کێشەکەی بکات.

کابرا گوتی: "لە پاشملە پێم دەڵێن ترسنۆک. ترسنۆک خۆتانن. ترسنۆک ئەوروپاییەکانی ئێوەن. بنووسن کە وام پێیان گوتووە." ئەمەی گوت و مستێکی بە دەرگاکەدا کێشا و ڕۆیشت.

لەو کاتەدا پرسیاری ئەوە کرا کە ڕێزدار هانز هانزن کێیە؟ بە پێچەوانەی ئەوەی قەدیفە لێی دەترسا، شینە ئەمجارە بە زمانێکی زۆر ناسک گوتی ئەو ڕێزدارە ڕۆژنامەنووسێکی نیازپاکی ئەڵمانە کە لە ناخەوە گرنگی بە (کێشەکان)ی تورکیا دەدات."

یەکێک لە دواوە گوتی: "لە ڕاستیدا پێویستە مرۆڤ لە نیازپاکانیی ئەڵمانیگەل

بترسێ."

کابرایەکی چاکەت ڕەش کە پاڵی بە پەنجەرەکەوە دابوو، پرسیاری ئەوەی کرد گەلۆ جگە لە ڕاگەیەندراوەکە، لێدوانی تایبەتیش بڵاودەکرێتەوە؟

قەدیفە گوتی: "دەکرێ."

یەکێکی تریان گوتی: "هاوڕێیان، با بۆ قسەکردن وەکو منداڵانی ترسنۆکی قوتابخانەی سەرەتایی چاوەڕێی یەکتری نەکەین."

لاوێکی تری سەر بە کۆمەڵە کوردییەکان دەستی بە ئاخاوتن کرد و گوتی: "من لە قۆناغی ئامادەیی دەخوێنم. ئەو شتانەی دەیانڵێم، پێشتریش بیرم لێ کردوونەتەوە."

"ئایا بیرتان لەوە کردبووەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان لێدوانێک دەدەن بە ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانی؟"

لاوە خوێن گەرمەکە بە دەنگێکی تا بڵێی ماقوڵەوە گوتی: "بەڵێ، چۆنی دەڵێم ئاوایە." بەڵام ڕەهەندێکی زۆر مەندیشی هەبوو. "منیش وەکو ئێوە لە ناخی خۆمدا بیرم لەوە کردبووەوە ڕۆژێک هەڵێکم بۆ دەرەخسێ بۆ ڕاگەیاندنی بۆچوونی خۆم بە هەموو جیهان."

"من هەرگیز بیر لە شتی وا ناکەمەوە..."

لاوە مەندەکە گوتی: "ئەوەی من دەیڵێم، شتێکی زۆر سادەیە. با ڕۆژنامەکەی فرانکفورت ئەمە بنووسێ: ئێمە دەبەنگ نین! ئێمە تەنیا هەژارین! مافی خۆمانە داوای ئەم جیاکردنەوەیە بکەین."

"ئەستەغفیروڵا."

یەکێک لە دواوە پرسی: "ئەفەندی گیان، مەبەستت لە -ئێمە- کێیە؟ مەبەستت تورکە، کوردە، خۆجێییەکانە، تەرەکەمەیە، ئازەرییە، چەرکەزە، تورکمانە، قارسییەکانە، مەبەستت کێیە؟"

لاوە مەندەکەی سەر بە کۆمەڵە کوردییەکان درێژەی دایێ و گوتی: "چونکە ئەمە گەورەترین هەڵەی مرۆڤە. ئەمە گەورەترین ڕەنجەڕۆیی هەزاران ساڵەمانە: هەمیشە



هەژاری و دەبەنگی پێکەوە گرێ دراون."

"دەبەنگی چییە؟ با ئەمەیش ڕوون بکاتەوە."

"لە مێژووی پڕ سەروەریی مرۆڤایەتیدا هەمیشە پیاوانی ئاین و کەسانی بەڕەوشت هەبوون کە هەستیان بەم عەقڵ تێکدانە شەرم بەشخە کردووە و گوتویانە هەژارانیش زانیاری، مرۆڤایەتی، زیرەکی و دڵیان هەیە. ڕێزدار هانز هانزن ئەگەر کەسێکی هەژار ببینێ، بەزەیی پێدا دێتەوە. لەوانەیە یەکسەر بیری بۆ ئەوە نەچێ ئەو هەژارە دەبەنگێکە کە هەموو هەڵەکانی ژیانی خۆی لە دەست داوە یاخۆ سەرخۆشێکی بێ دەسەڵاتە."

"بۆ ڕێزدار هانزن نازانم، بەڵام ئیدی هەرکەسێک هەژارێک ببینێ، هەروا بیر دەکاتەوە."

لاوە کوردە مەندەکە گوتی: "تکایە گوێ بگرن. زۆر قسە ناکەم. لەوانەیە بەزەیی بە تاک و تەرای هەژاراندا بێتەوە، بەڵام میللەتێک هەر هەمووی هەژار بێت، ئەوا هەموو جیهان بەر لە هەموو شتێک بیری بۆ ئەوە دەچێ کە ئەو میللەتە دەبەنگ، بێ مێشک، تەمەڵ، پیس و بێ توانایە. لە بری بەزەیی پێداهاتنەوە، پێی پێ دەکەنێ. کلتور و داب و نەریتەکانی بە مایەی پێکەنین دەزانێ. دواتر لەوانەیە شەرم لە بۆچوونەکانی خۆیان بکەن و دەست لە پێکەنین هەڵبگرن، ئەوسا ئەگەر کۆچبەرانی سەر بەو میللەتە زەویان بۆ بسڕێ و لە بەربادترین شوێندا کاریان بۆ بکات، ئەوا لەوانەیە ئەو کولتوورە بە سەرنجڕاکێش دابنێ و بگرە وا هەڵسوکەوتیش بکات وەکو ئەوەی یەکسان بێت بە کولتوورەکانی تر."

"ئەرێ با بڵێ باسی چ میللەتێک دەکات."

لاوە کوردەکەی تر خۆی تێ هەڵقورتاند و گوتی: "با منیش ئەمەی بۆ زیاد بکەم. جێگای داخە مرۆڤایەتی چیدی بەوانە پێ ناکەنێ کە یەکدی دەکوژن و زۆر لە یەکتر دەکەن. ئەم زانیارییانەم لە زاواکەمەوە وەرگرتووە کە هاوینی ڕابردوو بۆ قارس گەڕابووەوە. جیهان چیدی تۆلەرانسی نییە لە بەرانبەر میللەتانی زۆرداردا."

"مەبەستتان وایە بە ناوی ڕۆژئاواییەکانەوە هەڕەشەمان لێ بکەن؟"

لاوە کوردە مەندەکە لە وەڵامدا گوتی: "بەوجۆرە، ئەگەر ڕۆژئاواییییەک تووشی ببێ بە تووشی تاکی میللەتێکی هەژارەوە، ئەوا بە غەریزە و بەر لە هەموو شتێک بە چاوی سووک تەماشای دەکات، دەسبەجێ بیری بۆ ئەوە دەچێ ئەم تاکە بۆیە وا هەژارە چونکە سەر بە میللەتێکی دەبەنگە. بە ئەگەری زۆر، ڕۆژئاواییییەکە بیر لەوە دەکاتەوە سەری ئەم کابرایە پڕە لەو تورەهات و دەبەنگییانەی کە بووەتە هۆی هەژاربوون و بەلەنگازبوونی میللەتەکەی."

"زۆریش ناهەقی نییە..."

"ئەگەر تۆیش وەکو ئەو نووسەرە لە خۆباییییە بە دەبەنگمان دەزانی، بیڵێ با بیزانین. هەر هیچ نەبێ ئەو ئەتایستە خودانەناسە بەر لەوەی بمرێ و بە دۆزەخ شاد بێ، لە وەشانی ڕاستەوخۆی تەلەفزیۆندا سەیری ناو چاومانی کردبوو و چاونەترسانە گوتبووی هەموو میللەتی تورک بە دەبەنگ دەزانێ."

"بمبەخشن توخوا، ئەو کەسەی کە لە وەشانی زیندووی تەلەفزیۆندا قسە دەکات، ناو چاوی ئەو بینەرانە نابینێ کە لەو کاتەدا تەماشای دەکەن."

قەدیفە گوتی: "ئەو ڕێزدارە نەیگوت –بینیویتی–، بەڵکو گوتی –سەیری دەکرد–."

بەشدارە چەپەکە کە ڕەوتی کۆبوونەوەکەی تۆمار دەکرد، گوتی: "تکا هاوڕێیان با بەجۆرێک بەرامبەر بەیەک قسە نەکەین وەکو ئەوەی لە دانیشتنێکی کراوەدا بین، جگە لەوەیش، با کەمێک لەسەرخۆ بدوێین."

"ئەگەر پیاوانە پێمان نەڵێ مەبەستی کام میللەتە بوو، من بێ دەنگ نابم. دەبێ بزانین دانی لێدوانێک بە ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانی کە ببێتە هۆی بە کەم سەیرکردنمان، ناپاکیکردنە لە نیشتمان."

لاوە کوردە مەندەکە هەستایە سەرپێ و گوتی: "من ناپاکی لە نیشتمان ناکەم، منیش لەگەڵ ئێوەدا هاوبیرم. بۆیە دەمەوێ بنووسن تەنانەت ئەگەر ڕۆژێک هەلیشم بۆ ڕێک بکەوێ و ڤیزایش وەربگرم، ناچم بۆ ئەڵمانیا."

"کەس ڤیزای ئەوروپا بە کەسێکی بێکار و بێتوانای وەکو تۆ نادات."

" ڤیزا بە جارێک بخەرە لاوە، چونکە دەوڵەت پاسەپۆرتی ناداتێ."



لاوە کوردە مەندەکە بە شێوەیەکی بێ فیزانە گوتی: "بەڵێ نایدەن، بەڵام ئەگەر بیدەن و بڕۆم، یەکەم ڕۆژئاواییی کە لەسەر شەقام دەیبینم، تەنانەت کەسێکی باش بێ و بە چاوی سووکەوە بۆم نەڕوانێ، ئەوا من وای بۆ دەچم کە ئەو کابرایە تەنیا لەبەرئەوەی کە ڕۆژئاواییییە، بە چاوی سووک سەیرم دەکات و ئەمەیش گینگڵم پێ دەدات. چوون لە ئەڵمانیا، ئەو کەسانەی لە تورکیاوە دێن، یەکسەر پێیانەوە دیارە لە کوێوە هاتوون... ئەو کاتە تاقە شتێک بیکەی بۆ ئەوەی بە بچووک نەزاندرێی، ئەوەیە بۆیان بسەلمێنی تۆیش وەکو ئەوان بیر دەکەیتەوە. ئەمەیش کارێکی لە کردن نەهاتووە و هەستی شانازیی مرۆڤ بریندار دەکات."

ڕۆژنامەنووسێکی بەتەمەنی ئازەری گوتی: "کوڕم، سەرەتای قسەکانت خراپ بوون، بەڵام باش کۆتاییت پێ هێنان. سەرباری ئەوەیش با بۆ ڕۆژنامە ئەڵمانییەکەی نەنووسین، چونکە گاڵتەمان پێ دەکەن..." کەمێک بێدەنگ بوو، دواترێ پرسیارێکی فێڵبازانەی کرد: "ئەو میللەتە کامەیە کە باستان کرد؟"

کاتێک لاوە خوێن گەرمەکەی سەر بە کۆمەڵە کوردییەکان وەڵامی نەدایەوە و لە شوێنی خۆی دانیشتەوە، ڕۆژنامەنووسە بەتەمەنەکە بەچرپە بە کوڕەکەی خۆی کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، گوت: "دەترسێ!"

هەندێک لە وەڵامدا گوتیان: "مافی خۆیەتی بترسێ، چونکە ئەو وەکو ئێوە بۆ حسابی دەوڵەت کار ناکات." بەڵام نە ڕۆژنامەنووسە بەتەمەنەکە و نە کوڕەکەی، لە قسەکان تێ نەگەیشتن. هەموو بە جارێک قسەیان دەکرد، جاروبار شۆخییان دەکرد و لاقرتەیان لە یەکدی دەگرت، ئەمەیش وای کردبوو کەشێکی گەمە و سەفائامێز ئەوانەی ناو ژوورەکە پێکەوە ببەستێتەوە. (کا) کە دواترێ باسی ڕووداوەکانی لە فازیلەوە بیستبوو، لە دەفتەرەکەیدا نووسیبووی ئەم جۆرە کۆبوونەوە سیاسییانە بۆیان هەیە چەندین سەعات درێژە بکێشن، تاقە مەرجیش سەفاکردنی پیاوانی جگەرەکێشی برۆ برژ و سمێڵ بابرە بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن.

لاوێکی ئیسلامی بە لە خۆباییبوونەوە گوتی: "ئێمە ناتوانین ببین بە ئەوروپایی! ئەوانەی دەیانەوێ بمانخەنە دڵی ئەوروپاییگەلەوە، مەگەر هەر بە تانک و تفەنگ و بە ئازاردانمان ئەمەیان بۆ مەیسەر بێ، بەڵام هەرگیز ڕۆحی خۆمان ناگۆڕین."

یەکێک لە لاوە کوردەکان بەدەنگێکەوە کە لاساییکردنەوەی فیلمە تورکییەکانی پێوە دیار بوو، گوتی: "لەوانەیە بتوانن دەست بەسەر جەستەمدا بگرن، بەڵام هەرگیز ناتوانن ڕۆحم ڕام بکەن."

هەموو بەمە پێکەنین. لاوەکە خۆیشی گەشبینانە لە پێکەنینەکەدا بەشداریی کرد.

یەکێک لە لاوەکانی تەنیشت شینە گوتی: "منیش شتێک دەڵێم. هەرچەندە برایانمان بەشێوەی ئەو بێ ئابڕووانە قسە ناکەن کە لاساییی ڕۆژئاوا دەکەنەوە، کەچی هەست دەکرێ لە پای ئەوروپایینەبوونمان کەشی داوای پۆزش و لێبووردن باڵی بەسەر ئەم شوێنەدا کێشاوە."ڕووی لە کابرای نووسەرەوەی ڕەوتی کۆبوونەوەکە کرد کە چاکەتێکی چەرمی لەبەردا بوو. بەڕێزەوە گوتی: "گیانەکەم، تکایە ئەوانەی پێشووترم مەنووسە. ئێستا بنووسە: من شانازی بەو لایەنەی خۆمەوە دەکەم کە ئەوروپایی نیم. من شانازی بە هەموو ئەو شتانەی خۆمەوە دەکەم کە ئەوروپاییگەل بە منداڵانە و زۆردار و پاشکەوتووی دەزانن. ئەگەر ئەوان جوان بن، من ناشیرین دەبم، خۆ ئەگەر ژیر بن، من دەبەنگ دەبم، ئەگەر ئەوان هاوچەرخ بن، من بەسادەییی خۆمەوە دەمێنمەوە."

کەس بایەخی بەم قسانە نەدا. لەبەرئەوەی هەر قسەیەک لە ژوورەکەدا بە لاقرتەیەک وەڵام دەدرایەوە، کەمێک پێکەنین بیسترا. یەکێکیش قسەیەکی هاویشت و گوتی: "جا تۆ خۆت هەر دەبەنگی!"، بەڵام لەبەرئەوەی ڕێک لەو کاتەدا چەپە بەتەمەنەکە و کابرای چاکەت ڕەش تووشی کۆکینێکی سەخت بوون، نەزاندرا کێ بوو ئەو قسەیەی کرد.

لاوە خوێن گەرم و دەموچاو سوور هەڵگەڕاوەکەی ناو دەرگاکە، لەو کاتەدا هەڵی دایێ و دەستی بە شیعر خوێندنەوە کرد. سەرەتای شیعرەکە ئەمە بوو: "ئەوروپا، ئاخ ئەوروپا / ڕاوەستە لەوێ با بتبینم / لە خەونەکانی خۆماندا / با ئیبلیس فریومان نەدا." فازیل، بەهۆی کۆکین و لاقرتە تێگرتن و قاقا لێدانەوە، بە هەزار حاڵ توانیبووی گوێ لە پاشماوەی شیعرەکە بگرێ. دواترێ نەیتوانیبوو هەموو شیعرەکە بە (کا) بگەیەنێ، بەڵام هەموو کاردانەوەکانی دژ بە شیعرەکەی بۆ باس کردبوو. سێ لەو کاردانەوانە هەم وەکو وەڵام بۆ ئەوروپا بە دوو دێر لەسەر کاغەزێک نووسرانەوە



و هەم چووبوونە شیعرێکی (کا)وە کە دواتر نووسیبووی و ناوی لێ نابوو (هەموو مرۆڤایەتی و ئەستێرەکان).

١- کۆنە چەپە تەمەن ناوەندییەکە هاواری کردبوو و گوتبووی: "با لەوێ نەترسین، هیچ شتێک لەوێ نییە مایەی ترس بێت."

٢- ڕۆژنامەنووسە پیر و بە ڕەچەڵەک ئازەرییەکە کە هەر جارناجارێک دەیپرسی "مەبەستتان کام میللەتە"، دوای گوتنی: "با دەسبەرداری تورکایەتی و ئاینەکەمان نەبین"، وتەیەکی درێژی سەبارەت بە هەڵمەتی خاچپەرستان، کۆمەڵکوژیی جووەکان، کوشتنی چەرمسوورەکان لە ئەمەریکا و کوژرانی مسوڵمانانی جەزایەر لەسەر دەستی فەرەنسییەکان پێشکەش کرد. لەو کاتەدا گێرەشێوێنێک لە ناو ئاپۆڕەی ئامادەبووانەوە لە ژێرەوە پرسیبووی "کوان ئەو چەند ملیۆن ئەرمەنییەی قارس و سەرانسەری ئەنادۆڵ؟" کابرای هەواڵدزی نووسەرەوەی ڕەوتی کۆبوونەوەکە، لەبەرئەوەی بەزەیی بە کابرادا هاتەوە، ناوەکەی تۆمار نەکرد.

٣- یەکێکیان گوتی: "هیچ کەسێک ئەم شیعرە درێژە و بێ ناوەڕۆکەی وەکو خۆی بۆ وەرناگێڕدرێ. ڕێزدار هانز هانزنیش لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا بڵاوی ناکاتەوە." ئەمەیش ڕێی بۆ شاعیرانی ناو ژوورەکە (ژمارەیان سیان بوو) خۆش کرد بۆ ئەوەی گازندەی خۆیان لەدژی تەنیایی و بێچارەییی شاعیری تورک لە جیهاندا دەرببڕن.

کاتێک لاوە سوور هەڵگەڕاوەکە خوێندنەوەی شیعرەکەی کە هەمووان سەبارەت بە تووڕەهاتی و سەرەتاییبوونەکەی هاوبیر بوون، بەدەم عەرەق ڕشتنەوە تەواو کرد، چەند کەسێک وەکو ئەوەی گاڵتەی پێ بکەن، چەپڵەیان بۆ لێ دا. هەندێک لە ئامادەبووان دەیانگوت ئەگەر بێت و ئەم شیعرە لە ڕۆژنامە ئەڵمانییەکەدا چاپ بکرێ، ئەوا زیاتر (پێمان) ڕادەبوێرن. لاوە کوردەکەی کە زاواکەی لە ئەڵمانیایە، دەنگی ناڕەزاییی بەرز کردەوە و گوتی: "ئەوان کاتێک شیعر دەنووسن و گۆرانی دەڵێن، بەناوی هەموو مرۆڤایەتییەوە دێنە گۆ. ئەوان مرۆڤن، ئێمەیش تەنیا مسوڵمانین. ئەگەر ئێمە شیعر بنووسین، شیعری ئەتنیکی دەردەچێ."

کابرای چاکەت ڕەش گوتی: "پەیامی من ئەمەیە، بنووسن: ئەگەر ئەوروپاییگەل لەسەر مافن و ئێمە جگە لە لاساییکردنەوەی ئەوان داهاتوویەکی تر و ڕزگاربوونێکی ترمان نییە، ئەوا سەرقاڵبوونمان بە کاری توڕەهاتەوە بۆ ئەوەی زیاتر لە خۆمان بچین، بەفیڕۆدانێکی نەفامانەی کات نەبێ، هیچ شتێکی تر نییە."

"ئەمە ئەو قسەیەیە کە ئێمە بە دەبەنگترین شێوە دەخاتە بەر دیدی ئەوروپاییەکان."

"ئێستا ئیدی مەردی خودا بن و تکایە بڵێن ئەوە کام میللەتەیە کە ئەوەندە دەبەنگە."

"بەڕێزان، وا هەڵسوکەوت دەکەین وەکو ئەوەی کە زۆر لە ئەوروپاییگەل ژیرتر بین، بەڵام ئەگەر ئەڵمانیا ئەمڕۆ لە قارس کونسوڵخانەیەک بکاتەوە و بەخۆڕایی ڤیزا بدات، سوێندتان بۆ دەخۆم قارس لە یەک هەفتەدا چۆڵ دەبێ."

"ئەمە درۆیە. ئا ئەوەتا ئەو برادەرە پێش کەمێک گوتی ئەگەر ڤیزایشی بدەنێ، ناڕوات. منیش ناڕۆم، بە شەرەفی خۆمەوە لێرە دەمێنمەوە."

"بەڕێزان، خەڵکی تریش هەن کە بمێننەوە، با ئەمە ڕوون بێ لاتان. ئەوانەی نایانەوێ بڕۆن، تکایە با دەست بەرز بکەنەوە بۆ ئەوەی ببینرێن."

چەند کەسێک بە دەربەستەوە دەستیان هەڵبڕی. یەک دوو لاویش کە ئەمەیان دیبوو، تیا مابوون. کابرای چاکەت ڕەش پرسی: "بەر لە هەموو شتێک پێویستە ڕوون بکرێتەوە بۆچی ئەوانەی دەڕۆن، شەرەفی خۆیان دەدۆڕێنن؟"

یەکێکیان بە شێوازێکی پڕ لە ڕازەوە گوتی: "گێڕانەوەی ئەمە بۆ کەسانێک کە تێ ناگەن، کارێکی زۆر دژوارە."

لەو ساتەدا فازیل چاوی پێوە بوو چۆن قەدیفە نیگا غەمگینەکانی لە پەنجەرەکەوە ئاراستەی دەرەوە کردبوو. لێدانی دڵی زیادی کرد و لە خەیاڵی خۆیدا گوتی: "خودای خۆم، سادەییم بپارێزە، لە عەقڵ تێکچوون بەدوورم بگرە." وای بە خەیاڵدا هات قەدیفە ئەم وشانەی زۆر بە دڵ دەبێ. ویستی بۆ ڕۆژنامە ئەڵمانییەکە بنووسرێنەوە، بەڵام لە هەر سەرێکەوە دەنگێک دەرهات، کەس بایەخی بەم نەدەدا.



تەنیا لاوە کوردە دەنگ زیقنەکە توانی سنوورێک بۆ ئەو هەموو غەڵبەغەڵبە دابنێ. بڕیاری دابوو خەوێکی خۆی بۆ ڕۆژنامە ئەڵمانییەکە بدات بە نووسینەوەدا. لە سەرەتای خەونەکەیدا کە بە لەرزینەوە دەستی بە گێڕانەوەی کرد، بەتەنیا لە هۆڵی شانۆی گەل سەیری فیلمی دەکرد. فیلمەکە بەرهەمهێندراوی ڕۆژئاوا بوو، ئەکتەرەکان بە زمانێکی بیانی دەدوان، بەڵام ئەمە ئەوی هیچ سەغڵەت نەدەکرد، چونکە وا هەستی دەکرد هەرچی دەگوترێ، ئەم لێی تێ دەگات. دواتر دەبینێ چووەتە ناو ئەو فیلمەوە کە سەیری دەکرد: کورسییەکەی هۆڵی شانۆی گەل لە ڕاستیدا لە هۆڵی ماڵە دیانەکەی ناو فیلمەکەدا بوو. لەوێ خوانێکی گەورە دەبینێ، دەیەوێ خۆی تێر بکات، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا هەڵەیەکی لێ بوەشێتەوە، لە دوورەوە ڕادەوەستێ. پاشان لێدانی دڵی زیاد دەکات و تووشی دەبێ بە تووشی ژنێکی قژزەرد و چاوشینی زۆر شۆخ و شەنگەوە، لەپڕ بیری دەکەوێتەوە ساڵانێکی درێژە ئەڤینداری ئەو ژنەیە. ژنەکەیش، بە پێچەوانەی پێشبینیکردنی ئەمەوە، تا بڵێی نەرم و میهرەبانانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات. پەسنی پۆشاک و ڕواڵەتی دەدات، ڕوومەتەکانی ماچ دەکات و دەست بە سەر و قژیدا دێنێ. زۆر کامەران دەبێ. دواتر، ژنەکە لە ناکاو ئەم لە باوەش دەکات و خواردنەکانی سەر مێزەکەی نیشان دەدات. بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە تێ دەگات ئەو کاتە هێشتا منداڵ بووە، هێندە خۆشەویست بووە.

ئامادەبووان بەقاقا لێدان، گاڵتە پێکردن و بەغەمێکەوە کە تا ئەوسەری سنووری ترس درێژ دەبووەوە، پێشوازییان لەم خەونە کرد.

ڕۆژنامەنووسە بەتەمەنەکە پەردەی بێدەنگییەکەی دڕی و گوتی: "خەونی وا هەرگیز نابیندرێ. ئەو لاوە کوردە ئەمەی داهێناوە بۆ ئەوەی لە چاوی ئەڵمانەکاندا بەتەواوی بچووکمان بکاتەوە. نەخەڵەتابن تۆماری بکەن."

لاوەکەی سەر بە کۆمەڵە کوردییەکان بۆ سەلماندنی ئەوەی کە خەونەکەی بینیوە، دانی بە وردەکارییەکدا نا کە لە سەرەتادا بازی بەسەردا دابوو: گوتی هەر جارێک کە لە خەو هەڵدەستێ، ژنە قژزەرد و چاوشینەکەی بیر دەکەوێتەوە. یەکەمجار، پێنج ساڵ لەمەوبەر، ئەو کاتەی لەگەڵ کۆمەڵێک گەشتیاری زۆردا بە پاس بۆ بینینی

کڵێسا ئەرمەنییەکان هاتبوون و لە پاسەکە دابەزیبوو، ئەم بینیبووی. دەستێک جلی شینی لەبەردابوو کە دواتریش لە خەونەکانی و لە فلیمەکەیشدا دەیپۆشی.

ئامادەبووان بەمە هەر زۆر پێکەنین. یەکێکیان گوتی: "ئێمەیش ژنی ئەورووپاییمان زۆر بینیوە، ئیبلیس ئێمەیشی لە خەیاڵ پڵاوی بێبەش نەکردووە." لەپڕ کەشێکی گفتوگۆی تژە لە تووڕەیی و تاسە و بێزێزی سەبارەت بە ژنانی ڕۆژئاوا باڵی بەسەر ئامادەبوواندا کێشا. لاوێکی باڵابەرز و تا بڵێی ڕێکپۆش کە تا ئەو ساتە کەس سەرنجی نەدابوویێ، دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتێک کرد: "ڕۆژێک ڕۆژئاواییەک و مسوڵمانێک لە وێستگایەکی شەمەندەفەر بەیەک دەگەن. ماوەیەکی درێژ تێ دەپەڕێ و شەمەندەفەر نایات. ژنە فەرەنسییەکی زۆر شۆخیش لە پێشترەوە لەسەر شۆستەکە چاوەڕێی شەمەندەفەر دەکات..."

ئەم بەسەرهاتە، وەکو هەموو پیاوێکی کە چووبێتە قوتابخانەی ئامادەییی کوڕان یاخۆ سەربازیی کردبێ، پێشبینی دەکرد، پێوەندیی لە نێوان هێزی سێکس لە لایەک و نەتەوایەتی و کولتوور لەلایەکی ترەوە دادەنا. وشەی سووک لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەدا بەکار نەهێندرابوو بە هێما ئاماژە بۆ وشە زبرەکان کرابوو، بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا کەشێک باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو کە فازیل لە وەسفیدا گوتبووی "ناخم پڕە لە شەرم."

تورگوت بەگ هەستایە سەرپێ.

گوتی: "تەواو کوڕم، وەرە، من واژۆی خۆم دەخەمە سەر ڕاگەیەندراوەکە."

تورگوت بەگ پێنووسە تازەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و واژۆیەکی خستە سەر ڕاگەیەندراوەکە. لە تاو غەڵبەغەڵب و دووکەڵی جگەرە ماندوو بووبوو، خەریک بوو هەستێتە سەرپێ، قەدیفە گرتی و دای نیشاندەوە. ئەمجار خۆی هەستایە سەرپێ گوتی: "ئێستا خولەکێک گوێم لێ بگرن. ئێوە شەرم ناکەن، بەڵام سوور هەڵگەڕاوم لەتاو ئەو شتانەی کە گوێم لێ بووە. بۆیە ئەمە لە سەر دەکەم بۆ ئەوەی ئێوە قژم نەبینن، ئەمەیش ئازارکێشانێکی زۆرە لە پێناو ئێوەدا، بەڵام..."

دەنگێکی بێ فیز بەچرپەوە گوتی: "بۆ ئێمە نییە، بۆ خودا و بۆ ڕەوانی خۆتە."



"منیش دەمەوێ دەنگی خۆم بگەیەنمە ڕۆژنامە ئەڵمانییەکە. تکایە بنووسن."

بە پەی پێبردنی شانۆکارێکەوە هەستی کرد ئامادەبووان بە هەستێکی تێکەڵ لە سەرسوڕمان و پەستییەوە سەیری دەکەن. "کچە لاوێکی قارسی، نەخێر بنووسن: کچە مسوڵمانێکی قارسی کە لە سۆنگەی باوەڕەکەیەوە سەرپۆشی وەکو ئاڵایەک بۆ خۆی پەسەند کردبوو، لەبەر نەفرەتێک کە لەناکاو پەی پێ بردبوو، بە بەرچاوی هەمووانەوە سەری ڕووت کردووە. ئەمە دەبێتە هەواڵێکی جێی ڕەزامەندیی ئەورووپاییگەل. ئیدی هانز هانزنیش قسەکانمان بڵاو دەکاتەوە." کاتێکیش ویستی سەری ڕووت بکات، گوتی: "خودای گەورە بمبەخشە، چونکە ئیدی دەبێ تەنیا بم. ئەم جیهانە هێندە سەمەرەیە و منیش هێندە تووڕە و لاوازم کە تۆ..."

فازیل بەرزەپێ ڕاپەڕی و هاواری کرد: "قەدیفە، نەکەی، سەرت ڕووت نەکەی. ئێستا ئێمە هەموومان، هەر هەموومان لێرەین. بە من و بە نەجیبیشەوە. دوایی هەموومان، هەر هەموومان دەمرین."

لە پڕ هەموویان سەریان لەم قسانە سوڕما. هەندێک گوتیان: "بێ عەقڵی مەکە"، "بێگومان پێویستە سەری ڕووت نەکات." بەڵام زۆرینەی ئامادەبووان لەلایەک، بەئومێدەوە سەیریان دەکرد و چاوەڕێ بوون کەتنێک بقەومێ و هەرایەک ڕوو بدات. لەلایەکی تر، هەوڵیان دەدا تێ بگەن ئەم ڕووداوە بە گێچەڵانە گەمەی چ کەسێکن.

فازیل گوتی: "من ئەم دوو ڕستەیەم هەیە کە دەمەوێ لە ڕۆژنامە ئەڵمانییەکەدا بڵاو بکرێتەوە." لە ژوورەکەدا غەڵبەغەڵبێک پەیدابوو. "تەنیا بەناوی خۆمەوە نا، بەڵکو بەناوی هاوڕێی خوداڵێخۆشبووم نەجیبیشەوە کە لە شەوی شۆڕشەکەدا بە نامەردی شەهید کرا، قسە دەکەم: قەدیفە ئێمە تۆمان زۆر خۆش دەوێ. ئەگەر سەرت ڕووت بکەی، من خۆم دەکوژم، نەکەی سەرپۆشەکەت دابگری."

هەندێک پێیان وابوو فازیل بە قەدیفەی گوتووە "خۆشم دەوێی"، نەک "خۆشمان دەوێی." لەوانەیش بوو ئەمە بۆ ڕوونکردنەوەی کاردانەوەی شینە سازێندرابێ.

شینە تا هێزی تێدابووە هاواری کردووە: "کەس لەم شارەدا باسی خۆکوشتن نەکات." دواتر، بێ ئەوەی تەنانەت ئاوڕی لە قەدیفەیش دابێتەوە، لە ژووری هوتێلەکە

دەرچووە و ڕۆیشتووە. بەمەیش کۆتایی بە کۆبوونەوەکە هێندرابوو. ئاپۆڕەی ناو ژوورەکەیش، ئەگەر بە کپیش نەبووبێ، بەپەلە بڵاوەیان لێ کردبوو.



## ٣٢

# بە دوو ڕۆحەوە لە جەستەمدا ئەمەم بۆ ناکرێ

## سەبارەت بە ئەڤین، بێبایەخبوون و ونبوونی شینە

بەر لەوەی تورگوت بەگ و قەدیفە لە کۆبوونەوەکەی هوتێل ئاسیا بگەڕێنەوە، (کا) سەعات پێنج و چل و پێنج خولەک لە هوتێلی بەفرپالاس چووە دەرەوە. هێشتا پازدە خولەکی مابوو بۆ کاتی دیدار لەگەڵ فازیلدا؛ بەڵام دەیویست بە کامەرانییەوە بە کوچەکاندا پیاسە بکات. لە شەقامی ئەتاتورک بەلای چەپدا بای داوە و شەقامەکەی بەجێ هێشت، بەدەم ڕۆیشتنەوە سەیری ئاپۆڕەی ناو چایخانەکان، تەلەفزیۆنە داگیرساوەکان، بەقاڵەکان و جامخانەی دوکانی وێنەگرانی دەکرد، بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا گەیشتە ڕووباری قارس. چووە سەر پردە ئاسنەکە، بێ ئەوەی گوێ بە سەرما بدات، دوو مارلبۆرۆی بەدوای یەکدا کێشا و بیری لەو کامەرانییە کردەوە کە لەگەڵ ئیپەکدا لە فرانکفورت بەسەری دەبات. سەیرێکی پارکەکەی ئەوبەری ڕووبارەکەی کرد کە سەردەمانێک جێی بەفرەخلیسکێی خوداپێداوەکانی قارس بووە، ئێستا تاریکییەکی سامناک باڵی بەسەردا کێشابوو.

فازیل کە بەسەر پردەکەدا بەرەو ڕووی ئەم دەهات، (کا) بۆ ساتێک بە نەجیبی چوواند. پێکەوە چوونە چایخانەی برایانی بەختەوەر، فازیل ڕووداوەکانی کۆبوونەوەکەی هوتێل ئاسیای لە نووکەوە بۆ (کا) گێڕایەوە. کاتێک گەیشتە ئەو جێیەی کە هەستی کردبوو مێژووی شارە بچووکەکەی تێکەڵ بە مێژووی جیهان دەبێ، (کا) وەکو ئەوەی ڕادیۆیەک بۆ ماوەیەک بکوژێنێتەوە، فازیلی بێدەنگ کرد و شیعری (هەموو مرۆڤایەتی و ئەستێرەکان)ی نووسییەوە.

لەو تێبینییانەدا کە دواتر تۆماری کردبوون، (کا) لەبری باسکردنی شارێکی لەبیرکراو و غەمی ژیان بەسەربردن لە دەرەوەی مێژوو، ڕێچکەی شیعرەکەی بردبووەوە سەر سەرەتای ئەو فیلمانەی هۆلیود کە لە سەردەمی منداڵیدا زۆر حەزی

لێ دەکردن. لەگەڵ تەواوبوونی ژەنەریکدا، کامێرا هێدی هێدی لە دوورەوە دەگەڕێتەوە و جیهان نیشان دەدات، لەسەرخۆ لەم نزیک دەبێتەوە، نیشتمانێک دەردەکەوێ، لەو فیلمەدا کە (کا) لە منداڵییەوە لە خەیاڵی خۆیدا دەری هێناوە، ئەم نیشتمانە بێگومان تورکیایە؛ شینایی دەریای مەڕمەڕە و دەریای ڕەش و بۆغاز دێنە بەرچاوان، لەگەڵ زیاتر نزیکبوونەوەی کامێرادا، ئەستەمبوڵ، نیشانتاشیی جێگای ژیانی منداڵیی (کا)، پۆلیسی هاتوچۆی شەقامی تەشویقییە، کوچەی شاعیر نیگار، سەربانەکان و دارەکان (بینینی ئەوانە لە بەرزاییییەوە چەندە جوان بوو!)، پاشان جلوبەرگی هەڵواسراو، ڕێکلامی خواردەمەنیی ناو قووتوو (تامەک)، لوولە ژەنگاوییەکانی ئاوی باران، لەتە دیواری بە قیر سواخدراو و دواتریش هێدی هێدی پەنجەرەکەی (کا) دەردەکەوێ. کامێراکە لە پەنجەرەکەوە دەچێتەوە ژوورێ و دوای سووڕانەوە بەسەر کتێب، شتومەک، ژوورە پڕ لە تۆز و قالیچەکاندا، (کا) نیشان دەدات کە لە بەردەم پەنجەرەکەی ئەوبەرەوە بەدیار مێزێکەوە دانیشتووە و سەرقاڵی نووسینەوەیە. زوومی کامێرا دەچێتە سەر نووکی پاندانەکەی کە دواین پیتەکان دەنووسێتەوە و ئەمە دەخوێنینەوە: ناوونیشانی تێکەڵبوونم بە مێژووی جیهانی شیعر: شاعیر (کا)، کوچەی شاعیر نیگار، ٨/١٦، نیشانتاشی، ئەستەمبوڵ، تورکیا. ئەم ناوونیشانە کە پێم وابوو لە شیعرەکەیشدا جێگای بووبێتەوە، خوێنەری وردبین دەتوانێ سەرنج بدات کە لەسەر تەوەرەی لۆژیکی سەر نیگاری گەردیلە بەفرەکە، لە شوێنێکی نزیک لە هێزی کێشکردنی خەیاڵەوە جێگای کراوەتەوە.

فازیل لە کۆتاییی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی کۆبوونەوەکەی هوتێل ئاسیادا، هاتە سەر کرۆکی دەردەکەی خۆی: ئێستا لە پای ئەوەی بە قەدیفەی گوتەوە ئەگەر سەری ڕووت بکات، ئەوا ئەم خۆی دەکوژێ، زۆر بێ ئۆقرەیە. "بێ ئۆقرەیییەکەم هەر لەبەر ئەوە نییە کە خۆکوشتن بەواتای لە دەستدانی باوەڕی مرۆڤە بە خودا، بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە ئەمە لە باوەڕی منەوە دوورە. بۆچی شتێکم گوت کە باوەڕم پێی نییە؟" دوای ئەوەی بە قەدیفەی گوتبوو ئەگەر سەری ڕووت بکات، ئەم خۆی دەکوژێ، فازیل "تۆبە"ی کردبوو، بەڵام کاتێک لەبەر دەرگا چاوی بە چاوی کەوتبوو، وەکو بیی ناو ئاو دەستی بە لەرزین کردبوو.



لە (کا)ی پرسی: "تۆ بڵێی قەدیفە وای بۆ چووبێ کە من گرفتاری ئەڤینی ئەو بووم؟"

"بۆچی تۆ حەزت لە قەدیفە کردووە؟"

"تۆ بۆ خۆیشت دەیزانی من ئەڤینداری تەسلیمەی خوداڵێخۆشبوو بووم، جوانەمەرگەی هاوڕێشم حەزی لە قەدیفە کردبوو. شەرم لە خۆم دەکەم کە هێشتا ڕۆژێک بەسەر مردنی هاوڕێکەمدا تێ نەپەڕیوە، خۆم بخەمە داوی ئەڤینی هەمان کچەوە. دەشزانم ئەمە تەنیا یەک ڕوونکردنەوەی هەیە، ئەوەیش دەمترسێنێ. پێم بڵێ، چۆن دڵنیایت لە کوژرانی نەجیب؟"

"کڵاوەی شانەکانیم گرت و ڕوومەتەکانیم ماچ کرد."

فازیل گوتی: "ئەگەری ئەوە هەیە ڕۆحی نەجیب لە هەناوی مندا بژی. گوێ بگرە: دوێنێ ئێوارە من نە گوێم بە شانۆ دا و نە سەیری تەلەفزیۆنیشم کرد. هەر زۆر زوو چوومە جێگاوە و نووستم. لە خەونمدا تێ گەیشتم نەجیب خراپی لێ قەوماوە و بەڵای سامناکی بەسەر هاتووە. کاتێکیش سەربازەکان هێرشیان کردە سەر بەشی ناوخۆیییەکەمان، هیچ گومانم لە پێشبینیکردنەکەم نەما. ئەو کاتەی تۆم لە کتێبخانەکە بینی، دەمزانی ئیدی نەجیب مردووە، چونکە ڕۆحی هاتبووە ناو جەستەی منەوە. ئەمە بەرەبەیانی زوو ڕووی دا. سەربازەکان کە بەشی ناوخۆییان چۆڵکرد، دەستیان لە من نەدا. منیش شەوم لە گەڕەکی ڕێگای بازاڕ لە ماڵی کەسێکی ڤارتۆیی بەسەر برد کە هاوڕێی سەردەمی سەربازیی باوکم بووە. دوای تێپەڕبوونی شەش سەعات بەسەر کوژرانی نەجیبدا، سەر لە بەیانی زوو لە جەستەی خۆمدا هەستم بە بوونی کرد. لە ناو جێگای ماڵی خانەخوێکەمدا لەپڕ سەرم گێژ بوو، دواتر هەستم بە دەوڵەمەندبوون و قووڵییەکی شیرین کرد؛ هاوڕێکەم لە تەنیشتمەوە، لە جەستەمدا بوو. وەکو لە کتێبە کۆنەکانیشدا هاتووە، ڕۆح دوای شەش سەعات لە مردنی خاوەنەکەی، لە جەستە دێتە دەرێ. بەپێی بۆچوونی (سیوتی) ڕۆح لەو ساتەدا شتێکی بزۆکە لە شێوەی جیوەدا، پێویستە تا قیامەت لە بەرزەخدا، لەسەر سنووری نێوان ئەم دنیا و ئەو دنیادا چاوەڕێ بکات، بەڵام ڕۆحی نەجیب هاتووەتە جەستەی منەوە. گومانم لەمە نییە. دەشترسم، چونکە شتی وا لە

قورئاندا باس نەکراوە. هەروا زوویش گرفتاری ئەڤینی قەدیفە نابم. تەنانەت خۆکوشتن لە پێناویشیدا بیرۆکەی خۆم نەبوو. بە ڕای تۆ، ئایا دەشێ ڕۆحی نەجیب لە جەستەی مندا درێژە بە ژیان بدات؟"

(کا) بە هوشیاری گوتی: "ئەگەر تۆ باوەڕت بەمە هەبێ."

"ئەمە تەنیا بە تۆ دەڵێم. نەجیب نهێنییەکانی خۆی تەنیا لای تۆ دەدرکاند. لێت دەپاڕێمەوە کە ڕاستیم پێ بڵێی: نەجیب هەرگیز پێی نەگوتووم گومانی ئەتایستی لە ناخیدا هەبووبێ، بەڵام لەوانەیە ئەم بابەتەی لای تۆ کردبێتەوە. ئایا نەجیب هیچ لای تۆ باسی ئەوەی کردووە کە –حاشا– لە هەبوونی خودا کەوتبێتە گومانەوە؟"

"ئەو گومانە نا کە تۆ باست کرد، ئەو شتێکی تری بۆ من گێڕایەوە. باسی ئەوەی بۆ کردم مرۆڤ هەروەکو چۆن پێشبینیی مردنی دایکی یاخۆ باوکی دەکات و چاوی پڕ دەبێ لە فرمێسک و چێژ لەو غەمە وەردەگرێ، بخوازێ و نەخوازێ بیر لە نەبوونی ئەو خودایەش دەکاتەوە کە زۆری خۆش دەوێ."

فازیل لە وەڵامدا گوتی: "ئێستا هەمان شت بەسەر منیشدا دێ و هیچ گومانم لەوە نییە کە ڕۆحی نەجیب ئەم گومانەی هێناوەتە هەناوی منەوە."

"ئێ خۆ ئەم گومانە بە واتای ئەتایزم نایات."

فازیل بە لێوی غەمبارەوە گوتی: "بەڵام ئێستا خۆکوشتنی کچانیش بە ڕەوا دەزانم. پێش کەمێک گوتم خۆیشم خۆم دەکوژم. نامەوێ بڵێم نەجیبی جوانەمەرگ ئەتایست بوو، بەڵام ئێستا لە ناخی خۆمدا گوێم لە دەنگی ئەتایستێکە و زۆریش لەمە دەترسم. نازانم داخۆ ئێوەیش ئاوهان؟ بەڵام ئێوە لەبەرئەوەی لە ئەورووپا ژیاون، کەسانی ڕۆشنبیر، عارەقخۆر و دەرمانکێشتان ناسیوە. تکایە جارێکی تریش بۆم ڕوون بکەنەوە کە ئەتایست هەست بەچی دەکات؟"

"شتێک نییە ناوی ئەوە بێ کە مرۆڤ هەمیشە خولیای خۆکوشتنی هەیە."

"بە بەردەوامی نا، بەڵام جاروبار دەمەوێ خۆم بکوژم."

"بۆچی؟"



"چونکە هەمیشە بیر لە قەدیفە دەکەمەوە و هیچ شتێکی تر لە هۆشمدا نییە! لێکدالێکدا دێتە پێش چاوم. لە کاتی خوێندنی وانەکانمدا، بەدیار سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە، لەو دەمەیدا کە چاوەڕێی هاتنی زەردەی ئێوارە دەکەم، لە نەشیاوترین جێدا هەموو شتەکان قەدیفە دێننەوە بیرم و زۆر ئازار دەچێژم. بەر لە مردنی نەجیبیش هەستم بەمانە دەکرد. چیت لێ بشارمەوە، من لە ڕاستیدا قەدیفەم خۆش دەویست نەک تەسلیمە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەڤینداری هاوڕێکەم بوو، من هەستەکانی خۆم لە ناخی خۆمدا نقوم دەکرد. نەجیب ئەوەندە باسی قەدیفەی بۆم کرد هەتا ئەو ئەڤینەی لە ناخمدا چاند. کاتێک سەربازەکان هێرشیان بردە سەر بەشی ناوخۆیی، تێ گەیشتم وێ دەچێ نەجیبیان کوشتبێ. بەڵێ، خۆشحاڵیش بووم. نەک لەبەرئەوەی ئەڤینی خۆم بۆ قەدیفە بەیان بکەم، بەڵکو ڕقم لە نەجیب هەستابوو لە پای ئەوەی ئەم ئەڤینەی لە ناخی مندا چاندبوو. ئێستا نەجیب مرد و بڕایەوە، ئیدی ئازادم، بەڵام ئەمە هیچ ئەنجامێکی نەبوو جگە لە زیاتر چەقین لە ئەڤینی قەدیفەدا. لە بەیانیی زووەوە بیری لێ دەکەمەوە و بە تێپەڕبوونی کاتیش ناتوانم بیر لە هیچ شتێکی تر بکەمەوە. خودای گەورە، من چی بکەم؟"

فازیل دەموچاوی نایە ناو لەپی دەستەکانی و دای لە پرمەی گریان. (کا) مارلبۆرۆیەکی داگیرساند، گوێ پێنەدانێکی خۆپەرستانە بە ناخیدا گوزەری کرد. ماوەیەکی درێژ سەری فازیلی شێلا.

سافەتی هەواڵدز کە چاوێکی لەسەر تەلەفزیۆنەکە و چاوێکی لەسەر ئەوان بوو، لەو ساتەدا لێیان نزیک کەوتەوە. گوتی: "با ئەو لاوە نەگری، ناسنامەکەیم نەبرد بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش، لای خۆمە." کاتێک بینی وا فازیل هێشتا دەگری و باکی پێ نییە، ناسنامەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بۆی درێژ کرد، خۆی دەستی دایێ و لێی وەرگرت. هەواڵدزەکە بە پەرۆشێکی نیوە پیشەیی و نیوە مرۆیییەوە گوتی: "بۆچی دەگری؟" (کا) گوتی: "لە تاو عەشق." ئەم قسەیە سووکناییی بە هەواڵدزەکە بەخشی. تا لە چایخانەکە دەرچوو و ڕۆیشت، (کا) لە دواوە سەیری کرد.

دواترێ فازیل پرسیاری ئەوەی کرد داخۆ چۆن دەتوانێ سەرنجی قەدیفە بەلای خۆیدا ڕابکێشێ. هەمان کات گوتیشی هەموو قارس ئاگادارە لەوەی کە (کا)

کەوتووەتە داوی ئەڤینی ئیپەکی خوشکی قەدیفەوە. ئەڤینەکەی فازیل هێندە بێ ئومێد و مەحاڵ هاتە بەرچاوی (کا)، بەجۆرێک ترسی ئەوەی لێ نیشت عەشقی ئەمیش بۆ ئیپەک بەهەمان شێوە لە ڕەنجەڕۆیی زیاتر هیچی بەدواوە نەبێ. فازیل ژیر بوویووەوە، (کا) بێ بیرکردنەوە، هەمان پێشنیازی بۆ دووبارە کردەوە کە ئیپەک بۆ ئەمی کردبوو:

" ببە بەخۆت."

فازیل گوتی: "بەڵام بەدوو ڕۆحەوە لە جەستەمدا ئەمەم بۆ ناکرێ. سەرباری ئەوەیش، وا ڕۆحی ئەتایستی نەجیب من ڕام دەکات. دوای چەندین ساڵ بیرکردنەوەم لەوەی کە هاوڕێیانی لاوم بە خۆ خەریککردنیان بە سیاسەتەوە هەڵە دەکەن، ئێستا منیش دەمەوێ شانبەشانی ئیسلامییەکان شتێک لە دژی ئەم کودەتا سەربازییە بکەم، بەڵام وا هەست دەکەم ئەمەم بۆ ڕاکێشانی سەرنجی قەدیفەیە بۆ سەر خۆم. زۆر دەترسم لەوەی کەوا جگە لە قەدیفە، کەسی ترم لە خەیاڵدا نییە. لەبەرئەوەم نییە هیچ نایناسم، بەڵکو لەبەرئەوەی وەکو ئەتایستێک هەست دەکەم جگە لە ئەڤین و بەختەوەری، باوەڕم بەهیچ شتێکی تر نییە."

فازیل دەگریا، (کا)یش دامابوو و نەیدەزانی پێی بڵێ یاخۆ نەڵێ کە لە هەموو شوێنێ باسی عەشقی قەدیفە نەکات و پێویستە ترسی لە شینە هەبێ. بیری بۆ ئەوەیش چوو فازیل هەروەکو چۆن ئاگاداری پێوەندیی نێوان ئەم و ئیپەکە، بەهەمان شێوە بە پێوەندیی شینە–قەدیفەیش دەزانێ. ئەگەر بشیزانیبا، ئەوا دەبوو لەبەر پلە و پایەی سیاسی، خۆی نەخستایە ئاگری ئەڤینی قەدیفەوە.

فازیل بە تووڕەبوونێکی سەیرەوە گوتی: "هەژار و بێ بایەخین، هەموو مەسەلەکە ئەمەیە. ژیانی بەلەنگازی ئێمە هیچ جێگایەکی نییە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. ئێمە کە لەم شارە نابووتەی قارسدا دەژین، لە ئاکامدا هەمووومان دەڕۆین و دەبڕێینەوە. کەس یادمان ناکاتەوە و کەس بایەخمان پێ نادات. دەبین بەو کەسە بێبایەخانەی کە لەسەر ئەوەی ژنەکانیان چی لەسەر بکەن، دەست دەنێنە بینی یەکدی، یاخۆ لە ناکۆکییە تووڕەهاتەکانی خۆیاندا نقوم بوون. هەمووان لە بیرمان دەکەن. کاتێک دەبینم ژیانێکی دەبەنگ لەم جیهانەدا بەسەر دەبەین و هیچ شوێن پێیەک لە دوای



خۆمانەوە جێ ناهێڵین، بە ڕق هەستانەوە تێ دەگەم جگە لە ئەڤین، هیچ شتێکی تر لە ژیاندا نییە. ئەو هەستەی بەرامبەر بە قەدیفەیش هەمە و ڕاستیی ئەوەی تەنیا لە ئامێزی ئەودا سەبووریم دێ، زیاتر ئازارم دەدات، وێنەیشی هەرگیز لە بەرچاوم ون نابێ."

(کا) بە شێوەیەکی زۆر بێ بەزەییانە گوتی: "بەڵێ، ئەم جۆرە بیرکردنەوانە هەر لە کەسانی ئەتایست دەوەشێنەوە."

فازیل هەمدیسان دایە پرمەی گریان. (کا)یش، قسەکانی دواتری نە بیرکەوتەوە و نە لە هیچ کام لە دەفتەرەکانیشدا نووسییەوە. لە بەرنامەی گاڵتەی کامێرادا لە تەلەفزیۆنەکەدا، منداڵانی ساوای ئەمەریکایی لە کورسییەکانیان بەردەبوونەوە، حەوزی ماسییان لار دەکردەوە، خۆیان لە ئاو دەنا، پێیان بە ئەتەکەکانی خۆیاندا دەنا و لەپەڕوو دەکەوتن، هەمووو ئەمانەیش بە قاقایەکی دەستکردەوە بڵاو دەکرایەوە. فازیل و (کا)یش هەموو شتێکیان لە بیر کرد و وەکو ئاپۆڕەی ناو چایخانەکە بەدەم زەردەخەنەوە ساتێکی درێژ سەیری منداڵانی ئەمەریکایان کرد.

لەو کاتەدا کە زاهیدە خۆی کرد بە چایخانەکەدا، (کا) و فازیل لە تەلەفزیۆندا سەیری ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگریان دەکرد کە بە شێوازێکی پڕ لە ڕاز بە دارستانێکدا تێ دەپەڕی. زاهیدە زەرفێکی زەردی کە هیچ سەرنجی فازیلی ڕانەکێشا، دەرهێنا و ڕادەستی (کا)ی کرد. (کا) کردیەوە و ناوەڕۆکەکەی خوێندەوە: لە ئیپەکەوە هاتبوو. قەدیفە و ئیپەک، دەیانویست دوای بیست خولەکی تر، لە سەعات حەوتدا (کا) لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ ببینن. زاهیدە لە ڕێی سافەتەوە زانیبووی (کا) لە چایخانەی برایانی بەختەوەرە.

لە دوای ڕۆیشتنی زاهیدە، فازیل گوتی: "برازاکەی لە پۆلی ئێمەیە. شێت و شەیدای قومارە. شەڕە کەڵەشێر و گرەوی سەگبازی نییە ئەوی تێدا نەبێ."

(کا) ناسنامەکەی فازیل کە لە کابرای پۆلیسی وەرگرتبووەوە، دایەوە دەستی، هەستایە سەرپێ و گوتی: "لە هوتێل بۆ نانخواردن چاوەڕێم دەکەن." فازیل هیوا لێبڕاوانە لێی پرسی: "قەدیفە دەبینی؟" شەرمی لە ئاماژەی بێزاری و بەزەیی سەر

ڕووخسـاری (کـا) کـرد. "دەمەوێ خـۆم بکوژم." بەدوای دەرچوونی (کـا)دا لە چایخانەکە، ئەم هاواری کرد: "ئەگەر دەیبینی، پێی بڵێ ئەگەر سەرپۆش فڕێ بدا، من خۆم دەکوژم. لەبەرئەوەیشم نییە سەری ڕووت دەکات، بەڵکو مردن لە پێناوی ئەودا لەزەتم پێ دەبەخشێ."

(کا) لەبەرئەوەی هێشتا کاتی مابوو بۆ دیداری شیرینیخانەکە، لای دایە سەر لاکۆڵانەکان. کاتێک بە کوچەی کەناڵدا تێ پەڕی، ئەو چایخانەیەی بینی کە پێشنیوەڕۆ شیعری (خەونی کوچەکان)ی تێدا نووسیبوو. خۆی کرد بە ژووردا، بەڵام بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆیەوە شیعری تازەی بۆ نەهات. لە بری ئەوە، بیری کردەوە لە دەرگای پشتی چایخانە نیمچە چۆڵ و بە دووکەڵ قاندراوەکەوە بچێتە ئەودیودا. چووە حەوشە بە بەفر داپۆشراوەکەوە، لە تاریکیدا بەسەر دیوارە نزمەکەی بەردەمیدا پەڕیەوە، سێ پلە چووە خوارەوە و لە ناو وەڕەوەڕی هەمان سەگی ڕەشی بە زنجیر بەستراوەدا، چووە ژێر زەمینەکەوە.

لەوێ گڵۆپێکی کز دەسووتا. (کا) لە ژوورەوە جگە لە بۆنی خەڵووز و بۆنی خەو، بۆنی عارەقیشی کرد. سێبەری چەند کەسێک لە تەنیشت مەنجەڵە گێزەگێزکەرەکەی شۆفاژەوە بەدی دەکرا. هیچ سەری سوڕنەما کاتێک بینی وا کارمەندە لووت تەورداسەکەی میت و ژنە نەخۆشە گورجییەکە و کابرای مێردی لە نێوان قوتووی کارتۆندا دانیشتوون و عارەق دەخۆنەوە. وێ نەدەچوو ئەوانیش سەریان لە (کا) سووڕمابێ. (کا) شەپقەیەکی سوور و شیکی لەسەری ژنە نەخۆشەکەدا بینی. ژنەکە فەرمووی هێلکەی کوڵاو و نانی لەواشی لێ کرد، پیاوەکەیشی دەستی کرد بە ئامادەکردنی پێکێک عارەق بۆی. لەو دەمەیدا (کا) بە نینۆک خەریکی لێکردنەوەی توێکڵی هێلکە کوڵاوەکە بوو، کارمەندە لووت تەورداسەکەی میت گوتی ئەم خانووی مەنجەڵە گەرمترین گۆشەی قارسە و وەکو بەهەشت وایە.

لە ساتێکی بێدەنگیدا کە بەدوای ئەم قسەیەدا هات، (کا) بێ ڕاوەستان و بێ ئەوەی وشەیەکی کەم بێ، شیعرێکی نووسی و ناوی (بەهەشت)ی پێ بەخشی.

ئەم شیعرە کە ڕێک لەسەر تەوەرەی خەیاڵ، لە شوێنێکی دوور لە چەقی نیگاری گەردیلە بەفرەکە دانراوە، بەلای (کا)وە واتای داهاتوویەکی پێشبینیکراوی



نەدەگەیاند؛ بەڵکو واتای ئەوەی دەدا بە دەستەوە کە بیرەوەرییە بەهەشتییەکان تەنیا لە خەیاڵدا بە زیندوویی دەمێننەوە. (کا) کاتێک لە ساڵانی دواتردا ئەم شیعرەی بیر دەکەوتەوە، چەند بیرەوەرییەکی ڕیز دەکرد: پشووەکانی هاوین لە سەردەمی منداڵیدا، ئەو ڕۆژانەی کە لە قوتابخانە هەڵدەهات، ئەو کاتانەی لەگەڵ خوشکەکەیدا دەچوونە ناو جێگای نووستنی دایک و باوکیانەوە، هەندێک لەو نیگارانەی کە لە سەردەمی منداڵیدا دەیکێشان، ناسینی کچێک لە ئاهەنگی قوتابخانە و دواتر بینینەوەی و ماچکردنی.

لە ڕۆیشتنیدا بەرەو شیرینیخانەی ژیانی نوێ، ئیپەک و ئەو بیرەوەرییانەی لە خەیاڵدا بوو. لە شیرینیخانەکەدا ئیپەک و قەدیفەی بینی کە چاوەڕوانی ئەمیان دەکرد. ئیپەک هێندە شۆخ بوو، بەجۆرێک (کا) بۆ ساتێک هەستی کرد (لە ژێر کاریگەریی عارەقەکەشدا کە بە سکی ناشتا خواردبوویەوە) ئاوی چاوەکانی دادێ. دانیشتن و قسەکردن لەگەڵ جووتە خوشکێکی جوان و شۆخدا لە دەوری هەمان مێز، جگە لە کامەرانی، هەستی لە خۆباییبوونیشی لای (کا) دروست کرد: (کا) ئارەزووی دەکرد ئەو فرۆشیارە تورکانەی کە هەموو ڕۆژێ لە فرانکفورت بەدەم زەردەخەوە سڵاویان لێ دەکرد، لەگەڵ ئەم دوو ژنەدا بیاندیبا. لە شیرینیخانەکەدا کە دوێنێ بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی تێدا کوژرابوو، جگە لە گارسۆنە پیرەکە، کەسی تری تێدا نەبوو. دانیشتنی لەگەڵ قەدیفە و ئیپەکدا لە شیرینیخانەی ژیانی نوێدا -با یەکێکیشیان سەرداپۆشراو بێ- لە وێنەیەک دەچوو کە لە دەرەوە لەگەڵ دوو ژنی جواندا بە دەوری مێزێکەوە گیرابێ. ئەم دیمەنە، وەکو ئاوێنەی پشتەوە کە هەمیشە ئۆتۆمبیلی دواوە نیشان دەدات، لە گۆشەیەکی سەری (کا) دەرنەدەچوو.

بە پێچەوانەی (کا)وە، دوو ژنەکەی دەوری مێزەکە زۆر ئارام و لەسەرخۆ بوون. (کا) گوتی لە ڕێی فازیلەوە بە هەموو ڕووداوەکانی هوتێل ئاسیای زانیوە، ئیپەک قسەکەی پێ بڕی: "شینە بە تووڕەیی کۆبوونەوەکەی جێ هێشتووە. قەدیفەیش ئێستا زۆر پەشیمانە لەو قسانەی کە لەوێ کردوونی. زاهیدەمان نارد بۆ شوێنی خۆشاردنەوەکەی، لەوێ نەماوە. بۆمان نادۆزرێتەوە." ئیپەک وەکو خوشکێکی گەورە کە بیەوێ چارەیەک بۆ دەردی خوشکەکەی بدۆزێتەوە، دەستی بە قسە کردبوو، بەڵام

ئێستا خۆیشی بە زیادەوە غەمیگن دەینوواند.

"ئەگەر بیدۆزنەوە چیتان لێی دەوێ؟"

ئیپەک گوتی: "دەمانەوێ بەر لە هەموو شتێک لە ژیانی و لە دەستگیرنەکردنی دڵنیابین. سەیرێکی قەدیفەی کرد کە وێ دەچوو بە پەنجە پێوەدانێک بداتە پرمەی گریان. "هەواڵێکمان لە شینەوە بۆ بێنە. پێی بڵێ چۆنی دەوێ قەدیفە وا دەکات."

"ئێوە خۆتان لە من باشتر شارەزای قارسن."

ئیپەک گوتی: "ئێمە دوو کچین لەم تاریکاییی ئێوارەیەدا. تۆ شارەزای شار بووی. برۆ بۆ هەردوو چایخانەی ئایدەدە و نورۆل لە شەقامی خالید پاشا کە شوێنی کۆبوونەوەی قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانە. ئێستا ئەوێ جمەی دێ لە پۆلیسی سڤیل، ئەوانیش وەستای قسە و قسەڵۆکن، ئەگەر بەڵایەکی خراپ بەسەر شینەدا هاتبێ، لە ڕێی ئەوانەوە ئاگادار دەبی."

قەدیفە دەسرەکەی دەرهێنابوو، لووتی دەسڕی. (کا) بۆ ساتێک وایزانی کچەکە دەیەوێ دەست بە گریان بکات.

ئیپەک گوتی: "هەواڵێکمان لە شینەوە بۆ بێنەوە. ئێمە دەبێ برۆین، ئەگەر دوا بکەوین، باوکمان نیگەران دەبێ. لەسەر خوانی ئێوارەیش چاوەڕێت دەکات."

قەدیفەیش بەدەم هەستانەوە گوتی: "سەرێک لە چایخانەکانی کوچەی بایرام پاشایش بدەن."

لە نیگەرانی و غەمی کچەکاندا شتێکی هێندە شکستە و سەرنجڕاکێش هەبوو، بەجۆرێک (کا) بۆ ئەوەی لێیان جیا نەبێتەوە، تا نیوەی ڕێگای بەرەو هوتێلی بەفرپالاس لەگەڵیاندا ڕۆیشت. بارتەقای ترسی لە لەدەستدانی ئیپەک، هەستێکی پڕ لە ڕازی بەشداربوون لە تاواندا -پێکەوە شتێکیان بە دزی باوکیانەوە دەکرد- (کا)ی بە کچەکانەوە گرێ دەدا. وای بە خەیاڵدا هات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ ئیپەکدا دەچێتە فرانکفورت، قەدیفەیش دێ بۆ لایان، هەرسێکیان بە سێ قۆڵی خۆیان دەکەن بە قاوەخانەکانی شەقامی بەرلینەردا و دێنە دەرێ و بەدەم سەیرکردنی جامخانەی کۆگاکانەوە پیاسە دەکەن.



هیچ باوەڕی نەبوو بتوانێ ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنێ کە پێی سپێردرابوو. بێ ماندووبوونێکی زۆر چایخانەی ئایدەدەی دۆزیەوە. چایخانەکە هێندە سادە و بێ تام بوو، بەجۆرێک خەریک بوو لە بیری بچێ بۆچی بۆ ئێرە هاتووە. دانیشت و ماوەیەک بەتەنیا سەیری تەلەفزیۆنی کرد. چەند لاوێک کە لە تەمەنی قوتابێتیدا بوون، لەو دەوربەرە دانیشتبوون، بەڵام سەرەڕای نیشاندانی ئارەزووی بۆ قسەکردن -سەبارەت بە یاریی تۆپی پێ لە تەلەفزیۆنەکەدا قسەی کرد-، کەس ئاوڕی لێ نەدایەوە. ئەمە بەمەرجێک (کا) پاکەتی جگەرەکەی بۆ بەخشینەوە ئامادە کردبوو، چەرخەکەیشی بۆ ئەوەی نەبادا کەسێک پێویستی پێ بێ، لەسەر مێزەکە دانابوو. کاتێک زانی هیچی لە شاگردە خێڵەکە دەستگیر نابێ، چووە دەرێ و خۆی کرد بە چایخانەی نەرۆلدا کە زۆر لەوێوە دوور نەبوو. لەوێش کۆمەڵێک لاوی بینی کە لە تەلەفزیۆنێکی ڕەش و سپیدا سەیری هەمان گەمەی تۆپی پێیان دەکرد. ئەگەر لەتە ڕۆژنامەی بردراوی سەر دیوارەکان و خشتەی یارییەکانی ئەمساڵی یانەی وەرزشی قارسی نەدیبایە، نەدەهاتەوە یادی کە دوێنێ لێرە لەگەڵ نەجیبدا سەبارەت بە هەبوونی خودا و واتای جیهان قسەیان کردووە. بینی شاعیرێک شیعرێکی پێچەوانەی لە تەنیشت ئەو شیعرەوە نووسیوە کە ئەم دوێنێ ئێوارە خوێندبوویەوە. ئەم شیعرەیشی لە دەفتەرەکەیدا نووسیەوە:

**ئاشکرایە ئیدی، دایکمان لە بەهەشت دەرناچێ، ناگەڕێتەوە و لە ئامێزمان ناگرێ**

**باوکمان هەرگیز بێ کوتان وازی لێ ناهێنێ**

**بەڵام سەرباری ئەوەیش، هەناومان گەرم دەکاتەوە و ڕۆحمان زیندوو دەکاتەوە**

**چونکە چارەنووس وەهایە؛ تەنانەت لەم گوواوەشدا کە تێی کەوتووین، وەکو بەهەشت بیر لە شاری قارس دەکەینەوە**

شاگردە منداڵەکەی ئەوبەرەوە گوتی: "ئەوە شیعر دەنووسن؟"

(کا) گوتی: "هەی ئافەرین. تۆ دەزانی بە پێچەوانەوە بخوێنیتەوە؟"

"نا کاکی گەورە، من نازانم ڕاستەڕاتیش بخوێنمەوە. بەر لەوەی فێری خوێندەواری ببم لە قوتابخانە هەڵاتم، تەمەنم بەسەرچوو. ئیدی ڕۆیشت و بڕایەوە."

"کێ ئەو شیعرە نوێیەی سەر دیوارەکەی نووسی؟"

"نیوەی ئەو لاوانەی دێنە ئێرە، شاعیرن."

"بۆچی ئەمڕۆ دیار نین؟"

"دوێنێ سوپا هەموویانی خڕکردووەتەوە. هەندێکیان لە زیندانن و بڕێکیشیان خۆیان شاردووەتەوە. ئەگەر دەخوازی لەوانەی ئەوێ بپرسە، ئەوانە هەموویان پۆلیسی سڤیلن و دەزانن."

لەو گۆشەیەدا کە نیشانی ئەمی دا، دوو لاو دانیشتبوون و وەکو هار باسی گەمەی تۆپانێکەیان دەکرد، بەڵام (کا) بێ ئەوەی لێیان نزیک بکەوێتەوە و شتێکیان لێ بپرسێ، لە چایخانەکە چووە دەرێ.

پێی خۆش بوو کە بینی بەفربارین هەمدیسان دەستی پێ کردووەتەوە. باوەڕی نەدەکرد لە چایخانەکانی گەڕەکی بایرام پاشادا شوێن پێی شینە هەڵبگرێتەوە. لە ناخیدا هەستی بە غەمێک کرد کە لە ئێوارەی گەیشتنیدا بە قارس پەی پێ بردبوو، بەڵام ئێستا بڕێک کامەرانیش بوو. بەدەم چاوەڕێکردنی هاتنی شیعرێکی نوێوە، بە پێش باڵەخانەی چیمەنتۆیی و ناشیرینی هەژارەکاندا، ئەوتۆ پارکەکانی بە بەفر داپۆشراو، جامخانەی ڕچیوی چایخانە و سەرتاشخانە و بەقاڵەکاندا، ئەو حەوشانەی کە لە سەردەمی ڕووسەکانەوە وەڕەی سەگیان لێ نەبڕاوە، دوکانی فرۆشیاری پارچەی یەدەکی تراکتۆر و کەرەسەی عەرەبانەی دوای ئەسپ و پەنیرفرۆشەکاندا، وەکو ئەوەی خەون ببینێ، تێ پەڕی. وای دەزانی ئەو شتانەی کە دەیانبینێ: پۆستەرەکانی هەڵبژاردنی پارتی نیشتمانی دایک، پەردەی باش داخراوی پەنجەرەیەکی بچووک، ئاگادارییەک کە چەندین مانگ لەمەوبەر بە جامخانەی دەرمانخانەی زانستییەوە هەڵواسراوە و لەسەری نووسراوە (دەرمانی دژ بە هەڵامەتی ژاپۆنیمان بۆ هاتووە) و پۆستەرە زەردەکانی دژبەری خۆکوشتن، تا لە ژیاندا ماوە لە بیریان ناکات. هەستیاریی لە ڕادەبەدەری بەرامبەر بە وردەکارییەکانی ئەو ساتەی بەسەری دەبات، هەستی ئەوەی کە (ئێستا هەموو شتەکان پێکەوە گرێ دراون و ئەوەی کە خۆیشی پارچەیەکی لێک دانەبڕاوی ئەم



جیهانە دێرین و جوانەیە)، هێندە بەهێز لە ناخیدا تاوی سەند، بەجۆرێک پێی وابوو کە شیعرێکی نوێی بۆ دێت. خۆی کرد بە چایخانەیەکدا لە شەقامی ئەتاتورک، بەڵام شیعرەکەی بۆ نەهات.

# ۳۳

## خودانەناسێک لە قارسدا

### ترسی پەلاماردان

لەگەڵ هاتنە دەرەوەیدا لە چایخانەکە، لەسەر شۆستە بە بەفر داپۆشراوەکە، لووتی تەقی بە لووتی موختاردا. موختار کە بەدەم داڵغە لێدانەوە دەیویست بگاتە شوێنێک، ئەمی بینی، بەڵام لەبەر چڕیی کلووە بەفرە گەورەکان، سەرەتا نەیناسییەوە، (کا)یش لە پێشدا هەوڵی دا خۆی لێ بدزێتەوە. هەردووکیان لە یەک کاتدا پڕیان دایە یەک، وەکو دوو دۆستی دێرین باوەشیان بە یەکتردا کرد.

موختار گوتی: "ڕاسپاردەکانمت گەیاندە ئیپەک؟"

"بەڵێ."

"گوتی چی؟ وەرە با لەو چایخانەیە دانیشین، بۆم بگێڕەوە."

موختار، سەرباری کودەتا سەربازییەکە، ئەو تێ هەڵدانەی لە پۆلیسخانە خواردبووی و لەدەستدانی پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی، هیچ ڕەشبینییی پێوە دیارنەبوو. دوای ئەوەی لە چایخانەکە دانیشتن، گوتی: "بۆچی منیان دەستگیر نەکرد؟ لەبەرئەوەی دوای بڕانەوەی بەفر، کردنەوەی ڕێگا و بانەکان و کشانەوەی سەربازەکان، هەڵبژاردنەکانی شارەوانی بەڕێوە دەبرێن. ئەمەیش بە ئیپەک بڵێ." (کا) ڕای گەیاند کە پێی دەڵێ. پرسیاری لێ کرد داخۆ شتێک لە بارەی شینەوە دەزانێ.

موختار بە شانازییەوە گوتی: "من یەکەم کەس بووم کە بۆ قارس بانگهێشتنم کرد. لە ڕابردوودا هەر جارێک بۆ ئێرە بهاتبا، لای من دەمایەوە. بەڵام لەو کاتەوە کە چاپەمەنیی ئەستەمبوڵ ناوی ئەوی وەکو تیرۆریست ڕاگەیاندووە، بۆ ئەوەی زیان بە پارتیمان نەگەیەنێ، ئیدی لێمان ناپرسێتەوە. من دواین کەسم ئاگاداری هەواڵی ئەو



دەبم. ئیپەک چی گوت سەبارەت بە ڕاسپاردەکانم؟"

(کا) گوتی ئیپەک وەڵامێکی تایبەتی نەبووە لە بەرامبەر ویستی موختاردا سەبارەت بە دووبارە بەیەکگەیشتنەوەیان.

موختار ڕوویەکی وای نیشان دا وەکو ئەوەی ئەمە وەڵامێکی زۆر تایبەت بێت و گوتی دەیەوێ (کا) بزانێ هاوسەری پێشووی چەندە هەستیار، دڵناسک و تێ گەیشتووە. ئێستا زۆر پەشیمانە لەوەی لە ساتێکی پڕ لەتەنگژەی ژیانیدا خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردووە. دوایی گوتی: "لە گەڕانەوەتدا بۆ ئەستەمبوڵ، ئەو شیعرانەی پێم دابووی، بەدەستی خۆت ڕادەستی فاخیریان دەکەی، وا نییە؟" پاش وەرگرتنی وەڵامی ئەرێ لە (کا)، ئاماژەی مامێکی بەبەزەیی و خەمناک سیمای موختاری داپۆشی. (کا) لەبری شەرم بەخۆدا هاتنەوە لە بەرامبەر موختاردا، پەی بە هەستێکی تێکەڵ لە بەزەیی و نەفرەت برد و بینی وا کابرا لەو ساتەدا ڕۆژنامەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا. موختار بەزەوقەوە گوتی: "من بوومایە لەبری تۆ، ئاوا بێ غەم بە کوچە و شەقامەکاندا نەدەخولامەوە."

(کا) ژمارەی سبەینێی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) کە هێشتا مەرەکەبەکەی وشک نەبووبووەوە، لە دەستی ڕفاند و بەپەرۆشەوە دەستی بە خوێندنەوەی کرد: "سەرکەوتنی شۆڕشی شانۆکاران... ڕۆژانی ئارامی لە قارس، هەڵبژاردنەکان دواخران، هاوڵاتیان لە شۆڕشەکە ڕازین..." دواتر هەواڵێکی لاپەڕەی یەکەمی خوێندەوە کە موختار بە پەنجە ئاماژەی بۆ کرد:

## خودانەناسێک لە قارسدا

### لەم ڕۆژگارە ئاڵۆزەدا گەڕانی (کا)ی بەناو شاعیر بە شارەکەماندا مایەی گومانە

وتارەکەی دوێنێمان کە ئەم بەناو شاعیرەمان تێدا ناساندبوو، لە لایەن قارسییەکانەوە بە ڕەخنەوە پێشوازیی لێ کرا

دوێنێ شەو هونەرمەندی گەورە سونای زایم و هاوڕێکانی، لە ناو جۆش و خرۆشی جەماوەردا شانۆنامەیەکی ئەتاتورکییان بە سەرکەوتوویی نمایش کرد کە ئاشتی و

سەقامگیری لەگەڵ خۆیدا بۆ شاری قارس هێنا. قسە و باسی زۆرمان پێ گەیشتووە سەبارەت بەوەی کە (کا)ی بەناو شاعیر لە ناوەڕاستی شانۆنامەکەدا چووەتە سەر شانۆ و شیعرێکی بێ تامی خوێندووەتەوە و زەوقی ئامادەبووانی شێواندووە. لەم ڕۆژگارەدا کە هێزە دەرەکییەکان پاڵ بە ئێمەی خەڵکی قارسەوە دەنێن کە ساڵانێکی درێژە بەهەمان گیانی برایەتییەوە پێکەوە دەژین، بۆ شەڕی ناوخۆیی و هەوڵدەدەن کۆمەڵگاکەمان بەسەر لایسیست و دیندار، کورد، تورک و ئازەریدا دابەش بکەن و کۆمەڵکوژیی ئەرمەنی کە ئیدی لە بیر کراوە زیندوو بکەنەوە. لە ڕۆژگارێکی وادا، پەیدابوونی کەسێکی لەکەدار وەکو سیخوڕ لەناوماندا کە لە تورکیا هەڵاتووە و ساڵانێکی درێژە لە ئەڵمانیا دەژی، زەمینەی خۆش کردووە بۆ پرسیارکردن لە ناو خەڵکدا. ئایا ئەوە ڕاستە دوو ڕۆژ لەمەوبەر لە وێستگای شەمەنەفەر لەگەڵ چەند لاوێکی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێناندا کە بەداخەوە بۆ هەموو جۆرە ئاژاوەگێڕانێک لەسەر پێن، کۆبووەتەوە و گوتوویەتی: "من ئەتایستم، باوەڕم بە خودا نییە، بەڵام خۆیشم ناکوژم، هەرچۆنێک بێت -حاشا- خودا نییە؟"ئایا ئازادیی بیر و ڕادەربڕین لە ئەوروپا بەواتای نکۆڵیکردن لە هەبوونی خودا و ئەوە دێ بڵێی: "ئەرکی ڕۆشنبیر زماندرێژیکردنە بۆسەر پیرۆزییەکانی میللەت؟"بەڕێوەچوونی ژیانت بە پارەی ئەڵمانی، مافی ئەوەت پێ نابەخشێ بیر و باوەڕی ئەم میللەتە بخەیتە ژێر پێیەکانتەوە! ئەرێ ئەوە بەهۆی شەرمکردنتە لە تورک بوونت ناوی ڕاستەقینەی خۆت شاردووەتەوە و ناوی بیانیی (کا)ت بۆ خۆت داناوە؟ بەداخەوە، وەکو خوێنەرانیشمان لە ڕێی تەلەفۆنەوە پێیان ڕاگەیاندین، ئەم بێ باوەڕە لاساییکەرەوەیەی ڕۆژئاوا لەم ڕۆژگارە دژوارانەماندا بەمەبەستی ئاژاوەگێڕان هاتووەتە ناومانەوە. چووەتە هەژارترین کوچەی کوڵێتنشینەکان و ماڵ بە ماڵ لە دەرگای داوە و خەڵکی هان داوە بۆ ڕاپەرین، بگرە لە دژی ئەتاتورکیش دەمدرێژیی کردووە، ئەو ئەتاتورکەی کە ئەم نیشتمانە و ئەم کۆمارەی بە ئێمە بەخشیوە. ئەم بەناو شاعیرە کە لە هوتێلی بەفرپالاس لای داوە، هەموو دانیشتووانی قارس بەپەرۆشن بۆ زانینی هۆی هاتنی بۆ شارەکەمان. لاوانی قارس دەزانن چۆن سنووری ئەو کفربازانە دیاری بکەن کە نکۆڵی لە هەبوونی خودا و پەیامبەر (د.خ) دەکەن.

موختار گوتی: "بیست خولەک لەمەوبەر کە بەوێدا تێ پەڕیم، دوو کوڕەکەی



سەردار تازە ڕۆژنامەکەیان چاپ دەکرد." مەبەستی لەم قسەیە هاوسۆزی نیشاندان نەبوو بۆ ترس و دەردەکانی (کا)، بگرە بە شێوازی کەسێک دەری بڕی کە خۆشحاڵ بێ بە کردنەوەی بابەتێکی سەفابەخش.

(کا) هەستی بە تاک و تەنیاییی خۆی کرد و جارێکی تریش بەوردی هەواڵەکەی خوێندەوە.

سەردەمانێک کە هێشتا خەونی بە پایەیەکی ئەدەبی درەوشاوەوە لە داهاتوودا دەبینی، (کا) پێشبینیی کردبوو لە پای ئەو نوێکارییە هاوچەرخانەی کە دەیویست بیهێنێتە ناو شیعری تورکییەوە (ئەم چەمکە نەتەوەپەرستییە ئێستا بەلای (کا)وە مایەی پێکەنین و بەزەیی پێداهاتنەوە بوو)، تووشی ڕەخنە و پەلاماری زۆر دەبێ، پێیشی وابوو ئەو دوژمنایەتی و لێ تێنەگەیشتنە جۆرێک لە ناوبانگی بۆ پەیدا دەکەن. لە ساڵانی دواتردا، سەرباری کەمێک ناوبانگ دەرکردنیش، بەهیچ جۆرێک ڕەخنەی هێرشکارانەی لەدژ نەنووسرابوو، بۆیە ئێستا ئەم "بەناو شاعیر"ە لە کەللەی دابوو.

پاش ئەوەی موختار وشیاری کردەوە وەکو ئامانجێک بەو ناوەدا نەسووڕێتەوە، بەتەنیا لە چایخانەکە جێی هێشت و ڕۆیشت. ترسی مردن چووە هەناوی (کا)وە. لە چایخانەکە هاتە دەرەوە، بەدەم داڵغە لێدانەوە بەژێر کلووە گەورەکانی بەفردا کە بەخێرایییەکی ئەفسووناوی دەباری و فیلمێکی خاوی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ، کەوتە ڕێ.

لە ساڵانی سەرەتای لاویدا، مردن لە پێناوی ئامانجێکی ڕۆشنبیری یاخۆ سیاسیدا، یان لە پێناوی ئەو شتانەدا کە خۆی دەینووسێ، لە چاوی (کا)دا یەکێک بوو لەو پلە مانەوییە بەرزانەی کە دەکرا مرۆڤ بیگاتێ. کاتێک تەمەنی لە سی ساڵان تێ پەڕی، تووڕەهاتیی ژیانی ژمارەیەکی زۆر برادەر و ناسراوی کە: لە پای پەیوەستبوون بە بنەمای پوچ و بگرە خراپیشەوە لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانیان لە دەست دابوو، لەسەر دەستی چەتەکانی سیاسەت لە چەقی کوچەکاندا کوژرابوون، لە هەوڵەکانی تالانکردنی بانکدا تیا چووبوون، لە هەموویشی خراپتر ئەوانەی لە کاتی ئامادەکردنی بۆمبادا بە خۆیاندا تەقیبوونەوە و مردبوون، (کا)ی لە بیرۆکەی

خۆبەکوشتدان دوورخستبووەوە. (کا) لە ئەڵمانیا کە لە پای کۆمەڵێک هۆکاری سیاسی کە ئیدی هیچ بڕوای پێیان نەمابوو، ساڵانێکی درێژی لە دەربەدەریدا بەسەر بردبوو، پێوەندیی نێوان سیاسەت و خۆفیداکردنی مرۆڤی بەتەواوی لە مێشکی خۆی تووڕ هەڵدابوو. کاتێکیش لە ڕۆژنامە تورکییەکاندا لە ئەڵمانیا دەیخوێندەوە کە نووسەری فلان گۆشە لەبەر هۆکاری سیاسی -بە ئەگەری زۆر- لە لایەن ئیسلامییە سیاسییەکانەوە کوژراوە، نەفرەتی لە ڕووداوەکە دەکرد و لەبەرامبەر کوژاوەکەشدا هەستی بەڕێز دەکرد، بەڵام هیچ جۆرە هەستێکی شەیدابوون بە ڕۆژنامەنووسی کوژراو بە ناخیدا گوزەری نەدەکرد.

سەرباری ئەوەیش، خەیاڵی بۆ ئەوە چوو کە تفەنگچییەکی خەیاڵی لە کونێکی بەفربەستووی دیوارێکی گۆشەی شەقامی خالید پاشا و شەقامی کازم قەرەبەکرەوە نیشانی لەم گرتووە و لە ناکاو تەقەی لێ دەکات و بەمردوویی دەکەوێت بەسەر شۆستە ڕچیوەکەدا، تێ کۆشا پێشبینی بکات ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ لە دوای ئەم ڕووداوە چی دەنووسن. بە ئەگەری زۆر، پارێزگا و میت بۆ ڕێگرتن لە گەورەبوونەوەی ڕووداوەکە و بۆ خۆدزینەوە لە بەرپرسیارێتی خۆیان، ڕەهەندی سیاسیی ڕووداوەکە پەردەپۆش دەکەن. ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵیش کە نەیاندەزانی کوژراوەکە شاعیر بووە، هەواڵەکەیان بڵاو دەکردەوە یان نەدەکردەوە. تەنانەت ئەگەر شاعیرانی هاوڕێی و کارمەندانی ڕۆژنامەی جمهورییەتیش دواتر هەوڵیان بدایە بۆ ئاشکراکردنی ڕەهەندی سیاسیی ڕووداوەکە، ئەوا ئەمە لە بایەخی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کەم دەکردەوە کە لەوانەبوو لەسەر شیعرەکانی بنووسرێ (کێ ئەم لێکۆڵینەوەیەی دەنووسی؟ فاخیر؟ ئۆرهان؟)، یاخۆ هەواڵی مردنەکەی دەخرایە سەر ئەو لاپەڕە ڕۆشنبیرییانەی کە کەس نایانبینێ. ئەگەر بەڕاستی ڕۆژنامەنووسێکی ئەڵمانی بەناوی هانز هانزن هەبوایە و (کا)یش بیناسیبا، ئەوا لەوانە بوو هەواڵەکەی لە ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ڕوندشاودا بڵاو بکردایەتەوە، بەڵام هیچ ڕۆژنامەیەکی تری ڕۆژئاوایی ئەمەی نەدەکرد. (کا) وەکو دڵی خۆی بداتەوە، لە خەیاڵی خۆیدا وای بۆچوو لەوانەیە شیعرەکانی بکرێن بە ئەڵمانی و لە گۆڤاری -ئاکتسێنت-دا بڵاو بکرێنەوە. سەرباری ئەم دڵدانەوەیەش، (کا) لێی ئاشکرابوو ئەگەر لەسەر هەواڵەکەی



(ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) بکوژرێ، ئەوا بەڕاستی (فەوتان دەبێ لەپێناوی گوودا.) لە مردن زیاتر، لەوە دەترسا لە کاتێکدا بکوژرێ کە هیوای لە فرانکفورت پێکەوە بەختەوەر بوون لەگەڵ ئیپەکدا، تازە لە دڵیدا چەکەرەی کردبوو.

بڕێک لەو نووسەرانە هاتنەوە پێش چاوی کە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردووودا بەدەستی ئیسلامییەکان کوژرابوون: جۆشی پۆزەتیفی وتارخوێنێک کە دواتر بووبوو بە ئەتایست و هەوڵی دەدا (ناکۆکییەکان)ی ناو قورئان بخاتە ڕوو (لە پشتی سەریەوە گوللەیەکیان پێوە نابوو)، ڕق و کینی سەرۆکێکی دەستەی نووسەران کە لە گۆشەکەی خۆیدا بە پێڕابواردنەوە کچانی سەرپۆش بەسەر و ژنانی چارشێو بەسەری بە (سیسرک) دەشوبهاند (ئەویان دەمەوبەیانییەک لەگەڵ شۆفێرەکەیدا پێکەوە گوللەباران کردبوو)، یاخۆ هەوڵی گۆشەنووسێک کە تێ دەکۆشا ڕایەڵەیەک لە نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا و ئێراندا دابنێ (کاتێک ویستبووی ئۆتۆمبیلەکەی دابگیرسێنێ، تەقیبووەوە). -هەرچەندە هەستێکی بەزەیی پێداهاتنەوە لە ناخەوە چاوەکانی تەڕ کرد- بەڵام هەموو ڕووداوەکانی بە تووڕەهات زانی. (کا) زۆر پەست نەبوو لەوەی کە ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ و ڕۆژئاوا هیچ بایەخیان بەم نووسەرانە نەدەدا یاخۆ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە لەبەر ئەو هۆیانە لە سەر شەقامی شارە دوورەکان بە گوللە سارد دەکرانەوە، بەڵکو لەوە تووڕە بوو زادەی کولتوورێکە کە دوای ماوەیەکی کورت بۆ هەتا هەتایە هەموو نووسەران و ڕۆژنامەنووسانی تیرۆرکراوی لە بیر دەکرد. بە سەرسوڕمانەوە بۆی دەرکەوت خۆخزاندنە گۆشەیەکەوە و بەختەوەربوون چ کارێکی هۆشمەندانەیە.

کاتێک گەیشتە بەردەم نووسینگەی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) لە شەقامی فایەق بەگ، ژمارەی سبەینێی ڕۆژنامەکەی بینی کە لە گۆشەی جامخانە لە بەفر پاککراوەکەدا هەڵواسرابوو. هەمدیسان هەواڵەکەی سەبارەت بە خۆی خوێندەوە، چووە ژوورەوە. کوڕە گەورەکەی سەردار بەگ بەشێک لە ڕۆژنامە چاپکراوەکانی بە پەتێکی لاستیک گرێ دەدا. بۆ ئەوەی کوڕەکە بیناسێتەوە، کڵاوەکەی داکەند و کێشای بە شانەکانیدا کە بەفر گرتبووی.

کوڕە بچووکەکەیان لە پشتەوە هات و پەڕۆیەکی بەدەستەوە بوو کە دەزگای

چاپەکەی پێ سڕیبووەوە، گوتی: "باوکم لێرە نییە! چا دەخۆنەوە؟"

"کێ ئەو هەواڵەی لەسەر من نووسیوە کە لە ژمارەی سبەینێی ڕۆژنامەکەدا چاپ کراوە؟"

کوڕە بچووکەکە بەدەم بەرزکردنەوەی برۆکانیەوە پرسی: "هەواڵ لە بارەی ئێوەوە چاپ کراوە؟"

برا گەورە لچ ئەستوورەکەی بە خەندەیەکی دۆستانە و بە لە خۆ ڕازیبوونەوە گوتی: "چاپ کراوە، باوکم خۆی ئەمڕۆ هەموو هەواڵەکانی نووسیوە."

(کا) گوتی: "ئەگەر سبەینێ ئەو ڕۆژنامەیە دابەش بکەن،" کەمێک بیری کردەوە: "لەوانەیە بۆ من خراپ بێت."

کوڕە گەورەکە گوتی: "بۆچی؟" پێستێکی نەرم و دوو چاوی تا بڵێی پاک و بێ گەردی پێوە بوو کە زۆر بە سادەیی لە ناخەوە دەیانڕوانی.

(کا) حاڵی بوو تەنیا کاتێک دەتوانێ زانیارییان لێ وەربگرێ کە لە کەشێکی دۆستانەدا وەکو منداڵ پرسیاریان لێ بکات. بەوجۆرە بۆی ئاشکرا بوو کە: تا ئێستا تەنیا موختار بەگ، منداڵێک لە بارەگای پارتی نیشتمانی دایک و مامۆستای خانەنشینی ئەدەب نوورییە خان کە هەموو ئێوارانێک دێ، پارەیان داوە و هەریەکەیان دانە ڕۆژنامەی خۆی بردووە، ئەگەر ڕێگا و بانەکان کرابانەوە، ئەوا ژمارەکانی چاپی دوێنێ و ئەمڕۆیان دەیاگەیاندە ئەو پاسانەی کە بۆ ئانکارە و ئەستەمبوڵ بەڕێ دەکەون، هەردوو کوڕەکە سبەینێ پاشماوەی ڕۆژنامەکە لە قارسدا دابەش دەکەن، ئەگەر باوکیان داوایان لێ بکات، ئەوا ئەمان دەتوانن تا دەمەوبەیانی جارێکی تر ڕۆژنامەکە چاپ بکەنەوە، کوڕەکان گوتیان کە باوکیان کەمێک لەمەوبەر لە بارەگای ڕۆژنامەکە دەرچووە و بۆ نانی ئێوارەیش نایاتەوە بۆ ماڵ. (کا) گوتی کە چاوەڕێی چاخواردنەوە ناکات، ڕۆژنامەیەکی کڕی و خۆی کرد بەناو جەرگەی شەوی سارد و بکوژی قارسدا.

هەڵسوکەوتی بێ غەم و بێ گەردی منداڵەکان، (کا)ی کەمێک ئارام کردەوە. بەدەم ڕێکردنەوە بە نێوان کلووە بەفرەکاندا کە لەسەرخۆ دەکەوتنە خوارەوە، بە





هەستکردن بە تاوانەوە لەخۆی پرسی داخۆ ترسەکەی زیاد لە پێویست نییە، بەڵام بە گۆشەیەکی هۆشی دەیزانی ژمارەیەکی زۆری نووسەری بەدبەخت یان سنگ و سەریان پڕ کراوە لە فیشەک، یاخۆ بە پۆستە پاکەتیان بۆ هاتووە و وایان زانیوە لوقومە و خوێنەران بۆیان ناردوون، بە شەوقەوە پاکەتەکانیان کردووەتەوە و لەگەڵ هەڵدانەوەیاندا پیایاندا تەقیوەتەوە و ناچاربوون ماڵئاوایی لەم جیهانە بکەن. بۆ نموونە شاعیر نوورەدینی شەیدای ئەوروپا، سەرباری ئەوەی فڕی بەسەر بابەتی لەو جۆرەوە نەبوو، چەند ساڵێک لەمەوبەر وتارێکی نیمچە (زانستی)ی زۆر تووڕەهاتی سەبارەت بە پێوەندیی نێوان ئاین و هونەرەوە نووسیبوو. ڕۆژنامەیەکی سەر بە ڕەوتی ئیسلامی سیاسی وتارەکەی بە دەسکاریکردنەوە بە چاپ گەیاندبوو و نووسیبووی کە (سووکایەتیی بە ئاینەکەمان کردووە!). شاعیر نوورەدینیش تەنیا لەبەرئەوەی پێی نەڵێن ترسنۆکە، بە گەرمی پشتیوانیی لە بۆچوونەکانی خۆی کردبوو. دواتر هەزری ئاگرینی کەمالیستییانەی ئەو لە لایەن چاپەمەنیی لایسیستی نزیک لە سوپاوە بە پێوەنانەوە کە خۆیشی ئەمەی پێ خۆش بوو، گەیەندرابووە پلەی قارەمانێتی. دواتریش لە ئاکامی تەقینەوەی بۆمبێکدا کە لە توورەکەیەکی نایلۆندا لە بەردەم پێچکەی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکەیدا دانرابوو، جەستەی شاعیر نوورەدین بووبوو بە چەندین هەزار پارچەوە، بۆیە لە کاتی بەڕێکردنیدا بۆ گۆڕستان، ئاپۆڕەیەکی گەورە دوای تابووتێکی بۆش کەوتبوون. (کا) لە میانەی هەواڵە بچووک و سەرنجڕانەکێشەکانی سەر لاپەڕەکانی پشتەوەی ڕۆژنامە تورکییەکانەوە کە لە کتێبخانەی فرانکفورت دەیخوێندەوە، دەیزانی ڕۆژنامەنووسانی کۆنە چەپی ناوچە دوورە دەستەکان، پزیشکە ماتەریالیستەکان و ڕەخنەگرانی ئاین، کاتێک سەریان لێ دەشێوا و دەیانگوت "چۆن دەبێ ناوم بە ترسنۆک دەربچێ"، یاخۆ کەڵکەڵەی ئەوە دەکەوتە سەریان کە "بەڵکو بێت و وەکو سەلمان ڕوشدی سەرنجی هەموو جیهان بۆ سەر خۆم ڕابکێشم"، وەکو نووسەران و ڕۆژنامەنووسانی شارە گەورەکان بە نانەوەی بۆمبا نەدەکوژران، بەڵکو لە لایەن هەندێک ئاینداراني تووڕە و گەنجەوە کە بگرە دەمانچەشیان بەدەستەوە نەبوو، بە دەستی ڕووت لە گۆشەی کوچە تاریکەکاندا دەخنکێندران یاخۆ بەر چەقۆ دەدران. بۆیە (کا) بیری لەوە کردەوە

پێویستە چی بڵێ (ئەتایستم، بەڵام هەڵبەتە سووکایەتیم بە پەیامبەر نەکردووە؟ – باوەڕم نییە، بەڵام لە بەرامبەر ئایندا بێڕێزی نانوێنم؟) ئەگەر هات و هەڵێکیان دایێ بۆ وەڵامدانەوە لە (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)دا تاکو هەم پێستی کون نەکرێ و هەم ئابڕووی خۆیشی ڕزگار بکات. لەپڕ گوێی لە دەنگی پێی کەسێک بوو کە بەفرەکەی دەشێلا و لە دواوە لێی نزیک دەکەوتەوە. بە سەرسوڕمانەوە ئاوڕی بۆ دواوە دایەوە؛ ئەمە ئەو بەڕێوەبەری کۆمپانیای پاسە بوو کە دوێنێ ئەم کاتانە لە سەردانیدا بۆ تەکیەی شێخ سەعادەدین ئەفەندی بینیبووی. (کا) بیری بۆ ئەوە چوو ئەم کابرایە دەتوانێ گەواهی بدات کە ئەم ئەتایست نییە، دوایی شەرمی بەم بیرکردنەوەیەی خۆیدا هات.

بەدەم شەیدابوونی جوانیی بەفر بارینەکەوە، کە هەستێکی سادە و ئەفسوناویی دووبارەبوونەوەی دەبەخشی، بەسەر گۆشەی ڕچیوی شۆستەکاندا هێدی هێدی بە شەقامی ئەتاتورکدا چووە خوارێ. ساڵانێک دواتر لە خۆی دەپرسی بۆچی دیمەنی جوانیی بەفر لە قارس، ئەو دیمەنانەی کە لە هاتوچۆی سەر شۆستە ڕچیوەکاندا دەکەوتنە بەرچاوی (سێ منداڵ لای خوارەوە پاڵیان بە عەرەبانەیەکی سەر بەفرەوە دەنا، تیشکی سەوزی تاقە ترافیک لایتی قارس لە جامخانەی وێنەگری ئایدندا ڕەنگی دەدایەوە)، هەمیشە وەکو کۆمەڵێک پۆستکارتی غەمگین و لەبیر نەکراو لەگەڵ خۆیدا دەگێڕێ.

لە بەردەم دوورمانخانە کۆنەکەدا کە سونای وەکو بارەگا بەکاری دەهێنا، ئۆتۆمبیلێکی سەربازی و دوو سەربازی ئێشکگری بینی. سەربازەکان بۆ خۆپاراستن لە سەرما خۆیان بە چوارچێوەی دەرگاکەوە نووساندبوو. (کا) چەند جارێک بۆی دووپاتکردنەوە کە دەیەوێ سونای ببینێ، بەڵام سەربازەکان وەکو ئەوەی ئەم کابرایەکی لادێی بێ و بیەوێ سکاڵانامە بە سەرۆکی ئەرکانی سوپا بگەیەنێ، بەپاڵ لەو ناوە دووریان خستەوە. لە خەیاڵیدا بوو چاوی بە سونای بکەوێ و دابەشکردنی ڕۆژنامەکەی پێ ڕابگرێ. هۆی شپرزەیی و تووڕەبوونەکەی دواتری دەگەڕایەوە بۆ ئەم خەیاڵشکاندنەی. لە ناخەوە ئارەزووی دەکرد بە ڕاکردن بەسەر بەفرەکەدا بۆ هوتێلەکە بگەڕێتەوە، بەڵام بەر لەوەی بگاتە سەر سووچی یەکەم کۆڵان، لای چەپەوە



خۆی کرد بە چایخانەی یەککگرتندا . لە نێوان سۆپاکە و ئاوێنەی سەر دیوارەکەدا دانیشت و شیعری (مردن بە تیرباران)ی نووسییەوە.

(کا) لە تێبینییەکانیدا ، (ترس)ی بە هاندەری بنەڕەتیی ئەم شیعرەی دانابوو. دواتر لە نێوان هەردوو تەوەرەی بیرەوەری و خەیاڵدا لەسەر نیگارەکەی گەردیلەی بەفردا جێگای کردەوە. شیعرەکە گوێزەرەوەی پێشبینییەکی بێ فیز بوو کە لە خۆیدا هەڵی گرتبوو. (کا) دوای لێبوونەوە لە نووسینەوەی شیعرەکە، لە چایخانەی یەککگرتن هاتە دەرێ، کاتێک گەیشتەوە هوتێلی بەفرپالاس، سەعات هەشت و بیست خولەک بوو. خۆی هاویشتە سەر چرپاکەی، بەدەم سەیرکردنی کلووە گەورەکانی بەفرەوە کە لەبەر ڕۆشنایی گڵۆپی سەر جادەکە و تیشکی پەمەیی پیتی (کاف)دا لەسەرخۆ بەردەبوونە خوارەوە، هەوڵی دا بۆ زاڵبوون بەسەر شپرزەیی هەناویدا داڵغەی ئەوە لێ بدات کە لەگەڵ ئیپەکدا لە ئەڵمانیا چەندە بەختەوەر دەبن. دوای دە خولەک کەڵکەڵەی هەرچی زووتر بینینی ئیپەکی کەوتە سەر، خۆی لە بەرامبەر ئەم ویستەدا بۆ ڕانەگیرا و چووە خوارەوە. هەموو ئەندامانی خێزانەکەی بینی کە لەگەڵ میوانێکدا دەوری خوانەکەیان دابوو، زاهیدە تازە مەنجەڵە شۆرباکەی لەسەر مێزەکە دانابوو، (کا) بە بینینی درەوشانەوەی قژە کاڵەکەی ئیپەک شادییەک بە هەناویدا گەڕا . (کا) لەو جێیەی نیشانی درا ، لە تەنیشت ئیپکەوە دانیشت، بە شانازییەوە هەستی کرد هەموو ئەوانەی دەوری خوانەکە بە ئەڤینی نێوان ئەمان دەزانن. دواترێ سەرنجی دا میوانەکەی بەرامبەری، سەردار بەگی خاوەن (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) بوو.

سەردار بەگ بە زەردەخەنەیەکی دۆستانەی ئەوتۆوە دەستی بۆ درێژ کرد و دەستی گوشی، بەجۆرێک (کا) بۆ ساتێک لەو نووسراوە کەوتە گومانەوە کە لە ڕۆژنامەکەی گیرفانیدا چاپ کرابوو. قاپەکەی درێژ کرد و شۆربای خۆی وەرگرت، لە ژێر مێزەکەوە دەستی خۆی خستە باوەشی ئیپەکەوە، سەری لە سەری نزیک خستەوە و هەستی بە بۆن و هەبوونی کرد، بە گوێیدا چرپاند کە بەداخەوە هیچ هەواڵێکی سەبارەت بە شینە دەسگیر نەبووە. دواتر دەسبەجێ چاوی کەوتە سەر چاوی قەدیفە کە لە تەنیشت سەردار بەگەوە دانیشتبوو و تێ گەیشت لەو ماوە کورتەدا هەواڵی بە

ئیپەک گەیاندووە. لە ناخەوە هەستی بە تووڕەیی و سەرسوڕمان دەکرد، بەڵام سەرباری ئەوەیش توانی گوێ بۆ گازندەکانی تورگوت بەگ سەبارەت بە کۆبوونەوەکەی هوتێل ئاسیا ڕابگرێ: تورگوت بەگ گوتی کە سەرلەبەری کۆبوونەوەکە گێچەڵگێڕان بووە، دڵنیایش بوو لەوەی پۆلیس لە هەموو شتێک ئاگادارە. دواتر گوتی: "بەڵام هیچ پەشیمان نیم لە بەشداربوونم لەو کۆبوونەوە مێژووییەدا. مەمنوونم لەوەی کە بە چاوی خۆم بینیم ئەو لاو و پیرانەی قارس کە خولیای سیاسەتیان هەیە، کەرەسەیەکی چەند هەرزان بەهایان بەدەستەوەیە. تێ گەیشتم کە لەگەڵ ئەم توێژە هەرە گێژ و بێ عەقڵ و ڕەبەنەی شاردا سیاسەت و میاسەت ناکرێ. لە ڕاستیدا من بۆ بەرەنگاربوونەوەی کودەتاکە چووم بۆ کۆبوونەوەکە، بەڵام لەوێ هەستم کرد سوپا شتێکی باشی کردووە کە قارسی ڕادەستی ئەم تالانکەرانە نەکردووە. داوا لە هەمووتان دەکەم، لە سەرووی هەموانیشەوە قەدیفە، بەر لەوەی لەم وڵاتەدا دەست بە سیاسەتەوە بدەن، زۆر بە باشی بیر بکەنەوە. هەروەها ئەو ژنە گۆرانیبێژەمان کە خۆی بۆیاخ کردووە و لەبەر دەروازەی پیری ڕاوەستاوە و ئێستا دەیبینن لە تەلەفزیۆندا دۆلابی بەخت دەسوڕێنێتەوە، سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر هەموو کەسێک لە ئەنکارا دەیزانی کە دۆستی نهێنیی وەزیری پێشووتری دەرەوە فاتن ڕوشدی زۆرلووە. ئەو وەزیرە دواتر لە سێدارە درا."

کاتێک (کا) (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ی لە گیرفانی دەرهێنا و نیشانی ئەوانەی دەوری خوانەکەی دا و گوتی کە وتارێکی لەدژی ئەو تێدا نووسراوە، بیست خولەک بەسەر دانیشتنیاندا لە دەوری خوانەکە تێ پەڕیبوو و سەرباری تەلەفزیۆنە داگیرساوەکە، کەچی بێدەنگی باڵی بەسەریاندا کێشابوو.

سەردار بەگ گوتی: "منیش دەمویست باسی ئەوە بکەم، بەڵام نەمزانی چۆن، چونکە لەوەدا تیامابووم نەوەک بە هەڵە لێم تێ بگەن."

تورگوت بەگ گوتی: "سەردار، سەردار، هەمدیسان لە کێوە دەستووری چیت پێ دراوە؟ حەیفە وا لە میوانەکەمان دەکەی. ڕۆژنامەکەی بدەنێ با بیخوێنێتەوە و بزانین چی گوویەکی خواردووە."



سەردار بەگ بەدەم وەرگرتنی ڕۆژنامەکەوە لە (کا) گوتی: "دەمەوێ بزانن کە باوەڕم بە یەک وشەی ئەوە نییە کە نووسیومە. ئەگەر بیرتان بۆ ئەوە بچێ کە باوەڕم پێیەتی، ئەوا زیزم دەکەن. تورگوت بەگ، تکایە پێی بڵێ ئەمە شتێکی تایبەت نییە، ڕۆژنامەنووسانی قارس، ئەگەر داوایان لێ بکرێ، ناچارن شتی وا بنووسن."

تورگوت بەگ گوتی: "سەردار هەمیشە لە پارێزگاوە فەرمانی بۆ دێ و بەردەوام قولی کەسێک دەبات بە دەمدا. کوا بیخوێنەوە بزانم چیت نووسیوە."

سەردار بەگ بە شانازییەوە گوتی: "بەڵام بڕوام بە یەک وشەیشی نییە. تەنانەت خوێنەرانیشمان بڕوای پێ ناکەن. هیچ ترسێک لە ئارادا نییە بۆ ئەو."

سەردار بەگ دەستی بە خوێندەوەی هەواڵەکە کرد، لە هەندێک جێدا بە شێوەیەکی دراماتیک یاخۆ بە گاڵتەجاڕییەوە دەنگی گڕ دەکرد. دواتر گوتی: "وەکو دەبینن، هیچ ترسێک لە گۆڕێدا نییە."

تورگوت بەگ لە (کا)ی پرسی: "ئایا ئێوە ئەتایستن؟"

ئیپەک بە تووڕەبوونەوە گوتی: "بابە، مەسەلەکە ئەوە نییە، ئەگەر ئەم ڕۆژنامەیە دابەش بکرێ، ئەوا سبەینێ لەسەر جادە دەیکوژن."

سەردار بەگ گوتی: "بەڕێزم، هیچ شتێک ڕوونادات. سوپا هەموو ئیسلامی و پاشقەڕۆکانی قارسی دەستگیر کردووە." ئەمجار ڕووی لە (کا) کرد و گوتی: "لە چاوەکانتاندا دەخوێنمەوە کە زویر نەبوون و دەزانن من ڕێز لە هونەرمەندان و مرۆڤدۆستییان دەگرم. بە پشت بەستن بە هەندێک ڕێسای ئەورووپی کە بۆ ئێمە دەست نادەن، نارەواییم لە دژ مەکەن! ئەو دەبەنگانەی قارس کە پێیان وایە لە ئەوروپان، تورگوت بەگیش بەمە دەزانێ، لە ماوەی سێ ڕۆژدا لە گۆشەیەکدا سارد دەکرێنەوە و لە بیر دەکرێن. چاپەمەنیی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ لە تەنگاسییەکی گەورەدایە. خەڵکی قارس ڕۆژنامەکەی من ناکڕن و ناخوێننەوە. داوودەزگاکانی دەوڵەت ئابوونەمانی ڕۆژنامەکەمن. بۆیە لەو جۆرە هەواڵانە چاپ دەکەین کە ئابوونەمانەکانمان حەزی پێ دەکەن. لە هەموو شوێنێکی جیهان، تەنانەت لە ئەمەریکایش، ڕۆژنامەکان بەر لە هەموو شتێک ئەو هەواڵانە بڵاو دەکەنەوە کە

خوێنەران دەیانەوێ. لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا، ئەگەر خوێنەر داوای هەواڵی درۆت لێ بکات، تۆ ناچیت ڕاستییەکان بنووسی و فرۆشی خۆت کەم بکەیتەوە. ئەگەر بە بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکان فرۆشتنی ڕۆژنامەکەم زیاد بکات، بۆچی نایکەم! جگە لەوەیش، پۆلیس مۆڵەتمان پێ نادات ڕاستییەکان بنووسین. لە ئانکارا و ئەستەمبوڵ سەد و پەنجا خوێنەری قارسیمان هەن. بە پێوەنانەوە لەسەریان دەنووسین، باسی سەرکەوتن و دەوڵەمەندبوونیان لەوێ دەکەین و ماستاویان بۆ سارد دەکەینەوە تاکو ئابوونەکانیان نوێ بکەنەوە. جا ئایا خۆشیان بڕوا بەم درۆیانە دەکەن، ئەوەیان شتێکی ترە." قاقایەکی لێ دا.

تورگوت بەگ گوتی: "تۆ ئەوەمان پێ بڵێ کێ ڕایسپاردی کە ئەم هەواڵە بنووسی؟"

"بەڕێزم، ئاشکرایە کە گرنگترین ڕێسای ڕۆژنامەوانی ڕۆژئاوا بریتییە لە شاردنەوەی سەرچاوەی هەواڵ."

تورگوت بەگ گوتی: "کچەکانی من ئەم میوانەیان خۆشویستووە، ئەگەر سبەینێ ئەم ڕۆژنامەیە دابەش بکەی، ئەوا هەرگیز ناتبوورن. ئایا هەست بە لێپرسراوی دەکەی ئەگەر ئیسلامییە هاربووەکان پەلاماری بدەن؟"

سەردار بەگ بە زەردەخەنەوە ڕووی لە (کا) کرد و گوتی: "هێندە دەترسن؟ ئەگەر هێندە دەترسن، سبەینێ هیچ مەچنە دەرێ."

تورگوت بەگ گوتی: "لە بری ئەوەی ئەو لەو ناوە نەبیندرێ، با ڕۆژنامەکە نەبیندرێ. ڕۆژنامەکەت دابەش مەکە."

"ئەمە ئابوونەمانەکانم توورە دەکات."

تورگوت بەگ، وەکو ئەوەی سروشێکی بۆ هاتبێ، گوتی: "باشە، ئەم ژمارەیە بدە بەوانەی کە داوایان کردووە. دواتر ئەم هەواڵە هەڵبەستراو و هاندەرەی دەرهەق بە میوانەکەمانی لێ دەربێنە و جارێکی تر لە چاپی بدەوە."

ئیپەک و قەدیفەیش پشتیوانیان لەم بیرۆکەیە کرد. سەردار بەگ گوتی: "مایەی شانازییە بۆ من کە ڕۆژنامەکەم هێندە بەهەند وەردەگیرێ. بەڵام کێ ئەرکی تێچوونی ئەم چاپە تازەیە لە ئەستۆ دەگرێ؟ کەوا بوو ئەوەیشم پێ بڵێن."



ئیپەک گوتی: "باوکم، ئێوارەیەک ئێوە و کوڕەکانتان لە ڕیستۆرانتی نیشتمانی سەوز بانگهێشتن دەکات."

سەردار بەگ گوتی: "ئەگەر ئێوەیش بێن، ئەوا دەبێ. با ڕێگا و بانەکان بکرێنەوە و ئەو ئاپۆڕەی شانۆکارانەمان لە کۆڵ بێتەوە، ئەوسا! قەدیفە خانمیش دێت. قەدیفە خانم، لێدوانێکم دەدەیێ سەبارەت بە پشتیوانیکردنت لە کودەتا سەربازییەکە بۆ ئەوەی لەو جێیەی دابنێم کە دوای دەرهێنانی هەواڵەکەی لەمەڕ (کا) بەگ بە چۆڵی دەمێنێتەوە؟ خوێنەران ئەمەیان زۆر بە دڵ دەبێ."

تورگوت بەگ گوتی: "نایدات، نا. مەگەر تۆ کچی منت نەناسیوە؟"

"قەدیفە خانم، ئایا دەتوانن ڕابگەیەنن کە لەو باوەڕەدان لە دوای کودەتاکەوە ڕێژەی خۆکوشتن لە قارس کەم دەبێتەوە؟ خوێنەرانمان ئەمەیان زۆر پێ خۆش دەبێ. بە تایبەتیش کە ئێوە لە دژی خۆکوشتنی کچانی مسوڵمانن."

قەدیفە قسەکەی پێ بڕی و گوتی: "ئیدی لە دژی خۆکوشتن نیم."

سەردار بەگ لە وەڵامدا گوتی: "باشە ئەمە ناتخاتە خانەی ئەتایستییەوە؟" ویستی بابەتێکی تر بێنێتە ئاراوە، بەڵام بەشی ئەوە هوشیار بوو کە تێ بگات کەوا ئەوانەی دەوروبەری خوانەکە لێی بێزار بوون. ئەمجار گوتی: "باشە بەڵێن دەدەم ڕۆژنامەکە دابەش نەکەم."

"چاپێکی نوێ دەکەنەوە؟"

"دوای دەرچوونم لێرە و پێش ڕۆیشتنەوەم بۆ ماڵ."

ئیپەک گوتی: "زۆر سوپاستان دەکەین."

کپییەکی درێژ و سەرسوڕهێنەر باڵی بەسەریاندا کێشا. (کا) ڕەوشەکەی پێ خۆش بوو: دوای چەندین ساڵ، جاری یەکەمی بوو هەستی دەکرد بەشێکە لە خێزانێک؛ پێی وابوو ئەو شتەی پێی دەگوترێ خێزان، شتێکە، سەرباری بەدبەختی و گرفتەکان، لەسەر بنەمای چێژی کەللەڕەقیی ناچاری بنیاد نراوە. زۆریش داخدار بوو کە ئەمەی لە ژیانی خۆیدا لە دەست دابوو. ئایا لەگەڵ ئیپەکدا تا بڕاندنەوەی ژیان بەختەوەر دەبوو؟ ئەوەی عەوداڵی بوو، بەختەوەری نەبوو، لە دوای پێکی سێیەم

زۆر بە جوانی پەی بەمە برد، بگرە دەکرێ بگوترێ بەدبەختیی دەخستە پێش بەختەوەرییەوە. گرنگ ئەو پێکەوەبوونە بێئومێدە بوو، دامەزراندنی چەقێکی دوو کەسی بوو لە دەرەوەی هەموو جیهان. هەستی دەکرد کاتێک ئەم چەقەی بۆ دادەمەزرێندرێ کە چەندین مانگ بێ پسانەوە لەگەڵ ئیپەکدا جووت بێ. دانیشتن لەگەڵ دوو خوشکدا کە ئەم دوانیوەڕۆیە لەگەڵ یەکێکیاندا نووستبوو، لە دەوری هەمان مێز، هەستکردن بە هەبوونی ئەوان و نەرمیی پێستیان، زانینی ئەوەی ئێوارە لە هاتنەوەیدا بۆ ماڵ بەتەنیا نابێ، هەموو ئەم شادییە سێکسییە و بڕوا هێنانی بە دابەشنەکردنی ڕۆژنامەکە، (کا)ی گەیاندبووە ئەوپەڕی کامەرانی.

لەبەرئەوەی لە ترۆپکی کامەرانیدا بوو، بە شێوەیەک گوێی بۆ بەسەرهات و قسەکانی ئەوانەی دەوروبەری خوانەکە ڕاگرت، وەکو ئەوەی گوێی بۆ بەیتی ئەفسانەیەکی سامناک ڕاگرتبێ، نەک بۆ زنجیرەیەک هەواڵی کارەسات: یەکێک لەو جحێڵانەی کە لە ئاشپەزخانەکە کاری دەکرد، بۆ زاهیدەی گێڕابووەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە دەستگیرکراوەکان براونەتە گۆڕەپانی تۆپانێکە کە تا نیوەی ستوونی گۆڵەکانی لە بەفردا دیار نەمابوو، بەدرێژاییی ڕۆژ لە دەرێ ڕاگیرابوون بۆ ئەوەی نەخۆش بکەون، یاخۆ تەنانەت لە سەرما ڕەق ببنەوە و بمرن، هەندێکیشیان بۆ ئەوەی ببن بە پەند بۆ ئەوانی تر، لە بن دیواری ژوورەکانی خۆگۆڕیندا تیرباران کرابوون. بینەرانی ڕەفتارەکانی ز. دەمیرکۆڵ و پیاوەکانی کە بەدرێژاییی ڕۆژ لە شاردا خەڵکیان تیرۆر کردبوو، هەندێک بەسەرهاتیان دەگێڕایەوە کە لەوانەیە هەندێکیان زۆریشیان پێوە نرابێ: هێرش کرابووە سەر بارەگای ناوەندی چاندی میزۆپۆتانیا کە لاوانی نەتەوەپەرستی کورد کاری (فۆلکلۆر و ئەدەبی)یان تێدا دەکرد، لەو کاتەدا کەس لەوێ نەبووە، پیرێکی بەساڵاچوو کە کاری چایچێتیی ناوەندەکەی دەکرد و شەوانیش هەر لەوێ دەمایەوە و فڕی بەسەر سیاسەتەوە نەبووە، خراپ دارکاری کراوە. دوو سەرتاش و کەسێکی بێکار کە شەش مانگ لەوەوبەر بە تاوانی ڕژاندنی بۆیاخ و سیاناو بەسەر پەیکەری ئەتاتورکدا لە بەردەم بازاڕی ئەتاتورکدا دۆسیەی لێکۆڵینەوەیان بۆ کرابووەوە و دەستگیر نەکرابوون، لەبەرئەوەی تا دەمەوبەیانی ئەمڕۆ دارکاری کرابوون، دانیان بە تاوانەکەی خۆیان و چالاکییەکانی تری دژ بە



ئەتاتورک لە شاردا نابوو: (شکاندنی لووتی پەیکەری ئەتاتورک لە ناو باخچەی ئامادەیی پیشەسازی بە چەکوش، نووسینی دەستەواژەی ناشیرین لەسەر پۆستەرێکی ئەتاتورک بە دیواری چایخانەی ئۆنبێشلەرەوە، داڕشتنی نەخشە بۆ شکاندنی پەیکەری ئەتاتورک لە بەردەم بارەگای پارێزگادا بە تەورداس.) دوو لاوی کورد بە تاوانی نووسینەوەی دروشم لەسەر دیوارەکانی شەقامی خالید پاشا لە دوای کودەتای شانۆکە، تەقە لە یەکێکیان کرابوو و لە جێدا کوژرابوو، ئەوی تریشیان دەستگیر کرابوو و تا هۆشی تێدا بووە دارکاری کراوە، لاوێکی بێکاری ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانیش کە بۆ سڕینەوەی دروشمی سەر دیوارەکان هێنرابوو، لە کاتی هەڵاتنیدا تەقەی لێ کرابوو و ڕانی بریندار کرابوو. هەموو ئەوانەی شتی ناشیرینیان سەبارەت بە سوپا و شانۆکاران لێ وەشابووەوە، یاخۆ قسە و قسەڵۆکی بێ بناغەیان بڵاو کردبووەوە، لە سایەی هەواڵدزانی ناو چایخانەکاندا کۆ کرابوونەوە، بەڵام وەکو لە ساتەکانی کارەسات و تاوانکاری لەم جۆرانەدا باوە، دەمگۆی پێوەنراویش بەناو خەڵکدا دەهات و دەچوو، دەگوترا؛ بڕێک لاوی کورد نارنجۆک لە دەستیاندا تەقیوەتەوە و کوژراون، چەند کچێکی سەرپۆش بەسەر بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە دژی کودەتاکە خۆیان کوشتووە، یاخۆ دەگوترا ئۆتۆمبیلێکی بارکراو بە دینامیت لە کاتی نزیکبوونەوەی لە پۆلیسخانەی ئینونو دەستی بەسەردا گیراوە.

(کا) لەبەرئەوەی پێشتریش هەواڵی هێرشی خۆکوژیی بە ئۆتۆمبیلی بارکراو بە مادەی تەقێنەر بیستبوو، سەرنجی خۆی لەم بابەتە دوورخستەوە، بەڵام چێژی لەوە وەرگرت کە بەدرێژاییی ئەو ئێوارەیە لە ئارامیدا لە تەنیشت ئیپەکەوە دانیشتبوو.

درەنگانی شەو، کاتێک تورگوت بەگ و کچەکانی لە دوای ڕۆیشتنی سەردار بەگ هەستان و ویستیان بچنە ژوورەکانی خۆیان، بە عەقڵی (کا)دا هات ئیپەک بۆ ژوورەکەی خۆی بانگ بکات، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا داواکەی ڕەت بکاتەوە و کامەرانییەکەی گەرد بگرێ، بگرە بێ ئەوەی ئاماژەیشی بۆ بکات، هەستا و ڕووی لە ژوورەکەی خۆی کرد.

## ٣٤

# قەدیفەیش ئەمە پەسەند ناکات

## ناوبژیوانی

(کا) بەدەم جگەرەکێشانەوە، لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە سەیری دەرەوەی کرد. بەفرەکە خۆشی کردبووەوە؛ خامۆشیی کوچە بە بەفر داپۆشراوەکان لەبەر ڕۆشناییی کزی گڵۆپی دارتەلەکاندا ئارامیی بە مرۆڤ دەبەخشی. (کا) زۆر باشی دەزانی ئەو کامەرانییەی کە هەستی پێ دەکات، زیاتر پێوەندیی بە ئەڤین و بەختەوەرییەوە هەیە نەک بە جوانیی بەفرەکەوە. لەوەیش بترازێ، لێرە لە تورکیا، بوونی ئەو لە ناو کەسانی هاوشێوە و هاوپلەی خۆیدا، ئاسوودەیی پێ دەبەخشی. کەسانی دەوروبەری، بەهۆی ئەوەی ئەم لە ئەڵمانیاوە یان لە ئەستەمبوڵەوە هاتووە، هەستێکی خۆ بەزلزانییان تێدا بەدی دەکرد. ئێستا هێندە بەختەوەر بوو، بەجۆرێک ئامادە بوو بۆ خودی خۆی دانی پێدا بنێ کە ئەو هەستە، ئاسوودەیییەکەی ئەمی بەهێزتر کردووە.

لە دەرگا درا، کاتێک (کا) ئیپەکی لەبەر دەرگا بینی، سەری سوڕما.

ئیپەک بەدەم هاتنە ژوورەوەوە گوتی: "بەردەوام بیرت لێ دەکەمەوە، خەوم لێ ناکەوێ."

(کا) دەسبەجێ حاڵی بوو کە بێ گوێدانە تورگوت بەگ تا بەیانی یەکتر دەگەوزێنن. شتێکی باوەڕ نەکراو بوو بۆ (کا)، بێ ئەوەی پێشتر ئازاری چاوەڕوانیی چەشتبێ، ئێستا بتوانێ ئیپەک لە ئامێز بگرێ. (کا) بەدرێژاییی شەو بەدەم جووتبوونەوە لەگەڵ ئیپەکدا تێ گەیشت لەودیو بەختەوەرییەوە سەرزەمینێکی تریش هەیە، تا ئێستا ئەزموونی ژیان و ئەڤین بەشی نەکردووە بۆ هەستکردن بەو هەرێمەی دەرەوەی زەمان و ئەوینداری. یەکەم جاری بوو لە ژیانیدا خۆی هێندە بە ئاسوودەیی ببینێ. جاران،



کاتێک لەگەڵ ژناندا دەنووست، کۆمەڵێک خەیاڵی سێکسی و ویست و ئارەزووی ئامادەی لە گۆشەیەکی مێشکیدا هەبوو کە لە فیلمە سێکسی و بەرنامەکانی پۆرنۆگرافەوە وەری گرتبوو، بەڵام ئێستا هەموو ئەوانەی لە بیر کردبوو. بەدەم جووتبوونەوە لەگەڵ ئیپەکدا، موزیکێکی نەزانراوی دۆزییەوە کە لە جەستەی خۆیدا هەڵی گرتبوو و پێشتر پەی پێ نەبردبوو، بەپێی هارمۆنیی ئەو موزیکە دەچووە پێشێ. جاروبار خەو دەیبردەوە، لە خەونیدا کە بۆنی شنەی شەماڵی بەهەشتی پشوویەکی هاوینی لێ دەهات، دەیبینی وا ڕادەکات، نەمرە، لە فڕۆکەیەکی بەرەوەبووودا سێوێک دەخوات و هەر تەواو نابێ. لەپڕ هەستی بە گەرمیی پێستی نەرمی ئیپەک کە بۆنی سێوی لێ دەهات، دەکرد و بێدار دەبووەوە. زۆر لە نزیکەوە سەیری ناو چاوەکانی ئیپەکی دەکرد کە ڕەنگی بەفر و تیشکی نیمچەزەردی لە دەرەوەهاتوو ڕووناکی دەکردەوە. دەیبینی ژنەکە بێدارە و بە کپی بۆ ئەم دەڕوانێ، هەستی دەکرد هەردووکیان لە دوو نەهەنگ دەچن کە لە ئاوێکی تەنکدا لە تەنیشت یەکەوە ڕاکشابن و ئەو کاتە دەیزانی کە دەستەکانی لە دەستی ئەمدان.

لە کاتی بێداربوونەوە و بینینی ڕووی یەکتردا، ئیپەک گوتی: "قسە لەگەڵ باوکمدا دەکەم، لەتەکتدا دێم بۆ ئەڵمانیا."

(کا) خەوی لێ نەدەکەوت. وەکو ئەوەی سەیری فیلمێکی شاد بکات، بە سەرتاپای ژیانی خۆیدا چووەوە.

لە ناو شاردا تەقینەوەیەک ڕووی دا. جێ، ژوور و هوتێلەکە چرکەساتێک لەرینەوە. لە دوورەوە دەنگی دەستڕێژی چەک دەبیسترا. ئەو بەفرەی شاری داپۆشیبوو، لە تینی دەنگەکانی کەم دەکردەوە. خۆیان لەیەک ئاڵاند و بەبێدەنگی چاوەڕێیان کرد.

دواتر، کاتێک (کا) لە خەو هەستا، دەنگی تەقە و دەستڕێژ بڕابووەوە. دوو جار لە جێیەکەی چووە دەرێ و لە بەردەم پەنجەرەکەدا، هەستی دەکرد هەوای ساردی بەفر گەیشتووەتە سەر پێستی. جگەرەیەکی داگیرساند. سروشی شیعری بۆ نەدەهات. لە ژیانیدا هەرگیز تا ئەو ڕادەیە کامەران نەبووبوو.

دەمەوبەیانی لەگەڵ لێدانی دەرگادا لە خەو هەستا. ئیپەک لە تەنیشتییەوە نەمابوو.

بیری نەکەوتەوە دواجار کەی خەوی لێ کەوتەوە، دواین قسەکانی لەگەڵ ئیپەکدا چی بوون و کەنگێ دەنگی تەقە براوەتەوە.

ئەوەی بەردەرگا، جاویدی کارمەندی پرسگەی هوتێل بوو، گوتی کە ئەفسەرێک هاتووە بۆ هوتێل، سونای زایم (کا)ی بانگهێشتن کردووە بۆ بارەگا و ئێستا ئەفسەرەکە لە خوارەوە چاوەڕێ دەکات. (کا) پەلەی نەکرد، ڕیشی تاشی.

کوچە چۆڵەکانی قارس بەلای ئەمەوە لە دوێنێ بەیانی ئەفسووناویتر و جوانتر بوون. لە جێیەکی بەشی سەرەوەی شەقامی ئەتاتورکدا ماڵێکی بینی کە دەرگاکەی شکێندرابوو، جامەکانی وردوخاش کرابوون و کونێک کەوتبووە ڕووبەری پێشەوەی.

لە دروومانخانەکە سونای گوتی کە هێرشێکی خۆکوژی لەو ماڵەدا ئەنجام دراوە: "ئەو بەلەنگازە لە بری ئێرە، بە هەڵە خۆی بە ماڵێکی سەرووتردا کردووە. پارچە پارچە بووە. تا ئێستایش نەزانراوە کە داخۆ ئیسلامییە یان پەکەکەیە؟"

(کا) لە سونایدا جۆشی ئەو ئەکتەرە گەورانەی بینی کە ڕۆڵەکانی خۆیان زۆر بەهەند دەگرن. ڕیش و سمێڵی تاشیبوو، پاک و خاوێن و زۆر لەسەرخۆ دیار بوو. چاوی بڕیە ناو چاوی (کا) و گوتی: "شینەیان دەستگیر کرد."

(کا) خۆبەخۆ ویستی خۆشحاڵیی خۆی بەرامبەر بەم هەواڵە بشارێتەوە، بەڵام ئەمە بەسەر سونایدا تێ نەپەڕی. سونای گوتی: "مرۆڤێکی زۆر خراپە. هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی کوشتووە. لەلایەک بڵاوی دەکاتەوە کە دژی خۆکوژییە، لەلایەکی دی لاوانی بەستەزمان و بێهۆش بۆ ئەنجامدانی هێرشی خۆکوژی سازدەدات. ئاسایشی میللی دڵنیایە لەوەی بە بڕێک تەقینەوەوە بۆ ئێرە هاتووە کە بەشی تەقاندنەوەی هەموو قارس دەکات! لە شەوی شۆڕشەکەدا شوێن پێی ون کرا. لە جێگایەک کە کەس پێی نەدەزانی، خۆی مەڵاس دابوو. بێگومان ئاگاداری ئەو کۆبوونەوە پێکەنیناوییەی هوتێل ئاسیا هەیت کە دوێنێ ئێوارە سازدرابوو."

(کا)، وەکو ئەوەی لە نمایشێکدا بن، بە جووڵەیەکی دەستکرد سەرێکی بۆ لەقاند. سونای گوتی: "ئامانجی ژیانم بە سزاگەیاندنی ئەم تاوانبار و پاشقەڕۆ و



تیرۆریستانە نییە. شانۆیەک لە ئارادایە کە چەندین ساڵە من نمایشی دەکەم و ئێستایش هەر بۆ ئەوەیە لێرەم. نووسەرێکی ئینگلیز هەبوو بەناوی تۆماس کید. شکسپیر، -هاملێت-ی لەو دزیوە. شانۆنامەیەکی مافخوراو و لە بیرکراوی کید بەناوی -تراژیدیای ئیسپانیا- دزیوەتەوە. ناوەڕۆکەکەی، دۆزی خوێن و تراژیدیای تۆڵەسەندنەوەیە، لەم شانۆنامەیەدا نمایشێک هەیە، من و فوندا ماوەی پازدە ساڵە چاوەڕێین ئەو نمایشە بگێڕین."

فوندا ئەسەر خۆی کرد بە ژووردا و دارجگەرەیەکی درێژی بەدەمەوە بوو. (کا) دوو قات خۆی چەماندەوە و سڵاوێکی دەستکردی لێ کرد، بینی ژنەکە ئەمەی پێ خۆش بوو. بێ ئەوەی ئەم داوای لێ کردبن، ژن و پیاوەکە پوختەیەکی نمایشەکەیان بۆ (کا) باس کرد.

دواترێ سونای گوتی: "شانۆنامەکەم گۆڕی و بەجۆرێک ئاسانم کرد کە میللەتەکەمان چێژی لێ وەربگرن و دەرزی لێوە فێر بن. سبەینێ لە هۆڵی شانۆی گەل نمایشی دەکەین و بینەران و هەموو دانیشتووانی قارس لە وەشانی زیندووی تەلەفزیۆندا دەیبینن."

(کا) گوتی: "منیش ئارەزووی بینینیم هەیە."

"دەمانەوێ قەدیفەیش لە نمایشەکەدا ڕۆڵ بگێڕێ... فوندا ڕۆڵی دژبەرێکی خراپەکاری ئەو دەبینێ... قەدیفە بەسەری داپۆشراوەوە دێتە سەر شانۆ. پاشان لە دژی هەموو ئەو داوونەریتە پڕوپوچانەی کە دەبنە هۆی تۆڵەسەندنەوە، ڕادەوەستێتەوە و لە ناکاو و بە بەرچاوی هەمووانەوە سەری ڕووت دەکات." سونای بەدەم ئەم قسانەوە جووڵەیەکی دروستکراوی وایکرد وەکو ئەوەی سەرپۆشێکی خەیاڵی لەسەری خۆی بکاتەوە و فڕێی بدات.

(کا) گوتی: "هەمدیسان ڕووداو دەقەومێ!"

"خەمی ئەوەت نەبێ! ئێستا سەرکردایەتیی سەربازیمان هەیە."

(کا) گوتی: "قەدیفەیش هەرچۆنێک بووە ئەمە پەسەند ناکات."

سونای گوتی: "ئێمە دەزانین قەدیفە ئەڤینداری شینەیە. ئەگەر قەدیفە ئامادە بێت

سەری ڕووت بکات، ئەوا من شینەی بۆ ئازاد دەکەم. دەتوانن بۆ شوێنێکی دوور هەڵبێن و پێکەوە بەختەوەر بن."

لە سیمای فوندا ئەسەردا هێمایەکی بەزەیی پێداهاتنەوەی تایبەت بەو خانمە نیازپاکانە بیندرا کە لە فیلمی میلۆدرامای خۆماڵیدا بە کامەرانیی ئەڤیندارانی جحێڵی هەڵهاتوو خۆشحاڵن و دەیانپارێزن. (کا) بۆ ساتێکی کورت لە خەیاڵی خۆیدا وای بۆ چوو ئەم ژنە بەهەمان شێوە لە ئەڤینی ئەم و ئیپەکیش دەڕوانێ.

دواتر گوتی: "من هێشتا بەگومانم لەوەی کە قەدیفە لە وەشانی زیندوودا سەری خۆی ڕووت بکات."

سوونای گوتی: "بە چاوگێڕانەوە بە دۆخەکەدا، بیرمان لەوە کردەوە کە تەنیا تۆ دەتوانی قایلی بکەیت. سەوداو و مامەڵەکردنی لەگەڵ ئێمەدا، بەواتای مامەڵەکردنێتی لەگەڵ گەورەترین ئیبلیسدا. خۆ دەشزانێ تۆ ماف دەدەی بە کچانی سەرداپۆشراو. ئەڤینداری خوشکە گەورەکەی ئەویشی."

(کا) گوتی: "تەنیا قەدیفە نییە، پێویستە شینەیش قایل بکرێ. بەڵام پێویستە لە پێشدا قسە لەگەڵ قەدیفەدا بکرێ." بەڵام هێشتا هۆشی خۆی بە سادەیی و زبریی دەستەواژەی: "ئەڤینداری خوشکە گەورەکەی ئەوی" دەجەڕاند.

سوونای گوتی: "هەموو ئەمانە بە چەشنێک بکە کە خۆت پێت خۆشە. هەموو دەسەڵاتێکت پێ دەبەخشم و ئۆتۆمبیلێکی سەربازیش دەخەمە بەردەستت. دەتوانی بە ئارەزووی خۆیشت بەناوی منەوە سەوداو مامەڵە بکەیت."

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە. سوونای هەستی بە پەرتەوازەیی هۆشی (کا) کردبوو.

(کا) گوتی: "نامەوێ خۆم لەم کارەوە بگلێنم."

"بۆچی؟"

"لەوانەیە لەبەرئەوەی کە ترسنۆکم. ئێستا زۆر بەختەوەرم. نامەوێ ببمە نیشانەیەکی دیار بۆ تیری ئیسلامییەکان. ئەگەر قوتابیان ببینن قەدیفە سەری ڕووت دەکات، دەڵێن ئەو ئەتایستە ناپیاوە ئەم بەزمەی گێڕاوە. ئەوسا، تەنانەت ئەگەر بۆ ئەڵمانیایش هەڵبێم، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە نیوەی شەودا و لە کوچەیەکدا دەمکوژن."



سوونای بە لە خۆ باییبوونەوە گوتی: "سەرەتا دەست لە من دەوەشێنن. بەڵام پێشم خۆش بوو کە گوتت ترسنۆکیت. بڕوام پێ بکە منیش زۆر ترسنۆکم. لەم وڵاتەدا تەنیا ترسنۆکەکان بە پێوە دەمێننەوە. بەڵام هەمان کات مرۆڤ بەردەوام بیر لەوە دەکاتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان وەکو هەر ترسنۆکێک قارەمانێتیی لێ دەوەشێتەوە، وا نییە؟"

"من ئێستا زۆر کامەرانم. بەهیچ جۆرێک نامەوێ ببم بە پاڵەوان. ئەوە بەدبەختەکانن کە بە خەوبینین بە پاڵەوانییەوە دڵی خۆیان دەدەنەوە. کەسانی وەکو ئێمە بۆ ئەوەی ببین بە قارەمان، یان دەبێ کەسێکی تر بکوژین، یاخۆ خۆمان."

سوونای بە کەڵلەڕەقییەوە پرسی: "باشە، بە گۆشەیەکی هۆشت پەی بەوە دەبەیت کە ئەم کامەرانییەت زۆر درێژە ناخایەنێ؟"

فوندا ئەسەر گوتی: "بۆچی میوانەکەمان دەترسێنی؟"

(کا) بە خۆپارێزییەوە گوتی: "هیچ کامەرانییەک تا سەر درێژە ناخایەنێ. ئەمە دەزانم. بەڵام نیازم نییە قارەمانی بنوێنم و خۆم بە کوشت بدەم بۆ ئەوەی ڕێ لە ئەگەری بەدبەختیی داهاتووم بگرم."

"ئەگەر نەچیتە ئەم کارەوە، لە ئەڵمانیا نا، لێرە دەتکوژن! ڕۆژنامەی ئەمڕۆت بینی؟"

(کا) بەدەم زەردەخەنەوە گوتی: "نووسیویانە کە ئەمڕۆ دەکوژرێم."

سوونای دوا ژمارەی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ی نیشانی (کا)دا کە دوێنێ ئێوارە بینیبووی.

فوندا ئەسەر بە پێوەنانەوە دەستی بە خوێندنەوەی کرد: "خودانەناسێک لە قارسدا."

(کا) بە بڕوا بەخۆبوونەوە گوتی: "ئەوە یەکەمین چاپی دوێنێ بوو. دواتر سەردار بەگ بڕیاری دا چاپێکی نوێ بکات و هەڵەکە ڕاست بکاتەوە."

سوونای گوتی: "ئەم بڕیارەی خۆی نەبردووەتە سەر و ئەم بەیانییە چاپی یەکەمی ڕۆژنامەکەی دابەش کردووە. نابێ هەرگیز بڕوا بە قسەی ڕۆژنامەنووسان بکەیت."

بەڵام ئێمە دەتپارێزین. ئیسلامییەکان کە دەسەڵاتیان بەسەر سوپادا ناشکێ، بەنیازن سەرەتا دەست لە ئەتایستێکی غولامی ڕۆژئاوا بوەشێنن.

(کا) پرسی: "ئایا تۆ داوات لە سەردار بەگ کردووە ئەو هەواڵە بنووسێ؟"

سونای، وەکو کەسێکی شەرمەند کە سووکایەتیی پێ کرابێ، گۆشەی لچی خوار کردەوە، برۆکانی بەرز کردەوە و بە ڕوویەکی گرژەوە سەیری کرد، بەڵام (کا) دەیبینی زۆر شادمانە بە گێڕانی ڕۆڵی سیاسەتمەدارێکی هوشیار کە خەریکی گێڕانی دەک و دۆڵابی خۆیەتی.

(کا) گوتی: "ئەگەر بەڵێنم پێ دەدەی تا سەر دەمپارێزی، من ناوبژیوانی دەکەم."

سونای بەڵێنی پێ دا، لە پای پێوەندیکردنی بە ریزەکانی ژاکوبەنەکانەوە، باوەشی بە (کا)دا کرد و پیرۆزباییی لێ کرد. پێی گوت کە دوو پیاوی خۆی دەخاتە تەکی و هەرگیز لێی جیانابنەوە.

بە خرۆشەوە ئەمەیشی بۆ زیاد کرد: "ئەگەر پێویست بێت، دەتوانن لە بەرامبەر خودی خۆتیشدا پارێزگاریت لێ بکەن."

بەمەبەستی گفتوگۆ سەبارەت بە وردەکارییەکانی ناوبژیوانیکردن، دانیشتن و چایەکی بەیانییان بە بۆنی مسکەوە خواردەوە. فوندا ئەسەر هێندە لە خۆی ڕازی بوو، وەکو ئەوەی ئەکتەرێکی نوێی بەناوبانگ و درەوشاوە پێوەندیی بە گرووپی شانۆکەیانەوە کردبێ. کەمێک باسی هێزی -تراژیدیای ئیسپانیا-ی کرد، بەڵام (کا) هۆشی لەوێ نەبوو، سەیری سپێتییەکی بێ هاوتای دەکرد کە لە پەنجەرە بەرزەکەی دروومانخانەکەوە لە ژوورەوەی دەدا.

(کا) کە لە دوورمانخانەکە هاتەوە دەرەوە، بە بینینی دوو سەربازی کەتەی چەکدار کە دابوویانە پاڵی، واقی ورما. ئارەزووی دەکرد لانی کەم یەکێکیان ئەفسەر یان سڤیلێکی ڕێکپۆش بوایە. جارێک نووسەرێکی ناوداری لە نێوان دوو پاسەوانی ڕێکپۆش و پەروەردەکراودا بینیبوو کە دەوڵەت بۆی تەرخان کردبوو. نووسەرەکە، لەو سەردەمەدا دەچووە سەر پەردەی تەلەفزیۆن و میللەتی تورکی بە دەبەنگ ناوزەد دەکرد و دەشیگوت هیچ باوەڕی بە ئیسلام نییە. پاسەوانەکان هەر بە هەڵگرتنی



جانتاکەیەوە ڕانەدەوەستان، بگرە بە بریق و باقێکەوە کە (کا)یش پێی وابوو شایەن بە نووسەرێکی ناودار و دژبەرە، بەر دەرگایان بۆ دەگرت، لە سەر پلیکانەکان دەچوونە بن باڵی و لە هەوادارانی بەپەرۆش و لە دوژمنەکانی بە دووریان دەگرت.

ئەو دوو سەربازەیش کە لە ئۆتۆمبێلە سەربازییەکەدا لە تەنیشت (کا)وە دانیشتبوون، وەکو دەسبەسەرکراوێک ڕەفتاریان لە تەکدا دەکرد، نەک وەکو ئەوەی بیپارێزن.

(کا) لەگەڵ گەیشتنیدا بە هوتێلەکە، هەستی بەهەمان شادی کردەوە کە سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە سەرتاپای جەستەی هەژاندبوو. سەرباری ئەوەی لە ناخەوە ئارەزووی دەکرد دەسبەجێ ئیپەک ببینێ، بەڵام جارێ پێی باش بوو ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی دووبەدوو لەگەڵ قەدیفەدا قسە بکات، چونکە پێی وابوو شاردنەوەی شتێک لە ئیپەک، ناپاکیکردنە، ئەگەرچی بچووکیش بێت، لە ئەڤینەکەیان. بەڵام بە بینینی ئیپەک لە هۆڵی پێشوازیکردنەکە، نیازی خۆی گۆڕی. بە شەیدابوونەوە سەیری ئیپەکی کرد و گوتی: "لەوە جوانتری کە لە یادەوەریی مندا هەیت. سونای ناردبووی بە دوومدا، دەیەوێ ناوبژیوانیی بۆ بکەم."

"لە چ بابەتێکدا؟"

(کا) گوتی: "دوێنێ ئێوارە شینەیان دەستگیر کردووە. بۆچی ڕووی خۆت دەکەیت بەولاوە؟ هیچ مەترسییەک بۆ ئێمە لە ئارادا نییە. بەڵێ، قەدیفە غەمگین دەبێ، بەڵام من لە هەناوەوە بەم پێشهاتە ئاسوودە بووم، بڕوام پێ بکە." بەخێرایی ئەو قسانەی گێڕایەوە کە لە سونایەوە بیستبوونی، هۆی تەقینەوەکانی دوێنێ شەو و دەنگی دەستڕێژ و تەقەکانی ڕوون کردەوە: "بەیانی ڕۆیشتبوویت و منت لە خەو هەڵنەساندبوو. مەترسە، هەموو شتێک چارەسەر دەکەم، خوێن لە لووتی کەس نایات. دەچینە فرانکفۆرت و لەوێ بۆ خۆمان بە شادی دەژین. لەتەک باوکتدا قسەت کرد؟" (کا) درێژەی دایێ و گوتی کە سەودا و مامەڵەیەک بەڕێوەدەبرێ، لەبەرئەوە سونای ئەم بۆ لای شینە دەنێرێ، بەڵام مەرجە سەرەتا لەگەڵ قەدیفەدا قسە بکات. نیگەرانییەکی زیادی لە چاوەکانی قەدیفەدا بەدی کرد، ئەمەیش بەواتای ئەوەیە کە قەدیفە پەرۆشی ئەمە، ئەمەیشی پێ خۆش بوو.

ئیپەک گوتی: "پێش کەمێک قەدیفەم نارد بۆ ژوورەکەی." ئەمەی گوت و ڕۆیشت.

(کا) چووە ژوورەکەی خۆی، بینی کە پێخەوەکەی ڕێک خراوە. گڵۆپە کزەکەی سەر مێزەکە، پەردە زەردباوەکان و ئەو شتانەی کە دوێنێ شەو کامەرانترین شەوی خۆی لە نێوانیاندا بەسەر بردبوو، ئێستا لە ناو ڕووناکیی بەفر و بێدەنگییەکی تەواو جیاوازدا بوون، بەڵام هێشتا دەیتوانی بۆنی پاشماوەی پێکەوە نووستنەکەیان بکات. لەسەر پشت خۆی دا بەسەر جێیەکەیدا، چاوی لە بنمیچەکە بڕی و هەوڵی دا تێ بگات ئەگەر قەدیفە و شینەی بۆ قایل نەکرێ، چ بەڵایەکی بەسەر دێ.

قەدیفە لەگەڵ هاتنە ژوورەوەیدا یەکسەر گوتی: "هەرچی دەزانی سەبارەت بە گرتنی شینە بۆم بگێڕەوە. ئایا بەدڕەفتارییان لە تەکیدا کردووە؟"

(کا) گوتی: "ئەگەر بەدڕەفتارییان لە تەکدا نواندبێ، هەڵبەتە نەیاندەویست من ببەن بۆ لای. دوای کەمێکی تر دەمبەن. لە دوا کۆبوونەوەی هوتێلەکە کەوتووەتە داوەوە، لەوە زیاتر نازانم."

قەدیفە لە پەنجەرەکەوە سەیری شەقامە بەفراوییەکەی کرد. "ئێستا ئیدی تۆ کامەرانی و من ناشاد. لە دوای دیدارمانەوە لە ژووری سندووقەکان، شتەکان زۆر بەخێرایی گۆڕان."

(کا) دیدارەکەی دوای نیوەڕۆی دوێنێیان لە ژووری ٢١٧، دەرهێنانی چەک لە لایەن قەدیفەوە بەر لە دەرچوونیان لە ژوورەکە و ڕووتکردنەوەی ئەم، وەکو چەند یادگارییەکی زۆر کۆن و شیرین کە ئەمان پێکەوە دەبەستێتەوە، هاتەوە یاد.

(کا) گوتی: "قەدیفە، ئەمە هەموو شتێک نییە. دەوروبەرەکەی سونای، کابرایان هێناوەتە سەر ئەو باوەڕەی کە شینە دەستی لە کوشتنی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەدا هەیە. هەروەها دۆسیەیەکیش گەیشتووەتە قارس کە دەیسەلمێنێ بێژەرەکەی تەلەفزیۆن لە ئیزمیر بەدەستی شینە کوژراوە."

"کێن ئەو دەوروبەرانە؟"

"چەند دانەیەک لە پیاوانی هەواڵگریی میللی لە قارس... یەک دوو ئەفسەر کە پێوەندییان بەوانەوە هەیە... بەڵام سونای بەتەواوی لە ژێر کاریگەریی ئەواندا نییە.



ئامانجی هونەریی هەیە. ئەمانە قسەی ئەون. دەیەوێ ئەم ئێوارە لە شانۆی گەل شانۆیەک نمایش بکات و ڕۆڵیش بدات بە تۆ. چارە مەدە بەیەکدا، گوێ بگرە. لە تەلەفزیۆنەوە وەشانی زیندوو دەکات، هەموو قارس دەیبینێ. ئەگەر تۆ بە گێڕانی ڕۆڵەکە قایل بیت، شینەیش بتوانێ قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان ڕازی بکات بێن و بێدەنگ دابنیشن و لە کاتی پێویستدا بەڕێزەوە چەپڵە لێ بدەن، ئەوا سونای بڕیاری ئازادکردنی شینە دەدات. هەموو شتێک لە بیر دەکرێ، خوێن لە لووتی کەس نایات. سونای منی وەکو ناوبژیوان هەڵبژاردووە."

(کا) باسی تۆماس کید و شانۆنامەی –تراژیدیای ئیسپانیا–ی گێڕایەوە و گوتی سونای شانۆنامەکەی گۆڕیوە و گونجاندوویەتی. (بەهەمان شێوەی گونجاندنی کۆرنێل و شکسپیر و برێشت لەگەڵ سەما و گۆرانیی بێتامدا کە بەدرێژاییی ساڵانی خوولانەوەی بە ئەنادۆڵدا ئەنجامی داوە.)

"هەڵبەتە منیش لە وەشانی زیندوودا دەبم بەو ژنەی کە بۆ دەست پێکردنی تۆڵەسەندنەوە، دەستدرێژی دەکرێتە سەر ئابڕووی."

"نەخێر. وەکو خانمێکی ئیسپانیی سەرداپۆشراو لە تۆڵەسەندنەوە بێزاریت و دەبیت بەو کچەی کە لە ساتێکی هەڵچوون و تووڕەبووندا یاخی دەبیت و سەرپۆشەکەت فڕێ دەدەیت."

"لێرە بۆ یاخیبوون سەرپۆش فڕێ نادرێ، بەڵکو پێویستە لەسەر بکرێ."

"قەدیفە، ئەمە شانۆیە. لەبەرئەوەیش کە شانۆیە، دەتوانی سەرت ڕووت بکەیت."

"تێ گەیشتم چیت لێم دەوێ. شانۆ بێ، شانۆ بێ لە ناو شانۆیشدا، من سەرپۆش فڕێ نادەم."

"بڕوانە قەدیفە، دوو ڕۆژی تر بەفر خۆشی دەکاتەوە، ڕێگا و بانەکان دەکرێنەوە، گرتووی ناو زیندان دەکەوێتە دەستی کەسانی بێبەزەیی. ئەو کاتە تا لە ژیاندا ماوی چاوت بە شینە ناکەوێتەوە. ئایا باش بیرت لەمە کردووەتەوە؟"

"دەترسم ئەگەر بیری لێ بکەمەوە، پەسەندی بکەم."

"سەرەڕای ئەوەیش، دەتوانی لە ژێر سەرپۆشەکەتەوە باروکە لەسەر بکەیت و

بەوجۆرە کەس قژت نابینێ."

"ئەگەر باروکەم لە سەر بکردبا، وەکو هەندێک کەس بۆ چوونە ژوورەوەی زانکۆ ئەو کارەم دەکرد."

"ئێستا کێشەکە ڕزگارکردنی ئابڕوو نییە لە بەردەم دەرگای زانکۆ. ئێستا ئەمە بۆ ڕزگارکردنی شینە دەکەیت."

"با بزانین ئایا شینە دەیەوێ بە سەر ڕووتکردنی من ڕزگاری ببێت؟"

(کا) گوتی: "دەیەوێ. سەر ڕووتکردنی تۆ ویقاری شینە بریندار ناکات، چونکە کەس بە پێوەندییەکەتان نازانێ."

لە میانەی تووڕەیی ناو چاوانییەوە تێ گەیشت کە دەتوانێ پەنجە بخاتە سەر خاڵی لاوازی قەدیفە، دواتر (کا) بینی بە شێوەیەکی زۆر سەیر کە ئەمی ترساند، پێ کەنی. جۆرێک لە ترس و ئیرەیی پێبردن هەناوی ڕاپێچا. لەوە دەترسا قەدیفە شتێکی ڕووخێنەر لەبارەی ئیپەکەوە بەم بڵێ. بەهەمان ترسی سەیرەوە گوتی: "قەدیفە، کاتی زۆرمان بەدەستەوە نییە. دەزانم هێندە ژیر و هوشیاری کە بتوانی بە شیرینی لەم کارە بێیتە دەرێ. ئەمە وەکو کەسێک دەڵێم کە ساڵانێکی درێژ وەکو پەنابەرێکی سیاسی لە تاراوگە ژیاوە. گوێم لێ بگرە: ژیان لە پێناوی بنەماکاندا نا، لە پێناوی بەختەوەربووندا بەسەر دەبرێ."

قەدیفە گوتی: "بەڵام هیچ کەسێکیش بێ بنەما و بێ باوەڕ ناتوانێ بەختەوەر بێت."

"ڕاستە. بەڵام لە وڵاتێکی زۆرداری وەکو ئەوەی ئێمەدا کە هیچ بەهایەک بۆ مرۆڤ داناندرێ، بێ عەقڵییە مرۆڤ خۆی لە پێناوی باوەڕەکانیدا بەخت بکات. بنەمای گەورە و بیر و باوەڕ، شتگەلێکن بۆ مرۆڤ وڵاتە دەوڵەمەندەکان."

"تەواو بە پێچەوانەوە. مرۆڤ لە وڵاتێکی هەژاردا، لە بیر و باوەڕەکانی بترازێ، هیچ شتێکی تری نییە باوەشی پێدا بکات."

(کا)، "بەڵام ئەو شتانەی باوەڕی پێ دەکەن، ڕاست نییە"ی بە خەیاڵدا هات، بەڵام دەری نەبڕی. لەبری ئەوە گوتی: "قەدیفە، بەڵام تۆ سەر بە توێژی نەداران نیت، تۆ لە ئەستەمبوڵەوە هاتوویت."



"لەو سۆنگەیەوە باوەڕم بە چی بێت، ئەوە دەکەم. من تەقیە ناکەم. ئەگەر بمەوێ سەرم ڕووت بکەم، بەڕاستی دەیکەم."

"باشە، ئەمەت پێ چۆنە: کەس نەکرێتە هۆڵی شانۆوە. با فارسییەکان نمایشەکە تەنیا لە تەلەفزیۆندا سەیر بکەن. سەرەتا کامێرا وا نیشان دەدات کە تۆ لە ساتێکی تووڕە بووندا دەست بۆ سەرت دەبەیت. دواتر میکس دەکەین و قژی کەسێکی تری هاوشێوەی تۆ لە دواوە نیشان دەدەین."

قەدیفە گوتی: "ئەمە لە باروکە لە سەر کردنیش فێڵبازانەترە. لە ئاکامدا هەموو کەسێک وا بیر دەکاتەوە کە لە دوای کودەتا سەربازییەکەوە سەرپۆشم فڕێداوە."

"ئایا تۆ فەرموودەکانی ئاینەکەت بەلاوە گرنگە یاخۆ قسە و تانە و تەشەری ئەوانی دی؟ لەم سیناریۆیەدا تۆ بەهیچ جۆرێک قژت ڕووت ناکەیت. خۆ ئەگەر گرفتەکەیشت دەمگۆی خەڵکییە، ئەوا دوای بڕانەوەی ئەم کارەساتە تووڕەهاتانە، دەتوانی بۆ هەموو کەسێکی بگێڕیتەوە ئەوەێ کە کردووتە بەشێک بووە لە فیلمێک. ئەگەر لاوانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان پێ بزانن تۆ ئەمەت لە پێناوی ئازاد کردنی شینەدا کردووە، ئەوا هێندەی تر ڕێزت لێ دەگرن."

قەدیفە بە ڕیتمێکی تەواو جیاوازەوە گوتی: "ئایا هیچ بیرت لەوە کردووەتەوە، هەموو هێزی خۆت خستووەتە کار بۆ قایلکردنی کەسێک و لەو پێناوەشدا هەندێک شت دەڵێی کە خۆت هیچ باوەڕت پێی نییە؟"

"بەڵێ. بەڵام ئێستا وا هەست ناکەم."

"کەواتە لەبری قایلکردنی ئەو کەسە، لە خشتەی دەبەیت و لە پای ئەوەشدا هەست بە تاوان دەکەی. وا نییە؟ چونکە هیچ چارەیەکی ترت بۆ نەهێشتووەتەوە."

"قەدیفە، ئەوەی ئێستا دەیبینی، بێچارەیی نییە. وەکو مرۆڤێکی ژیر دەبینی هیچ چارەیەکی ترمان نەماوە. دەروبەرەکەی سونای، بێ ئەوەی دەستیان بلەرزێ، شینە هەڵدەواسن و تۆیش بەمە ڕازی نابیت."

"با بڵێین ئەوا بە بەرچاوی هەموانەوە سەرپۆشم فڕێدا و دۆڕانم پەسەند کرد. بە چیدا دیارە کە شینە ئازاد دەکەن؟ من بۆچی بڕوا بە بەڵێنی ئەم دەوڵەتە بکەم."

"ڕاست دەکەی. ئەمەیان لەگەڵدا باس دەکەین."

"لەگەڵ کێدا و کەی قسە دەکەی؟"

"دوای دیدارم لەگەڵ شینەدا، دووبارە دەچمەوە لای سونای."

هەردووکیان ساتێک بێدەنگ بوون. بەوجۆرە بە باشی ئاشکرابوو کە قەدیفە بە نابەدڵی مەرجەکانی پەسەند کردووە. (کا) بۆ دڵنیابوونی زیاتر بەشێوەیەک قەدیفەیش بیبینێ، سەیری سەعاتەکەی کرد.

"ئایا شینە لای میت دەستبەسەرە یاخۆ لای سوپا؟"

"نازانم، بەڵام پێم وابێ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە."

قەدیفە گوتی: "لەوانەیە سەربازەکان ئەشکەنجەی نەدەن." کەمێک بێدەنگ بوو. "دەمەوێ ئەمانەی پێ بگەیەنی." چەرخێکی مۆدیل کۆن و بە گەوهەر ڕوپۆشکراو و پاکەتێک مارلبۆرۆی سووری بۆ (کا) درێژ کرد. "چەرخەکە هی باوکمە. شینە پێی خۆش دەبێ جگەرەی پێ دابگیرسێنێ."

(کا) پاکەتەکەی لێ وەرگرت و چەرخەکەی گێڕایەوە و گوتی: "ئەگەر چەرخەکەی بدەمێ، شینە تێ دەگات کە لە پێشدا بۆ لای تۆ هاتووم."

"جا با بزانێ."

"ئەو کاتە تێ دەگات کە لەگەڵ تۆدا قسەم کردووە و پەرۆشی زانینی بڕیاری تۆ دەبێ. ئەمە لە کاتێکدا من نامەوێ پێی بڵێم کە سەرەتا تۆم بینیوە و ئامادەی لە پێناوی ڕزگارکردنیدا سەرپۆش فڕێ بدەی."

"لەبەرئەوەتە کە ئەمە پەسەند ناکات؟"

"نەخێر. شینە بەشی ئەوە هۆشمەند و بە لۆژیکە تێ بگات تۆ لە پای ڕزگارکردنی ئەو لە مردن سەرپۆش فڕێ دەدەیت، تۆیش ئەمە دەزانی. ئەوەی شینە پەسەندی ناکات ئەوەیە ئەم پرسیارە بەر لەخۆی لە تۆ کرابێ."

"بەڵام ئەمە بەتەنیا بابەتێکی سیاسی نییە، هەمان کات بابەتێکی تایبەت بە منیشە. شینە لەمە دەگات."



"قەدیفە، تۆیش دەزانی ئەگەر تێش بگات، ئەو دەیەوێ خۆی خاوەن قسەی یەکەم بێت. ئەو پیاوێکی تورکە. سەرەڕای ئەوەیش ئیسلامییەکی سیاسییە. من ناتوانم پێی بڵێم –تۆ ئازاد بە، قەدیفە بڕیاری داوە سەرپۆش فڕێ بدات.– پێویستە بگاتە ئەو باوەڕەی کە خۆی بڕیارەکەی داوە. من بیرۆکەی باروکە پۆشین و مۆنتاژی تەلەفزیۆن دەخەمە بەردەستی ئەویش. دەسبەجێ تێ دەگات کە ئەمە هەوڵێکی تۆیە بۆ ڕزگارکردنی ئابڕووی خۆت. ئەو ڕێ بەخۆی نادات پێشبینی شتێک بکات کە لەگەڵ بۆچوونی بێ فڕوفێڵی تۆ لەگەڵ بۆچوونی بە کردەوەی ئەودا بۆ ئابڕوو یەک ناگرنەوە. هەرگیزیش نایەوێ ببیستێ کە تۆ بەدەربەست و بێ فڕوفێڵ سەرت ڕووت دەکەیت."

قەدیفە گوتی: "تۆ ئیرەییت بە شینە دەبەیت و نەفرەتی لێ دەکەیت. بگرە ناتەوێ وەکو مرۆڤ سەیری بکەیت. تۆ لەو لایسیستانە دەچی کە باوەڕیان وایە کەسانی بە ڕۆژئاوایی نەبوو سەر بە توێژێکی پریمیتڤ، بێ ڕەوشت و کەم بەهان و پێویستە بە کوتەک بکرێن بە مرۆڤ. سەردانەواندم بۆ سوپا لە پێناوی ڕزگارکردنی شینەدا، تۆی دڵخۆش کرد. بگرە ناتوانی ئەم دڵخۆشییە بێ ڕەوشتانەیەت بشاریتەوە." ئەمە بە نەفرەتەوە لە چاوەکانیدا دیاری دا. "مادام پێویست بوو سەرەتا شینە لەمبارەیەوە بڕیار بدات، تۆ کە پیاوێکی تری تورکی، بۆچی دوای دەرچوونت بۆ لای سونای، یەکسەر نەچوویتە لای شینە و بۆ لای من هاتی؟ پێت بڵێم بۆچی؟ چونکە دەستپێک دەتویست بزانی من ئامادەم بە ویستی خۆم سەر دابنەوێنم. ئەمەیش لە بەردەم شینەدا کە تۆ لێی دەترسی، سەردەستییەکت پێ دەبەخشێ."

"ڕاستە، لە شینە دەترسم. بەڵام قەدیفە، قسەکانی ترت ناڕەوان. ئەگەر لە پێشدا بچوومایەتە لای شینە و بڕیاری سەرپۆش فڕێدانی تۆم وەکو فەرمانێک بۆت بهێنایە، تۆ پەسەندت نەدەکرد."

"تۆ چیدی ناوبژیوان نیت، کەسێکی کە لەگەڵ زۆرداراندا هاوکاری دەکەیت."

"قەدیفە، من جگە لە ڕزگار بوونم بە ساغ و سەلامەتی لەم شارە، بڕوام بەهیچ شتێکی تر نییە. ئیدی تۆیش بڕوا بەهیچ شتێک مەهێنە. زیاد لە پێویست بۆ هەموو قارست سەلماند کە ژیر و سەربەرز و بوێری. من لەگەڵ ڕزگاربوونمدا لێرە لەگەڵ

دادەتدا دەچینە فرانکفورت، بۆ ئەوەی لەوێ بەختەوەر بین. تۆیش چی کامەرانت دەکات ئەوە بکە. لەگەڵ شینەدا لێرە خۆتان ڕزگار بکەن و خۆتان بگەیەننە شارێکی ئەورووپا، لەوێ تا بڵێی کامەران دەژین. دڵنیام باوکیشتان بەدوای ئێوەدا دێت. بۆ ئەمەیش، پێویستە دەسپێک متمانەت بە من هەبێ."

لەو کاتەدا کە قەدیفە باسی کامەرانیی دەکرد، دڵۆپێک لەو فرمێسکانەی کە چاوی پڕکردبوو، بەسەر ڕوومەتیدا هاتە خوارەوە. بەدەم زەردەخەنەیەکەوە کە (کا)ی ترساند، بەپەلە بەناو لەپی دەستی دڵۆپە فرمێسکەکەی سڕییەوە. "ئایا دڵنیای کە دادەم ئامادەیە قارس جێ بهێڵێ؟"

(کا) لە کاتێکدا کە هیچ دڵنیا نەبوو، وتی: "دڵنیام."

قەدیفە بە ڕیتمی شازادەیەکی لە خۆبایی و گەشبینەوە گوتی: "پێ داناگرم لەسەر ئەوەی چەرخەکە بدەی بە شینە و پێی بڵێی سەرەتا منت بینیوە. بەڵام دەمەوێ بە هەر نرخێک بووە لەوە دڵنیابم کە بە سەرپۆش فڕێدانی من شینە ئازاد دەکرێ. بەڵێنی سونای یان کەسێکی تر بەس نییە. هەموومان دەوڵەتی تورک دەناسین."

(کا) وتی: "قەدیفە، تۆ زۆر ژیری. تاقە کەسیت لە پێش هەموو کەسێکی ترەوە لە قارس شایەنی بەختەوەری بی." لە پڕ وای بە خەیاڵدا هات کە بڵێ "هەروەها نەجیبیش"، بەڵام دەسبەجێ ئەوەی لە بیر خۆی بردەوە. "چەرخەکەیشم بەرێ. لەوانەیە هەلێکم بۆ هەڵکەوێ و بیگەیەنم بە شینە، بەڵام متمانەت پێم هەبێ."

لەو دەمەیدا قەدیفە چەرخەکەی بۆ درێژ کرد، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو باوەشیان بە یەکدیدا کرد. (کا) بە میهرەبانی دەستی بە جەستەی قەدیفەدا هێنا کە زۆر لە پێستی دادەی تەنکتر و باریکەڵەتر بوو. خۆیشی ڕاگرت بۆ ئەوەی ماچی نەکات. کاتێکیش بە توندی لە دەرگا درا، لە دڵی خۆیدا گوتی: "باشتر کە خۆم ڕاگرت."

ئەوەی لە دەرگای دا، ئیپەک بوو. گوتی ئۆتۆمبیلێکی سەربازی هاتووە بۆ بردنی (کا). بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی ناو ژوورەکە، ساتێکی درێژ بە نیگا نەرم و پڕ لە پرسیارەکانی خۆی سەیری ناو چاوانی (کا) و قەدیفەی کرد. (کا) بێ ئەوەی ماچی



بکات، چووە دەرەوە. لە کۆتایی ڕێڕەوەکەدا بە دەم هەستکردن بە تاوان و سەرکەوتنەوە ئاوڕی دایەوە بۆ دواوە. بینی وا جووتە خوشکەکە باوەشیان بەیەکدا کردووە.

## ٣٥

# من سیخوڕی کەس نیم

## (کا) و شینە لە ژووری زینداندا

دیمەنی باوەش لەیەکدانی قەدیفە و ئیپەک لەوسەری ڕێڕەوەکەدا، تا ساتێکی درێژ لە بەرچاوی (کا) نەڕەوییەوە. لە تەنیشت شۆفێرکەوە دانیشتبوو، کاتێک ئۆتۆمبیلەکە لە گۆشەی شەقامی ئەتاتورک و خالید پاشادا لە بەردەم ترافیک لایتە تاقانەکەی قارسدا ڕاوەستا، (کا) لەسەر کورسییە بەرزەکەوە، لە میانەی پەنجەرەیەکەوە کە تاکێکی کرابووەوە و با بەهێمنی پەردەکەی دەلەراندەوە، لەپڕ حاڵی بوو لە ژوورەوە کۆبوونەوەیەکی سیاسیی زۆر چڕوپڕ ساز دەکرێ. دەستی سپی و پەشۆکاوی ژنێک بە توورەیی پەردەکەی ڕاکێشا و پەنجەرەکەی پێوە دا. (کا) توانی بەتەواوی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە لە ژوورە ڕووناکەکەدا چی دەقەومێ: دوو میلیتانی بە ئەزموون و ناسراوی نەتەوەپەرستی کورد لە قارس هەوڵ دەدەن شاگرد چاپچییەک کە برا گەورەکەی لە پەلامارەکانی دوێنێدا کوژرابوو و ئێستا بەهۆی بەستنی چەند قەفێک لە لەزگەی -گازۆ- لە جەستەی، بەدیار سۆپاکەوە چین چین عارەقی دەردەدا، بەوە قایل بکەن کە زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لە دەرگای تەنیشتەوە بچێتە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشەوە لە شەقامی فایەق بەگ و بۆمباکەی سەر جەستەی بتەقێنێتەوە.

بە پێچەوانەی پێشبینیی (کا)وە، ئۆتۆمبیلە سەربازییەکە نە لایدایە ئەو بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشەی کە باس کراو نەڕووی لە مەڵبەندی ئاسایشی میللی کرد کە کەمێک لە پێشتر دەکەوتە مەڵبەندێکی بە بریق و باقی پاشماوەی ساڵانی سەرەتای کۆمارەوە، بەڵکو لەسەر شەقامی ئەتاتورک مایەوە و دواتر چووە سەر شەقامی فایەق بەگ و خۆی کرد بە بارەگای سەربازیی ناوەندی شاردا. لە نەخشەسازیی ساڵانی ١٩٦٠دا ئەم زەوییە فراوانە بۆ پارک تەرخان کرابوو، لە دوای کودەتای ساڵی ١٩٧٠ شورایەکی بەدەوردا کێشرابوو و کرابوو بە ناوچەیەکی



داخراو کە جێی حەوانەوەی سەرباز، بارەگای سەرکردایەتیی سوپا و گۆڕەپانی مەشقی لەخۆ دەگرت، منداڵانی بێزاریش بەناو سپیندارە باریکەکانی دەوروبەریدا پاسکیلیان لێ دەخوڕی. بەمجۆرە، -وەکو ڕۆژنامەی حوریەتی نزیک لە سوپا نووسیبوی-، ئەو ماڵەی کە پوشکین لە کاتی سەردانیدا بۆ قارس تێیدا حەوابووەوە و هەروەها ئەو ئاخوڕانەی کە چل ساڵ دواتر بە فەرمانی قەیسەری ڕووس بۆ سوارەی قازاخ دروست کرابوون، لە ڕووخاندن ڕزگاریان بووبوو.

ئەو ژوورەی شینەی تێدا ڕاگیرابوو، دەکەوتە کۆتاییی ئاخوڕە مێژووییەکانەوە. ئۆتۆمبیلە سەربازییەکە ڕاوەستا، (کا) لە بەردەم باڵەخانەیەکی کۆن و دڵگیری لە بەرد دروستکراودا کە دەکەوتە ژێر لق و چڵ و پۆپی بە بەفر داپۆشراوی پیرە دارزەیتوونێکی ڕووسییەوە، دابەزی. دوو کەسی بەڕێز کە (کا) دەسبەجێ بۆی ئاشکرابوو کارمەندی میتن، لە ژوورەوە بوون. دوو کەسەکە ئامێرێکی دەنگ تۆمارکردنیان بەدەستەوە بوو کە بە پێوانەی ساڵانی ١٩٩٠ بە شتێکی سەرەتایی دادەنرا، بە لەزگەی گازۆ لەسەر سنگی (کا) قایمیان کرد و دووگمەی داگیرسانیان نیشانی دا. لەلایەک، وا هەڵسوکەوتیان دەکرد وەکو ئەوەی غەمگین بن بە دەستگیرکردنی گیراوەکەی خوارەوە و بیانەوێ هاوکاریی بکەن، لەلایەکی دی، بە ڕیتمێکی بەدەربەست و دوور لە هەموو جۆرە گاڵتەیەک، هوشیاریان کردەوە کە وا لە کابرا بکات دان بە تاوانەکانی خۆی و ئەو تاوانانەدا بنێ کە نەخشەی بۆ کێشاون و لە کاسێتەکەدا تۆماریان بکات. (کا) بڕوای نەکرد ئەم پیاوانە هۆی سەرەکیی ناردنی ئەم بۆ ئێرە نەزانن.

مرۆڤ بە پلیکانەیەکی ساردا دەگەیشتە نهۆمی خوارەوەی باڵەخانە بەردینەکە کە لە سەردەمی قەیسەردا وەکو بارەگای سوارەی ڕووس بەکارهێنراوە. لە ژێرزەمینەکەدا ژوورێکی گەورەی بێ پەنجەرە هەبوو کە بۆ سزادانی ئەوانەی بێ دیسپلینییان دەنواند، بەکاردەهێنرا. ئەم ژوورە کە لە سەردەمی کۆماردا وەکو کۆگایەکی بچووک و لە ساڵانی ١٩٥٠یشدا وەکو حەشارگەیەکی نموونەیی بۆ خۆپاراستن لە هێرشی ئەتۆمی دانرابوو، بە پێچەوانەی بۆچوونی (کا)وە، زۆر پاک و خاوێن بوو.

هەرچەندە سۆپایەکی کارەبایی لە مارکەی ئارچەلیک کە موختاری فرۆشیاری سەرەکی لەو ناوچەیە بەمەبەستی باشتر فرۆشتنی کەلوپەلەکانی پێشکەش بە بنکە سەربازییەکەی کردبوو، ژوورەکەی بە باشی گەرم دەکردەوە، کەچی شینە بەدەم خوێندنەوەی کتێبەوە لە ناو جێگاکەیدا، بەتانییەکی سەربازیشی بەسەر خۆیدا دابوو. بە بینینی (کا)، لە جێگا هاتە دەرەوە، پێڵاوەکانی کە قەیتانەکانی لێ دەرهێندرابوو، لە پێ کرد و بە ڕێتمێکی فەرمی، بەڵام بەدەم زەردەخەنەوە دەستی (کا)ی گوشی و بە سووربوونی کەسێکەوە کە ئامادە بێت بۆ دانوسان سەبارەت بە کار، ئاماژەی کرد بۆ مێزێکی فۆرمیکای گۆشەیەکی ژوورەکە. لەسەر دوو کورسیی ئەمسەر و ئەوسەری مێزە بچووکەکە دانیشتن. (کا) لەگەڵ بینینی تەپەڵەکێکی چینکۆدا لەسەر مێزەکە کە لێوانلێو بوو لە قونە جگەرە، پاکەتە مارلبۆرەکەی دەرهێنا و دای بە شینە و پێی گوت وا دیارە ڕەفتاری خراپیان لەگەڵدا نەنواندووی. شینە گوتی کە ئەشکەنجە نەدراوە، بە دەنکە شقارتەیەک لە پێشدا جگەرەکەی (کا) و دواتر ئەوەی خۆی داگیرساند. بەدەم بزەیەکی شیرینەوە پرسی: "بەڕێزم، ئەمجارەیان بۆ کێ سیخوڕی دەکەی؟"

(کا) گوتی: "وازم لە سیخوڕی هێنا. ئیدی ناوبژیوانی دەکەم."

"جا خراپتر. سیخوڕ ئامادەیە لە پێناوی پارەدا بەبار زانیاری بگەیەنێ کە لەوانەیە زۆربەشیان بێبایەخ بن. ناوبژیوانانیش بەبیانووی بێلایەنییەوە لووت لە هەموو شتێک دەژەنن. بەرژەوەندیی تۆ لەمەدا چییە؟"

"ڕزگاربوونم بە ساغ و سەلامەتی لەم شارە بەربادەی قارس."

"دەبێ تەنیا سونای بێ توانییێتی ئەمڕۆ ئەم متمانەیەی بە ئەتایستێک دابێ کە لە ڕۆژئاواوە بۆ سیخوڕیکردن هاتووە."

بەم چەشنە (کا) تێ گەیشت شینە دواین ژمارەی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ی بینیووە. نەفرەتی لە پێکەنینی ژێر سمێڵی شینە دەکرد. ئەم ئیسلامییە شەریعەتخوازە کە دەوڵەت داد و بێدی بوو لەدەست بێبەزەییێتی –بە دوو دۆسیەی تاوانکارییەوە–، ئێستا دوای دەستگیرکردنی چۆنە وا هێندە کەیفساز و



لەسەرخۆیە؟ ئێستا (کا) باشتر تێ دەگەیشت بۆچی قەدیفە تا ئەو ڕادەیە گرفتاری داوی ئەڤینی ئەم کابرایە بووە. ئەمجارە، شینەی ڕێکپۆشتر لە هەموو جارەکانی پێشووتر هاتە بەرچاو.

"بابەتی ناوبژیوانییەکەت چییە؟"

(کا) گوتی: "ئازادکردنی تۆ." پاشان بە هێمنی پوختەی پێشنیارەکەی سونای بۆ گێڕایەوە، بەڵام باسی دانوسانی ئەوەی نەکرد کە قەدیفە لە کاتی سەرپۆش فڕێداندا باروکە لە سەر دەکات، یاخۆ لە وەشانی زیندوودا پەنا بۆ مۆنتاژ دەبرێ. ئاماژەی کرد بۆ دژواریی ڕەوشەکە و گوتی کە کەسانی بێبەزەی دەوروبەری سونای لە نزیکترین هەلدا لە سێدارەی دەدەن. هەستی کرد چێژی لەم قسەیەی خۆی وەرگرت، بەڵام لە هەمان کاتدا هەستی بە تاوانباریش کرد. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی کە سونای کەسێکی شێتۆکەیە، لەگەڵ توانەوەی بەفردا ڕێگاوبانەکان دەکرێنەوە و هەموو شتێک دەگەڕێتەوە دۆخی جاران. دواترێ لە خۆی پرسی داخۆ ئەمەی بۆ ڕازیکردنی کارمەندەکانی میت گوتووە.

شینە گوتی: "کەواتە شێتۆکەییی سونای تاقە ڕێگای ڕزگاربوونی منە."

"بەڵێ."

"دە کەواتە پێی بڵێ: پێشنیارەکەی ڕەت دەکەمەوە. سوپاسی تۆیش دەکەم لە پای زەحمەتکێشان و هاتنت بۆ ئێرە."

(کا) ساتێک وای زانی کە شینە هەڵدەستێتە سەرپێ، تەوقەی لەگەڵدا دەکات و لە دەرگا دەیکاتە دەرەوە. بێدەنگییەک باڵی بەسەریاندا کێشا. شینە بە ئارامی لەسەر قاچەکانی دواوەی کورسییەکە، خۆی دەجووڵاند. "ئەگەر بەهۆی سەرنەکەوتنتەوە لە ناوبژیوانیدا نەتتوانی بە سەلامەتی لەم شارە بەربادەی قارس ڕزگارت بێ، ئەوا بەهۆی منەوە نییە، بەڵکو بەهۆی چەنەبازی و شانازیکردنت دەبێ بە ئەتایستیی خۆتەوە. مرۆڤ لەم وڵاتەدا کاتێک دەتوانێ شانازی بە ئەتایستیی خۆیەوە بکات کە سوپا بخاتە دوای خۆی."

"من لەو کەسانە نیم شانازی بە ئەتایستییەوە بکەم."

"کەوابوو باشە."

هەمدیسان بێ دەنگ بوون و جگەرەیان کێشا. (کا) هەستی کرد جگە لە خۆکێشانەوە و ڕۆیشتن، هیچ شتێکی تری بۆ نەماوەتەوە. پاشان لە شینەی پرسی: "لە مردن دەترسی؟"

"ئەگەر ئەمە هەڕەشە بێ: دەترسم. غەمێکی دۆستانەیش بێ: بەڵێ، دەترسم. بەڵام ئیدی هەرچییەکیش بکەم، ئەم زۆردارانە هەر هەڵم دەواسن. هیچم بۆ ناکرێ."

شینە بە نیگایەکی شیرینەوە کە ڕقی (کا)ی هەستاند، بزەیەکی بۆ کرد. نیگاکانی دەیانگوت: "بڕوانە، من لە دۆخێکی زۆر خراپتر لەوەی تۆدام، بەڵام سەرباری ئەوەیش لە تۆ ئاسوودەترم." (کا) بە شەرمەوە هەستی کرد نائارامی و غەمەکانی پێوەندییان بە ئازارێکی شیرینەوە هەیە کە لە دوای حەزکردنیەوە لە ئیپەک لە ناخیدا هەڵیگرتووە. ئایا تۆ بڵێی شینە ئومێدێکی لەو چەشنەی نەبێ؟ بە خۆی گوت: "تا نۆ دەژمێرم، دوای ئەوە هەڵدەستم و دەڕۆم. یەک، دوو..." کاتێک گەیشتە پێنج، هاتە سەر ئەو باوەڕەی ئەگەر شینەی بۆ لە خشتە نەبرێ، ئەوا ناتوانێ ئیپەک بۆ ئەڵمانیا ببات.

ماوەیەک باسی شتی پڕوپووچی کرد: ناوبژیوانێکی بەدبەختی ناو فیلمێکی ڕەش و سپیی ئەمەریکایی کە لە سەردەمی منداڵیدا بینیبووی، ئەگەری بڵاوکردنەوەی ڕاگەیەندراوی کۆبوونەوەی هوتێل ئاسیا -ئەگەر ڕاست بکرێتەوە- لە ئەڵمانیا، پەشیمانبوونەوەی مرۆڤ لەو بڕیارانەی کە لە ژیانیدا لە ساتی کەللەڕەقی و لە پێناوی ئەڤیندا دەیاندات، بۆ نموونە خۆیشی لە قۆناغی ناوەندی بە بڕیارێکی هەڵەشە وازی لە تیپی تۆپی سەبەتەی قوتابخانە هێنا و جارێکی تر ڕووی تێ نەکردەوە، ڕۆیشتنی لە هەمان ڕۆژدا بۆ قەراغ دەریای بۆغاز و ماوەیەکی درێژ سەیرکردنی دەریا، خۆشەویستیی بێ سنووری بۆ ئەستەمبوڵ، دڵگیریی لە ڕادەبەری کەنداو لە ئێوارانی بەهاردا، ئەمانە و باسی زۆر شتی تریشی کرد. تێ دەکۆشا نەکەوێتە ژێر کاریگەریی نیگاکانی شینە کە بە خوێنساردییەوە تێی دەڕوانی و هەوڵی دەدا لە قسەکردن بەردەوام بێ، بەمجۆرەش دیدارەکەی بە دوا دیداری پێش مردن چوواند.



شینە گوتی: "ئەمانە، کام داخوازەی لە کردن نەهاتووە و مرۆڤ بۆیان ئەنجام بدات، هێشتا بە بەڵێنی خۆیانەوە پەیوەست نابن." لەسەر مێزەکە کۆمەڵێک پێنووس و کاغەزی نیشان دا. "دەیانەوێ چیرۆکی ژیانم، تاوانەکانم و هەر شتێکی کە دەیڵێم بۆیان بنووسمەوە. ئەگەر نیازپاکی ببینن، ئەوا گوایە لەوانەیە بمخەنە بەر یاسای لێبووردن. من هەمیشە بەزەییم بەو دەبەنگانەدا دەهاتەوە کە بڕوایان بەم درۆیانە دەکرد و لە دوا ڕۆژەکانی ژیانیاندا دەسبەرداری دۆزی خۆیان دەبوون و ناپاکییان لە سەرتاپای ژیانی خۆیان دەکرد. بەڵام مادام هەر دەمرم، دەمەوێ ئەوانەی دوای خۆم یەک دوو شتی ڕاست لە بارەی منەوە بزانن." یەکێک لە کاغەزە نووسراوەکانی سەر مێزەکەی ڕاکێشا. وەکو ئەوەی لێدوان بۆ ڕۆژنامەنووسەکانی ئەڵمانیا بدات، هێمایەکی بەدەربەست کەوتە سەر سیمای:

"لەم ڕۆژی بیستی شوباتەدا کە شیمانەی بەهێزی لە سێدارەدانی من لە ئارادایە، دەمەوێ ڕابگەیەنم لە هیچ شتێک پەشیمان نیم کە تا بە ئەمڕۆ لە چوارچێوەی پێداویستی خەباتی سیاسیمدا کردوومە. کوڕی دووەمی فەرمانبەرێکی پیر و خانەنشینی دەزگای دەفتەرداریی ئەستەمبوڵم. سەردەمی منداڵی و تافی لاویم لە جیهانی سادە و بێدەنگی باوکمدا بەسەر برد کە بە نهێنییەوە لە تەکیەیەکی (جەراح)دا دەوامی دەکرد. لە تافی لاویمدا لە باوکم یاخی بووم و بووم بە چەپێکی بێ ئاین، لە زانکۆ کەوتمە دوای میلیتانە لاوەکان و ئەو مارینزانەم بەردەباران کرد کە لە کەشتییە فڕۆکە هەڵگرەکانی ئەمەریکا دادەبەزین. لەو سەردەمەدا زەماوەندم کرد و جیایش بوومەوە؛ تووشی تەنگژەیەک هاتم. لە سۆنگەی ڕق هەستانم لە ڕۆژئاوا، ڕێزم بۆ شۆڕشی ئێران نیشان دا. هەمدیسان بوومەوە بە مسوڵمان، بڕوام بەو قسەیەی ئیمام خومەینی هێنا کە دەیگوت "ئەمڕۆ ئیسلام پاراستن" لە نوێژ و ڕۆژوو زۆر گرنگترە. لە نووسینەکانی فرانتز فانۆنەوە سەبارەت بە توندوتیژی، لە بیرۆکەکانی سەید قوتبەوە سەبارەت بە زۆرداری و گۆڕینی شوێنەوە و لە عەلی شەریعەتی سروشم وەرگرت. بۆ خۆ دەربازکردن لە کودەتای سەربازی، پەنام بۆ ئەڵمانیا برد. گەڕامەوە. لە گرۆزنی شانبەشانی چەچەنەکان لە دژی ڕووسەکان شەڕم کرد، بەهۆی برینداربوونمەوە لەوێ، لاقی ڕاستم کەمێک دەشەلێ. لە کاتی

گەمارۆی سربەکاندا چووم بۆ بۆسنە، لەوێ لەگەڵ کچێکی بۆسناییدا بەناوی مەرزوقە زەماوەندمان کرد و لەگەڵ خۆمدا هێنامەوە بۆ ئەستەمبوڵ. بەهۆی چالاکیی سیاسی و بەهۆی بڕوابوونم بە بیرۆکەی کۆچەوە لە دوو هەفتە زیاتر لە هیچ شارێکدا نەدەمامەوە، بەهۆی ئەمەوە دەستم لە ژنی دووەمیشم هەڵگرت. دوای ئەوەی پێوەندیم لەگەڵ ئەو گرووپە ئیسلامییانەدا برا کە منیان بۆ چەچەنستان و بۆسنە بردبوو، بست بە بستی تورکیا گەڕام. سەرباری ئەوەی باوەڕم وایە کە دوژمنانی ئیسلام ئەگەر پێویست بێ، دەبێ بکوژرێن، من تا بەم ڕۆژە دەگات، نە کەسم کوشتووە و نە کەسیشم بە کوشت داوە. سەرۆکی پێشووی شارەوانیی قارس لە لایەن عەرەبانچییەکی کوردی دەروون نەخۆشەوە کوژرا، چونکە سەرۆکی شارەوانی دەیویست عەرەبانە لە ناو شاردا قەدەغە بکات. من لەبەر خۆکوشتنی کچانی جحێڵ بۆ قارس هاتووم. خۆکوشتن گەورەترین تاوانە. با شیعرەکانم لە دوای مردنم یادگاری من بن، دەمەوێ بڵاوبکرێنەوە. هەمووی لای مەرزوقەیە. ئەوەندە و بەس."

بێدەنگییەک هاتە نێوانەوە.

(کا) گوتی: "ناچار نیت بمری. من بۆ ئەوە لێرەم."

شینە گوتی: "دە کەوابوو شتێکی تر دەگێڕمەوە." دڵنیابوو لەوەی کە باش گوێی لێ گیراوە، جگەرەیەکی تریشی داگیرساند. تۆ بڵێی هەستی بەو ئامێری تۆمارکردنە کردبێ کە لەسەر مەمکی (کا) دانراوە و وەکو ژنێکی چاپووکی ناو ماڵان کار دەکات؟

شینە گوتی: "ئەو سەردەمەی لە مونشن بووم، سینەمایەک هەبوو کە ڕۆژانی شەممە لە سەعات دوازدەی شەو بەدواوە دوو فیلمی بە نرخی هەرزان نیشان دەدا. دەرهێنەرێکی ئیتاڵی هەیە کە فیلمێکی بەناوی –شەڕی جەزایەر– دەرهێناوە و تیایدا زۆرداریی فەرەنسییەکان لە جەزایەر نیشان دەدات. سینەماکە، فیلمی –کوایمادا–ی نمایش کرد کە نوێترین فیلمی ئەو دەرهێنەرەیە. فیلمەکە پیلانەکانی کۆلۆنیالزمی ئینگلیز لە دوورگەیەکی کاریبی کە قامیشی شەکر بەرهەم دەهێنێ و هەوڵی ئینگلیزەکان بۆ ئاژاوەنانەوە نیشان دەدات. سەرەتا پێشەوایەکی ڕەشپێست دەدۆزنەوە و لە ڕێی ئەوەوە شۆڕشێک لەدژی فەرەنسییەکان بەرپا دەکەن، دواتریش دوورگەکە داگیر دەکەن و دەست بەسەر دۆخەکەدا دەگرن. ڕەشپێستەکان دوای



شکستی ڕاپەڕینی یەکەمیان، ئەمجار لەدژی ئینگلیزەکان ڕادەپەڕن، بەڵام کاتێک ئینگلیزەکان هەموو دوورگەکە دەسووتێنن، ڕاپەڕینەکە شکست دێنێ. ڕابەری ڕەشپێستی هەردوو ڕاپەڕینەکە دەستگیر دەکرێ، دەمەوبەیانییەک وا خەریکە لە سێدارە دەدرێ. ڕێک لەو کاتەدا، مارلۆ براندۆ کە هەر لە سەرەتاوە ئەوی دۆزیبووەوە و هانی دابوو لە دژی فەرەنسییەکان ڕاپەڕێ و چەندین ساڵ نەخشەی هەموو شتێکی داڕێژابوو و دواتریش هەر خۆی ڕاپەڕینی دووەمی کابرای ڕەشپێستی دژ بە ئینگلیزەکان سەرکوت کردبوو، دەچێتە ژێر ئەو خێوەتەی کە سەرکردەی ڕەشپێستەکانی تێدا دەستبەسەرە، کۆت و زنجیری لێ دەکاتەوە و ئازادی دەکات."

"بۆچی؟"

شینە کەمێک تووڕە بوو. "بۆچی... بۆ ئەوەی لە سێدارە نەدرێ! چونکە زۆر باش دەزانن ئەگەر لە سێدارەی بدەن، دەبێتە قارەمان و میللەتەکەی ساڵانێکی درێژ ناوی ئەو دەکەن بە ئاڵای ڕاپەڕین. بەڵام کاتێک کابرای ڕەشپێست تێ دەگات مارلۆن بەو نیازە پەتی دیلیی ئەوی پچڕاندووە، ئازادکردنی خۆی ڕەت دەکاتەوە و ڕاناکات."

(کا) پرسی: "لە سێدارە درا؟"

شینە گوتی: "بەڵێ. بەڵام لە فیلمەکەدا لە سێدارەدانەکەی نیشان نادرێ. لە بری ئەوە، سیخوڕ مارلۆن براندۆ کە پێشنیاری ئازادبوونی خستبووە بەردەستی کابرای ڕەشپێست، وەکو ئەوەی ئێستا تۆ لەگەڵ مندا دەیکەی، نیشان دەدات چۆن لە کاتێکدا دەیەوێ دوورگەکە بەجێ بهێڵێ، لە لایەن هاوولاتییەکەوە دەدرێتە بەر چەقۆ و دەکوژرێ."

(کا) بە هەستیارییەکەوە کە بۆی ڕام نەکرا، گوتی: "من سیخوڕ نیم!"

"بە وشەی سیخوڕ پەست مەبە. منیش سیخوڕی ئیسلامم."

ئەمجارە (کا) بێ ئەوەی تووڕەیی خۆی بشارێتەوە، گوتی: "من سیخوڕی کەس نیم."

"واتا دەرمانێکی تایبەتیان نەکردووەتە ئەم مارلبۆرۆیەوە بۆ ژەهراویکردنی من و سستکردنی هۆشم؟ باشترین شتێک کە ئەمەریکاییەکان بە جیهانیان بەخشیبێ،

ماربلبۆرۆی سووره. دەتوانم تا کۆتاییی ژیانم ماربلبۆرۆ بکێشم."

"ئەگەر هۆشمەندانە ڕەفتار بکەیت. دەتوانی چل و یەک ساڵی تر ماربلبۆرۆ بکێشی!"

شینە گوتی: "کاتێک دەڵێم سیخوڕ، مەبەستم ئا ئەمەیە. یەکێک لە ئەرکەکانی سیخوڕ ڕامکردنی عەقڵی مرۆڤە."

"تەنیا دەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم کە ئەوپەڕی بێ عەقڵییە لێرە خۆت بەدەستی ئەم فاشیستە دەست بە خوێن و شێتانە بە کوشت بدەی. ناویشت بۆ کەس نابێت بە ئاڵا و شتی لەو جۆرە. مرۆڤەکانی ئەم میللەتە کە لە مێگەل دەچن، بە ئاینەوە پەیوەستن، بەڵام لە ئاکامدا بە قسەی دەوڵەت هەڵدەسووڕێن نەک ئاین. هەموو شێخانی یاخی، ئەوانەی بەناوی پاراستنی ئاینەوە ڕاپەڕیون، ئەو میلیتانانەی لە ئێران مەشق دراون، با وەکو سەعیدی نەورەسیش کەمێک ناویان دەرکردبێ، بەڵام لە ئاکامدا تەنانەت گۆڕیشیان نامێنێ. ئەو ڕابەرە ئاینییانەی کە ڕێی تێ دەچێ ڕۆژێک لە ڕۆژان ناویان ببێ بە ئاڵای ڕاپەڕین، لە فڕۆکە سوار دەکرێن و لە بەرزاییەوە فڕێ دەدرێنە دەریاوە. تۆ هەموو ئەمانە دەزانی. گۆڕستانی حزبولڵاییەکانی باتمان کە بووبوو بە مەزارگا، لەناکاو لە شەوێکدا دیار نەما. ئایا ئێستا ئەو گۆڕانە لە کوێن؟"

"لە دڵی میللەتدان."

"قسەی قۆڕ، بەتەنیا لە سەدا بیستی ئەم میللەتە دەنگ بە ئیسلامییەکان دەدەن. ئەویش بە پارتێکی میانڕەو."

"ئەگەر میانڕەون بۆچی لێیان دەترسن و کودەتایان لە دژ دەکەن؟ کەوابوو ئەوەیشم پێ بڵێ. سنووری ناوبژیوانییە بێلایەنەکەی تۆ تا ئێرەیە."

(کا) خۆبەخۆ دەنگی بەرز کردەوە: "من ناوبژیوانێکی بێلایەنم."

"کە نیت. تۆ سیخوڕی ڕۆژئاوایت. کۆیلەیەکی ئەوروپاییگەلی کە حەز بە ئازادیی خۆی ناکات و وەکو هەموو کۆیلەیەکیش نازانی کە کۆیلەیت. لەبەرئەوەی لە نیشانتاشی کەمێک بوویت بەڕۆژئاوایی و بەچاوی سووکەوە سەیری ئاین و داب و نەریتی میللەت دەکەی، خۆت بە گەورەی ئەم میللەتە دادەنێی. بە بۆچوونی تۆ، ڕێی



باشبوون و بە ڕەوشتبوون بەناو ئاین و خودا و ژیان لە ناو میللەتدا نا، بەڵکو بە لاساییکردنەوەی ڕۆژئاوادا تێ دەپەڕێ. لەوانەیشە یەک دوو قسە سەبارەت بە زۆرداریی سەر ئیسلامییەکان و کوردەکانیش بکەی، بەڵام دڵت لە ناخەوە پشتیوانی لە کودەتا سەربازییەکە دەکات."

"دەتوانم ئەمانەشت بۆ ساز بکەم: قەدیفە لە ژێر سەرپۆشەکەیەوە باروکە لە سەر دەکات، بەم چەشنە ئەگەر سەریشی ڕووت بکات، کەس قژی نابینێ."

شینە دەنگی بەرز کردەوە و گوتی: "ناتوانی شەرابم دەرخوارد بدەی! من نە دەبم بەئەوروپایی و نە لاساییش دەکەمەوە. من مێژووی خۆم دەژیم و وەکو خۆم دەبم. باوەڕم وایە مرۆڤ دەتوانێ بێ لاساییکردنەوەی ئەوروپاییگەل و بێ ئەوەی ببێ بە کۆیلەیشیان، کامەران بێ. شەیدایانی ڕۆژئاوا قسەیەکیان هەیە بۆ بچووککردنەوەی ئەم میللەتە کە لێکدالێکدا بەکاری دەهێنن: بۆ بە ڕۆژئاواییبوون پێویستە مرۆڤ سەرەتا تاک بێتەوە، بەڵام دەڵێن لە تورکیا تاک نییە. واتای لە سێدارەدانیشم ئەمەیە. من وەکو تاک بەرەنگاری ڕۆژئاواییەکان دەبمەوە، لەبەرئەوەی تاکیشم، لاساییی ئەوان ناکەمەوە."

"سونای هێندە باوەڕی بەو نمایشەی خۆی هەیە، بەجۆرێک دەتوانم ئەمەشت بۆ بکەم: هۆڵی شانۆی گەل چۆڵ دەبێ. کامێرای وەشانی زیندوو سەرەتا دەستی قەدیفە نیشان دەدات لەو کاتەدا کە دەست بۆ سەری دەبات. دواتر بە فیلێکی مۆنتاژ، قژی کەسێکی تر نیشان دەدرێ."

"گومانم هەیە لە پەرۆشیت بۆ ئازادکردنم."

(کا) وەکو کەسێک لە پای درۆکردن هەست بە تاوان بکات، گوتی: "زۆر کامەرانم. لە ژیانمدا هێندە کامەران نەبووم. دەمەوێ ئەم کامەرانییەم بپارێزم."

"ئەو شتە چییە کە کامەرانت دەکات؟"

(کا)، وەکو دواتریش زۆر جاران بیری لێ کردەوە، نەیگوت: "لەبەرئەوەی کە شیعر دەنووسم." یاخو نەیگوت: "لەبەرئەوەی باوەڕم بە خودا هەیە، بەڵکو گوتی: "لەبەرئەوەی ئەڤیندارم. خۆشەویستەکەم لەگەڵمدا دێ بۆ فرانکفورت." بۆ ساتێک

هەستی بە خۆشی کرد، چونکە باسەکەی بۆ کەسێکی بێئاگا لە ئەڤینەکەی گێڕایەوە.

"خۆشەویستەکەت کێیە؟"

"ئیپەکی دادەی قەدیفە."

(کا) بینی شینە دەموچاوی دا بەیەکدا. یەکسەر پەشیمان بووەوە لەو ساتەی کە جۆش گرتبووی. بێدەنگییەک دەستی پێ کرد.

شینە مارلبۆرۆیەکی تریشی داگیرساند. "ئەوە لوتفی خودایە کە مرۆڤێکی بەختەوەر دەیەوێ شادی و کامەرانیی خۆی لەگەڵ کەسێکی بەردەم پەتی سێدارەدا بەش بکات. گریمان من پێشنیارەکەتم پەسەند کرد بۆ ئەوەی درز نەکەوێتە ئەم کامەرانییەت و لەم شارە ڕزگارت بێ و بڕۆی، قەدیفەیش بۆ ئەوەی ڕێگر نەبێ لە بەردەم بەختەوەریی دادەیدا، بەشێوەیەک کە ئابڕووی نەڕووشێ، لە نمایشەکەدا بەشداریی کرد؛ ئایا بە چیدا دەزانی ئەمانە بەڵێنی خۆیان دەبەنە سەر و من ئازاد دەکەن؟"

(کا) بە هەڵچوونەوە گوتی: "دەمزانی شتی وا دەڵێی!" کەمێک بێدەنگ بوو. پەنجەی بۆ لێوی برد و ئاماژەیەکی بەواتای "بێدەنگ و هۆشیار بە" بۆ شینە کرد. دوگمەی چاکەتەکەی کردەوە و بە بەرچاویەوە ئامێری دەنگ تۆمارکردنەکەی سەر بلوزەکەی کوژاندەوە. گوتی: "من دەبمە کەفیلت. سەرەتا تۆ ئازاد دەکەن. قەدیفەیش کاتێک دەچێتە سەر شانۆ کە تۆ لە شوێنی خۆحەشاردانتەوە هەواڵی بۆ بنێری، بەڵام بۆ ئەوەی قەدیفە قایل بکەین، دەبێ تۆ نامەیەکم بۆ بنووسی و تیایدا ڕوونی بکەیتەوە کە بەم ڕێکەوتنە ڕازیت." هەموو ئەو وردەکارییانەی لەو کاتەدا بۆهات. بەچرپە پێی گوت: "بە دڵی خۆت هەلومەرج و جێی ئازادکردنت بۆ دەرەخسێنم. لە شوێنێکی پێ نەزاندراودا خۆت بشارەوە تا ئەو کاتەی ڕێگا و بانەکان دەکرێنەوە. بۆ ئەمەیش متمانەت پێم هەبێ."

شینە یەکێک لە کاغەزەکانی سەر مێزەکەی خستە بەردەمی (کا) و گوتی لێرەدا بنووسە: "من، (کا) ناوبژیوان و کەفیلم قەدیفە بێ ئەوەی ئابڕووی لەکەدار بێ،



سەری ڕووت دەکات و دەچێتە سەر شانۆ، لە بەرامبەر ئەمەیشدا شینە ئازاد دەکرێ و بە سەلامەتی لە شاری قارس دەردەچێ. ئەگەر بەڵێنی خۆت نەبردە سەر و منیش کڵاوم نرایە سەر، سزای کەفیل چی بێ؟"

"چی بەسەر تۆ دێ، با ئەوەیش بەسەر من بێ."

"دە کەوابوو وا بنووسە."

(کا)یش کاغەزێکی خستە بەردەمی ئەو. "تۆیش بنووسە ڕازیت بەو ڕێکەوتنەی کە بۆم باس کردی، هەواڵی ڕێکەوتنەکە لە لایەن منەوە بە قەدیفە ڕادەگەیەندرێ و بڕیاریش بەدەست قەدیفەیە. ئەگەر ئەویش ڕازی بێ، ئەوا ڕەزامەندیی خۆی لە سەر کاغەزێک دەنووسێ و واژۆی دەخاتە سەر و بەر لە سەر ڕووتکردنی، تۆ ئازاد دەکرێیت. ئەوانە بنووسە. چۆن و لە کوێش دەتەوێ ئازاد بکرێی، ئەوە لەگەڵ مندا نا، لەگەڵ کەسێکدا کە متمانەت پێی هەیە، چارەسەر بکە. بۆ ئەم مەسەلەیە فازیلی برای گیانی بە گیانی نەجیبی جوانەمەرگ پێشنیار دەکەم."

"فازیل ئەو منداڵەیە کە گرفتاری ئەڤینی قەدیفە بووە و نامەی بۆ دەنێرێ؟"

(کا) گوتی: "ئەوە نەجیب بوو، مرد. ئەو مرۆڤێکی تایبەت بوو کە خودا ناردبووی. فازیلیش وەکو ئەو مرۆڤێکی باشە."

شینە گوتی: "مادام تۆ ڕات لەسەرە، جێی متمانەی منیشە." ئەمەی گوت و دەستی کرد بە نووسینی کاغەزەکەی بەردەمی.

لە پێشدا شینە نووسینەکەی خۆی تەواو کرد. کاتێک (کا) لە نووسینی بریکارینامەکەی بووەوە، زەردەخەنە گاڵتە ئامێزەکەی شینەی بینی، بەڵام گوێی پێ نەدا. زۆر شادمان بوو بەوەی کە کارەکانی خستووەتە ڕێ و دەتوانێ لەگەڵ ئیپەکدا شار بەجێ بهێڵێ. بە بێدەنگی کاغەزەکانیان گۆڕیەوە. (کا) بینی کە شینە بێ ئەوەی کاغەزەکەی ئەم بخوێنێتەوە، قەدی کرد و لە گیرفانی نا، ئەمیش هەر وای کرد. بە شێوەیەکیش کە شینە چاوی پێوە بێ، دەستی نایەوە بە دوگمەی ئامێری دەنگ تۆمارکردنەکەی سەر سنگیدا و خستیەوە کار.

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە. (کا) دواین ڕستەی بەر لە کوژاندنەوەی ریکۆردەرەکەی

بیرکەوتەوە و گوتی: "دەمزانی ئەمە دەڵێیت. بەڵام ئەگەر لایەنەکان متمانەیان بەیەکدی نەبێ، هەرگیز ناتوانن بە ڕێکەوتن بگەن. پێویستە باوەڕت بە پابەندبوونی دەوڵەت بە بەڵێنەوە هەبێ کە پێتی دەدات."

سەیری ناو چاوی یەکدیان کرد و بزەیان هاتێ. پاش ساڵانێکی زۆر هەر کاتێک (کا) ئەو ساتەی بیر دەکەوتەوە، لە پای ئەوەی لەبەر کامەرانیی خۆی پەی بە تووڕەییی شینە نەبردبوو، پەشیمانیی دەردەبڕی. ئەگەر درکی بە تووڕەییی شینە بکردایە، ئەم پرسیارەی لێ نەدەکرد.

"ئایا قەدیفە پابەندی ئەم ڕێکەوتنە دەبێ؟"

شینە بە دوو چاوەوە کە ئاگریان لێ دەباری گوتی: "دەبێ." کەمێک بێدەنگ بوون.

شینە گوتی: "مادام ڕێکەوتنێک دەکەی بۆ هێشتنەوەی من لە ژیاندا، کەمێک باسی بەختەوەرییەکەتم بۆ بکە."

(کا) گوتی: "لە ژیانمدا هیچ کەسێکم ئەوەندە خۆش نەویستووە." قسەکانی خۆی بە سادە و بێواتا دەزانی، بەڵام سەرباری ئەوەیش، هەر کردنی. "بۆ من لە ئێپەک زیاتر هیچ کامەرانییەکی تر لە ژیاندا نییە."

"کامەرانی چییە؟"

(کا) گوتی: "دۆزینەوەی جیهانێک کە هەموو ئەم نەبوونی و چەوسانەوەیە لە بیری مرۆڤ بباتەوە. پەیوەستبوون بە کەسێکەوە وەکو ئەوەی بە هەموو جیهانەوە پەیوەست بیت..." دەیویست لە قسەکردن بەردەوام بێت، بەڵام شینە لە پڕ هەستایە سەرپێ.

لەو ساتەدا (کا) سروشی شیعری (شەترەنج)ی بۆ هات. سەیرێکی ڕاوەستانەکەی شینەی کرد، دەفتەرەکەی گیرفانی دەرهێنا و بەپەلە دەستی بە نووسینەوە کرد. (کا) سەرگەرمی نووسینەوەی بەیتەکانی شیعرەکەی بوو کە باسیان لە بەختەوەری و دەسەڵات، زانیاری و تەماح دەکرد. شینەیش بۆ تێگەیشتن لە دۆخەکە، لەسەر شانی (کا)وە سەیری کاغەزەکەی بەردەمی دەکرد. (کا) لە ناخەوە هەستی بە سەیرکردنە کرد، دواتر بۆی دەرکەوت واتای ئەو سەیرکردنەی لە شیعرەکەیدا گونجاندووە.



بەجۆرێک سەیری ئەو دەستەی دەکرد کە شیعرەکەی پێ دەنووسی، وەکو ئەوەی سەیری دەستی کەسێکی تر بکات. حاڵی بوو شینە ناتوانێ لەمە بگات؛ دەیویست هەر هیچ نەبێ نیشانی بدات هێزێکی تر هەیە کە دەستی ئەم دەجووڵێنێ، بەڵام شینە لە قەراغ جێگاکەی خۆی دانیشتبوو، وەکو کەسێک کە بەڕاستی لە چاوەڕوانیی هەڵواسیندا بێ، جگەرەی دەکێشا.

(کا) هەر لە خۆیەوە ویستی جارێکی تریش گرێی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە. ساڵانی دواتریش هەرچەند بیری لێ دەکردەوە، نەیدەزانی بۆ لەو کاتەدا ئەو هەستەی لا دروست بوو.

(کا) گوتی: "ساڵانێکی درێژ بوو شیعرم بۆ نەدەنووسرا. ئێستا لە قارس هەموو ڕێگاکانی بەرەو شیعر بە ڕوومدا ئاوەڵا بوون. ئەمەیش دەگەڕێنمەوە بۆ ئەو خۆشەویستییەی خودا کە لێرە لە ناخی خۆمدا هەستم پێ کردووە."

شینە گوتی: "نامەوێ بتشکێنمەوە، بەڵام خۆشەویستی تۆ بۆ خودا جۆرێکە لەوەی کە لە ڕۆمانەکانی ڕۆژئاوادا هەیە. ئەگەر لێرە وەکو ئەورووپییەک باوەڕ بە خودا بێنی، خۆت دەکەی بە گاڵتەجاڕی خەڵکی. ئەو کاتە مرۆڤ بڕوا بە باوەڕهێنانەکەیشت ناکات. تۆ سەر بەم وڵاتە نیت، هەر دەڵێی تورکیش نیت. جارێ هەوڵ بدە لە خەڵکی سادە بچی، پاشان باوەڕ بە خودا بێنە."

(کا) دەرکی کرد کە بەرامبەرەکەی حەزی پێ ناکات. چەند دانەیەک لە کاغەزەکانی سەر مێزەکەی نووشتاندەوە و هەڵی گرت. گوتی کە پێویستە بە زووترین کات قەدیفە و سونای ببینێ، کوتای بە دەرگای ژوورەکەدا. لەگەڵ کرانەوەی دەرگادا، (کا) ڕووی لە شینە کرد و لێی پرسی داخۆ پەیامێکی تایبەتی بۆ قەدیفە هەیە یاخۆ نا. شینە زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و گوتی: "ئاگات لە خۆت بێت. نەتکوژن."

## ٣٦

# خۆ بەڕاستی نامرن، وا نییە بەڕێزم؟

## مامەڵەی نێوان ژیان و نمایش، هونەر و سیاسەت

لە کاتێکدا کارمەندەکانی میت لە نهۆمی سەرەوە لەسەرخۆ خەریکی کردنەوەی لەزگەی ڕیکۆردەرەکە بوون بەدەم ڕاکێشانی تووکەکانی سەر سنگیەوە، (کا) لەخۆوە خۆی لەگەڵ ڕیتمی مەسخەرەئامێز و کارزانیی ئەواندا گونجاند و بە چاوی سووکەوە بۆ شینەی ڕوانی. بەهیچ جۆرێک باسی ئەوەی نەکرد کە هەڵویستی شینە لە بەرامبەر ئەمدا چەند دوژمنکارانە بووە.

بە شۆفێری ئۆتۆمبیلە سەربازییەکەی گوت بیباتەوە بۆ هوتێل و لەوێ چاوەڕێی بکات. لەگەڵ دوو پاسەوانەکەیدا بەمسەری سەربازگادا تا ئەوسەری تێ پەڕی. کۆمەڵێک مێردمنداڵ لە ژێر سپیندارەکانی مەیدانی بەردەم قاوشە سەربازییەکاندا زرمەیان دەهات و شەڕە بەفریان دەکرد. (کا) لەولاترەوە کچێکی باریکەڵەی بینی کە پاڵتۆیەکی لەبەردا بوو و لەگەڵ دوو هاوڕێیدا پاڵیان بە تۆپەڵێک بەفرەوە دەنا و لە بەفر پیاوێکیان دروست دەکرد. پاڵتۆی بەری کچەکە، پاڵتۆیەکی خووریی ڕەنگ سوور و ڕەشی هێنایەوە بیری (کا) کە لە پۆلی سێی سەرەتاییدا بۆیان کڕیبوو. بەری ئاسمان ڕوون و ساف بوو، خۆریش، لە دوای تۆفانێکی هێزپڕوکێن، تازە خەریک بوو لەبەرەوە دەوروبەری گەرم دەکردەوە.

لە هوتێلەکە یەکسەر ئیپەکی دۆزیەوە. لە ئاشپەزخانەکە بوو، تەنوورە و بلووزێکی لەبەرکردبوو کە سەردەمانێک هەموو کچانی قۆناغی ئامادەیی لە تورکیا دەیانپۆشی. (کا) بە شادمانییەوە سەیرێکی کرد، ویستی لە ئامێزی بگرێ، بەڵام بەتەنیا نەبوو: پوختەی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی بۆ باس کرد و پێی گوت کە کارەکان هەم بۆ خۆیان و هەم بۆ قەدیفە بە باشی دەچنە پێش. گوتی کە ڕۆژنامەکە دابەش کراوە، بەڵام من لە مردن ناترسم! هێشتا لە قسەکردن بەردەوام بوو کە زاهیدە خۆی بە



ئاشپەزخانەکەدا کرد و باسی دوو پاسەوانەکەی بەر دەرگای کرد. ئیپەک ویستی بێنە ژوورەوە و چای بخۆنەوە. بە نیگای چاو لەگەڵ (کا) ڕێک کەوتن کە لە سەرەوە لە ژوورەکەدا یەک ببینن.

(کا) هەر کە گەیشتە ژوورەکەی، پاڵتۆکەی داکەند و هەڵی واسی، چاوی بڕیە بنمیچەکە و کەوتە چاوەڕێکردنی ئیپەک. سەرباری ئەوەی زۆر باشی دەزانی لەبەرئەوەی شتیان زۆر هەیە بۆ گوتن، ئیپەک بێ نازکردن دێتە سەرێ، کەچی دوای ماوەیەکی کورت ڕەشبینی دای گرت. لە پێشدا خەیاڵی بۆ ئەوە چوو ڕەنگە ئیپەک تووشی بووبێ بە تووشی باوکییەوە، بۆیە نەهاتووە؛ دواترێ بە ترسەوە بیری لەوە کردەوە ڕەنگە نەیەوێ بێ. هەمدیسان هەستی بەهەمان ئێش کردەوە کە لە گەدەیەوە وەکو ژەهر بە سەرتاپای جەستەیدا بڵاو دەبووەوە. ئەگەر ئەمە ئەوە بێت کە خەڵکانی تر ناوی ئازاری عەشقی لێ دەنێن، ئەوا بەهیچ کلۆجێک کامەرانی بە مرۆڤ نابەخشێ. دەیزانی لەگەڵ زیاتر قووڵبوونەوەی ئەڤینەکەیدا بۆ ئیپەک، زووتر بێ متمانەیی و ڕەشبینی زەفەری پێ دەبەن. بیری کردەوە ئەوەی مرۆڤ بە خۆشەویستی ناوی دەبات، بریتییە لە هەستی بێ متمانەیی، ترسی لە خشتەبردن و خەیاڵ شکاندن، بەڵام بەپێی ئەوەی هەموو کەسێک ئەڤین بە دۆڕان و نابووتی ناو نابات، بەڵکو بە شێوەیەکی ئەرێنی و جاروباریش بە شانازییەوە باسی دەکرێ، دەبێ ڕەوشی ئەم هەندێک جیاوازتر بێ. لە هەمووی خراپتر، هەر ئەوە نەبوو لە ماوەی چاوەڕوانیکردندا بەگومانەوە بیری دەکردەوە (ئیپەک نایات، ئیپەک نایەوێ بێت، ئیپەک تەنیا بۆ بەزمگێڕان یاخۆ بۆ مەبەستێکی شاراوە دێت، هەموویان –قەدیفە، تورگوت بەگ و ئیپەک– لە نێوان خۆیاندا ڕاوێژ بەیەک دەکەن و (کا) بە دوژمنێک دەزانن کە دەبێ لێرە دەربپەڕێندرێ)، بەڵکو دەیزانی کە ئەم بیرکردنەوانە ناتەندروست و گوماناوین. لە هەمان کاتدا، هەم بیرکردنەوەیەکی گوماناوی باڵی بەسەردا دەکێشێ، بۆ نموونە، ئێستا بەدەم سکئێشەوە بیر لەوە دەکاتەوە کە ئیپەک خۆشەویستێکی تری هەیە و بە ئازارەوە ئەمەی دەهاتە بەرچاو، هەم بە بەشێکی تری هۆشی دەیزانی ئەوەی کە ئەم بیری لێ دەکاتەوە نەخۆشییەکە و هیچی تر. جاروبار بۆ دامرکاندنەوەی ئازارەکانی و دیمەنە خراپەکانی بەرچاوی (بۆ نموونە

ئیپەک ئێستا بینینی (کا) و ڕۆیشتنی بۆ فرانکفورت لە سەری خۆی دەرهێناوە)، بەهەموو هێزی خۆی، ئەو بەشەی هۆشی کە هێشتا بەهۆی ئەڤینەوە هاوسەنگیی لە دەست نەداوە، دەخستە کار و خۆی لە بێ متمانەیی و ترس ڕزگار دەکرد (بێگومان خۆشی دەویێم، ئەگەر خۆشی نەویستبام بۆچی هێندە عەشقاوی دەبوو)، بەڵام دوای ساتێکی کورت غەمێکی تر دای دەگرت و تاڵاوی دەکرد بە گەروویدا.

کاتێک لە ڕێڕەوەکەدا گوێی لە دەنگی پێ بوو، لە خەیاڵی خۆیدا وای بۆچوو ئیپەک نەبێ، بەڵکو کەسێکی تر بێ و نەهاتنی ئیپەکی پێی ڕابگەیەنێ. کاتێک ئیپەکیشی لە بەردەم دەرگادا بینی، هەم بە کامەرانی و هەم دوژمنانە سەیری کرد. دوازدە خولەکی ڕەبەق چاوەڕێی کردبوو و لە چاوەڕوانیکردندا شەکەت بووبوو. بە شادمانییەوە بینی ئیپەک سووراو و سپیاوی کردووە و بۆنێکی دڵگیری لە خۆی داوە.

ئیپەک گوتی: "لەگەڵ باوکمدا قسەم کرد و پێم گوت کە دەچمە ئەڵمانیا."

دیمەنە ڕەشبینەکانی ناو سەری (کا) هێندە بەهێز چۆکیان بەسەر سنگیدا دابوو، بەجۆرێک سەرەتا هەستی بە دڵتەنگی کرد و بایەخی بە قسەکانی ئیپەک نەدا. ئەمەیش گومانی ئەوەی لای ئیپەک وروژاند کە هەواڵەکانی ئەم (کا)یان دڵخۆش نەکردووە؛ لە هەمووی خراپتر، ئەم خەیاڵشکاندنە ڕێگای بۆ پاشەکشەکردنی ئیپەک خۆش کرد، بەڵام بەلایەکی تری هۆشی دەیزانی (کا) زۆر عاشقی ئەم بووە و بەشێوەی منداڵێکی پێنج ساڵە کە ناخوازێ هەرگیز لە دایکی دابڕێ، بەمەوە پەیوەستە. هەروەها دەیزانی کە هۆیەکی بردنی ئەم لە لایەن (کا)وە بۆ ئەڵمانیا، هەر ئەوە نەبوو کە لە فرانکفورت ماڵێکی هەبوو و دەیویست تیایدا بەختەوەر بێ، بەڵکو ئومێدی ئەوە بوو ئەمی دوور لە هەموو چاوەکانی تر، تەنیا بۆ خۆی هەبێ.

"گیانەکەم، ئەوە چیتە؟"

(کا)، کاتێک ساڵانی پاشتر بە دەردی ئەڤینەوە دەتلایەوە، هەزاران جار نەرم و نیانی و شیرینیی ناو ئەم پرسیارەی ئیپەکی بیر دەکەوتەوە. هەموو غەمەکانی ناو هۆشی، ترسی دەست لێکبەردان و سامناکترین ئەو دیمەنانەی کە هێنابوونیە پێش



چاوی خۆی، هەر هەمووی بۆ ئیپەک گێڕایەوە.

"بەپێی ئەو هەموو ترسەی پێشوەختەت لە ئازاری عەشق، پێ دەچێ ژنێک ئازاری زۆری کردبێ بە گەرووتدا."

"کەمێک ئازارم چەشتووە، بەڵام هەر لە ئێستاوە لەو ئازارە دەترسم کە ڕەنگە بەهۆی تۆوە بیچێژم."

ئیپەک گوتی: "من هەرگیز ئازارت پێ ناگەیەنم. من ئەڤینداری تۆم و لە تەکتدا دێم بۆ ئەڵمانیا. هەموو شتێک بە دڵی خۆمان دەبێ."

بەهەموو هێزی خۆیەوە باوەشی بە (کا)دا کرد و بە ئاسانییەک کە مایەی بڕواکردن نەبوو بەلای (کا)وە، لەگەڵ یەکدیدا نووستن. هەڵسوکەوتی توندی لە گەڵیدا، لە ئامێزگرتنی بەوپەڕی هێزەوە و پێستی نەرم و سپیی ئیپەک زەوقی بە (کا) بەخشی، بەڵام هەردووکیشیان هەستیان کرد پێکەوە نووستنەکەیان وەکو ئەوەی دوێنێ شەو قووڵ و بەتین نەبوو.

هۆشی (کا) بەلای نەخشەکانی ناوبژیوانیکردنەوە بوو. بڕوای وابوو تەنیا جارێک لە ژیاندا کامەران دەبێ، ئەگەر کەمێک ژیرانە ڕەفتار بکات، دەستی خۆشەویستەکەی دەگرێ و بە سەلامەتی لە قارس بۆی دەردەچن و ئەم کامەرانییەی تا هەتایە بەردەوام دەبێ. سەری سوڕما لەوەی ئەو لە کاتێکدا لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات و بەدەم جگەرەکێشانەوە لە خەیاڵی خۆیدا خەریکی نەخشەدانانە، شیعرێکی نوێی بۆ هات. لە ژێر نیگای پڕ لە خۆشەویستی و سەرسامی ئیپەکدا بە دەستوبرد شیعرەکەی نووسیەوە و سەردێری (ئەڤین)ی بۆی دانا. (کا) دواتر لە ئێوارە کۆڕەکانی ئەڵمانیادا شەش جار ئەم شیعرەی خوێندبووەوە. ئەوانەی گوێیان لە شیعرەکە گرتبوو، پێیان گوتم شیعرەکە، کەمتر لە ئەڤین و خۆشەویستییەوە و زیاتر لە ناکۆکیی نێوان ئارامی و تەنیایی یاخۆ متمانە و ترسەوە و لەو پانتاییيە تاریکانەی ژیانی (کا)وە کە بۆ خۆیشی سەری لێ دەرنەکردن، سەرچاوەیان دەرگرت و جۆرێکیش لە سۆزی تێدابوو بۆ ژنێکی تایبەت. (دواتر تەنیا یەک کەس لێی پرسیم کە ئەو ژنە کێیە؟) ئەمە لە کاتێکدا (کا) لەو

تێبینییانەدا کە سەبارەت بەم شیعرە تۆماری کردبوون، بە زۆری باسی بیرەوەرییەکانی لەگەڵ ئیپەکدا، تاسەکردنی، وردەکاریی جلوبەرگەکانی و جووڵەکانی دەکرد. یەکێک لە هۆیەکانی ئەوەی کە لە یەکەم دیدارم لەگەڵ ئیپەکدا تا ئەو ڕادەیە کەوتمە بەر کاریگەریی، خوێندنەوەی بەردەوامم بوو بۆ ئەو تێبینییانە.

ئیپەک بەپەلە خۆی پۆشتە کردەوە و گوتی کە خوشکەکەی دەنێرێ. لەگەڵ دەرچوونی ئەودا، قەدیفە خۆی کرد بە ژووردا. (کا) بەمەبەستی هێورکردنەوەی شڵەژانی قەدیفە کە چاوەکانی لە ترساندا داچەقاندبوو، گوتی کە هیچ شتێکی مایەی نیگەرانی ڕووی نەداوە و ڕەفتاری خراپ لە تەک شینەدا نەکراوە. هەروەها گوتی کە هەوڵی زۆری داوە تا توانیویەتی شینە قایل بکات و زۆریش بە کەسێکی چاونەترس و بوێری دەزانێ. دواتر دەستی کرد بە فراوانکردنەوەی وردەکارییەکانی درۆیەک کە پێشتر بۆی هاتبوو: سەرەتا گوتی کە چەتوونترین شت قایلکردنی شینە بووە بەوەی قەدیفە بەم ڕێکەوتنە ڕازی بووە. گێڕایەوە و گوتی شینە گوتوویەتی ڕێککەوتن لەگەڵ ئەودا بەواتای بێڕێزی نواندنە بەرامبەر بە قەدیفە و پێویست بوو سەرەتا لەمبارەیەوە لەگەڵ قەدیفەدا قسە بکرایە. کاتێک قەدیفەی بچکۆلانە برۆی هەڵبڕی، (کا) بۆ ئەوەی ڕەهەندێکی ڕاستی بدات بە درۆکەی، گوتی کە باوەڕ ناکات شینە زۆر لەسەر ئەم قسەیەی خۆی سوور بێت. لێرەدا ئەوەیشی بۆ قسەکانی زیاد کرد، ئەگەرچی مەبەستیشی تەنیا خۆنواندن بوو لەسەر ئابڕووی قەدیفە لەگەڵ شینەدا زۆر یەکیان هێناوە و بردووە. دواتر گوتی کە ئەمە (واتا ڕێزگرتن لە بڕیاری ژنێک) شتێکی ئەرێنییە بۆ شینە. (کا) ئێستا ڕازی بوو لەوەی کە لەم شارە قوڕەی قارسدا کە تیایدا فێربووبوو، ئەگەرچی بەدەرەنگیش بووبێ، کەوا تاکە ڕاستی لە ژیاندا بەختەوەربوونە، دەتوانێ ئەم درۆیانە بە زەوقەوە بەو مرۆڤە بێبەختانە بفرۆشێ کە خوویان داوەتە شەڕ و ناکۆکیی تووڕەهاتی سیاسەت. لەلایەکی دی، قەدیفەی بە ئازاتر و فیداکارتر لەخۆی دەزانی و لەم سۆنگەیەوە غەمگین بوو بەوەی ئەو درۆیانەی پێ فرۆشتووە، چونکە دەیزانی لەوانەیە کچەکە لە ئاکامدا ڕەنجەڕۆ بێ. بۆیە بە درۆیەکی بێزیان کۆتاییی بە قسەکانی هێنا و گوتی کە شینە بە گوێیدا چرپاندووە سڵاوی بە قەدیفە بگەیەنێ. جارێکی تر وردەکارییەکانی ڕێکەوتنەکەی



دووبارە کردەوە و ڕای قەدیفەی لەسەر پرسی.

"بەو شێوەیە سەرم ڕووت دەکەم کە خۆم بە باشی دەزانم."

(کا) هەستی کرد هەڵە دەکات ئەگەر بێت و خۆی لە قەرەی ئەم بابەتە نەدات، بۆیە گوتی کە شینە بە پەسەندی دەزانێ قەدیفە باروکە لەسەر بکات یاخۆ شتێکی لەو بابەتە بکات، بەڵام کە بینی وا قەدیفە هەڵدەچێ، بێدەنگ بوو. بەپێی ڕێککەوتنەکە، سەرەتا شینە ئازاد دەکرا، لە شوێنێکی نهێنی خۆی دەشاردەوە و دواتریش قەدیفە بەشێوازێک کە خۆی هەڵی دەبژارد، سەرپۆشی فڕێ دەدا. (کا) لێی پرسی ئایا دەکرێ ئەویش لەسەر کاغەزێک بینووسێ کە هەموو ئەمانە دەزانێ و واژۆی بخاتە سەر؟ (کا) ئەو کاغەزەی لە شینەی وەرگرتبوو، بۆ قەدیفەی درێژ کرد بەمەبەستی ئەوەی بەوردی بیخوێنێتەوە و بیکات بە نموونە. کاتێک بینی دەستنووسەکەی شینە هەستی قەدیفەی جوڵاند، (کا) لە ناخەوە هەستی بە خۆشەویستییەک کرد بەرامبەری. قەدیفە بەدەم خوێندنەوەی نامەکەوە، لەپڕ بەدزیی (کا)وە بۆنی کرد. لەبەرئەوەی قەدیفە دۆش دامابوو، شینە گوتی ئەو نامەیە بۆ قایلکردنی سونای و دەوروبەرەکەی بە ئازادکردنی شینە بەکاردەهێنێ. لەوانەیە سوپا و دەوڵەت لە سۆنگەی سەرداپۆشینەوە لە قەدیفە بەداغ بووبن، بەڵام ئەوانیش وەکو سەرجەم دانیشتووانی قارس باوەڕیان بە جوامێری و بەڵێنەکانی هەبوو. (کا) کاغەزێکی سپیی دایە دەستی قەدیفە و ئەویش بە خۆشییەوە دەستی بە نووسین کرد. (کا) ساتێک پێیدا ڕوانی. قەدیفە بە بەراورد لەگەڵ پێرێ ئێوارەدا کە پێکەوە لە کوچەی قەسابەکان باسی فاڵی ئەستێرەکانیان دەکرد، بەتەمەنتر دەینواند.

(کا) دوای ئەوەی نووسراوەکەی لە قەدیفە وەرگرت و خستیە گیرفانیەوە، گوتی کە ئەگەر سونای بۆ قایل بکرێ، ئەوا گرفتی داهاتوو بریتی دەبێ لە دۆزینەوەی پەنایەکی جێی متمانە بۆ شاردنەوەی شینە لە دوای ئازادکردنی. ئایا قەدیفە ئامادەبوو لە شاردنەوەی شینەدا هاوکاری بکات؟

قەدیفە بە جووڵەی سەر ئاماژەی "بەڵێ"ی بۆی کرد.

(کا) گوتی: "غەمت نەبێ، لە ئاکامدا هەموومان شادمان دەبین."

قەدیفە گوتی: "کردنی کاری ڕاست هەمیشە مرۆڤ بەختەوەر ناکات."

(کا) گوتی: "ڕاستی ئەوەیە کە بەختەوەرمان دەکات." داڵغەی ئەوەی لێ دابوو قەدیفە دوای ماوەیەکی تر دەچێتە فرانکفورت و بە چاوی خۆی شادمانیی ئەم و دادەی دەبینێ. ئیپەک لە بازاڕی کاوفهۆف چاکەتێکی هاوینەی کەشخە بۆ قەدیفە دەکڕێ، هەموویان پێکەوە دەچن بۆ سینەما، دواتر لە ڕیستۆرانتێکی شەقامی کایزەر سۆسیس دەخۆن و بیرەی بەسەردا دەکەن.

(کا) لە پشت قەدیفەوە پاڵتۆکەی لەبەر کرد، چووە خوارەوە و سواری ئۆتۆمبیلە سەربازییەکە بوو. دوو پاسەوانە کەتەکە لە پشتیەوە دانیشتن. (کا) لە خۆی پرسی گەلۆ ترسەکەی لە بەتەنیا ڕێکردن زیاد لە پێویست نییە؟ لە شوێنی شۆفێری ئۆتۆمبیلەکەوە سەیری کوچەکانی قارسی کرد و هیچ شتێکی ترسناکی بەرچاو نەکەوت. بڕێک ژنی بینی کە بۆ شتومەک کڕین بە سەبەتەوە هاتبوونە بازاڕ. بەدەم سەیرکردنی شەڕە بەفری منداڵانەوە، پیاوانی بەساڵاچوو کە بۆ نەکەوتن قۆڵیان بە قۆڵی یەکدا کردبوو، داڵغەی ئەوەی لێ دا دەست لە ناو دەست لەگەڵ ئیپەکدا لە فرانکفورت سەیری فیلم دەکەن.

سونای، لەگەڵ ئالبای عوسمان نووری چۆلاک هاوبەشی کودەتاکەی بوو. (کا) بە گەشبینییەکی سەرچاوەگرتوو لە کامەرانیی خۆیەوە قسەی لەگەڵدا کردن: گوتی کە هەموو شتێکی ئەنجام داوە، قەدیفە ئامادەیە لە نمایشەکەدا بەشداری بکات و سەری ڕووت بکات، شینەیش ئاگر کەوتووەتە کەوڵی و ئامادەیە لە بەرامبەردا ئازاد بکرێ. هەستی کرد جۆرە لێکگەیشتنێکی ماقووڵی تایبەت بەو کەسانەی کە لە کاتی لاوییاندا هەمان کتێبگەلیان خوێندووەتەوە، لە نێوان سونای و ئالبایدا هەیە. بە هۆشیاری، بەڵام بێ شەرمکردن گوتی کە ئەو مەسەلەیەی بە دەستیانەوەیە، زۆر ئاڵۆزە. دواتر گوتی: "سەرەتا ماستاوم بۆ ئابڕووی قەدیفە سارد کردووەتەوە، دواتریش بۆ شینە." ئەو کاغەزانەی لەوانی وەرگرتبوو، دانی بە سونای. لە کاتێکدا سونای کاغەزەکانی دەخوێندەوە، (کا) هەستی کرد کابرا بەر لە داهاتنی دانی نیوەڕۆ، خواردوویەتیەوە. کەمێک سەری لە دەمی سونای نزیک کردەوە و لەوە دڵنیابوو کە عارەقی خواردووەتەوە.



سونای گوتی: "ئەم کابرایە دەیەوێ بەر لەوەی قەدیفە بچێتە سەر شانۆ و سەری ڕووت بکات، ئازاد بکرێ. زۆر هۆشیارە."

(کا) گوتی: "قەدیفەیش هەمان شت دەڵێ. هەوڵی زۆرم دا، بەڵام هەر ئەوەندەم لە دەست هات."

ئالبای عوسمان نوری چەلیک گوتی: "ئێمە وەکو دەوڵەت بۆچی باوەڕ بەوانە بکەین؟"

(کا) گوتی: "ئەوانیش بڕوای خۆیان بە دەوڵەت لە دەست داوە. ئەگەر ئەم بێ متمانەییە بەردەوام بێ، بەهیچ ئەنجامێک ناگەین."

ئالبای گوتی: "ئایا شینە پەی بەوە نابات هەر بۆ پەند هەڵبواسرێ و دواتریش لێپرسراوییەکە بخرێتە ئەستۆی شانۆکارێکی سەرخۆش و ئالبایەکی غەمبارەوە؟"

"زۆر باش دەزانێ، بەجۆرێک ڕەفتار بکات وەکو ئەوەی لە مردن ناترسێ، بۆیە ناتوانم تێ بگەم داخۆ بەڕاستی بیر لە چی دەکاتەوە. ئاماژەی بۆ ئەوەیش کرد کە دەیەوێ لە دار بدرێ بۆ ئەوەی ببێ بە کەسێکی پیرۆز و ببێ بە سیمبول."

سونای گوتی: "گریمان سەرەتا شینەمان ئازاد کرد، ئەدی چۆن بڕوا بکەین قەدیفە پەیمان ناشکێنێ و لە نمایشەکەدا بەشداری دەکات؟

"دەتوانین لە بەڵێنی شینە زیاتر بڕوا بە بەڵێنەکەی قەدیفە بکەین، چونکە کچی تورگوت بەگێکە کە سەردەمانێک ژیانی خۆی لەسەر بنەمای پابەندبوون بە شەرەف و دۆزێکەوە بنیادناوە و ژیانی خۆی لەو ڕێیەدا بە فیڕۆ داوە. سەرباری ئەوەیش، ئەگەر ئێستا پێی بگوترێ شینە ئازاد کراوە، ئەوا خۆیشی نازانێ ئایا ئێوارە دێتە سەر شانۆ یاخۆ نا، چونکە ڕەهەندێکی توورەیی و بڕیاردانی کاتیی تێدا هەیە."

"پێشنیازی تۆ چییە؟"

(کا) گوتی: "دەزانم ئێوە ئەم کودەتا سەربازییەتان تەنیا لەپێناوی سیاسەتدا نەکردووە، بەڵکو لە پێناوی هونەر و جوانیشدا. تێش دەگەم سونای بەگ بەدرێژاییی ژیانی لە پێناوی هونەردا سیاسەتی کردووە. ئێستایش ئەگەر دەتانەوێ تەنیا سیاسەت بکەن، پێویستە شینە ئازاد بکەن و خۆتان نەخەنە مەترسییەوە. دەشزانن

کە سەر ڕووتکردنی قەدیفە بە بەرچاوی هەموو قارسەوە هەم هونەرە و هەم سیاسەتێکی قوڵیشە."

عوسمان نووری چۆلاک گوتی: "ئەگەر سەری ڕووت بکات، شینە ئازاد دەکەین. هەموو خەڵکی شاریش بۆ نمایشەکەی ئێوارە کۆ دەکەینەوە."

سونای باوەشی بە هاوڕێ دێرینەکەی سەردەمی سەربازیدا کرد و ماچی کرد. دوای چوونە دەرەوەی ئالبای، گوتی: "دەمەوێ هەموو ئەمانە بۆ ژنەکەیشم بگێڕیتەوە!" ئەمەی گوت و دەستی (کا)ی گرت و بردی بۆ ژوورێکی پشتەوە. فوندا ئەسەر، لە ژوورێکی سارد و بێ کەلوپەلدا کە سۆپایەکی کارەبایی گەرمی دەکردەوە، بە خۆنووادندەوە دەقێکی دەخوێندەوە کە بە دەستیەوە گرتبوو. بینی وا (کا) و سونای لە دەرگا کراوەکەوە تەماشای دەکەن، بەڵام بێ خۆتێکدان لەسەر خوێندنەوە بەردەوام بوو. (کا) بۆی نەکرا بەوردی سەرنج لە قسەکانی خۆی بدا، چونکە بۆیاخی دەوروبەری چاوی، ڕەنگی ئەستووری سەر لێوەکانی و جلوبەرگەکانی بەری کە مەمکەکانی لێوە دیار بوو، سەری لێ شێواند. سونای بە لە خۆباییبوونەوە گوتی: "مۆنۆلۆژی ئەو ژنە تۆڵەسێنەیە کە لە شانۆنامەی -تراژیدیای ئیسپانیا-ی کیددا دەستدرێژی دەکرێتە سەر ئابڕووی. لەسەر بنەمای شانۆنامەی -مرۆڤە باشەکانی سەزونا-ی برێخت و بەر لە هەموو شتێکیش بە سوود وەرگرتن لە خەیاڵی من داڕێژراوەتەوە. ئێوارە لە کاتێکدا فوندا ئەمە دەخوێنێتەوە، قەدیفە خانم، بە چمکی سەرپۆشەکەی کە هێشتا جەسارەتی نەکردووە فڕێی بدات، فرمێسکی چاوەکانی دەسڕێتەوە."

فوندا ئەسەر گوتی: "ئەگەر قەدیفە خانم ئامادەیە، با یەکسەر دەست بە پرۆڤە بکەین."

تۆنی ئارەزوو لە دەنگی ژنەکەدا، نەک تەنیا عەشقی شانۆ، بەڵکو بانگەشەی هاوجنسبازبوونی فوندایشی بیرخستەوە کە لە لایەن ئەوانەوە درابووە پاڵی کە دەیانویست گێڕانی ڕۆڵی ئەتاتورک لە دەست سونای دەربهێنن. سونای وەکو ئەفسەرێکی شۆڕشگێڕ نا، بەڵکو زیاتر بە ڕیتمی بەرهەمهێنەرێکی لە خۆ باییبووی شانۆوە ڕای گەیاند کە هێشتا بەشداربوونی قەدیفە لە نمایشەکەدا یەکلایی



نەبووەتەوە. لەو کاتەدا یاوەرێک هاتە ژوورەوە و گوتی کە سەرداربەگی خاوەنی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. (کا) کاتێک کابرای لە بەردەم خۆیدا بینی، لە ناخەوە هەستی بە تەنگاوبوونێک کرد کە لە ساڵانی بەر لە دەرچوونی لە تورکیا هەستی پێ دەکرد. فەرموویان لێ کرد بۆ سەر خوانێکی خواردنەوە و پەنیری سپی کە دیار بوو زۆر لەوەوبەرتر بەتایبەتی ئامادەکرابوو. وەکو کەسانێکی نزیک لە دەسەڵاتی سەرکەوتوو کە بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خەڵکانی تر شتێکی زۆر ئاسایی بێ بەلایانەوە، بە بڕوا بەخۆبوونەوە و بە ئاسوودەیی و بێبەزەییانە عارەقیان خواردەوە و نانیان خوارد و سەبارەت بە شتەکانی جیهان قسەیان کرد.

لەسەر داوای سونای، (کا) ئەو قسانەی بۆ فوندا ئەسەر دووبارە کردەوە کە کەمێک پێشتر سەبارەت بە هونەر و سیاسەت کردبوونی. ڕۆژنامەنووسەکە ویستی ئەم وتانە کە فوندا ئەسەر بەجۆشەوە پێشوازیی لێ کرد، تۆمار بکات بۆ بڵاوکردنەوەیان لە ڕۆژنامەکەیدا، بەڵام سونای بە زبری ئازاری پێ گەیاند. سەرەتا ویستی ئەو درۆیانە ڕاست بکاتەوە کە لە ڕۆژنامەکەیدا سەبارەت بە (کا) بە چاپی گەیاندووە. سەردار بەگیش بەڵێنی دا هەواڵێکی زۆر ئەرێنی دابڕێژێ و لە لاپەڕەی یەکەمدا بڵاوی بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو بۆچوونە خراپە لە بیر بچێتەوە کە لای خوێنەرانی بیرەوەری کورتی قارس سەبارەت بە (کا) دروست بووە.

فوندا ئەسەر گوتی: "بەڵام مانشێتی ڕۆژنامەکەت دەبێ سەبارەت بە نمایشەکەی ئەم ئێوارەیەمان بێت."

سەردار بەگ گوتی کە بێگومان ئەو هەواڵە بەوجۆرەی داوای لێ دەکرێ، دەنووسێ و لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاوی دەکاتەوە. کابرا زانیارییەکی ئەوتۆی دەربارەی شانۆی کلاسیک و شانۆی هاوچەرخ نەبوو، گوتی: " ئەگەر سونای بەگ پێم بڵێ نمایشەکەی ئەم ئێوارەیە باسی چی دەکات، واتە ئەگەر ئەو هەواڵەکە بڵێ و من بینووسمەوە، ئەوا سبەینێ بە بێ هەڵە لە لاپەڕەی یەکەمدا بڵاو دەکرێتەوە." بەڕێزەوە بەبیری هێنایەوە کە بەدرێژاییی ژیانی ڕۆژنامەگەریی خۆی چەندین هەواڵی بە دروستی بەر لە ڕووداوەکان بە ڕاسترین شێوە نووسیوە. بە گوێرەی ئەوەی بەهۆی هەلومەرجی

شۆڕشەکەوە کاتی چاپکردنی ڕۆژنامەکە خرابووە سەعات چوار، هێشتا چوار سەعات کات بۆ ئەو کارە بەدەستەوە مابوو.

سونای گوتی: "زۆر ڕات ناگرم بۆ زانینی ڕووداوەکانی ئەم ئێوارەیە." (کا) بینیبووی لەگەڵ دانیشتنیاندا لە دەوری مێزەکە، یەکسەر پێکێک عارەقی هەڵدابوو. لەگەڵ ئامادەکردنی پێکێکی تردا (کا) ئازار و جۆشی لە چاوەکانیدا بینی.

دواتر سونای وەکو ئەوەی هەڕەشەی لێ بکات، سەیری سەردار بەگی کرد و نەڕاندی: "ئەی ڕۆژنامەنووس، بنووسە! مانشێت: مردن لەسەر شانۆ. (کەمێک بیری کردەوە.) ژێرمانشێت: (کەمێک بیری کردەوە.) ئەکتەری ناسراو سونای زایم دوێنێ لەسەر شانۆ کەوتە بەر هێرش و کوژرا. ژێرمانشێتێکی تریش."

بە سەنگینییەکی ئەوتۆ قسەی دەکرد کە (کا) واقی ورمابوو. (کا) بێ ئەوەی بزەی بێتێ، بەڕێزەوە گوێی بۆ سونای ڕاگرتبوو و یارمەتیی ڕۆژنامەنووسەکەیشی دا لەو جێیانەدا کە تێ نەدەگەیشت.

بە پشوودانەکانیشەوە کە سونای لە میانەیاندا بیری دەکردەوە و عارەقی دەخواردەوە، نووسینەوەی هەواڵەکە بەتەواوی سەعاتێکی خایاند. کاتێک دوای چەند ساڵێک چوومە قارس، دەقی تەواوی هەواڵەکەم لە سەردار بەگی خاوەنی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) وەرگرت:

## مردن لەسەر شانۆ

**ئەکتەری ناسراو سونای زایم دوێنێ لەسەر شانۆ کەوتە بەر هێرش و کوژرا**

لە کاتی نمایشەکەی دوێنێ ئێوارەدا لە هۆڵی شانۆی گەل، قەدیفەی سەرپۆش بەسەر، سەرەتا لە ژێر کاریگەریی ئاگری ڕۆشنگەریدا، سەری خۆی ڕووت کرد. پاشان ڕووی چەکی دەستی لە سونای زایم کە ڕۆڵی پیاوە خراپەکارەکەی دەبینی، کرد و زرمەی لێ هەستاند. دانیشتووانی قارس بە بینینی ڕووداوەکە لە وەشانی زیندوودا، واقیان ورما.

سونای زایم کە سێ ڕۆژ لەمەوبەر هاتووەتە شارەکەمان و بە نمایشە



شۆڕشگێڕانە و خوڵقێنەرەکانی کە لە سەر شانۆوە تێکەڵ بە ژیان دەبن، تیشکی ڕۆشنگەری و ئارامیی بۆ قارس هێناوە، خۆی و گرووپی شانۆکەی، دوێنێ ئێوارە بە نمایشەکانیان بۆ جاری دووەم سەرنجی دانیشتووانی شاری قارسیان بۆ سەر خۆیان ڕاکێشا. لەم نمایشەدا کە بە دەستکارییەوە لە نووسەر -کید- وەرگیراوە، ئەو نووسەرەی کە تەنانەت کاریگەریی بەسەر شکسپیریشەوە هەبووە و مافی خۆی نەدراوەتێ، سونای زایم ڕەوتی ڕۆشنگەریی شانۆییی خۆی کە ماوەی بیست ساڵی ڕەبەقە هەوڵ دەدات لە ناوچە دابڕاو و لەبیرکراوەکانی ئەنادۆڵدا، لە سەر شانۆ چۆڵەکان و چایخانەکان نمایشی بکات، گەیاندە کۆتاییی ڕەها. قەدیفەی سەرکردەی کەللەڕەقی کچانی سەرپۆش بەسەر بەهۆی جۆشی ئەم دراما هاوچەرخ و بزوێنەرەوە کە ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە سەر ژاکۆبینەکانی فەرەنسا و شانۆی ژاکوبینی ئینگلیزی، بە بڕیارێکی لە ناکاودراو لەسەر شانۆ سەرپۆشی فڕێ دا و بە بەرچاوی نیگا واقوڕماوەکانی هەموو قارسەوە ڕووی لوولەی چەکی دەستی کردە سونای زایم و دایە بەر دەستڕێژی گوللە، ئەو سونای زایمەی کە ڕۆڵی پیاوە خراپەکارەکەی دەگێڕا و مرۆڤێکی گەورەی شانۆ بوو و وەکو کید مافی خورابوو. قارسییەکان بیریان کەوتەوە کە دەستڕێژەکانی کاتی نمایشەکەی دوو ڕۆژ لەمەوبەر ڕاستی بووە و بە سەرسوڕمانەوە هەستیان کرد کە سونای زایم بەڕاستی پێکراوە. بینەرانی قارس کە زۆر باش لەوە تێ گەیشتبوون لە نمایشەکەدا ڕزگاربوونی مرۆڤ لە دابونەریت و گوشاری ئاین نیشان دراوە، چەندی هەوڵیان دا بۆیان ڕوون نەبووەوە داخۆ سونای زایم کە بێ سنوور باوەڕی بە نمایشەکەی خۆی هەبوو و سەرباری هەبوونی فیشەک لە جەستەیدا، لە ناو خوێنیشدا لەسەر ڕۆڵگێڕان بەردەوام بوو، مردووە یاخۆ زیندووە، بەڵام دەیانزانی کە دیالۆگەکانی بەر لە مردنی و بەخشینی ژیانی خۆی بە هونەر هەرگیز لە بیر ناکەن.

سەردار بەگ دواشێوەی هەواڵەکەی دوای ڕاستکردنەوەی لەگەڵ سونایدا بۆ ئەوانەی دەوروبەری مێزەکە خوێندەوە و گوتی: "هەڵبەتە من لەسەر فەرمانی ئێوە ئەمە لە چاپی سبەینێی ڕۆژنامەکەمدا بڵاو دەکەمەوە، بەڵام بە پێچەوانەی دەیان هەواڵی ترەوە کە پێش ڕووداوەکان نووسیومن و دواتر هاتوونەتە دی، بۆ جاری

یەکەم لە خودا دەپاڕێمەوە ناوەڕۆکی ئەم هەواڵە ڕاست دەرنەچێ! خۆ بەڕاستی نامرن، وا نییە بەڕێزم؟"

سونای گوتی: "هەوڵ دەدەم بگەمە ئەو سەرزەمینەی لە ئاکامدا هونەری ڕاستەقینە پێی دەگات، تێ دەکۆشم ببم بە ئەفسانە. هەروەها ئەگەر سبەینێ بەفر خۆشی بکاتەوە و ڕێگاوبانەکان بکرێنەوە، مردنی من هیچ بایەخێکی نامێنێ بۆ قارسییەکان."

لەپڕ نیگای لەگەڵ نیگای ژنەکەیدا یەکانگیر بووەوە. ژن و پیاوەکە بە تێگەیشتنێکی هێندە قووڵەوە سەیری یەکتریان دەکرد، بەجۆرێک (کا) ئیرەیی پێ بردن. لە خۆی پرسی ئایا ئەویش لەگەڵ ئیپەکدا هەمان لێکگەیشتنیان دەبێ و ژیانێکی کامەران بەسەر دەبەن؟

سونای گوتی: "ڕۆژنامەنووسی بەڕێز، ئێوە بڕۆن و ڕۆژنامەکەتان بۆ چاپکردن ئامادە بکەن. با یاوەرەکەم کلێشەی وێنەیەکی منتان بداتێ بۆ ئەم ژمارە مێژووییەی ڕۆژنامەکەتان." هەر کە ڕۆژنامەنووسەکە چووە دەرەوە، سونای دەستی لە ڕیتمی گاڵتەئامێزانەی دەنگی خۆی هەڵگرت کە بەهۆی زیاد خواردنەوەی عارەقەوە دەنگی بەسەر (کا)دا بەرز کردبووەوە و گوتی: "مەرجەکانی شینە و قەدیفە پەسەند دەکەم." پاشان ڕووی لە فوندا ئەسەر کە برۆیەکی هەڵبڕیبوو، کرد و بۆی ڕوون کردەوە کە بەپێی بەڵێنەکەی قەدیفە سەبارەت بە سەرڕووتکردنی لە نمایشەکەدا، سەرەتا شینە ئازاد دەکرێ.

فوندا ئەسەر گوتی: "قەدیفە خانم کەسێکی زۆر ئازایە. هەر لە ئێستاوە دەزانم لە پرۆڤەکاندا لە یەکدی دەگەین."

سونای گوتی: "پێکەوە دەچن بۆ لای، بەڵام سەرەتا پێویستە شینە ئازاد بکری، لە جێیەکدا خۆی بشارێتەوە، شوێن پێی خۆن ون بکات و هەواڵ بە قەدیفە خانم بگەیەنێ. ئەمەیش کاتی دەوێ."

بەمجۆرە سونای، داخوازی فوندا ئەسەری بۆ دەسبەجێ دەست پێکردنی پرۆڤە لەگەڵ قەدیفەدا بەهەند نەگرت، بەڵکو لەگەڵ (کا)دا کەوتە باسکردنی شێوازی



چۆنێتیی ئازادکردنی شینە. لە میانەی تێبینییەکانی (کا)وە تێ دەگەم کە (کا) تا ڕادەیەک بڕوای بە دەربەستبوونی سونای لەم بابەتدا هەبووە. واتا بە بۆچوونی (کا)، سونای هیچ نەخشەیەکی نەبووە سەبارەت بەوەی شینە دوای ئازادکردنی، چاودێری بکرێ، شوێنی خۆحەشاردانی دەستنیشان بکرێ و دوای سەر ڕووتکردنی قەدیفە لەسەر شانۆ، هەمدیسان دەستگیر بکرێتەوە. ئەمە بیرۆکەیەکی کارمەندانی هەواڵگریی میللی بوو کە ڕاست و چەپی هەموو شوێنێکیان مایکرۆفۆنڕێژ کردبوو، لە ڕێی سیخوڕە دووسەرەکانەوە لە هەموو شتێک تێ گەیشتبوون و هەوڵیان دابوو ئالبای عوسمان نووری چۆلاک بەلای خۆیاندا ڕابکێشن. کارمەندانی هەواڵگریی میللی لە سۆنگەی باش ئاگاداربوونیان لە پێشهاتەکان، ئەم بیرۆکەیەیان داڕشتبوو. ئەوان هێزی سەربازییان نەبوو بۆ ئەوەی شۆڕشەکە لە دەستی سونای و ئالبایەکی تۆراو و چەند ئەفسەرێکی دەوروبەریان دەربێنن؛ بەڵام لە ڕێگای پیاوەکانیانەوە کە بە هەموو لایەکدا بڵاوەیان پێ کردبوون، هەوڵیان دەدا سنوورێک بۆ شێتبوونە (هونەری)یەکانی سونای دابنێن. سەردار بەگ ئەو هەواڵەی کە لەسەر مێزی خواردنەوە لە سونای وەرگرتبوو، بەر لەوەی بۆ ڕۆژنامەکەی ئامادە بکات، بە بێتەل بۆ ناسیاوەکانی خۆی لە میت خوێندبووەوە. کارمەندانی میت لە توانای عەقڵی و لە متمانەکردن بە سونای کەوتبوونە گومانەوە. تا دوا ساتیش کەس نەیدەزانی تا چ ڕادەیەک لە نیازی سونای بۆ ئازادکردنی شینە ئاگادارن.

من باوەڕ ناکەم ئێستا ئەو وردەکارییانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان بەسەر ئەنجامی چیرۆکەکەمانەوە هەبێ، بۆیە بەدرێژی ناچمە ناو وردەکارییەکانی جێبەجێکردنی نەخشەی ئازادکردنی شینەوە. سونای و (کا) لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن ئەم ئەرکە بە یاوەرە سیواسییەکەی سونای و فازیل بسپێرن. سونای ناونیشانی فازیلی لە کارمەندانی میت وەرگرت و ئۆتۆمبیلێکی نارد بە شوێنیدا و دوای دە خولەک گەیشت. فازیل کە کەمێک ترسی پێوە دیار بوو و ئەم جارە نەجیبی بەبیر نەهێنایەوە، بۆ خۆدزینەوە لە هەواڵدزەکان، لەگەڵ یاوەرەکەی سونایدا لە دەرگای پشتەوەی دوورمانخانەکەوە دەرچوون و ڕوویان لە سەربازگاکە کرد. سەرباری گومانی کارمەندانی میت کە سونای لەوانەیە کارێکی توڕەهاتی لێ بوەشێتەوە،

ئامادەکارییەکانیان نەگەیشتبووە ئاستێک کە بتوانن لە هەموو جێیەک پیاوەکانی خۆیان بچێنن. دواتر (کا) زانیبووی شینە لە ژووری سەربازگاکە ئازاد کراوە، هاورێ لەگەڵ هۆشیاریدانەکەی سونای "فێڵ نەبێ"، سواری ئۆتۆمبیلێکی سەربازیی کراوە، یاوەرە سیواسییەکە، ئۆتۆمبیلەکە لە قەراغ پردە ئاسنینەکەی قارس کە پێشتر فازیل دەستنیشانی کردبوو، ڕادەگرێ، شینە لە ئۆتۆمبیلەکە دێتە خوارەوە، وەکو پێی گوتراوە خۆی دەکات بە دووکانی بەقاڵێکدا کە لە جامخانەی پێشەوەدا تۆپی لاستیک، قووتووی تایت و ڕێکلامی سجووقی داناوە، لەوێ خۆی لە ژێر خێوەتی عەرەبانەیەکی دوای ئەسپدا کە لەو کاتەدا بوتڵی ئای گازی بۆ کابرای بەقاڵ هێناوە، حەشار دەدات و بە سەرکەوتوویی شوێن پێی خۆی ون دەکات. لە فازیلیش بەولاوە کەسی تر نەیدەزانی کە عەرەبانەکە شینەی بەرەو کوێ بردووە.

جۆرکردن و ئەنجامدانی هەموو ئەو کارانە سەعات و نیوێکی خایاندبوو. لە دەوروبەری سەعات سێ و نیودا، لەو کاتەدا کە سێبەری دار زەیتوونی ڕووسی و کەستانە لە چاوان ون دەبن و سەرەتای تاریکیی ئێوارە وەکو تارمایی باڵ بەسەر کوچە چۆڵەکانی قارسدا دەکێشێ، فازیل هەواڵی بە قەدیفە گەیاند کە شینە لە شوێنێکی جێی متمانەدا خۆی حەشارداوە. فازیل لە بەردەم دەرگای پشتەوەی ئاشپەزخانەی هوتێلەکەدا، بەجۆرێک سەیری قەدیفەی دەکرد وەکو ئەوەی لە ئاسمانەوە دابەزیبێ، بەڵام قەدیفە بە دەردی نەجیب، ئەمیشی وێڵ کرد. قەدیفە لە خۆشیاندا هەڵبەزیەوە و ڕای کرد بۆ ژوورەکەی خۆی. لەو کاتەدا ئیپەک لە ژوورەکەی (کا) لەسەرەوە کە سەعاتێکی تێدا بەسەربردبوو، هاتە دەرەوە. لە سەرەتای بەشێکی نوێدا دێمە سەر باسی ئەو یەک سەعاتە کە هاورێ خۆشەویستەکەم دواتر بڕوای وابوو لە میانەیدا بە بەڵێنی بەختەوەری، شادمان کراوە.



# ٣٧

## تاقە دەقی ئەم ئێوارەیە ڤژی قەدیفەیە

### سازدانی تەدارەک بۆ دوایین نمایش

پێشتر باسم کردبوو (کا) یەکێکە لەو کەسانەی کە لە کامەرانی دەترسن، چونکە پێیان وایە لە ئاکامدا بەشیان تەنیا ئازارچێشتن دەبێ. دەزانین لەم سۆنگەیەوە بوو لە کاتی کامەرانیدا نا، بەڵکو لە کاتێکدا باوەڕی بکردایە کامەرانی لە دەستدەدات، زیاتر چێژی لێ وەردەگرت. لەسەر مێزی خواردنەوەکەی سونای هەستا، دوو پاسەوانە کەتەکە کەوتنە دوای و گەڕایەوە بۆ هوتێل. هێشتا باوەڕی وابوو هەموو شتێک بە باشی دەچێتە پێش و هەمدیسان ئیپەک دەبینێ، زۆریش دڵخۆش بوو. بەڵام هاوکات ترسی لە دەستدانی کامەرانی بەهێزتر لە هەناویدا شەپۆلی دەدا. من لە کاتێکدا دێمە سەر باسی ئەو شیعرەی کە هاورێکەم لە دەوروبەری سەعات سێی ڕۆژی پێنجشەممەدا لە ژووری هوتێلەکەدا نووسیوێتی، ناچارم ئاماژە بۆ ئەو دوو بارە جیاوازەی دەروونی بێنمە بەر چاوان. ئەم شیعرە کە (کا) ناوی (سەگ)ی بۆ دانابوو، پێوەندیی بەو سەگە ڕەنگ خەڵوزییەوە هەبوو کە لە ڕێگای گەڕانەوەیدا لە دوورمانخانەکەوە جارێکی تر بینیبووی. دوای چوار خولەک لە بینینی سەگەکە گەیشتووەتە ژوورەکەی خۆی، بەدەم بڵاوبوونەوەی ئازاری عەشق وەکو ژەهر بە هەناویدا و لە کاتێکدا لە نێوان چاوەڕوانییەکی گەورەی بەختەوەری و ترسی لە دەستدانیدا گینگڵی خواردبوو، شیعرەکەی نووسیبوو. لە شیعرەکەیدا شوێن پێی ترسی سەردەمی منداڵی لە سەگ بەدی دەکرا: هێشتا شەش ساڵان بووە، سەگێکی بۆز لە پارکی ماچکا بە هەموو کەسێک وەڕیوە و هاورێیەکی خراپی گەڕەکی خۆیان سەگەکەی بەرداوەتە گیانی هەموو کەسێک. (کا) دواتر باوەڕی هێنابوو ترسی لە سەگ سزای ساتەکانی کامەرانی بووە لە سەردەمی منداڵیدا. بەڵام لێرەدا دووفاقییەکیش سەرنجی ڕاکێشابوو: کاتێک سەگ دەهاتن و شوێنی گەمەی

منداڵانیان بۆ دۆزەخ دەگۆڕی، ئەوسا یاریی دووگۆڵی لە کۆڵان، توو کۆکردنەوە یاخۆ کۆکردنەوەی وێنەی یاریزانانی تۆپی پێ کە لە کاغەزی چکلێت دەردەهێنرا و منداڵان بۆ خۆشی گەمەیان پێ دەکرد، بەلای منداڵانەوە شیرینتر دەبوو.

ئیپەک پاش حەوت هەشت خولەک لە دوای ئاگاداربوونی لە گەڕانەوەی (کا) بۆ هوتێل، چووبووە ژوورەکەی. بۆی ڕوون نەبووەوە داخۆ ئیپەک بە گەڕانەوەی ئەوی زانیوە، بە خەیاڵیدا هاتبوو هەواڵی بۆ بنێری. ماوەی چاوەڕوانیکردنەکە بەلای (کا)وە زۆر ماقووڵ بوو، جاری یەکەمی بوو فریا نەکەوێ بیر لەوە بکاتەوە گەلۆ ئیپەک دوادەکەوێ یاخۆ لەوانەیە بڕیاری دابێ دەست لەم هەڵبگرێ، زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی یەکتریان بینی. سەرباری ئەوەیش هێمایەکی کامەرانی بە ڕووخساری ئیپەکەوە دیار بوو کە بە ئاسانی تێک نەدەشکا. (کا) پێی گوت هەموو شتێک زۆر باش دەچێتە پێش، ئەویش هەمان شتی بە (کا) گوت. لە وەڵامی پرسیارێکی ئیپەکدا (کا) گوتی کە دوای کەمێکی تر شینە ئازاد دەکرێ، ئەمە ئیپەکی دڵخۆشتر کرد. وەکو دوانەیەکی زۆر کامەران کە خۆپەرستانە ترسی ئەوەیان هەبوو غەمگینی و بەدبەختیی کەسانی تر و خراپەکارییەکانیان زیان بە کامەرانی ئەمان بگەیەنێ، هەر بەوەندەوە نەوەستان باوەڕ بە خۆیان بێنن کە هەموو شتەکان بە باشی دەڕۆنە پێشەوە، بەڵکو بە شەرمەوە هەستیان کرد ئامادەن لە پێناوی لەکەدارنەبوونی کامەرانیی خۆیاندا هەموو ئێش و ئازار و خوێنی ڕژاو لە بیر خۆیان بەرنەوە. چەندین جار یەکیان لە ئامێز گرت و بە تاو یەکدییان ماچ کرد، بەڵام نەچوونە جێگاوە و لەگەڵ یەکدا نەنووستن. (کا) گوتی کە دەتوانێ لە ڕۆژێکدا لە ئەستەمبوڵ ڤیزای ئەڵمانیا بۆ ئیپەک وەربگرێ، ناسیاوێکی هەیە لە کونسوڵخانە، پێویست ناکات بۆ ڤیزا وەرگرتن یەکسەر زەماوەند بکەن و لە فرانکفورت چۆنیان بوێ دەتوانن ئەو کارە جێبەجێ بکەن. قسەیان هێنایە سەر ئەوەی قەدیفە و ئیپەک کارەکانی خۆیان لێرە جۆر بکەن و بێنە فرانکفورت و بگرە باسی ئەوەشیان کرد کە دەکرێ لە چ هوتێلێک لابدەن. بە سەر گێژخواردن و بە تینوێتیان بۆ کامەرانی، باسی وردەکاریی وایان دەکرد کە لەبەرئەوەی هەر زۆر خەیاڵی بوون، ئەم تەنانەت شەرمی دەکرد بیریشی لێ بکاتەوە. ئیپەک کەوتە قسەکردن سەبارەت بە غەمە



سیاسییەکانی باوکی، ئەگەری تەقاندنەوەی بۆمبا لە لایەن کەسانێکەوە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە، پێویستیی مانەوەی (کا) لە هوتێل و نەچوونە دەرەوەی. بەڵێنیان بە یەکتردا بە یەکەم پاس کە شار بەجێ دێڵێ، بڕۆن. دەستیان خستە ناو دەستی یەکدی و لە پەنجەرەکەوە چاویان بڕیە ڕێگا بەفراوییەکانی چیا.

ئیپەک پێی گوت کە دەستیشی کردووە بە ئامادەکردنی باوڵی کەلوپەلەکانی. (کا) لە پێشدا پێی گوت هیچ لەگەڵ خۆیدا نەهێنێ، بەڵام ئیپەک کۆمەڵێک شتی سەردەمی منداڵیی هەبوو ئەگەر لێیان دوور بوایە، هەستی بە کەموکوڕی لە خۆیدا دەکرد. لە کاتێکدا لە بەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوون و سەیری کوچە بە بەفرداپۆشراوەکەیان دەکرد (لەو ساتەدا ئەو سەگەی کە سروشی شیعرەکەی پێ بەخشیبوو، چرکەساتێک دەرکەوتبوو و دواتر یەکسەر دیار نەمابوو)، ئیپەک کەوتە ژماردنی ئەو شتانەی کە سەرباری پێ داگرتنی (کا) ئامادە نەبوو دەستبەرداریان بێت: سەعاتێکی منداڵانە کە ئەو کاتەی لە ئەستەمبوڵ بوون دایکی بۆ هەریەکەیان دانەیەکی کڕیبوو، لەبەرئەوەی قەدیفە سەعاتەکەی خۆی ون کردبوو، ئیپەک ئەوەی خۆی بەلاوە شیرینتر بووبوو؛ بلوزێکی شینی ئاسمانیی نایابی لە خوریی ئانگۆراچنراو کە خاڵی کۆچکردووی کە ماوەیەک لە ئەڵمانیا ژیابوو، بۆی هێنابوو، بەڵام لەبەرئەوەی کەمێک تەسک بوو، لە قارس نەیتوانیبوو لەبەری بکات؛ پەردەیەکی سەر مێز کە بە دەزووی زیوین چنرابوو و لەبەرئەوەی لە یەکەم بەکارهێنانیدا موختار مورەبای بەسەردا ڕژاندبوو، چیدی بە کاری نەهێنابوو؛ حەڤدە شووشەی عارەق و بۆنی پڕ لە میرووری چاوەزار کە لە سەرەتادا بێ ئامانج کۆی کردبوونەوە و دواتریش بەبیانووی ئەوەی گوایە دەیپارێزن، بۆی نەدەکرا دەستبەرداریان بێ؛ وێنەیەکی خۆی کە لە سەردەمی منداڵیدا گیراوە و تیایدا ئەم لە باوەشی دایک و باوکیدایە ((کا) لەو کاتەدا حەزی دەکرد ببینێ)؛ دەستێک جلی زۆر جوانی ئێواران کە لە قوماشی قەدیفە دروست کرابوو و لەگەڵ موختاردا پێکەوە لە ئەستەمبوڵ کڕیبوویان و پیاوەکەی مۆڵەتی دابووێ تەنیا لە ماڵەوە لەبەری بکات، چونکە لە دواوە زۆر کراوە بوو؛ شاڵێکی ئاوریشم بۆ ئەوەی موختار قایل بکات و بەسەر دەستە جلەکەی ئێواراندا بیپۆشێ؛ جووتێک پێڵاوی چەرم کە لە ترسی قوڕ و

چڵپاوی قارس لە پێی نەکردبوو و گەردانەیەکی گەورەی بەردی گرانبەها کە لەبەرئەوەی لەو ساتەدا پێی بوو، نیشانی (کا)ی دا.

وا مەزانن لە بابەت لام داوە ئەگەر بڵێم دوای چوار ساڵ لەو ڕۆژە، ئیپەک لە ئێوارە خوانێکدا کە سەرۆکی شارەوانیی قارس بانگهێشتنی بۆ کردبوو، ڕێک لە بەرامبەر من دانیشتبوو و هەمان بەردی گرانبەهای لە ملدا بوو و بە پارچەیەک ئاوریشمی ڕەشی دەوری ملیدا هەڵواسرابوو. تەواو بە پێچەوانەوە، ئێستا دەچینە ناو جەرگەی بابەتەکەوە: ئیپەک هێندە شۆخ بوو بەجۆرێک کە نە بە خەیاڵی مندا دەهات و نە بە خەیاڵی ئێوەشدا کە لە ڕێی منەوە بەدوای ئەم بەسەرهاتەوەن. ئەوم یەکەمجار لەو نانخواردنەی ئێوارەدا بینی، ئیرەیی پێبردن و سەرسووڕمان هەناومی هەژاند و هۆشمی تێک دا. چیرۆکی پەرش و بڵاوی دیوانی شیعری هاوڕێ خۆشەویستەکەم لەپڕ وەرگەڕایە سەر چیرۆکێکی زۆر جیاوازی گەشاوە بە عەشقێکی قوڵ. وێ دەچێ لەو ساتە لەرزێنەرەدا بووبێ من بڕیارم دابێ ئەم کتێبەی بەردەستتان بنووسم، بەڵام ڕۆحم لەو کاتەدا ئاگای لەم بڕیارەم نەبوو، بەڵکو پاڵی پێوە دەنام بۆ سەرزەمینێک کە لە هەموو لایەکەوە بە جوانیی ئیپەک تەنرابوو. هەستی بێچارەیی کە هەناوی کەسێکی دانیشتووی بەرامبەر ژنێکی لە ڕادەبەدەر جوان دەهەژێنێ، تواندنەوە و سوریالیزم هەموو جەستەمی پێچابوو. زۆر بە باشی حاڵی بووم هەموو ئامادەبووانی دەوروبەری خوانەکە، سەرجەم ئەو قارسییانەی کە هاتبوون بۆ ئەوەی یەک دوو وشە لەگەڵ نووسەرێکدا کە بۆ شارەکەیان هاتبوو، بگۆڕنەوە یاخۆ بەو بیانووەوە قسەوقسەڵۆکیان دەکرد و تانەوتەشەریان لە خەڵکی تر دەگرت، هەموویان فێڵبازییان دەکرد، هەموو ئەو قسە پووچانەیان بۆ ئەوە بوو بابەتی ڕاستەقینە: کە جوانیی ئیپەک بوو، لە منیش و لە خۆشیان بشارنەوە. لەلایەکی تریش ئیرەیی پێبردن و دڵڕەشییەک کە دەترسام وەرگەڕێتە سەر ئەڤین، هەناومی دەقرتاند: منیش وەکو هاوڕێی کۆچککردووم دەمویست، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بووە، ئەڤینداری ژنێکی ئاوەها جوان ببم! بڕوای نەهێنیم سەبارەت بەوەی کە ساڵانی کۆتاییی ژیانی (کا) بەفیڕۆ چووە، لەناکاو گۆڕا بۆ بیرۆکەی (مرۆڤ تەنیا کاتێک دەتوانێ عەشقی ژنێکی لەو چەشنە بەدەست بێنێ کە



وەکو (کا) خاوەن ڕۆحێکی قوڵ بێ!) بیرم لەوە کردەوە تۆ بڵێی ئیپەکم بۆ لەخشتە ببرێ و لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ئەستەمبوڵ؟ بەڵێنم پێ دەدا بیخوازم، یاخۆ تا پیر و خەرۆ دەبووم هەر خۆشەویستی نهێنیم دەبوو، بەڵام ئارەزووم دەکرد لەگەڵ ئەودا بمرم! ناوچەوانێکی پان و بە بڕیاری هەبوو، چاوەکانی گەورە و نمگرتوو بوون، دەمێکی زەریفی کوتومت لەوەی مەلینداى پێوە بوو کە من لە سەیرکردنی تێر نەدەبووم... گەلۆ تۆ بڵێی چۆن بیر لە من بکاتەوە؟ ئایا دەکرێ لەگەڵ (کا)دا باسی منیان هێنابێتە ئاراوە؟ هێشتا پێکی یەکەمم تەواو نەکردبوو، دڵم دابووی لە شەقەی باڵ و فڕیبوو. هەستم کرد قەدیفە کە کەمێک لەولاترەوە دانیشتبوو، نیگایەکی توندی تێ گرتم. ئێستا پێویستە بگەڕێمەوە سەر چیرۆکەکەم.

لەو کاتەدا کە لە بەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوون، (کا) گەردانەکەی لە ئیپەک وەرگرت و کردیە ملی، بە جوانی ماچی کرد و بێ بیرکردنەوە دووپاتی کردەوە کە لە ئەڵمانیا زۆر بەختەوەر دەبن. لەو ساتەدا ئیپپەک چاوی پێوە بوو کە فازیل بەپەلە لە دەرگای حەوشەکەوە خۆی کرد بە ژووردا، کەمێک چاوەڕێی کرد و دابەزیە خوارەوە و لەبەر دەرگای ئاشپەزخانەکەدا لووتی تەقی بە لووتی خوشکەکەیدا: پێ دەچێ قەدیفە لەوێدا مزگێنیی ئازادبوونی شینەی پێ گەیاندبێ. جووتە خوشکەکە چوونەوە ژوورەکەی خۆیان. نازانم لە نێوان خۆیاندا چییان کردووە و سەبارەت بە چی قسەیان کردووە. (کا) لە ژوورەکەی خۆیدا لە سەرەوە، هێندە مەستی شیعرە تازەکانی و ئەو بەختەوەرییەی خۆی بوو کە ئیدی بە تەواوی باوەڕی پێ هێنابوو، بەجۆرێک بۆ جاری یەکەم دەستی لەوە هەڵگرت بە گۆشەیەکی هۆشی چاودێری هاتوچۆی جووتە خوشکەکە بە هوتێلی بەفرپالاسدا بکات.

دواتر لە ڕێی تۆمارەکانی فەرمانگای کەشناسییەوە بۆم ڕوون بووەوە کەوا ڕەوشی ئاو و هەوا لەو ماوەیەدا زۆر خۆش بووە. هەتاو بەدرێژاییی ڕۆژ بەفری سەر گوێسوانە و درەختەکانی تواندووەتەوە، ماوەیەک بەر لەوەی تاریکیی ئێوارە دابێ، دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەتەوە کە ئەمشەو شەقامەکان لە بەفر پاک دەکرێنەوە و ئیدی کۆتایی بە شۆڕشی شانۆکە دێ. ئەوانەی کە دوای ئەو هەموو ساڵە وردەکاریی ڕووداوەکانیان لەبیر ماوە، هێنایانەوە بیرم کە لە هەمان کاتدا خەڵکی قارس لە ڕێی

(تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس)ەوە بانگهێشتن کراون ئەو ئێوارەیە بچنە هۆڵی شانۆی گەل بۆ بینینی نمایشێکی نوێی گرووپەکەی سونای زایم. کاربەدەستان لەبەرئەوەی پێیان وابوو بیرەوەرییە خوێناوییەکانی دوو ڕۆژ لەمەوبەر دەبنە هۆی تەکینەوەی خەڵکی قارس لە نمایشەکەی ئەمڕۆ، لە ڕێی هاکان ئۆێزگەوە کە خۆشەویستترین بێژەری تەلەفزیۆن بوو، ڕایان گەیاند مۆڵەت بەهیچ دەستدرێژییەک بۆ سەر بینەران نادرێ، هێزەکانی ئاسایش لە دەوروبەری شانۆکە ڕێوشوێنی پێویست لە بەرچاو دەگرن، هاتنە ژوورەوە بە خۆڕاییە و قارسییەکان دەتوانن بە خێزانەوە بێن بۆ سەیرکردنی نمایشەکە، بەڵام ئەمە جگە لە زیادکردنی مەترسییەکان و لە زووتر چۆڵکردنی کوچە و شەقامەکان، هیچ ئەنجامێکی بە دەستەوە نەدا. هەمووان پێیان وابوو هەمدیسان لە هۆڵی شانۆی گەل توندوتیژی و پێکدادانێکی نوێ دەقەومێ، جگە لەو شێت و هارانەی کە دەیانویست بە چاوی خۆیان لە نزیکەوە ڕووداوەکان ببینن (پێویستە لێرەدا بڵێم من ئەم ئاپۆڕەیە کە لە لاوانی بێکار، چەپڕەوانی مایل بە توندوتیژی، پیاوانی بەسالاچووی عاشق و تاقم لە دەم کە دەیانویست بەهەر نرخێک بووە بەرکەوتن و مردنی مرۆڤ ببینن و ئەتاتورکچییانی شەیدای سونای زایم کە زۆر جاران لە تەلەفزیۆندا بینیبوویان، پێک دەهات، بە کەم نازانم)، قارسییەکان دەیانویست نمایشەکە لە وەشانی زیندوودا کە تەلەفزیۆن بانگەشەی بۆ کردبوو، تەماشا بکەن. لەو ساتانەدا سونای و ئالبای عوسمان نووری چۆلاک سەرلەنوێ چاویان بەیەک کەوتبوو. لەبەرئەوەی هەستیان کردبوو شەو هۆڵی شانۆی گەل پڕنابێتەوە، بڕیاریان دابوو قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کۆ بکرێنەوە و بە ئۆتۆمبیلی سەربازی بهێندرێن، ژمارەیەکی دیاریکراو لە خوێندکاران و فەرمانبەرانی قوتابخانەکان، خانەی مامۆستایان و فەرمانگاکانی دەوڵەت بهێندرێن و بە کراڤات و چاکەتەوە بکرێن بە هۆڵی شانۆی گەلدا.

دواتر کەسانێک بینیبوویان کە سونای چۆن لە ژوورێکی بچووک و تۆزاویی درووماندخانەکەدا لەسەر پارچە قوماش و کاغەزی پاکەت و کارتۆنی بەتاڵ ڕاکشاوە و خەوتووە. بەڵام ئەمەی بەهۆی عارەق خواردنەوەکەوە نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی پێی وابوو کە جێی نەرم جەستەی مرۆڤ خاو دەکاتەوە، کردبووی بە خوو لە پێش هەموو



نماشێکی گرنگدا خۆی فڕێ دەدایە سەر دۆشەکێکی ڕەق و زبر. بەر لەوەی بخەوێ، بە دەنگی بەرز لەگەڵ ژنەکەیدا سەبارەت بە تێکستی نمایەشەکە کە هێشتا فۆرمی کۆتاییی پێ نەبەخشیبوو، قسەی کردبوو. دواتر بەمەبەستی دەست پێکردنی پرۆڤە، فوندا ئەسەری بە ئۆتۆمبیلی سەربازی نارد بۆ لای قەدیفە لە هوتێلی بەفرپالاس.

فوندا ئەسەر لەگەڵ گەیشتنیدا بۆ هوتێلەکە، وەکو خانمێک کە هەموو جیهان بەماڵی خۆی بزانێ، بێ سێودووکردن خۆی کرد بە ژووری جووتە خوشکەکەدا. لەوێ، بە دەنگە چینەچینکەرەکەی بناغەی دەمەتەقێی لە نێوان ژنەکاندا دامەزراند. لەمەوە دەتوانم ڕایبگەیەنم فوندا توانای نواندنی خۆی لە دەرەوەی شانۆیش پێش خستبوو. بێگومان دڵ و چاوی لە جوانییە بێگەردەکەی ئیپەک غافڵ نەدەکرد، بەڵام هۆشی بە ڕۆڵەکەی ئەم ئێوارەیەی قەدیفەوە سەرقاڵ بوو. دەتوانم بڵێم درکی بە واتای ڕۆڵەکە کردبوو، چونکە مێردەکەی زۆر بایەخی پێ دەدا. فوندا ئەسەر ماوەی بیست ساڵ بوو لە ئەنادۆڵ ڕۆڵی ئەو ژنە زۆرلێکراوانەی دەبینی کە دەستدرێژی دەکرایە سەر ئابڕوویان، تەنیا یەک ئامانجیشی لەم ڕۆڵگێڕانە هەبوو: هەوڵ بدات لە ڕۆڵی قوربانیدا هەوەسی پیاوان بوروژێنێ! ژن بە شوودان، تەڵاقدان، سەر ڕووتکردن یان داپۆشین بەلای ئەوەوە کۆمەڵێک ئامرازی زۆر ئاسایی بوون بۆ ئەوەی ئەم بخەنە دۆخی چەوساوەیی و بیکەن بە جێگای سەرنجی بینەران، ناشتوانین بڵێین لە تەواوی ڕۆڵەکانی لە شانۆنامە ئەتاتورکچی و ڕۆشنگەرییەکاندا تێ گەیشتووە، بەڵام لە ڕاستیدا پیاوانی نووسەری کلێشەی ئەو ڕۆڵانەیش خاوەن تێزێکی قوڵتر و ناسکتر لەوەی فوندا ئەسەر نەبوون سەبارەت بە ئێرۆتیزمی ئەکتەری ژن و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی. فوندا ئەسەر خۆبەخۆ سۆزێکی دەکرد بە بەر ژیانی دەرەوەی سەر شانۆدا کە نووسەرانی پیاو زۆر بە کەمی بۆ ئەو جۆرە ڕۆڵانە بیریان لێ دەکردەوە. هەر کە چووە ژوورەوە هێندەی پێ نەچوو پێشنیازی بۆ قەدیفە کرد پرچە جوانەکەی ڕووت بکات و دەست بکات بە پرۆڤە بۆ ئێوارە. کاتێک قەدیفە بێ نازکردن سەری خۆی ڕووت کرد، فوندا ئەسەر لە پێشدا قیڕەیەکی بۆ کرد، پاشان گوتی کە قژی قەدیفە هێندە بریقەدار و جوانە، بەجۆرێک ئەم ناتوانێ چاوی لەسەر لاببات. قەدیفەی لە بەردەم ئاوێنەکەدا دانا، بەدەم داهێنانی قژیەوە بە شانەیەکی لە عاج

دروستکراو، بۆی ڕوون کردنەوە کە لە نمایشەکەدا وشە نا، بەڵکو دیمەن گرنگە. گوتی: "بهێڵە با قژت بە ئارەزووی خۆی بدوێ و پیاوان هار بکات!" قەدیفە سەری گێژی دەخوارد، بەڵام فوندا ئەسەر ماچێکی قژی کرد و ئارامی کردەوە. بەشی ئەوە ژیر بوو کە ببینێ ئەو ماچە تۆوە نهێنییەکانی خراپەکاریی لە ناخی قەدیفەدا جووڵاند و بەشی ئەوەیش ئەزموونی هەبوو کە بتوانێ قەدیفە بۆ نمایشەکە بەکێش بکات: شووشەیەک کۆنیاکی لە جانتاکەی دەرهێنا و کردیە ئەو پیاڵانەوە کە زاهیدە هێنابوونی. کاتێک قەدیفە نارەزاییی بەرامبەر بەو ڕەفتارە نیشان دا، فوندا بە گێچەڵ پێگێڕانەوە گوتی: "بەڵام ئەم ئێوارەیە سەریشت ڕووت دەکەی!" کاتێکیش قەدیفە دەستی بە گریان کرد، ئەو وردە ماچی ڕوومەت و لامل و دەستەکانی کرد. دواتر بەمەبەستی دڵخۆشکردنی جووتە خوشکەکە، دەستی کرد بە خوێندنەوەی شانۆنامەیەکی نەناسراوی سونای بە ناوونیشانی (تیرادی هۆستێسی بێتاوان)، بەڵام جووتە خوشکەکە بەمە غەمبارتر بوون. کاتێک قەدیفە گوتی: "دەمەوێ لەسەر تێکستەکە بڕۆم"، فوندا گوتی کە تاقە تێکستی ئەم ئێوارەیە بریسکەی قژە درێژ و جوانەکەی قەدیفەیە کە هەموو پیاوانی قارس بە واقوڕمانەوە سەیری دەکەن، لەوەیش گرنگتر، لەتاو ئیرەیی پێبردن و لە عەشقدا دەیانەوێ دەست بە قژی قەدیفەدا بێنن. بەدەم قسەوە کەمەکەمە کۆنیاکی دەکردە پیاڵەکانی قەدیفە و خۆیەوە. گوتیشی کە هێمای شادییەک بە ڕووخساری ئیپەکەوەیە و لە نیگاکانی قەدیفەیشدا بوێری و تەماح دەبینێ. نەیشیتوانی یەکلاییی بکاتەوە کام لەم جووتە خوشکە لەوی تریان شۆخترە. ئەم جۆشەی فوندا ئەسەر تا هاتنە ژوورەوەی تورگوت بەگ کە لە تووڕەییدا شین و مۆر بووبووەوە، درێژەی کێشا.

تورگوت بەگ گوتی: "پێش کەمێک تەلەفزیۆن ڕای گەیاند قەدیفەی سەردەستەی کچانی سەرپۆش بەسەر ئەم ئێوارەیە سەری ڕووت دەکات. ئایا ئەمە ڕاستە؟"

ئیپەک گوتی: "با ئەمە لە تەلەفزیۆندا ببینین."

فوندا ئەسەر گوتی: "بەڕێزم با خۆمتان پێ بناسێنم، من فوندا ئەسەرم، هاوڕێی ژیانی شانۆکاری ناسراو و پیاوی نوێی دەوڵەت سونای زایم. بەر لە هەموو شتێک بەبۆنەی پەروەردەکردنی ئەم دوو کچە دانسقە و بێ هاوتایەوە پیرۆزباییتان لێ



دەکەم. دەمەوێ دڵنیاشتان بکەمەوە هیچ پێویست ناکات لە بڕیاری بوێرانەی قەدیفە بترسن."

تورگوت بەگ گوتی: "توندڕەوانی ئیسلامیی ئەم شارە هەرگیز لە کچەکەم خۆش نابن."

هەموو پێکەوە چوونە ژووری نانخواردن بۆ سەیرکردنی تەلەفزیۆن. لەوێ فوندا ئەسەر دەستی تورگوت بەگی گرت و بەناوی پیاوەکەیەوە کە فەرمانڕەوای سەرتاسەری شارە، بەڵێنی پێ دا کە هەموو شتێک باش دەبێ. (کا) گوێی لە هەرای ژووری نان خواردنەکە بوو و لەو کاتەدا هاتە خوارەوە، لە قەدیفەی دڵخۆشەوە بیستی کە شینە ئازادکراوە. بێ ئەوەی (کا) هیچی لێ بپرسێ، قەدیفە گوتی کە پابەندی بەڵێنەکەی دەمەوبەیانیی خۆی دەبێت و ئێستا لەگەڵ فوندا خانمدا پرۆڤە بۆ نمایشەکەی ئێوارە دەکەن. فوندا ئەسەر خەریکی خاوکردنەوەی تورگوت بەگ بوو لە ترسی ئەوەی نەبادا ببێتە تەگەرە لە بەردەم بەشداریکردنی کچەکەی لە نمایشەکەدا. ئەوانەی ژوورەکە هەموویان سەیری تەلەفزیۆنە داگیرساوەکەیان دەکرد و سەرجەم لە یەک کاتدا قسەیان دەکرد. (کا) هەشت نۆ خولەکی کۆتاییی ئەو ساتەی خستبووە خانەی بەختەوەرترین خولەکانی ژیانی و تا چەندین ساڵ دوای ئەوەیش بە خۆشییەوە یادی دەکردەوە. لەو ساتەدا بێ هیچ گومانێک، بە گەشبینییەوە باوەڕی بە بەختەوەربوونی خۆی هەبوو و لە خەیاڵی خۆیدا ئەندامی خێزانێکی قەرەباڵەغ و کەیفساز بوو. سەعات هێشتا نەگەیشتبووە چوار، بەڵام لەو کاتەدا کە تاریکیی ئێوارە وەکو بیرەوەرییەکی ئارامبەخشی سەردەمی منداڵی، خۆی بە ژووری خواردنەکەدا کرد کە بنمیچەکەی بە کاغەزی کۆن و ڕەنگ تاریک داپۆشرابوون، (کا) چاوی بڕیە چاوی ئیپەک و بزەیەکی بۆ کرد. ئا لەو کاتەدا (کا) لەو دەرگایەوە کە بەسەر ئاشپەزخانەکەیدا دەڕوانی، فازیلی بینی، بۆ ئەوەی شادیی هیچ کەسێک نەشێوێنێ، (کا) ویستی بیخزێنێتە ئاشپەزخانەکەوە و پرسیاری هۆی هاتنی لێ بکات، بەڵام لاوەکە مۆڵەتی بە (کا) نەدا بیگرێ و پاڵی پێوە بنێ: لە نێوان دەرگای ئاشپەزخانەکەدا ڕاوەستا و شێوەی دیمەنێکی بەسەرچووی تەلەفزیۆنە داگیرساوەکەی وەرگرت، چەند نیگایەکی نیمچە سەرسوڕمان و نیمچە هەڕەشەی

گرتە ئاپۆرە دڵخۆشەکەی ناو ژوورەکە. دواتر (کا) توانی بیداتە پێش خۆی بۆ ئاشپەزخانەکە، ئیپەکیش ئەمەی بینی و دوایان کەوت.

فازیل بە ڕیتمێکی تێکدەرانەوە گوتی: "شینە دەیەوێ هەمدیسان قسەتان لەگەڵدا بکات. ڕای خۆی لەسەر بابەتێک گۆڕیوە."

"کام بابەت؟"

"خۆی پێتان دەڵێ. ئەو عەرەبانەیەی کە دەتانبات بۆ لای، دوای دە خولەکی تر دەگاتە حەوشەی هوتێلەکە." فازیل ئەمەی گوت و چووە حەوشەکە.

لێدانی دڵی (کا) زیادی کرد: نەک تەنیا لەبەرئەوەی نەیدەویست ئەو ڕۆژە هەنگاو بۆ دەرەوەی هوتێلەکە نەنێ، بەڵکو لەبەرئەوەی ترسنۆک بوو، دەترسا.

ئیپەک گوتی: "ئەیەڕۆ، نەکەی بڕۆی!" بەدوایدا ڕووی قسەی لە بۆچوونەکانی ناو مێشکی (کا) کرد و گوتی: "عەرەبانەکەیان دەستنیشان کردووە. ئاکامی زۆر خراپ دەبێ."

(کا) گوتی: "نەخێر، دەڕۆم."

باشە ئەو لە کاتێکدا کە دڵی پێوە نەبوو بڕوات، بۆچی گوتی کە دەڕوات؟

زۆر جاران لە ژیانیدا ڕووی دابوو کە دەستی هەڵبڕیبوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی مامۆستا بێ ئەوەی وەڵامەکەی بزانێ، یاخۆ ئەو بلووزەی نەکڕیبوو کە خۆی دڵی پێوە بووە، بەڵکو بەهەمان پارە و بە زانینەوە دانەیەکی زۆر لەوە خراپتری کڕیبوو. لەوانەیە لە خەفەتدا یاخۆ لە ترسی بەختەوەری ئەمەی کردبێ. بێ ئەوەی ڕێ بدەن قەدیفە بە دۆخەکە بزانێ، هەردووکیان چوونە ژوورەکەی (کا). (کا) ئارەزووی خواست ئیپەک شتێکی ئەوتۆ بڵێ یاخۆ شتێکی داهێنەرانەی ئەوتۆ بکات کە ئەم بۆچوونی خۆی بگۆڕێ و بە ئاسوودەیی لە هوتێل بمێنێتەوە. بەڵام لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەدا ئیپەک چەندی هێنا و برد هەر هەمان بۆچوون و هەمان دەستەواژەی دووبارە کردەوە: "مەڕۆ، ئەمڕۆ لە هوتێل دەرمەچۆ، بەختەوەریمان مەخەرە مەترسییەوە" هتد.

(کا) کە وەکو قوربانییەکی نوقمی خەون گوێی بۆ ئیپەک ڕاگرتبوو، سەیری



دەرەوەی کرد. کاتێک عەرەبانەی دوای ئەسپەکە هاتە حەوشەوە، لەتاو ڕەنجەڕۆیی خۆی، دڵی گوشرا. بێ ئەوەی ماچی بکات، باوەشی بە ئیپەکدا کرد، ماڵئاواییی لێ کرد و دەرچوو. دوو پاسەوانەکە لە هۆڵی پێشوازی چایان دەخواردەوە، (کا) بێ ئەوەی بهێڵێ ئەوان بیبینن، لە دەرگای ئاشپەزخانەکەوە چووە حەوشەکە، خێوەتی عەرەبانەکە کە نەفرەتی لێ دەکرد، هەڵدایەوە و لە ژێریدا ڕاکشا.

با خوێنەران پێیان وا نەبێ من ویستبێتم بەم سەرەتایە زەمینە خۆش بکەم بۆ ئەوەی کە سواربوونی (کا) لە عەرەبانەکە سەرلەبەری ژیانی دەگۆڕێ و بەدەنگەوەچوونی بۆ بانگکردنەکەی شینە بۆ ئەو دەبێت بە خاڵی وەرچەرخان. بەهیچ جۆرێک بڕوام بەمە نییە: (کا) هەلی زۆری لە بەردەستدا بوو بۆ گۆڕینی ئەو بەڵایانەی لە قارس بەسەری دێن بۆ بەرژەوەندی خۆی و لە ئاکامدا ئەو شتە بدۆزێتەوە کە خۆی پێی دەگوت (بەختەوەری)، بەڵام دوای ئەوەی پێشهاتەکان شێوازی کۆتاییی خۆیان وەرگرت و هەر دەبوایە ڕوو بدەن، (کا) چەندین ساڵ خۆبەخۆی خۆی و بە پەشیمانییەوە ڕووداوەکانی هەڵسەنگاندبوو، لە ئاکامدا گەیشتبووە ئەو باوەڕەی ئەگەر ئیپەک لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی (کا)دا قسەی ڕاستی بکردایە، ئەوا بیرۆکەی ڕۆیشتن بۆ لای شینەی دەنایە لاوە.

ئەمەیش نیشانی دەدات کە لە جێی خۆیدایە ئەگەر بڵێین (کا)ی خۆحەشارداو لە ناو عەرەبانەکەدا سەری بۆ چارەنووسی خۆی دانەواندووە. لەوە پەشیمان بوو کە لەوێدا بێ و لە خۆی و لە جیهان تووڕە بوو. دەلەرزی، ترسی هەبوو نەخۆش بکەوێ و پێشبینیی هیچ شتێکی باشی لە شینە نەدەکرد. ئەمجارەیش، وەکو گەشتی جاری یەکەمی بە عەرەبانەکە، بەتەواوی هزری خۆی خستبووە سەر دەنگی کوچە و مرۆگەل، بەڵام گوێی بەوە نەدەدا کە عەرەبانەکە بۆ کوێی قارسی دەبات.

عەرەبانەکە ڕاوەستا، لەگەڵ بیستنی دەنگی تەقەی عەرەبانچییەکەدا لە ژێر خێوەتەکە دەرچوو، دابەزی. نەیزانی لە کوێیە. چووە باڵەخانەیەکی وێرانەوە کە بەهۆی کۆنی و داڕووخاوی ڕەنگی پێوە نەما بوو و نموونەی لەوانەیشی زۆر بنیبوو. دوای ئەوەی بە پلیکانەیەکی تەسک و خوار و خێچدا بۆ نهۆمی دووەم سەرکەوت (دواتر و لە ساتێکی کامەرانیدا بیری کەوتبووەوە کە لە نێوان دەرگایەکدا کە پێڵاوی

لە بەردەمدا ڕیزکرابوو، منداڵێکی چاوکراوەی بینیبوو)، بە دەرگایەکی کراوەدا چووە ژوورەوە و خەندەی لە بەردەم خۆیدا بینی.

خەندە بەدەم زەردەخەنەوە پێی گوت: "بڕیارم دا هەرگیز خۆم لەو کچە دانەبڕم کە خۆمم."

"گرنگ بەختەوەربوونە."

خەندە گوتی: "لێرە هەر شتێک بکەم دڵخۆشم دەکات. ئیدی لەوە ناترسم لە خەونەکانمدا کەسێکی تر بم."

(کا) گوتی: "ئایا بوونت لێرە کەمێک جێگای مەترسی نییە؟"

خەندە گوتی: "بەڵێ، بەڵام مرۆڤ کاتێک دەتوانێ لە ژیان وردبێتەوە کە مەترسی لە ئارادا بێ. تێ گەیشتم ناتوانم لە شتێک وردبمەوە کە بڕوام پێی نییە، بۆ نموونە سەرپۆش فڕێدان. ئێستا زۆر کامەرانم بەوەی لێرە هاوبەشی دۆزێکم لەگەڵ ئەم سەروەرەدا. ئایا ئێوە دەتوانن لێرە شیعر بنووسن؟"

دوو ڕۆژ لەوەوبەر لەسەر خوانی ئێوارە ناسیبووی و قسەی لەگەڵدا کردبوو، بەڵام ئێستا ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە لە یادەوەرییدا هێندە دوور کەوتبووەوە، بەجۆرێک (کا) وەکو ئەوەی هەموو شتێکی لە بیر چووبێ، لە پڕ سەیرێکی کرد. ئایا خەندە تا چ ڕادەیەک پێی لەسەر نزیکیی خۆی لە شینەوە دادەگرت؟ کچەکە دەرگای ژوورێکی ئەولاتری کردەوە، (کا) چووە ژوورەوە و شینەی بینی کە سەیری تەلەفزیۆنێکی ڕەش و سپیی دەکرد.

شینە بە سوپاسەوە گوتی: "هیچ گومانم نەبوو لە هاتنت."

(کا) گوتی: "نازانم لەبەرچی هاتووم."

شینە بە ڕیتمی کەسێکی زۆرزانەوە گوتی: "لەبەر بێ ئۆقرەییی ناو هەناوی خۆت."

بە نەفرەتەوە سەیری یەکتریان کرد. شینە تا ڕادەیەکی باش لە خۆی ڕازی بوو، (کا)یش پەشیمان، هەردووکیشیان ئەم دۆخەیان لە چاوی یەکدیدا خوێندەوە. خەندە لە ژوورەکە چووە دەرێ و دەرگاکەی بەدوای خۆیدا داخست.



شینە گوتی: "دەمەوێ بە قەدیفە بڵێی لە مەسخەرەکەی ئەم ئێوارەیەدا بەشداری نەکات."

(کا) گوتی: "دەتتوانی ئەم هەواڵە بە فازیلدا بنێری." بە سەرنجدان لە سیمای شینە، تێ گەیشت کە بیری ناکەوێتەوە فازیل کێیە.

"ئەو کوڕەی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە منی بۆ ئێرە هێنا."

شینە گوتی: "ها، قەدیفە ئەو کوڕە بەهەند ناگرێ. لە تۆ بترازێ، کەسی تر بەهەند ناگرێ. قەدیفە تەنیا بە گوێگرتن لە تۆ تێ دەگات کە من چەند سوورم لەسەر ئەم بابەتە. لەوانەیە خۆیشی بڕیاری دابێ پێویست بە سەر ڕووتکردن نەکات. بەتایبەتیش دوای ئەوەی بینیوێتی ئەمە بە شێوەیەکی خراپ کەڵکی لێ وەرگیرا و لە تەلەفزیۆندا بانگەشەی بۆ کرا."

(کا) بە زەوقێکەوە کە بۆی پەنهان نەکرا، گوتی: "بگرە کە من لە هوتێل هاتمە دەرێ، قەدیفە دەستی بە پرۆڤە کردبوو."

"پێی ڕادەگەیەنی من زۆر لەدژی ئەو ڕەفتارەم! قەدیفە بە ویستی ئازادی خۆی بڕیاری سەر ڕووتکردنی نەداوە، بەڵکو بۆ ئازادکردنی ژیانی منی بووە. لەگەڵ دەوڵەتێکدا کە پیاوێکی سیاسیی بە بارمتە گرتبوو، مامەڵەی کرد، بەڵام چیدی ناچار نییە پابەندی بەڵێنی خۆی بێت."

(کا) گوتی: "ئەمانەی پێ دەڵێم، بەڵام نازانم ئەو چی دەکات."

"دەتەوێ پێ بڵێی ئەگەر قەدیفە وا بکات وەکو خۆی دەیەوێ، ئەوا تۆ بەرپرسیار نابیت، وا نییە؟" (کا) بێدەنگ بوو. "ئەگەر ئەم ئێوارەیە قەدیفە بچێتە سەر شانۆ و سەری ڕووت بکات، ئەوا تۆ بەرپرسیار دەبی. هەر تۆیش بووی ئەم مامەڵەیەت کرد."

(کا) لەو کاتەوەی بۆ قارس هاتبوو، بۆ جاری یەکەم لە ویژدانی خۆیدا هەستی بە ڕەوایی و ئارامی کرد: پیاوی بەدڕەفتار لە ئاکامدا وەکو بەدڕەفتاران قسەی خراپی دەکرد و ئیدی هیچ سەری لەمە سووڕ نەدەما. (کا) بۆ هێورکردنەوەی شینە گوتی: "ڕاستە، تۆیان بە بارمتە گرتبوو!" هەوڵی دەدا بەجۆرێک ڕەفتار بکات کە شینە نەوروژێ و ئەم بتوانێ لەوێ بڕوات.

شینە زەرفێکی بۆ (کا) درێژ کرد و گوتی: "ئەم نامەیەشی پێ بگەیەنە، چونکە لەوانەیە قەدیفە بڕوا بە پەیامەکەم نەکات." (کا) زەرفەکەی لێ وەرگرت. "ڕێگای خۆت دەدۆزیتەوە و ڕۆژێک دەگەڕێیتەوە بۆ فرانکفورتەکەت. ئەو ڕاگەیەندراوەیش کە دەیان کەس ژیانی خۆیان لە پێناویدا خستە مەترسییەوە، بێ هیچ دوودڵییەک لە ڕێی هانز هانزنەوە بڵاودەکەیتەوە."

"بێگومان."

جۆرێک لە تێرنەبوون و گومانی لە نیگای شینەدا بینی. ئەو کاتە ئارامتر بوو کە لە ژووری گرتووخانەکەدا لە دۆخی کەسێکی سزادراودا چاوەڕێ بوو دەمەویەیانی لە سێدارە بدرێ. ئێستا ژیانی ڕزگار کرابوو، بەڵام سوور دەیزانی لە پاشماوەی ژیانیدا جگە لە تووڕەبوون هیچی تری بۆ ناکرێ. ئەمەیش پێشوەخت هەستی ڕەنجەڕۆییی تێدا وروژاندبوو. (کا) درەنگتر بۆی دەرکەوت شینە هەستی کردووە کەوا ئەم پەی بە ڕەنجەڕۆیییەکەی بردووە.

شینە گوتی: "ئەگەر دەتەوێ لێرە، ئەگەر نا، ئەوا دەتوانی لە ئەورووپا خۆشەویستەکەت لاسایی ئەوان بکەیتەوە و وەکو مشەخۆرێک بژی."

"من ئەوەندەم بەسە کە کامەران بم."

شینە بەسەریدا قیڕاند: "بڕۆ، دەی بڕۆ. بەڵام لێت ڕوون بێ کەسێک کە تەنیا وێڵی بەختەوەری بێ، هەرگیز بەختەوەر نابێ."



# ٣٨

## بەڕاستی نیازمان نییە غەمگینت بکەین

### میواندارییەکی زۆرەملێ

(کا) بە دوورکەوتنەوە لە شینە خۆشحاڵ بوو، بەڵام دەسبەجێ هەستی کرد کە ڕایەڵێکی نەگبەتی شینە بە ئەمەوە دەبەستێتەوە: ئەم ڕایەڵە زۆر قوڵتر بوو لە مەراق و نەفرەتێکی سادە، هەر کە لەوێ هاتە دەرەوە حاڵی بوو بە نارەزای دڵ تاسەی شینە دەکات. خەندە بەنیازێکی پاک و بە بیری باشەوە لێی نزیک کەوتەوە، ئەم سەرەتا کچەکەی زۆر سادە و بێ عەقڵ هاتە بەرچاو، بەڵام بەخۆنازینەکەی هێندە درێژەی نەکێشا. خەندە چاوەکانی کردووەتەوە و سڵاو بۆ قەدیفە دەنێرێ، دەیەوێ قەدیفە بزانێ ئەگەر ئەم ئێوارەیە لە تەلەفزیۆندا (بەڵێ، شانۆی نەگوت، بەڵکو ڕاستەوخۆ تەلەفزیۆنی گوت) سەری ڕووت بکات یاخۆ نەکات، ئەوا دڵی ئەمی هەمیشە لەگەڵدایە. هەمان کات بۆ (کا)ی ڕوون دەکردەوە کە دوای چوونە دەرەوەی کام ڕێگا بگرێتە بەر بۆ سەرلێشێواندن لە پۆلیسی سڤیل و هەواڵدزان.

(کا) بەپەلە و بە شپرزەیی لە خانووەکە چووە دەرێ، نهۆمێک لە خوارتر سروشی شیعرێکی بۆ هات و لەسەر یەکەم پلیکانەی پێش ئەو دەرگایەدا کە کۆمەڵێک پێڵاوی لە بەردەمدا ڕیزکرابوو، دانیشت. دەفتەرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و دەستی بە نووسینەوەی شیعرەکەی کرد.

ئەمە هەژدەیەمین شیعری (کا) بوو کە لە قارس بۆی هاتبوو، بەبێ ئەو تێبینییانەی کە خۆی تۆماری کردبوون، هیچ کەسێک نەیدەتوانی بزانێ لەم شیعرەدا ئاماژەی کردووە بۆ هەبوونی لەو جۆرە پێوەندییی خۆشەویستی و نەفرەتە کە لەگەڵ کۆمەڵێک مرۆڤ لە ژیانیدا هەیبووە: کاتێک لە ئامادەییی تەرەقی شیشلی قوتابیی قۆناغی ناوەندی بوو، کوڕی بنەماڵەیەکی بەڵێندەری زۆر دەوڵەمەند کە پاڵەوانێتیی ئەسپ سواریی باڵکانی بردبووەوە، کوڕێکی شووم بوو، بەڵام بەشی ئەوەی پێوە بوو کەوا

(کا) بەلای خۆیدا ڕابکێشێ؛ کوڕێکی ڕەنگ زەرد و ڕووخسار سپی و پڕ لە ڕازی دایکێکی خەڵکی ڕووسیای سپی کە بێ باوک و خوشک و برا پێ گەیشتبوو، لە قۆناغی ئامادەیی فێری بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر بووبوو و ڕێزی لە هیچ نەدەگرت و بەشێوازێکی سەیر بەهەموو شتێکی دەزانی؛ کاتێک لە توزلا سەربازیی دەکرد، کوڕێکی ڕێکپۆش و بێدەنگ هەبوو کە جاروبار لە ڕیزەکەی تەنیشت ئەوانەوە (کا)ی تووڕە دەکرد (بێرییەکەی دەشاردەوە.) لە شیعرەکەیدا ڕوونی کردبووەوە کە خۆشەویستییەکی نهێنی و نەفرەتێکی ئاشکرا بەم مرۆڤانەوەی گرێ دەدات. هەوڵی دا بە وشەی (ئیرەیی پێبردن) کە ئەو دوو هەستە لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە و ناوی شیعرە نوێکەیشی بوو، جەنجاڵیی ناو مێشکی خۆی هێور بکاتەوە، بەڵام کێشەکە زۆر لەوە قوڵتر بوو و لە شیعرەکەدا چارەسەر نەدەکرا: (کا) هەستی دەکرد دوای سەردەمێک ڕۆح و دەنگی ئەو مرۆڤانە هاتوونەتە هەناوی ئەمەوە.

پاش ئەوەی لە باڵەخانەکە هاتە دەرەوە، نەیزانی لە کوێندەرێی قارسە، بەڵام دوای ئەوەی ماوەیەک لە سەرەولێژییەک چووە خوارەوە، بینی وا گەیشتووەتە شەقامی خالید پاشا، لە خۆیەوە ئاوڕێکی بۆ دواوە دایەوە و سەیرێکی شوێنی خۆحەشاردانەکەی شینەی کرد. لەبەرئەوەی لە گەڕانەوەیدا بەرەو هوتێل پاسەوانەکانی لەگەڵدا نەبوو، هەستی بە نائارامی کرد. لە پێش باڵەخانەی شارەوانیدا ئۆتۆمبیلێک ڕووی تێ کرد، لەگەڵ ترازانی دەرگای ئۆتۆمبیلەکەدا، ئەم لە جێی خۆی ڕاوەستا.

"(کا) بەگ مەترسن، ئێمە سەر بە ئاسایشین. فەرموون سواربن با بتانگەیەنینە هوتێل."

(کا) ئەوەی لێک دەدایەوە کە ئایا کامیان جێی متمانەیە؛ لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا بڕواتەوە بۆ هوتێل یاخۆ سواربوونی ئۆتۆمبیلی پۆلیس لە ناوەڕاستی شاردا. لەم بیرکردنەوانەدا بوو کە دەرگای ئۆتۆمبیلەکە کرایەوە. پیاوێکی خڕپلە کە کەسێکی هێنایەوە بیری (کا) (مامێکی دوور لە ئەستەمبوڵ، بەڵێ مامە مەحموود)، بە هەڵمەتێکی زبر و بەهێزی نەگونجاو لەگەڵ نەزاکەتەکەی کەمێک لەمەوبەردا، (کا)ی ڕاکێشایە نێو ئۆتۆمبیلەکەوە. لەگەڵ وەگەرکەوتنی ئۆتۆمبیلەکەدا، دوو



مستەکۆڵە لە سەری (کا) درا. یاخۆ تۆ بڵێی لە کاتی سواربووندا سەری بەر بنمیچی ئۆتۆمبیلەکە کەوتبێ؟ زۆر دەترسا؛ تاریکییەکی نائاسایی ناو ئۆتۆمبیلەکەی داپۆشیبوو. مامە مەحموود نا، بەڵام ئەوەی لە پێشەوە دانیشتبوو جنێوی زۆر پیسی دەدا. لە سەردەمی منداڵیی ئەمدا، پیاوێک هەبوو لە گەڕەکی شاعیر نیگار، کاتێک تۆپ دەکەوتە باخچەکەیەوە، بەو شێوەیە جنێوی بە منداڵان دەدا.

(کا) نقەی لە خۆی بڕی و وای هێنایە پێش چاوی خۆی کە منداڵێکە. ئۆتۆمبیلەکە (ئێستا بیری کەوتەوە: ئۆتۆمبیلێکی ڕینۆ نییە لەوانەی کە پۆلیسی سڤیلی قارس بەکاری دێنن، شۆفرلێتێکی ٥٦ی پان و لوکسە)، وەکو ئەوەی منداڵێکی زیزبوو سزا بدرێ، خۆی کرد بە کوچە تاریکەکانی قارسدا، هاتە دەرەوە، پێچێکی کردەوە و چووە حەوشێکەوە. گوتیان : "سەیری پێشی خۆت بکە." چوونە بن باڵی و دوو پلیکانە بردیانە سەرێ. کاتێک گەیشتنە سەرەوە، (کا) بۆی ڕوون بووەوە شۆفێرەکە و ئەو دوو کەسە ئیسلامی سیاسی نین (ئەوان ئۆتۆمبیلی وایان لە کوێ بوو.) سەر بە میتیش نەبوون، چونکە پیاوانی میت –بەلانی کەمەوە هەندێکیان– بە هەماهەنگی لەگەڵ سونایدا هەڵدەسووڕان. دەرگایەک کرایەوە، دەرگایەک داخرا، (کا) خۆی لە بەردەم پەنجەرەی ژوورێکی بنمیچ بەرزی کەونە ماڵێکی ئەرمەنیدا بینییەوە. پەنجەرەی ژوورەکە دەیڕوانی بەسەر شەقامی ئەتاتورکدا. لە ژوورەکەدا تەلەفزیۆنێکی داگیرساوی بینی، مێزێکی پڕ لە قاپی چەور، پرتەقاڵ و ڕۆژنامەی بینی؛ ئامێرێکی کارەبایی کە دواتر تێ گەیشت بۆ ئەشکەنجەدان بەکار دەهێندرێ، یەک دوو دانە بێتەل، دەمانچە، گوڵدان، ئاوێنە... دەسبەجێ حاڵی بوو کە کەوتووەتە دەست تیمی تایبەت و ترسی لێ نیشت، بەڵام دوای ئەوەی لەوسەری ژوورەکە چاوی بە ز. دەمیرکۆڵ کەوت، سووکناییی بە دڵدا هات.

ز. دەمیرکۆڵ ڕۆڵی پۆلیسێکی باشی دەگێڕا، زۆر غەمگین بوو بەوەی کەوا (کا) بەو چەشنە هێندرابووە ئەو شوێنە. لەبەرئەوەی (کا) پێشبینیی کرد کە مامە مەحموودی ڕۆڵی پۆلیسێکی خراپ دەگێڕێ، بەهەموو هزری خۆیەوە گوێی بۆ پرسیارەکانی ز. دەمیرکۆڵ ڕاگرت.

"سونای دەیەوێ چی بکات؟"

(کا) هەر هەموو وردەکارییەکانی، بە (تراژیدیای ئیسپانیا)ی کید-یشەوە، بە ترش و خوێوە گێڕایەوە.

"بۆچی ئەو شینە جاڵجاڵۆکەیەی ئازاد کرد؟"

(کا) لە وەڵامدا گوتی: "بۆ ئەوەی قەدیفە لە وەشانی زیندوو و لە نمایشەکەدا سەرپۆش فڕێ بدات." سروشێکی بۆ هات و چەنەبازانە دەستەواژەیەکی شەترەنجی بەکارهێنا: "لەوانەیە ئەمە "قوربانی"یەکی زۆر بوێرانەی شایەن بە سەرسوڕمان بێ. هەمان کات هەڵمەتێکیشە بۆ تێکدانی ورەی ئیسلامییە سیاسییەکانی قارس!"

"بە چیدا دیارە کچەکە پابەندی بەڵێنی خۆی دەبێ؟"

(کا) گوتی کە قەدیفە ڕەزامەندی خۆی بۆ چوونە سەر شانۆ نیشان داوە، بەڵام گوتیشی کەس لەم گفتەی دڵنیا نییە.

ز. دەمیرکۆڵ پرسی: "حەشارگەی نوێی شینە لە کوێیە؟"

(کا) گوتی کە هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانێ.

لێیان پرسی بۆچی ئەو کاتەی سواری ئۆتۆمبیلەکەیان کردووە، پاسەوانەکانی لەگەڵدا نەبووە و لە کوێوە گەڕاوەتەوە.

(کا) گوتی: "لە پیاسەی ئێواران دەگەڕامەوە." بە سووربوونی لەسەر ئەم وەڵامە، ز. دەمیرکۆڵ بە کپی ژوورەکەی جێ هێشت و ڕۆیشت. مامە مەحموودی بە نیگا بەدەکانییەوە لە بەردەمیدا چەقی. ئەویش وەکو کابرای پێشەوەی ناو ئۆتۆمبیلەکە چەندین جنێوی هیچ کەس نەبیستووی دەزانی. وەکو چۆن منداڵان بێ ئەوەی بیر بکەنەوە کە شیرینە یا سوێر کەچەپ بەسەر هەموو پاروویەکدا دەکەن، مامە مەحموودی بەدەم شیکردنەوەی سیاسی و باسکردنی بەرژوەندییە باڵاکانی دەوڵەت و هەڕەشەکانەوە، جنێوبارانی کرد.

مامە مەحموود گوتی: "پێت وایە بە شاردنەوەی حەشارگەی تیرۆریستێکی دەست بەخوێنی پارە وەرگر لە ئێران چیت بۆ دەکرێ؟ ئەگەر دەسەڵات بگرنە دەست، دەزانی چی بەسەر کەسانی دڵنەرمی ئەوروپادیدەی وەکو تۆدا دێنن، وا نییە؟" (کا) بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، کەچی مامە مەحموود بە تێروتەسەلی باسی ئەوەی بۆ کرد کە چۆن



مەلاکانی ئێران لە سەرەتادا هاوپەیمانی دیموکرات و کۆمۆنیستەکان بوون، بەڵام دوای ئەوەی دەسەڵاتیان گرتە دەست، سووتاندیانن و کردیانن بە کەباب؛ چۆن دینامیتیان لە قونیان نا و تەقاندنیاننەوە؛ چۆن لەشفرۆش و قوندەرەکانیان گوللەباران کرد؛ چۆن جگە لە کتێبە ئاینییەکان، هەموو جۆرە کتێبێکی تریان قەدەغە کرد؛ چۆن سەرەتا سەری ڕۆشنبیرانی لووتبەرزی وەکو (کا)یان سفر کرد و دواترێ کتێبە پڕوپووچەکانی شیعریان لێ سەندن... لێرەدا هەمدیسان کۆمەڵێک قسەی بێ پەردەی بە دەمدا هات و بە ڕوویەکی بێزارەوە جارێکی تر پرسیاری شوێنی خۆحەشاردانی شینەی لە (کا) کرد و لێی پرسی کاتی ئێوارە لە کوێوە گەڕاوەتەوە. (کا) هەمان وەڵامی پێشووی دایەوە، مامە مەحموود بەهەمان ڕووخساری بێزارەوە کەلەپچەیەکی لە دەست کرد و پێی گوت: "بڕوانە ئێستا چیت بەسەر دێنم." خوێنساردانە بە مستە کۆڵە و زللە لێدان کەوتە وێزەی و چینێکی باش کوتای.

لە تێبینییەکانیدا کە دواتر تۆماری کردبوون، پێنج هۆ هەبوون بۆ ئەوەی (کا) ئەو دارکاریکردنەی بەلاوە گرنگ نەبووە. لێرەدا هۆیەکان بە دروستی دەنووسمەوە و هیوادارم خوێنەران تووڕە نەکات.

٠١ بەپێی چەمکی خۆشبەختیی ناو سەری (کا)، بڕی ئەو خراپەکاری و باشییانەی بەسەری دێن، هێندەی یەکن و ئەو تێ هەڵدانەی ئێستا دەیخوات، بەواتای ئەوەیە دەتوانێ لەگەڵ ئیپەکدا بچێتە فرانکفورت.

٠٢ بە درک پێکردنێک کە هەر لە چینی دەسەڵاتداران دەوەشێتەوە، پێشبینیی کرد کە ئەندامانی تیمی تایبەت ئەم لە پێخاوس و تاوانبار و لاتەکانی قارس جیا دەکەنەوە و نایخەنە ژێر ئەشکەنجە و تێ هەڵدانێکی ئەوتۆوە کە شوێنەواری هەمیشەیی لەسەر جەستەی جێ بهێڵێ.

٠٣ پێی وابوو ئەم دارکاریکردنە ڕێژەی میهرەبانیی ئیپەک لە بەرامبەری دەباتە سەرێ.

٠٤ دوو ڕۆژ لەمەوبەر کاتێک لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش ڕووخساری خوێناوی موختاری بینیبوو، بەشێوەیەکی بودەڵانە داڵغەی ئەوەی لێ دابوو کە شەق و

تێهەڵدانی پۆلیس، مرۆڤ لەو هەستی خۆ بەتاوانبارزانینە پاک دەکاتەوە کە لە پێناو نابووتیی وڵاتەکەیدا دەیکێشێ.

٥٠ لە ناخەوە هەستی بە شانازی دەکرد کە سەرباری تێ هەڵدانیش لە دۆخی گرتوویەکی سیاسیدا بێ و لە لێپرسینەوەدا شوێنی کەسە خۆحەشاردراوەکە دەستنیشان نەکات.

ئەم هۆیەی دواییان بیست ساڵ لەمەوبەر (کا)ی زیاتر مەمنوون دەکرد، ئێستایش کەمێک بە شەرم بەخۆداهاتنەوە هەستی دەکرد باوی ئەو شتانە نەماوە. خوێنی ڕژاوی لووتی و تامی سوێری قەراغ لێویشی، سەردەمی منداڵیی بیر دەخستەوە. ئایا دواجار کەی خوێن لە لووتی هاتبوو؟ لەو دەمەیدا مامە مەحموود و ئەوانی تریش ئەمیان لە گۆشەیەکی نیمچە تاریکی ژوورەکەدا لەبیر کردبوو و بەدیار تەلەفزیۆنەکەوە دانیشتبوون، (کا) بیری کەوتەوە چۆن لە منداڵیدا لووتی دەیکێشا بە پەنجەرە داخراوەکاندا یان تۆپی بەردەکەوت، یاخۆ چۆن جارێک لە ماوەی خزمەتی سەربازیدا و لە کاتی سکە خشکێدا مستە کوڵەیەک بەر لووتی کەوتبوو. لەگەڵ داهاتنی تاریکایی ئێوارەدا، ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی لە بەردەم تەلەفزیۆنەکەدا گردبوونەوە و سەیری زنجیرەی ماریانایان دەکرد، (کا)یش ڕازی بوو بەوەی کە خوێن لە لووتی هاتبوو، دارکاری کرابوو، سووکایەتیی پێ کرابوو و وەکو منداڵێک لەوێدا لە بیر کرابوو. لە ناکاو پەشۆکا و ترسی ئەوەی لێ نیشت ئەگەر بیپشکنن، ئەوا نامەکەی شینە لە گیرفانیدا دەدۆزنەوە. ماوەیەکی درێژ بەبێدەنگی و بە هەستی خۆ بەتاوانبارزانینەوە لەگەڵ ئەوانی تردا سەیری ماریانای کرد، هەمان کات پێشبینیی کرد کە ئێستا تورگوت بەگ و کچەکانیشی سەیری هەمان زنجیرە دەکەن.

لە تەلەفزیۆنەکەدا ماوەی ڕێکلامەکان دەستی پێ کرد، ز. دەمیرکۆڵ لەسەر کورسییەکەی هەستا، ئامێرە کارەباییەکەی سەر مێزەکەی بەدەستەوە گرت، نیشانی (کا)ی دا و لێی پرسی داخۆ دەزانێ بۆ چ مەبەستێک بەکار دەهێنرێ؟ (کا) وەڵامی نەدایەوە، ئەم خۆی بۆی باس کرد و وەکو باوکێکیش کە بیەوێ بە نیشاندانی تێلا منداڵەکەی بترسێنێ، کەمێک بێدەنگ بوو.



لەگەڵ دەست پێکردنەوەی زنجیرەکەدا، ز. دەمیرکۆڵ لە (کا)ی پرسی: "دەزانی بۆچی ماریانام خۆش دەوێ؟ چونکە دەزانێ چی دەوێ. بەڵام ئێوەی ڕۆشنبیر خۆشتان نازانن چیتان دەوێ و ئەمەیش من دەهری دەکات. دەڵێن دیموکراسی، کەچی دوایی لەگەڵ شەریعەتخوازاندا هاوکاری دەکەن. دەم لە مافەکانی مرۆڤ دەدەن، کەچی لەگەڵ تیرۆریست و مرۆڤکوژاندا دانوسان دەکەن... دەڵێن ئەوروپا، کەچی مامەحەمەیی بۆ ئیسلامییەکانی دوژمنی ڕۆژئاوا دەکەن... باس لە فەمینیزم دەکەن، کەچی پشتیوانی لەو پیاوانە دەکەن کە بەزۆر سەرپۆش لە سەری ژنان دەکەن. بە پەیڕەوکردنی بیر و ویژدانی خۆت ڕەفتار ناکەی، بەڵکو بەخۆت دەڵێی با وا بکەم وەکو ئەوەی ئەوروپاییەک لێرە دەیکات! بەڵام بگرە ناشتوانی ببی بە ئەوروپی! دەزانی ئەوروپایی چی دەکات؟ ئەگەر هانز هانزن ڕاگەیەندراوە پڕوپووچەکەتان بڵاو بکاتەوە و ئەوروپاییگەل بەهەندی بگرن و شاندێک بنێرن بۆ قارس، ئەوا شاندەکە، لە پای ئەوەی کە وڵاتی ڕادەستی ئیسلامییە سیاسییەکان نەکردووە، بەر لە هەموو شتێک سوپاسی سوپا دەکات. بەڵام بێگومان کاتێک ئەو قوندەرانە دەگەڕێنەوە ئەوروپا، هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە و دەڵێن دیموکراسی لە قارسدا بوونی نییە. ئێوەیش هەم گازندەتان لە دەست سوپا هەیە و هەم بۆ ئەوەی ئیسلامییەکان نەتانکەن بە گۆشتی هەنجراو تەنیا متمانەتان بە سوپا هەیە. لەبەرئەوەی تۆ هەموو ئەمانە دەزانی، من ئەشکەنجەت نادەم."

(کا) بیری لەوە دەکردەوە ئیدی نۆرەی (باشە) هاتووە، کەمێکی تر ئازاد دەکرێ و لەگەڵ تورگوت بەگ و کچەکانیدا تا کۆتایی سەیری زنجیرەی ماریانا دەکات.

ز. دەمیرکۆڵ گوتی: "بەڵام بەر لەوەی بتنێرمەوە بۆ لای خۆشەویستەکەت لە هوتێل، دەمەوێ یەک دوو شتت دەربارەی ئەو تیرۆریستە مرۆکوژە پێ بڵێم کە پێش کەمێک ناوبژیوانیت بۆ دەکرد و ئێستا بەرگری لێ دەکەیت. ئەوانەی لەو بارەیەوە پێت دەڵێم بیانکە بە گوارە و بیانکە بە گوێتدا. بەڵام بەر لە هەموو شتێک ئەمە بخەرە مێشکی خۆتەوە: تۆ بەهیچ جۆرێک نەهاتووی بۆ ئەم نووسینگەیە. ئێمە تا سەعاتێکی تر لێرە دەگوازینەوە. بارەگای نوێمان نهۆمی سەرەوەی بەشی ناوخۆیی قوتابخانەی ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانە. لەوێ چاوەڕێت دەکەین.

لەوانەیە شوێنی خۆحەشاردانی شینە و جێی پیاسە ئێوارەی کەمێک لەمەوبەرت بیر بکەوێتەوە و بتەوێ پێمان ڕابگەیەنی. سونای تا هۆشی لە دەست نەدابوو، پێتی گوتبوو ئەو پاڵەوانە چاوشین و قـۆزەی تۆ زۆر بێ بەزەییانە بێژەرێکی مێشک چۆلەکەیی بەبیانووی سووکایەتیکردن بەپەیامبەرمان کوشتووە، کوشتنی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەیش کە تۆ بە چاوی خۆت فریای بینینی کەوتی و چێژت لێ وەرگرت، لە لایەن شینەوە نەخشەی بۆ داڕێژراوە. شتێکی تریش هەیە کە لە لایەن پیاوانی گوێبیستی میتەوە تۆمار کراوە و لەوانەیە بۆ ئەوەی دڵت گەرد نەگرێ، تا ئێستا پێت نەگوترابێ. بیرمان لێ کردەوە باش دەبێ ئەگەر ئەمەیش بزانی."

ئێمە ئێستا گەیشتینە ئەو خاڵەی کە (کا) بەدرێژاییی چوار ساڵی داهاتوو لە بارەیەوە دەیگوت: "خۆزگە وەکو کارمەندی سەر ئامێری فیلم نیشاندان بمتوانیبایە فیلمی ژیان بۆ دواوە هەڵبکەم و هەموو شتێک لەوێدا ڕابوەستایە."

ز. دەمیرکۆڵ بە دەنگێکی نەرم گوتی: "ئەو ئیپەک خانمەی کە دالْغەی ئەوەت لێ داوە بیرڤێنی بۆ فرانکفورت و لەگەڵیدا بەختەور بیت، سەردەمانێک یاری شینە بووە. بەپێی ئەم تۆمارەی بەردەستم پێوەندییەکەیان چوار ساڵ لەمەوبەر دەستی پێ کردووە. ئەو سەردەمە ئیپەک خانم هاوسەری موختار بەگ بوو کە پێڕێ بە ویستی خۆی، خۆی لە پالاوتن بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی کێشایەوە. ئەو بێ عەقڵە، کۆنە چەپ و شاعیرە -بمبەخشە- بەهیوای ئەوەی لاوانی قارس ڕێک دەخات، بە شەیدابوونەوە شینەی لە ماڵەکەی خۆیدا حەشاردەدا. لە کاتێکدا ئەو لە دووکانەکەی خۆی سۆپای کارەباییی دەفرۆشت، زۆر بەداخەوە نەیدەزانی شینە پێوەندییەکی ئەڤینیی زۆر توندوتۆڵی لەگەڵ ژنەکەیدا داناوە."

(کا) وای بۆچوو "ئەم قسانە پێشوەخت ئامادەکراون و ڕاست نین."

"هەڵبەت دوای کارمەندانی گوێبیستی میت، قەدیفە خانم یەکەم کەس بووە کە بەم ئەڤینە شاراوەیەی زانیوە. ئیپەک خانمیش کە پێوەندیی لەگەڵ پیاوەکەیدا باش نەبوو، هاتنی خوشکەکەی کە دەیەویست لە زانکۆ بخوێنێ، کردە بیانوو و لە ماڵێکی تردا لەگەڵ ئەودا نیشتەجێ بوو. شینەیش بەردەوام دەهاتە قارس بۆ -ڕێکخستنی



لاوانی ئیسلامی- و هەر لای موختاریش دەمایەوە، کاتێکیش قەدیفە دەچوو بۆ دەوام، ئەڤیندارە سەرشێتەکان لە ماڵە نوێکەدا بەیەک دەگەیشتن. ئەمە تا هاتنی تورگوت بەگ بۆ قارس و نیشتەجێبوونی لەگەڵ کچەکانیدا لە هوتێلی بەفرپالاس، درێژەی کێشا. لەوە بەدواوە قەدیفە پێوەندیی بە کچانی سەرپۆش بەسەرەوە کرد و لە پێوەندی لەگەڵ شینەدا جێی دادەی گرتەوە. بەڵگەیشمان بە دەستەوەیە کە کازانۆڤای چاوشینمان لەو سەردەمەدا بە قۆناغێکی کاتیدا تێ پەڕیوە کە تیایدا هاوکات ئیدارەی هەردوو خوشکەکەی داوە."

(کا) بەهەموو توانای خۆیەوە چاوی تەڕی خۆی لە سەر چاوی ز. دەمیرکۆڵ هەڵگرت و لە جێی دانیشتنی خۆیەوە نیگای بڕیە دارتەلە غەمگین و لەرزیوەکانی کۆڵان لەسەر شەقامی بە بەفر داپۆشراوی ئەتاتورک کە وەکو تازە هەستی پێ کردبوو، دەیتوانی بەدرێژاییی شەقامەکە بیانبینێ.

ز. دەمیرکۆڵ وەکو هەموو ئەندامێکی تیمی تایبەت کە زاریان بەردەبێ و دەکەونە قسە، گوتی: "من ئەمانە بۆیە دەڵێم بۆ ئەوەی قایلت بکەم کارێکی چەند هەڵە دەکەیت ئەگەر -تەنیا لە سۆنگەی دڵنەرمییەکەتەوە- جێی ئەو مرۆکوژە هۆڤەمان لێ بشاریتەوە. بەهیچ جۆرێک نیازم نییە غەمگینت بکەم، بەڵام لەوانەیە لە دوای چوونە دەرەوەت لێرە، خەیاڵت بچێ بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە من گوتمن، بەری ڕەنجی هۆبەی گوێگرتنی میت نەبێ کە ماوەی چل ساڵی ڕەبەقە میکرۆفۆن لە قارسدا دەچێنن، لەوانەیە بڵێی ئەمانە برێک قسەی قۆڕن کە ز.دەمیرکۆڵ هەڵی بەستوون. یاخۆ ئیپەک خانم بۆ ئەوەی گەرد لە خۆشبەختیی فرانکفۆرتتان نەنیشێ، بتهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە هەموو ئەم شتانە درۆی پەتین. زۆر دڵنەرمی، هەروەها لەوانەیشە دڵت خۆی بۆ ڕانەگیرێ، بەڵام بۆ ئەوەی هیچ گومانێکت لەم قسانەم نەبێ، بە یارمەتیی خۆت بڕێک لەو گفتوگۆی ئەڤینە دەخوێنمەوە کە دەوڵەتەکەمان مەسەرەفێکی زۆری لە تۆمارکردن و دواتر نووسینەوەی لەسەر کاغەزدا کردووە."

"بۆ نموونە، ئیپەک خانم چوار ساڵ لەمەوبەر، لە شازدەی ئاب و لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا گوتوویەتی -گیانەکەم، گیانەکەم، ئەو ڕۆژانەی بێ تۆ دەگوزەرێن، بۆ من ژیان نییە-، لەوانەیشە لە کاتی یەکەم جیابوونەوەیاندا بووبێ... شینە دوای دوو

مانگ لەو کاتە جارێکی تر بۆ گوتنەوەی دەرزێک بەناوی -ئیسلام و خۆداپۆشین- هاتووەتە قارس و لە دوکانی بەقاڵ و لە چایخانەکانەوە هەشت جار تەلەفۆنی بۆ ئیپەک خانم کردووە و باسی ئەوەیان کردووە کە یەکدییان چەند خۆش دەوێ. دوای دوو مانگ، کاتێک ئیپەک خانم بیری لەوە کردووەتەوە هەڵبێ و لەگەڵیدا بڕوات، بەڵام بڕیاری یەکجاریی بۆ نەدراوە، پێی گوتووە -ڕاستییەکەی، هەموو کەسێک لە ژیاندا هەر یەک خۆشەویستی هەیە و خۆشەویستی ئەویش شینەیە.- جارێکی تر لەبەر ئیرەیی بردن بە مەرزووقەی ژنی شینەی نیشتەجێ لە ئەستەمبوڵ، پێی دەڵێ کە ناتوانێ لە کاتێکدا باوکی لە ماڵە، لەگەڵیدا بنوێ. بۆ دواجاریش لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا سێ جاری تر تەلەفۆنی کردووە! لەوانەیە ئەمڕۆش بۆی کردبێ. ئێستا تۆماری ئەو گفتوگۆیانەم لا نییە، بەڵام گرنگ نییە، خۆت دەتوانی لە ئیپەک خانم بپرسی کە باسی چییان کردووە. زۆر داوای لێبووردن دەکەم، پێم وابێ تا ئێرە بەسە، با برادەران کەلەپچەکەی دەستت بکەنەوە، دەموچاوت بشۆ و ئەگەر دەشتەوێ، با بتگەیەننە هوتێل."



# ٣٩

## چێژی پێکەوە گریان

### (کا) و ئیپەک لە هوتێلن

(کا) ویستی بە پێ بگەڕێتەوە. بە ئاوێکی زۆر سەرتاپای دەموچاوی و خوێنی لووتی کە بەسەر لێو و چەناگەیدا هاتبووە خوارێ، شۆری. وەکو میوانێک کە بە ڕەزامەندی خۆی هاتبێ، خوداحافیزیی لە چەتە و مرۆکوژەکانی ناو خانووەکە کرد و چووە دەرەوە. لە ژێر ڕووناکیی لاوازی شەقامی ئەتاتورکدا دەڕۆیشت و وەکو سەرخۆش لەتری دەدا. بێ بیرکردنەوە چووە سەر شەقامی خالید پاشا، کاتێک گوێی لێ بوو وا دوکانی عەنتیکە فرۆشەکە هەمدیسان (ڕۆبێرتا)ی (پەپینۆ دی کاپری)ی ناوەتە سەر، دەستی بە گریانێکی بێبڕانەوە کرد. ئا لەو ساتەدا ئەو لادێییە باریکەڵە و ڕێکپۆشەی بینییەوە کە سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە پاسەکەی نێوان ئەرزەروم و قارسدا لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو و بەدەم خەوەنوچکێوە سەری کەوتبووە باوەشی ئەمەوە. لە کاتێکدا سەرتاسەری قارس هێشتا سەیری ماریانایان دەکرد، (کا) لە پێشدا لە شەقامی خالید پاشا لووتی تەقی بە لووتی پارێزەر موزەفەر بەگدا. پاشان کە لای دایە سەر شەقامی کازم قەرەبەکر، بەڕێوەبەرەکەی کۆمپانیای پاس کە لە یەکەم چوونیدا بۆ تەکیەی شێخ سەعادەدین بینیبووی، لەگەڵ هاوڕێیەکی بەساڵاچوویدا بینی. لە نیگای ئەو مرۆڤانەوە تێ گەیشت کە هێشتا فرمێسک بە چاوەکانیدا دێتە خوارێ. لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا هێندە ئەمسەر و ئەوسەری ئەو شەقامانەی بە پێ تەیکردبوو، ئیدی بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ، ئەو جامخانە ڕچیوانەی کە بەردەمیاندا تێ دەپەڕی، چایخانە لێوان لێواوەکان، دوکانی ئەو وێنەگرانەی کە بیری مرۆڤیان دەخستەوە کەوا شارەکە سەردەمانێک ڕۆژگارێکی باشتری بەخۆیەوە بینیوە، دارتەلە لەرزۆکەکانی شەقام، جامخانەی ئەو بەقالانەی کە پێچکەی پەنیری قاشاریان نمایش دەکرد و پۆلیسە سڤیلەکانی گۆشەی شەقامی کازم قەرەبەکر و

شەقامی قەرەداغی دەبینی.

بەر لەوەی بچێتە هوتێلەکەوە، بە دوو پاسەوانەکەی گوت کە هەموو شتێک بە باشی دەچێتە پێش و هێوری کردنەوە. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ، چووە ژوورەکەی خۆی. هەر کە خۆی هەڵدایە سەر جێیەکە، دایە پرمەی گریان. دوای گریانێکی درێژ لە خۆیەوە ژیر بووەوە. دوای یەک دوو خولەک گوێگرتن لە دەنگەکانی شار کە هێندەی چاوەڕوانییە نەبڕاوەکانی سەردەمی منداڵی درێژ بوون، لە دەرگا درا؛ ئیپەک بوو. لە کورەکەی هۆڵی پێشوازیی بیستبوو کە (کا) لە دۆخێکی سەیردایە و دەسبەجێ هاتبووە سەرەوە. لەگەڵ گوتنی ئەو چەند وشەیەدا، لە بەردەم ڕووناکی گڵۆپەکەدا سیمای (کا)ی بینی و بێدەنگ بوو. بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەریاندا کێشا.

(کا) بەچرپە پێی گوت: "زانیم کەوا پێوەندیت لەگەڵ شینەدا هەبووە."

"خۆی پێی گوتی؟"

(کا) گڵۆپەکەی کوژاندەوە. هەمدیسان بەچرپە گوتی: "ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی منیان ڕفاند. ماوەی چوار ساڵ گوێیان لە تەلەفۆنەکانتان گرتووە." دیسان خۆی فڕێ دایەوە سەر جێیەکەی و گوتی: "دەمەوێ بمرم." دەستی بە گریان کردەوە.

دەستهێنانی ئیپەک بە قژیدا، تاوی گریانەکەی بەهێزتر کرد. لە ناخیشەوە هێندە ئارام بوو وەکو کەسێک کە شتێکی ون کردبێ و بڕیاری دابێ کە چیدی بەختەوەر نابێ. ئیپەکیش لە جێگاکەدا ڕاکشا و (کا)ی لە باوەش گرت. ماوەیەک گریان و ئەمەیش زیاتر پێکەوەی پەیوەست کردن.

ئیپەک لە تاریکاییی ژوورەکەدا بەدەم وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی (کا)وە چیرۆکی خۆی گێڕایەوە. گوتی کە هەمووی تاوانی موختار بووە: هەر بەوەندەوە نەوەستاوە شینە بۆ قارس بانگ بکات و لە ماڵەکەی خۆیدا بیشارێتەوە، بەڵکو دەیویست کابرای ئیسلامی سیاسی بۆی بسەلمێنێ کە ژنێکی چەندە ژیر و زانای هەیە. سەرباری ئەوەیش، لەو دەمەدا ڕەفتاری موختار لەگەڵ ئیپەکدا زۆر خراپ بووە و تاوانی منداڵ نەبوونی دەخستە ئەستۆی. وەکو (کا)یش دەیزانی، شینە بە ئاسانی دەیتوانی دڵی



ژنێکی ڕەنجەڕۆ بداتەوە و سەری لێ بشوێنێ. دوای دەست پێکردنی پێوەندییەکەیان ئیپەک زۆر هەوڵی دابوو نەکەوێتە دۆخێکی خراپەوە! سەرەتا مەبەستی بوو موختار کە زۆری حەز پێ دەکرد، بە ڕەوشەکە نەزانێ و غەمگین نەبێ. دواتریش بۆ ڕزگاربوونی بوو لەو ئەڤینەی کە تا دەهات گڕ و تینی زیاتر دەبوو. ئەوەی لە سەرەتادا شینەی سەرنجڕاکێش کردبوو، باڵادەستییەکەی بوو بەسەر موختارەوە؛ کاتێک موختار نەزانانە سەبارەت بە سیاسەت دەهاتە گۆ، ئیپەک شەرمی لە خۆی دەکرد. کاتێکیش شینە دەڕۆیشت و بێ سەر و شوێن دەبوو، موختار زۆر بە شان و باڵیدا هەڵدەدا، دەیگوت دەبێت زیاتر بێتە قارس و زۆری لە ئیپەک دەکرد باشتر و لە دڵەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات. کاتێک ئیپەک و قەدیفە گواستبوویانەوە ماڵێکی تر، موختار بە بەسەرهاتەکەی نەزانیبوو. ئەگەر ز. دەمیرکۆڵ و ئەوانیش پێیان نەگوتبێ، ئەوا هەرگیز پێی نازانێ. ئەمە لە کاتێکدا کە قەدیفەی چاوکراوە هەر لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنیدا بۆ قارس، هەموو شتێک تێ گەیشتبوو، پێوەندیکردنیشی بە کچانی سەرپۆش بەسەرەوە تەنیا بۆ خۆ نزیکخستنەوە بوو لە شینە. ئیپەک دەرکی کردبوو کە قەدیفەی خوشکی کە بەدرێژاییی ژیان لەگەڵ ئەمدا لە ڕقەبەرێدا بوو، دڵی بە شینەوەیە. کاتێک بینیبووی شینەیش بەو پێوەندییە دڵخۆشە، ئیدی ئەم لە شینە سارد بووبووەوە. بیری لەوە کردبووە ئەگەر شینە خۆی بە قەدیفەوە خەریک بکات، ئەوا ئەم لە بیر دەکات، دوای گەیشتنی باوکیشی، توانیبووی بەتەواوی لە شینە دوور بکەوێتەوە.

وێ دەچوو (کا) باوەڕ بکات پێوەندیی نێوان شینە و ئیپەک هەڵەیەکی بەسەرچووی ژیانە، بەڵام ئیپەک لەپڕ جۆشی گرت و گوتی: "ڕاستییەکەی شینە منی خۆش دەوێ نەک قەدیفە!" لە دوای ئەم وشانە کە هەرگیز ئارەزووی بیستنیانی نەبوو، لێی پرسی ئەدی ئێستا بۆچوونی بۆ ئەو "نانەجیبە بەربادە" چییە. لە وەڵامدا ئیپەک گوتی کە نایەوێ لەو بارەیەوە قسە بکات، هەموو شتێک ڕۆیشتووە و بڕاوەتەوە و دەیەوێ لەگەڵ (کا)دا بڕوات بۆ فرانکفورت. لەو ساتەدا (کا) هاتەوە بیری کە شینە لە دواهاتنیدا بۆ قارس تەلەفۆنی بۆ ئیپەک کردووە، ئیپەک لە وەڵامدا گوتی کە شتێکی وا ڕووی نەداوە و شینەیش بەشی ئەوە ئەزموونی سیاسیی هەیە بزانێ لە ڕێی

تەلەفۆنکردنەوە جێگاکەی ئاشکرا دەبێ. (کا) لەو کاتەدا گوتی: "هەرگیز بەختەوەر نابین!" ئیپەک بەدەم باوەش پێداکردنەوە گوتی: "نەخێر، دەچینە فرانکفورت و لەوێ بەختەوەر دەبین!" بەبۆچوونی ئیپەک، (کا) بڕوای بە قسەکانی ئەم کردبوو، بەڵام لەو کاتەدا هەمدیسان دایەوە پڕمەی گریان.

ئیپەک بەهێزتر باوەشی پێدا کرد و هەردووکیان پێکەوە گریان. دواترێ (کا) لە تێبینییەکانیدا نووسیبووی ڕەنگە ئیپەکیش بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا لەو ساتەدا پەی بەوە بردبێ کە باوەشکردن بە (کا)دا و گریان و پێکەوە گەڕان لە سەرزەمینی بێ بڕیاریی نێوان تێکشکان و ژیانێکی نوێدا، بارتەقای ئازار، چێژیش بە مرۆڤ دەبەخشێ. بەهۆی ئەوەی یەکیان لە ئامێز گرتبوو و بۆیان لوابوو پێکەوە بگرین، زیاتر گرفتی داوی عەشقی بووبوو. (کا) لەلایەک بەهەموو هێزی خۆی باوەشی بە ئیپەکدا کردبوو و دەگریا، لەلایەکی دی، بە گۆشەیەکی هۆشی بیری دەکردەوە لەمەودوا چی بکات و بە غەریزەیش گوێی بۆ ئەو دەنگانە ڕاگرتبوو کە لە ناو هوتێلەکە و لە کوچەکەوە دەهاتن. سەعات لە شەش نزیک دەکەوتەوە: چاپی ژمارەی سبەینێی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد) بە ئەنجام گەیەندرابوو، ئامێرە بەفرڕنەکان خرابوونە کار بۆ پاککردنەوەی ڕێگای ساریقامیش، فوندا ئەسەر بە شیرینی سواری ئۆتۆمبیلە سەربازییەکە بووبوو و قەدیفەی لەگەڵ خۆیدا بردبووە شانۆی گەل و لەوێ لەگەڵ سونایدا دەستیان بە پرۆڤە کردبوو.

دوای نیوسەعات ئەوسا (کا) بە ئیپەکی گوت کە پەیامێکی لە شینەوە بۆ قەدیفە پێیە. بەدرێژاییی ئەو ماوەیە یەکیان لە باوەش گرتبوو و گریابوون. (کا) دەیویست لەگەڵ ئیپەکدا بنوێ، بەڵام ئەم ئارەزووەی لە نێوان ترس، گومان و ئێرەییدا بە نیوەناچڵی مایەوە. (کا) لەو ساتەدا لێکدالێکدا لە ئیپەکی دەپرسی دواجار کەی شینەی بینیوە، ئایا هەموو ڕۆژێک بە نهێنی قسەی لەگەڵدا کردووە، ئایا هەموو جارێک کە یەکتریان بینیووە، پێکەوە نووستوون؟ (کا) سەردەمانێک دوای ئەو ڕۆژە بیری کەوتەوە کە ئیپەک بەتووڕەیی وەڵامی ئەو پرسیار و واتەواتانەی داوەتەوە، چونکە ئەم باوەڕی پێ نەکردووە. دواتر لە بری ناوەڕۆکی لۆژیکیی قسەکانی (کا)، کاریگەریی سۆزی قسەکانی لەبەر چاو گرتووە و بەبەزەییتر ڕەفتاری لەگەڵدا



کردووە. (کا)یش لەلایەک چێژی لەو بەزەییە وەردەگرت و لەلایەکی دی، پێی خۆش بوو بە پرسیار و دەمگۆییکردن ئازاری ئیپەک بدات. (کا) کە لە چوار ساڵی دواییی تەمەنیدا کاتێکی زۆری لە پەشیمانی و خۆتاوانبارکردندا بەسەر بردبوو، دانی پێ دادەنا کە بەدرێژاییی ژیانی، خووی ئازاردان بە قسەی وەکو شێوازێک بۆ پێوانەی خۆشەویستیی ئەو کەسەی کە مەیلی بەلای ئەمدا هەبووە، بەکارهێناوە. کاتێک پەیتاپەیتا بە ئیپەکی دەگوت و لێی دەپرسی کە شینەی لەم زیاتر خۆش دەوێ و لە ڕاستیشدا هەر ئەوی دەوێ، چاوەڕێی وەڵامی ئیپەک نەبوو، بەڵکو دەیویست سنووری دان بەخۆداگرتنی ئیپەک تاقی بکاتەوە.

ئیپەک گوتی: "دەتەوێ بەم پرسیارانەت سزام بدەی لەبەرئەوەی پێوەندیم لەگەڵ ئەودا هەبووە!"

(کا) گوتی: "منت بۆیە دەوێ بۆ ئەوەی ئەوت لەبیر بچێ." لە ڕووخساری ئیپەکدا ڕاستیی ئەم قسەیەی بەدی کرد، بەڵام نەگریا. لەوانەیشە لەبەر ئەوە بووبێ کە هەستی کرد بە گریانی زیاد لە پێویستی، هێزێکی گەورەی لە خۆیدا کۆکردووەتەوە. (کا) گوتی: "شینە لە جێی خۆحەشاردانییەوە پەیامێکی هەیە بۆ قەدیفە. دەیەوێ قەدیفە لە قسەی خۆی پەشیمان بێتەوە، نەچێتە سەر شانۆ و سەری ڕووت نەکات. زۆر سوورە لەسەر ئەم داوایە."

ئیپەک گوتی: "با ئێمە ئەمە بە ئیپەک نەڵێین."

"بۆچی؟"

"بەمجۆرە هەم سونای تا کۆتایی دەمانپارێزێ و هەم بۆ قەدیفەیش باش دەبێ. چونکە دەمەوێ خوشکەکەم لە شینە دوور بکەوێتەوە."

(کا) گوتی: "نەخێر. بەڵکو دەتەوێ نێوانیان تێک بدەی."

بۆی ئاشکرابوو کە ئیرەیی پێبردنەکەی، ئەوی لە چاوی ئیپەکدا بچووک کردووەتەوە، بەڵام سەرباری ئەوەیش خۆی بۆ ڕانەگیرا.

"لە زووەوە پێوەندیی من بە شینەوە نەماوە."

(کا) بیری لەوە کردەوە کە ڕیتمی زبری زمانی ئیپەک لە ناخیەوە هەڵناقوڵێ. خۆی

بۆ ڕاگیرا و بڕیاری دا ئەمە بە ئیپەک نەڵێ. بەڵام دوای کەمێک ئەوەی بە ئیپەک گوت و خۆی بینییەوە وا لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات. (کا) کە دەیبینی دەسەڵاتی بەسەر ئیرەیی و تووڕەوونی خۆیدا لە دەست داوە، هێندەی دی غەمگین دەبوو. دەیتوانی بگری، بەڵام هۆشی لەسەر وەڵامدانەوەکەی ئیپەک بوو.

ئیپەک گوتی: "بەڵێ، سەردەمانێک زۆر گرفتاری ئەڤینی بووم. بەڵام ئێستا هەمووی بەسەر چووە، ئیدی باشم. دەمەوێ لەگەڵ تۆدا بێم بۆ فرانکفورت."

"چۆن وا بەقوڵی گرفتاری ئەڤینی بووی؟"

ئیپەک گوتی: "زۆر عاشق بووم." دواتر بە سووربوونەوە بێدەنگ بوو.

"بۆم باس بکە چۆن –زۆر عاشق بووی–؟" (کا) سەرباری ئەوەی خوێنساردیی خۆیشی لە دەست دابوو، بەڵام هەستی کرد ئیپەک ناتوانێ خۆی یەکلایی بکاتەوە کە ئایا وەڵامی ڕاست بداتەوە و (کا) ئاسوودە بکات و ئازارەکانی ژیانی لەگەڵدا دابەش بکات، یاخۆ داخێک بنێ بە دڵیەوە کە شایەنی بێ.

ئیپەک دواتر گوتی: "هێندە بەهێز خۆشم دەویست، بەجۆرێک هیچ کەسێکی ترم وا خۆش نەویستووە." ئەمەی گوت و ڕووی خۆی وەرگێڕا بەولاوە.

(کا) گوتی: "ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە لە موختاری پیاوت بەولاوە کەسی ترت نە ناسیوە."

هێشتا قسەکەی لە دەم دەرنەچووبوو، پەشیمان بووەوە. نەک تەنیا لەبەرئەوەی بەو قسەیە ژنەکەی شکاندەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی پەی بەوە برد کە ئیپەک وەڵامێکی توندی دەداتەوە.

"لەوانەیە لەبەرئەوەی کچێکی تورکم لە ژیاندا هەلی زۆرم بۆ نەڕەخساوە لە پیاوان نزیک ببمەوە. بەڵام بێگومان تۆ لە ئەورووپا ژمارەیەکی زۆر کچی ئازادت ناسیوە. پرسیاری هیچ کامیانت لێ ناکەم، بەڵام پێم وابێ فێریان کردووی خۆشەویستێکی نوێ جێی خۆشەویستە کۆنەکان دەگرێتەوە."

(کا) گوتی: "من تورکم."



"تورکبوون، زۆربەی کات پۆزشە لە پای خراپەکردن یاخۆ بیانووە."

(کا) بێ ئەوەی خۆیشی باوەڕی بە قسەکەی بێ، گوتی: "بۆیە بۆ فرانکفورت دەگەڕێمەوە."

"منیش لەتەکتدا دێم و لەوێ بەختەوەر دەبین."

"لە پێناوی لەبیرکردنی ئەودا دێی بۆ فرانکفورت."

"هەست دەکەم ئەگەر پێکەوە بگەڕێینەوە بۆ فرانکفورت، دەتوانم دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک عاشقت ببم. من وەکو تۆ نیم؛ لە دوو ڕۆژدا عاشقی کەس نابم. ئەگەر سەبرم لێ بگری و بە ئیرەیی پێبردنی تورکی زویرم نەکەی، ڕۆژێک دێ زۆرم خۆشبوێی."

(کا) گوتی: "بەڵام ئێستا خۆشت ناوێم. هێشتا هەر عاشقی شینەی. ئەو شتە چییە ئەو هەموو تایبەتمەندییەی پێ بەخشیوە؟"

"زۆرم پێ خۆشە کە دەتەوێ بزانی، بەڵام لە کاردانەوەت لە بەرامبەر وەڵامەکەم دەترسم."

(کا) بێ ئەوەی بڕوای بە قسەکانی خۆی بێت، گوتی: "مەترسە، زۆرم خۆش دەوێی."

ئیپەک گوتی: "منیش تەنیا دەتوانم لەگەڵ پیاوێکدا بژیم کە دوای ئەم قسانەیشم هەر خۆشی بوێم." کەمێک بێدەنگ بوو، نیگای لەسەر (کا) هەڵگرت و بڕیە کوچە بە بەفر داپۆشراوەکە و بەدەنگێکی گەرم گوتی: "شینە زۆر بە بەزەیییە، زۆر بیرمەند و جوامێرە. خراپەی کەسی ناوێ. جارێکیان بەدرێژایی شەو فرمێسکی بۆ دوو توتکە سەگی دایک تۆپیو هەڵڕشت. بڕوام پێ بکە زۆر بێ هاوتایە."

(کا) بە ناهومێدی گوتی: "ئەو کابرایە مرۆکوژە، وا نییە؟"

"ئەگەر کەسێک تەنانەت یەک لەسەر دەی ناسینی منیش ئەوی ناسیبێ، تێ دەگات ئەو قسەیە چ شتێکی تووڕەهاتە و پێکەنینی پێ دێ. ئازاری کەس نادات. ئەو منداڵێکە. وەکو منداڵ حەزی لە گەمە و خەیاڵپەرستییە، لاسایی دەکاتەوە،

چیرۆکەکانی شانامە و مەسنەوی دەگێڕێتەوە، مرۆڤی جۆراوجۆریان بەدوای یەکدا لێ دێتە دەرێ. خاوەن عەزمێکی پتەوە، ژیرە، خاوەن قسەی خۆیەتی و زۆر بەهێزە؛ زۆریش بە کەیف و سەفایە... ئاخ، داوای لێبووردن دەکەم، مەگری گیانەکەم، بەسە ئیدی مەگری."

(کا) ماوەیەک دەستی لە گریان هەڵگرت و گوتی کە ئیدی باوەڕ ناکات پێکەوە بچنە فرانکفورت و لەوێ بەختەوەر بن. بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا کە جاروبار هەنسکی (کا) دەیشڵەقاند. (کا) لە پێخەوەکەدا ڕاکشا، پشتی لە پەنجەرەکە کرد و دوو لۆ خۆی چەماندەوە. پاش کەمێک ئیپەکیش لە تەنیشتیەوە ڕاکشا و لە پشتەوە باوەشی پێدا کرد.

(کا) لە پێشدا ویستی بە ئیپەک بڵێ: "واز بێنە." دواترێ بە چرپە گوتی: "قایمتر بمنووسێنە بە خۆتەوە!"

بەلای (کا)وە خۆش بوو ڕوومەتی بخاتە سەر سەرینەکەی کە بە فرمێسکی خۆی تەڕ بووبوو. لە باوەش گرتنیشی لە لایەن ئیپەکەوە هەستێکی جوانی پێ بەخشیبوو. خەو بردیەوە.

کاتێک لە خەو هەستا سەعات گەیشتبووە حەوت و هەردووکیشیان ساتێک هەستیان کرد کە بەختەوەر دەبن. سەیری سیمای یەکدییان نەدەکرد، بەڵام هەردووکیان بەدوای بیانوودا دەگەڕان بۆ دووبارە ئاشتبوونەوە.

ئیپەک گوتی: "وێڵی کە گیانەکەم، دەی وێڵی کە."

(کا) نەیتوانی تێ بگات داخۆ ئەمە ئاماژەیە بۆ بێهیوایی یاخۆ بۆ باوەڕبوون بە لە بیرکردنی ڕابردوو. وای زانی ئیپەک دەیەوێ بڕوا. زۆر باشیش دەیزانی ئەگەر بێ ئیپەک لە قارسەوە بۆ فرانکفورت بگەڕێتەوە، ئەوا ناتوانێ تەنانەت ژیانی کۆن و بێئومێدیی ساڵانی ڕابردوویشی دەست پێ بکاتەوە.

بە شپرزەیی گوتی: "مەڕۆ، کەمێکی تر دانیشە."

دوای بێدەنگییەکی سەیر و بێزارکەر، یەکیان لە ئامێز گرت.

(کا) گوتی: "خودای من، خودای من، چی دەقەومێ!"



ئیپەک گوتی: "هەموو شتێک بە دڵی خۆمان دەبێ. باوەڕم پێ بکە و متمانەت پێم هەبێ."

(کا) هەستی دەکرد تەنیا بە گوێگرتن لە قسەکانی ئیپەک دەتوانێ لەو مێردەزمەیە ڕزگاری بێ.

ئیپەک گوتی: "وەرە با ئەو شتانەت نیشان بدەم کە لە جانتاکەم کردووە و لەگەڵ تۆدا بۆ فرانکفورتیان دەبەم."

(کا)، چوونە دەرەوەی لە ژوورەکە پێ باش بوو. لەسەر پلیکانەکان دەستی ئیپەکی گرتبوو، بەڵام کە گەیشتنە بەردەم ژوورەکەی تورگوت بەگ و ئەوان، دەستی بەردا. سەربەرزیش بوو بەوەی کە لە هۆڵی هوتێلەکەدا وەکو جووت دەیاننواند. ڕاستەوخۆ چوونە ژوورەکەی ئیپەک. ژنەکە، بلووزە شینە تەسکەکەی کە نەیتوانیبوو لە قارس لەبەری بکات، لە کشاوەکە دەرهێنا، ڕای وەشاند و چووە بەردەم ئاوێنەکە و بە خۆیدا هەڵواسی.

(کا) گوتی: "لەبەری بکە."

ئیپەک بلووزە خوورییە فراوانەکەی بەری داکەند، بلوزە شینەکەی لەبەر کرد و (کا) هەمدیسان شەیدای جوانییەکەی بووەوە.

(کا) گوتی: "ئایا تا کۆتاییی ژیانت خۆشت دەوێم؟"

"بەڵێ."

"ئێستا ئەو قاتی ئێوارانە لەبەر بکە کە موختار مۆڵەتی پێ دابووی تەنیا لە ماڵ بیپۆشی."

ئیپەک دۆڵابەکەی کردەوە، جلە ڕەشە لە مەخمەڵ دروستکراوەکەی دەرهێنا، چرچ و لۆچەکانی ڕاست کردەوە، بە بایەخەوە کردیەوە و لەبەری کرد.

کاتێک لە ئاوێنەکەدا نیگای کەوتە سەر چاوی (کا)، گوتی: "زۆرم پێ خۆشە کە ئاوا سەیرم دەکەی."

(کا) بەجۆش و ئیرەیی پێبردنەوە ڕوانی بە پشتی درێژی ژنەکەدا، بەو جێیە

هەستیارەی سەر پەراسوویدا کە ڕاستەوخۆ دەکەوتە ژێر پرچیەوە، کەمێک خوارتر بە سێبەری بڕبڕەی پشتیدا، بە جووڵەی شانەکانیدا کاتێک بۆ پۆزلێدان دەستەکانی دەخستە سەر قژی. (کا) هەستی دەکرد لە هەمان کاتدا بەختەوەریشە و زۆریش خراپی لێ دەگوزەرێ.

تورگوت بەگ خۆی بە ژوورەکەدا کرد و گوتی: "ئۆی، ئەم جلانە چین! خۆمان بۆ چ ئاهەنگێکی سەما ئامادە دەکەین؟" خۆشی بە چارەیەوە نەبوو. (کا) ئەمەی وەکو ئیرەیی پێبردنی باوک لێک دایەوە و پێی خۆش بوو.

تورگوت بەگ گوتی: "لە دوای ڕۆیشتنی قەدیفەوە، ئاگادارییەکانی تەلەفزیۆن توندتر بووە. بەشداربوونی قەدیفە لەو نمایشەدا کارێکی زۆر هەڵەیە."

"بابە گیان، تکایە بۆ منیشی ڕوون بکەنەوە بۆچی ناتانەوێ قەدیفە سەری ڕووت بکات."

هەموویان پێکەوە چوونە هۆڵەکە و لە بەردەم تەلەفزیۆنەکەدا دانیشتن. پاش کەمێک بێژەرێک هاتە سەر پەردەی تەلەفزیۆن و ڕای گەیاند لە وەشانی زیندووی ئەمشەودا کۆتایی بە تراژیدیایەک دەهێندرێ کە ژیانی کۆمەڵایەتی و مانەوی هەموومانی تێک داوە، قارسییەکان ئەم ئێوارەیە بە هەڵمەتێکی دراماتیک لەو ڕێسا ئاینییانە ڕزگاریان دەبێ کە ئێمەیان لە هاوچەرخبوون و یەکسانیی ژن و پیاو دوور خستووەتەوە. هەروەها گوتی ساتێکی مێژوویی بێوێنە و ئەفسووناویی ئەوتۆیش، لەوانەی کە لەسەر شانۆ نمایش و ژیان ئاوێتەی یەکتر دەکەن، بەسەر دەبەین. گوتی هیچ پێویست ناکات قارسییەکان ئەمجارە خۆیان نیگەران بکەن، چونکە چوونە ژوورەوەی هۆڵی شانۆ بەخۆڕاییە و بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و فەرماندەیی ڕەوشی نائاسایی لە هۆڵەکەدا ڕێوشوێنی پێویستیان لەبەر چاو گرتووە. چاوپێکەوتنێک لەگەڵ قاسم بەگی جێگری بەڕێوەبەری ئاسایشدا کە دیاربوو پێشتر تۆمارکرابوو، هاتە سەر پەردەی تەلەفزیۆن. قژی کە لە شەوی شۆڕشەکەدا بەسەر یەکدا شێوابوو، ئێستا داهێنرابوو، کراسەکەی ئوتو کرابوو و کراڤاتەکەی لە شوێنی خۆیدا بوو. گوتی کە قارسییەکان دەتوانن بێ سڵەمینەوە بێن بۆ بینینی شاکارە هونەرییەکانی ئەم ئێوارەیە. قاسم بەگ گوتی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی ئامادەییی



پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان لە ئێستاوە سەریان لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش داوە و بەڵێنیان داوە وەکو وڵاتانی هاوچەرخ و ئەوروپا، لە شوێنی پێویستدا بە دیسپلینەوە چەپڵە بۆ نمایشەکە لێ بدەن. هەروەها گوتی ئەمجارە بەهیچ جۆرێک مۆڵەت بە توندوتیژی، زبری نواندن، هەرا و هۆیها کێشان نادرێ. پاشان گوتی دانیشتووانی قارس کە خاوەن پاشخانێکی کولتووریی هەزار ساڵەن، هەڵبەتە خۆیان دەزانن چۆن سەیری شاکارێکی شانۆیی دەکەن. ئەمەی گوت و لەسەر پەردەی تەلەفزیۆن نەما.

هەمان بێژەری پێشوو هاتەوە سەر پەردە و باسی لەو تراژیدیایە کرد کە لەو ئێوارەیەدا نمایش دەکرێ و گوتی کە چەندین ساڵە ئامادەکاری بۆ ئەم شانۆنامەیە دەکرێ و سونای زایم ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەگێڕێ. لەسەر پەردەی تەلەفزیۆن دەست کرا بە نیشاندانی پۆستەری شانۆنامەکانی ناپلیۆن، ڕۆبەسپیر و لینین کە سونای زایم چەندین ساڵ لەمەوبەر نمایشی کردبوون؛ وێنەی ڕەش و سپیی سونای زایم (فوندا ئەسەر سەردەمێک هێندە لاواز بووە نەبێتەوە!)؛ هەندێک بیرەوەریی تری شانۆیی کە (کا) پێی وابوو ژن و پیاوە شانۆکارەکە لە دۆلابێکدا لەگەڵ خۆیاندا دەیانگواستەوە (بلێتی کۆن، پرۆگرامی نمایشەکانی ڕابردوو، پارچە ڕۆژنامەی ئەو سەردەمەی کە سونای زایم دەیویست ڕۆڵی ئەتاتورک بگێڕێ و بڕێک وێنەی جەرگبڕی چایخانەکانی ئەنادۆڵ.) ئەم فیلمی ناساندنە تا ڕادەیەک بێزارکەر بوو و ئەو بەڵگەنامە کولتوورییانەی دەهێنایەوە بیر کە لە تەلەفزیۆنی دەوڵەتەوە پەخش دەکران، بەڵام وێنەیەکی سونای زایم کە دیاربوو تازە لێی هەڵگیرابوو و جارنەجارێک دەهاتە سەر پەردە، شێوەی تێکشکاو بەڵام خۆدەرخستنی سەرانی بلکۆی سۆسیالیست یاخۆ دیکتاتۆرەکانی ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پێوە دیار بوو. دانیشتووانی قارس هەر لە ئێستاوە باوەریان کردبوو سونای زایم کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە تەلەفزیۆندا سەیری دیمەنەکانیان کردبوو، ئارامیی بۆ شارەکەیان هێناوە، هەستیان دەکرد هاووڵاتیی ئەون و خەریک بوون شێلگیرانە متمانەیان بە داهاتووی خۆیان پەیدا دەکرد.

هەشتا ساڵ لەمەوبەر، دوای کشانەوەی سوپای عوسمانی و ڕووس لە شار، لەو

سەردەمەدا کە ئەرمەنی و تورک لە یەکتریان دەکوشت، تورکەکان لە شاردا دەوڵەتێکی تورکیان ڕاگەیاندبوو. ئێستا ئاڵای ئەو دەوڵەتە کە کەس نەیدەزانی لە چ قوژبنێکدا دۆزراوەتەوە، پەیتاپەیتا لە پەردەی تەلەفزیۆندا نیشان دەدرا. نیشاندانی ئەم ئاڵا لەکەدارە کە مێش و مەگەز وێرانیان کردبوو، لە هەموو شتێک زیاتر ئارامیی لەبەر تورگوت بەگ هەڵگرتبوو.

"ئەم کابرایە شێتە. سەری هەموومان لە قوڕ دەگرێ، هەر چۆنێک بووە نابێ قەدیفە بچێتە سەر شانۆ!"

ئیپەک گوتی: "بەڵێ، با نەچێ، بەڵام بابە گیان ئەگەر بڵێین ئەمە ئارەزووی ئێوەیە، ئەوا خۆتان دەزانن قەدیفە کەللەڕەقە، دەچێتە سەر شانۆ و سەری ڕووت دەکات."

"باشە، چی ڕوو دەدات؟"

ئیپەک ڕووی لە (کا) کرد، برۆی بەرز کردەوە و گوتی: "با (کا) هەر ئێستا بچێ بۆ شانۆی گەل و قەدیفە بە نەچوونە سەر شانۆ قایل بکات!"

(کا) کە ماوەیەکی درێژ بوو سەیری ئیپەکی دەکرد، نەک تەلەفزیۆنەکە، لەبەرئەوەی بۆی ڕوون نەبووەوە ئەم ڕاگۆڕینە لە ئەنجامی چییەوەیە، هەستی بە شپرزەیی کرد.

تورگوت بەگ بە (کا)ی گوت: "ئەگەر دەیەوێ سەری ڕووت بکات، با دوای هێوربوونەوەی ڕووداوەکان، لە ماڵەوە بیکات. بێ هیچ گومانێک سونای ئەم ئێوارەیە لەسەر شانۆ بەزمێکی تر دەنێتەوە. زۆر پەشیمانم لەوەی فوندا ئەسەر لە خشتەی بردم و قەدیفەم ڕادەستی ئەو شێتانە کرد."

"بابە گیان، (کا) دەڕوا بۆ هۆڵی شانۆی گەل و قەدیفە قایل دەکات."

"ئیدی تەنیا ئێوە دەتوانن بگەنە قەدیفە، چونکە سونای متمانەی پێتان هەیە. ئەوە چی بەسەر لووتتاندا هاتووە بەرخم؟"

(کا) بە خۆ بەتاوانبارزانینەوە گوتی: "لەپەوڕوو بەسەر بەفرەکەدا کەوتم."

"ناوچەوانیشتان بەرکەوتووە. بەتەواوی شین هەڵگەڕاوە."

ئیپەک گوتی: "(کا) هەموو کوچە و شەقامەکانی داوەتە ژێر پێوە."



تورگوت بەگ گوتی: "بێ ئاگاداریی سونای، قەدیفە ڕابکێشنە گۆشەیەکەوە... پێی مەڵێن ئەم بیرۆکەیەتان لە ئێمەوە بیستووە و ناشبێ بڵێ لە ئێوەی وەرگرتووە. با هیچ لەگەڵ سونایدا نەڵێ و بیانوویەک بدۆزێتەوە. هەرە باش ئەوەیە کە بڵێ –نەخۆشم–، با بڵێ –سبەینێ لە ماڵ سەرم ڕووت دەکەم–، با بەڵێن بدات. بە قەدیفە بڵێن کە هەموومان زۆرمان خۆش دەوێ. کچۆڵەی نازدارم!"

لەپڕ چاوەکانی تورگوت بەگ پڕ بوون لە فرمێسک.

"بابە گیان، ئایا دەتوانم دووبەدوو لەگەڵ (کا)دا قسە بکەم؟" ئیپەک ئەمەی گوت و (کا)ی بەرەو لای مێزی نانخواردنەکە ڕاکێشا. لە سووچێکی دەوری مێزەکە دانیشتن کە زاهیدە لە ئێستاوە بۆ خواردنی ئێوارە سەرپۆشی بەسەردا ڕاخستبوو.

"بڵێ بۆیە ئەم داوایەی لێ دەکەی چونکە شینە لە دۆخێکی دژواردایە و هێزی لێ بڕاوە."

(کا) گوتی: "جارێ بەر لە هەموو شتێک پێم بڵێ بۆچی ڕای خۆت گۆڕی."

"ئاخ گیانەکەم، هیچ شتێک لە ئارادا نییە مایەی گومان لێکردن بێ. باوەڕم پێ بکە تەنیا ئەوەندە هەیە قسەکانی باوکم بە ڕەوا دەزانم و هیچی تر.

دوورخستنەوەی قەدیفە لە بەڵای ئەم ئێوارەیە، ئێستا بۆ من لە هەموو شتێک گرنگترە."

(کا) بە هوشیارییەوە گوتی: "نەخێر، شتێک قەوماوە و تۆیش ڕای خۆت گۆڕی."

"شتێک لە گۆڕێدا نییە مایەی ترس بێ. ئەگەر قەدیفە دەیەوێ سەری ڕووت بکات، با دوایی لە ماڵەوە بیکات."

(کا) زۆر بەوردی گوتی: "قەدیفە ئەگەر ئەم ئێوارەیە سەری ڕووت نەکات، ئەوا هەرگیز لە ماڵەوە لەبەر چاوی باوکت نایکات. تۆیش ئەمە باش دەزانی."

"لە هەمووی گرنگتر، گەڕانەوەی خوشکەکەمە بە سەلامەتی بۆ ماڵەوە."

(کا) گوتی: "من ترسم لە شتێک هەیە، شتێک کە لە منتان شاردبێتەوە."

"گیانەکەم، شتی وا نییە. زۆرم خۆش دەوێی. ئەگەر منت دەوێ، با هەر ئێستا

پێکەوە بچینە فرانکفورت. کاتێک لەوێ بینیت بە تێپەڕبوونی کات تا چ ڕادەیەک بە منەوە پەیوەست دەبی و عاشق دەبی، ئەو کاتە ئەم ڕۆژگارە لەبیر دەکەیت و بە متمانەوە خۆشت دەوێم."

ئیپەک دەستی خستە سەر دەستی عەرەقاوی و گەرمی (کا). (کا) خەریک بوو باوەڕی نەدەکرد کە چەند لە ئیپەک، لە جوانییەکەی لە ئاوێنەکەدا، لە پشتی جوانی لە جلە مەخمەڵییەکانیدا و لە چاوە گەورەکانیەوە نزیکە.

دواترێ گوتی: "وەکو ئەوەی بڵێی دڵنیام لە ڕوودانی شتێکی خراپ."

"بۆچی؟"

"چونکە زۆر کامەرانم. بە پێچەوانەی پێشبینیی خۆمەوە لە قارس هەژدە شیعرم نووسیوە. ئەگەر شیعرێکی تریش بنووسم، ئەوا دەتوانم بیانکەم بە دیوانێک. باوەڕیشم هەیە دەتەوێ لەتەکمدا بێی بۆ ئەڵمانیا و هەستیش دەکەم خۆشبەختییەکی گەورە چاوەڕێم دەکات. ئەم ڕێژە بەرزەی بەختەوەری بە منەوە نایات، هەست دەکەم شتێکی خراپم لێ دەقەومێ."

"خراپێکی چۆن؟"

"وەکو ئەوەی دوای دەرچوونم لێرە بۆ قایلکردنی قەدیفە، تۆ دەسبەجێ چاوت بە شینە بکەوێ."

ئیپەک گوتی: "ئاخ، قسەی تورەهاتە. بگرە جێگاکەیشی پێ نازانم."

"لەبەرئەوەی جێگاکەیم ئاشکرا نەکرد، دارکاری کرام."

ئیپەک بەدەم گرژکردنی برۆکانیەوە گوتی: "بە قوربانە بە کەسیش نەڵێی، دواتریش دەبینی کە ترسەکەت لە جێی خۆیدا نییە."

تورگوت بەگ لەولاوە گوتی: "ئێ چی بوو؟ ناڕۆن بۆ لای قەدیفە؟ دوای سەعاتێک و دە خولەکی تر نمایشەکە دەست پێ دەکات. تەلەفزیۆن ڕای گەیاند کەوا خەریکە ڕێگا و بانەکانیش دەکرێنەوە."

(کا) بەچرپە گوتی: "نامەوێ بڕۆم بۆ هۆڵی شانۆی گەل، نامەوێ لێرە بڕۆمە



دەرێ."

ئیپەک گوتی: "باوەڕم پێ بکە، ناتوانین لێرە بڕۆین ئەگەر قەدیفە بە دڵشکاوی لە دوای خۆمان جێ بهێڵین. ئەو کاتە ئێمەیش ناتوانین کامەران بین. هەر هیچ نەبێ بڕۆ و هەوڵ بدە قایلی بکەی بۆ ئەوەی سوکنایی بە دڵماندا بێ."

(کا) گوتی: "سەعات و نیوێک لەمەوبەر کە شینە فازیلی ناردبوو بەدوامدا، تۆ بە منت دەگوت لێرە مەڕۆ دەرێ."

ئیپەک گوتی: "بەپەلە پێم بڵێ من چۆن بتوانم بۆت بسەلمێنم کاتێک تۆ بۆ هۆڵی شانۆی گەل دەچی، من لێرە دەرناچمە دەرەوە؟"

(کا) پێکەنی و گوتی: "وەرە ژوورەکەی من لەسەرەوە. دەرگاکە کلیل دەدەم و ماوەی نیو سەعاتێک کلیلەکە لای خۆم دەهێڵمەوە."

ئیپەک بە خۆشییەوە گوتی: "باشە." هەستایە سەرپێ. "بابە گیان، من بۆ ماوەی نیوسەعاتێک دەچمە ژوورەکەی خۆم لە سەرەوە. خەمی (کا)شتان نەبێ، ئێستا بۆ قسەکردن لەگەڵ قەدیفەدا دەچێتە هۆڵی شانۆی گەل... لە جێی خۆتان مەجووڵێن، لەسەرەوە کارێکمان هەیە و ئێستا پەلەمانە."

تورگوت بەگ گوتی: "خودا ئاگای لێتان بێ." وەلێ شپرزەییی پێوە دیاربوو.

ئیپەک دەستی (کا)ی گرت، بەو جۆرە بە هۆڵی پێشوازیکردنەدا تێ پەڕین و بە پلیکانەکاندا چوونە سەرێ.

(کا) گوتی: "جاوید بینیمانی، تۆ بڵێی چۆن بۆ مەسەلەکە بچێ؟"

ئیپەک بە خۆشییەوە گوتی: "وێڵی بکە." لەسەرەوە کلیلەکەی لە (کا) وەرگرت، دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورێ. ژوورەکە هێشتا بۆنی پێکەوە نووستنەکەی دوێنێ شەویانی لێ دەهات. "لێرە چاوەڕێت دەکەم. ئاگات لە خۆت بێ، سەر مەخە سەر سونای."

"ئایا بە قەدیفە بڵێم باوکت و ئێمە نامانەوێ بچێتە سەر شانۆ یاخۆ بڵێم شینە ڕازی نییە؟"

"بڵێ داخوازی شینەیە."

"بۆچی؟"

"لەبەرئەوەی قەدیفە شینەی زۆر خۆش دەوێ، بۆیە. تۆ بۆ پاراستنی خوشکەکەم لە مەترسی، بۆ ئەوێ دەڕۆی. ئیرەیی بردن بە شینە لە بیر بکە."

"ئەگەر بۆم لە بیر بکرێ."

ئیپەک گوتی: "لە ئەڵمانیا زۆر کامەران دەبین." دەستی لە ملی (کا) کرد. "پێم بڵێ دەچینە کام سینەما؟"

(کا) گوتی: "لە مۆزەخانەی فیلم سینەمایەک هەیە کە شەوانی درەنگی شەممە فیلمی هونەریی ئەمەریکاییی دۆبلاج نەکراو نیشان دەدات. دەڕۆین بۆ ئەوێ. بەر لە ڕۆیشتنیشمان لە ریستۆرانتەکانی نزیک وێستگای شەمەنەفەر، دۆنەر و خەیاری شوێر دەخۆین. دوای گەڕانەوەشمان لە سینەما، لە ماڵەوە بەدەم گۆڕینی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە کەیف دەکەین. دواتریش پێکەوە دەنووین. ئەو موچەیەی لە فەرمانگەی کۆمەڵایەتی وەری دەگرم لەگەڵ داهاتی خوێندنەوەی ئەم شیعرانەمدا لە ئێوارە کۆڕەکاندا، سەروزیادمانە و جگە لە پێکەوە نووستن، هیچ کارێکی ترمان نابێ."

ئیپەک ناوی کتێبەکەی لێ پرسی و (کا)یش وەڵامی دایەوە.

ئیپەک گوتی: "جوانە. دەی گیانەکەم دەسا بڕۆ. ئەگەر نا، باوکم خەفەت دەخوات و دەکەوێتە کوچە و کۆڵان."

(کا) پاش لەبەرکردنی پاڵتۆکەی، باوەشی بە ئیپەکدا کرد. "ئیدی ناترسم." درۆی کرد. "بەڵام ئەگەر شتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕووی دا، لە یەکەم شەمەنەفەردا کە شار بەجێ دەهێڵێ، چاوەڕێت دەکەم."

ئیپەک بە پێکەنینەوە گوتی: "ئەگەر بتوانم لەم ژوورە بێمە دەرێ."

"تا لە گۆشەی کوچەکە دەچم بەو دیودا و ون دەبم، سەیرم بکە. دەبێ؟"

"دەبێ."

(کا) بەدەم داخستنی دەرگاکەوە گوتی: "زۆر دەترسم جارێکی تر نەتبینمەوە."



دەرگاکەی کلیل دا و کلیلەکەی خستە گیرفانی پاڵتۆکەیەوە.

لە کوچەکەدا چەند هەنگاوێک کەوتە پێش پاسەوانەکانی بۆ ئەوەی بتوانێ ئاوڕ بداتەوە و ئیپەک لە پەنجەرەکەدا ببینێ. بینی ئەوا ئیپەک لە پەنجەرەی ژووری ٢٠٣ی نهۆمی یەکەمی هوتێلی بەفرپالاسەوە جووڵەی لە خۆی بڕیوە و سەیری ئەم دەکات. تیشکێکی پرتەقاڵیی گڵۆپی بچووکی سەر مێزەکە قۆڵ و مەچەکی ڕەنگ هەنگوینیی کە لە جلە مەخمەڵییەکەدا لە سەرما دەستیان بە هەڵلەرزین کردبوو، ڕووناک دەکردەوە. (کا) هەرگیز ئەو تیشکەی لەبیر نەکرد و لە چوار ساڵی دواییی پاشماوەی ژیانیدا لە خەیاڵی خۆیدا، بە بەختەوەرییەوەی گرێ دەدا.

(کا) لەو ساتە بەدواوە هەرگیز قەدیفەی نەبینییەوە.

## ٤٠

# وێ دەچێ سیخوڕیی دووسەرە کارێکی ئاسان نەبێ

## بەشێکی نیوەناچڵ

لە کاتی ڕۆیشتنی (کا)دا بۆ هۆڵی شانۆی گەل، کوچە و شەقامەکان چۆڵ و هۆڵ بوون، یەک دوو ڕێستورانتی لێ دەربچێ، هەمــوو دوکانەکانی تر دەڕابەیان دادرابووەوە. میوانی چایخانەکان لە کۆتاییی ڕۆژێکی درێژدا کە بە جگەرەکێشان و چاخواردنەوەوە بەسەریان بردبوو، هەڵدەستان بۆ ئەوەی بەرەو ماڵ بگەڕێنەوە، بەڵام هێشتا چاویان لەسەر پەردەی تەلەفزیۆنەکە لا نەدەبرد. (کا) لە بەردەم هۆڵی شانۆی گەلدا سێ ئۆتۆمبیلی پۆلیسی بینی کە لایتەکانی سەریان هەڵدەبوون و دەکوژانەوە. لە ژێر دار زەیتوونە ڕووسییەکانی هەورازەکەی خوارەوەیشدا تارماییی تانکێکی بەدیکرد. ئێوارە پشتی سەرماکەی شکاندبوو، نووکی شەختەی بن گوێسوانەکان ئاویان لێ دەچۆڕا و دەکەوتە سەر شۆستەکان. بەژێر کابڵی وەشانی زیندووی تەلەفزیۆندا کە لەمبەری شەقامی ئەتاتورکەوە بۆ ئەوبەری ڕاکێشرابوو، پەڕیەوە و چووە هۆڵی شانۆی گەلەوە، کلیلەکەی گیرفانی دەرهێنا و خستیە لەپی دەستیەوە.

پۆلیس و سەربازەکان کە بەڕیز لە بن دیوارەکاندا ڕاوەستابوون، دەنگدانەوەی پرۆڤەکانی سەر شانۆیان لە هۆڵە چۆڵەکەدا دەبیست. (کا) لەسەر کورسییەک دانیشت و گوێی لە دانەبەدانەی قسەکانی سونای گرت کە بە دەنگێکی گڕ دەیکردن، سەرنجی لە وەڵامە بێ بڕیار و لاوازەکانی قەدیفەی سەرداپۆشراو دا، گوێی لە دەنگی فوندا ئەسەر بوو کاتێک خۆی لە پرۆڤەکان هەڵدەقورتاند و بەدەم دانانی دیکۆری سەر شانۆکەوە (دارێک، مێزێکی ماکیاجی ئاوێنەدار) دەیگوت: "گیانەکەم قەدیفە، زیاتر لە ناخەوە بدوێ."

لەو دەمەیدا فوندا ئەسەر و قەدیفە پێکەوە پرۆڤەیان دەکرد، سونای تیشکی جگەرەکەی (کا)ی بینی و هات بەلایەوە دانیشت و گوتی: "ئەم ساتانە،



بەختەوەرترین ساتەکانی ژیانی منن." بۆنی عارەق لە دەمی دەهات، بەڵام هیچ سەرخۆش نەبوو. "هەرچەندە پرۆڤەی زیادیش بکەین، لەسەر شانۆ ڕوون دەبێتەوە کە لەو ساتەدا هەست بە چی دەکەین. قەدیفەیش بە توانا و لێهاتووە."

(کا) گوتی: "لە باوکیەوە پەیامێک و میرووییەکی چاوەزارم بۆی هێناوە. ئایا دەتوانم لە گۆشەیەکدا قسەی لەگەڵدا بکەم؟"

سونای گوتی: "ئاگادارین ماوەیەک خۆت لە پاسەوانەکان دابڕیوە و ون بووی. بەفر لە توانەوەدایە، وا خەریکە هێڵی ئاسنین دەکرێتەوە. بەڵام ئێمە بەر لە هەموو ئەمانە شانۆکەی خۆمان نمایش دەکەین. ئایا شینە لە شوێنێکی باشدا خۆی حەشارداوە؟"

"نازانم."

سونای ڕۆیشت و گوتی کە قەدیفە دەنێرێ، خۆی گەیاندەوە پرۆڤەی سەر شانۆکە. هەر لەو کاتەدا ڕووناکیی سەر شانۆکە داگیرسێندرا. (کا) هەستی کرد هێزێکی گەورەی بەکێشکردن لە نێوان سێ کەسەکەی سەر شانۆدا هەیە. بەخێرایی جێگربوونی قەدیفەی سەر داپۆشراو لە ناو جیهانێکدا کە ئاڕاستەی بەرەو دەرەوەیە، (کا)ی ترساند. هەستی کرد دەیتوانی زیاتر قەدیفەی بچێ بە دڵدا ئەگەر سەری دانەپۆشیبا، ئەو پاڵتۆ ناشیرینەی لەبەر نەکردبا کە کچانی سەرپۆش بەسەر دەیانپۆشی، ڕۆکێکی لەبەر بکردایە کە کەمێک لە ڕانەکانی کە وەکو ڕانەکانی دادەی درێژ بوون، نیشان بدایە، بەڵام کاتێک قەدیفە لە شانۆکە دابەزی و هات لە تەنیشتیەوە دانیشت، بۆی ڕوون بووەوە کە بۆچی شینە دەستی لە ئیپەک هەڵگرتووە و گرفتاری ئەڤینی ئەمیان بووە.

"قەدیفە، شینەم بینی. ئازاد کراوە و لە شوێنێک خۆی حەشارداوە. نایەوێ ئەمشەو بچیتە سەر شانۆ و سەرت ڕووت بکەی. نامەیەکیشی بۆ ناردووی."

(کا) بۆ ئەوەی سەرنجی سونای ڕانەکێشێ، وەکو قوتابییەک کە لە کاتی تاقیکردنەوەدا پارچە کاغەزێکی کۆپیا بدات بە هاوڕێیەکی، بەوجۆرە نامەکەی دایە دەستی قەدیفە، بەڵام قەدیفە بە بەرچاویانەوە کردیەوە و خوێندیەوە. جارێکی تریش خوێندیەوە و پێکەنی.

"قەدیفە، ئەمە ڕای باوکیشتە. بڕیاری سەر ڕووتکردنت هەنگاوێکی ڕاستە، بەڵام جێبەجێکردنی لەم ئێوارەیەدا و بە بەرچاوی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانەوە تا بڵێی کارێکی چەوتە. سونای ئەمڕۆ ئاژاوەیەک دەنێتەوە. هیچ پێویست ناکات ئەم ئێوارە لێرە بمێنیتەوە. پێیان بڵێ کە نەخۆشی."

"پێویست بە بیانوو ناکات. سونای پێی گوتم ئەگەر بمەوێ دەتوانم بڕۆمەوە بۆ ماڵ."

(کا) تێ گەیشت کە تووڕەیی و خەیاڵ شکاندنی سەر ڕووخساری قەدیفە زۆر قووڵترە لە خەمی ئەو کچە لاوەی کە لە دوا ساتدا مۆڵەتی پێ نادرێ لە شانۆی قوتابخانەدا بەشداری بکات. "قەدیفە، لێرە دەمێنیتەوە؟"

"لێرە دەمێنمەوە و لە نمایشەکەدا بەشدار دەبم."

"ئەم بڕیارە باوکت زۆر غەمگین دەکات، دەزانی؟"

"ئەو میرووی چاوەزارەم بدەرێ کە بۆی ناردووم."

"ئەو بیرۆکەیە داهێنانی خۆم بوو بۆ ئەوەی بتوانم بە دووقۆڵی قسەت لەگەڵدا بکەم."

"وێ دەچێ سیخوڕیی دووسەرە کارێکی ئاسان نەبێ."

(کا) ڕەنجەڕۆییەکیشی لە سیمای قەدیفەدا بەدی کرد، بەڵام بە ئازارەوە هەستی کرد کە کچەکە هۆشی لە لایەکی تەواو جیاوازە.

ویستی دەفەی شانەکانی قەدیفە بگرێ و بەخۆیەوە بنووسێنێ، بەڵام هیچی نەکرد.

(کا) گوتی: "ئیپەک ڕابردووی خۆی لەگەڵ شینەدا بۆ من گێڕایەوە."

قەدیفە جگەرەیەکی لە پاکەتەکەی دەرهێنا و بە جووڵەیەکی سستەوە نای بە لێویەوە و ئاگری دا.

(کا) بە بێتاقەتی پێی گوت: "جگەرە و چەرخەکەم دایێ." کەمێک بێدەنگ بوون. "ئایا ئەمە لە پێناوی زۆر خۆشویستنی شینەدا دەکەی؟ قەدیفە، پێم بڵێ چی شتێکی



ئەوت زیاتر خۆش دەوێ؟"

(کا) لەبەرئەوەی دەیزانی قسەی خۆی بە با دەدا و لەگەڵ هەر وشەیەکیشدا زیاتر دەیشێوێنێ، نقەی لە خۆی بڕی و کپ بوو.

فوندا ئەسەر لەسەر شانۆکەوە بانگی قەدیفەی کرد و گوتی کە نۆرەی هاتووە.

قەدیفە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە سەیرێکی (کا)ی کرد و هەستایە سەرپێ. لە دوا چرکەدا یەکدییان لە ئامێز گرت. (کا) بەدەم هەستکردن بە هەبوون و بۆنی قەدیفەوە، ساتێک سەیری سەر شانۆکەی کرد، بەڵام بەهیچ جۆرێک هۆشی لەوێ نەبوو؛ لە شتەکان نەدەگەیشت. لە هەناوی خۆیدا هەستی بە ناتەواوی، ئیرەیی و پەشیمانییەک دەکرد کە بڕوا بەخۆبوون و لۆژیکی خۆی تەفروتونا دەکرد. تا ڕادەیەک دەیزانی بۆچی ئازار دەچێژێ، بەڵام ئەوەی سەری لێ دەرنەدەکرد، بۆچی ئازارەکان هێندە سووتێنەر و بەتاون؟

بەدەم کێشانی جگەرەیەکەوە بیری لەوە کردەوە ئەم ئازارە گورچکبڕ و ماڵوێرانکەرە مۆری خۆی لەو ساڵانە دەخات کە لە فرانکفورت لەگەڵ ئیپەکدا بەسەری دەبات –بێگومان ئەگەر لە بردنی ئیپەکدا بۆ فرانکفورت سەرکەوتوو بێ.– هۆشی تێکەڵ و شێوا بوو. چوو بۆ ئەو سەرئاوەی کە دوو ڕۆژ لەمەوبەر لەگەڵ نەجیبدا لەوێ پێک گەیشتبوون، چووە هەمان ئاودەستەوە. پەنجەرە بچووکەکەی سەرەوەی کردەوە و بەدەم جگەرەکێشانەوە سەیری ئاسمانی تاریکی کرد.

سەرەتا بڕوای نەکرد کە شیعرێکی تازەی بۆ دەهات. شیعرەکەی بەجۆرێک لە دڵدانەوە و ئومێد دانا و بەجۆشەوە لە دەفتەرە سەوزەکەیدا نووسییەوە. کاتێک تێ گەیشت هەمان هەستی گورچکبڕ هێشتا بەوپەڕی هێزەوە بە هەناویدا تەشەنە دەکات، بەپەلەپرووزێ لە هۆڵی شانۆی گەل چووە دەرێ.

ساتێک بیری کردەوە کە ڕەنگە باشتر بێ بەسەر شۆستە بەفراوییەکاندا بڕوات و بایەکی سارد لێی بدات. دوو پاسەوانەکەی بەدوایەوە بوون، بەڵام هێشتا هۆشی ئاڵۆز بوو. بەمەبەستی باشتر تێگەیشتن لە چیرۆکەکەمان، لێرەدا کۆتاییی بەم بەشە دێنم و دەچمە سەر بەشێکی تر. بەڵام ئەمە بەواتای ئەوە نییە (کا) لەم بەشەدا

شتگەلێکی شایەن بە گێڕانەوەی نەکردبێ. بەر لە هەموو شتێک پێویستە لە دیوانی (بەفر)دا سەرنجێک لە شوێنی دوا شیعری (کا)، (سەرزەمینی کۆتاییی جیهان) بدەم کە بێ ڕاوەستان لە دەفتەرەکەیدا نووسییەوە.



## ٤١

# هەرکەسێک گەردیلەیەکی بەفری هەیە

## دەفتەرە سەوزە ونبووەکە

(سەرزەمینی کۆتاییی جیهان) نۆزدەیەمین و دوا شیعر بوو کە لە قارس بۆ (کا) هاتبوو. دەزانین (کا) هەژدە دانە لە شیعرەکانی لەگەڵ بۆهاتنیدا دەسبەجێ لە دەفتەرێکی سەوزدا کە هەمیشە لەبەر باخەڵیدا بوو، ئەگەرچی بە هەندێک کەموکورتیشەوە بووبێ، تۆمار کردبوو. تەنیا ئەو شیعرەی تۆمار نەکردبوو کە لە شەوی شۆڕشەکەدا خوێندبوویەوە. (کا) لە دوو نامەدا کە دواتر لە فرانکفورت بۆ ئیپەکی نووسیبوو، بەڵام بۆی نەناردبوو، نووسیبووی هەرچی دەکات ئەو شیعرەی بیرناکەوێتەوە کە سەردێری (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە)ی بۆ دانابوو، هەرچۆنێک بووە دەبێ بۆ تەواوکردنی دیوانەکەی بیدۆزێتەوە. نووسیبووی زۆر دڵخۆش دەبێ ئەگەر ئیپەک بیتوانیبا چاوێک بە کاسێتەکانی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس)دا بگێڕێ. بە شێوازی نووسینی نامەکاندا کە لە ژووری هوتێلەکەمدا لە فرانکفورت خوێندمنەوە، هەستم کرد (کا) پێشبینیی کردووە ڕەنگە ئیپەک وا تێ بگات ئەم بەبیانووی کاسێتی ڤیدیۆ و شیعرەوە نامەی عەشقی بۆ نووسیوە و ئەمەیش (کا)ی نائارام کردووە.

هەمان شەو کە بە کاسێتەکانی مەلینداوە بۆ ژوورەکەم گەڕامەوە و دوای ئەوەی کەمێک سەرم گەرم کرد، لەخۆوە دەستم بۆ یەکێک لە دەفتەرەکان برد و ئەو نیگاری گەردیلەی بەفرەم تێدا دۆزییەوە کە لە کۆتاییی بەشی بیست و نۆیەمی ئەم ڕۆمانەدا دامناوە. ڕۆژانی دواتر بەدەم بەردەوام خوێندنەوەی دەفتەرەکانەوە، پێم وابێ، ئەگەرچی کەمێکیش بێ، تێ گەیشتبووم (کا) مەبەستی چی بووە لە دانانی ئەو شیعرانەی کە لە قارس بۆی هاتبوو، لەسەر نۆزدە خاڵی سەر نیگاری گەردیلە بەفرەکە.

(کا) لە ڕێی کتێبگەلێکەوە کە دواتریش خوێندبوونیەوە، تێ گەیشتبوو کە مەیینی گەردیلەیەکی شەشپاڵوویی بەفر لە ئاسمان و وەرگرتنی شێوەی ئەستێرەیەکی شەشپاڵوویی و گەیشتنی بە زەوی و لە دەستدانی شێوەی، هەشت بۆ دە خولەکی پێ دەچێت. ئەوەشی بۆ ئاشکرا بووبوو کە گەردیلەی بەفر لە ژێر کاریگەریی با، ساردی، بەرزیی چینەکانی هەور و چەندین هۆکاری تری نەزاندراو و پڕ لە ڕازدا شێوەی خۆی وەردەگرێ. لە هەموو ئەمانەیشەوە پەی بەوە بردبوو کە جۆرێک لە پێوەندی لە نێوان گەردیلەکانی بەفر و مرۆڤدا هەیە. شیعری (من، (کا))ی لە کتێبخانەی قارس بە خەیاڵی گەردیلەی بەفرەوە نووسیبوو. دواتریش بیری لەوە کردبووەوە کە هەمان گەردیلەی بەفر لە چەقی دیوانە شیعری (بەفر)دا ڕاکشاوە.

(کا) دواتر بەهەمان لۆژیکەوە نیشانی دابوو کە شیعرەکانی (بەهەشت، شەترەنج و قوتووی شۆکۆلاتە)" لەسەر نیگاری خەیاڵیی گەردیلە بەفرەکە جێگایان هەیە. بۆ ئەم مەبەستە، بە سوود وەرگرتن لەو کتێبانەی کە شێوەی گەردیلەی بەفریان تێدایە، نیگاری گەردیلە بەفرەکەی خۆی کێشابوو و ئەو شیعرانەی کە لە قارس بۆی هاتبوون، لەسەر ئەو گەردیلەیە جێگیر کردبوو. بەوجۆرە، هەر لە پێکهاتەی دیوانە نوێکەی شیعرەوە بگرە تا بەو شتانە دەگات کە ئەوی بە (کا) دەکرد، هەموو شتێک لەسەر گەردیلەیەکی بەفر نەخشێندرابوو. پێی وابووە هەموو مرۆڤێک، هەروەکو چۆن نەخشەیەکی ناوەکی هەیە بۆ سەرلەبەری ژیانی، بەهەمان شێوە گەردیلەیەکی بەفریشی هەیە. (کا) تەوەرەکانی بیرەوەری، خەیاڵ و لۆژیکی سەر گەردیلە بەفرەکە کە شیعرەکانی خۆی لەسەر جێگیر کردبوو، لە هێلکارییەکەی (باکۆن)ەوە بۆ پۆلاندنی زانیاریی مرۆڤ وەرگرتبوو. لە شیکردنەوەی ئەو شیعرانەیشدا کە لە قارس نووسیبوونی، بە دوور و درێژی باسی واتای خاڵەکانی سەر تەوەرەکانی ئەستێرە شەشپاڵووییەکەی گەردیلەی بەفری کردبوو.

لەو سۆنگەیەوە، ئەو تێبینییانەی کە لە فرانکفورت دەربارەی شیعرەکانی قارس نووسیبوونی و سێ دەفتەریان پڕ کردبووە، هێندەی بۆ شیکردنەوەی گەردیلەی بەفرە، پێویستە بەهەمان بارتەقا وەکو گەنگەشەیەک لەسەر واتای ژیانی خۆیشی چاوی لێ بکرێ. بۆ نموونە، کاتێک قسەی لەسەر شوێنی شیعری (مردن بە



تیرباران)ی سەر نیگاری گەردیلە بەفرەکە کردووە، سەرەتا ئەو ترسە ڕوون دەکاتەوە کە لە شیعرەکەدا ئاماژەی پێ دراوە، لە پێویستیی جێگیرکردنی ئەم شیعرە، بە خۆی و ترسەکەیەوە، لە نزیک تەوەری خەیاڵەوە دەکۆڵێتەوە، دانانی لە نزیک و لە مەودای کێشکردنی شیعری (سەرزەمینی کۆتاییی جیهان)ەوە کە بەسەر لووتکەی تەوەرەی بیرەوەرییەوەیە، شی دەکاتەوە و باوەڕیشی وابووە کەرەسەی پێویستی بۆ چەندین شتی پڕ لە ڕاز و نهێنی خستووەتە بەردەست. بەپێی بۆچوونی (کا)، لە پشت ژیانی هەر کەسێکەوە نەخشەیەک و گەردیلەیەکی بەفری لەوجۆرە هەیە، گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کەوا مرۆڤ بە شیکردنەوەی گەردیلەی بەفری تایبەت بە خۆی، دەتوانێ بیسەلمێنێ مرۆڤگەل کە لە دوورەوە لەیەک دەچن، لە ڕاستیدا چەند جیاواز، سەیر و لە یەک نەگەیشتوون.

هەر بەشی ئەوەندەی بۆ ڕۆمانەکەمان پێویست بێ، سەبارەت بە چەندین لاپەڕە تێبینیی تایبەت بە پێکهاتەی دیوانی شیعر و گەردیلە بەفرەکەی (کا) -ئایا دانانی شیعری (قوتووی شۆکۆلاتە) لە سەر تەوەرەی خەیاڵ چ واتایەکی دەگەیاند؟ ئایا شیعری (هەموو مرۆڤایەتی و ئەستێرەکان) شێوازێکی چۆنی بە ئەستێرەکەی (کا) بەخشیبوو؟ هتد- قسە دەکەم. (کا) لە تافی لاویدا گاڵتەی بەو شاعیرانە دەهات کە زیاد لە پێویست بایەخیان بە خۆیان دەدا، بەهۆی ئەوەیشی پێیان وابوو هەر تورەهاتێکی کە دەینووسن، لە داهاتوودا دەبێت بە بابەتی لێکۆڵینەوە، هێشتا هەر لە ژیاندا بوون، لە خۆیان دەگۆڕان و خۆیان لێ دەبوو بە پەیکەرێک، کە لە خۆیان بترازێ، کەسی تر سەیری نەدەکرد.

هەروەها چەند سووکەڵە بیانوویەکیشی هەبوو بۆ شیکردنەوەی شیعرەکانی خۆی لە ماوەی چوار ساڵی پێش کۆتاییی ژیانیدا بە تایبەتیش ئەگەر بزانین ساڵانێکی درێژ بە چاوی نزم بۆ ئەو شاعیرانەی دەڕوانی کە شەیدای ئەفسانەی هاوچەرخ بوون و شیعرگەلێکیان دەنووسی کە کەس لێیان تێ نەدەگەیشت. بە خوێندنەوەی وردی تێبینییەکانی، ڕوون دەبێتەوە کە (کا) هەستی نەکردووە ئەو شیعرانەی لە قارس بۆی هاتووە هەمووی خۆی نووسیبێتنی. ئەو باوەڕی وابووە لە شوێنێکەوە لە دەرەوەی خۆیەوە بۆی هاتووە و خۆیشی -وەکو لە نموونەیەکدا گوتوویەتی- تەنیا

ئامێرێک بووە بۆ نووسینەوەیان. (کا) لە چەند جێیەک نووسیبووی کە ئەم تێبینییانەی بە مەبەستی گۆڕینی ڕەوشی (پاسیڤ)ی خۆی و بۆ شیکردنەوەی واتا و هاوشێوەی شاراوەی شیعرەکانی تۆمار کردووە. دووەمین بیانووی (کا)یش بۆ شیکردنەوەی ئەو شیعرانەی کە خۆی نووسیبوونی، لێرەدا بوو: (کا) تەنیا بە تێگەیشتن لە واتای ئەو شیعرانەی کە لە قارس نووسیبوونی، دەیتوانی کەموکوڕییەکانی دیوانەکەی، نیوە بەیتە ناتەواوەکان و شیعری (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە) کە بەر لەوەی تۆماری بکات لە بیری کردبوو، تەواو بکات. چونکە (کا) دوای گەڕانەوەی بۆ فرانکفورت بەهیچ جۆرێک شیعری بۆ نەهاتبوو.

لە تێبینی و نامەکانەوە ڕوون دەبێتەوە کە (کا) لە کۆتاییی ئەو چوار ساڵەدا لۆژیکی شیعرەکانی شی کردووەتەوە و دیوانەکەی تەواو کردووە. بۆیە ئەو کاغەز و دەفتەرانەی کە لە خانووەکەی لەگەڵ خۆمدا هێنابوومن، بەدەم خواردنەوەی وێسکییەوە لە هوتێلەکەی فرانکفورت تا دەمەوبەیانی ئەمدیو ئەودیوم کردن. تاوناتاوێک جۆشم دەسەند و بە خۆم دەگوت پێویستە شیعرەکانی (کا) لە شوێنێکدا بن لەم ناوە، سەرلەنوێ دەستم دەکردەوە بە گەڕان بەناو شتومەکەکانی بەردەممدا. تا دەمەدەمی بەیانی لاپەڕەی دەفتەرەکانی هاوڕێکەم هەڵدایەوە، دواتر لە نێوان بیجامە کۆنەکانیدا، کاسێتەکانی مەلیندا، کراڤاتەکانی، کتێبەکانی، چەرخەکانیدا (بەمجۆرە زانیم ئەو چەرخەشم لە خانووەکەی لەگەڵ خۆمدا هێناوە کە قەدیفە دابووی بە (کا) بۆ ئەوەی بیگەیەنێ بە شینە و بەڵام پێی نەدابوو)، خەو بردمییەوە و دەستم کرد بە بینینی خەون و خەیاڵی پڕ لە مێردەزمە و حەسرەت. (لە خەونمدا (کا) پێی دەگوت "چوویتە ساڵەوە،" منیش دەترسام.)

دەوروبەری نیوەڕۆ بێدار بوومەوە و پاشماوەی ڕۆژم بەبێ هاوکاریی تارکوت ئۆێلچوین لە کوچە و شەقامە بەفراوی و شێدارەکانی فرانکفورتدا بەدوای کۆکردنەوەی زانیاریدا سەبارەت بە (کا) بەسەربرد. ئەو دوو ژنەی کە لە هەشت ساڵەکەی بەر لە هاتنیدا بۆ قارس پێوەندییان لەگەڵ (کا)دا هەبووە، ئامادەبوون بێ چەند و چوون بمبینن. پێم گوتن نیازم وایە ژیاننامەی هاوڕێکەم بنووسمەوە. نالان کە خۆشەویستی یەکەمی (کا) بووە، نەک هەر ئاگای لە دوایین دیوانی شیعری ئەو



نەبوو، بگرە پێی نەزانیبوو کە (کا) شاعیر بووە. شووی کردبوو، خۆی و هاوسەرەکەی دوو ڕێستۆرانتی دۆنەر و نووسینگەیەکی گەشتوگوزاریان بەڕێوە دەبرد. دووبەدوو قسەمان کرد، پێی گوتم (کا) کەسێکی دژوار، شەڕانی، سەرکێش و زۆر هەستیار بووە. دواتر کەمێک گریا. (ژنەکە زیاتر بۆ بەفیڕۆدانی تەمەنی جوانیی خۆی لە پێناوی خەون و خەیاڵی چەپڕەویدا غەمگین بوو، نەک بۆ مەرگی (کا).)

خۆشەویستی دووەمی (کا) کە ناوی هیلدەگراد بوو و هێشتا شووی نەکردبوو، وەکو پێشبینیم کرد نە ئاگاداری دوا شیعرەکانی (کا) بوو و نە هیچی لەبارەی دیوانی شیعری (بەفر)ەوە دەزانی. بەجۆرێک (کا)م پێ ناساند وەکو ئەوەی لە تورکیا زۆر ناسراوتر بێ لەوەی کە هەیە و لە پای ئەمەشدا هەستم بە تاوان کرد، بەڵام هیلدەگراد بە جیلوە و نازێکی ئەوتۆوە کە برێک لە هەستی تاوانبارییەکەمی ڕەواندەوە، بۆی گێڕامەوە و گوتی کەوا لە دوای (کا)وە پاشگەز بووەتەوە لە بەسەربردنی پشووی هاوین لە تورکیا، (کا) لاوێکی سەر بە گۆبەن، زۆر زیرەک و تاقانە بووە، هەڵوەدای دۆزینەوەی دایک–خۆشەویست بووە، بەڵام بەهۆی سەرکێشیی خۆیەوە هەرگیز نەیتوانی بیدۆزێتەوە، ئەگەر بیشدۆزیباوە لە دەستی دەدا. هەروەها گوتی عاشقبوونی (کا) کارێکی چەندە ئاسان بوو، پێکەوە ژیانیش لەگەڵیدا هێندە دژوار بوو. ئایا (کا) بەهیچ جۆرێک باسی منی بۆ نەکردبوو؟ (خۆیشم نازانم بۆچی ئەو پرسیارەم لێ کرد و بۆچیش لێرەدا باسی لێوە دەکەم.) باسکی ناسک و دەستی جوان و پەنجەکانی شمشاڵی بوون، بەڵام لە ماوەی گفتوگۆکەماندا کە سەعات و چارەکێکی خایاند، ئەوەی هەستم پێ نەکردبوو، نەبوونی گرێی یەکەمی پەنجەی دۆشاومژەی دەستی ڕاستی بوو. لە دوا ساتدا کە دەستی نایە ناو دەستم، پەنجەی خۆی نیشاندام و بە بزەوە پێی گوتم جارێک (کا) لە کاتی تووڕەبوون و هەڵچووندا گاڵتەی بەو پەنجە ناتەواوەی کردووە.

(کا) دوای تەواوکردنی دیوانەکەی، بەر لەوەی شیعرەکانی کە بەدەست لە دەفتەرێکدا نووسیبوونیەوە، بە داکتیلۆ بنووسێتەوە و چەند کۆپییەکیان لەبەر بگرێتەوە، وەکو لەگەڵ کتێبەکانی پێشووتریشیدا کردبووی، دەستی بە گەشتێک بۆ خوێندنەوەی شیعرەکانی کردبوو: کاسل، براونشڤایگ، هانۆڤەر، ئۆسنابروک،

برێمن، هامبورگ. منیش لەسەر بانگهێشتنی کۆمەڵە میللییەکان و بە هاوکاریی تارکوت ئویلچوین بەپەلە لەو شارانە زنجیرەیەک ئێوارە کۆڕی خوێندنەوەم بۆ سازکرا. کوتومت وەکو ئەوەی کە (کا) لە شیعرێکدا ئاماژەی بۆ کردووە، منیش شەیدای لە کاتی خۆیدا گەیشتن و پاکوخاوێنیی شەمەندەفەرەکانی ئەڵمانیا بووم و وەکو ئەو لە سەر کورسیی لای پەنجەرەوە دانیشتم، بە دڵی پڕ لە خەمەوە دەمڕوانییە دەشتەکان، گوندی شیرین و ڕاکشاوی ناو دۆڵەکان بە کڵێسا بچووکەکانیانەوە و منداڵانی جانتا لە شان و چاکەتی بارانیی ڕەنگاورەنگ لەبەر کە لە وێستگا بچووکەکان چاوەڕێیان دەکرد. دوو تورکی جگەرە بەدەمی سەر بە کۆمەڵە میللییەکان چاوەڕوانم بوون. پێم گوتن هەمان ئەو شتانەم بۆ بکەن کە حەوت هەفتە لەمەوبەر بۆ (کا)تان کردبوو لە کاتی هاتنیدا بۆ شیعر خوێندنەوە لە شارەکەتان. هەروەکو (کا) لە هوتێلێکی هەرزان و بچووک جێگایان بۆ منیش گرت. پاشان لەگەڵ خانەخوێکانمدا چووینە ڕێستورانتێکی تورکی، بەدەم خواردنی بۆرەکی سپیناخ و دۆنەرەوە قسە هاتە سەر سیاسەت و سەر ئەوەی کە بەداخەوە تورکەکان گرنگی بە کولتوور نادەن. دواتر بە شەقامە سارد و چۆڵەکانی شاردا گەڕاین و لە خەیاڵی خۆمدا بووبووم بە (کا) و بەمەبەستی لە بیرکردنی ئازارەکانی ئیپەک بە شەقامەکاندا دەسووڕامەوە. لە ئێوارە کۆڕی (ئەدەبی)دا کە پازدە بیست کەسێکی ئارەزوومەندی سیاسەت، ئەدەبیات یاخۆد کاروباری تورک ئامادەی بوون، بەبێ حەوسەڵەیی یەک دوو لاپەڕەم لە نوێترین ڕۆمانی خۆم خوێندەوە، دواتر یەکسەر نۆرە دەهاتە سەر شیعر، گوتم شاعیری گەورە (کا) کە ماوەیەکی کورت لەمەوبەر لە فرانکفورت کوژراوە، هاوڕێمە. پرسیم "ئایا کەسانێک هەن شتێک لەبارەی ئەو شیعرانەیەوە بزانن کە پێش ماوەیەک لێرە خوێندبوونییەوە؟"

ئەوانەی بۆ ئێوارە کۆڕەکەی من هاتبوون، زۆربەیان نەچووبوونە کۆڕەکەی (کا)، ئەوانەیشی چووبوون، مەبەستیان ئەوە بووە پرسیاری سیاسی بکەن، یاخۆد بە ڕێکەوت ڕێیان کەوتبووە ئەوێ. ئەوەی بۆم دەرکەوت ئەوان شیعرەکانی (کا)یان بیر نەدەکەوتەوە، ئەوان تەنیا ئەم شتانەی (کا)یان بیردەکەوتەوە: پاڵتۆ خۆڵەمێشییەکەی کە هەمیشە لەبەریدا بوو، ڕەنگی زەردی، قژی ئاڵۆزی و جووڵە تووڕەکانی. لە



ماوەیەکی کورتدا مردنی هاوڕێکەم، نەک ژیان و شیعرەکانی، بووبوو بە مایەی سەرنج و بایەخ پێدان. گوێم لە چەندین بیردۆزە بوو سەبارەت بە کوشتنی (کا) لەسەر دەستی ئیسلامییەکان، دەزگای هەواڵگریی نهێنیی تورک، ئەرمەنییەکان، ئەڵمانە سەرتاشراوەکان، کوردەکان یاخۆ نەتەوەپەرستانی تورک. هەندێک جار کەسی ژیر، هۆشمەند و بەئاگا لە ناو ئاپۆڕەکەدا پەیدا دەبوون کە بەڕاستی سەرنجیان لە (کا) دابوو. کەسێکی ئەدەبدۆست و وریا پێی گوتم (کا) دیوانێکی نوێی شیعری نووسیوە، شیعرگەلی (کوچەی خەونەکان، سەگ، قوتووی شۆکۆلاتە و ئەڤین)ی خوێندووەتەوە، کەسە ئەدەبدۆستەکە ئەم شیعرانەی (کا)ی زۆر بەلاوە نامۆ بووە. لەمانە بترازێ، هیچ زانیارییەکم لەو کەسە هەڵنەکڕاند. (کا) لە چەند جێیەک ڕای گەیاندبوو کە شیعرەکانی خۆی لە قارس نووسیووە، ئەمەیش وا لێک درابووەوە کە ویستوویەتی بەمشێوەیە دنەی هەستی ئەو گوێگرانە بدات کە تاسەی نیشتمانیان کردووە. بێوەژنێکی گەنم ڕەنگ کە تەمەنی لە سییەکاندا بوو و منداڵێکی پێ بوو و دوای کۆڕەکە گفتوگۆیەکی درێژی لەگەڵ (کا)دا کردبوو (دواتریش لەگەڵ مندا)، لەبیری مابوو (کا) باسی شیعرێکی کردووە بەناوی (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە): بەبۆچوونی ئەو، (کا) بۆ ئەوەی ڕەخنەی نەیاتە سەر، تەنیا چوارینەیەکی لەو شیعرەی خوێندبووەوە. سەرباری گوشاری زۆریشم، ئەو شیعردۆستە وریایە جگە لە (دیمەنێکی زۆر ترسناک بوو)، هیچی لە بیر نەبوو. ئەم ژنە کە لە کۆڕەکەی (کا)دا لە هامبورگ لە ڕیزی پێشەوە دانیشتووە، دڵنیا بوو لەوەی (کا) شیعرەکانی لە دەفتەرێکی سەوزدا خوێندووەتەوە.

شەو بەو شەمەندەفەرەی (کا) گەشتەکەی پێ کردبوو، لە هامبورگەوە گەڕامەوە بۆ فرانکفورت. لە وێستگای سەرەکی دابەزیم و وەکو ئەو ڕووم لە شەقامی کایزەر کرد و خۆم بە بازاڕەکانی سێکسەوە خەریک کرد. (لە ماوەی هەفتەیەکدا کاسێتێکی نوێی مەلیندا هاتبوو.) کاتێک گەیشتمە ئەو شوێنەی کە هاوڕێکەمی لێ کوژرابوو، ڕاوەستام و بە ئاشکرا ئەو شتەم بەخۆم گوت کە پێشتر بێ ئەوەی بەخۆم زانیبێ، درکم پێ کردبوو: هەبێ و نەبێ، دوای ئەوەی (کا) کەوتووەتە سەر زەوی، بکوژەکە دەفتەرە سەوزەکەی لە گیرفانی دەرهێناوە و بردوویەتی. ماوەی هەفتەیەک لە ئەڵمانیا، هەموو شەوێک تێبینییەکانی (کا) سەبارەت بە شیعرەکانی و

بیرەوەرییەکانی قارسیم دەخوێندەوە. ئێستا تاقە دڵدانەوەی من ئەوە بوو کە پێشبینیم دەکرد یەکێک لە شیعرە درێژەکانی ناو کتێبەکەی (کا) لە قارس لە ئەرشیفی کاسێتەکانی ستۆدیۆی تەلەفزیۆندا چاوەڕێم دەکات.

دوای گەڕانەوەم بۆ ئەستەمبوڵ، ماوەیەک بوو ئێواران لە کۆتاییی هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی دەوڵەتدا چاودێریی ڕەوشی ئاو و هەوای قارسم دەکرد و بیرم لە چۆنێتیی پێشوازی لێکردنم لەو شارە دەکردەوە. خوێنەرانی ئەم کتێبە پێویستە وا بیر نەکەنەوە کە من هێدی هێدی بەرەو ئەوە دەڕۆم کە ببم بە سێبەری (کا) "ئەگەر بێت و بڵێم منیش بەهەمان شێوەی ئەو دوای ڕۆژ و نیوێک سەفەر بە پاس" دەمەوئێوارەیەک گەیشتمە قارس، بە جانتاکەی دەستمەوە و بە ترسەوە چوومە هوتێلی بەفرپالاس و ژوورێکم بەکرێ گرت (نە جووتە خوشکە پڕ لە ڕاز و نهێنییەکە لەو ناوە بوون و نە باوکیان)، وەکو (کا) بەسەر ئەو شۆستە شەختە بەستووانەدا گەڕام کە چوار ساڵ بەسەریاندا هاتوچۆی کردبوو (لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا ڕێستورانتی نیشتمانی سەوز بووبوو بە بیرەخانەیەکی نابووت.) کێماسیی من لە شیعر و غەمدا کە جاروبار (کا)یش ئاماژەی پێ دەکرد، نەک هەر من و ئەوی لە یەکتر دابڕیبوو، بگرە شاری قارسی غەمگینی ئەوی لەو قارسە هەژارە جیا دەکردەوە کە من دەمبینی، بەڵام ئێستا پێویستە باسی ئەو کەسە بکەم کە ئێمەی وێک دەچوواند و پێکەوەی گرێ دەداین.

ئیپەکم یەکەم جار لەو خوانی ئێوارەیە بینی کە سەرۆکی شارەوانیی قارس لەسەر شەرەفی من سازی کردبوو. چەند ئارەزووم دەکرد ئەو گێژبوونەی کە لە یەکەم بینینی ئەودا تووشم بوو، لە ئەنجامی عارەق خواردنەوە بوایە، بۆچوونم سەبارەت بە پەت پچڕان و عاشقبوونی، تەنیا جۆرێک لە پێوەنان بوایە و پێویستیش نەبوایە ئەو ئێوارەیە ئیرەیی بە (کا) ببەم! لە نیوەی شەودا، لە کاتێکدا بەفرێکی شلۆک، کەمتر ڕۆمانسی لەوەی (کا) باسی کردبوو، بەسەر شۆستە قوڕاوییەکانی بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەمدا لە هوتێلی بەفرپالاس دەباری، چەند جارێک لە خۆم پرسی بۆچی شۆخی و جوانیی ئیپەکم لە تێبینییەکانی (کا)وە هەڵنەهێنجاوە.

لە خۆمەوە و بەدەم گوتنی دەستەواژەی "کوتومت وەکو (کا)" کە لەو ڕۆژانەدا زۆر



بەکارم دەهێنا، دەفتەرێکم دەرهێنا و دەستم بە نووسینەوە کرد. دەتوانم بڵێم ئەو نووسینانەم سەرەتایەک بوون بۆ ئەم کتێبەی کە ئێستا دەیخوێننەوە: دێتەوە بیرم هەوڵم دا بەجۆرێک باسی (کا) و ئەڤینەکەی بۆ ئیپەک بکەم وەکو ئەوەی بەسەرهاتی خۆم بێ. لە گۆشەیەکی تەماویی مێشکیشمدا بیرم کردەوە کە خۆ تەرخانکردن بۆ گرفتەکانی ناو کتێبێک یاخۆ وتارێک، ڕێگایەکی تاقیکراوەیە بۆ خۆ بەدوورگرتنم لە ئەڤین.

بەڵام مرۆڤ بۆ بە خۆ دوورگرتن لە عاشقبوون، پێویستە خۆی هەم لەو ژنە کە هۆشی بە غارەت دەبات و هەم لە تارماییی کەسی سێیەم کە بۆ ئەو عەشقە هانی دەدات، ڕزگار بکات.

لەو نێوانەدا، من لەمێژبوو لەگەڵ ئیپەکدا کاتی ژووانم دیاری کردبوو بۆ دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ بۆ قسەکردن سەبارەت بە (کا).

یاخۆ پێم وابوو پێم گوتووە کە دەمەوێ دەربارەی (کا) بدوێین. لە ئێمە بترازێ، کەسی تر لە شیرینیخانەکەدا نەبوو. لە کاتێکدا هەمان تەلەفزیۆنی ڕەش و سپی دوو ئەوینداری نیشان دەدا کە لە بەرامبەر پردی بۆغاز یەکیان لە ئامێز گرتبوو، ئیپەک پێی گوتم قسەکردن دەربارەی (کا) کارێکی هێندە ئاسان نییە. ئەو تەنیا دەیتوانی باسی ئازار و خەیاڵشکاویی خۆی بۆ کەسێک بەیان بکات کە بە دان بەخۆداگرتنەوە گوێی بۆ بگرێ، لە ناخیشەوە ئاسوودە بوو بەوەی کە ئەو کەسە دۆستێکی نزیکی (کا)یە و لە ئەستەمبوڵەوە بەدوای شیعرەکانیدا هاتووە بۆ قارس، چونکە ئەگەر بیتوانیبا قایلم بکات بەوەی کە ناحەقیی لە (کا) نەکردووە، لە ناخەوە ئاسوودە دەبوو. بە پارێزیشەوە پێی گوتم تێ نەگیشتنم لێی، غەمگینی دەکات. هەمان ئەو ئەتەکەی لەبەردابوو کە سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوای (شۆڕشەکە) بەرچییی پێوە دابوو بە (کا)، هەر هەمان کەمەربەندی ئەستووری مۆدێل کۆنیشی بەسەر بلوزەکەیدا بەستبوو (لەبەرئەوەی لە تێبینییەکانی (کا)دا خوێندبوومنەوە، دەسبەجێ ئەو شتانەم ناسیەوە)، لە سیمایشیدا هێمایەکی نیمچە بەرەنگاربوونەوە و نیمچە غەمگین بەدی دەکرا. زۆر بەوردی و دوور و درێژ گوێم بۆ ڕاگرت.

## ٤٢

# باوڵەکەم ئامادە دەکەم

## لە چاوی ئیپەکەوە

ئەو کاتەی (کا) لە دوای دوو پاسەوانەکەیەوە لە ڕێگای ڕۆیشتنیدا بۆ هۆڵی شانۆی گەل بەری کردبووە دواوە و بۆ دواجار سەیرێکی ئیپەکی کردبوو، ئیپەک گەشبین بوو بەوەی کە ڕۆژێک دێ (کا)ی زۆر خۆش بوێ. لەبەرئەوەی باوەڕهێنان بە خۆشویستنی پیاو بەلای ئیپەکەوە هەستێکی ئەرێنیتر بوو لە خۆشویستن و تەنانەت عاشق بوونیش، هەستی دەکرد کە لەبەردەم دەروازەی ژیانێکی نوێ و خۆشبەختییەکی درێژخایەندایە.

بۆیە بیست خولەکی سەرەتای دوای ڕۆیشتنی (کا) هیچ غەمێکی نەبوو: نەک هەر نائارام نەبوو بە کلیلدانی دەرگای ژوورەکەی لە لایەن خۆشەویستێکی دڵپیسەوە، بگرە ڕازیش بوو. هۆشی لای باوڵەکەی بوو؛ پێی وابوو ئەگەر ساتێک زووتر باوڵەکەی ئامادە بکات و خۆی بەو شتومەکانەوە خەریک بکات کە نایەوێ تا کۆتایی ژیان خۆی داببڕێ لێیان، ئەوا هەم دەتوانێ ئاسانتر باوک و خوشکەکەی جێ بهێڵێ و هەمیش دەتوانێ ساتێک زووتر لەگەڵ (کا)دا بێ دەرد و بەڵا لە شاری قارس دوور بکەونەوە. دوای تێپەڕبوونی نیوسەعات بەسەر ڕۆیشتنی (کا) و نەگەڕانەوەیدا، ئیپەک جگەرەیەکی داگیرساند. لەبەر باوەڕهێنانی بەوەی هەموو شتێک بە ئارەزووی دڵی ئەوان دەبێ، هەستی بە بوودەڵەییی خۆی دەکرد: بەجێهێشتنی لە ژوورێکی کلۆمکراودا ئەم هەستەی ئەوی زیاتر دەکرد و لە خۆی و لە (کا) زویر بوو. کاتێک بینی وا جاویدی کارمەندی هۆڵی پێشوازی لە هوتێلەکە هاتە دەرێ و بەرەو شوێنێک تێی تەقاند، ویستی پەنجەرەکە بکاتەوە و بانگی بکات، بەڵام هەتا ئەم فریاکەوت بڕیاری خۆی بدات، لاوەکە بە ڕاکردن دوورکەوتەوە. ئیپەک بە خەیاڵی هاکا گەڕانەوەی (کا)وە خۆی خافڵاند.



دوای تێپەڕبوونی چل و پێنج خولەک بەسەر ڕۆیشتنی (کا)دا ئیپەک بەزۆر پەنجەرەی شەختەبەستووی ژوورەکەی کردەوە، لەو کاتەدا لاوێک بەسەر شۆستەکەدا تێ دەپەڕی – قوتابییەکی سەر لێشێواوی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان بوو کە بۆ هۆڵی شانۆی گەل نەبرابوو–، ئیپەک پێی گوت کە لە ژووری ٢٠٣ دا دەرگای لەسەر داخراوە و تکای لێ کرد لە خوارەوە هەواڵ بە کارمەندانی هوتێلەکە بگەیەنێ. دوای کەمێکیش زەنگی تەلەفۆنی ژوورەکە زرنگایەوە.

تورگوت بەگ گوتی: "چ کارێکت هەیە لەو ژوورە؟ ئەگەر دەرگای ژوورەکەت لێ داخراوە، بۆچی تەلەفۆن ناکەی؟"

باوکی دوای خولەکێک بە کلیلی یەدەک دەرگای ژوورەکەی کردەوە. ئیپەک بە تورگوت بەگی گوت کە ویستوویەتی لەگەڵ (کا)دا بچێ بۆ هۆڵی شانۆی گەل، بەڵام (کا) بۆ ئەوەی ئەم لە دەرد و گرفت بپارێزێ، دەرگاکەی لەسەر داخستووە. هەروەها بە باوکی گوت کە لەبەرئەوەی هێڵی تەلەفۆنی شار بڕاوە، وای زانیوە تەلەفۆنی هوتێلیش کار ناکات.

تورگوت بەگ گوتی: "تەلەفۆنەکانی شار کەوتوونەتەوە کار."

ئیپەک گوتی: "کاتێکی زۆر بەسەر ڕۆیشتنی (کا)دا تێ پەڕی، زۆر بە پەرۆشم بۆی. با بڕۆین بۆ هۆڵی شانۆی گەل و بزانین چی بەسەر قەدیفە و (کا)دا هاتووە."

سەرباری هەموو نیگەرانییەکانی ئەم، دەرچوونی تورگوت بەگ لە هوتێل کاتێکی زۆری خایاند. سەرەتا دەسەوانەکانی بۆ نەدۆزرایەوە، دواتریش گوتی ئەگەر کراڤات لە مل نەکات، ئەوا لەوانەیە ئەمە بەلای سونایەوە بە هەڵە لێک بدرێتەوە. بە ڕێگایشەوە داوای لە ئیپەک دەکرد لەسەرخۆ هەنگاو بنێ، چونکە هەم هێزی ڕۆیشتنی تێدا نەبوو و هەمیش دەیویست ئامۆژگارییەکانی ئیپەک باشتر ببیستێ.

ئیپەک گوتی: "بەهیچ جۆرێک نەیکەی بە هەرا لەگەڵ سونایدا. لەبیرت نەچێ ئەو ئێستا ژاکوبەنێکی ڕادیکاڵە و هێزێکی زۆری لە دەستدایە!"

تورگوت بەگ کاتێک لەبەر دەروازەی هۆڵی شانۆکە ئاپۆڕەی پێکهاتووی لە ئارەزوومەندان، قوتابییانی بە پاس هێندراو، ئەو فرۆشیارانەی کە سەردەمێکی درێژ بوو بە حەسرەتی حەشاماتێکی واوە بوون، پۆلیس و ڕەوە سەرباز بینی، جۆش و

خرۆشی کۆبوونەوە سیاسییەکانی تافی لاویی خۆی بیر کەوتەوە. خۆی زیاتر بە قۆڵی کچەکەیدا هەڵواسی و بە هەستێکی تێکەڵ لە کامەرانی و ترسەوە چاوی بۆ کەسانێک گێڕا لە دەوروبەری خۆی کە بتوانێ لەگەڵیاندا بدوێ و خۆی بکات بەبەشێک لەو جمەوجووڵەی دەوروبەر. کاتێک هەستی کرد کە زۆربەی ئاپۆڕەکە کەسانی نامۆن بەم، بە توندی پاڵی بە لاوێکەوە نا کە لە ناوەڕاستی دەرگاکەدا ڕاوەستابوو، یەکسەریش لە پای ئەم ڕەفتارەی، شەرمی بە خۆیدا هاتەوە.

هۆڵەکە هێشتا بەتەواوی پڕ نەبووبوو، بەڵام ئیپەک هەستی دەکرد پاش کەمێکی تر کەش و هەوای ڕۆژی کۆبوونەوەی دایکان و باوکان باڵ بەسەر هۆڵەکەدا دەکێشێ و پێی وابوو هەموو ئەوانەی ئەو دەیانناسێ، وەکو لە خەونێکدابن، لەوێ گرد بووبوونەوە. بە نەبینینی قەدیفە و (کا) ئۆقرەی لەبەر بڕا. سەربازێک بردنیە قەراغەوە.

تورگوت بەگ بە ڕیتمێکی پڕ لە گلەیی و گازندەوە گوتی: "من باوکی ئەکتەری سەرەکی قەدیفە یلدزم. پێویستە بە زووترین کات بیبینم."

تورگوت بەگ وەکو باوکێک کە لە دوا ساتدا تەگەرە دەخاتە ڕێی کچەکەی کە لە شانۆی قوتابخانەدا ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێ، ڕەفتاری دەکرد. سەربازەکەیش وەکو مامۆستایەک کە پێی وایە ماف بەلای باوکەوەیە، شپرزە بووبوو. دوای کەمێک چاوەڕێکردن لە ژوورێکدا کە وێنەی ئەتاتورک و سوونای بە دیوارەکانیدا هەڵواسرابوون، ئیپەک خوشکەکەی بینی بە تەنیا هاتە ژوورەوە و دەسبەجێ تێ گەیشت هەرچی بکات و نەکات، خوشکەکەی دەچێتە سەر شانۆ و لە نمایشەکەی ئێوارەدا بەشدار دەبێ. ئیپەک هەواڵی (کا)ی پرسی. قەدیفە گوتی دوای یەکتربینینیان گەڕاوەتەوە بۆ هوتێل. ئیپەک گوتی کە لە ڕێگا نەیانبینیووە، بەڵام زۆر پێی لەسەر ئەو بابەتە دانەگرت، چونکە تورگوت بەگ بە چاوی پڕ لە ڕۆندکەوە دەستی کردبوو بە پاڕانەوە لە قەدیفە و داوای لێ دەکرد نەچێتە سەر شانۆ.

قەدیفە گوتی: "بابە گیان، لەم ساتە بەدواوە و پاش ئەو هەموو ڕەکلامکردنە، نەچوونە سەر شانۆ ترسناکترە لە چوونە سەری."

"قەدیفە، تۆ دەزانی ئەگەر سەرت ڕووت بکەی قوتابیانی ئامادەیی پێگەیاندنی



پێشنوێژ و وتارخوێنان چەند تووڕە دەبن و چۆن هەموو کەسێک ڕکیان لێت دەبێتەوە. وا نییە؟"

"بابە گیان، ئەگەر ڕاستت دەوێ ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە کاتێک پێم دەڵێی – سەرت ڕووت مەکە–، وا دەزانم گاڵتەم لەگەڵدا دەکەی."

تورگوت بەگ گوتی: "قەدیفەکەم، ئەمە گاڵتەی تێدا نییە. پێیان بڵێ کە نەخۆشی."

"بەڵام من نەخۆش نیم..."

تورگوت بەگ کەمێک گریا. ئیپەک هەستی کرد باوکی وەکو هەموو جارێک ڕەهەندێکی سۆزداری لە بابەتێکدا دەدۆزێتەوە و هۆشی خۆی تێدا چڕ دەکاتەوە، بەڵام تەنانەت خۆیشی بە گۆشەیەکی هۆشی بڕوا بە فرمێسکەکانی خۆی ناکات. تورگوت بەگ ڕەهەندێکی هاوکات ڕووکەش و ڕاستگۆی ئەوتۆیشی هەبوو لە دەربڕینی ئازارەکانیدا، بەجۆرێک ئیپەک پێی وابوو کە باوکی لەبەر هۆیەکی تەواو پێچەوانەی ئەم هۆیەش لە ناخەوە فرمێسک دەڕێژێ. ئەم ئاکارە کە باوکیانی باش و خۆشەویست دەکرد، ئێستا بەبەراورد لەگەڵ بابەتێکدا کە جووتە خوشکەکە دەیانویست قسەی لەسەر بکەن، تا ڕادەی شەرم پێداهاتنەوە (سووک) دەهاتە بەرچاو.

ئیپەک وەکو ئەوەی بە چرپە بدوێ، لە قەدیفەی پرسی: "(کا) کەی دەرچوو؟"

قەدیفە بەهەمان وردبینییەوە گوتی: "دەبێ لە زووەوە گەیشتبێتەوە هوتێل."

بە ترسەوە سەیری ناو چاوی یەکتریان کرد.

ئیپەک دوای چوار ساڵ لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ بۆی گێڕامەوە کە هەردووکیان لەو کاتەدا بیریان لە شینە کردووەتەوە نەک لە (کا)، ئەمەیان لە نیگای یەکدیدا بەدی کردووە و ترس باڵی بەسەردا کێشاون، بەهیچ جۆرێکیش باکی باوکیان نەبووە. من ئەم دان پێدانانەی ئیپەکم وەکو ئاماژەی خۆ نزیکخستنەوە لێک دایەوە، هەستم کرد ئیدی بێ خۆدزینەوە لە دیدی ئەوەوە بۆ کۆتایی چیرۆکەکەم دەڕوانم.

بێدەنگییەک باڵی بەسەر جووتە خوشکەکەدا کێشابوو.

ئیپەک گوتی: "پێی گوتی کە شینەیش ڕازی نییە، وا نییە؟"

قەدیفە بەچەشنێک وەکو ئەوەی کە بڵێ "باوکم گوێی لێ بوو"، سەیری دادەی کرد. هەردووکیان سەیرێکی باوکیان کرد و تێ گەیشتن کە باوکیان بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە گوێی لێیان ڕاگرتووە و گوێی لە وشەی شینەیش بووە.

"بابە گیان، دەتوانین دوو خولەک پێکەوە قسەی خوشکانە بکەین؟"

تورگوت بەگ گوتی: "عەقڵ و هۆشی ئێوە هەمیشە لە سەرووی ئەوەی منەوەیە." لە ژوورەکە چووە دەرەوە، بەڵام دەرگاکەی پێوە نەدا.

ئیپەک گوتی: "قەدیفە، باش بیرت لێ کردووەتەوە؟"

قەدیفە لە وەڵامدا گوتی: "باش بیرم لێ کردووەتەوە."

ئیپەک گوتی: "دەزانم باشت لێک داتەوە، بەڵام ئەگەری ئەوەیش هەیە هەرگیز نەیبینیتەوە."

قەدیفە بە هوشیارییەوە گوتی: "باوەڕ ناکەم. سەرباری ئەوە، زۆریش لێی تووڕەم."

ئیپەک بەدەم ئازارەوە ئەوەی هێنایە پێش چاوی خۆی کە مێژوویەکی تایبەت و درێژی لێوانلێو لە دەمەقاڵێ، ئاشتبوونەوە، تووڕەبوون و هەڵبەز و دابەز لە نێوان قەدیفە و شینەدا هەیە. چەند ساڵە؟ بە تەواوی نەیدەزانی، بەهیچ جۆرێکیش نەیدەویست جارێکی تر لە خۆی بپرسێ ئەو ماوەیەی کە شینە ئیدارەی ئەم و قەدیفەیشی داوە چەندی خایاندووە. لەپڕ بە خۆشەویستییەوە بیری لە (کا) کردەوە کە ئەم دەباتە ئەڵمانیا و شینەی لەبیر دەباتەوە.

قەدیفەیش لە ساتێکی ئەو درککردنە تایبەتەی کە لە نێوان دوو خوشکدا دروست دەبێ، لە بیرکردنەوەی دادەی حاڵی بوو. گوتی: "(کا) زۆر ئیرەیی بە شینە دەبات. بە سەختی عاشقی تۆ بووە."

ئیپەک گوتی: "باوەڕم نەدەکرد لە ماوەیەکی هێندە کورتدا بەو ڕادەیە خۆشی بوێم. بەڵام ئێستا باوەڕ دەکەم."

"لەگەڵیدا بڕۆ بۆ ئەڵمانیا."

ئیپەک گوتی: "بەڵێ، هەر کە گەڕامەوە باوڵەکەم ئامادە دەکەم. ئایا بەڕاستی باوەڕ



دەکەی لەگەڵ (کا)دا لە ئەڵمانیا بەختەوەر دەبم؟"

قەدیفە گوتی: "باوەڕ دەکەم. بەڵام ئیدی شتەکانی ڕابردوو بە (کا) مەڵێ. هەر لە ئێستاوە زۆر شت دەزانێ، پەی بە شتی زیاتریش دەبات."

ئیپەک نەفرەتی لەم بەخۆنازینەی قەدیفە دەکرد کە خۆی وا نیشان دەدا باشتر لە دادەی لە ژیان دەگات: "وا دەدوێی وەکو ئەوەی نیازت نەبێ دوای نمایشەکە بۆ ماڵەوە بگەڕێیتەوە."

قەدیفە گوتی: "بێگومان دەگەڕێمەوە، بەڵام پێم وابێ ئێستا تۆ دەسبەجێ دەڕۆی."

"هیچ بۆچوونێکت هەیە سەبارەت بەو شوێنەی (کا) ڕووی تێ کردووە؟"

سەیرێکی ناو چاوی یەکتریان کرد، ئیپەک هەستی کرد هەردووکیان لە شتێک دەترسن کە لەو کاتەدا بە خەیاڵیاندا گوزەری دەکرد.

قەدیفە گوتی: "ئیدی دەبێ بڕۆم، چونکە دەبێ ماکیاج بکەم."

ئیپەک گوتی: "لە سەر ڕووتکردنەکەت زیاتر، بەوە خۆشحاڵم کە لەم چاکەتە مۆرە بارانییە ڕزگارت دەبێ."

قەدیفە بە دوو جووڵەی سەماکردن هەردوو دامێنی چاکەتەکەی کە وەکو چارشێوێک تا سەر پێیەکانی درێژ بووبووەوە، ڕاوەشاند. باوکیان لە ناو دەرگاکەوە ئەمەی بینی و بزەیەکی بۆ کردن، ئەمانیش باوەشیان بە یەکدیدا کرد و یەکیان ماچ کرد.

پێ دەچوو تورگوت بەگ لەمێژ بێ خۆی بە چوونە سەر شانۆی قەدیفە قایل کردبێ. ئەمجار نە فرمێسکی ڕشت و نە ئامۆژگاریی کرد. باوەشی بە کچەکەیدا کرد و ماچی کرد. ویستیشی هەرچی زووترە بەناو ئاپۆڕەی بینەراندا بچنە دەرەوە.

ئیپەک لەبەردەم دەروازەی قەرەباڵغی هۆڵەکە و لە ڕێی گەڕانەوەیشدا هەر چاوێکی کردبوو بە چوار بۆ بینینی (کا) یاخۆ بۆ بینینی کەسێک کە سۆراخی (کا)ی لێ بپرسێ، هیچ شتێک لەسەر شۆستەکان سەرنجی ڕانەکێشا. دواتر بە منی گوت: "هەروەکو چۆن (کا) لەبەر هۆی ناقۆلا ڕەشبین دەبوو، پێم وابێ منیش لەبەر هۆی بەهەمان شێوە ناقۆلا، چل و پێنج خولەکی دوای ڕۆیشتنی ئەو زۆر گەشبین بووم."

تورگوت بەگ یەکسەر چووە بەردەم تەلەفزیۆنەکە و ئیدی چاوەڕێی نمایشەکەی دەکرد کە بێ بڕانەوە ڕێکلامی بۆ دەکرا. ئیپەکیش ئەو باوڵەی ئامادە کرد کە دەیویست لەتەک خۆیدا بیباتە ئەڵمانیا. لە بری ئەوەی بیر لە شوێنی (کا) بکاتەوە، بەدەم خەیاڵی ئەوەی کە لە ئەڵمانیا چۆن بەختەوەر دەبن، لە دۆلابەکەیدا شتومەک و جلوبەرگی هەڵدەبژارد. سەرباری ئەوەی پێشبینیشی دەکرد کە (لە ئەڵمانیا شتگەلی زۆر باشتر لەوانە هەبن)، کەچی هەندێک گۆرەوی و جلوبەرگی ژێرەوەی خزاندە ناو باوڵی ئەو شتومەکانەی کە پێشتر ئامادەی کردبوو، چونکە بیری لەوە دەکردەوە کە لەوانەیە لەگەڵ شتومەکی ئەڵمانیادا ڕانەیات. لەو کاتەدا هەر لە خۆیەوە لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد، بینی ئەو ئۆتۆمبیلە سەربازییەی کە چەند جارێک بەدوای (کا)دا هاتبوو، وا لە هوتێلەکە نزیک دەبێتەوە.

دابەزیە خوارەوە، باوکیشی لەبەردەم دەرگا بوو. کارمەندێکی سڤیلی باش تەراشکردووی لووت تەورداس کە ئیپەک یەکەم جاری بوو دەیبینی، گوتی: "تورگوت یلدز" و زەرفێکی داخراوی دایە دەستی تورگوت بەگ.

کاتێک تورگوت بەگ بە ڕووخسارێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی و بە دەستی لەرزیو زەرفەکەی کردەوە، کلیلێکی تێدا بوو. لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکەدا تێ گەیشت کە بۆ کچەکەی نووسراوە، بەڵام تا کۆتاییی خوێندیەوە و پاشان دای بە ئیپەک.

ئیپەک، دوای چوار ساڵ، لەبەرئەوەی کە دەیویست داکۆکی لە خۆی بکات و خوازیار بوو ئەوەی سەبارەت بە (کا) دەینووسم، ڕەنگدانەوەی ڕاستییەکان بێ، نامەکەی دا بە من.

پێنجشەممە، سەعات هەشت

تورگوت بەگ، زۆر باش دەبێ بۆ هەموومان ئەگەر ئیپەک بەم کلیلە لە ژوورەکەم دەربهێنن و ئەم نامەیەی پێ بگەیەنن. داوای لێبووردن دەکەم. لەگەڵ ڕێزمدا.

گیانەکەم. قەدیفەم بۆ قایل نەکرا. سەربازەکان بەمەبەستی پاراستنم منیان هێناوە بۆ وێستگای شەمەنەفەر. ڕێگای ئەرزەرووم کراوەتەوە، بە شەمەنەفەری سەعات نۆ و نیو بەزۆر لێرەم دوور دەخەنەوە. تۆیش پێویستە جانتاکەی من بپێچیتەوە و باوڵەکەی خۆیشت هەڵبگری و بێی. ئۆتۆمبیلە سەربازییەکە سەعات نۆ



و چارەک دێ بەدواتدا. بەهیچ جۆرێک مەچۆ کوچە و کۆڵانەکان. وەرە. زۆرم خۆش دەوێی. خۆشبەخت دەبین.

کابرای لووت تەورداس گوتی کە دوای سەعات نۆ جارێکی تر دێتەوە. ئەوەی گوت و ڕۆیشت.

تورگوت بەگ پرسی: "جا دەڕۆی؟"

ئیپەک گوتی: "زۆر پەرۆشی ئەوەم بزانم چی بەسەر هاتووە."

"سەربازەکان دەیپارێزن، هیچی لێ نایات. تۆ جێمان دێڵی و دەڕۆی؟"

ئیپەک گوتی: "باوەڕم وایە لەگەڵ ئەودا بەختەوەر دەبم. قەدیفەیش هەر وای گوت."

وەکو ئەوەی بەڵگەی بەختەوەربوونەکەی لەخۆ گرتبێ، هەمدیسان نامەکەی خوێندەوە و بەدوایدا دەستی کرد بە گریان. بەڵام بەتەواوی نەیدەزانی بۆچی فرمێسک دەڕێژێ. ساڵانێک دواتر بە منی گوت: "ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە جێ هێشتنی باوکم و خوشکەکەم بەلاوە گران بووبێ."

دەمبینی ئیپەک وردەکاریی هەموو ئەو شتانەی لەو ساتەدا هەستی پێ کردبوون، بە بەسەرهاتەکەی خۆیەوەی گرێ دەدان کە من بە بایەخەوە گوێم بۆ ڕاگرتبوو. دواتر گوتی: "ڕەنگە لەبەر ترسیشم بووبێ لە شتەکەی تری ناو عەقڵم."

دوای بڕانەوەی دڵۆپە فرمێسکی چاوەکانی ئیپەک، لەگەڵ باوکیدا چوونە ژوورەکەی، بۆ دواجار چاوێکیان بەو شتومەکانەدا گێڕایەوە کە دەبوو بخرێنە باوڵەکەوە. پاشان چوونە ژوورەکەی (کا) و سەرجەمی شتومەکەکانی ئەویشیان کردە جانتا دەستییە ڕەنگ گێلاسییەکەیەوە. ئەمجار هەردووکیان بە ئومێدەوە قسەیان لەسەر داهاتوو دەکرد، باسی ئەوەیان دەکرد ئەگەر خودا یار بێ قەدیفە بە زوویی زانکۆ تەواو دەکات، تورگوت بەگیش لەگەڵ کچەکەیدا لە فرانکفورت سەر لە ئیپەک دەدات.

دوای پێچانەوەی باوڵەکە، هەردووکیان دابەزینە خوارەوە و چوونە بەردەم تەلەفزیۆنەکە بۆ بینینی قەدیفە.

تورگوت بەگ گوتی: "بەهیوای خودا نمایشەکە کورت دەبێ بۆ ئەوەی بەر لەوەی

سواری شەمەنەفەرەکە بی، ببینی کە شتەکان بێ بەڵا و دەردی سەر تەواو بوون."

بێ ئەوەی هیچ شتێکی تر بڵێین لە بەرامبەر تەلەفزیۆنەکەدا دانیشتن و وەکو ئەوەی لە کاتی سەیرکردنی ماریانادا دەیانکرد، بە باشی خۆیان بە یەکەوە نووساند، بەڵام ئیپەک هۆشی لەسەر دیمەنەکانی سەر پەردەی تەلەفزیۆنەکە نەبوو. لە بیست و پێنج خولەکی سەرەتای نمایشەکە کە ڕاستەوخۆ لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرا، ئیپەک سالانی دواتر هەر ئەوەندەی لەبیر مابوو کە قەدیفە لە جلێکی سووری ئاوداماندا هاتبووە سەر شانۆ و گوتبووی: "بابە گیان، هەر وەکو ئەوەی کە بۆخۆتان پێتان خۆشە!" لەبەرئەوەی تێ گەیشت من بە پەرۆشەوەم بۆ زانینی ئەوەی ئەو لەو ساتەدا بیری لە چی کردووەتەوە، گوتی: "بێگومان هۆشم لە جێیەکی تر بوو." دوای چەندین جار پرسیارکردنم لەو جێیانەی کە هۆشی ئەوی لێ بووە، ئاماژەی کرد بۆ گەشتی شەمەندەفەرەکە کە دەبوو لەگەڵ (کا)دا بیکات. دواتریش باسی ترسانی خۆی بۆ کردم. بەڵام لەبەرئەوەی خۆشی نەیزانیبوو لە چی ترساوە، دوای ئەو هەموو ساڵەیش نەیدەتوانی هۆی ترسانەکەی بەتەواوی بۆ من ڕوون بکاتەوە. پەنجەرەکانی هۆشی تا کۆتایی خستبووە سەر پشت، پەردەی تەلەفزیۆنەکەی بەردەمی نەبێ، لە ناخەوە پەی بە هەموو شتێکی تر دەبرد، وەکو گەڕیدەیەکی گەڕاوەی دوای گەشتێکی درێژ چۆن ماڵەکەی، شتومەکەکانی و ژوورەکانی زۆر نامۆ، بچووک، گۆڕاو و کۆن دێتە بەرچاو، ئاوا بە سەرسووڕمانەوە سەیری کەلوپەلەکانی دەورووبەری، مێزەکە و لۆی پەردەکانی دەکرد. پێی گوتم لەبەرئەوەی هەستی کردووە لە ماڵەکەی خۆیاندا بێگانەیە، لەو ئێوارەیەوە مۆڵەتی بە ژیانی خۆی داوە کە ڕوو لە شوێنێکی تەواو جیاواز بکات. ئەمەیش، وەکو ئیپەک لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ زۆر بە سەرنجەوە بۆ منی گێڕایەوە، بەڵگەیەکی بێگەرد بوو بۆ ئەوەی کە بڕیاری دابوو ئەو ئێوارەیە لەگەڵ (کا)دا سەفەر بکات بۆ فرانکفورت.

لە دەرگای هوتێل درا، ئیپەک ڕاپەڕی و کردیەوە. ئۆتۆمبیلە سەربازییەکەی کە دەبوو بیبات بۆ وێستگای شەمەنەفەر، زووتر گەیشتبوو. بە ترسەوە بە کارمەندە سڤیلەکەی بەر دەرگای گوت کە دوای تۆزێکی تر دێ. بە ڕاکردن چووەوە پاڵ باوکی و بەتەواوی گوڕ و تینەوە باوەشی پێدا کرد.



تورگوت بەگ پرسی: "ئۆتۆمبیلەکە هات؟ ئەگەر باوڵەکەت پێچابێتەوە، هێشتا کاتت هەیە."

ئیپەک ماوەیەک لەسەر پەردەی تەلەفزیۆنەکە نائاگا سەیری سونای کرد. نەیتوانی لە شوێنی خۆی بسرەوێ، تاوی دایە خۆی بۆ ژوورەکەی، دەمپاکانی و جانتایەکی بچووکی دەستچنی زنجیردار کە لە سەر لێواری پەنجەرەکە داندرابوو، خستە باوڵەکەیەوە. دواتر بۆ ماوەی چەند خولەکێک لە قەراغی جێگاکەی دانیشت و گریا.

بەپێی ئەوەی دواتر بۆ منی گێڕایەوە، پاش گەڕانەوەی لە هۆڵی شانۆوە بۆ هوتێل، بۆ جێ هێشتنی قارس لەگەڵ (کا)دا بڕیاری خۆی یەکلایی کردبووەوە. لەبەرئەوەی ژەهری گومان و بێ بڕیاری لە هەناوی خۆی دەرهاویشتبوو، لە ناخەوە هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد و دەیویست دوا خولەکەکانی خۆی لە بەردەم تەلەفزیۆن لەگەڵ باوکە خۆشەویستەکەیدا بەسەر ببات. کاتێک جاویدی کارمەندی هۆڵی پێشوازی هاتە بەرەوە و گوتی کەسێک لەبەر دەرگا چاوەڕێ دەکات، ئیپپەک هیچ خۆی تێک نەدا. تورگوت بەگیش پێی گوت کۆکاکۆلایەک لە بەفرگرەکە بۆ کچەکەی و دوو لێوانیش بۆ دابەشکردنی بهێنێ. ئیپەک پێی گوتم هەرگیز ئەو ڕووخسارەی فازیل لەبیر ناکات کاتێک لەبەردەم دەرگای ئاشپەزخانەکەدا بینیبووی. گێڕایەوە و گوتی نیگاکانی لەلایەک ئاماژەیان بۆ ڕوودانی کارەساتێک دەکرد، لەلایەکی تر شتێکیان بە ئیپەک گوتووە کە پێشتر هیچ پەی پێ نەبردووە: فازیل خۆی بە ئەندامێکی خێزانەکە و کەسێکی زۆر نزیک لەوان دەزانی.

فازیل گوتی: "شینە و خەندەیان کوشت!" لێوانێک ئاوی لە زاهیدە وەرگرت و نیوەی خواردەوە. "تەنیا شینە دەیتوانی قەدیفە پاشگەز بکاتەوە."

ئیپەک لە جێی خۆی نەجووڵا و هەندێک سەیری کرد، فازیل دەستی کرد بە گریان. گوتی کە دوای دەنگێکی ناوەوەی خۆی کەوتووە و بۆ ئەوێ چووە، لە میانەی بەشداربوونی بڕێک سەربازیشەوە حاڵی بووە کە لەبەر ڕۆشنایی زمانلێداندا هێرش کراوەتە سەر شوێنی خۆحەشاردانی شینە و خەندە. ئەگەر زمانلێدان نەبێ، ئەو هەموو سەربازە نەدەچوونە سەریان. نەخێر، دوای ئەم نەکەوتبوون، چونکە کاتێک فازیل گەیشتبووە ئەوێ، لەمێژبوو هەموو شتێک کۆتایی هاتبوو. فازیل گوتی کە

لەگەڵ منداڵانی ماڵەکانی دەوروبەردا و لەبەر ڕۆشنایی بلاجیکتۆری سەربازەکانیشدا تەرمی شینەی بینیوە.

دوایی گوتی: "ئایا دەتوانم لێرە بمێنمەوە؟ نامەوێ بڕۆم بۆ هیچ شوێنێکی تر."

ئیپەک لێوانێکی بۆ ئەویش دەرهێنا. لە کشاو و دۆڵابی شووشەدا و لە شوێنی هەڵە بەدوای کلیلی شووشە هەڵپچڕیندا گەڕا. بیری کەوتەوە ئەو بلووزە گوڵدارەی کە لە یەکەم ڕۆژی بینینی شینەدا لەبەری کردبوو، لە باوڵەکەی ناوە. فازیلی بردە ژوورەوە، لەسەر ئەو کورسییەی لای دەرگای ئاشپەزخانەکە دانیشاند کە (کا) شەوی سێشەم بە سەرخۆشی لەسەری دانیشتبوو و بە بەرچاوی هەمووانەوە شیعری لەسەر نووسیبوو. دواتر کەمێک هەستی ڕاگرت و وەکو نەخۆشێک گوێی لەو تاڵاوە بوو کە چەشنی ژەهر بە هەناویدا تەشەنەی دەکرد: فازیل لە دوورەوە سەیری قەدیفەی دەکرد لە تەلەفزیۆنەکەدا. ئیپەک لە پێشدا لێوانێک کۆکاکۆلای دایێ و پاشان لێوانێکی دایە باوکی. لایەکی مێشکی وەکو کامێرایەک لە دەرەوە هەموو ئەم ڕەفتارانەی ئەمی دەبینی.

چووە ژوورەکەی خۆی. ساتێک لە تاریکییەکەدا ڕاوەستا.

جانتاکەی (کا)ی لەسەرەوە هەڵگرت. چووە سەر شەقامەکە. دەرەوە سارد بوو. بە کارمەندی سقیلی ناو ئۆتۆمبیلە سەربازییەکەی گوت کە شار بەجێ ناهێڵێ.

کارمەندەکە گوتی: "دەمانتوانی سوارتان بکەین و بتانگەیەنینە شەمەنەفەرەکە."

"پەشیمان بوومەوە، نایەم، زۆر سوپاستان دەکەم. تکایە ئەم جانتایە بدەن بە (کا) بەگ."

هاتەوە ژووری و لە تەنیشت باوکیەوە دانیشت، هێندەی نەبرد گوێیان لە دەنگی ئۆتۆمبیلەکە بوو کە دوور دەکەوتەوە.

ئیپەک بە باوکی گوت: "بەڕێم کردن. ناڕۆم."

تورگوت بەگ لە ئامێزی گرت. ماوەیەکی تریش بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆی لێ تێ بگەن، لە تەلەفزیۆندا سەیری نمایشەکەیان کرد. لەگەڵ نزیکبوونەوەی تەواوبوونی پەردەی یەکەمدا ئیپەک گوتی: "با بڕۆین بۆ لای قەدیفە! پێویستە شتێکی بۆ بگێڕمەوە."



# ٤٣

## ژنان لە پێناوی شەرەفدا خۆیان دەکوژن

### پەردەی کۆتایی

سونای، ئەو شتەی بە سروش وەرگرتن لە شانۆنامەی (تراژیدیای ئیسپانیا)ی تۆماس کید و لە ژێر چەندین کاریگەریی تردا نووسیبووی و ئێستا لەسەر شانۆ نمایشی دەکرد، لە دوا ساتدا ناوەکەی گۆڕیبوو بۆ (تراژیدیا لە قارسدا.) ئەم ناوە تازەیەی نمایشەکە لە نیو سەعاتی کۆتاییدا فریای ئەو ڕێکلامەی تەلەفزیۆن خرابوو کە پەیتاپەیتا لێ دەدرایەوە. ئاپۆڕەی بینەران کە پێک هاتبوو لەوانەی لە ژێر چاودێری سوپادا بە پاس هێندرابوون، ئەوانەی کە لە ڕێی بیستنی ئاگادارییەکانەوە متمانەیان بە بەڕێوەبەرایەتیی سەربازی بەخشیبوو، ئەوانەی کە دەیانویست بە هەر نرخێک بووە ڕووداوەکان بە چاوی خۆیان ببینن (چونکە لە شاردا دەنگۆی ئەوە هەبوو کە –وەشانی زیندوو– کاسێتی تۆمار کراوە و ئەو کاسێتەیش لە ئەمەریکاوە هێندراوە)، فەرمانبەرانی دەوڵەت کە زۆربەیان بە ناچاری هاتبوون (ئەمجارە خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێنابوو)، سەرجەم ئەمانە ئاگایان لەم ناوە نەبوو. بگرە ئەگەر هەستیشیان پێ بکردایە، زۆر دژوار بوو بتوانن پێوەندییەک لە نێوان ناوەکە و (نمایش)ەکەدا کە وەکو سەرجەم خەڵکی شار سەیریان دەکرد و زۆر شتی لێ تێ نەدەگەیشتن، دابنێن.

دوای تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر یەکەمین و دوایین نیشاندانیدا، کاسێتی (تراژیدیا لە قارسدا)م لە ئەرشیفی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) دەرهێنا و سەیرم کرد، بەڵام کورتکردنەوەی نیوەی یەکەمی نمایشەکە کارێکی زۆر دژوارە. لە شارەدێیەکی (دواکەوتوو، هەژار و لانەی گەوجان)دا کێشەیەکی تۆڵەسەندنەوە لە گۆڕێدایە، بەڵام هیچ باسی ئەوە ناکرێ بۆچی مرۆڤەکان یەکدی دەکوژن و دیار نییە ناکۆکیی نێوانیان چییە. نە بکوژان و نە قوربانییەکانیش کە وەکو مێش دەکوژرێن،

هیچ پرسیارێک لەو بارەیەوە ناکەن. تەنیا سونایە لە پای ئەوەی خوویان داوەتە شتێکی پاشڤەڕۆیانەی وەکو تۆڵەسەندنەوە، لە خەڵک تووڕەیە، لەمبارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ ژنەکەیدا دەکات و بەدوای ژنێکی تری تێگەیشتوو و لاو (قەدیفە)دا دەگەڕێ. سونای لە نمایشەکەدا وەکو کەسێکی دەوڵەمەند و خاوەن دەسەڵات دەردەکەوێ، بەڵام لەگەڵ خەڵکە هەژارەکەیشدا سەما دەکات، گاڵتە دەکات، ژیرانە سەبارەت بە واتای ژیان دەدوێ و بەشێوەی نمایش لە نمایشدا چەند پەردەیەک لە شانۆنامەکانی شکسپیر، ڤیکتۆر هۆگۆ و برێشت بۆ نمایش دەکات. هەروەها چەند دیمەنێکی فێرکاری سەبارەت هاتوچۆی شار، جۆشی داگیرکاریی فەرەنسا، سوودەکانی کوتان و کۆندۆم و عارەق، سەمای سۆزانیی دەوڵەمەند، شامپۆ و کۆزمەتیک کە بەجۆرێک نیشان دەدران وەکو ئەوەی جگە لە ئاوی ڕەنگکراو هیچی تر نەبن، بە شێوەیەکی نارێک لێرە و لەوێدا دەهاتنە ناو نمایشەکەوە.

دیمەنە کۆمیدی و سەرپێییەکان کە جاروبار دەهاتنە ناوەوە، نمایشەکەیان بەتەواوی شێواندبوو. توانای نواندنی سونای تاقە شتێک بوو کە ڕایەڵەی نمایشەکەی پێکەوە گرێ دەدا و بینەرانی قارسی بە شانۆکەوە دەبەستەوە. لەو جێیانەدا کە نمایشەکە قورس دەبێ، بە شێوازگەلێک کە باشترین سەردەمەکانی نواندنی خۆی بیردەخاتەوە، تووڕە دەبێ، حساب لەو کەسانە دەخوازێ کە وڵات و میللەتیان بەو ڕۆژە گەیاندووە، بە جووڵەیەکی تراژیدی، لەمپەڕی شانۆوە دەڕوات بۆ ئەوپەڕ و لەو نێوانەیشدا بیرەوەرییەکانی تافی لاوی، باس لە نووسینەکانی مۆنتاین سەبارەت بە هاوڕێیەتی دەکات، یاخۆ باسی ئەوە دەگێڕێتەوە کە ئەتاتورک چەند تەنیا باڵ بووە. دەموچاوی نوقمی عەرەق بووە. مامۆستا نووریە خانمی شەیدای شانۆ و مێژوو کە بە عەشقەوە سەیری نمایشەکەی دوو شەو لەوەوبەری کردبوو، دوای چەندین ساڵ پێی گوتم دانیشتووانی ڕیزی پێشەوە زۆر بە باشی دەیانتوانی هەست بەو بۆنی عارەقە بکەن کە لە دەمی سونایەوە دەهات. بەبۆچوونی ئەو، ئەو هونەرمەندە مەزنە سەرخۆش نەبووە، بەڵکو لە دۆخی جۆشداندا بووە. سەرجەم ئەوانەی لە ماوەی دوو ڕۆژدا هەموو مەترسییەکەیان لەبەرچاو گرتبوو بۆ لە نزیکەوە بینینی، فەرمانبەرانی تەمەن مامناوەندیی سەر بە دەوڵەت کە هەموویان شەیدای



سونای بوون، توێژی بێوەژنان، لاوانی ئەتاتورکچی کە هەر لە ئێستاوە سەدان جار لە تەلەفزیۆندا سەیری دیمەنەکانیان کردبوو، پیاوانی ئارەزوومەندی سەرچڵی و دەسەڵات و هەموو ئەوانەی لە ڕیزەکانی پێشەوە دانیشتبوون، دەیانگوت لەو کاتەدا تیشک و تیرێژێک لە چاوی سونایەوە پەخش بووە، بەجۆرێک تەماشاکردنی چاوەکانی کاری لە کردننەهاتوو بووە.

مەسعودیش کە یەکێک بوو لەو قوتابییانەی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان کە بەزۆر بە ئۆتۆمبیلی سەربازی بۆ هۆڵی شانۆی گەل هێندرابوون (ئەو کەسە بوو کە لە دژی بەخاکسپاردنی ئەتایست و باوەڕمەندان لە هەمان گۆڕستاندا بوو)، چەندین ساڵ دواتر پێی گوتم لە سونایدا هەستی بەو هێزی کێشکردنە کردووە. پێ دەچوو ئەم دانپێدانانەی لەوەوە بووبێ کە دوای چوار ساڵ کارکردن لە ناو گرووپێکی ئیسلامیی چەکداری بچووکدا لە ئەرزەروم تووشی خەیاڵشکاندن بووبوو، گەڕابووەوە قارس و لە چایخانەیەکدا دەستی بەکار کردبوو. بەبۆچوونی ئەو، دۆخێکی دژواری لە شیکردنەوەنەهاتوو لاوانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی بە سونایەوە گرێ دەدا. ڕەنگە لەبەر دەسەڵاتی ڕەهای سونای بووبێ کە ئەمان خۆیان عەوداڵی بوون. یاخۆ بەو قەدەغەکردنانەی کە ڕای گەیاندبوو، ئەوانی لە گرفتێکی مەترسیداری وەکو یاخیبوون ڕزگار کردبوو. پێی گوتم: "ڕاستییەکەی، هەموو کەسێک لە دوای کودەتا سەربازییەکان لە ناخی خۆیدا دڵخۆش دەبێ." بەبۆچوونی ئەو، سونای سەرباری ئەو هەموو دەسەڵاتەی کە هەیبوو، دەچووە سەر شانۆ و ناخی خۆی لەبەردەم بینەراندا ڕادەخست و ئەمەیش کاریگەریی لەسەر لاوان دادەنا.

کاتێک منیش دوای ساڵانێکی درێژ سەیری کاسێتەکانی ئەرشیفی (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس)م کرد، هەستم کرد چۆن لە هۆڵەکەدا ناکۆکی و ناتەبایی نێوان باوک و کوڕ، دەسەڵات و تاوانباران وەلا نراوە و هەرکەسە لە بێدەنگییەکی قوڵدا نوقمی بیرەوەرییە ترسناکەکان و ئومێدی خۆی بووە. هەستم بە بوونی (ئێمە)یەکی ئەفسووناویی ئەوتۆ کرد کە مەگەر هەر دانیشتووانی ئەو وڵاتانەی لە ژێر گوشار و شەپۆلی میللەتگەرایی توندان، لێی تێ بگەن. وەکو ئەوە وابوو لە سایەی سونایدا

هیچ کەسێک لە هۆڵەکەدا (بێگانە) نەبێ، بەسەرهاتێکی هاوبەش، نائومێدانە هەمووانی پێکەوە بەستبووەوە.

ئەو هەستە بەهۆی قەدیفەوە کە قارسییەکان بە هاتنە سەر شانۆی ئەو ڕانەهاتبوون، تێک چوو. وێ دەچوو کامێرامانی وەشانی زیندووی تەلەفزیۆنیش پەی بەم ڕاستییە بردبێ، بۆیە بەردەوام سونای دەخستە زوومەوە و خۆی لە قەرەی قەدیفە نەدەدا. بینەرانی قارس قەدیفەیان تەنیا وەکو خزمەتکارێکی ناو شانۆی کۆمیدیی بلوارەکان کە خزمەتی دەسەڵاتدارانی ڕووداوئافرێن دەکات، دەبینی. ئەمە لە کاتێکدا لەبەرئەوەی هەر لە نیوەڕۆوە ڕاگەیەنرابوو کە قەدیفە لە نمایشی ئەم ئێوارەیەدا سەری ڕووت دەکات، بینەران پەرۆشی زانینی کاردانەوەکانی بوون. چەندین دەمگۆی لە جۆری ئەوەی قەدیفە لە ژێر گوشاری سوپادا ئەم کارە دەکات و نایەتە سەر شانۆ، بڵاو کرابووەوە. ئەوانەیشی کە شتێکیان سەبارەت بە تێکۆشانی کچانی سەرپۆش بەسەر بیستبوو و بەهیچ جۆرێک گوێیان لە ناوی نەبووبوو، لە ماوەی نیو ڕۆژدا قەدیفەیان ناسیبوو، بۆیە کاتێک لە سەرەتادا بە جلوبەرگێکی سوور و درێژی ئاودامانەوە بە پۆشتەیی و سەرداپۆشراوی هاتە سەر شانۆ، زۆر کەس تووشی خەیاڵشکاندن بوون.

سەرەتا لە دیالۆگێکی نێوان سونای و قەدیفەدا لە خولەکی بیستەمی نمایشەکەدا زاندرا کە داخوازێک ڕووبەڕووی قەدیفە دەکرێتەوە: لە کاتێکدا تەنیا هەر خۆیان لەسەر شانۆ بوون، سونای پرسیاری "پێداگرتن یان دانەگرتن"ی لێ دەکات، پێی دەڵێ: "تووڕەبوونت لە کەسانی تر و خۆکوشتنت بە پەسەندنەکراو دەزانم."

قەدیفەیش لە وەڵامدا دەڵێ: "لە کاتێکدا پیاوانی ئەم شارە وەکو ئاژەڵ یەکدی دەکوژن و دەڵێن گوایە ئەمەیان لە پێناوی کامەرانیی شاردایە، کێ گوێ بە خۆکوشتنی من دەدات." ئەمە دەڵێ و ڕا دەکات، وەکو ئەوەی بیەوێ لە دەست فوندا ئەسەر هەڵبێ کە لەو کاتەدا دێتە سەر شانۆ.

دوای چوار ساڵ لە قارس گوێم لە هەرکەسێک گرت کە توانبێتم سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەو ئێوارەیە لەگەڵیدا بدوێم، سەعاتم بە دەستەوە گرت و هەوڵم دا ڕووداوەکان خولەک بە خولەک ڕیز بکەم، گەیشتمە ئەو ئاکامەی کاتێک قەدیفە ئەو



دیالۆگەی لەسەر شانۆ گوتووە، شینە بۆ دواجار ئەوی لەسەر پەردەی تەلەفزیۆن بینیووە. چونکە بەپێی قسەی دراوسێکان کە باسی هێرشەکەیان بۆ گێڕامەوە و بەگوێرەی قسەی ئەو کارمەندانەی ئاسایش کە هێشتا لە قارس دەوامیان دەکرد، لەو دەمەیدا لە دەرگا دراوە، شینە و خەندە سەیری تەلەفزیۆنیان کردووە. بەپێی ڕاگەیاندنی فەرمی، کاتێک شینە هێزەکانی ئاسایش و سەربازەکان دەبینێ، ڕادەکاتە ژوورێ، چەکەکەی دەردێنێ و دەست بە تەقە دەکات. بەڵام بەگوێرەی گێڕانەوەی هاوسێکان و هەندێک لە لاوانی ئیسلامی کە لە ماوەیەکی کورتدا ئەفسانەیەکیان لە شینە خوڵقاندبوو، شینە هاواری کردووە: "تەقە مەکەن!" ویستوویەتی خەندە ڕزگار بکات، بەڵام ئەندامەکانی تیمی تایبەت بە فەرماندەیی ز. دەمیرکۆڵ کە بە خانووەکەدا بڵاوەیان لێ کردبوو، لە ماوەی خولەکێکدا نەک هەر شینە و خەندە، بگرە هەموو خانووەکەیان کردبوو بە بێژەنگ. سەرباری ئەو هەموو هەرا و ئاژاوەیە، جگە لە چەند منداڵێکی بەپەرۆش، هیچ کەسێک لە ماڵە دراوسێکان بایەخی بە ڕووداوەکە نەدابوو. ئەمە تەنیا لەبەرئەوە نەبوو کە قارسییەکان لەسەر ئەم جۆرە شەو بەسەردادانە ڕاهاتبوون، بەڵکو بەشێکی لەبەرئەوە بوو ئیدی کەس تاقەتی نەبوو جگە لە وەشانی زیندووی نمایشەکەی هۆڵی شانۆی گەل، خۆی بە شتی ترەوە خەریک بکات. هەموو شۆستەکان چۆڵ بوون، سەرجەم دەرابەکان دادرابوونەوە، چەند دانەیەک نەبێ، سەرلەبەری چایخانەکان داخرابوون.

سونای دەیزانی هەموو نیگاکانی شار لە سەر ئەون و ئەمەیش متمانە و هێزێکی بێ سنووری پێ بەخشیبوو. قەدیفە لەبەرئەوەی دەیزانی بێ مۆڵەتی سونای لەسەر شانۆ جێی نابێتەوە، زیاتر خۆی لێ نزیک دەخستەوە. هەستی دەکرد تەنیا بە سوودوەرگرتن لەو هەلانەی کە سونای بۆی دەڕەخسێنێ، دەتوانێ ئەرکی خۆی ڕابپەڕێنێ. دواتر، لەبەرئەوەی بە پێچەوانەی دادەیەوە خۆی لە قسەکردن دەربارەی ئەو ڕۆژانە دەدزییەوە، کارێکی دژوار بوو بزانم لەو ساتانەدا چی بە خەیاڵیدا تێ پەڕیوە. بینەرانی قارس کە لە دواین چل خولەکی نمایشەکەدا حاڵی دەبن قەدیفە سوورە لەسەر خۆکوشتن و سەر ڕووتکردن، هێدی هێدی شەیدای دەبن. سەرەتا بەهۆی هاتنەوەی قەدیفە بۆ سەر شانۆ و دواتر بەهۆی تووڕەییی نیمچە فێرکاری و

نیچمە بە هاتوهاواری سونای و فوندا ئەسەرەوە، نمایشەکە زیاتر بەرەو درامایەکی قورس دەچوو. بینەران تێ گەیشتبوون قەدیفە ڕۆڵی ژنێک دەبینێ کە لە تاو گوشاری پیاوان بڕستی لەبەر بڕاوە و ئامادەیە هەموو شتێک بکات. سەرباری ئەوەی ناسنامەی "قەدیفەی کچی سەرپۆش بەسەر" هێشتا بەتەواوی لە بیر نەکرابوو، کەسانێک کە بیست ساڵانێکی درێژ بوو بۆ قەدیفە غەمبار بوون، دواتر پێیان گوتم ڕۆڵی قەدیفە لە نمایشەکەدا لە دڵی قارسییەکاندا جێگای خۆی کردبووەوە. ئیدی کاتێک قەدیفە دەهاتە سەر شانۆ، بێدەنگییەکی قووڵ دەستی پێ دەکرد، لە ماڵانیش خێزانەکان بەدەم سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە بەدوای قسەکانیدا لە یەکتریان دەیانپرسی: "چی گوت، چی گوت؟"

لە یەکێک لەو ساتانەی بێدەنگیدا، دەنگی فیکەی یەکەم شەمەندەفەر بیسترا کە ماوەی چوار ڕۆژ بوو یەکەم جار قارسی بەجێ دەهێشت. سەربازەکان (کا)یان بەزۆر لە واگۆنێک سوار کردبوو. هاوڕێ خۆشەویستەکەم کاتێک بینیبووی وا ئۆتۆمبیلە سەربازییەکە گەڕایەوە و ئیپەکی لێ دانەبەزی و تەنیا جانتاکەی هاتووە، لای سەربازەکان پێ لەسەر بینینی ئیپەک دادەگرێ، کاتێک مۆڵەتی ئەمەی پێ نادەن، قایلیان دەکات سەرلەنوێ ئۆتۆمبیلەکە بۆ هوتێلەکە بنێرنەوە، دوای گەڕانەوەی ئۆتۆمبیلەکە بێ ئیپەک، لە ئەفسەرەکان دەپاڕێتەوە شەمەندەفەرەکە بۆ ماوەی پێنج خولەک ڕابگرن، کاتێک ئیپەک پەیدا نابێت و شەمەندەفەرەکە فیکەی کەوتنەڕێ لێ دەدات، (کا) دەست بە گریان دەکات. لەگەڵ جووڵەی شەمەندەفەرەکەدا چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی دەبڕێتە ئاپۆڕەی سەر شۆستەی وێستگاکە، سەیری ئەو دەرگایەی وێستگاکە دەکات کە بەسەر پەیکەرەکەی کازم قەرەبەکردا دەڕوانێ، بەدوای ژنێکی باڵابەرزی جانتا بەدەستدا دەگەڕا کە پێشبینیی دەکرد بەرەو لای ئەم بێت.

لەگەڵ خێراتربوونی شەمەندەفەرەکەدا، جارێکی تر دەنگی فیکەکەی بیسترا. لەو ساتەدا ئیپەک و تورگوت بەگ لە هوتێلی بەفرپالاسەوە بەرەو هۆڵی شانۆی گەل دەڕۆیشتن. تورگ بەگ گوتی: "شەمەندەفەر بەڕێوەیە." ئیپەک گوتی: "بەڵێ، ڕێگاکان بە زوویی دەکرێنەوە. پارێزگار و فەرماندەی یەکەی سوپا دەگەڕێنەوە بۆ شار." هەندێ شتی تریشی سەبارەت بە کۆتایی هاتنی ئەم کودەتا سەربازییە قۆڕە و



ئاساییبوونەوەی باردۆخ گوت، بەڵام لەبەرئەوەی نەبوو ئەو قسانەی بەلاوە گرنگ بێ، بەڵکو هەستی دەکرد ئەگەر بێدەنگ بێ، باوکی وا دەزانێ ئەم بیر لە (کا) دەکاتەوە. خۆیشی بەتەواوی نەیدەزانی چەندی هۆشی لەسەر (کا) و چەندی لەسەر کوژرانی شینەیە. ئازارێکی زۆر بەهێزی لە دەستدانی هەلێکی بەختەوەری و ڕقێکی توند لە (کا) لە ناخیدا بوو. زۆر بە کەمی گومانی لە هۆیەکانی تووڕەبوونەکەی دەکرد. دوای چوار ساڵ لە قارس بە نارەزای دڵ ئەو هۆیانەی لەگەڵ مندا تاوتوێ کرد و پرسیار و گومانەکانم بێزاریان دەکرد. پێی گوتم یەکسەر تێ گەیشتووە کە لەو شەوە بەدواوە مەحاڵە بتوانێ چیدی (کا)ی خۆش بوێ. کاتێک فیکەی ئەو شەمەندەفەرە لێ درا کە (کا)ی لە قارس دوور دەخستەوە، ئیپەک لە بەرامبەر (کا)دا تەنیا هەستی بە دڵشکاوی دەکرد؛ لەوانەیە کەمێکیش سەرسووڕمان. گرفتی سەرەکیی ئەو لەم کاتەدا، دابەشکردنی غەمەکانی بوو لەگەڵ قەدیفەدا.

تورگوت بەگ هەستی کرد کچەکەی لە بێدەنگی بێزار بووە، گوتی: "دەڵێی شار چۆڵ کراوە."

ئیپەک هەر بۆ ئەوەی شتێک بڵێ، گوتی: "شاری تارمایی و خێوە."

کاروانێکی سەربازیی پێکهاتوو لە سێ ئۆتۆمبیل لە گۆشەکە پێچیان کردەوە و بە بەردەمی ئەماندا تێ پەڕین. تورگوت بەگ گوتی ئەم ئۆتۆمبیلانە بەهۆی کرانەوەی ڕێگا و بانەکانەوە توانیویانە بگەنە ئێرە. باوک و کچ بۆ خۆخەریککردن سەیری تیشکی گڵۆپی ئۆتۆمبیلەکانیان کرد کە لە تاریکیی شەودا ون بوون. بەپێی لێکۆڵینەوەکانی دواترم، تەرمی شینە و خەندە لە ئۆتۆمبیلە جێمسییەکەی ناوەڕاستدا بووە.

تورگوت بەگ لەبەر ڕۆشناییی تیشکی لایتە خوار و خێچەکانی جێبەکەدا کە لە دواداوەی کاروانەکەدا بوو، لە جامخانەی نووسینگەی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)دا چاپی سبەینێی ڕۆژنامەکەی بە هەڵواسراوی بینی؛ ڕاوەستا و خوێندیەوە: "مردن لەسەر شانۆ. ئەکتەری ناسراو سونای زایم دوێنێ لەسەر شانۆ کەوتە بەر هێرش و کوژرا."

دوای دوو جار خوێندنەوەی هەواڵەکە، بە هەنگاوی خێرا بەرەو هۆڵی شانۆی گەل بەڕێ کەوتن. لە بەردەم دەرگای هۆڵەکەدا هەمان ئۆتۆمبیلەکانی پۆلیس و لە خوارتریشەوە سێبەری هەمان تانک بەدی دەکرا. لە چوونە ژوورەوەیاندا پشکێندران. تورگوت بەگ گوتی کە "باوکی ژنە ئەکتەری سەرەکییە." پەردەی دووەم دەستی پێ کردبوو، لە ڕیزی دواوە دوو کورسیی چۆڵیان دۆزیەوە و دانیشتن.

لەم پەردەیەدا هێشتا چەند دیمەنێکی گاڵتەجاڕی و کەیف و سەفا دەبینرا کە سونای بەدرێژاییی ساڵانی ڕابردوو بەرهەمی هێنابوو: بگرە فوندا ئەسەر کورتە سەمایەکی گاڵتەجاڕانەیشی کرد. بەڵام هەوای نمایشەکە زۆر قورس بووبوو و بێدەنگی باڵی بەسەر شانۆکەدا کێشابوو. قەدیفە و سونای ئیدی زوو زوو بەتەنیا لەسەر شانۆ دەمانەوە.

سونای گوتی: "هەمدیسان پێویستە بۆم ڕوون بکەنەوە بۆچی خۆتان دەکوژن."

قەدیفە گوتی: "مرۆڤ ئەمە بەتەواوی نازانێ."

"چۆن؟"

قەدیفە گوتی: "ئەگەر مرۆڤ هۆی تەواوی خۆکوشتنی بزانیبا و ئەو هۆیەی بە ڕوونی بخستایە بەردەست، هەرگیز خۆی نەدەکوشت."

سونای زایم گوتی: "یاهو، هیچ وا نییە. هەندێک ژن لەتاو عەشق خۆیان دەکوژن، بڕێکیشان لەبەرئەوەی بەرگەی تێهەڵدانی مێردەکانیان ناگرن یاخۆ بەهۆی ئەوەی هەژاری وەکو چەقۆ ئێسکیان دەبڕێتەوە."

قەدیفە گوتی: "ئێوە زۆر بەسادەیی بۆ ژیان دەڕوانن. مرۆڤ لەبری ئەوەی لەتاو عەشق خۆی بکوژێ، چاوەڕێ دەکات تا کاریگەریی عەشق کەمتر دەبێتەوە. هەژاریش هۆیەک نییە کە بەشی خۆکوشتن بکات."

"باشە هۆی ڕاستەقینە چییە؟"

"بێگومان هۆی سەرەکیی هەموو خۆکوشتنەکان شەرەفە. بەلانی کەمەوە ژنان لەو پێناوەدا کۆتایی بەژیانی خۆیان دەهێنن!"





"لەبەرئەوەی لە عەشقدا شەرەفیان شکێندراوە؟"

قەدیفە گوتی: "هەر هیچ تێ ناگەن! ژنان لەبەرئەوە خۆیان ناکوژن کە شەرەفیان شکێنراوە، بەڵکو دەیانەوێ بە خۆکوشتنیان نیشانی بدەن چەندە شەرەفمەندن."

"ئایا لە سۆنگەی ئەم هۆیەوەیە هاوڕێکانتان خۆیان دەکوژن؟"

"من بەناوی ئەوانەوە نادوێم. هەرکەسە هۆی تایبەت بەخۆی هەیە. بەڵام هەر جارێک کە بیر لە خۆکوشتنی خۆم دەکەمەوە، هەست دەکەم ئەوانیش وەکو من بیر دەکەنەوە. ساتەکانی خۆکوشتن باشترین کاتن بۆ تەنیاییی ژنان و بۆ ئەوەی هەست بە ژنێتیی خۆیان بکەن."

"ئایا بەم قسانەتان هانی هاوڕێکانتان دەدا بۆ خۆکوشتن؟"

"ئەوان بە بڕیاری ئازادانەی خۆیان کۆتاییيان بە ژیانی خۆیان هێنا."

"هەموو کەسێک دەزانێ لە قارس هیچ کەسێک خاوەن بڕیاری ئازادی خۆی نییە، هەموو کەسێک لە بەر تێ هەڵدان هەڵدێ و بۆ خۆپاراستن خۆی دەخزێنێتە ناو گرووپێکی دیاریکراوەوە. قەدیفە، دانی پێدا بنێن کە بە دزییەوە لەگەڵیاندا ڕێک کەوتوون و ژنانتان بۆ خۆکوشتن هان داوە."

قەدیفە گوتی: "بەڵام چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەوانەی خۆیان دەکوژن، زیاتر تاق دەکەونەوە. هەندێک لە باوکان حاشایان لە کچە خۆکوشتووەکانیان کرد، بگرە نوێژی مردوو بۆ هەندێکیان هەر نەکرا."

"ئایا ئێستا ئێوە بۆیە خۆتان دەکوژن بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە خۆکوژان تەنیا نین و دەستە و تاقمی پێکەوە گرێ دراون؟ قەدیفە، بێدەنگن... بەڵام پێتان وا نییە پەیامەکەتان بە هەڵە لێک بدرێتەوە ئەگەر بێت و ڕوونی نەکەنەوە کە بۆچی وا دەکەن؟"

قەدیفە گوتی: "من نامەوێ بە خۆکوشتنی خۆم پەیامێک ڕابگەیەنم."

"سەرباری ئەوەیش ئەو هەموو بینەرە سەیر دەکەن، بە پەرۆشن. هەر هیچ نەبێ شتێک بڵێن کە ئێستا بە خەیاڵتاندا دێ."

قەدیفە گوتی: "ژنان بەهیوای دەستکەوت خۆیان دەکوژن. پیاوانیش کاتێک خۆیان دەکوژن کە دەبینن ئومێدی دەستکەوتیان نەماوە."

سونای گوتی: "ئەمە ڕاستە." دەمانچەیەکی (کرککالە)ی لە گیرفانی دەرهێنا. هەموو بینەرانی ناو هۆڵەکە نیگایان خستە سەر بریسکانەوەی چەکەکە. "ئایا پاش ئەوەی دڵنیا بوون کە بەتەواوی دۆڕاوم، بەمە گوللەبارانم دەکەن؟"

"نامەوێ بکەومە زیندان."

سونای گوتی: "ئەدی هەرچۆنێک بێ ئێوەیش دواتر خۆتان ناکوژن؟ بەو پێیەی بە خۆکوشتنتان دەچنە دۆزەخەوە، ئیدی پێویست ناکات نە لە سزای ئەم دنیا و نە لە ئاگری ئەو دنیا بترسن."

قەدیفە گوتی: "ژن تەواو لەو پێناوەدا خۆی دەکوژێ. بۆ خۆدزینەوە لە هەموو جۆرە سزایەک."

سونای بە کەش و فشێکەوە ڕووی لە بینەران کرد و گوتی: "کاتێک لە دۆڕانی خۆم دڵنیا دەبم، دەمەوێ کۆتاییی ژیانم لەسەر دەستی ژنێکی لەم بابەتە بێ." کەمێک بێدەنگ بوو. دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتێک دەربارەی لێهاتوویی ئەتاتورک. ڕێک لە کاتی خۆیدا درکی کرد کە بینەران وا خەریکن بێزار دەبن.

لەگەڵ تەواوبوونی پەردەی دووەمدا تورگوت بەگ و قەدیفە چوونە پشت پەرەدەکانەوە و قەدیفەیان دۆزیەوە. ژوورە پان و بەرینەکە کە سەردەمانێک ئامادەبوونی ئاکرۆباتەکانی لە مۆسکۆ و پەترسبۆرگەوە هاتوو، شانۆکارانی ئەرمەنی کە (مۆلێر)یان نمایش دەکرد، سەماکارانی گەڕیدەی ڕووسیا و مۆزیسیەنەکانی بەخۆیەوە بینیبوو، ئێستا سارد و سڕ بوو.

قەدیفە بە ئیپەکی گوت: "وام دەزانی دەڕۆی."

تورگوت بەگ قەدیفەی لە ئامێز گرت و گوتی: "شانازیت پێوە دەکەم گیانەکەم. زۆر باش بووی! ئەگەر چەکەکەی بدایەتە دەستت و بیگوتبا -تەقەم لێ بکە-، هەڵدەستامە سەرپێ و هاوارم دەکرد -نمایشەکە ڕابگرن، قەدیفە نەکەی تەقەی لێ بکەی-."



"بۆچی؟"

تورگوت بەگ گوتی: "لەبەرئەوەی لەوانەیە چەکەکە فیشەکی تێدا بێ." باسی ئەو هەواڵەی بۆ گێڕایەوە کە لە ژمارەی سبەینێی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)دا خوێندبوویەوە. پاشان گوتی: "لەوە ناترسم ئەو هەواڵانەی کە سەردار پێشتر بە هیوای ڕاست دەرچوونیانەوە دەیانووسێ، ڕاست دەربچن، چونکە زۆربەی ئەو هەواڵانە ڕاست دەرناچن. بەڵام لەبەرئەوەی دەزانم سەردار بێ ڕەزامەندیی سونای ناتوانێ هەواڵێکی لەو جۆرە بنووسێ، نیگەرانم. دیارە سونای هەواڵەکەی پێ بە نووسین داوە. دەکرێ ئەمە ڕێکلامێک بێ، لەوانەیشە بیەوێ لەسەر شانۆ خۆی بە دەستی تۆ بە کوشت بدات. کچی شیرینم، تا دڵنیا نەبی لە بەتاڵبوونی، نەکەی ڕووی چەکی تێ بکەی! لەبەر ئەو کابرایەش سەرت ڕووت مەکە. ئیپەک ناڕوات. ماوەیەکی درێژتر لەم شارە دەژین، بە خوتوخۆڕایی ئیسلامییەکانمان لێ مەوروژێنە."

"بۆچی ئیپەک لە ڕۆیشتن پاشگەز بووەوە؟"

تورگوت بەگ دەستی قەدیفەی گرت و گوتی: "چونکە باوکی و تۆ و خێزانەکەمانی زیاتر خۆش دەوێ."

ئیپەک گوتی: "بابە گیان، دەتوانین هەمدیسان بەتەنیا قسە بکەین؟" لەگەڵ گوتنی ئەم قسەیەدا بینی تارماییی ترسێک بە ڕووی قەدیفەوە نیشتووەتەوە. تورگوت خۆی گەیاندە سونای و فوندا ئەسەر کە لەوبەری ژوورە بنمیچ بەرز و بە تۆز داپۆشراوەکەوە هاتنە ژوورەوە. ئیپەک بەتەواوی هێزەوە قەدیفەی لە ئامێز گرت و بە خۆیەوە نووساند. بینی ئەم ڕەفتارەی ترسی لە دڵی خوشکەکەیدا چاند، دەستی گرت و پەلکێشی کرد بۆ بەشێکی تایبەت کە بە پەردە جیا کرابووەوە. فوندا ئەسەر شووشەیەک کۆنیاک و چەند لێوانێکی بەدەستەوە بوو و لەوێوە دەرچوو.

فوندا ئەسەر گوتی: "قەدیفە، زۆر باش بووی. فەرموون پشوویەک بدەن."

قەدیفە تا دەهات بێهیواتر دەبوو، ئیپەک داینیشاند. چاوی بڕیە ناو چاوەکانی و بە نیگایەوە، وەکو بڵێ هەواڵێکی خراپم پێیە، سەیرێکی کرد. دواتر گوتی: "لە پەلامارێکدا شینە و خەندەیان کوشتووە."

قەدیفە بۆ ساتێک نیگاکانی خۆی ئاراستەی ناوەوە کرد و گوتی: "لە هەمان ماڵدا بوون؟ کێ گوتی؟" بەڵام کە نیشانەی سووربوونی سەر ڕووخساری ئیپەکی بینی، بێدەنگ بوو.

"فازیلی قوتابیی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان گوتی. دەستبەجێ بڕوام پێ کرد، چونکە بە چاوی خۆی بینیبووی... ساتێک بێدەنگ بوو تاکو قەدیفە کە ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو، هەواڵەکە وەربگرێ، پاشان بەپەلە درێژەی بە قسەکانی دا: "(کا) بە شوێنی شینەی دەزانی، دوای بینینی تۆ بۆ هوتێل نەگەڕابووەوە. پێم وابی (کا) شوێنی خۆحەشاردانی شینە و خەندەی بۆ تیمی تایبەت ئاشکرا کردبێ. بۆیە لەگەڵیدا نەچووم بۆ ئەڵمانیا."

قەدیفە گوتی: "بە چیدا دەزانی؟ لەوانەیشە ئەو نەبێ، کەسێکی تر زمانی لێ دابن."

"لەوانەیشە، بیرم لەوەیش کردەوە، بەڵام دڵم هێندە بەهێز پێم دەڵێ کە (کا) زمانی لێ داون، بەجۆرێک بە عەقڵ ناتوانم باوەڕ بەخۆم بهێنم کە ئەو زمانی لێ نەدابن. لەبەرئەوەی حاڵی بووم کە ناتوانم خۆشم بوێ، لەگەڵیدا نەچووم بۆ ئەڵمانیا."

قەدیفە چیدی هێزی ئەوەی نەبوو گوێ لە ئیپەک بگرێ. ئیپەک هەستی کرد خوشکەکەی لەو کاتەدا بەتەواوی مردنی شینەی دەرک کردووە.

قەدیفە دەموچاوی خستە نێوان لەپی دەستەکانی و بەدەم هەنسکدانەوە دەستی بە گریان کرد. ئیپەکیش باوەشی پێدا کرد و گریا. ئیپەک بێدەنگ دەگریا و بە گۆشەیەکی هۆشی هەستی دەکرد لەگەڵ خوشکەکەیدا بۆ هەمان مەبەست دەگرین. سەردەمانێکیش کە هیچیان ئامادەنەبوون دەستبەرداری شینە بن و لە سۆنگەی کێبەرکێ لەگەڵ یەکتردا شەرمیان لە یەکدی دەکرد، چەند جارێک گریابوون. ئیپەک هەستیدەکرد ئێستا هەموو شەڕ و کێشەکان کۆتاییان پێ هاتووە: قارس بەجێ ناهێڵێ، ساتێک هەستی کرد کە پیر بووە. ڕازیبوون و پیربوون، ژیربوون تا ڕادەی هیچ نەویستن لە ژیان: هەستی کرد ئەمانەی بۆ دەکرێ.

ئێستا زیاتر بۆ قەدیفە نیگەران بوو کە بە کوڵ دەگریا. دەیبینی خوشکەکەی



ئازارێکی قووڵتر و ماڵوێرانکەرتر لەوەی ئەم دەچێژێ. لە پای ئەوەی لە دۆخی ئەودا نەبوو، هەستێکی سوپاس -یاخۆ تامی تۆڵەکردنەوە- بە هەناویدا تێ پەڕی و یەکسەریش شەرمی بەخۆیدا هاتەوە. کارمەندانی هۆڵی شانۆی گەل لە پشووەکاندا هەمان موزیکیان دەخستە سەر کە پێیان وابوو بینەران حەزی لێ دەکەن و ئەمەیش فرۆشی گازۆز و نۆکی کولاو دەباتە سەرێ. لە ناو هۆڵەکەدا گۆرانی(come Baby, closer, closer to me) دەبیسترا کە لە ساڵانی تافی لاویدا لە ئەستەمبوڵ گوێیان لێ دەبوو. ئەو سەردەمانە هەردووکیان دەیانویست بە باشی فێری ئینگلیزی ببن؛ بەڵام بۆیان نەچووبووە سەر. ئیپەک بینی گریانی خوشکەکەی لەگەڵ بیستنی گۆرانییەکەدا زیاتر تاوی سەند. ئیپەک لە نێوان پەردەکانەوە باوکی بینی کە لەوسەری ژوورە نیمچە تاریکەکەدا لەگەڵ سونایدا سەرگەرمی قسە بوون و فوندا ئەسەریش بە شووشەیەک کۆنیاک و چەند پەرداخێکەوە لێیان نزیک کەوتەوە.

ئەفسەرێکی تەمەن مامناوەندی بەهێزەوە پەردەکەی لادا و گوتی: "قەدیفە خانم، من ئالبای عوسمان نووری چۆلاکم." لەسەر شێوازی ناو فیلمەکان تا سەر زەوی خۆی چەماندەوە و سڵاوی لێ کرد. "خانمە سەنگینەکەم، ئایا چۆن دەتوانم لە خەمتان کەم بکەمەوە؟ ئەگەر ناتانەوێ بچنە سەر شانۆ، ئەوا دەتوانم ئەم مزگێنییەتان بدەمێ: ڕێگاوبانەکان کراونەتەوە، هێزە سەربازییەکان کەمێکی تر دێنە شارەوە."

دواتر عوسمان نووری چۆلاک لە دادگای سەربازیدا ئەم قسانەی خۆی وەکو بەڵگە بۆ پاراستنی شار لە ئەفسەرە کودەتاچییەکان بەکارهێنابوو.

قەدیفە گوتی: "لە هەموو ڕوویەکەوە باشم. سوپاستان دەکەم بەڕێزم."

ئیپەک هەستی کرد ڕەفتارەکانی قەدیفە هەر لە ئێستاوە کەمێک لە هەڵسوکەوتی دەستکردانەی فوندا ئەسەری پێوە دیارە. لەلایەکیش بەو هەوڵەی سەرسام بوو کە بۆ هەستاندنەوەی قەدیفە بە خەرجی دا. قەدیفە بەزۆر لەخۆکردنەوە هەستایە سەرپێ؛ لێوانێک ئاوی خواردەوە، وەکو تارماییەک ئەمسەر و ئەوسەرێکی ژوورە پان و بەرینەکەی پشت پەردەوەکەی کرد.

لەگەڵ دەست پێکردنی پەردەی سێیەمدا، ئیپەک هەوڵی دا قەدیفە دوور بخاتەوە و نیشانی باوکی نەدا، بەڵام تورگوت بەگ هاتە بەرەوە و گوتی: "مەترسە." مەبەستی سونای و هاوڕێکانی بوو: "ئەوانە مرۆڤی هاوچەرخن."

فوندا ئەسەر لە سەرەتای پەردەی سێیەمدا گۆرانیی ژنی دەستبردراو بۆ ئابڕووی گوت. ئەمەیش بینەرانی بە شانۆکەوە بەستەوە کە تا ئەو کاتە زۆر بە "ڕۆشنبیری"یان دەزانی و لێی تێ نەدەگەیشتن. فوندا ئەسەر وەکو پیشەی هەمیشەیی، لەلایەک فرمێسکی هەڵدەرشت و جنێوی بەسەر پیاوگەلدا دەباراند، لەلایەکی دی بەسەرهاتەکەی خۆی بە ترش و خوێکراوی دەگێڕایەوە. دوای دوو گۆرانی و جۆکی ڕێکلامێک کە زیاتر منداڵانی دەهێنایە پێکەنین (وای نیشان دەدا کە ئای گاز لە تڕ بەرهەم دەهێنرێ)، سەر شانۆ ڕەش کرا، دوو سەرباز کە سەربازە چەک بەدەستەکانی کۆتاییی نمایشەکەی دوو ڕۆژ لەمەوبەریان دەهێنایەوە بیر، هاتنە سەر شانۆ. سێدارەیەکیان هێنا و لە ناوەڕاستی شانۆکەدا دایاننا، بێدەنگییەکی سامناک باڵی بەسەر هەموو شانۆکەدا کێشا. سونای کە بە شێوەیەکی بەرچاو دەلەنگی، لەگەڵ قەدیفەدا بەژێر سێدارەکەدا ڕۆیشتن.

سونای گوتی: "پێم وا نەبوو پێشهاتەکان ئاوەها بەخێرایی بچنە پێش."

قەدیفە گوتی: "ئایا ئەمە داننانە بە سەرنەکەوتنتان لەو شتەدا کە دەتانویست بیکەن، یاخۆ ئیدی پیر بوون و بەدوای بیانوویەکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی مەردانە بمرن؟"

ئیپەک هەستی کرد قەدیفە بۆ بینینی ڕۆڵەکەی، زۆر لە خۆی دەکات.

سونای گوتی: "ئێوە زۆر زیرەکن قەدیفە."

قەدیفە بە ڕیتمێکی پڕ لە شڵەژاوی و ڕقەوە گوتی: "ئایا ئەمە دەتانترسێنێ؟"

سونای وەکو ئەوەی چاوشلکانێی لەگەڵدا بکات، گوتی: "بەڵێ!"

قەدیفە گوتی: "ئێوە لە زیرەکییەکەم نا، لەوە دەترسن کە خاوەن کەسایەتیم، چونکە لە شارەکەماندا پیاوان لە زیرەکیی ژنان نا، بەڵکو لەوە دەترسن بکەونە ژێر فەرمانیانەوە."



سونای گوتی: "تەواو بە پێچەوانەوە. من بۆیە ئەم شۆڕشەم بەرپا کرد بۆ ئەوەی ئێوەی ژنان وەکو ئەوروپاییگەل خاوەن فەرمانی خۆتان بن. هەر لەبەرئەوەیشە دەمەوێ ئێستا سەرتان ڕووت بکەن."

قەدیفە گوتی: "سەرم ڕووت دەکەم. بۆ ئەوەیشی بیسەلمێنم ئەمەم نە لە ژێر گوشاری ئێوەدا کردووە و نە لاساییی ئەوروپاییگەلم کردووەتەوە، خۆم هەڵدەواسم."

"بەڵام زۆر باش دەزانی ئەگەر وەکو تاک خۆت بکوژی، ئەوروپاییگەل چەپڵەت بۆ لێ دەدەن، وا نییە قەدیفە؟ شاراوەیش نییە ئێوە لە کۆبوونەوە نهێنییەکەی هوتێل ئاسیادا ئارەزوویەکی گەورەتان هەبووە لێدوانێک بدەنە ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانی. دەنگۆی ئەوە هەیە ئێوە ڕێکخەری ئەو کچانە بن کە خۆیان کوشتووە، تەواو وەکو ڕێکخستنی کچانی سەرپۆش بەسەر."

"تەنیا کچێک هەیە کە لە پێناو سەرپۆشدا تێ کۆشابێ و خۆی کوشتبێ، ئەویش تەسلیمەیە."

"ئێستا ئێوەیش دەبن بە دووەم..."

"نەخێر، من بەر لەوەی خۆم بکوژم، سەرم ڕووت دەکەم."

"ئایا باش بیرتان لێ کردووەتەوە؟"

قەدیفە گوتی: "بەڵێ، زۆر باش بیرم لێ کردووەتەوە."

"دە کەواتە دەبێ بیرتان لەمەش کردبێتەوە. خۆکوژ دەچێتە دۆزەخ. بۆیە وا بە ویژدانی ئاسوودەوە من دەکوژی، چونکە دەزانی هەر چۆنێک بووە لە کۆتاییدا دەچیتە دۆزەخ."

قەدیفە گوتی: "نەخێر، باوەڕم بەوە نییە بە خۆکوشتنم بچمە دۆزەخ. تۆیش بۆیە دەکوژم بۆ ئەوەی میللەت لە دوژمنێکی ئاین و ژن و لە میکرۆبێک خاوێن بکەمەوە!"

"بوێر و چاوکراوەن قەدیفە. بەڵام لە ئاینی ئێمەدا خۆکوشتن قەدەغەیە."

قەدیفە گوتی: "بەڵێ، قورئانی پیرۆز لە سوورەی ژناندا دەفەرموێ –خۆتان مەکوژن–، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کەوا خودای دەسەڵاتشکاو بەسەر هەموو

شتێکدا لە کچانی خۆکوشتوو نابووریّ و بۆ دۆزەخیان دەنێرێ."

"کەواتە بە ڕێگایەکی وا درێژدا دەڕۆن."

قەدیفە گوتی: "پێچەوانەکەی ئەمە ڕاستە. هەندێک لە کچانی جحێڵی قارس بۆیە خۆیان کوشت، چونکە نەیانتوانی بە ئارەزووی دڵی خۆیان سەریان داپۆشن. یەزدانی پەروەردگار دادپەروەرە و ئازارەکانیان لەبەرچاو دەگرێ. لەگەڵ هەبوونی خۆشەویستیی ئەو خودایە لە هەناومدا، لەبەرئەوەی لەم شاری قارسەدا شوێنێکم نییە، منیش وەکو ئەوان خۆم لە ناو دەبەم."

"ئێوە دەزانن بەم کارەتان گەورە پیاوانی ئاینیشیمان تووڕە دەکەن، ئەو پیاوانەی بەمەبەستی دوورخستنەوەی ژنان لە خۆکوشتن زستان بەناو بەفردا دێنە شاری قارسی هەژار. وا نییە قەدیفە؟ ئەمە لە کاتێکدا قورئان..."

"من ئاینەکەم لەگەڵ ئەتایست و لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لە ترسدا وا خۆیان دەنوێنن وەکو ئەوەی کە باوەڕمەند نەبن، تاوتوێ ناکەم. هەروەها ئیدی پێویستە کۆتایی بەم نمایشە بهێندرێ."

"ڕاست دەکەن. من مەبەستم لە کردنەوەی ئەم بابەتە دەستێوەردان لە ڕۆحی ئێوە نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوەم بوو نەوەک لە ترسی دۆزەخ بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە من نەکوژن."

"هیچ خەمتان نەبێ، بەوپەڕی خەیاڵ ئاسوودەییەوە دەتانکوژم."

سونای بە ڕیتمێکی هەستیارەوە گوتی: "جوانە، با منیش ئەو ئەنجامەتان پێ بڵێم کە لە ماوەی بیست و پێنج ساڵ کاری شانۆییدا پێی گەیشتووم. بینەرانمان لە هیچ نمایشێکی تردا حەوسەڵەی گوێگرتن لە دیالۆگێکی لەمە درێژتریان نییە. ئەگەر دەتانەوێ با درێژەی پێ نەدەین و دەست بەکار بین."

"باشە."

سونای هەمان دەمانچەی کرککالەی دەرهێنا و هەم نیشانی قەدیفە و هەم نیشانی بینەرانی دا. "ئێستا ئێوە سەرپۆش فڕێ دەدەن. دواتر ئەم چەکەتان دەدەمێ و تەقەم لێ دەکەن... لەبەرئەوەی جاری یەکەمە لە وەشانی زیندوودا شتی وا



دەقەومێ، جارێکی تریش واتای ئەمە بۆ بینەران..."

قەدیفە گوتی: "با درێژەی نەدەینێ. چیدی وزەم تێدا نەماوە گوێ لەو پیاوانە بگرم کە باسی هۆیەکانی خۆکوشتنی کچانی جحێڵ دەکەن."

سونای بەدەم یاریکردن بە چەکەکەی دەستییەوە گوتی: "ڕاست دەکەن. بەڵام دیسانیش، بۆ ئەوەی خوێنەران وتیوتیی ناو ڕۆژنامەکان و ئەو بینەرانەی کە لە وەشانی زیندوودا سەیرمان دەکەن، نەترسن، دەمەوێ دوو شت بڵێم. بڕوانن قەدیفە، ئەمە شارژۆری دەمانچەکەمە. وەکو دەبینن بەتاڵە." شارژۆرەکەی دەرهێنا، نیشانی قەدیفەی دا و دیسانەوە خستیەوە سەر دەمانچەکە. پاشان وەکو جادووگەرێکی شارەزا گوتی:"ئایا بینیتان کە بەتاڵە؟"

"بەڵێ."

سونای گوتی: "دیسانیش با زیاتر دڵنیا بین!" شارژۆرەکەی سەرلەنوێ دەرهێنا و وەکو جادووگەرێک کە کەروێشک لە کڵاودا نیشان دەدات، نیشانی بینەرانی دا و پاشان خستیەوە سەر دەمانچەکە. "بۆ دواجار لە بەرژەوەندی خۆم قسە دەکەم: وەکو گوتتان بە خەیاڵی ئاسوودەوە تەقەم لێ دەکەن. لەبەرئەوەی کەسێکم کودەتای سەربازیم کردووە و تەقەم لە خەڵک کردووە بە تاوانی ئەوەی لە ڕۆژئاواییەکان ناچن، ڕەنگە نەفرەتم لێ بکەن، بەڵام دەمەوێ بزانن ئەمەم لە پێناوی میللەتدا کردووە."

قەدیفە گوتی: "باشە، منیش ئێستا سەرم ڕووت دەکەم. تکایە هەموو تەماشا بکەن."

لەپڕ ئازارێک لە ڕووخساریدا بەدی کرا و بە جووڵەیەکی سادە سەرپۆشەکەی لە سەری کردەوە.

لە هۆڵەکەدا دەرزیت هەڵبدایە گوێت لە دەنگی دەبوو. سونای، وەکو ئەوەی شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دابێ، بۆ ساتێک گێژانە و ئەبڵەقانە سەیری قەدیفەی کرد. لێرە بەدواوە هەردووکیان وەکو دوو ئەکتەری نەزان کە دیالۆگی خۆیان نازانن، ڕوویان لە بینەران کرد.

سەرجەم خەڵکی شار ماوەیەکی درێژ بە سەرسامی سەیری قژە درێژ و کاڵ و جوانەکەی قەدیفەیان کرد. کامێرامانەکە هەموو هێز و تینی خۆی خستە گەڕ و بۆ یەکەمجار قەدیفەی خستە زووومەوە. لە ڕووی قەدیفەدا شەرمی ژنێک بەدی دەکرا کە لە ناو ئاپۆڕەیەکی جەنجاڵدا جلەکانی بەری دادەماڵدرێن. بە ڕووخساریدا دیاربوو ئازارێکی زۆر دەکێشێ.

قەدیفە بە ئارام لێبڕانەوە گوتی: "تکایە چەکەکەم بدەنێ!"

سوونای گوتی: "فەرموون." لوولەی دەمانچەکەی گرت و بۆ قەدیفە درێژی کرد. "ئەم میلە ڕادەکێشن."

قەدیفە دەمانچەکەی گرتە دەستەوە و سوونای زەردەخەنەیەکی بۆ کرد. سەرتاپای قارس پێیان وابوو گفتوگۆکەیان زیاتر درێژە دەخایەنێ. ڕەنگە سونایش هەروا بیری کردبێتەوە، بۆیە گوتی: "قەدیفە، قژتان زۆر جوانە. منیش بوومایە نەمدەهێشت پیاوانی تر ببینن." لەو کاتەدا قەدیفە میلی دەمانچەکەی ڕاکێشا.

دەنگی تەقەیەک بیسترا. سەرجەم قارس لە دەنگەکە نا، بەڵکو لە لاربوونەوەی سوونای سەریان سوڕما کە وەکو ئەوەی بەڕاستی پێکرابێ، کەوتە سەر زەوی. سوونای گوتی: "ئای کە گەمژەن! تێگەیشتنیان نییە بۆ هونەری هاوچەرخ، نابن بە هاوچەرخ!"

بینەران چاوەڕێی مۆنۆلۆگێکی درێژی مردنیان لە سوونای دەکرد، بەڵام قەدیفە دەمانچەکەی لێ نزیک خستەوە و چوار فیشەکی تری پێوە نا. لەگەڵ هەر تەقەیەکدا جەستەی سوونای بەلەرزینەوە بەرز دەبووەوە و قورستر دەکەوتە سەر زەوی. قەدیفە ئەو چوار فیشەکەی زۆر بەخێرایی تەقاندبوو.

بینەران کە لە لاساییکردنەوەی مردن زیاتر چاوەڕێی مۆنۆلۆگی مردنێکی بەواتایان لە سوونای دەکرد، کاتێک دوای تەقەی چوارەم دەموچاوی سوونایان لە خوێندا بینی، هیوابڕاو بوون. نووریە خان کە ڕووداو و ئەفێکتەکانی شانۆی هێندەی دەق بەلاوە گرنگ بوو، بەنیازی چەپڵەلێدان بۆ سوونای هەستایە سەرپێ، بەڵام بە بینینی دەموچاوی لە خوێندا خەڵتانبووی سوونای ترسا و لە شوێنی خۆی



دانیشتەوە.

قەدیفە بە بینەرانی گوت: "پێم وابێ کوشتم!"

قوتابییەکی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنان لە ڕیزەکانی پشتەوە هاواری کرد: "باشت کرد."

هێزەکانی ئاسایش بە ڕادەیەک سەرقاڵی تاوانەکەی سەر شانۆ بوون، بەجۆرێک نە جێی ئەو قوتابییەیان بۆ دەستنیشان کرا کە پەردەی بێدەنگیی دڕاندبوو و نە دوایشی کەوتن. مامۆستا نووریە خانم کە ماوەی دوو ڕۆژ بوو بە سەرسووڕمانەوە لە تەلەفزیۆندا سەیری سوونای دەکرد و بە هەر نرخێک بوو بۆ لە نزیکەوە بینینی لە ڕیزەکانی پێشەوە دانیشتبوو، کاتێک هەنسکی دا و دەستی بە گریان کرد، نەک تەنیا ئەوانەی ناو هۆڵەکە، بگرە سەرتاپای قارس درکیان کرد کە ڕووداوەکانی سەر شانۆ زیاد لە پێویست ڕاستەقینەن.

دوو سەرباز بە هەنگاوی سەیر و پێکەنیناوی ڕووبەڕووی یەکدی ڕایان کرد و پەردەی شانۆیان دادایەوە.

## ٤٤

# ئەمڕۆ لێرە کەس (کا)ی خۆش ناوێ

## دوای چوار ساڵ لە قارس

دوای داخستنی پەردەی شانۆکە، ز. دەمیرکۆڵ و هاوڕێکانی یەکسەر قەدیفەیان دەستگیر کرد، (لە پێناوی پاراستنیدا)، لەو دەرگایەی پشتەوەی هۆڵەکەوە کە بەسەر شەقامی کوچووک کازم بەگدا دەیڕوانی، بردیانە دەرێ و سواری ئۆتۆمبیلێکی سەربازییان کرد و بردیان بۆ ئەو حەشارگا کۆنەی ناو سەربازگای شار کە لە دوا ڕۆژدا میوانداریی شینەی تێدا کرابوو. دوای چەند سەعاتیک کە هەموو ڕێگا و بانەکانی قارس کرانەوە، سوپا بێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ بەرەنگارییەک ببێتەوە، چووە شارەوە. جێگری پارێزگار، فەرماندەی یەکەی سوپا و چەندین لێپرسراوی تر بە تاوانی فەرامۆشکردنی ئەرکەکانیان لە کاتی ڕووداوەکاندا، یەکسەر لە کار دوورخرانەوە. چەند سەربازێکی دەستوەشێن و هەندێک لە کارمەندانی میت کە هاوکاریی (کودەتاچییەکان)یان کردبوو، -سەرباری ئەوەی بانگەشەیان دەکرد کە ئەو کارەیان لە پێناوی (دەوڵەت و میللەت)دا کردووە-، دەستگیرکران. تورگوت بەگ و ئیپەک دوای تێپەڕبوونی سێ ڕۆژ ئەوسا توانییان سەر لە قەدیفە بدەن. تورگوت بەگ هەر لە کاتی ڕووداوەکەدا زانیبووی سونای لەسەر شانۆ گیانی دەرچووە، زۆر تووڕە بووبوو، سەرباری ئەوەیش بەهیوای ئەوەی بەڵایەک بەسەر قەدیفەدا نەیات، هەر ئەو ئێوارەیە دەستی بە هەوڵدان کردبوو بۆ هێنانەوەی کچەکەی بۆ ماڵەوە، کاتێکیش لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتوو نەبووبوو، درەنگانێکی دوای نیوەشەو قۆڵی کردبوو بە قۆڵی کچە گەورەکەیدا و بە کوچە چۆڵەکاندا گەڕابوونەوە بۆ ماڵەوە، ئەو دەستی بە گریان کردبوو، ئیپەکیش شتەکانی ناو باوڵەکەی دەرهێنابوو و خستبوونیەوە دۆڵابەکانەوە.

زۆربەی ئەو قارسییانەی کە ڕووداوەکانی سەر شانۆیان بینیبوو، ڕۆژی دواتر،



کاتێک (ڕۆژنامەی شاری قارس)یان خوێندەوە، تێ گەیشتن سونای دوای گیانکێشانێکی کورت، بەڕاستی مردووە. ئاپۆڕەی ناو هۆڵی شانۆی گەل، دوای داخستنی پەردەکان، بەگومانەوە، بەڵام بەبێدەنگی بڵاوەیان لێ کردبوو. تەلەفزیۆنیش هیچ خۆی لە قەرەی باسکردنی ڕووداوەکانی سێ ڕۆژی ڕابردوو نەدابوو. دانیشتووانی قارس لەبەرئەوەی لە ڕابردوودا لە سایەی ڕاگەیاندنی ڕەوشی نائاساییدا لەگەڵ ڕاوەدوونانی (تیرۆریستان) لە لایەن دەوڵەت یاخۆ تیمەکانی تایبەتەوە، پەلاماردان و بەیاننامە بڵاوکردنەوەدا ڕاهاتبوون، دوای ماوەیەکی کورت چیدی بیریان لەوە نەکردەوە کە ئەو سێ ڕۆژە سەردەمێکی زۆر تایبەت بووە. لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواترەوە فەرماندەییی گشتی سوپا دەستی بە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکان کرد، کۆمسیۆنی پشکنینی سەر بە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی وەزیران کەوتە کار و سەرجەم دانیشتووانی قارسیش دەستیان کردبوو بە تاوتوێکردنی ڕەهەندی ڕووداوە شانۆیی و هونەرییەکانی (کودەتای شانۆکە) نەک ڕەهەندە سیاسییەکانی. پرسیاری سەرەکی ئەوە بوو کە سەرباری ئەوەی سونای زایم بە بەرچاوی هەمووانەوە شارزۆرێکی بەتاڵی خستبووە سەر دەمانچەکەی، ئەدی چۆن قەدیفە بەهەمان دەمانچە کوشتبووی؟

ڕاپۆرتی تێروتەسەلی ئەو ئەفسەرەی کە دوای گەڕانەوەی ژیان بۆ دۆخی ئاسایی بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە (کودەتای شانۆ)کەی قارس لە ئانکاراوە هاتبوو، وەکو لە زۆر جێی کتێبەکەمدا بەدی دەکرێ، لەم بابەتەیشدا کە زیاتر لە جادوو دەچێ نەک دەستسووکی لە بەکارهێنانی چەکدا، بە هانامەوە هات. لەبەرئەوەی قەدیفە لەو شەوە بەدواوە ئامادە نابێ ڕووداوەکە لەگەڵ باوکی و دادەیدا کە سەریان لێ دابوو، لەگەڵ داواکارانی گشتیی دەوڵەت یاخۆ پارێزەرێکدا -هەر هیچ نەبێ بۆ ئەوەی لە دادگادا بەرگریی لێ بکات- تاوتوێ بکات، ئەفسەری لێکۆڵەر بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕاستییەکان -کوتومت وەکو ئەوەی من دوای چوار ساڵ کردم-، لەگەڵ زۆر کەساندا قسەی کردووە (یاخۆ ڕاستتر بڵێم وتەکانی تۆمار کردوون)، بەوجۆرە چاوی بە هەموو شیمانە و دەمگۆکاندا خشاندووە.

ئەفسەری لێکۆڵەر، سەرەتا بەمەبەستی پووچەڵکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی گوایە

قەدیفە بە زانایی و بە پێچەوانەی ویستی سونای زایمەوە ناوبراوی کوشتووە، سەلماندبووی بانگەشەی ئەوەی ژنە لاوەکە لە چاوتروکاندنێکدا دەمانچەیەکی تری لە گیرفانی دەرهێنابێ، یاخۆ شارژۆرێکی پڕی خستبێتە سەر دەمانچەکە، لە ڕاستییەوە دوورن. هەرچەندە لە کاتی کوشتنیدا نیشانەی سەرسووڕمانێک بە ڕووخساری سونایەوە دەقی گرتبوو، پشکنینەکانی دواتری هێزەکانی ئاسایش، شتومەکەکانی لای قەدیفە و کاسێتی نمایشەکەی ئەو شەوەیش ئەوەیان پشتڕاست دەکردەوە کە قەدیفە تەنیا چەکێک و شارژۆرێکی پێ بووە. بەپێی بۆچوونێکی تر کە دانیشتووانی قارس زۆر حەزیان پێ دەکرد، کەسێکی تر لە هەمان کاتدا لە لایەکی ترەوە تەقەی لە سونای زایم کردووە، بەڵام ڕاپۆرتی ئەفسەریی لە ئانکاراوە هاتوو ئەم بۆچوونەی بەدرۆ خستبووەوە، چونکە ئەنجامی توێکاری دەری خستبوو سەرچاوەی فیشەکەکانی ناو جەستەی سونای، دەمانچە کرککالەکەی دەستی قەدیفە بوو. دوا دەستەواژەی قەدیفە (پێم وابێ کوشتم!) کە زەمینەی خۆش کردبوو بۆ ئەوەی لە لایەن زۆربەی دانیشتووانی قارسەوە هەم وەکو قارەمان و هەم وەکو قوربانی بکرێ بە ئەفسانە، ئەفسەری لێکۆڵەر بە بەڵگەی ئەوەی دانابوو کە قەدیفە تاوانەکەی بە ئەنقەست ئەنجام نەداوە. هەروەها بەشێوازێکی ئەوتۆ وەکو ئەوەی بیەوێ ڕێ نیشانی ئەو سەردۆزگەرە بدات کە دواتر دۆزی یاسایی دەکاتەوە، وردەکارییە یاسایی و فەلسەفییەکانی هەردوو چەمکی کوشتنی بە ئەنقەست و نیازی خراپی تۆمار کردبوو. هەروەها باسی ئەوەی کردبوو هەموو دیالۆگ و جووڵەکانی قەدیفە لەسەر شانۆ، لە خۆیەوە نەبووە، بەڵکو لە لایەن کۆچکردوو سونای زایمەوە پێی لەبەر کراوە کە هەر خۆی نەخشەداڕێژی هەموو ڕووداوەکەیش بووە. سونای دوای ئەوەی دوو جار گوتبووی کە شارژۆرەکە بەتاڵە، خستبوویە سەر دەمانچەکە، بەڵام بەمجۆرە هەم قەدیفە و هەم سەرجەم دانیشتووانی قارسی لە خشتە بردبوو. ئەفسەری لێکۆڵەر کە سێ ساڵ بەر لە وادەی خۆی خانەنشین کرابوو و من لە ئانکارا چوومە ماڵەکەی و کاتێک ئاماژەم بۆ ئاگاتا کریستی کرد لەسەر ڕەفەکان، پێی گوتم کە ئەو زیاتر ناوونیشانی کتێبەکانی بە دڵە وەک لە ناوەڕۆکەکانیان، پێی وابوو "شارژۆرەکە پڕ بووە!" نیشاندانی شارژۆرێکی پڕ بە



بەتاڵی، بێگومان گەمەیەکی ورد و جادووگەرانەی ئەکتەرێکی شانۆ بوو: توندوتیژیی بێبەزەییانەی سونای زایم و هاوڕێکانی کە ماوەی سێ ڕۆژ بەبیانووی بوون بە ڕۆژئاوایی و ئەتاتورکچێتییەوە پەیڕەویان کردبوو (ژمارەی کوژراوەکان بە سونایەوە بیست و نۆ کەس بوون)، دانیشتووانی قارسی بە ڕادەیەکی ئەوتۆ تۆقاندبوو کە هەموویان ئامادە بوون لێوانێکی بەتاڵ بە پڕ بزانن. لەم ڕوانگەیەوە نەک بەتەنیا قەدیفە، بەڵکو دانیشتووانی قارسیش بەشێک بوون لە ڕووداوەکان، چونکە ئەوان بەبیانووی سەیرکردنی نمایشەوە چێژیان لە خۆبەکوشتدانی سونای لەسەر شانۆ وەرگرتبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی سونای پێشوەخت مەرگی خۆی ڕاگەیاندبوو. ئەفسەری لێکۆڵەر لە وەڵامی دەمگۆیەکدا سەبارەت بەوەی قەدیفە سونای لە تۆڵەی شینەدا کوشتووە، لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبووی کەسێک کە چەکێکی دراوەتە دەست و پێی گوتراوە بەتاڵە، ئەم ناتوانێ بەبیانوویەکی تر تاوانباری بکات. هەروەها نووسبووی قەدیفە فێڵبازانە ڕەفتاری کردووە و سونای کوشتووە، بەڵام لە وەڵامی ئیسلامییەکاندا کە بە شان و باڵی قەدیفەیاندا هەڵدەدا لە پای خۆنەکوشتنی و لە وەڵامی دەمگۆی لایسیستە کۆماریخوازەکانیشدا کە تاوانباریان دەکرد، نووسیبووی پێویستە هونەر و ڕاستی تێکەڵ بەیەکتری نەکرێن. بۆچوونی سەبارەت بەوەی کە قەدیفە بەبیانووی خۆکوشتن سونای کوشتووە و دواتر لە خۆکوشتن پاشگەز بووەتەوە، بەوە پووچەڵ کرایەوە کە هەم سونای و هەمیش قەدیفە زانیویانە سێدارەکەی سەر شانۆ لە کارتۆن دروست کراوە.

سەردۆزگەر و دادوەرەکانی قارسیش بەڕێزێکی زۆرەوە ڕاپۆرتی ئەو ئەفسەرە لێکۆڵەرە چالاکەیان هەڵسەنگاند کە فەرماندەیی گشتی سوپا لە ئانکاراوە ناردبووی. بەوجۆرە قەدیفە بە تاوانی مرۆڤ کوشتن لەبەر هۆکاری سیاسی نا، بەڵکو بە تاوانی ئەوەی بەهۆی بێتەگبیری و ناوردبینی ئەوەوە کەسێک کوژراوە، سزای سێ ساڵ و مانگێک زیندانی بۆ بڕدرایەوە. دوای بەسەربردنی بیست مانگ لە زیندان ئازاد کرا. ئالبای عوسمان نووری چۆلاکیش بەپێی ماددەکانی ٣١٣ و ٤٦٣ لە یاسای سزادانی تورک، تاوانی پێکەوەنانی دەستە و تاقمی چەکداری مرۆڤکوژ و ئەو تاوانی کوشتارانەی درایە پاڵ کە بکەرەکانیان نادیار بوون. سزایەکی توندی بۆ

بڕدرایەوە و لە کونجی زیندان قایم کرا، بەڵام دوای شەش مانگ بەر لێبووردنی گشتی کەوت و ئازاد کرا. سەرباری ئەوەی چاوترسێن کرابوو کە ڕووداوەکان بۆ کەس نەگێڕێتەوە، ساڵانی دواتر لە یانە سەربازییەکاندا لەگەڵ هاوڕێ دێرینەکانیدا دادەنیشیت، لەو شەوانەیشدا کە زۆری دەخواردەوە، دەیگوت هەوڵی داوە ئەو ئەرکە بەجێ بهێنێ یاخۆ "بەلانی کەمەوە" هانی جێبەجێکردنی بدات کە هەموو ئەفسەرێکی ئەتاتورکچی لە ناخی خۆیدا هیوای بۆ دەخوازێ. بێ ئەوەی زۆری لەسەر بڕوات، هاوڕێکانی بە ترسنۆک و نەرم و نەوێر لە بەرامبەر ئیسلامییەکاندا تاوانبار دەکرد.

ئەفسەر و سەربازانی تر و هەندێک لە فەرمانبەران کە لە ڕووداوەکانەوە گلابوون –سەرباری پێ داگرتنیان لەسەر ئەوەی کە نیشتمانپەروەرن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی سەرووی خۆیان بوون–، لە دادگای سەربازیدا بەهەمان شێوە تاوانی لە جۆری پێکەوەنانی دەستە و تاقمی چەتە، مرۆڤ کوشتن و بەکارهێنانی بێ مۆڵەتی سامانی دەوڵەتیان درایە پاڵ و سزای زیندانیان بۆ بڕدرایەوە، بەڵام ئەوانیش بەر هەمان لێبووردنی گشتی کەوتن و ئازاد کران. ئەفسەرێکی لاوی یەک ئەستێرەی کەمێک شێتۆکە کە یەکێک بوو لەوانە و دواتر بووبوو بە ئیسلامی، دوای ئازادبوونی لە زیندان، بیرەوەرییەکانی خۆی لە زنجیرەیەک وتاردا بە سەردێری (منیش ژاکۆبەنێک بووم) لە ڕۆژنامەی (عەهد)ی ئیسلامیدا بڵاو کردەوە، بەڵام بەبیانووی سووکایەتیکردن بە سوپا، بڵاوکردنەوەی زنجیرە وتارەکانی ڕاگیرا. ڕاستەوخۆ دوای شۆڕشەکەیش ئاشکرابووبوو کە ڤورالی گۆڵچی بۆ دەزگای میت کاری کردووە. دادگا شانۆکارانی تری بە (هونەرمەندی سادە) دانابوو و سزای بۆ نەبڕیبوونەوە. فوندا ئەسەریش لەبەرئەوەی لە شەوی کوشتنی پیاوەکەیدا فێی لێ هاتبوو، بە ڕقەوە پەلاماری هەموو کەسێکی دەدا و لای هەموو کەسێک گازندەی لەوانی دی دەکرد، ماوەی چوار مانگ لە بەشی چارەسەری دەروونیی سەر بە نەخۆشخانەی سەربازی لە ئانکارا، خرایە ژێر چاودێریی چڕەوە. چەند ساڵێک دوای دەرچوونی لە نەخۆشخانە و لە ڕۆژگارێکدا کە بەهۆی دۆبلاجکردنی دەنگی جادووگەرێکەوە لە زنجیرەیەکی بەناوبانگی منداڵاندا ناوبانگی بە هەموو لایەکی وڵاتدا بڵاوبووبووەوە، پێی گوتم هێشتا غەمگینە بەوەی پیاوەکەی لە ڕووداوێکی سەر شانۆدا گیانی لە





دەست داوە، بەهۆی ئیرەیی پێبردن و واتەواتەوە گێڕانی ڕۆڵی ئەتاتورکی پێ ڕەوا نەبیندراوە. پێشی گوتم تاقە شتێک کە سەبووریی پێ بێت، ئەوەیە لەم ساڵانەی دوایدا کەڵک لە شێوازی ڕاوەستان و پۆز لێدانەکانی پیاوەکەی وەردەگیرێ بۆ داڕشتنی پەیکەرەکانی ئەتاتورک. لەبەرئەوەی ئەفسەری پشکێنەر لە ڕاپۆرتی خۆیدا تیشکی خستبووە سەر ڕۆڵی (کا)یش لە ڕووداوەکاندا، دادوەری سەربازی –وەکو مافدار– بۆ گەواهیدان بانگهێشتنی دادگای کردبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی لە دوو دانیشتنی سەرەتای دادگادا نەهاتبوو، دادوەر بەمەبەستی وەرگرتنی قسەکانی، فەرمانی دەستگیرکردنی دابوو.

قەدیفە ماوەی زیندانیکردنەکەی لە قارس بەسەر برد. تورگوت بەگ و ئیپەکیش هەموو ڕۆژێکی شەممان سەریان لێ دەدا. لە ڕۆژانی خۆشی بەهار و هاویندا و پاش وەرگرتنی مۆڵەت لە بەڕێوەبەری لێبووردە و دڵفراوانی زیندان، ڕایەخێکی سپییان لە ژێر دارتووی ناو حەوشە فراوانەکەی زینداندا ڕادەخست، دەستیان دەکرد بە خواردنی دۆڵمەی بیبەر کە زاهیدە بە ڕۆنی زەیتوون لێی دەنا، فەرمووی کفتەی گۆشتیان لە زیندانییەکانی تر دەکرد، هێلکەی کوڵاویان بەر لە پاککردن بەیەکدا دەکێشا، هاوکات لە ڕێی ڕیکۆردەرێکی مارکەی فیلیپسەوە کە تورگوت بەگ لای وەستایەک چاکی کردبووەوە، گوێیان لە (پرێلود)ەکانی (شۆپین) دەگرت. تورگوت بەگ، بۆ ئەوەی کچەکەی زیندان بە شوورەیی نەزانێ، بە چاوی قوتابخانەیەکەوە بۆ گرتووخانەی دەڕوانی کە دەبێ هەموو هاووڵاتییەکی شەرەفمەند بۆی بڕوات. جاروباریش ناسیاوێکی وەکو سەردار بەگی ڕۆژنامەنووسی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. لە یەکێک لە سەردانەکاندا فازیلیشیان لەگەڵدا بوو، دواتر چەند جارێک قەدیفە داوای کردبوو چاوی پێ بکەوێتەوە، دوای بەسەربردنی ماوەی زیندانیکردنکەی، لەگەڵ ئەو لاوەدا کە چوار ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو، زەماوەندی کرد.

شەش مانگی یەکەم لە ژوورێکی هوتێلی بەفرپالاس نیشتەجێ بوون و فازیلیش لە پرسگەی هوتێل کاری دەکرد. کاتێکیش من گەیشتمە قارس، بە خۆیان و کۆرپە ساواکەیانەوە گواستبوویانەوە خانوویەکی تر. قەدیفە هەموو بەیانیانێک لەگەڵ عومەرجانی کۆرپەی شەش مانگاندا دەهاتە هوتێلی بەفرپالاس، ئیپەک و زاهیدە

چاویان لە منداڵەکەی دەبوو، تورگوت بەگیش گەمەی لەگەڵ کچەزاکەیدا دەکرد، قەدیفەیش خۆی بە کاروباری هوتێلەوە سەرقاڵ دەکرد. فازیلیش بۆ ئەوەی بە غەزوورییەوە پەیوەست نەبێ، لەلایەک لە کۆشکی وێنەگری ئایدن کاری دەکرد، لەلایەکی دیش، لە (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس)، وەکو خۆی بە زەردەخەنەوە پێی دەگوتم، "بەناو یاریدەدەری پرۆگرامڤانە، بەڵام لە ڕاستیدا کاری بەردەستیی دەکرد."

ڕۆژێک دوای گەیشتنم بۆ شار و بانگهێشتنکردنم بۆ ئەو خوانەی کە سەرۆکی شارەوانی لەسەر شەرەفی من ئامادەی کردبوو، لە کاتی نیوەڕۆدا و لە ماڵە نوێکەیان لە شەقامی خلووسی ئایتەکین چاوم بە فازیل کەوت. لە کاتێکدا من سەیری ئەو بەفرەم دەکرد کە بە چڕی بەسەر قەڵا و ڕووباری قارسدا دەباری، فازیل بەنیازپاکیی خۆی هۆی هاتنمی بۆ قارس پرسی. منیش زۆر شڵەژابووم، چونکە ترسام بابەتی ئیپەک بێنێتە ئاراوە کە دوێنێ ئێوارە لە کاتی بانگهێشتنەکەی سەرۆکی شارەوانیدا هۆشی لەبەر بریبووم. بە پێوەنانەوە پێم گوت ئەو شیعرانەی (کا)م دەوێ کە لە قارس نووسیوونی و دووریش نییە کتێبێکیان لەسەر بنووسم.

دۆستانە گوتی: "لە کاتێکدا شیعرەکان لە ئارادا نەبن، چۆن دەکرێ کتێبیان لەسەر بنووسرێ؟"

گوتم: "منیش نازانم. لەوانەیە شیعرێک لە ئەرشیفی تەلەفزیۆندا هەبێ."

"ئێوارە دەیدۆزینەوە و دەری دەهێنین. بەڵام تۆ تەواوی سەرلەبەیانیی ئەمڕۆ کوچە بە کوچەی قارست دایە ژێر پێوە. لەوانەیشە بیر لەوە بکەیتەوە ڕۆمانێکمان لەسەر بنووسی."

نابەدڵ گوتم: هەموو ئەو شوێنانەم بەسەر کردەوە کە (کا) لە شیعرەکانیدا ئاماژەی پێ داون."

"لە ڕووخسارتدا تێ دەگەم دەتەوێ هەژاریی ئێمە و جیاوازیمان لە خوێنەرانی ڕۆمانەکانت بکەیت بە چیرۆک. من نامەوێ بمخەیتە ڕۆمانێکی لەو جۆرەوە."

"بۆچی؟"

"چونکە نامناسی! تەنانەت ئەگەر بشمناسی و وەکو ئەوەی کە هەم لەسەرم



بنووسی، ئەوا خوێنەرانی ڕۆژئاواییت لە تاو بەزەییهاتنەوە بە هەژارییەکەمدا، ناتوانن ژیانم ببینن. بۆ نموونە، بەلای ئەوانەوە مایەی پێکەنینە کە من نووسەری ڕۆمانی خەیاڵی زانستیی ئیسلامیم. نامەوێ وەکو کەسێکی دڵفراوان باس بکرێم و لە هەمان کاتیشدا بە چاوی سووک سەیر بکرێم و ببمە مایەی پێکەنینی کەسانی تر."

"باشە."

فازیل گوتی: "دەزانم پێت ناخۆشە. تکایە گوێ بە قسەکانم مەدە، تۆ مرۆڤێکی باشی. هاوڕێکەیشت مرۆیەکی باش بوو، لەوانەیشە هەوڵی دابێ ئێمەی خۆش بوێ، بەڵام لە ئاکامدا گەورەترین خراپەکاریی ئەنجام دا."

فازیل بەهۆی کوژرانی شینەوە توانیبووی لەگەڵ قەدیفەدا زەماوەند بکات، بۆیە بەڕاستم نەزانی ئێستا بەشێوەیەک باس لە بانگەشەی زمان لێدانی (کا) لە شینە بکات وەکو ئەوەی خراپەکارییەک دژ بە خۆی کرابێ، بەڵام بێدەنگ بووم.

دواتر گوتم: "چۆن دەتوانی لە ڕاستیی ئەم بانگەشەیە دڵنیا بی؟"

فازیل بەدەنگێکی نەرم و بە بەزەیی و بێئەوەی نە من و نە (کا) تاوانبار بکات، گوتی: "سەرتاسەری قارس بەم ڕاستییە دەزانێ."

لە چاوانیدا نەجیبم بینی. پێم گوت ئامادەم بۆ بینینی ڕۆمانی خەیاڵی زانستییەکەی کە دەیویست نیشانم بدات: لێی پرسیم داخۆ دەمەوێ سەیری نووسینەکانی بکەم، بەڵام پێشی گوتم نووسینەکانی خۆیم نادات و دەشخوازێ لە کاتی خوێندنەوەیاندا لە تەنیشتمەوە بێ. لەبەردەم مێزێکدا کە ئێواران لەگەڵ قەدیفەدا بەدەم سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە نانیان لەسەر دەخوارد، دانیشتین و بەبێدەنگی و پێکەوە پەنجا لاپەڕەی یەکەمی ڕۆمانێکی خەیاڵی زانستیمان خوێندەوە کە چوار ساڵ لەمەوبەر بە خەیاڵی نەجیبدا هاتبوو و ئەم نووسیبوویەوە.

فازیل تەنیا جارێک و وەکو ئەوەی داوای لێبووردن بکات، پرسی: "چۆنە، باشە؟ ئەگەر بێ تاقەتی کردووی، با دەستی لێ هەڵبگرین."

گوتم: "نەخێر، باشە." بە ئارەزووەوە لەسەر خوێندنەوەی ڕۆمانەکە بەردەوام بووم.

دواتر، کاتێک لە شەقامی بە بەفر داپۆشراوی کازم قەرەبەکر پیاسەمان دەکرد، جارێکی تر لە ناخەوە پێم گوت ڕۆمانەکەم زۆر پێ جوانە.

فازیل بە خۆشحاڵییەوە گوتی: "پێ دەچێ بتەوێ بەم قسانەت دڵخۆشم بکەی، بەڵام ئەمە چاکەیەک بوو لەگەڵ مندا کردت. منیش دەمەوێ لەگەڵ تۆدا بیکەم. ئەگەر بەنیازی ڕۆمانێک بنووسی، دەتوانی باسی منیش بکەی، بەڵام بەمەرجی ئەوەی منیش ڕاستەوخۆ شتێک بە خوێنەرەکانت بڵێم."

"مەرجەکەت چییە؟"

"نازانم. ئەگەر لە ماوەی مانەوەی تۆدا لە قارس بتوانم ئەو قسەیە بدۆزمەوە، ئەوا پێت دەڵێم."

دوای ئەوەی بڕیارمان دا لای ئێوارە لە (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) یەکتر ببینین، لە یەکدی جیابووینەوە. فازیل بە ڕاکردن ڕووەو دوکانی کۆشکی وێنەگری ئایدن چوو، منیش لە دواوە چاوم تێ بڕی. تۆ بڵێی تا چ ڕادەیەک نەجیبی ناو ناخیم بینیبێ؟ ئایا وەکو لای (کا)یش باسی کردبوو، هێشتا لە هەناویدا هەستی بە نەجیب دەکرد؟ گەلۆ مرۆڤ تا چ ڕادەیەک دەتوانێ گوێی لە دەنگی کەسێکی تر بێ لە ناخی خۆیدا؟

لە چێشتەنگاودا کوچە بە کوچەی قارس سوڕامەوە، لەگەڵ ئەو مرۆگەلەدا قسەم کرد کە (کا) دووانبوونی، لە هەمان ئەو چایخانانە دانیشتم کە ئەو سەری پێدا کردبوون. گەیشتبوومە ئاستێک هەستم دەکرد بووم بە (کا). لە چایخانەی برایانی بەختەوەر کە (کا) شیعری (هەموو مرۆڤایەتی و ئەستێرەکان)ی لێ نووسیبوو، دانیشتم و منیش وەکو هاوڕێ خۆشەویستەکەم بیرم لە شوێنی خۆم لە جیهاندا دەکردەوە. جاویدی کارمەندی پرسگەی هوتێلی بەفرپالاسیش پێی گوتم منیش "کوتومت وەکو (کا) بەگ" بەتاو پڕ دەدەمە کلیلەکەم. لە کاتێکدا بە کوچەیەکدا ڕێم دەکرد، بەقاڵێک لێی پرسیم: "ئایا ئێوە ئەو نووسەرەن کە لە ئەستەمبوڵەوە هاتوون؟" ئەمەی گوت و فەرمووی لێ کردم بۆ ژوورەوە. دەقاودەق وەکو ئەوەی بۆ (کا) دوابوو لەگەڵ منیشدا قسەی کرد و کۆکاکۆلایەکی پێشکەش کردم. دەیویست بنووسم



هەموو ئەو هەوالانەی کە چوار ساڵ لەمەوبەر لە ڕۆژنامەکاندا سەبارەت بە خۆکوشتنی تەسلیمەی کچی نووسراون، هەر هەمووی دۆرن. ئایا ئەمانە چەندیان ڕێکەوت بوون و چەندیشیان دەستکردی خۆم بوون؟ جارێک کە بینیم ئەوا بە کوچەی بایتارخانەدا تێ دەپەڕم، سەیرێکی پەنجەرەکانی تەکیەکەی شێخ سەعادەدینم کرد، بۆ ئەوەی بۆم ڕوون بێتەوە (کا) لە کاتی ڕۆیشتنیدا بۆ تەکیەکە هەستی بەچی کردووە، بە پلیکانە قیتەکاندا کە موختار لە شیعرەرکەیدا باسی لێوە کردبوو، سەرکەوتم.

ئەو شیعرەی کە موختار دابووی بە (کا)، لە ناو کاغەزەکانیدا لە فرانکفورت دۆزیبوومەوە، ئەمەیش واتای نەناردنی شیعرەکەی بۆ فاخیر دەگەیاند. ئەمە لە کاتێدا کە پێنج خولەک بوو موختارم ناسیبوو پێی گوتم: "ئای کە (کا) مرۆڤێکی بەڕێز بوو!" پاشان گوتی کاتێک لە قارس بووە، شیعرەکانی ئەمی زۆر بە دڵ بووە و بە شانازییەوە ناردوویەتی بۆ وەشانخانەیەکی زۆر گەورە لە ئەستەمبوڵ. لە کاروباری خۆی ڕازی بوو، بەئومێد بوو لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا لەسەر لیستی پارتێکی تازە دەمەزرێندراو (پارتی ڕەفای کۆن هەڵوەشێنرابووەوە) بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی شارەوانی هەڵبژێردرێ. لە سایەی کەسایەتیی دۆستانە، نەرم و ئاشتیخوازانەی موختاردا لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش (مۆڵەتی دابەزینە خوارەوەیان بۆ نهۆمی ژێرەوە پێ نەداین) و لە نەخۆشخانەی کۆمەڵایەتی، ئەو شوێنەی کە (کا) لاشەی نەجیبی لێ ماچ کردبوو، پێشوازیمان لێ کرا. موختار منی بە پاشماوەی هۆڵی شانۆی گەل و ئەو ژوورانەیدا گەڕاند کە کردبوونی بە کۆگای کەرەسەی ناوماڵ. دانیشی پێ دانا (کەمێک) لە بەرامبەر ڕووخاندنی باڵەخانە سەدساڵییەکەدا بەرپرسیارە، بەڵام بە گوتنی ئەوەی کە "باڵەخانەکە دەستکردی ئەرمەنییەکانە نەک تورکەکان"، هەوڵی دا دڵم بداتەوە. دوکانی سەوزەفرۆشانی بە بەفرداپۆشراو، ڕیزە دوکانی ناڵبەندەکانی شەقامی کازم قەرەبەکر و یەکە بە یەکەی ئەو شوێنانەی نیشان دام کە ئارەزووی قووڵی (کا)ی بۆ سەرلەنوێ بینینەوەی ئیپەک و قارس هێنایەوە بیرم. پاش ئەوەی لە خانی خالید پاشا منی بە پارێزەر موزەفەر بەگی ڕکەبەری سیاسیی خۆی ناساند، ڕۆیشت. دواتی ئەوەی سەرۆکی پێشتووتری

شارەوانی، بەهەمان شێوەی ڕەفتاری لەگەڵ (کا)دا باسێکی مێژووی کۆماریخوازانەی قارسی بۆ گێڕامەوە، ملی ڕێگای ڕێڕەوە سەخت و تاریکەکانی خانەکەم گرت و لە پێش دەروازەی یانەی ئاژەڵدۆستان کەسێکی دەوڵەمەندی خاوەنی کارگەی شیرەمەنیم بینی کە وەکو (ئۆرهان بەگ) خۆی پێ ناساندم. کابرا منی بردە ژوورێ و بیرەوەریی تیژی خۆی خستە کار و بۆی گێڕامەوە چۆن چوار ساڵ لەمەوبەر لە سەروبەندی کوشتنی بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەدا (کا) هاتووەتە ئێرە، چۆن لە گۆشەیەکی هۆڵی شەڕە کەڵەشێرەکەدا دانیشتووە و نوقمی بیرکردنەوە بووە.

پێم باش نەبوو بەر لە بینینی ئیپەک گوێم لە وردەکاریی ئەو ساتە بێت کە تیایدا (کا) حەزی لێ کردووە. بەر لەوەی ڕوو لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ بکەم، چوومە بیرەخانەی نیشتمانی سەوز و بەئومێدی خاوکردنەوەی باری دەروونیم و بۆ ئەوەی خۆم لە گرفتاربوون بە عەشقی ئیپەک بپارێزم، پێکێک عارەقم خواردەوە، بەڵام کاتێک لە شیرینیخانەکە لە بەرامبەر ئیپەکدا دانیشتم، دەستبەجێ بۆم دەرکەوت تەگبیرەکانم هۆیەکانی خۆپاراستنیان لە دەست دەرهێناوم. عارەقەکەم بە سکی ناشتا خواردبووەوە، بۆیە لەبری ئەوەی خەیاڵم ئاسوودە بکات، هۆشمی شێواندبوو. دوو چاوی گەورە و ڕوویەکی درێژی پێوە بوو لەوانەی من حەزم لێ دەکرد. لە کاتێکدا دەکۆشام لە جوانییەکەی بگەم کە زۆر قوڵتر بوو لەوەی من لە دوێنێوە لە خەیاڵی خۆمدا دەمهێنا و دەمبرد، ئومێد لێبڕاوانە ویستم جارێکی تر بڕوا بە خۆم بهێنم ئەو شتەی لە نێوان ئەو و (کا)دا گوزەراوە و هۆشی لێ بڕیوم و هەموو وردەکارییەکانی دەزانم، ئەڤین بووە. بەڵام ئەمە بەتەنیا بە ئازارەوە لایەنێکی تری لاوازی خۆمی هێنایەوە بیرم: بە پێچەوانەی (کا)وە کە شاعیرێکی ڕاستەقینە بوو و توانیبووی بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا بژی، من ڕۆماننووسێکی خاوەن ڕۆحێکی سادەتر بووم کە بەیانیان و ئێواران چەند سەعاتێک وەکو سکرتێرێک کارم دەکرد. ڕەنگە هەر لەبەرئەوەیش بێ من بەجۆرێکی هێندە هەمەڕەنگ گێڕاومەتەوە کە (کا) لە فرانکفورت ژیانێکی ڕۆژانەی ڕێکوپێکی هەبووە، هەموو بەیانیانێک لە هەمان سەعاتدا لە خەو هەستاوە، بەهەمان کوچە و شەقامدا



ڕۆیشتووە و لەسەر هەمان مێزی هەمان کتێبخانە دانیشتووە و کاری کردووە.

ئیپەک گوتی: "من خۆم بڕیارم دابوو لەگەڵ (کا)دا بچم بۆ فرانکفورت." بۆ سەلماندنی ئەم بڕیارەیشی چەندین وردەکاری، تا بە ئامادەکردنی باوڵەکەیشی دەگات، بۆ گێڕامەوە. پاشان گوتی: "بەڵام ئێستا کارێکی دژوارە بۆ من بیر بکەمەوە (کا) مرۆڤێکی تا چ ڕادەیەک باش بووە. ئەمە لە کاتێکدا ڕێزم بۆ دۆستایەتییەکەتان هەیە و دەشمەوێ لە نووسینی کتێبەکەتاندا هاوکاری بکەم."

بەمەبەستی دەرهێنانی زانیاریی زیاتر لێی، گوتم: "(کا) لە سایەی ئێوەدا لە قارس دیوانێکی نایابی نووسی. ئەو چەند سەعاتەی پێش دەرچوونی نەبێ لە قارس، ئیدی خولەک بە خولەکی ئەو سێ ڕۆژەی بیرکەوتووەتەوە و لە دەفتەرەکانیدا تۆماری کردوون."

بە ڕاشکاوییەکی سەرسوڕهێنەر و بێ ئەوەی هیچ شتێکم لێ بشارێتەوە، بە ڕاستگۆییەکی ئەوتۆ کە منی سەرسام کرد و بارێکیش بوو بۆ خۆی، چونکە مەسەلەکە پێوەندیی بە ژیانی تایبەتی خۆیەوە هەبوو، کەوتە گێڕانەوەی خولەک بە خولەکی سەعاتەکانی پێش دەرچوونی (کا) لە قارس، وەکو ئەوەی خۆی گوزەراندبووی و پێشبینیی دەکرد.

بێ ئەوەی هەوڵی تاوانبارکردنی بدەم، پێم گوت: "هیچ بەڵگەیەکی جێی بڕواتان لەبەر دەستتدا نەبوو بۆ پاشگەزبوونەوە لە بڕیاری ڕۆیشتن بۆ فرانکفورت."

"هەندێک شت هەن کە مرۆڤ دەستبەجێ بە دڵ هەستیان پێ دەکات."

گوتم: "ئێوە لە پێشدا باسی دڵتان هێنایە ئاراوە." وەکو ئەوەی داوای پۆزشی لێ بکەم، بۆم گێڕایەوە لە نامەکانی (کا)دا کە بۆ ئەمی نووسیوە و بۆی نەناردووە و من ناچاربووم لەبەر کتێبەکەم بیانخوێنمەوە، (کا) نووسیوێتی ساڵی یەکەمی دوای گەڕانەوەی بۆ ئەڵمانیا بەهۆی بیرکردنەوە لە ئیپەک نەیتوانیووە بنوێ و هەموو شەوێک دوو حەپی خەوی قووتداوە، تا سەرخۆشبوونی لە ڕادەبەر خواردوویەتیەوە، لەکاتی پیاسەکردن بە شەقامەکانی فرانکفورتدا هەر پازدە خولەک جارێک ژنێکی لە دوورەوە بینیبێ وایزانیوە ئیپەکە، ئەو کامەرانییەی لەگەڵیدا بەسەری بردبوو هەموو

ڕۆژێک چەندین سەعات وەکو فیلمێکی خاو دەهاتەوە بەر چاوی، تەنانەت ئەگەر بیتوانیبا بۆ پێنج خولەکیش لە بیری کردبا، هەستی دەکرد زۆر کامەرانە، تا مردنی خۆی پێوەندیی لەگەڵ هیچ ژنێکی تردا نەبەستووە، دوای لە دەستدانی ئەو، "خۆی وەکو مرۆڤێکی ڕاستەقینە نا، بەڵکو وەکو تارمایی" بینیووە. کاتێک لە ڕووخساری ئیپەکدا هێمایەکی بەزەیی پێداهاتنەوەم بینی کە واتای "تکایە بەسە!"ی دەگەیاند و هەستم کرد برۆکانی وەکو ئەوەی لە بەردەم پرسیارێکی بەدەربەستدا بێ، بەرز کردووەتەوە، بەترسەوە حاڵی بووم من بۆیە هەموو ئەو شتانەم بۆ باس کردووە، بۆ ئەوەی من، بەڵێ من پەسەند بکات، نەک هاوڕێکەم.

ئیپەک گوتی: "لەوانەیە هاوڕێکەتان منی زۆر خۆش ویستبێ، بەڵام تا ئەو ڕادەیە نا کە جارێکی تر ڕێگای گەڕانەوە بۆ قارس تاقی بکاتەوە."

"بڕیاری دەستگیرکردنی درابوو."

"ئەوە هێندە گرنگ نەبوو. دەهاتە دادگا و قسەی دەکرد، هیچ بەلایەکی بەسەر نەدەهات. بە هەڵە لێم تێ مەگەن، باشتر کە نەهات، بەڵام شینە سەرباری ئەوەی سالانێکی درێژ بڕیاری کوشتنی درابوو، کەچی چەندین جار بە مەبەستی بینینی من بە نهێنی بۆ قارس هاتبوو."

هەر کە "شینە"ی بە زاردا هات، چاوە خوومارەکانی گەشانەوە. غەمێکی ڕاستەقینەیشم بە ڕووخساریەوە بینی کە لە ناخەوە هەژاندمی.

وەکو ئەوەی بیەوێ دڵم بداتەوە، گوتی: "بەڵام هاوڕێکەتان ترسی دادگای نەبوو. زۆر باش تێ گەیشتبوو کە پەیم بە تاوانەکەی بردووە و هەر لەبەرئەوەیش بوو نەچووم بۆ وێستگای شەمەنەفەر."

گوتم: "هەرگیز نەتانتوانی ئەم تاوانە بسەلمێنن."

بە شێوەیەکی ژیرانە گوتی: "زۆر باش تێ دەگەم ئێوە لەو سۆنگەیەوە هەست بە تاوان دەکەن." بۆ ئەوەیشی نیشانی بدا کە دیدارەکەمان کۆتاییی پێ هات، بەشێوەیەکی ژیرانە پاکەتی جگەرە و چەرخەکەی خستە جانتاکەیەوە. ژیرانە: چونکە لەگەڵ دەرپەڕینی ئەو وشانەدا لە زاری، من دەمودەست بەدەم هەستکردن بە



دۆڕانەوە تێ گەیشتم کە دەزانێ من ئیرەیی بە شینە دەبەم نەک بە (کا). دواتر گەیشتمە ئەو باوەڕەی ئیپەک ئاماژەی بۆ شتێکی ئەوتۆ نەکردووە، بەڵکو ئەوە خۆم بووم کە زیاد لە پێویست لە هەستکردن بە تاواندا نغرۆ بووبووم. هەستایە سەرپێ، بەژنێکی بڵندی پێوە بوو، هەموو شتێکی جوان بوو، پاڵتۆکەی لەبەر کرد.

هۆشم تێکەڵ و پێکەڵ بوو. بە شڵەژانەوە پێم گوت: "ئەم ئێوارەیە هەمدیسان یەک دەبینینەوە، وا نییە؟" هیچ پێویستی بەم قسەیە نەدەکرد.

"بەڵێ، باوکم چاوەڕێتان دەکات." ئەمەی گوت و بە لەنجە و لاری شیرینی تایبەت بە خۆی کەوتە ڕێ. بە خۆم گوت غەمبارم بەوەی کە لە دڵەوە باوەڕی وایە (کا) (تاوانبار)ە، بەڵام لە ڕاستیدا خۆم لە خشتە دەبرد. مەبەستی من لە بنەڕەتدا بریتی بوو لەوەی بە شیرینی (وەکو دۆستێکی خۆشەویستی کوژراوم) باسی (کا) بکەم، هێدی هێدی خاڵە لاوازەکانی، کەللەڕەقی و (تاوان)ەکەی بخەمە ڕوو و بەوجۆرە بەیادی بیرەوەرییە شیرینەکەی ئەوەوە سواری هەمان کەشتی ببین و دەست بە یەکەم گەشتی هاوبەشمان بکەین. داڵغەی شەوی یەکەمم سەبارەت بە بردنی ئیپەک بۆ ئەستەمبوڵ ئێستا زۆر دوور دەهاتە بەرچاو. لە هەناویشمدا پاڵنەرێک بۆ سەلماندی (بێتاوانی)ی هاوڕێکەم گینگڵی دەدا. ئایا تۆ بڵێی ئەمە تا چ ڕادەیەک بە واتایی ئیرەیی بردنم بووبێ بە شینە نەک بە (کا)؟

لەگەڵ بولێڵی ئێوارەدا پیاسەکردن بە کوچە شەختاوییەکانی قارسدا منی غەمگینتر کرد. بارەگای (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس) گوازرابووەوە بۆ خانێکی نوێ لە بەرامبەر بەنزینخانەکەی شەقامی قەرەداغ. لە ڕێڕەوەکانی ئەم خانە سێ نهۆمییە لە چیمەنتۆ بنیادنراوەدا کە قارسییەکان بە نیشانەی گەشەسەندنی ئابوورییان دادەنا، کەش و هەوای پۆخڵ، قوڕاوی، تاریک و کەونارەی شار کەڵەکە بووبوو.

فازیل لە نهۆمی دووەم بە ڕووی گەشەوە پێشوازیی لێ کردم و بە خۆشبینییەوە بە هەشت کارمەندی تەلەفزیۆنەکەی ناساندم. پاشان گوتی: "هاوکاران لێدوانێکی کورتیان دەوێ بۆ دەنگوباسەکانی ئەمشەو." منیش پێم وابوو ئەمە هەڵسووڕانی کارەکانم لە قارس ئاسانتر دەکات. هاکان ئۆیزگەی بێژەری بەرنامەی لاوان لە دیدارێکی پێنج خولەکیدا، ڕەنگە فازیل پێی گوتبێ، گوتی: "کەواتە سەرقاڵی

نووسینی ڕۆمانێکن کە قارس شانۆی ڕووداوەکانیەتی!" کاتێک ئەمەی گوت، من بڵمەبڵمێکم بۆی کرد. تەنانەت یەک وشەیش لەبارەی (کا)وە نەدواین.

چووینە ژووری بەڕێوەبەر، کاسێتەکان لەوێ بەپێی یاسا پارێزرابوون. مێژووی کاسێتەکانی سەر ڕەفەکانی قەد دیوارەکەمان پشکنی و تۆماری یەکەم و دووەم وەشانی زیندووی هۆڵی شانۆی گەلمان دەرهێنا. چووینە بەردەم تەلەفزیۆنێکی کۆن لە ژوورێکی بچووک و بێ هەوادا و لە پێشدا بەدەم خواردنەوەی چاوە سەیری "تراژیدیا لە قارسدا"م کرد کە قەدیفە ڕۆڵی تێدا بینیبوو. شەیدای (دیمەنە ڕەخنەئامێز)ەکانی سونای زایم و فوندا ئەسەر و گاڵتەکردنیان بووم بەو کلیپی ڕێکلامانەی کە چوار ساڵ لەمەوبەر بەرهەم هێنرابوون. چەند جارێک دیمەنی سەر ڕووتکردنی قەدیفە و پاشان تەقەکردنی ئەوم لە سونای هەڵکردەوە و بەوردی تەماشام کرد. بەڕاستیش مردنەکەی سونای وەکو بەشێکی نمایشەکە دەهاتە بەرچاو. دانیشتووانی ڕیزەکانی پێشەوە نەبێ، مەحاڵ بوو بینەرانی تر بزان کە داخۆ شارژۆری دەمانچەکە پڕە یاخۆ بەتاڵە.

کاتێک سەیری کاسێتەکەی ترم کرد، سەرەتا وام زانی بەتەنیا چەند دیمەنێکی درامای "نیشتمان یان سەرپۆش"، لاساییکردنەوە، سەرچڵییەکانی ڤوراڵی گۆڵچی، سمت بادانە دڵگیرەکانی فوندا ئەسەر و ئەو بڕگانەی کەیف و سەفای تێدایە کە شانۆکاران لە هەموو ئاهەنگێکدا دووبارەیان دەکردەوە. هاتوهاوار و گوتنەوەی دروشم و غەڵبەغەڵبی ناو هۆڵەکە دەنگەکانی سەر ئەو کاسێتە کۆنبووەی بەتەواوی تێک دابوو. سەرباری ئەوەیش دوای چەندین جار گێڕانەوە و گوێگرتن بەشێکی ئەو شیعرەی (کا)م هێنایە سەر کاغەز کە دواتر ناوی نابوو (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە.) فازیل لێی پرسیم بۆچی نەجیب لەو کاتەدا کە (کا) شیعری خوێندووەتەوە، هەستاوەتە سەرپێ و چەند شتێکی گوتووە؟ من لەو کاتەدا کاغەزی ئەو بەشەی شیعرەکە کە توانیبووم بینووسمەوە، دامە دەستی فازیل بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە.

دوو جار سەیری تەقەکردنی سەربازەکانمان لە بینەران کرد.

فازیل گوتی: "زۆر بە قارسدا گەڕای. منیش ئێستا دەمەوێ شوێنێکت نیشان بدەم." کەمێک بە شەرمەوە، بەڵام تۆزێکیش بە پێ داگرتنەوە گوتی لەوانەیە من



بمەوێ لە کتێبەکەمدا جێی نەجیبیش بکەمەوە، بۆیە دەیەوێ بەشی ناوخۆییی قوتابیانی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانم نیشان بدات کە ئەم ساڵانی دواییی ژیانی خۆی تێدا بەسەر بردووە و ماوەیەک بوو داخرابوو.

لەو دەمەیدا بەژێر بەفردا بە شەقامی غازی ئەحمەد موختار پاشادا ڕێمان دەکرد، سەگێکی ڕەنگ خەڵووزیم بینی کە پەڵەیەکی سپیی خڕ بە ناوچەوانیەوە بوو. کاتێک تێ گەیشتم ئەمە ئەو سەگەیە کە (کا) شیعرێکی دەربارەی نووسیووە، لە دوکانی بەقاڵێک نان و هێلکەی کوڵاوم کڕی و بەپەلە پاکم کرد و نامە بەردەم ئەو ئاژەڵە. ئەویش بە شادمانی کەوتە کلکەلەقێ بۆم.

فازیل کە بینی سەگەکە بەدوامانەوەیە و لێمان جیا نابێتەوە، گوتی: "ئەمە سەگی وێستگایە. بەشی ناوخۆییی کۆن ئێستا چۆڵە، بۆیە لە سەرەتاوە پێم نەگوتی، چونکە لەوانە بوو لەگەڵمدا نەیەی. لە دوای شەوی شۆڕشەکەوە بەبیانووی ئەوەی لانەی تیرۆر و پاشڤەڕۆیی بووە، داخرا. لەو کاتەوە کەسی تێدا نییە، هەر لەبەرئەوەیش لە تەلەفزیۆنەوە ئەم لایتەم لەگەڵ خۆمدا هێنا. لایتەکەی داگیرساند و ڕووی لە چاوە غەمگینەکانی سەگە ڕەشەکەی دوامانەوە کرد، سەگەکە هەمدیسان کەوتە کلکەلەقێ بۆمان. دەرگای باخچەی بەشی ناوخۆییی کۆن کلیل درابوو. باڵەخانەکە سەردەمانێک خانێکی ئەرمەنی و دواتریش بارەگای کۆنسوڵخانەی ڕووسیا و شوێنی ژیانی کونسوڵی ڕووسیا و سەگەکەی بوو. فازیل دەستی گرتم و بەسەر دیوارێکی نزمدا بازمان دا. پەنجەرەیەکی بەرزی جام شکاوی نیشان دام و گوتی: "شەوان لێرەوە هەڵدەهاتین." شارەزایانە لە پەنجەرەکە چوو بەو دیودا، بە لایتەکەی دەستی دەوروبەری ڕووناک کردەوە و منیشی ڕاکێشایە ژوورەوە. گوتی: "مەترسن، لە باڵندە زیاتر هیچ شتێکی تری تێدا نییە." جامی هەندێک لە پەنجەرەکان بەهۆی ئەوەی تۆز و خۆڵ و شەختەیان گرتبوو، ڕووناکییان لێ نەدەهاتە ژوورەوە. بەشێکی تریش لە پەنجەرەکان تەختەڕێژ کرابوون، بۆیە ناو باڵەخانەکە تاریکی و ئەنگوستەچاو بوو، بەڵام فازیل بەجۆرێک بە پلیکانەکاندا سەردەکەوت کە نیشانەی ئەوە بوو پێشووتریش بۆ ئێرە هاتبێ. وەکو ئەو کەسەی لایتێکی بەدەستەوەیە و لە سینەما جێگا نیشانی میوانەکان دەدات، بەر پێی منی ڕووناک دەکردەوە. لە هەموو

لایەکەوە بۆنی تۆز و کەڕوو دەهات. بە دەرگا شکاوەکانی پاشماوەی شۆڕشەکەی چوار ساڵ لەمەوبەردا تێ پەڕین، بە سەرنجدان لە شوێنەواری فیشەکی سەر دیوارەکان و باڵەفڕکێی شپرزەی کۆترەکاندا کە لە سووچی بنمچە بەرزەکان و لەسەر بۆڕیی سۆپاکە هێلانەیان کردبوو، بەنێوان چڕپایە ژەنگرتووەکاندا تێ پەڕین. فازیل ئاماژەی کرد بۆ نهۆمی سەرەوەی دوو چڕپایەی تەنیشت یەکدی و گوتی: "ئەمە ئەوەی منە و ئەویشیان ئەوەی نەجیبە. زۆربەی شەوان، بۆ ئەوەی ئەوانی دی بێدار نەکەینەوە، هەردووکمان لەسەر یەکێک لە چڕپاکان ڕادەکشاین و بەدەم سەیرکردنی ئاسمانەوە بە چرپە قسەمان دەکرد." لە جامی شکاوی پەنجەرەیەکی سەرەوەوە لەبەر ڕووناکیی گڵۆپێکی شەقامدا کلووی گەورەی بەفر دەبیندرا کە بەگرانی دەهاتنە خوارێ. بەڕێز و بە سەرنج لێدانەوە تەماشام کرد.

زۆر دواتر فازیل ئاماژەی بۆ دالانێکی تەسکی لای خوارەوە کرد و گوتی: "ئەمەیش ئەو دیمەنەیە کە لە چڕپاکەی نەجیبەوە دەبیندرا." ڕاگوزەرێکم بینی بە پانیی دوو مەتر کە لەودیوی باخچەکەوە کەوتبووە نێوان دیوارێکی داڕزیوی بانکی کشتوکاڵ و دیوارێکی بێ پەنجەرەی باڵەخانەیەکی بەرزەوە کە تەنانەت ناکرێ ناوی کۆڵانیشی لێ بندرێ. تیشکی گڵۆپێکی مۆر لە نهۆمی یەکەمی بانکەکەوە لە زەمینی قوڕاویی ڕاگوزەرەکەی دەدا. بۆ ئەوەی کەس پێی وانەبێ دالانەکە کۆڵانە، تابلۆیەکی سوور کە "داخراوە"ی لەسەر نووسرابوو، لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا چەقێندرابوو. لەوپەڕی ڕاگوزەرەکەدا کە فازیل بە سروش وەرگرتن لە نەجیب (کۆتاییی ئەم جیهانە)ی پێ دەگوت، دارێکی بێ گەڵا و تاریکی لێ بوو. ڕێک لەو کاتەدا کە ئێمە سەیرمان کرد، وەکو ئەوەی گڕی گرتبێ، سوور هەڵگەڕا. فازیل بە چرپەوە گوتی: "گڵۆپی سووری ڕێکلامی کۆشکی وێنەگری ئایدن ماوەی حەوت ساڵە تێک چووە. تیشکە سوورەکە جارویار دادەگیرسێ و دەکوژێتەوە و هەموو جارێکیش کە لە دار زەیتوونە ڕووسییەکە دەدات، لە چڕپاکەی نەجیبەوە وا دیارە وەکو ئەوەی گڕی گرتبێ. نەجیب تا دەمەوبەیانی سەیری ئەم دیمەنەی دەکرد و ئەسپی خەیاڵی تاو دەدا. ناوی (ئەو جیهانە)ی بەو شتە بەخشیبوو کە دەیبینی و سەرلەبەیانیی ئەو شەوانەی کە خەو نەدەچووە چاوی، پێی دەگوتم: "بەدرێژاییی شەو سەیری ئەو جیهانەم کرد!" کەواتە



نەجیب ئەمەی بۆ (کا) بەگی هاوڕێی شاعیرتان گێڕاوەتەوە و ئەویش خستوویەتیە شیعرێکی خۆیەوە. لەو دەمەدا کە سەیری کاسێتەکەت دەکرد، پەیم بەمە برد و هەر لەبەرئەوەیش بۆ ئێرەم هێنای. بەڵام هاوڕێکەت ناوی (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە)ی بە شیعرەکەی بەخشیوە و ئەمەیش بێڕێزی نواندنە بەرامبەر بە نەجیب."

گوتم: "نەجیبی خودا لێخۆشبوو ئەو دیمەنەی بینوێتی، وەکو (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە) بۆ (کا)ی گێڕاوەتەوە. من لەمە دڵنیام."

فازیل بە هوشیاری گوتی: "باوەڕ ناکەم نەجیب وەکو ئەتایستێک مردبێ، بەڵام گومانی لەو جۆرەیشی هەبوو."

لێم پرسی: "ئایا چیدی دەنگی نەجیب لە هەناوی خۆتدا نابیستی؟ ئایا ئەمانە وەکو کابرای ناو بەسەرهاتەکە هێدی هێدی ترسی بە ئەتایستبوونت تێدا ناوروژێنێ؟"

فازیل پێی خۆش نەبوو من ئاگاداری ئەو گومانانەی ئەوم کە چوار ساڵ لەمەوبەر بۆ (کا)ی گێڕابووەوە: "من ئیدی خاوەن خێزانم و منداڵم هەیە. ئێستا بە پێچەوانەی ڕابردوومەوە زۆر بایەخ بەو بابەتانە نادەم." یەکسەر بەدوای ئەم قسەیەیدا هەستی بە غەمگینی کرد لە پای ئەوەی بەجۆرێک ڕەفتاری لەگەڵدا نواندم وەکو ئەوەی کەسێک بم لە ڕۆژئاواوە هاتبم و بمەوێ بۆ ناو ئەتایزم بەکێشی بکەم. بە دەنگێکی شیرین گوتی: "دوایی قسە دەکەین. غەزوورم بۆ نانی ئێوارە چاوەڕێمان دەکات. پێویستە دوا نەکەوین."

بەڵام سەرباری ئەوەیش، بەر لەوەی بێینە خوارەوە، مێزی گۆشەی ژوورێکی گەورە کە سەردەمانێک نووسینگەی کونسوڵی ڕووس بووە، پارچە شووشەی بوتڵی عارەق و چەند کورسییەکی نیشان دام. "ز. دەمیرکۆڵ و تیمەکانی تایبەت، چەند ڕۆژێک لە دوای کردنەوەی ڕێگا و بانەکانیش لێرە مانەوە و درێژەیان بە کوشتنی نەتەوەپەرستانی کورد و ئیسلامییەکان دا."

ئەم باسەیان کە توانیبووم تا ئەو کات لەبیر خۆمی ببەمەوە، منی تۆقاند. بەهیچ جۆرێک نەمدەویست بیر لە دوا ساتەکانی (کا) لە قارس بکەمەوە.

سەگە ڕەنگ خەڵووزییەکە کە لەبەردەم دەروازەی باخچەکەدا چاوەڕێی دەکردین، لە گەڕانەوەماندا بۆ هوتێل، کەوتە دوامان.

فازیل گوتی: "زەوقت نەما. بۆچی؟"

"ئایا بەر لە نان خواردن سەرێک لە ژوورەکەم دەدەی؟ دەمەوێ شتێکت بدەمێ."

کاتێک کلیلی ژوورەکەم لە جاوید وەرگرت، لە دەروازەی کراوەی ماڵەکەی تورگوت بەگەوە ڕووناکیی ژوورەکە و خوانی ئامادەکراوم بینی. گوێم لە دەنگی قسەی میوانەکان بوو و هەستم کرد ئیپەکیش لە ژوورەکەیە. وێنەی ئەو نامانە لە باوڵەکەمدا بوو کە نەجیب چوار ساڵ لەمەوبەر بۆ قەدیفەی نووسیبوون و (کا) لە قارس وێنەی لەبەر گرتبوونەوە. ئەوانەم لە ژوورەکەمدا دا بە فازیل. زۆر دواتر بیرم کردەوە ئەم کارەم بۆ ئەوە بوو تاکو تارماییی هاوڕێکەی ئۆقرەی لێ هەڵبگرێ، هەروەکو چۆن تارماییی هاوڕێکەی من ئارامی لەبەر بڕیبووم.

فازیل لە قەراخ جێیەکەم دانیشت و دەستی بە خوێندنەوەی نامەکان کرد. منیش یەکێک لە دەفتەرەکانی (کا)م لە باوڵەکەم دەرهێنا و چاوێکم بەو ئەستێرەی بەفرەدا گێڕا کە یەکەم جار لە فرانکفورت بینیبووم. بەوجۆرە ئەو شتەی کە ماوەیەکی درێژ بوو بە گۆشەیەکی هۆشم پەیم پێ بردبوو، بە چاویش بینیم. (کا) شیعری (ئەو شوێنەی کە خودای لێ نییە)ی ڕێک لەسەر لوتکەی تەوەرەی بیرەوەری دانابوو. ئەمە واتای ئەوەی دەگەیاند (کا) چووەتە بارەگای ز. دەمیرکۆڵ لە بەشی ناوخۆییی چۆڵکراو، لە پەنجەرەکەی نەجیبەوە سەیری کردووە و بەر لەوەی قارس بەجێ بهێڵێ، پەردەی لەسەر سەرچاوەی ڕاستەقینەی (دیمەن)ەکەی نەجیب هەڵداوەتەوە. ئەو شیعرانەی کە لەملای تەوەرەی بیرەوەری دابنابوون، تەنیا بیرەوەرییەکانی قارس یاخۆ سەردەمی منداڵیی (کا)یان دەگێڕایەوە. بەمجۆرە لەو شتە دڵنیابووم کە سەرجەم دانیشتووانی قارس پێیان دەزانی: هاوڕێکەم کاتێک لە هۆڵی شانۆی گەل قەدیفەی بۆ قایل ناکرێ و لە کاتێکدا ئیپەک لە هوتێل دەرگای لەسەر داخراوە، بەمەبەستی درکاندنی شوێنی خۆحەشاردنی شینە بۆ لای ز. دەمیرکۆڵ دەچێ کە لە بەشی ناوخۆیی چاوەڕێی ئەمی کردووە.



دڵنیام لەو کاتەدا، بە ڕووخساری منەوە، هێمایەکی باشتر لە هێما سەرلێشواوەکەی فازیل نەدەبیندرا. لە خوارەوە دەنگی تێکەڵ و پێکەڵی میوانەکان و لە کۆڵانیشەوە دەنگی نرکەی شاری غەمباری قارس دەهات. فازیل و منیش بەبێدەنگی خۆمان لە ناو بیرەوەرییەکانمان و کرۆکی خۆماندا کە لە خۆمان عاشقانەتر، ئاڵۆزتر و ڕاستتر بوو، ون کرد.

لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی خوارەوە و بارینی بەفرم کرد و بە فازیلم گوت ئیدی پێویستە بڕۆین بۆ نانخواردن. سەرەتا فازیل وەکو کەسێک تاوانێکی ئەنجام دابێ، شانی شۆڕ کرد و ڕۆیشت. منیش لەسەر جێیەکەم ڕاکشام و بەدەم ئازارچەشتنەوە پێشبینیم کرد (کا) ئەو کاتەی لە دەروازەی هۆڵی شانۆی گەلەوە بۆ بەشی ناوخۆیی چووە، بیری لە چی کردووەتەوە، چۆن هەوڵی داوە لە کاتی قسەکردن لەگەڵ ز. دەمیرکۆڵدا چاوی بە چاوی نەکەوێ، چۆن بۆ نیشاندانی ناوونیشانێک کە نەیزانیوە دەکەوێتە کوێوە، لەگەڵ پەلامارلادەراندا سواری هەمان ئۆتۆمبیل بووە و بە گوتنی "ئا ئەوێیە" لە دوورەوە شوێنی خۆشاردنەوەی شینە و خەندەی بۆیان دەستنیشان کردووە. بەدەم ئازار چەشتنەوە؟ لە خۆم تووڕە بووم، چونکە منی "سکرتێری نووسەر" هەستم دەکرد بە دزییەوە لە کەوتنە داوی هاوڕێ شاعیرەکەم چێژێکی زۆر نهێنی وەردەگرم و هەوڵم دەدا چیدی بیر لەو مەسەلەیە نەکەمەوە.

لە بانگهێشتنەکەی تورگوت بەگدا لە خوارەوە، جوانی و بەدەویی ئیپەک منی هێندەی تر پەرێشان کرد. ڕەجایی بەگی بەڕێوەبەری فەرمانگەی تەلەفۆن کە شەیدای خوێندنەوەی کتێب و بیرەوەری بوو، سەردار بەگ، تورگوت و بەگ و هەموو ئەوانی تر مامەڵەیان لە تەکمدا زۆر خۆش بوو. ئەو شەوە درێژە کە من زۆرم تێدا خواردەوە، دەمویست لە کورتی ببڕێتەوە. ئیپەک لە بەرامبەرم دانیشتبوو، هەر جارێک کە سەیرم دەکرد، کۆمەڵێک شت لە هەناومدا هەرەسی دەهێنا. لە هەواڵەکاندا ئەو ڕیپۆرتاژە بڵاوکرایەوە کە لەگەڵمدا ئەنجام درابوو، بە شەرمەوە سەیری جووڵەی تووڕەی دەستەکانم دەکرد. وەکو ڕۆژنامەنووسێکی ماندوو کە بڕوای بە کارەکەی خۆی نەبێ، ئامێرێکی بچووکی تۆمارکردنم پێ بوو کە لە قارس لەگەڵ خۆمدا دەمگێڕا. کۆمەڵێک گفتوگۆم لەسەر تۆمارکرد کە لەگەڵ خاوەن ماڵ و

میوانەکاندا سەبارەت بە چەند بابەتێکی وەکو مێژووی قارس، ڕۆژنامەگەری لە قارس، بیرەوەرییەکانی شۆڕشەکەی چوار ساڵ لەمەوبەر ئەنجامم دا. بەدەم خواردنی شۆربا نیسکێنەکەی زاهیدەوە هەستم دەکرد بەشێک بم لە ڕۆمانێکی ساڵی چلەکان کە ڕووداوەکانی لە ناوچەیەکی دوورەدەست ڕوویان دابێ. کەس خۆی لە قەرەی باسی (کا) -تەنانەت مردنەکەیشی- نەدەدا؛ ئەمە هەناوی منی زیاتر ئەنجنئەنجن دەکرد. ئیپەک و قەدیفە ڕۆیشتن بۆ بەسەرکردنەوەی عومەرجانی بچکۆلانە کە لە ژوورێکی تەنیشتەوە نووستبوو و ماوەیەکیان پێ چوو. منیش ویستم دوایان بکەوم، بەڵام نووسەری خۆتان کە "وەکو هونەرمەندان زۆری خواردبووەوە"، هێندە سەرخۆش بوو بە ڕادەیەک خۆی لەسەر پێ بۆ ڕانەدەگیرا.

بەڵام سەرباری ئەوەیش شتێکی ئەو شەوەم زۆر باش لەبیرە. درەنگانێکی شەو بە ئیپەکم ڕاگەیاند کە دەمەوێ ژووری ژمارە ٢٠٣ ی شوێنی حەوانەوەی (کا) ببینم. هەموو ئامادەبووان بێدەنگ بوون و ڕوویان لە ئێمە کرد.

ئیپەک گوتی: "باشە، فەرموون."

لە هۆڵی پێشوازی کلیلەکەی هەڵگرت. بەدوایدا سەرکەوتمە سەرەوە. ژوورە کراوەکە. پەردە، پەنجەرە، بەفر. بۆنی خەو، سابون و کەمێک تۆز. سارد. لە کاتێکدا ئیپەک بە گومان و هەمان کات بەشێوەیەکی دۆستانە منی دابووە بەر نیگا، لە قەراغ ئەو پێخەوەدا کە هاوڕێکەم بەختەوەرترین ساتەکانی ژیانی خۆی لەگەڵ ئەمدا تێدا بەسەر بردبوو، دانیشتم. ئایا لێرەدا بمرم، یان عەشقی خۆم بۆ ئیپەک ڕابگەیەنم، یاخۆ لە پەنجەرەکەوە بۆ دەرێ بڕوانم؟ بەڵێ، هەمووان لە دەوری مێزەکە چاوەڕێمان بوون. بەمەبەستی دڵخۆشکردنی ئیپەک یەک دوو قسەی قۆڕم کرد و توانیم بیهێنمە پێکەنین. لە کاتێکدا شیرین شیرین بۆم پێ دەکەنی، ئەم چەند وشە شەرمبەخشەم پێ گوت کە پێشتر ئامادەم کردبوون.

لەئەڤینبەولاوەهیچشتێکیترمرۆڤلەژیاندابەختەوەرناکاتنەئەورۆمانانەیکەدەیاننووس

ێونەئەوشارانەیکەدەیانبینێزۆرتەنیاملەژیانداکەربلێمدەمەوێتاکۆتاییژیانلەمشارەلە نزیکئێوەوەژیانبەسەرببەمئایاوەڵامتانچیدەبێ؟





ئیپەک گوتی: "ئۆرهان بەگ، زۆر هەوڵم دا موختارم خۆش بوێ، بەڵام نەچووە سەر؛ شینەم فرە خۆشویست، سەری نەگرت؛ بڕوام وابوو دەتوانم (کا)م خۆش بوێ، وا دەرنەچوو؛ ئارەزووم دەکرد منداڵێکم ببێ، نەبوو؛ پێشم وانییە لەمەودوا هیچ کەسێکی ترم بە عەشق خۆش بوێ. ئیدی دەمەوێ تەنیا چاوم لە عومەرجانی خوشکەزام بێ. زۆر سوپاس، ئێوەیش هێندە بەدەربەست نین."

لە پای ئەوەی بۆ جاری یەکەم لەبری "هاوڕێکەتان" گوتی (کا)، سوپاسم کرد. لێم پرسی گەلۆ دەتوانین سبەی نیوەڕۆ دیسان لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ یەک ببینین و تەنیا سەبارەت بە (کا) قسە بکەین؟

زۆر بەداخەوە سەرقاڵ بوو. بەڵام وەکو خانەخوێیەکی باش بەڵێنی دا بۆ ئەوەی من غەمگین نەبم، سبەی ئێوارە لەگەڵ ئەوانی تردا بێت بۆ وێستگا و بەڕێم بکات.

زۆر سوپاسم کرد، دانم پێدا نا کە هێزی گەڕانەوەم بۆ سەر مێزی نانخواردنەکە تێدا نەماوە (ترسی گریانیشم هەبوو) و خۆم هاویشتە سەر جێگاکە و یەکسەر خەوم لێ کەوت.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی، بێ ئەوەی کەس بمبینێ، کەوتمە کوچە و کۆڵان و سەرەتا لەگەڵ موختار و دواتر لەگەڵ سەردار بەگی ڕۆژنامەنووس و فازیلدا تەواوی ڕۆژ بە قارسدا خولامەوە. نیشاندانم لە هەواڵەکانی دوێنێ ئێوارەدا دانیشتووانی قارسی کەمێک هێور کردبووە، منیش بە کەڵک وەرگرتن لەو دۆخە دەمتوانی بە ئاسانی وردەکاریی زۆر و پێویست بۆ کۆتاییی چیرۆکەکەم کۆ بکەمەوە. موختار منی بە دەرمانفرۆشێکی خانەنشینکراوی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕم)ی ئیسلامیی قارس ناساند کە ٧٥ دانەی لێ دەفرۆشرا. کابرا کەمێک دواتر گەیشتە شوێنی کۆبوونەوەکە. بۆی گێڕامەوە و گوتی کە بەهۆی تەگبیرە دژە دیموکراتییەکانی ئیسلامییەکانی قارسەوە ئەم نێوانی لەگەڵیاندا تێک چووە و پێی گوتم ئامادەیی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانیش ئەو برەوەی جارانی نەماوە. من یەکسەر بیرم کەوتەوە کە لەبەرئەوەی ئەم دەرمانفرۆشە بەساڵاچووە دوو جار بە شێوەیەکی سەیر نەجیبی ماچ کردووە، نەجیب و فازیل نەخشەی کوشتنیان داڕشتووە. خاوەنی هوتێلی شەن قارسیش کە لای سونای زایم هەواڵی لە میوانەکانی خۆی دابوو،

ئێستا لە هەمان ڕۆژنامەدا دەنووسێ. لە کاتی شەن و کەوکردنی ڕووداوەکانی ڕابردوودا بابەتێکی بیر خستمەوە کە من لەوەدا بووم لە بیرم دەکرد: ئەو کەسەی کە چوار ساڵ لەمەوبەر بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی کوشت، سوپاس بۆ خودا کە خەڵکی قارس نەبوو. تۆمارکردنی دەنگی کابرای چایچی خەڵکی تۆکات لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا، ڕێی خۆش کردبوو بۆ دەست نیشانکردنی ناسنامەکەی. لەبەرئەوەی لە ئاکامی پشکنیندا لە ئانکارا ئاشکرابووبوو کە بەهەمان چەک تاوانێکی تریش ئەنجام دراوە، خاوەنی ڕاستەقینەی چەکەکە دەستگیرکرابوو. کابرا دانی پێدا نابوو کە شینە ئەوی بۆ قارس بانگ کردووە. بەپێی ڕاپۆرتی دادگا تەرازووی عەقڵی لار بوو. دوای بەسەربردنی سێ ساڵ لە نەخۆشخانەی عەقڵ لە باقرکۆی، هاتووەتە دەرەوە، لە ئەستەمبوڵ نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش چایخانەیەکی بەناوی (شەن تۆکات)ەوە کردووەتەوە. لە ڕۆژنامەی (عەهد)یشدا بووە بە خاوەنی ستوونێک کە تیایدا بەرگری لە مافەکانی کچانی سەرپۆش بەسەر کردووە. بەرخودانی کچانی سەرداپۆشراو کە چوار ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ سەر ڕووتکردنی قەدیفەدا شکستی هێنابوو، هەرچەندە خەریک بوو سەری هەڵدەدایەوە، بەڵام بزووتنەوەکە لە قارسدا هێندەی ئەستەمبوڵ بەهێز نەبوو، چونکە ئەوانەی پابەندی سەرداپۆشین بوون بەشێکیان لە خوێندنگاکان دووردەخرانەوە و ئەوانی تریشیان ڕوویان لە زانکۆی شارەکانی تر دەکرد. کەسوکاری خەندە ئامادە نەبوون بمبینن. بەهۆی ئەوەی جەماوەر حەزیان لەو سرووود و گۆرانییانە کردبوو کە کابرای ئاگرکوژێنەوەی دەنگگڕ لە دوای شەوی شۆڕشەکە گوتبوونی، کابرا لە (تەلەفزیۆنی سەرحەد قارس)بووبووە بە بێژەری بەرنامەیەک بەناوی (گۆرانییەکانی سەرحەد). بەرنامەکە شەوانی شەممە تۆمار دەکرا و ئێوارەی ڕۆژانی هەینی بڵاودەکرایەوە. دەرگاوانە موزیک دۆستەکەی نەخۆشخانەی قارس کە یەکێک بوو لە میوانە هەمیشەییەکانی شێخ سەعادەدین، بە ئامێری ساز لە بەرنامەکەی کابرای دەنگگڕدا بەشدار دەبوو. سەردار بەگی ڕۆژنامەنووس بەو منداڵە بچووکەیشی ناساندم کە لە شەوی شۆڕشەکەدا چووبووە سەر شانۆ. (چاویلکە) کە باوکی لەو شەوە بەدواوە تەنانەت مۆڵەتی بەشداریکردنی لە شانۆنامەکانی قوتابخانەیشدا پێ نەدابوو، بووبوو بە پیاوێکی پێگەیشتوو و لەسەر دابەشکردنی ڕۆژنامەیش بەردەوام



بوو. لە سایەی ئەودا کار و ڕەفتاری ئەو سۆسیالیستانەی قارسم بۆ ئاشکرابوو کە ڕۆژنامەکانی ئەستەمبوڵ دەخوێننەوە: تا ئێستایش لە دڵەوە ڕێز لەو شەڕی مان و نەمانە دەگرن کە ئیسلامییەکان و نەتەوەپەرستانی کورد دژ بە دەوڵەت بەڕێوەی دەبەن. نووسینەوەی ئەو بەیاننامانەی کە کەس نایخوێنێتەوە و ستایشکردنی قارەمانێتی و فیداکارییەکانی ڕابڕدوویان نەبێ، هیچ شتێکی تریان لە دەست نایات. هەرکەسێک کە من دواندبێتم، چاوەڕێی هاتنی مرۆڤێکی قارەمان و لە خۆبوردووی دەکرد کە پەیدا بێت و هەموویان لە بێکاری، هەژاری، دزی و تاوان ڕزگار بکات. لە سۆنگەی ئەوەیشەوە کە من ڕۆمانووسێکی کەمێک ناسراو بووم، سەرانسەری شار پێوەری خەیاڵیی ئەو مرۆڤە مەزنەیان بۆ هەڵسەنگاندنی من بەکار دەهێنا کە پێیان وابوو ڕۆژێک لە ڕۆژان لێیان هەڵدەکەوێ، بۆیە نیشانیان دەدام کە خۆشحاڵ نین بە چەندین هەڵە و کەموکوڕی کە لە ئەستەمبوڵ لەسەریان ڕاهاتبووم. داماوی، پەشێوی، بەخشینی هۆشم بە کارەکەم و بە چیرۆکەکەم و پەلەپەلیی منیان بە دڵ نەبوو. لە چایخانەی یەکبوون دانیشتم و گوێم بۆ سەرلەبەری بەسەرهاتی مارفی بەرگدروو ڕاگرت. پاشان بانگهێشتنی کردم بۆ ماڵەوە و برازاکانی پێ ناساندم. پێویست بوو عارەقیان لەگەڵدا بخۆمەوە، دوو ڕۆژی تر لە شار بمێنمەوە بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسی لاوانی ئەتاتورکچی کە بڕیار بوو ئێوارەی چوارشەم ساز بکرێ، دەبوو هەموو ئەو جگەرانە بکێشم کە بە ڕووی گەش و دۆستانەوە پێشکەشیان دەکردم و هەر جارێکیش چایان دەخستە بەردەمم، پێویست بوو بیخۆمەوە (زۆربەیشیم کرد.) کابرای ڤارتۆییی برادەری باوکی فازیل لە سەردەمی سەربازیکردندا، بۆی گێڕامەوە لە چوار ساڵی ڕابردوودا ژمارەیەکی زۆر نەتەوەپەرستی کورد کوژراون یاخۆ خراونەتە زیندانەوە: ئیدی کەسیش پێوەندیی بە ڕیزەکانی گەریلاوە نەدەکرد، ئەو سێ لاوە کوردەیش کە لە کۆبوونەوەکەی هوتێل ئاسیادا بەشدار بووبوون، لە شار نەمابوون. برازا قومارچی و خوێن شیرینەکەی زاهیدە پاڵی بە منیشەوە نا بۆ ناو ئاپۆڕەی شەڕە کەڵەشێر کە ئێوارەی یەکشەم ساز کرا و بە زەوقەوە دوو پێک عارەقم خواردەوە کە لە پیاڵەی چادا پێشکەش دەکرا.

خەریک بوو دەمی ئێوارە نزیک دەبووەوە، ماوەیەکی درێژ بەر لە وادەی بەڕێکەوتنی شەمەندەفەرەکەم و بۆ ئەوەی کاتێک لە هوتێل دەربچم کە کەس نەمبینێ، وەکو ڕێبوارێکی تەنیا و ناشاد هێدی هێدی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و باوڵەکەم پێچایەوە. کاتێک لە دەرگای چێشتخانەکە چووم بەودیودا، سافەتی هەواڵدزم ناسی کە زاهیدە وەکو پیشەی ڕابردووی، هەموو ئێوارەیەک شۆربای دەدایێ. خانەنشین بووبوو، لەبەرئەوەی دوێنێ ئێوارە لە تەلەفزیۆندا نیشان درابووم، منی دەناسی و دەیویست چەند شتێکم بۆ بگێڕێتەوە. دوای ئەوەی لە چایخانەی یەکبوون دانیشتین، پێی گوتم سەرباری خانەنشینبوونی، هێشتا بە قۆنتەرات بۆ دەوڵەت کار دەکات. هیچ هەواڵدزێک لە قارسدا بۆی نەدەکرا خانەنشین ببێ؛ دەزگای هەواڵگری نهێنیی شار زۆر پەرۆشی زانینی هۆی هاتنم بوون بۆ ئێرە (ڕووداوە کۆنەکانی "ئەرمەنی"، یاخیبوونی کوردەکان، گرووپە ئیسلامییەکان، پارتە سیاسییەکان؟) بە پێکەنینەوە پێی گوتم ئەگەر کەمێک زانیاریی بدەمێ، ئەوا چەند قروشێکی دەست دەکەوێ.

بە پارێزەوە باسی (کا)م کرد، بە بیرم هێنایەوە کە چوار ساڵ لەمەوبەر هەنگاو بە هەنگاو بەدوای هاوڕێکەمەوە بووە و لەو بارەیەوە پرسیارم لێ کرد.

لە وەڵامدا گوتی: "کەسێکی زۆر باشی مرۆڤدۆست و سەگدۆست بوو، بەڵام هۆشی لە ئەڵمانیا بوو، زۆر مەند و داخراو بوو. ئەمڕۆ لێرە کەس خۆشی ناوێ."

ساتێکی درێژ بێدەنگ بووین. بەنیازی ئەوەی بەڵکو زانیارییەکی لا بێ بە دوودڵی پرسیاری شینەم لێ کرد. پێی گوتم هەروەکو چۆن من بۆ سۆراخی (کا) هاتووم، ساڵێک لەمەوبەر کەسێک لە ئەستەمبوڵەوە هاتووە و پرسیاری شینەی لێ کردووە! سافەت گێڕایەوە و گوتی لاوانی ئیسلامیی دوژمن بە دەوڵەت هەوڵی زۆریان داوە بۆ دۆزینەوەی گۆڕی شینە: بەڵام هەمیشە بەدەستی بەتاڵ گەڕاونەتەوە، چونکە بە ئەگەری زۆر، بۆ ئەوەی گۆڕەکەی نەبێتە مەزارگا، تەرمەکەی لە فڕۆکەوە فڕێ دراوەتە دەریاوە. فازیلیش کە لە تەنیشتمانەوە دانیشتبوو، گێڕایەوە و گوتی ئەویش گوێی لەو دەمگۆیانە بووە، لاوانی ئیسلامی بیریان کەوتووەتەوە کە شینە سەردەمانێک (هیجرەت)ی کردووە بۆ ئەڵمانیا و ئەوانیش پەنایان بۆ هەمان وڵات بردووە، لە بەرلین گرووپێکی ڕادیکاڵی ئیسلامییان دامەزراندووە کە تا دێ گەورە دەبێتەوە و لە



هاوڕێکانی پێشووی ئامادەییی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنانی بیستبوو لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری (هیجرەت)دا کە لە ئەڵمانیا دەری دەهێنن، نووسیوویانە تۆڵەی کوشتنی شینە لەوانە دەسێننەوە کە بوونەتە هۆی لەناوبردنی. نیگام خستە سەر بەفرەکەی دەرەوە و خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی کە تاقە دەستنووسی دیوانی شیعری هاوڕێکەم بەناوی (بەفر) لە دەستی یەکێک لە هیجرەتچیانی بەرلیندایە.

پۆلیسێکی تر کە لەو کاتەدا لە دەوری مێزەکەمان دانیشتنبوو، بۆی گێڕامەوە هەموو ئەو شتانەی سەبارەت بەو گوتراون، درۆن. گوتی: "من چاو کانزایی نیم." نەشیدەزانی چاو کانزایی واتای چی دەگەیەنێ. دەشیگوت بە عەشقەوە تەسلیمەی خودا لێخۆشبووی خۆش ویستووە و ئەگەر خۆی نەکوشتبا، ئەوا بێ هیچ گومانێک دەیخواست. من لەو میانەدا بیرم کەوتەوە کە سافەت چوار ساڵ لەمەوبەر لە کتێبخانەی شارەوانی دەستی بەسەر ناسنامەی قوتابێتیی فازیلدا گرتووە. ئەم ڕووداوە کە (کا) لە دەفتەرەکانیدا تۆماری کردبوو، وێ دەچوو لەمێژبێ ئەوان لەبیریان کردبێ.

کاتێک من و فازیل چووینە دەرەوە بۆ کوچە بەفراوییەکان، ئەو دوو پۆلیسەیش، جا نازانم لەبەر برادەرایەتی بوو یاخۆ لە ڕووی پەرۆشییان بۆ پیشەکەیان، کەوتنە پاڵمان و تا بۆیان کرا گازندەیان لە دەست ژیان، بێواتاییی ژیان، ئازاری ئەڤین، پیری و پەککەوتەییی خۆیان کرد. کەسیان تەنانەت کڵاویشیان لەسەردا نەبوو. کلووە بەفرەکان دەکەوتنە سەر قژی سپی و شێواویان و نەدەتوانەوە. لە وەڵامی پرسیارێکمدا کە ئایا لە ماوەی چوار ساڵدا شار هەژارتر و چۆڵتر بووە، فازیل گوتی ئێستا دانیشتووان زیاتر سەیری تەلەفزیۆن دەکەن و بێکاران لەبری ئەوەی بچنە چایخانەکان، لە ماڵەوە بەخۆڕایی و لە ڕێی سەتەلایتەوە سەیری هەموو فیلمەکانی جیهان دەکەن. هەرکەسە پارەی پاشەکەوت کردووە و سەتەلایتێکی سپیی بە قەد مەنجەڵێکی پێ کڕیوە و لە قەراغ پەنجەرەکەیەوە دایناوە، ئەمەیش تاقە نوێکاریی شار بوو لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا.

لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ، مەیلمان چووە سەر چۆرەکی گوێزدار کە سەری بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردەی خواردبوو. هەریەکەمان دانەیەکمان کڕی و

بەنیازی نانی ئێوارە خواردمان. کاتێک پۆلیسەکان حاڵی بوون ئێمە بەرەو وێستگای شار دەڕۆین، لێمان جیابوونەوە. دواتر ئێمە بە بەردەم دەڕابە داخراوەکان، چایخانە چۆڵەکان، کەونە ماڵانی ئەرمەنیی چۆڵکراو، ڕووناکیی جامخانە ڕچیوەکان و بەژێر لق و پۆپی بە بەفر داپۆشراوی سپیندار و داربەڕووەکاندا تێ پەڕین و بەدەم بیستنی دەنگی پێی خۆمانەوە بەو کوچە ماتەمینانەدا ڕۆیشتین کە تاک و تەرا گڵۆپی نیۆن ڕووناکی دەکردنەوە. لەبەرئەوەی پۆلیسەکان بەدوامانەوە نەبوون، خۆمان کرد بە کۆڵانەکانی ناوەوەدا . بەفرەکە بۆ ساتێک وای نیشان دا کە خۆشی بکاتەوە، بەڵام لە پڕ بەخێرایی دەستی پێ کردەوە. لەبەرئەوەی کەس بە کوچەکانەوە نەبوو و بەهۆی ڕۆیشتنیشم لە قارس، ئازارێک هەناومی دەکروژاند، هەستم بە تاوانێکی ئەوتۆ دەکرد وەکو ئەوەی بە ڕۆیشتنم لەم شارە چۆڵە، فازیل بەتەنیا جێ بهێڵم. شەختە و چلوورە لق و چڵە وشکەکانی دوو دار زەیتوونی دووریان گەیاندبووە یەک و پەردەیەکی تەنکیان پێک هێنابوو. چۆلەکەیەک لە ناو پەردەکەوە دەرچوو و بەژێر کلووە بەفرە گەورەکاندا بەسەر ئێمەدا فڕی. کوچەکان کە بە بەفرێکی نوێ و نەرم داپۆشرابوون، هێندە کپ و بێدەنگ بوون، بەجۆرێک جگە لە دەنگی پێمان و هەناسەدانمان کە تا دەڕۆیشتین زیاتر دەبوو، هیچی ترمان نەدەبیست. ئەم کپییە لە کوچەیەکدا کە ڕیزە دوکان و ماڵ کەوتبووە ئەمبەر و ئەوبەری، هەستێکی وای لای مرۆڤ دەبزوواند وەکو ئەوەی لە خەوندا بێ.

لەپڕ لە چەقی کوچەکەدا ڕاوەستام، سەرم هەڵبڕی و نیگام خستە سەر کلوویەکی بەفر و تا کەوتە سەر زەوی چاوم لەسەری هەڵنەگرت. لە هەمان کاتدا فازیل بە بەرزاییی دەروازەی چایخانەی (نورۆڵ)ەوە پۆستەرێکی زەردهەڵگەڕاوی نیشان دام کە ماوەی چوار ساڵ بوو بەو شوێنەوە بوو:



## مرۆڤ شاکاری خودایە

## و

## خۆکوشتن کفرە

فازیل گوتی: "لەبەرئەوەی پۆلیس بە زۆری ڕوو لەم چایخانەیە دەکەن، کەس نەیتوانیوە دەست بۆ ئەو پۆستەرە ببات."

لێم پرسی: "ئایا هەست دەکەی خۆت شاکارێک بیت؟"

"نەخێر. تەنیا نەجیب شاکاری خودا بوو. دوای ئەوەی خودا ئەوی بردەوە، لە ترسی ئەتایزم لە هەناومدا و لە عەشقی زیاتر خۆشویستنی پەروەردگارم دوور کەوتمەوە. مەگەر خودا بە گەورەییی خۆی بمبەخشێ."

بێ ئەوەی قسە بکەین، بەناو کلووە بەفرەکاندا کە لەوە دەچوون لە هەوادا ڕاوەستابن، تا وێستگا ڕۆیشتین. باڵەخانەی بەردین و جوانی بنیادنراوی سەرەتای کۆمار کە لە (کتێبی ڕەش)دا ئاماژەم پێ داوە، ڕووخێندراوە و لە شوێنەکەیدا شتێکی ناشیرین لە چەمەنتۆ دروست کراوە. موختار و سەگە ڕەنگ خەڵوزییەکەمان بینی کە لە چاوەڕوانیی ئێمەدا بوون. سەردار بەگی ڕۆژنامەنووسیش دە خولەک بەر لە وادەی بەڕێکەوتنی شەمەنەفەرەکە گەیشت، هەموو ئەو ژمارە کۆنانەی (ڕۆژنامەی شاری سەرحەد)ی بۆ هێنابووم کە هەواڵیان سەبارەت بە (کا) تێدا بڵاوکرابووە و تکای لێ کردم لە کتێبەکەمدا بە باشی باسی شار و نەهامەتییەکانی، قارس و مرۆڤەکانی بکەم. موختاریش دوای ئەوەی دیارییەکانی سەردار بەگی بینی، ئەویش شووشەیەک کۆڵۆنیا، پارچەیەکی بچووک پەنیری قاشاری قارس و دانەیەکی ئیمزاکراو لە یەکەم دیوانی شیعری خۆی کە بە پارەی خۆی لە ئەرزەرووم چاپی کردبوو، لە توورەکەیەکی پلاستیک دەرهێنا و وەکو ئەوەی تاوانێک بکات، دایە دەستم. بۆ سەگە ڕەنگ خەڵوزییەکە کە هاوڕێ خۆشەویستەکەم شیعرێکی لەسەر نووسیبوو، بابۆڵەیەک و بۆ خۆیشم بلێتێکم کڕی. لە کاتێکدا خواردنم دەکردە دەمی سەگەکەوە و ئەویش بە شێوەیەکی دۆستانە کلکە چەماوەکەی بۆ دەلەقاندم، تورگوت بەگ و قەدیفە بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە لام. لە

دواساتدا لە ڕێی زاهیدەوە بە هەواڵی ڕۆیشتنی منیان زانیبوو. بە چەند ڕستەیەکی کورت دەربارەی بلێت، ڕێگا و بان و بەفر قسەمان کرد. تورگوت بەگ بە شەرمەوە دانەیەک لە چاپی نوێی ڕۆمانی (ئەڤینی یەکەم)ی تورگەنیەفی بۆ درێژ کردم کە لە ساڵانی زیندانیدا لە فەرەنسییەوە وەری گێڕابوو. دەستم هێنا بە ڕوومەتی عومەرجاندا لە باوەشی قەدیفەدا. ئەملاو ئەولای قژی دایکی کە بە سەرپۆشێکی گرانبەهای ئەستەمبوڵی داپۆشیبوو، بەفراویان لێ دەچۆڕایەوە. بێئەوەی لەوە زیاتر سەیری چاوە جوانەکانی ژنەکەی بکەم، ڕووم لە فازیل کرد و لێم پرسی ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕۆمانێک لەسەر قارس بنووسم، دەیەوێ چی بە خوێنەران بڵێ.

بە بڕوا بەخۆبوونەوە گوتی: "هیچ."

کاتێک بینی بەم وەڵامەی غەمم لێ نیشت، خاوبووەوە و گوتی: "شتێکم لە خەیاڵدایە بەڵام ئێوە بە دڵتان نابێ... ئەگەر بڕیارە بمخەنە ڕۆمانێکەوە کە ڕووداوەکانی لە قارس دەقەومێن، دەمەوێ بە خوێنەران بڵێم هیچ بڕوا بەو شتانە نەکەن کە ئێوە سەبارەت بە من و بە ئێمەی دەنووسن. هیچ کەسێک ناتوانێ لە دوورەوە لە ئێمە تێ بگات."

"هەرچۆنێکیش بێت کەس بڕوا بە ڕۆمانێکی لەو جۆرە ناکات."

بە هەڵچوونەوە گوتی: "نەخێر، بڕوای پێ دەکەن. بۆ ئەوەی خۆیان بە ژیر و لووتبەرز و مرۆدۆست بزانن، هەوڵدەدەن بڕوا بکەن کە ئێمە گاڵتەجاڕ و مرۆڤگەلی باشین و بەم حاڵەمانەوە لێمان تێ دەگەن و خۆشەویستیمان بۆ دەردەبڕن. بەڵام ئەگەر ئێوە ئەم وشانەی من بخەنە ڕۆمانەکەوە، ئەوا لانی کەم گومانێک لە عەقڵیاندا دەمێنێتەوە."

بەڵێنم دایێ کە وشەکانی بخەمە ڕۆمانەکەمەوە.

کاتێک قەدیفە بینی من ساتێک سەیری دەروازەی وێستگاکەم کرد، لێم نزیک کەوتەوە و گوتی: "کچێکی بچکۆلانەی جوانتان بەناوی ڕووئیا هەیە. دادەم بۆی نەکرا بێ، بەڵام ویستی سڵاوی بگەیەنن بە کچەکەتان. منیش لە کاروانی شانۆی نیوەناچڵم ئەم بیرەوەرییەم بۆ هێناون." وێنەیەکی بچووکی دامێ کە خۆی و سونای



زایمی لەسەر شانۆی هۆڵی گەل نیشان دەدا.

کارمەندی وێستگاکە فووی بە فیکەکەیدا کرد. وێ دەچوو من تەنیا کەس بم کە سواری شەمەنەفەرەکە دەبووم. یەکە بە یەکەیانم لە ئامێز گرت. فازیل لە دوا چرکەدا توورەکەیەکی دایە دەستمەوە کە کۆپیی کاسێتەکان و پێنووسە نەمرەکەی نەجیبی تێدا بوو.

بەدەستی پڕ لە دیارییەوە، بەدژواری سواری واگۆنی شەمەنەفەرەکە بووم کە دەستی بە جووڵە کردبوو. هەر هەموویان لەسەر شۆستەکە ڕاوەستابوون و دەستیان بۆ ڕادەوەشاندم، منیش لە پەنجەرەکەوە سەرم دەرهێنا و دەستم بۆ ڕاوەشاندن. تەنیا لە دوا ساتیشدا سەگە ڕەنگ خەڵووزییەکەم بینی کە زمانی گوڵڕەنگ و گەورەی دەرهێنابوو و بەزەوقەوە لە نزیک خۆمەوە بەدرێژاییی شۆستەکە ڕای دەکرد. دواتر هەموویان لە ناو کلووی گەورەی بەفردا کە تا دەهات بەتاوتر دەباری، ون بوون.

دانیشتم، لەنێوان کلووە بەفرەکانەوە چاوم بڕیە تیشکی پرتەقاڵیی دوا ماڵانی گەڕەکەکانی قەراغ شار، ئەو ژوورە داڕووخاوانەی کە سەیری تەلەفزیۆنیان تێدا دەکرا، نەرمە دووکەڵی باریک و لەرزۆکی کە لە دووکەڵکێشی سەربانە نزم و بە بەفر داپۆشراوەکانەوە دەردەچوو و دەستم بە گریان کرد.

نیسان ١٩٩٩–کانوونی یەکەم ٢٠٠١

## شـوێنی شـیعـرەکان بە پێی دابەشـبوونیان بەسـەر تەوەرەکانی گەردیلـەی بەفـردا:

| لۆژیک | بیرەوەری | خەیاڵ | چەق |
|---|---|---|---|
| (١) بەفر | (٥) ئەو شوێنەی کە | (٤) قوتووی شۆکۆلاتە | (١٠) من، (کا) |
| (٢) هاوشێوەی شاراوە | خودای لێ نییە | (٨) خۆکوشتن و دەسەڵات | |
| (٣) هاوڕێیەتی | (٦) شەوی شۆڕشەکە | (١١) بەختەوەر دەبم | |
| ئەستێرەکان | (٧) کوچەکانی خەون | (١٣) بەهەشت | |
| (٩) بێچارەیی، دژواری | (١٤) مردن بە تیرباران | (١٦) ئەڤین | |
| (١٢) هەموو مرۆڤایەتی | (١٧) سەگ | (١٨) ئیرەیی پێبردن | |
| و ئەستێرەکان | (١٩) سەرزەمینی | | |
| (١٥) شەترەنج | کۆتاییی جیهان | | |



## کورتە ژیاننامەی ئۆرهان پاموک

ئۆرهان پاموک لە ساڵی ١٩٥٢ لە ئەستەمبوڵ لە دایک بووە. لە خێزانێکی گەورەدا لە نیشانتاشی کە بەشە شارێکی دەوڵەمەند و بەرۆژئاواییبووی ئەستەمبوڵە، پێ گەیشتووە. وەکو خۆیشی لە کتێبی ئۆتۆبیۆگرافی ئەستەمبوڵدا باسی کردووە، لە منداڵییەوە تا تەمەنی ٢٢ ساڵی خووی داوەتە نیگارکێشان و پێی وابووە کە لە داهاتوودا دەبێت بەنیگارکێش. قۆناغی ئامادەیی لە قوتابخانەی Robert Collegeی ئەمەریکایی لە ئەستەمبوڵ خوێندووە. دوای سێ ساڵ خوێندنی نیگارکێشی و بیناسازی لە زانکۆی تەکنۆلۆژی ئەستەمبوڵ، تێ دەگات کە ناتوانێ ببێ بەبیناساز و نیگارکێش، بۆیە دەست لە خوێندن هەڵدەگرێ. لە زانکۆی ئەستەمبوڵ دەست دەکات بەخوێندنی رۆژنامەگەری. پاموک لە تەمەنی بیست و سێ ساڵییەوە بریار دەدات ببێت بەرۆماننووس، دەست لە هەموو شتێک هەڵدەگرێ، خۆی لە سووچی ماڵەوە قایم دەکات و دەست دەداتە نووسین.

رۆمانی یەکەمی، "جەواد بەگ و کورەکانی"، لە ساڵی ١٩٨٢دا بڵاو کرایەوە. ئەم رۆمانە، کە چیرۆکی سێ پشتی خێزانێکی دەوڵەمەندی ئەستەمبوڵی دەگێڕێتەوە کە وەکو پاموک لە نیشانتاشی دەژین، خەڵاتی ئۆرهان کەمال و خەڵاتی رۆمانی رۆژنامەی میللیەتی وەرگرت. ساڵی دواتر، پاموک رۆمانی "ماڵی کپ"ی خستە بازارەوە. ئەم رۆمانە، پاش وەرگێرانی بۆ سەر زمانی فەرەنسی، لە ساڵی ١٩٩١دا خەڵاتیPrix de la Découverte Européeneی پێ بەخشرا. رۆمانی "قەڵای سپی"، کە چیرۆکی ناکۆکی و دۆستایەتیی نێوان کۆیلەیەکی ڤینیسیایی و زانایەکی عوسمانی دەگێڕێتەوە و نووسەر لە ساڵی ١٩٨٥دا بەچاپی گەیاندووە، پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٠دا وەرگێردرایە سەر زمانی ئینگلیزی و چەند زمانێکی تری رۆژئاوایی، یەکەم رۆمان بوو کە ناوبانگی پاموکی گەیاندە ئاستی نێودەوڵەتی. لە ساڵی ١٩٨٥دا خۆی و هاوسەرەکەی چوونە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ماوەی سێ ساڵ لە زانکۆی کۆڵۆمبیا لە نیۆرک وەکو "زانای میوان" کاری کرد. لەوێ بەشێکی زۆری رۆمانی "کتێبی رەش"ی نووسییەوە. نووسەر لەم رۆمانەدا، لە میانەی پارێزەرێکەوە کە

بەدوای هاوسەرە ونبووەکەیدا دەگەڕێ، باسی کوچەکانی ئەستەمبوڵ، ڕابردووی شار، پێکهاتە و ڕایەڵەکانیمان بۆ دەگێڕێتەوە. "کتێبی ڕەش" لە ساڵی ۱۹۹۰دا لە تورکیا بڵاوکرایەوە و دوای وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فەڕەنسی، خەڵاتی Prix France Cultureی وەرگرت. "کتێبی ڕەش"، ئەزموونێکی ئەوتۆیە، کە باس و خواسی زۆری هەڵگرتووە و ناوبانگی پاموکی زیاتر بە تورکیا و بە جیهاندا بڵاوکردەوە.

ساڵی ۱۹۹۱ کچێکیان بوو و ناویان نا "ڕوئیا." لە هەمان ساڵدا، "چیرۆکێکی یەک لاپەڕەیی"ی ناو ڕۆمانی "کتێبی ڕەش" کرا بە سیناریۆ بۆ فیلمێک بەناوی "ڕووی شاراوە." ڕۆمانی "ژیانی نوێ"، کە لە ساڵی ۱۹۹٤دا بڵاوکرایەوە و بەسەرهاتی فێرخوازێکی زانکۆ دەگێڕێتەوە، کە کەوتووەتە ژێر کاریگەریی کتێبێکی جادوو ئامێزەوە، یەکێک بوو لەو ڕۆمانانەی پاموک کە ژمارەیەکی پێوانەیی لە فرۆشتندا تۆمار کرد.

پاموک لە ساڵی ۱۹۹۸دا ڕۆمانی "ناوم سوورە"ی بڵاوکردەوە. ئەم ڕۆمانە کە چیرۆکی نیگارکێشەکانی عوسمانی و ئێرانی و جیهانی دەرەوەی ڕۆژاوامان بۆ دەگێڕێتەوە، لە ساڵی ۲۰۰۲دا لە فەرەنسا خەڵاتی Prix du Meilleur Livre etranger، لە ئیتاڵیا خەڵاتی Grinzane Cavour و لە ساڵی ۲۰۰۳دا لە ئیرلەندا خەڵاتی International Impac- Dublinی وەرگرت.

پاموک لە ناوەڕاستی ساڵەکانی نەوەدی سەدەی ڕابردووەوە دەستی دایە وتار نووسین لە بوارەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی بیر و ڕا دەبڕین و کەوتە ڕەخنەگرتن لە دەوڵەتی تورکیا، زۆر خۆی بە سیاسەتەوە سەرقاڵ نەکرد.

گوڵبژێرێکی لە وتارە ئەدەبی و مولوتوورییەکانی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان کۆکردەوە و لە ساڵی ۱۹۹۹دا لە دوو توێی کتێبێکدا بەناوی "ڕەنگەکانی تر" بە چاپی گەیاند. لە ساڵی ۲۰۰۲دا ڕۆمانی "بەفر"ی بڵاوکردەوە، کە خۆی "بە یەکەمین و دواین ڕۆمانی سیاسی"ی دادەنێ. نووسەر بەم ڕۆمانە، کە ڕووداوەکانی لە شاری قارس دەقەومێن و ئیسلامی سیاسی، سوپا، لایست و توندوتیژی و ناکۆکییەکانی نێوان نەتەوەپەرستانی کورد و تورک دەخاتە بەرچاوان، شێوازێکی نوێی نووسینی ڕۆمانی سیاسیی تاقی کردەوە. ڕۆژنامەی نیۆرک تایمز لە



ساڵی ۲۰۰٤دا ڕۆمانی "بەفر"ی خستە ڕیزی باشترین ۱۰ کتێبی ساڵەوە لەسەر ئاستی جیهان. "ئەستەمبوڵ" دواین کتێبی ئۆرهان پاموکە کە لە ساڵی ۲۰۰۳دا چاپ کراوە. نووسەر لەم کتێبەدا، بیرەوەرییەکانی خۆی تا تەمەنی ۲۲ ساڵی دەگێڕێتەوە. ئەم کتێبە شیعر ئامێزەی نووسەر، کە بەوێنەی ئەلبومی تایبەتی نووسەر و وێنەی نیگارکێشانی بیانی و ناوخۆیی ڕازێندراوەتەوە، پۆلێنکردنی کارێکی دژوارە.

بە زمانی کوردی و بە کوردستانەوە، بەرهەمەکانی ئۆرهان پاموک بە زیاتر ٥٠ زمان لە زیاد لە ۱۰۰ وڵاتی جیهاندا دەخوێنرێنەوە. پاموک لە ساڵی ۲۰۰٥دا خەڵاتی ئاشتی وەشانخانەکانی ئەڵمانیای وەرگرت کە بە دیارترین خەڵاتی بواری کولتووری ئەڵمانیا دادەنرێ و لە ساڵی ۱۹٥۰وە دابەش دەکرێ. خەڵاتی Le Prix Medicis etrang-er، کە ساڵانە لە فەڕەنسا بە باشترین ڕۆمانی بیانی دەبەخشرێ، لە ساڵی ۲۰۰٥دا بە ڕۆمانی "بەفر" ڕەوا بیندرا. نووسەر لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Richarda Huchی وەرگرت، کە لە شاری دارمشتادتی ئەڵمانیا هەر سێ ساڵ جارێک بە "کەسایەتیی خاوەن بیری ئازاد و هەڵوێستی بوێرانە دەبەخشرێ." گۆڤاری Time لە ساڵی ۲۰۰٦دا ئۆرهان پاموکی وەکو یەکێک لە ۱۰۰ کەسایەتی کاریگەری ساڵ هەڵبژارد.

ڕۆمانی "بەفر" لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Le Prix Mediterranee etrangerی پێ بەخشرا. نووسەر ئەندامی شانازیی American Academy of Arts and Letters ئەمەریکییە و تا ئێستا لە زانکۆکانی تیلبورگ و بەرلین لە ئەڵمانیا و ئەستەمبوڵ لە تورکیا، دکتۆرای شانازیی پێ بەخشراوە. پاموک لە ساڵی ۲۰۰٦دا خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەبیات وەرگرت و لە مێژووی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵدا بوو بە دووەم لاوترین کەس کە ئەم خەڵاتە وەردەگرن.

ئەو سێ ساڵە نەبێ کە لە نیویۆرک ژیاوە، ئۆرهان پاموک هەموو ژیانی خۆی لە هەمان کوچەی ئەستەمبوڵ بەسەر بردووە. ئێستایش هەر لەو ماڵەدا دەژی کە تیایدا لە دایک بووە.

# ناوەڕۆک


مۆدێرنە و ترادسیۆن لە لای ئۆرهان پاموک - بەختیار عەلی ..... 5
١- سەفەر بۆ قارس ..... 33
٢- کوچە دوورەکان ..... 41
٣- هەژاری و مێژوو ..... 53
٤- (کا) و ئیپەک لە شیرینیخانەی ژیانی نوێ ..... 69
٥- دوا گفتوگۆی نێوان بکوژ و کوژراو ..... 79
٦- چیرۆکی غەمگینی موختار ..... 90
٧- لە بارەگای پارتی، لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش و دیسانەوە لەسەر شەقامەکان ..... 101
٨- بەسەرهاتی شینە و ڕۆستەم ..... 113
٩- بێ باوەڕێک کە نایەوێ خۆی بکوژێ ..... 128
١٠- بەفر و بەختەوەری ..... 137
١١- (کا) لای شێخ ئەفەندی ..... 146
١٢- بەسەرهاتی غەمگینی نەجیب ..... 155
١٣- پیاسەیەک لەگەڵ قەدیفە بەژێر بەفردا ..... 166
١٤- بەدەوری خوانی ئێوارەوە سەبارەت بەئەڤین، خۆداپۆشین و خۆکوشتن ..... 175
١٥- لە هۆڵی شانۆی گەل ..... 193
١٦- ئەو دیمەنەی نەجیب بینیبووی و شیعرەکەی (کا) ..... 206
١٧- پیەسێک سەبارەت بەو کچەی کە سەرپۆشەکەی خۆی دەسووتێنێ ..... 215
١٨- شۆڕشی سەر شانۆ ..... 223
١٩- شەوی شۆڕشەکە ..... 235
٢٠- شەو، کاتێک (کا) نووست و، بەرەبەیان ..... 244
٢١- (کا) لە ژوورە نسرم و تاریکەکاندا ..... 256
٢٢- پێگەی سونای زایم لە سەربازی و لە شانۆی هاوچەرخدا ..... 268
٢٣- لە فەرماندەیی لەگەڵ سونایدا ..... 285
٢٤- گەردیلەی شەشپاڵوویی بەفر ..... 300
٢٥- (کا) و قەدیفە لە ژووری هوتێلەکەدا ..... 311
٢٦- لێدوانی شینە بۆ سەرتاسەری ڕۆژئاوا ..... 320





٢٧- (کا) تێ دەکۆشێ تورگوت بەگ لە ڕاگەیەندراوەکەدا بەشدار بکات ..... 336
٢٨- (کا) و ئیپەک لە ژووری هوتێلەکەدا ..... 347
٢٩- لە فرانکفورت ..... 353
٣٠- شادییەکی کورتخایەن ..... 369
٣١- کۆبوونەوە نهێنییەکەی هوتێل ئاسیا ..... 374
٣٢- سەبارەت بەئەڤین، بێ بایەخ بوون و ونبوونی شینە ..... 398
٣٣- ترسی پەلاماردان ..... 411
٣٤- ناوبژیوانی ..... 427
٣٥- (کا) و شینە لە ژووری زینداندا ..... 443
٣٦- مامەڵەی نێوان ژیان و نمایش، هونەر و سیاسەت ..... 457
٣٧- سازدانی تەدارەک بۆ دوایین نمایش ..... 472
٣٨- میوانداریيەکی زۆرەملێ ..... 486
٣٩- (کا) و ئیپەک لە هوتێلن ..... 496
٤٠- بەشێکی نیوەناچڵ ..... 513
٤١- دەفتەرە سەوزە ونبووەکە ..... 518
٤٢- لە چاوی ئیپەکەوە ..... 527
٤٣- پەردەی کۆتایی ..... 538
٤٤- دوای چوار ساڵ لە قارس ..... 557